

# هەزار و یەک شەو



سولەیمان ئیبڕاهیمزادە

لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی

بەرگی چوارەم

# هەزار و یەک شەو

وەرگێڕانی: سولەیمان ئیبڕاهیمزادە



بەرگی چوارەم

ADIBAN

**ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، نزیك ناوەندیی ڕۆژهەڵاتی کوڕان.

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

*ناسنامەی کتێب*

ناونیشان: هەزار و یەک شەو.

کۆکردنەوەی: عەبدول لەتیف تەسووجی.

بابەت: گێڕانەوە.

ژانر: کۆمەڵە چیرۆکی ئەفسانەیی فارسی، عەرەبی و هیندی.

وەرگێڕانی: سولەیمان ئیبراهیمزادە.

پێداچوونەوە: جووتیار قارەمان.

بەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

دیزاینی دەق و بەرگ: ئارام مەلا محەمەد

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠ میلادی، بەرگی چوارەم، چاپی یەکەم.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٥٦٩) ساڵی (٢٠٢٠) پێی دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە،

# کە شەوی هەوسەد و شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـکۆ! دەسـتوپێوەند و خزمەتکارەکانی بە سـەیفولملووکیان گوت کە تازە لەگەڵ چارەنووس هیچ ناکرێ و ئەسـتێرەناسـان هەر ئەوەڵێ بە باوکتیان گوتووە کە ئەوە کوڕە تووشـی سـەختی و تەنگانە دەبێ. ئێسـتا ئەتۆش و ئێمەش جگە لەوەی دەبێ شـان وەبەر ڕووداوەکان دەین هیچی دیکەمان لە دەست نایە. بەشکوو خودا بۆخۆی لەو گرفتە ڕزگارمان بکا. سـەیفولملووک گوتی: «وایە لەگەڵ چارەنووس چ ناکرێ. دوای ئەوە، ئاخێکی هەڵکێشا و ئەو شێعرەی گوت:

تەنیـــــــــــا خەونێکی خۆشە شادی بێبڕانەوە
هەزاران ڕۆژی ناخـــــــــــــــوش، هاتن و برانەوە
واتە هیچی تـا سـەر نین، نە خۆشـی و نە تـاڵی ژین
بێت و پشتت بە خـــــــــــودا ببەستی هیچی هیچ نین
گەر بێتوو بە بەشـــــــــــــی خۆ ڕازی بن خاوەن دینن
خـــــــــێر و شـەڕ و کەند و لەند، بەشـی سـەرەکی ژینن

دوای ئەوە لە دەریای بیر و خەیاڵدا نوقم بوو. ئەسـرین بە سـەر گۆنایدا هاتە خوارێ. هێندە نارەحەت بوو ماوەیەک خەوت. دوای ئەوە هەسـتا و داوای خواردنی کرد. کەمێکی شـت خوارد. با و پێڵەکان گەمییەکەیان ڕادا. بۆخۆشـیان نەیاندەزانی بەرەو کوێ دەچن. ماوەیەکی زۆر لە سـەر ئاوەکە سـەرگەردان بوون هەتا وای لێ هات خواردنیان لێ بڕا. لە برسان و لە توونیان خەریک بوو هیلاک بن. لە پڕدا دوڕگەیەک وەدەر کەوت با گەمییەکەی ڕادا هەتا بردییە قەراخ دوڕگەکە. لە گەمییەکە دابەزین و چوونە ناو دوڕگەکەوە. سـەیریان کرد ئەوێ پڕە لە میوەی جۆراوجۆر. لەو میوانەیان خوارد. لە ناکاو کەسێکیان دیت لە نێو دارەکان دانیشـتبوو. دموچاوێکی درێژ و سـەیری هەبوو. قاوی لە یەکێک لە پیاوەکان کرد و پێی گوت: «لەو میوانە مەخۆ نەگەیون وەر ئێرە میوەی گەیوترت دەمێ.» ئەو پیاوە پێی وا بوو ئەوە یەکێک لەو کەسـانەیە کە لە کەشـتییەکاندا بووە و ڕزگاری بووە ڕێی لێرە کەوتووە. بە دیتنی زۆر خۆشـحـاڵ بوو هەڵات بۆ لای. نەیدەزانی لە غەیبەوە چی لە ناوچاوانی نووسراوە. هەرکە کۆیلەکە گەیشتە لای ئەو شتە خۆی هاویشت قەلاندۆشی و لاقێکی لە ملی هالاند و لاقێکیشی شۆڕ کردەوە و گوتی: «برۆ تازە ڕزگاربوونت ئاستەمە.» کۆیلەکە بانگی لە هاوڕێکانی کرد و دەسـتی کرد بە شـین و گریان و گوتی: «خێرا لەو دوڕگەیە بڕۆنە دەرێ، ئەو یەکێک لە دانیشـتوانی ئێرە هاتووەتە قەلاندۆشم و ئەوانی دیش

لە ئێوە دەگەڕێن. هەتا ســـوارتان بن. هاوڕێکانی کە ئەوەیان بیســـت خێرا ڕایان کرد و ســواری گەمییەکە بوون و خۆیان دەرباز کرد. هەتا مانگێک ئاوا بە دەریادا ڕۆیشـتن. هەتا گەیشـــتنە دوڕگەیەکی دیکە و لەوێ دابەزین و چوونە ناو دوڕگەکەوە. پڕ بوو لە میوەی جۆراجۆر دەسـتیان کرد بە میوە خواردن. لە پڕ شـتێک لە دوور وەدیار کەوت. کە چوونە پێشـــێ، ناحەزێکیان دیت وەک کۆلکە لەوێ درێژ بوو. یەکێک لە کۆیلەکان قاچێکی لێ دا. ســـەیری کرد دەنکێکی چاو درێژە کە گوێچکەکانی ڕاخســـتووە و گوێیەکەی دیکەی بە ســەروچاویدا داوە. ئەو شــتە خێرا ئەو کۆیلەیەی کە قاچەکەی لێ دابوو گرت و هەڵات بۆ نێو دوڕگەکە. لەوێ دێوی لێ بوو کە مرۆڤیان دەخوارد. کۆیلەکە هەرای هاوڕێکانی کرد و گوتی هەڵێن ئێرە دوڕگەی دێوانە و مرۆڤان دەخۆن. کە ئەوان ئەوەیان بیست خێرا هەڵاتن بۆ لای گەمییەکە و ســـوار بوون و ڕایان کرد. دوای چەند ڕۆژ دوڕگەیەکی دیکە وەدیار کەوت. کە گەیشتنە دوڕگەکە کێوێکی بەرزیان دیت. کە چوونە سەر کێوەکە پڕ بوو لە دار و درەخت. زۆریان لە میوەی دارەکان خوارد کە لە پڕدا کەســـانێکی بەســـامی درێژ کە درێژییەکەیان پەنجا گەز دەبوو. ددانیان وەک شـــفرە هاتبوونە دەرێ پەیدا بوون. پیاوێک لەوێ بوو کە لە ســەر تاشــەبەردێک لبادێکی ڕەشــی ڕاخســتبوو لە ســەری دانیشــتبوو، قولەڕەشەش لە دەوری کۆ ببوونەوە. ئەو قولە ڕەشانە سەیفولملووک و کۆیلەکانیان گرت و بردیانن بۆ لای پاشـــاکەی خۆیان و پێیان گوت کە ئێمە ئەو باڵندانەمان لە نێو دارەکاندا دیت. دوو دانە لەکۆیلەکانیان سەربڕی و پاشاکەیان خواردی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و شەست و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سەیفولملووک ترسی ڕێنیشت و دەستی کرد بە گریان. بەدەم گریانەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ڕۆژگار چییە بە سەرمدا دەدەی
بەردی ڕق و قینت. کەی هەدا دەدەی
سێبەراسا مات و بێ دەنگ و سستم
چیم لێ دەکەی بە کام دەردی دیم دەبەی
بێ هۆش نیم و هیچ هۆشێکی وام نییە
وڕ و کاس بووم. باشە بۆچی وا دەکەی؟

پاشا کە گریانی ئەوی بیست گوتی: «ئەو مەلانە دەنگیان خۆشە. دا هەر یەکی لە قەفەسێکیان بکەن. ئیدی قولە ڕەشەکان خێرا هەر یەکەی لە قەفەسێکیان خستن و لە سەر سەری پاشا هەڵیان ئاوەسین. سەیفولملووک و کۆیلەکانی لە نێو قەفەسەکاندا بوون و قولە ڕەشەکان خواردن و شەرابیان دەدانێ. ئەوانیش تاوێک دەگریان و تاوێک پێ دەکەنین، تاوێک قسەیان دەکرد و ماوەیەک بێ دەنگ دەبوون. پاشای قولە ڕەشەکانیش زۆری دەنگی ئەوان پێ خۆش بوو. ماوەیەکی زۆر ئاوا لەوێ مانەوە و لەو قەفەسانەدا بوون.

ئەو پاشایە کچێکی هەبوو کە شووی کردبوو لە دوڕگەیەکی دیکە بوو. ڕۆژێک بیستییەوە کە باوکی مەل و باڵندەی زۆر دەنگ خۆشی بۆ هاتووە. چەند کەسێکی نارد بۆ لای بابی و داوای کردبوو یەکێک لەو مەلانەی بۆ بنێرێ. پاشای ڕەشەکانیش سەیفولملووک و سێ دانە لە کۆیلەکانی لە چوار قەفەسدا نارد بۆ کچەکەی. کچە کە ئەوانی دیت کەوتنە بەر دڵی و فەرمانی دا لە پشت سەریان لە جێیەک دایان نێن. سەیفولملووک ئەو ڕووداوەی زۆر پێ سەیر. دەورانی دەسەڵاتی خۆی بیر هاتەوە و دەستی کرد بە گریان و کۆیلەکانیشی دەگریان. بەڵام شازادە پێی وا بوو ئەوە گۆرانی دەچڕن. شازادە خانم عادەتی وابوو کە ئەگەر کەسێک لە وڵاتی میسر یان وڵاتێکی دیکەوە هاتبا و ڕێی کەوتبا لای ئەو پێی سەیر و سەرنج ڕاکێش با ئەوە لە لای ئەو ڕێزێکی زۆری دەبوو. ڕێکەوت وا بوو چونکە سەیفولملووک شا کوڕێکی جوانچاک و لە بەر دڵان بوو زۆری خۆش دەویست و بە دەوریدا دەهات هەتا وا بوو ڕۆژێک هەلی بۆ هەڵکەوت و داوای نیزیکی لێ کرد و دەستی کرد بە پاڕانەوە و لالانەوە.

سەیفولملووک جوابی نەداوە. ئیدی کچی پاشا لەبەر ئەوە لێی بە قینداچوو، کردنی بە خزمەتکار و ئاو و ئاوردوو شتی پێ دێنا، بۆ چێشتخانەکەی. چوار ساڵیش ئاوایان ڕابوارد.

سـەیفولملووک لەو دۆخە وە گیان هات و کەسێکی نارد بۆ لای پاشا تکایان بۆ بکا. پاشا داوای کرد سەیفولملووک بچێ بۆ لای. کە سەیفولملووک چووە لای پێی گوت: «ئەگەر تۆ بە قسەی من بکەی و ئەوەی من دڵێم جێبەجێی بکەی ئەوە لەو دۆخە ڕزگارت دەکەم تا بچییەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت. شـاژنش بەردەوام دەگریا و دەکڕووزاوە. سـەیفولملووک وەڵامی نەدەداوە. شـاژن ڕقی لێی هەستا و پشتی تێ کرد. ئیدی ئەوان هەر بەو وزعەوە لەو دوڕگەیە مانەوە. شـاژن لەوە دڵنیا بوو کە تازە ئەوان ڕێگای هەڵاتیان نییە و هەر لەو دوڕگەیە دەمێننەوە. ئەوانیش دوو ڕۆژ سێ ڕۆژ دەچوون لە نێو دوڕگەدا دەگەڕان و چرپی و چاڵ و ئاوردوویان لە دەوروبەر کۆ دەکردەوە و دەیانهێناوە بۆ چێشتخانەکەی شاژن. پێنج ساڵ ئاوا ڕابرد. ڕێکەوت وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان سەیفولملووک و پیاوەکانی لە قەراخ دەریا دانیشتبوون و باسی چارەنووسی خۆیانیان دەکرد. سەیفولملووک باسی باب و دایکی و ساعدی کرد و دەستی کرد بە گریان. هاوڕێکانیشی دەستیان کرد بە گریان. دوای ئەوە کۆیلەکانی گوتیان: گەورەم، پاشای زەمان هەتا کەنگێ بگرین خۆ گریان دادمان نادا، ئەوە بە پێنووسی چارەنووس لە ناوچاوانمان نووسراوە جگە لەوەی دەبێ خۆراگر بین هیچی دیکەمان لە دەست نایە. سـەیفولملووک گوتی: «برایان، چۆن خۆمان دەرباز کەین.» کۆیلەکانی گوتیان جا ڕزگاری چی؟ مەگین خودا بە گەورەیی خۆی فریامان کەوێ دەنا هیچ ڕێگایەک بۆ دەربازبوون نییە.

سەیفولملووک گوتی: «ئەمن دەڵێم هەڵێین بەشکوو لەو چەرمەسەرییە ڕزگارمان بێ.» کۆیلەکانی گوتیان جا پاشا لەو دوڕگەیەدا بۆ کوێ هەڵدێی ڕوو لە هەر لایەک دەکەی هەمووی هەر لەوانە. ئەوە حەوتوویەکیش خۆمان شـاردەوە دەمان بیننەوە، شـاژن ئەوەندەی دیش لێمان بە قینداە دەچێ و خراپترمان بە سەر دێنن. سـەیفولملووک گوتی: «ئەمن بیرێکم بە مێشکدا دێ ڕەنگە مایەی ڕزگار ئێمە بێ. تێکڕا گوتیان: دەی بەشکوو ڕزگارمان کەی. سـەیفولملووک گوتی: «دەست دەکەین بە دار بڕینەوە و توێکڵەکانیان لێ دەکەینەوە و دەیهۆنینەوە. وەک پەتک و کەندر دارەکانی پێ لێک دەبەستین و چەپەری داری پێ دروست دەکەین و دەیخەینە دەریاوە. میوەیەکی زۆریش لێ دەکەینەوە و سوار دەبین دەڕۆین. لە سەر خودا بەشکوو خودای تەعالا لە دەست ئەو گڵاوە ڕزگارمان بکا.» تێکڕا گوتیان وەڵا فکری چاکە پاشا.

لەڕێوە هەستان دەستیان کرد بە دار بڕینەوە و بە توێکڵەکانی کەندر و گوریسیان ساز کرد. هەتا مانگێک بە ڕۆژدا ئەوە کاریان بوو. شەویش یەکی کەمێکیان دار و چرپی و شت هەڵدەگرت و دەیانبردەوە بۆ چێشتخانەکەی شاژن. کە ڕۆژ دەبووەوە دیسان دەهاتنەوە بە لای کارەکەی خۆیانەوە هەتا تەواویان کرد.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی حەوسەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاونشـکۆ، سـەیفولملووک کە لەگەڵ هاورێکانی دارچەپەرەکەیان تەواو کرد بە دەریایاندا دا. ئەوەندەی بۆیان کرا میوەیان خستە سەری و بۆخۆشیان سوار بوون و ڕۆیشتن. چوار مانگ ڕۆیشتن بەبێ ئەوەی بزانن بەرەو کوێ دەڕۆن. تا وای لێ هات خواردمەنیان تەواو بوو لە برسان و لە توونیان خەریک بوون تێدا دەچوون.

لە پڕدا دەریا کەفی کرد و شەپۆل بەرز بوونەوە. نەهەنگێکی گەورە لە دەریا هاتە دەرێ. بە پەڕتاو هات و یەکێک لە کۆیلەکانی لە سەر دارچەپەرەکە گرت و قووتی دا. سەیفولملووک کە ئەوەی دیت دەستی کرد بە گریان و خێرا لەو شوێنە دوور کەوتەوە کە نەهەنگەکەی لێ بوو. تەنیا یەکێک لە کۆیلەکانی لەگەڵ مابوو. دوو بە دوو ڕۆیشتن و ڕۆیشتن تا لە دوور کێوێکیا لێ وە دیار کەوت. بە دیتنی کێوەکە خۆشحاڵ بوون. دوای ئەوە دورگەیەکیان دیت خێراتر دارچەپەرەکەیان لێ خوڕی تا خۆیان بگەیەننە ئەوێ. لەو جەنگەیەدا دیسان دەریا خرۆشا و شەپۆل بەرز بوونەوە، لە ناکاو نەهەنگێکی دیکە هاتە دەرێ و پڕی دا کۆیلەکەی دیکە و فڕاندی. سەیفولملووک بە تەنیا ماوە.

ماندوو، ترسا و تۆقاو گەیشتە قەراخ و بە هەزار زەحمەت لە کێوەکە چووە سەرێ. کە چووە سەرێ سەیری کرد دارستانێک بوو چووە ناو دارستانە. دەستی کرد بە میوە خواردن. لە پڕدا سەیری کرد سەر دارەکان مەیموونی لێ بوو یەکی لە وشترێک گەورەتر بوون. سەیفولملووک زۆر لەو مەیموونانە ترسا. مەیموونەکان لە سەر دارەکانەوە بازیان دا و هاتن دەوریان دا. تێیان گەیاند کە بە دوایاندا بڕوا. ئیدی مەیموونەکان ڕۆیشتن و سەیفولملووکیش بە دوایاندا ڕۆیشت تا گەیشتنە قەڵایەکی قایم و بەرز. مەیموونەکان چوونە قەڵاکەوە و سەیفولملووک بە دوایاندا چووە ژوورێ. نێو ئەو قەڵایە هەموو جۆرە شتێکی جوان و باش و گرانبایی لە زێڕ و جەواهێرات و شت لێ بوو. لاوێکیشی لێ بوو جوانچاک و باڵابەرز کە هێشتا خەتی نەدابوو. سەیفولملووک بە دیتنی ئەو لاوە دڵی گەشاوە. ئەو قەڵایە جگە لەو مرۆڤی دیکەی لێ نەبوو. ئەو لاوەش کە سەیفولملووکی دیت واقی وڕ ما و لێی پرسی:«ناوت چییە؟ لە کوێوە هاتووی و چۆنە هاتوویە ئێرە؟» سەیفولملووک گوتی: «بە خودا خۆ من بە کەیفی خۆم نەهاتوومە ئێرە و چارەنووس هێناومی. ئەمن وە شوێن ویستی دڵم کەوتووم و ئاوا سەرگەردان لەو شوێن بۆ ئەو شوێن هەڵوەدام.»

گەنجەکە گوتی: «بە دوای چییەوەی؟» سەیفولملووک گوتی: «ناوم سەیفولملووکە و کوڕی عاسمشام.» ئیدی بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا ئەو شوێنە بۆ گێڕاوە. لەڕێوە

کوڕە لە بەری هەستا و گوتی: «پاشای جیهان ئەمن لە میسر بووم بیستم کە تۆ چووی بۆ وڵاتی چین. چین لە کوێ ئێرە لە کوێ؟ بەڕاستی شتێکی سەیرە.» سەیفولملووک گوتی: «تۆ ڕاست دەکەی، بەڵام من لە وڵاتی چینەوە چووم بۆ وڵاتی هێند. بایەکی توند لە دەریادا هەڵیکرد و کەشـــتییەی ئێمەی تێک شـــکاند.» ئیدی هەمووی بۆ گێڕاوە. ئەو لاوە گوتی: «شـازادە، ئیدی سـەختی و کوێرەوەری تەواو بوو. سـپاس بۆ خودا کە ڕێی لێرە خسـتی. ئێســـتا لێرە دانیشـــە با بۆخۆمان پێکەوە بژین و ئەگەر منیش مردم ئەوە بۆخۆت ببە بە پادشــای ئێرە. ئێرە شــارێکی گەورە و بەرینە و ئەو مەیموونانە زۆر دەســتڕەنگینن چیت پێویست بێ بۆت دابین دەکەن. هەموو شتێکیش لێرە بە پێی فیلانە.»

سەیفولملووک گوتی: «براکەم خۆ من لێرە نامێنمەوە هەتا شتێکم وە دەست کەوێ یان تا دەمرم. مەیموونێک لەوێ بوو. گەنجەکە چاوێکی لێ کرد و بەڕێی کرد. ئێستێک ون بوو کە گەڕاوە مەیموونێکی دیکەی لەگەڵ بوو کە بەرکۆشـــێکی حەریری پێوە بوو. ســـفرەیان ڕاخســـت. ســـەد دەفری زێڕ و زێوی دانا کە هەموو جۆرە خواردنێکی لە ســـەر بوو. مەیموونەکان وەک کۆیلە و خزمەتکار ڕاوەســـتابوون. ئەو لاوە بە ئاماژە بە هێندێک لە مەیموونەکانی گوت دانیشـــن. ئەوان دانیشـــتن و تاقمێکیان بە پێوە وێســـتابوون تا خواردنەکەیان بخۆن. دوای نان خواردن تەشت و مەسینەی زێڕینیان هێنا و دەست شۆرا. ئەوجار چل دەفری زێڕینیان هێنا کە چل جۆرە شـــەرابیان تێدا بوو. ئەوان شـــەرابیان خواردەوە و کەیفیان ســاز و خۆشــحاڵ بوون. تەواوی مەیموونەکان هەڵدەپەڕین و یاریان دەکرد. کاتێک ســەیفولملووک ئەو بەزمەی دیت کەمێکی خۆشــحاڵ بوو. خەم و دەردەکانی لە بیر چوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی حەوسەد و شەست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە بوو بە شەو مەیموونەکان مۆمیان هەڵکرد و لە مۆمدانی زێڕ و زێودا دایان نا و شەراب و شیرینی و میوەشیان هێنا. کە کاتی خەو هات جێگایان بۆ خۆیان ڕاخست و خەوتن.

کە ڕۆژ بووەوە لاوەکە هەستا و سەیفولملووکیشی هەستاند و پێی گوت: «هەستە لێرەوە چاو لەو دیمەنە بکە بزانە چ باسە؟» سەیفولملووک هەستا تەماشای کرد، دیتی ئەوە دەشت و دەر پڕ پڕە لە مەیموون ئەوەندە زۆرن کە خودا نەبێ کەس نازانێ چەندن. سەیفولملووک پرسی: «ئەو هەموو مەیموونە چییە وا دار و بەردیان داگرتووە؟» گەنجەکە گوتی: «تەواوی مەیموونی ئەو دورگەیە عادەتیان وایە ڕۆژانی شەممە بێنە ئێرە ڕاوەستن هەتا من لە خەو هەڵدەستم و لەو بەرجەوەندەوە چاوێکیان لێ دەکەم ئەوانیش تێکڕا کڕنۆش دەبەن و زەوی ماچ دەکەن و دەڕۆن.

بە کورتی سەیفولملووک مانگێک لە لای ئەو گنجە ماوە. دوای ئەوە مالاوایی لێ کرد و ڕۆیشت. لاوەش سەد دانە مەیموونی لەگەڵ نارد بەڕێی کەن. مەیموونەکان ڕێگای حەوت ڕۆژی لەگەڵ چوون و مالاواییان لێ کرد و گەڕانەوە. سەیفولملووک بە تاقی تەنێ لەو دەشت و کێوەدا سەرگەردان دەسووڕاوە ڕۆژێک تێر و ڕۆژێک برسی بوو. ڕۆژێک گیای دەخوارد و ڕۆژێک میوەی دارانی دەخوارد و زۆریش پەشیمان بوو بۆ لە لای ئەو لاوە نەماوە. ڕۆژێک ویستی بە ڕێی خۆیدا بگەڕێتەوە لای کوڕە گەنجە کە لە دوور ڕەشاییەک سەرنجی ڕاکێشا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «لە پێشدا هەتا لای ئەو ڕەشاییە دەچم بزانم چییە. پاشان دەگەڕێمەوە لای ئەو کوڕە.» چوو بۆ لای ڕەشاییەکە، کە لێی چووە پێشێ سەیری کرد کۆشکێکی پتەو و قایم کە لە کۆشکەکانی یافیسی کوڕی نوحە (س ـــ خ). هەر ئەو کۆشکەی کە لە کتێبە پیرۆزەکەی خۆیدا باسی کردووە و فەرموویەتی: «... وَبِئْرٍ مُعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَشِيدٍ»[1] (=چالاوەگەلێک کە بێ کەڵک ماونەتەوە و دیوگەلێکی سپیکاری کراوی بێ خاوەن.) دوای ئەوە سەیفولملووک لە بەر دەرگای کۆشک دانیشت. لە بیر ئەوەدا بوو کە گەلۆ ئەو کۆشکە دەبێ چ بێ و پاشاکەی کێ بێ؟ ماوەیەک تێ پەڕی کەسێکی نەدی هاتوچۆی بکا. پشتی بە خودای مەزن بەست و لە کۆشک وە ژوور کەوت. لە حەوت نێوکۆیان ڕەد بوو، تووشی کەس نەبوو. بە دەستی ڕاستەوە دەرگایەکی دیت پەردەیەکیان پێدا دابوو. چووە پێشێ و پەردەکەی هەڵداوە و لە دەرگاکە چووە ژوورێ. تەماشای کرد ئەوە سەرسەرایەکی گەورەیە و فەرش و مافوورەی حەریری

---

[1]. بەشێک لە ئایەی ٤٥ی سوورەی حەج.

تێدا ڕاخراوە و لە لای سـەرەوەش تەختێکی زێڕی لێیە و کچێکی لە سـەرە وەک مانگ دەدرەوشێ و جلی مەلەکانەی لە بەر دایە. سەیفولملووک سڵاوی لێ کرد. کیژە سڵاوەکەی ئەستاندەوە و گوتی: «ئەتۆ ئینسی یا جنی؟» وەڵامی داوە: «ئەمن لە باشترین ئینسەکانم و پاشـازادەم.» کیژە گوتی: «ئەتۆ جارێ لەو خواردنانە بخۆ وا لە ژێر ئەو تەختەدایە. دوای ئەوە پێم بڵێ چۆناوچۆن هاتوویە ئێرە؟» سەیفولملووک چاوێکی لە بن تەختەکە کرد. چل دانە خوانی دیت ڕاخرابوو. سـەر هەر خوانێکیش پڕ بوو لە دەفری زێڕ و زێوی پڕ لە خواردمەنی بەتام و خۆش.

سەیفولملووک چوو لە خواردنەکان تێری خوار و دەستی شوت هاتەوە سەر تەختەکە و لە لای کچە دانیشـت. کیژە جوانەکە لێی پرسـی: «ئەتۆ کێی و ناوت چییە و لە کوێوە هاتووی و کێ تۆی هێناوەتە ئێرە؟» سـەیفولملووک گوتی: «چیرۆکی من دوورودرێژە، لە پێشـدا ئەتۆ پێم بڵێ ناوت چییە و بۆ بە تەنیا لێرەی؟» کچە گوتی: «ناوی من دەوڵەت خاتوونە، کچی پاشـای هێندم. باوکم لە شـاری سـەراندیبە. باوکم باخێکی گەورە و خۆشی هەیە کە لە سـەرتاسـەری وڵاتی هێندا باخی دیکەی ئاوای تێدا نییە. لەو باخەدا حەوزێکی گەورەی تێدایە، ئەمن ڕۆژێک لە ڕۆژان لەگەڵ کەنیزەکانم چوومە ئەو باخە و لە حەوزەکەدا خەریکی یاری و گەمە بووین کە لە پڕدا شـتێک وەک هەور هاتە سـەرم و منی لە نێو کەنیزەکانم هەڵگرت و ڕفاندمی و وە حەوان کەوت. هەر پێشـی دەگوتم دەوڵەت خاتوون مەترسە و نیگەران مەبە. ئەرخەیان بە هیچ نییە. ئەوەندەی پێ نەچوو لەو کۆشکە دابەزین و ئەو شـتە هاتەوە بیچمی خۆی و بوو بە کوڕێکی جوانچاک و ڕەزاسـووک. پێی گوتم: «من دەناسی یا نە؟» گوتم: «گەورەم ناتناسـم.» گوتی: «ئەمن کوڕی ئەزرەقشـام. پاشـا جندۆکان و باوکم لە قەڵای قوڵزۆمە و شـەسـت هەزار جن لە ژێر فەرمان و ڕکێفی ئەو دان. ئەمن بەوێدا دەڕۆیشـتم کە تۆم دیت ئاشـقت بووم. ئیدی هاتمە خوارێ و لە نێو کەنیزەکانت هەڵم گرتی و هێنامی بۆ ئەو کۆشـکە قایمە هەتا دەسـتی ئینس و جینت پێ ڕانەگا. لە هێندیشـەوە هەتا ئێرە ڕێگای سـەد و بیسـت سـاڵەڕێیە و تازە ئەتۆ بیر لەوە مەکەوە کە چاوت بە شـار و وڵاتی خۆت بکەوێتەوە. بێدەنگ لە لای من دانیشـە و چیشـت دەوێ بۆت دێنم. دوای ئەوە منی لە ئامێز گرت و ماچی کردم.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! کچە بە ســـەیفولملووکی گوت کە کوڕی پاشـــای جندۆکان منی لە ئامێز گرت و ماچی کردم و پێی گوتم: «ئەلێرە دانیشـە و لە هیچ شـتێکیش مەترسـە. ئیدی منی لێرە دانا و بۆخۆی ون بوو. دوای ئیسـتێک هاتەوە ئەو فەرش و خوان و شـتەی هێنا. هەموو سـێشــەممەیەک دێتە لام نانم لەگەڵ دەخوا و لە باوەشـم دەگرێ ماچم دەکا و بێ ئەوەی داوای دیم لێ بکا دەڕوا. ئەمن هێشتا هەر کچم. باوکم ناوی تاجولملووکە و هێشتا هیچ هەواڵێکی لە من نییە. ئەوە بەسەرهاتی من بوو. جا ئەوجار نۆرەی تۆیە.

سەیفولملووک گوتی: «بەسـەرهاتی من زۆر دووردرێژە و دەترسـم سـەرقاڵ بین ئەو جندۆکەیە بێتەوە.» کچە گوتی: «نـا خەمـت نەبێ، ئیســـتێک پێش ئەوەی تۆ بێی لێرە ڕۆیشــتووە و هەتا ســێ ســـەممەی دیکەش نایەتەوە. بە خەیاڵێکی ئاســوودەوە دانیشـــە و بەســـەرهاتی خۆتم، لە ئەوەڵەوە تا کۆتایی بۆ بگێڕەوە.» ســـەیفولملووک دەســـتی کرد بە گێڕانەوە. کە گەیشـــــتە باســـــی بەدیعولجەمال کچە چاوی پڕ بوو لە ئاو و گوتی: «ئای بەدیعولجەمال، بڵێی قەد بیری من بکەی؟» دوای ئەوە دەستی کرد بە گریان. سەیفولملووک گوتی: «دەوڵەت خاتوون، ئەتۆ ئینس و ئەو جین شتی وا چۆن دەبێ ئەو خوشکی تۆ بێ؟»

دەوڵەت خاتوون گوتی: «ئەو خوشـــکی شـــیریمە. هۆیەکەشـــی ئەوە بوو، کە دایم بۆ ســــەیران چووبووە بـاخ و لەوێ ژانی پێدا دێ و منی دەبێ. ڕێکەوت وا دەبێ، دایکی بەدیعولجەمـال لەگەڵ خزمەتکـارەکـانی لەوێ دەبێ، ئەویش ژانی پێدا دێ و لەو بـاخە بەدیعولجەمالی دەبێ. یەک دوو کەس لە کەنیزەکانی دەنێرێتەوە لای دایکم داوای هێندێک خواردن و شـــتی وا دەکا. هەرچی ویســـــتبووی دایکم بۆ دەنێرێ. ئەویش هەڵدەســــتێ بەدیعولجەمال لە باوەش دەگرێ و دێ بۆ لای دایکم. دایکم شـــــیر دەدا بە بەدیعولجەمال. دایکی بەدیعولجەمال دوو مانگ لە لای دایکم دەمێنێتەوە و پاشان دەڕواتەوە بۆ شوێنەکەی خۆیان. شـتێکی بۆ یادگار داوە بە دایکم و پێی گوتووە کە هەر کاتێک بیری منت کرد. هەر لەو باخەدا دێمە لات و یەکتر دەبینین. بەدیعولجەمال لەگەڵ دایکی دەهاتن. ماوەیەکی زۆر لە لامان دەمانەوە و دەڕۆیشـتنە بۆ وڵاتی خۆیان. سـەیفولملووک ئەگەر من لە لای دایکم بایەم تۆم لەوێ دیتبا ئەوە فکرێکم بۆ دەکردییەوە و تۆم بە ئاوات دەگەیاند. بەڵام ئێســــتا من ئەوە لێرەم و بـابیشــــم هەواڵی منی نییە. ئەگەر بیزانی بـا دەیتوانی ڕزگـارم بکـا. ســــەیفولملووک گوتی: «هەســـتا بە لێرە بڕۆین و لە ســــەر خودا ڕوو لە جێیەک بکەین. بزانین خودا کوێمان بە قسمەت دەکا.

دەوڵەت خاتوون گوتی: «ناتوانین بچین بۆ هیچ کوێ. چونکە ئەگەر یەک ســــاڵەڕێش

دوور کەوینەوە، ئەو گلاوە خێرا دەگاتە سەرمان و لەجێوە دەمانکووژێ. سەیفولملووک گوتی: «ئەمن لە شوێنێک بۆی دەچمە بۆسەوە هەر بە لامدا هات بە شیر لێی دەدەم دەیکووژم. دەوڵەت خاتوون گوتی: «تۆ ناتوانی ئەو بکووژی مەگەر ئەوەی کە گیانی دەرکێشی.» سەیفولملووک گوتی: «گیانی لە کوێیە؟» کچە گوتی: «ئەمن زۆر جاران لێم پرسیوە کە گیانی تۆ لە کوێ دایە کەچی پێی نەگوتووم. ڕۆژێکی زۆرم پێداگری کرد. توورە بوو گوتی: «تۆ پرسیار لە شوێنی ڕووحی من دەکەی؟» گوتم: «ئەمن جگە لە تۆ کەس شک نابەم و تا دنیاش بە دنیا بێ تازە هەر لەگەڵ تۆ و ڕووحی تۆدا دەژیم. ئەگەر من بە شوێنی ڕووحی تۆ بزانم ئەوە دایمە پێوەندی پێوە دەکەم و لە ئامێزمدا دەبێ و وەک چاوم دەیپارێزم.»

ئەوجار گوتی: «کاتێک من لە دایک بوو، ئەستێرەناسان گوتیان کە من بە دەستی پاشازادەیەکی ئینسی دەکوژرێم. هەر بۆیە ئەمن ڕۆحی خۆم خستە ناو جیکەڵدانەی مەلیچکێکەوە[1] مەلیچکەکەم خستە ناو قوتوویەک و قوتووەکەشم خستە نێو حەوت مجرییەوە و لە قەراخ ئەو دەریایە خستمە ژێر بەردێکی ڕوخامەوە[2] چونکە ئەو بەرەی دەریا لە ئینسان دوورە، کەس لەوان ڕێی ناکەوێتە ئێرە. ئەوە لە لای تۆ باسم کرد. ئیدی تۆ بۆ کەسی نەگێڕییەوە. با وەک نهێنییەک لە بەینی خۆماندا بمێنێتەوە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. مەلیچک: چۆلەکە.

[2]. ڕوخام: جۆرە بەردێکە وەک بەردی مەڕمەڕ.

## که شەوی حەوسەد و حەفتایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! دوای ئەوەی دەوڵەت خاتوون شـــوێنی رووحی جندۆکەکەی بە سەیفولملووک گوت، ئینجا گوتی: «ئەمن بەو جندۆکەیەم گوتووە کە من کەس نابینم تا ئەو نهێنییەی لا بدرکێنم. بەڵام بە راســتی ئەتۆ رۆحی خۆت لە شــوێنێکی ئەوەندە قایم داناوە کەس دەســتی پێی راناگا. خۆ ئەگەر بە وتەی ئەســتێرەناســان ئینســانێک بێتە ئێرەش خۆ نــاتوانن زەفەرت پێ بەرن. جنــدۆکەکە گوتی: «ئەی ئەوە هــاتوو کەســــێک بێتە ئێرە ئەنگوســتیلەی حەزرەتی ســولەیمانی لە دەســتدا بوو؟» ئینجا ئەو دەســتەی کلکەوانەکەی تێدایە لە ســـــەر ئاو دانێ و بڵێ خودایە لەبەر حورمەتی ئەو ناوانە رووحی فلانکەس بێتە دەرێ. لەرێوە بە ئەمری خودا مجرییەکە بێتە دەرێ و ئەویش مجرییەکە بشـــکێنێ و قووتووە چۆلەکەکە دەرێنێ گیانی من لە جیکەڵدانەی بێنێتە دەرێ. بە ئازاد بوونی رووحم من لێرە بمرم. ســــەیفولملووک گوتی: «دەوڵەت خاتوون ئەو شـــازادەیە منم و ئەوەش کلکەوانەی سولەیمانە لە قامکی من دایە. هەستا با بچین بۆ قەراخ دەریا بزانین راست دەکا یان درۆ. ئیدی هەر ئەو کاتە هەرکیان هەستان و رۆیشتن تا گەیشتنە قەراخ دەریا.

دەوڵەت خاتوون لە قەراخ دەریا راوەســـتا و ســــەیفولملووک تا نێو قەدی چوو لە ئاوەکەوە و گوتی: «خودایە بۆ خاتری ئەو ناوانەی کە لەو ئەنگوســـتیلەدا نووســـراوە و لەبەر خاتری حەزرەتی سولەیمان گیانی کوڕی ئەزرەقشا بێتە دەرێ. دەریا جووڵا و پێڵی دا و مجرییەکەی دا دەرێ.

ســـەیفولملووک مجرییەکەی گرتەوە و شـــکاندی و چۆلەکەی لە قوتووەکە دەر هێنا و لەگەڵ دەوڵەت خاتوون گەڕانەوە بەرەو کۆشــک. چوونەوە ســـەر تەختەکە. لەو جەنگەیەدا باڵندەیەکی گەورە وە دەر کەوت لە دوور دەیگوت: «شازادە مەمکووژە هەر ئاواتێکی هەت بێ بۆت وەدی دێنم.» دەوڵەت خـاتوون گوتی: « ســـــەیفولملووک ئەوە دێوەکەیە خێرا چۆلەکەکە بکوژ. دەنا بێتە کۆشکەوە چۆلەکەکەت لێ دەستێنێ و دەیرفێنێ. پاشان منیش و تۆش دەکووژێ. ســــەیفولملووک خێرا مەلیچکەکەی کوشـــت و هەر لەجێوە جندۆکەکە کەوتە عەرزی و بوو بە خۆڵەمێش. دەوڵەت خـاتوون گوتی: «خودای مەزن ئێمەی لە دەســـت ئەو دێوە رزگار کرد. ئەدی ئەوجار چ بکەین؟» ســـەیفولملووک گوتی: «رزگاری ئێمە بە دەست خودایە.» دوای ئەوە سەیفولملووک هەستا دەرگا و شتەکەی کۆشکی لێ کردەوە کە هەمووی لە داری بۆنخۆش و تایبەت چێ کرابوون بەو داروتەختانە و قوماشی حەریر، هێنای دارچەپەرێکی ســـاز کرد و لەگەڵ دەوڵەت خاتوون بردی لە قەراخ دەریا بەستییەوە. ئینجا لەگەڵ دەوڵەت خاتوون گەڕانەوە ناو کۆشک و ئەوەی بە وەزن سووک

و به قیمەت گران بوو هەڵیان گرت و بردیانە ســــەر دارچەپەرەکە ئەوەندەی بۆیان چوو خواردەمەنیشــیان برد و بۆخۆشــیان ســوار بوون و وەڕێکەوتن. تا چوار مانگ بە دەریادا ڕۆیشـــتن، وای لێ هات، خواردەمەنیان لێ بڕا و تووشـــی مەینەت بوون و کەوتنە پاڕانەوە لە خودا. لەو ماوەیەدا هەر کاتێک ســــەیفولملووک دەخەوت پشـــتی لە دەوڵەت خاتوون دەکرد.

شــەوێک لە شــەوان ســەیفولملووک خەوتبوو، دەوڵەت خاتوون بە خەبەر بوو، لە پڕدا ســەیری کرد دارچەپەرەکەیان بەرەو ویشـکی دەڕوا. دوای ئەوە کەشـتیگەلێکی دیت لەوێ لەنگەریان گرتبوو. کابرایەک بە دەنگێکی بەرز قســـەی بۆ کەشـــتیوانێک دەکرد. دەوڵەت خاتوون کە ئەوانەی دیت زانی گەیشـــتوونەتە ئاوەدانی و شـــارێکی قەراخ دەریا. لە ڕادە بەدەر خۆشـــحاڵ بوو، ســـەیفولملووکی لە خەو هەســـتاند و پێی گوت: «هەســـتە بچۆ لەو کەشـتیوانە پرســە بزانە ئێرە کوێیە و ناوی ئەو شــارە چییە. ســەیفولملووک لە خۆشـیان شاگەشکە بوو. هەستا چوو لە پاپۆڕڤانەکەی پرسی ئەو شارە کوێیە و نێوی ئەو بەندەرە چییە؟ ناوی پادشـــای ئەو شـــارە چییە؟» پاپۆڕڤانەکە گوتی: «گەوجە ئەگەر تۆ ناوی ئەو شـــارە نازانی چۆن هاتوویە ئێرە؟» ســـەیفولملووک گوتی: «ئەمن غەریبم و لە کەشـــتی بازرگاناندا بووم کە کەشتییەکەمان شکا و هەرچی لە کەشتییەکەدا بوو نغرۆ بوو. ئەمن بە تەختەیەک گەیشـــتمە ئێرە بۆیە لە تۆ دەپرســـم. پرســـیارەکەی منت پێ ســـەیر نەبێ. پـاپۆڕڤـانەکە گوتی: «ئەو شـــــارە عەمـارییەیە و بەو بەنـدەرەش دەڵێن بەنـدەری بەینولبەحرەین.» دەوڵەت خاتوون ئەوەی بیســـت لە خۆشـــیان خەریک بوو باڵ بگرێ. ســپاســی خودای کرد. ســەیفولملووک گوتی: «ئەوە بۆ ئاوا خۆشــحاڵ بووی؟» دەوڵەت خاتوون گوتی: «سەیفولملووک مزگێنیم دەیە پاشای ئەوە شارە مامی منە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەوسەد و حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! دەوڵەت خاتوون گوتی کە پاشـــای ئەو شـــارە مامی منە و ناوی عالییەلملووکە. دوای ئەوە بە سەیفولملووکی گوت: «لەو سەرۆکە پرسە بزانە عالییەلملووک ساغ و سەلیمە؟» سەیفولملووک پرسیاری لێ کرد. پاپۆڕڤانەکە توورە بوو گوتی: «خۆ ئەتۆ دەتگوت قەت نەهاتوومە ئێرە و غەوارە و لاوەکیم. ئەی چۆن ناوی پاشای ئەو شارە دەزانی؟» کە پاپۆڕڤانەکە ئاوا قسەی کرد ئەوەندەی دیش خۆشحاڵ بوو، ناسییەوە ئەوە کەشتیوانی بابیەتی و ناوی موعینەددینە. موعینەددین بە دوای دەوڵەت خاتووندا گەڕابوو، هاتبووە ئێرەش کە شاری مامی دەوڵەت خاتوون بوو.

دوای ئەوە بە سەیفولملووکی گوت: «پێی بڵێ، بڵێ موعینەددین وەرە خانم کاری پێتە.» سەیفولملووک چوو پێی گوت: «موعینەددین خانم دەڵێ هەتا ئێرە وەرە کارم پێتە.» کەشتیوانەکە زۆر توورە بوو گوتی: «گلاو ئەتۆ نێوی من لە کوێوە دەزانی. ئینجا ڕووی لە هاوکارەکانی کرد گوتی: «دا دارێکم دەنێ با دارکاری کەم.» دارێکیان دایە، کە دارەکەی وەر گرت لێی چووە پێشێ بۆ لای دارچەپەرەکە، لە پڕ لە سەر دارچەپەرەکە دموچاوێکی دیت وەک مانگ شۆقی دەداوە. کە جوان لێی ورد بووەوە ناسییەوە کە دەوڵەت خاتوونە. ئیدی لە سەیفولملووکی پرسی: «کێت لەگەڵە؟» سەیفولملووک گوتی: «کچێکم لەگەڵە ناوی دەوڵەت خاتوونە.» کە پاپۆڕڤانەکە ئەو ناوەی بیست تەواو زانی کە ئەوە خانمی خۆی و کچی پاشاکەیانە. لە خۆشیان لە هۆش خۆی چوو، کەوت. کە وە هۆش هاتەوە هەستا چوو بۆ ناو شار و چووە کۆشکی پاشا و ڕوخسەتی چوونە ژووری ویست. دەرکەوان چووە لای پاشا و پێی گوت: «موعینەددینی پاپۆڕڤان هاتووە هەواڵێکی خۆشت پێ ڕاگەیەنێ. پاشا فەرمانی دا بابێتە ژوور. پاپۆڕڤان چووە لای پاشا و کڕنۆشی برد و پێی گوت: «پاشا مزگێنیم دەیە کە دەوڵەت خاتوونی برازات بە ساغ و سلامەتی گەیشتە ئێرە و کوڕێکی گەنجی وەک مانگیشی لەگەڵە.

پاشا کە هەواڵی برازاکەی بیست زۆر خۆشحاڵ بوو دیاری و خەڵاتی گرانبایی دا بە پاپۆڕڤانەکە و فەرمانی دا شار برازێننەوە. ئینجا فەرمانیدا بچن ئەو و سەیفولملووک بێننە کۆشک، لەوەی کە ساغ و سەلیمن پیرۆزبایی لێ کردن و سپاسی خودای کرد. دوای ئەوە کەسێکی نارد بۆ لای براکەی هەتا لە هاتنەوەی کچەی ئاگاداری کەنەوە. کاتێک هەواڵبەرەکە گەیشتە لای بابی دەوڵەت خاتوون، خێرا کەلوپەل و پێداویستی سەفەر ئامادە کرا و لەشکر ڕێکخرا و کەوتنە ڕێ، بۆ دیتنی دەوڵەت خاتوون بەرە و شاری براکەی کەوتە ڕێ. ڕۆیشتن و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شاری براکەی و بە دیداری کچەکەی شاد

بوو. حەوتووەیەک لەوێ مانەوە و پاشان کچەکەی و سەیفولملووکی هەڵگرت و گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆی سەرانديب. کچەش لەگەڵ دایکی پێک شاد و شکوور بوون. ئەوەی کە هەموو لایەک ساغ و سلامەت بوون هەموویان زۆر خۆشحاڵ بوون و شادیان گێڕا.

تاجولملووکی باوکی دەوڵەت خاتوونیش زۆری ڕێز لە سەیفولملووک گرت و پێی گوت: «ئەتۆ چاکەیەکی زۆرت لەگەڵ من و کچەکەم کردووە و نازانم چۆن وەڵامی ئەو هەموو چاکەیەت بدەمەوە هەر بۆیە داوات لێ دەکەم وەرە لە جێی من لەسەر تەخت دانیشە و ئەوە دەسەڵات و بەڕێوبەرایەتی هێندم پێ بەخشیت. خەزێنە و خزمەتکارەکانم هەمووی پێشکەشت بێ. سەیفولملووک پێچکەی کورسی دەسەلاتی ماچ کرد و گوتی: «پاشای زەمان ئەوەی پێشکەشی منت کرد ئەوە قەبووڵم کرد و هەموویم پێشکەشی جەنابت کردەوە. بەڵام پاشای مەزن من دیاری و دەسەڵاتم ناوێ، بەس ئاواتێکم هەیە هیوادارم خودا بەو ئاواتەم بگەیەنێ.

پاشا گوتی: «دەی ئەوە خەزێنە لە بەر دەستت دایە و ڕاوێژیش لەگەڵ من مەکە. سەیفولملووک گوتی: «پاشای خۆشەویست ئەمن پێویستیم بە ماڵ بۆ ئەوەی بە مرادم بگەم. بەڵام ئێستا هەر ڕێم بدە لەو نێو شارەدا بسووڕێمەوە و بە کۆڵان و شەقامەکانیدا بگەڕێم و چاوێک لە وڵات بکەم.

تاجولملووک فەرمووی ئەسپێک لە باشترین ئەسپەکانی بۆ تەیار کەن و بۆی بێنن. لەڕێوە باشترین ئەسپیان بە زین و لغاوەوە بۆ هێنا. سەیفولملووک سواری ئەسپەکە بوو. بە کۆڵان و شەقامی شاردا دەگەڕا و بەولا و لادا چاوی دەگێڕا. لە پڕ چاوی بە لاوێک کەوت کە کەوایەکی پێ بوو دەیفرۆشت و هەرای دەکرد داوای پازدە دیناری لێ دەکرد. کە جوان سەرنجی دایە وەک ساعدی برای هاتە بەر چاو، هەر ئەوەندە بوو کەمێک ڕواڵەتی تێک چووبوو ئەویش دەبێ لەبەر غەریبی و هەڵوەدا بوونی بێ. سەیفولملووک بەو خزمەتکارانەی لەگەڵی بوو گوت: «دا بچن ئەو گەنجەم بێنن، کارم پێیەتی.» کە لاوەکەیان هێنا، ناسییەوە و گوتی: «بیبەن بۆ ئەو کۆشکەی منی لێم. تا من کەمێکی دیکە دەگەڕێم. ئەوان پێیان وا بوو کە پاشا گوتوویە بیبەن بەندی کەن، وەیان زانی ئەوە یەکێک لە کۆیلەکانی بووە و رایکردووە. هەر بۆیە گرتیان و بردیانە بەندەوە کۆت و زنجیریان کرد. کاتێک سەیفولملووک لە گەڕان هاتەوە و چووەوە کۆشکەکەی خۆی ئیدی ساعدی لە بیر چووەوە و کەسیش وەبیری نەهێناوە. ساعد لە بەندا ماوە. کاتێک دیلەکانیان هێنا بۆ کاری بیناسازی ساعدیشیان هێنا و لە کاری بیناسازیان وەر دا. ئیدی بەردەوام لەگەڵ دیلەکاندا خەریکی کار بوو تا تەواو گیانی پیس بوو و مانگێکی ئاوا تێ پەڕاند. سەری لە کاری خۆی دەرنەدەچوو، پێی سەیر بوو باشە بۆ لە خۆڕا بەندیان کرد؟!

کورتی کەینەوە، سـەیفولملووک بەردەوام خەریکی کەیف و خۆشـی خۆی بوو، هەتا ڕۆژێک دانیشـتبوو بیری دەکردەوە کە سـاعدی وەبیر هاتەوە. بە خزمەتکار و شـتەکەی گوت: «ئەو کوڕەی ئەو ڕۆژە بە ئێوەم سـپارد، بچن بیهێنن.» ئەوانیش گوتیان: «قوربان مەگەر تۆ پێت نەگوتین بیبەین بیخەینە بەندیخانەوە؟» سـەیفولملووک گوتی: «ئەمن بە ئێوەم گوت بیبەنە ئەو کۆشـکەی منی لێم.» لە ڕێوە پیاوەکانی نارد سـاعدیان هێنا و کۆت و زنجیریان لە ئەسـتۆ و قاچی داماڵی. سـەیفولملووک گوتی: «گەنجۆ لە کام شـارەوە هاتووی؟» سـاعد گوتی: «لە شـاری میسـرەوە و ناوم سـاعدە؛ کوڕی وەزیر فارسـم. سـەیفولملووک کە ئەوەی بیست لە سـەر تەختەکەی هاتە خوارێ و لە باوەشـی گرت و لە خۆشـیان دەسـتی کرد بە گریان و گوتی: «براکەم، ساعد گیان شـوکر و سـپاس بۆ خودا نەمردم و ئەو جارەش تۆم دیتەوە. ئەوە نامناسـییەوە، من براکەتم. سـەیفولملووکی کوڕی عاسمشا. کە ساعد ئەو وتەیەی بیست. دیسان باوەشیان پێکدا گرتەوە و دەستیان کرد بە گریان. ئەوانەی لەوێ بوون سەریان سووڕ مابوو.

دوای ئەوە سـەیفولملووک فەرمانی دا سـاعد بەرنە گەرماو. خزمەتکارەکان بردیانە گەرماو کە هاتە دەرێ، جل و بەرگی حەریریان کردە بەری و هێنایانەوە لای سەیفولملووک. سـەیفولملووک لە سـەر تەختەکەی لای خۆی داینا. تاجولملووک بەو هەواڵەی زانی و هاتە لایان. بە دیتنی ئەوان کە لە پەنا یەک دانیشتبوون زۆر خۆشحاڵ بوو. ئەویش هات لە لایان دانیشت و سێ بە سێ دەستیان کرد بە قسە و باس.

ساعد گێڕاوە کە کاتێک کەشتییەکەیان نوقم بوو، تەواوی کۆیلەکان تێدا چوون و من و چەند کۆیلە خۆمان بە تەختەیەکەوە گیرساندەوە هەر لە سەر ئەو تەختەیە بووین کە بەدەم با و پێلانەوە ڕۆیشـتین هەتا گەیشـتینە دورگەیەک. چووینە ناو دورگەکەوە و خەریکی میوەخواردن بووین کە لەپڕدا هێندێک دێوەڵەمان لێ پەیدا بوو سواری قەڵاندۆشمان بوون و پێیـان گوتین ئێوە کەری ئێمەن. بە کەیفی خۆیـان بۆ ئەملا و ئەولایـان دەبردین. ئەمن بەوەی سەر قەڵاندۆشم گوت: «ئەتۆ کێی و بۆ سواری قەڵاندۆشی من بووی؟» کە من وام گوت، لاقی بە جۆرێک لە ملم هـاڵاند و لە قوڕقوڕۆچکەمی تونـد کرد، هەر خەریـک بوو بخنکێم. بە لاقەکەی دیکەی وەک قامچی لە پشـتمی دەدا. تا وای لێ هات کەوتم. کە کەوتم، زانی هێزم لە بەردا نییە و برسـیمە. لەڕێوە دەسـتی گرتم و بردمی بۆ لای دارێک کە بەرێکی زۆری پێوە بوو. پێی گوتم: «لە بەری ئەو دارە بخۆ تا تێر دەبی. ئەمن تێرم لەو میوەیە خوارد و لە خۆڕا ڕۆیشـتم. هێشـتا چی وا نەڕۆیشـتبووم کە ئەو شـتە هاتەوە و سواری شانم بووەوە. تاوێک دەڕۆیشتم و تاوێک غارم دەدا. ئەویش پێ دەکەنی و دەیگوت بە ژیانم کەری وەک تۆم نەدیوە.

ڕۆژێـک لە ڕۆژان کەمێکمـان ترێ ڕنی و لە قولکەیەکـدا کۆمـان کردەوە و بە قـاچ

کەمێکمان شـێلا. بەینێکی پێ چوو، ببوو بە شـەڕابێک پیاوی دەخسـت. لەو شـەرابەمان خواردەوە و مەست بووین. سەر کوڵمەکانمان سووڕ هەڵگەڕا و ئەوەندە سەرخۆش بووین سەمامان دەکرد و سترانمان دەچڕی. ئەو گوتی ئەوە چییە وا ئێوەی ئاوا جوان کرد و وە سەمای خستن؟» ئێمەش گوتمان: بۆ دەپرسن؟ گوتیان: «پێمان خۆشە بزانین.» گوتمان: «ئەوە دۆشاوی ترێیە.» ئیدی ئێمەیان بردە دەشتێک کە ئەوسەرەوەسەری دیار نەبوو. ڕەزێکی ئەوەندە زۆر بوو سەیر، هەر مێوەی چەندین هێشووی گەورەگەورەی پێوە بوو. گلارەکانی بە قەد دەنکە خورمایەک دەبوو. چا شیرین!!.

پێیان گوتین لەو ترێیانە بڕنن. ترێیەکی زۆرمان ڕنی، لەوێ قوڵکەیەکی گەورەی لێ بوو بە قەد حەوزێک دەبوو ترێکەمان لەوێ کرد و بە لاق شـێلامان و ماوەیەکی زۆر دامان نا بمێنێتەوە. تا ببێ بە شەرابێکی خۆش. بوو بە شەرابێکی خۆش. وەک شەرابی حەوت ساڵە. پێم گوتن: «ئەو شـەرابە کاتییەتی، بەڵام دەبێ پیاڵەیەک ببێ پێی بخۆنەوە. لە پێشدا کەری وەک ئێوەمان لە لا بوو. ئەوانمان خوارد و ئێستا کاژەڵەسـەرەکەیان ماوە، بۆمان لەوان کەن. ئێمەش بۆمان تێ کردن. ئەوەندەمان شـەراب دانێ هەتا هەموویان بە لادا هاتن و خەویان لێ کەوت. دوو سـەد کەسێک بوون. ئێمە گوتمان وا دیارە هەر بە سـواربوون لە کۆڵمان نابنەوە دەشمان خۆن. وا باشە تەواو مەستیان کەین و بیان کووژین و ڕزگارمان بێ. ئینجا هەڵمان هەسـتاندن و پیاڵە بە دوای پیاڵە بۆمان تێ کردن. تا وایان لێ هات، ئەوەی هێز و توانا بوو، تێیاندا نەما. ئینجا دەستمان گرتن و هەموویانمان برد لە شوێنێک خستماننە سـەر هێندێک چرپی و چاڵ و ئاگرمان دان. خۆشـمان لە دوور ویسـتاین و سەیرمان کردن بزانین بە کوێ دەگەن.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ساعد گوتی: «ئەمن لەگەڵ هاوڕێکانم ئاورمان لە چرپی و دارەکان بەردا و بۆخۆمان لە دوور ڕاوەستاین. پاشان چووینە پێشێ سەیرمان کرد هەموویان بوون بە خۆڵەمێش. ئیدی زۆر خۆشحاڵ بووین و شوکری خودامان کرد. لەو دورگەیە هاتینە دەرێ و چووینە قەارغ دەریا و لە یەک جیا بووینەوە. ئەمن و دوو دانە لە کۆیلەکانم ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە بێشە و دارستانێک. کە پڕ بوو لە داری بەری. ئێمە خەریک بووین میوەمان دەخوارد کە لە دوور کەسێکمان دیت. گوێچکەی پان و درێژ بوو چاوەکانی وەک ئەستێرە دەدرەوشانەوە مێگەلە مەڕێکی پێ بوو دەیلەوەڕاندن.

کە ئێمەی دیت لە دوور کەیفی ساز بوو بانگی کردین و گوتی: «وەرن میوانم بن با مەڕێکتان بۆ بکوژمەوە. ئێمەش چووین بۆ لای. ئەشکەوتێکی پێشان داین و گوتی: «بچنە ژوورێ جگە لە ئێوە میوانگەلێکی زۆری دیشی لێیە. ئێمە باوەڕمان بە وتەکەی کرد و چووینە ژوورێ کە چووین سەیرمان کرد. هەموو میوانەکان کوێرن. کاتێک هەستیان کرد ئێمەش چووینە ئەوێ. گوتیان: «ئێوە کێن؟» گوتمان: «میوانین.» گوتیان: «ئەوە چۆن بە دەست ئەو گڵاوەوە گیرتان کرد؟ خۆ ئەوە درنجە و مرۆڤ دەخوا. ئەوە ئێمەشی کوێر کردووە و بە تەمایە بمانخوا.» ئێمەش گوتمان: «ئەو گەمارە چۆنی ئێوە کوێر کردووە؟» گوتیان: «هەر ئێستا ئێوەش کوێر دەکا.» گوتم: «باشە چۆنم کوێر دەکا؟» گوتیان: «جامێکتان شیر بۆ دێنێ و دەڵێ ماندوو و برسین جارێ دانیشن ئەو شیرە بخۆنەوە هەرکە شیرەکەتان خوادەوە کوێر دەبن.» ئەمن کە ئەوەم بیست، گوتم بە خودا تازە تێکەوتووین دەبێ فکرێک بکەمەوە. بە لەز لە پەنا خۆمەوە قوڵکەیەکم هەڵکەند و لەسەر دانیشتم. کەمێکی پێ چوو، ئەو گڵاوە هات و چەند جامی شیر پێ بوو. جامێکی دا بە من. هەریەکی جامێکیشی دا بە هاوڕێکانم و پێی گوتین: «ئێوە ماندوو و تینوو بوون لەو دەشتە. سەر و جامێک شیر بخۆنەوە هەتا گۆشت مەڕیشتان بۆ دەبرژێنم. ئەمن شیرەکەم لێ وەر گرت و بۆ لای دەمم برد. پاشان بە دزی لە قوڵکەکەی بن خۆم کرد. دیسان جامەکەم بۆ لای دەمم بردەوە و وەک ئەوەی بڵێم تەواوم کرد. ئینجا دەستم کرد بە هاتوهاوار و گوتم: «ئەی چاوم، ئەی چاوم کوێر بووم، ئەی چاوم کوێر بوو.» ئیدی هەردووک دەستم بە چاومەوە گرت و دەستم کرد بە گریان. ئەو گڵاوەش پێم پێ دەکەنی و دەیگوت مەترسە.

هاوڕێکانیشم کە خواردیانەوە، لەڕێوە کوێر بوون. ئەو درنجە پیسە هەستا چوو دەرگاکەی پێوەدا و هات بە لامەوە تاقیم کاتەوە، سەیری کرد لەڕ و لاوازم و گۆشتێکی

وام پێوە نییە. چوو بە لای یەکی دیکەوە دیار بوو ئەوی پێ لە من بە کەیفتر و قەڵەوتر بوو. دوایە هەستا سێ مەڕی سەر بڕی و کەوڵی کردن. گۆشتەکەی لەت لەت کرد و چوو شیشی ئاسنی هێنا و گۆشتەکەی پێوە کرد و لە سەر ئاوری دانا و سووری کردنەوە. پاشان هێنای و دای بە هاوڕێکانم ئەوانیش خواردیان. درنجەکەش لەگەڵ ئەوان خواردی. گۆزەڵەیەکی شەراب هێنا و ئەویشی خواردەوە و خەوت. ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم: «هەتا لە خەودایە، دەبێ بیکووژم. بەڵام چۆنی بکووژم؟» لەو جەنگەیەدا شیشە ئاسنەکانم وەبیر هاتەوە. لەجێوە هەستام چووم، دوو دانە شیشم هێنا، لە سەر ئاورەکە دامنا و لێی گەڕام هەتا جوان سوور بوونەوە. وەک دندووکی کەو. ئیدی دەستم دانێ و لە دێوە نیزیک بوومەوە و لە هەردووک چاویم ڕۆ کرد و توند دامگرت. دێوە یەک بە خۆی هۆڕاندی و ڕاستەوە بوو. بەو حاڵەوەش خەریک بوو بم گرێ. بەملاولادا هەڵاتم، کەلێنێک لەوێ بوو چووم لە وێوە سەیرم کرد دیوێک بوو شیرێکی لێ بوو شیرەم هێنا و لە پشتەوەڕا دام هێنایە و دوو قاشم کرد. ئێنجا هاواری کرد تازە منت کوشتووە یەکی دیکەشم لێدە با نەجاتم بێ. یەکێک لە کوێرەکان هەرای کرد لێی نەدەی زیندوو دەبێتەوە و هەموومان دەکووژێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ساعد گوتی: «ئەو کابرایە کە هەرای کردم چی دیکەی لێ مەدە بە قسەم کرد و دەستم ڕاگرت. ئیدی دێوە تۆپی. ئەو کابرایە گوتی هەستە دەرگای ئەشکەوتەکە بکەوە و با لێرە بچینە دەرێ. دەشقم خودای گەورە ڕێیەکمان پێشان بدا. ئەمن گوتم: «تازە هیچ مەترسییەک نەماوە. با بۆخۆمان لێرە لەو مەڕانە سەر بڕین و گۆشتەکەیان بخۆین و لەو شەرابەش بخۆینەوە.» ماوەی دوو مانگ لەو شوێنە ماینەوە هەتا وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان لە قەراخ دەریا دانیشتبووین کە کەشتییەکی گەورە لە دوور وەدەر کەوت. ئێمە بە هەراکردن و دەست و شت ڕاوەشاندن کەشتیسوارەکانمان حاڵی کرد. بەڵام ئەوان ناوبانگی ئەو دێوە مرۆخۆرەیان بیستبوو دەترسان، نەیاندەوێرا بێن. بە تەما بوون هەڵێن. هەتا ئاخر بە هەر جۆرێک بوو تێمان گەیاندن کە ئێمە مرۆڤین و دێومان لەگەڵ نییە. یەکێک لە ئەندامانی ناو کەشتییەکە بە هاوڕێکانی گوت: «ئەوانە مرۆڤن و شێوەی دێوان نادەن.» ئیدی وردەوردە هاتن و لێمان نیزیک بوونەوە تا تەواو دڵنیا بوون کە مرۆڤین. ئەوجار هاتن و سڵاویان کرد. ئێمەش وەڵامی سڵاوەکەمان دانەوە و مژدەمان دانێ کە دێوەکەمان کوشتووە. ئەوجار خواردەمەنی و بژیوی ڕێگایەمان لە دورگەکە کۆ کردەوە و سواری کەشتییەکە بووین. هەتا سێ ڕۆژان بایەکی خۆشی دەهات. دوای ئەوە بایەکەی توند کرد و تاریکی ئاسمانی داگرت. ئەوەندەی پێ نەچوو با پاپۆڕەکەمانی بە کێوێکدا دا و پاپۆڕ شکا و تەختەکانی لە بەر یەک بڵاو بوو. چارەنووس وا بوو من خۆم بە تەختەیەکەوە گرتەوە و چوومە سەری دانیشتم. دوو ڕۆژ بە سەر ئەو تەختەوە بەدەم با و شەپۆلانەوە ڕۆیشتم هەتا بە سڵامەتی گەیشتە قەراخی ئەم شارە و ڕزگارم بوو. لێرەش نامۆ و تەنیا نەمدەزانی چ بکەم و ڕوو لە کوێ کەم. لە برسان برستم لێ بڕابوو. ئیدی هەستام کەواکەم داکەند و هاتم بۆ بازاڕ بیفرۆشم و بیدەم بە خواردەمەنی و شت. خەڵکم تێ ئاڵابوو کە چاویان لە کەواکە دەکرد، وا بوو لەو جەنگەیەدا ئەتۆ هاتی فەرمووت بمبەنە کۆشک. کۆیلەکانت خستیانمە بەندەوە و ئەتۆش منت لە بیر چووبوو. هەتا ئاخری ئەوە ئەورۆ منت وەبیر هاتووەتەوە بانگت کردوومەتە ئێرە. ئەوە بوو بەسەرهاتی من.

کاتێک سەیفولملووک و تاجولملووکی باوکی دەوڵەت خاتوون بەسەرهاتی ساعدیان بیست، سەریان سووڕ ما. پاشان تاجولملووک شوێنێکی شیاوی بۆ سەیفولملووک و ساعدی برای دابین کرد. دەوڵەت خاتوون بەردەوام دەهات و سپاسی گەورەیی و یارمەتییەکانی سەیفولملووکی دەکرد. ڕۆژێک وزیر ساعد بە دەوڵەت خاتوونی گوت: «داوامان لە تۆ ئەوەیە کارێک بکەیت سەیفولملووک بە ئاواتەکەی بگا. دەوڵەت خاتوون گوتی: «بەڵێ، دڵنیا بن من هەوڵی خۆم دەدەم بۆ ئەوەی ئەو بە ئاواتەکەی بگا.» ئینجا

ڕووی لە سـەیفولملووک کرد و گوتی: «ئەرخەیان بە بە ئامانجت دەگەیەنم.» جارێ سەیفولملووک و ساعد لێرە بەجێ دێڵین.

شاژن بەدیعولجەمال کە هەواڵی هاتنەوەی خوشکەکەی واتە دەوڵەت خاتوونی بۆ ماڵە باوکی بیست، بۆ دیمانەتی هەستا چوو بۆ لای. کە لە شوێنی ئەو نیزیک بووەوە. شاژن دەوڵەت خاتوون هات بە پێشوازییەوە و سڵاوی لێ کرد. یەکتریان لە ئامێز گرت و پاشان دەستیان کرد بە قسەکردن. بەدیعولجەمال داوای لە دەوڵەت خاتوون کرد بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ بگێڕێتەوە. دەوڵەت خاتوون گوتی: «خوشکەکەم، ئەمن لە کۆشکێکی زۆر پتە و قایم و بە شکۆدا بووم. کوڕی ئەزرەق شا حەوتووی جارێک دەهات بۆ لام... ئینجا تەواوی بەسەرهاتەکەی ورد بۆ گێڕاوە. بەسەرهاتی سەیفولملووکیشی بێ زیاد و کەم هەمووی بۆ گێڕاوە. چۆنی کوڕی ئەزرەق شا کوشت و چۆن دارچەپەری چێ کرد هەمووی گێڕاوە. بەدیعولجەمال واقی وڕ ما.

دەوڵەت خاتوون گوتی: «خوشکم، دەمەوێ کاکڵە و هۆکاری بەسەرهاتەکانی سەیفولملووکت بۆ بگێڕمەوە بەڵام لە ڕووم نایە. بەدیعولجەمال گوتی: «شەرمی بۆ چییە؟ ئەتۆ خوشکی منی و لە نێوان دوو خوشکدا شەرمی پێ ناوێ. خۆ دەزانم ئەتۆ خراپەی منت ناوێ، دەیجا چی هەیە بی گێڕەوە. ئەی بە منی نەڵێی بە کێی دەڵێی؟» دەوڵەت خاتوون گوتی: «خوشکێ، وادیارە باوکت کەوایەکی بە دیاری بۆ حەزرەتی سولەیمان ناردووە، حەزرەتی سولەیمانیش ئەو کەوایەی لەگەڵ هێندێک دیاری و خەڵاتی دیکە داوە بە عاسمشا کوڕی سەفوان، پادشای میسر. عاسمشایش ئەوی بە دیاری داوە بە سەیفولملووکی کوڕی. سەیفولملووکیش کە کەواکە دەکاتەوە و دەیهەوێ لە بەر بکا وێنەکەی تۆ لەو کەوایەدا دەبینێ. ئاشق و ئەڤینداری تۆ دەبێ و هەڵدەستێ سەری خۆی هەڵدەگرێ و وەدەر دەکەوێ و لەبەر تۆ تووشی ئەو هەموو تووشی و مەینەت و چەرمەسەرییە دەبێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەوسەد و هەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! کاتێک دەوڵەت خاتوون، بەدیعولجەمالی لە ئەڤینی ســەیفولملووک ســەبارەت بەو ئاگادار کردەوە، بەدیعولجەمال ســەر گۆناکانی ســوور هەڵگەڕا و گوتی: «کاری ئەوا کەس نەیدیوە و نابێ. ئینس و جن قەت یەک ناگرنەوە.»

دەوڵەت خاتوون دەستی کرد بە پەسن و تاریفی جوانچاکی و خوێنشیرنی و ئازای و ڕەوشــت جوانی ســەیفولملووک. بەردەوام باســی تایبەتمەندییە باشــەکانی دەکرد و لە کۆتاییدا گوتی: «خوشکێ لە پێشدا لەبەر خودا و دوای ئەوە لەبەر دڵی من قسەی لەگەڵ بکە ئەگەر تەنیا یەک وشەش بێ.» بەدیعولجەمال گوتی: «ئەمن گوێم بەو قسانە نابزوێ و لێرەدا دڵت نەیشێ بە گوێت ناکەم. دەوڵەت خاتوون دەستی کرد بە پاڕانەوە و لالانەوە و تەنانت قاچی ماچ کرد و گوتی: «بەدیعولجەمال بیکە بۆ خاتری ئەو شــیرەی پێکەوە خواردوومانە، لەبەر خاتری ئەو وێنانەی لەســەر نەقیمەکەی حەزرەتی ســولەیمانن بێ قســەییم مەکە. چونکە من بەڵێنم پێداوە لەو کۆشــکە قایم و پتەوەدا چاوی بە تۆ بکەوێ. دەڵێم تۆخودا جارێک هەر جارێک خۆتی پێشان بدە و تۆش ئەو ببینە.

کورتی کەینەوە، دەوڵەت خاتوون هەر پاڕاوە و لالاوە و دەســت و قاچی ماچ کرد هەتا ئاخری بەدیعولجەمالی ڕازی کرد و گوتی: «لەبەر دڵی تۆ جارێک خۆمی پێشان دەدەم.»

ئەوجار دەوڵەت خاتوون دڵخۆش بوو، دەســت و قاچی ماچ کرد و هاتە دەرێ و چوو بۆ کۆشــکی گەورە کە لە نێوەڕاســتی باخ بوو. بە کەنیزەکانی گوت: لەوێ فەرش و شــت ڕاخەن و تەختی زێڕین و دەفری زێڕین ڕیز کەن. ئەوەی شــاژن فەرموو بووی کەنیزەکان جێبەجێیان کرد. ئینجا دەوڵەت خاتوون چوو بۆ لای ســەیفولملووک و ســاعد. بە سەیفولملووکی گوت موژدە وا ئێستا بە دیداری خۆشەویستەکەت شاد دەبی. ئێستا تۆ و براکەت ســاعد بچن بۆ باخ و خۆتان مەخەنە بەر چاوی خەڵک. هەتا ئەمن بەدیعولجەمال دێنم. سەیفولملووک هەستا لەگەڵ ساعد چوون بۆ ئەو شوێنەی کە دەوڵەت خاتوون بۆی دەســتنیشــان کردبوون. تەختی زێڕین و خواردن و شــەراب لەوێ ئامادە بوو. ماوەیەک دانیشــتن. دوای ئەوە ســەیفولملووک نەیتوانی خۆی بگرێ و لە تاوی خۆشــەویســتەکەی هەستا و بە نێوکۆی کۆشکدا هاتە درێ. ساعدی براشی وە دوای ئەو کەوت. سەیفولملووک گوتی: «براکەم، تۆ لە جێی خۆت مەبزوو هەتا منیش دێمەوە لات.

ســاعد دانیشت و ســەیفولملووک چووە ناو باخەوە. ئەوەندە لە خەیاڵی بەدیعولجەمالدا بوو، مەست و بێ هۆش ببوو. لە خۆشیان ئەو شێعرانەی دەخوێندەوە:

لێـــــــــــــــــم دیار نەبێ ئۆقرە ناگرم دەمرم
تاقەتی دووریتــــــــــــــــم نییە بەرگە ناگرم
تۆ وێردی زمـــــــــــــــــانی ئەندامەکانمی
لە نینۆکی قامــــــــــــــــــکی پێم ڕا هەتا سەرم
دانە نەبــوو، هــۆی هــاتــنە نــاو تەبــکە و داوت
داوی تۆم بێ ئیتر ئەمــــــــــــــــن چۆن دەفڕم

دوای ئەوە گریا و ئەو دوو بەیتەشی گوت:

ڕووت دەربخە با خرمانی هـــــــــــۆشم بدەم بە بادا
خۆڵەمێشـــی ســـەدانی وەک من ئێســـتە با دەی با
گیان و دڵ قوربانی ساتی دیـــــــــــــــتنی تۆ بێ
بێ تـــــــــــــــۆ من گەڵاڕێزانمە و با ڕووتم دەکا

دیسان ئاخێکی هەڵکێشا و تێر گریان و ئەو بەیتانەشی خوێندەوە:

دوو گوێچکەم تیژی هەواڵ و دوو چاوم خێلی ڕێگەیەک
تۆ ئاســـوودە و بێ خەمیت و منیش نیمە هیچ پێگەیەک
قەت نییە لە خـــــــــــــۆت بپرسی بڵێی ئەڤیندارەکانم
شـــــەو ڕۆژهەڵوەدای منن بڵێی هەیانبێ جـــــێگەیەک

دوای ئەوەش بە بەردەوامی فرمێسـکی هەڵدەڕشـت و ئەو شـێعرەشـی لە بەر خۆیەوە دەگوت:

خـــــــــــۆزگە و ئاواتم ئەوەیە دەمێ لەگەڵ تۆدا بژیم
چیها دەم هاتن و چـــــــــوون من هەر لەگەڵیدا دەژیم
نە ئەوەیە بە تــــــــــۆ بگەم، نە ئەوەیە لە بیرت کەم
لە بیرت ناکەم دەزانم. قووتمە بەبـــــێ ئەو قەت ناژیم

ســـاعد کە دیتی ســـەیفولملووک هەر نەهاتەوە، هەســـتا وە دوای کەوت. ســـەیری کرد، سەیفولملووک لە نێو باخدا بە لۆژەلۆژ دەڕوا و ئەو شێعرەی دەخوێنێتەوە:

ڕێــــــــــــــــــم بدە با بە بەر دەمتدا تێپەڕم

به دزیـــــــــــیەوە چاوێک لە ڕووی جـــــوانت برم
ئەگەر چـاوێـکـم لـێ نـاکەی بە دەســــت خـۆتە
گەر بێت و من، تۆ ببینم هەر خـــــــــــــۆشـفەڕم

ساعد چوو بۆ لای و پێکەوە دەگەڕان. ئەوان با لێرە بگەڕێن...

دەوڵەت خاتوون و بەدیعولجەمال کە هاتنەوە کۆشـک. بەدیعولجەمال لە سـەر تەختەکە دانیشـــت لە پەنا تەختەکە پەنجەرێیەکی لێ بوو دەیڕوانییە ناو باخ. خزمەتکارەکان هەموو جۆرە میوەیەکیان دانابوو. دەوڵەت خاتوون و بەدیعولجەمال خەریکی میوەخواردن بوون. جـار جـار دەوڵەت خـاتوون میوەی بە دم بەدیعولجەمـالەوە دەکرد هەتـا تێریـان خوارد. ئەوجار هەڵوایان هێنا و ئەویشـیان خوارد و دەسـتیان شـوتەوە. دوای ئەوە دەفر و پیاڵەی زێڕ و بلووریان ڕیز کرد و شــــەرابیان هێنا. دەوڵەت خاتوون پیاڵەیەکی تێ کرد و دای بە بەدیعولجەمــال و پیـاڵەیەکیشـــی بۆ خۆی تێ کرد. لەو جەنگەیەدا بەدیعولجەمــال بە پەنجەرێیەکەدا چاوی لە دار و سـەوزایی و شـتی ناو باخەکە دەکرد کە لە پڕدا چاوی بە ســـەیفولملووک کەوت. وەک سـەلو بە لارولەنجە دەڕوا و ئەســـرین بە چاویدا لێژگەی بەســـتبووە و لە بەر خۆیەوە غەزەلی ئاشـــقانە دەڵێتەوە. کە بەدیعولجەمال لە جوانی و ڕێکوپێکی سـەیفولملووک ڕاما تیری ئەڤینی کاری لە دڵی کرد و لە ئاسـتەخۆی دڵی سـیس بوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و حەفتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بەدیعولجەمال کە سەیفولملووکی دی لە باخدا دەگەڕێ هێندە سەرخۆش بوو ڕووی لە دەوڵەت خاتوون کرد و گوتی: «دادە ئەو کوڕە کێیە لە باخدا دەگەڕێ؟»

کێیە ئەو لاوە وا لە باخا دەگەڕێ
تینوو دەمرێ و ئەوی ئاویش ڕادەبرێ

دەوڵەت خاتوون گوتی: «خوشکم، دەڵێی بانگی کەم بێتەوە ئێرە؟» بەدیعولجەمال گوتی: «ئەگەر دەکرێ بیهێنە.» ئیدی دەوڵەت خاتوون هەرای لە سەیفولملووکی کرد و گوتی: «شازادە بەرەو ئێرە وەرە با بە دیتنی ئەو جوانی و قۆزییەت کەمێک شاگەشکە بین.» سەیفولملووک دەنگی دەوڵەت خاتوونی ناسییەوە و بەرەو کۆشک گەڕاوە. کە چاوی بە بەدیعولجەمال کەوت بێهۆش بوو. دەوڵەت خاتوون گوڵاوی بە سەردا هەڵپرژاند تا وە هۆش هاتەوە. دوای ئەوە هەستا و کڕنۆشی بۆ بەدیعولجەمال برد. بەدیعولجەمال بە دیتنی ئەو هەموو قەشمەری و جوانییەی واقی وڕ ما و ئاوەزی تێک چوو.

دەوڵەت خاتوون کە ئاوای دیت گوتی: «شاژن ئەوە سەیفولملووکە منی لەو هەموو چارەڕەشییە ڕزگار کرد و مەینەت و کوێرەوەرییەکی زۆری لە ڕێی مندا کێشا. دەڵێم کەرەمت بێ و ئاگات لێی بێ.» بەدیعولجەمال بە پێکەنینەوە گوتی: «لە جیهاندا کەس گفت و بەڵێنی نەبردووەتە سەرێ چ بگا بەو لاوە کە مرۆڤە و هیچ جێی بەقا نییە.» سەیفولملووک گوتی: «شاژن تۆمەتی بێ وافایی لە من مەدە چونکە خەڵک هەموو وەک یەک نین.» ئەوەی گوت و ڕۆندکی لە چاوی ڕژانە خوارێ و ئەو شێعرەی گوت:

بەڵگەی خۆشەویستیمە کە عومرێکە من لە دوای تۆم
ڕەنگی زەردم دیاری دەدا، من چەندە هەڵوەدای تۆم
دڵم تژی لە وەفایە ئازیزم، دڵنیا بە
فرێشتەم دەی لە سەر ڕێگات، من هەر بەردەبازی تۆم

دوای ئەوە زۆر گریا و ئەڤینی قلپەی کرد و ڕووی لە بەدیعولجەمال کرد و ئەو شێعرەشی خوێندەوە:

گەر بە ئاوات نەگەیشتنمە ئاواتی تۆ

ئاواتی خۆم پشــت گوێ دەخــــــــــەم لەبەر دڵی تۆ
تۆ ڕەپێم نێی یا ڕێــــــــــــــــم بدەی بۆ ماڵی دڵت
مەســــت و کەلەلا کەوتــــــووم لە دەرک و بــانی تـۆ

بە دوای ئەوەدا هەستی ئەوەندە هەڵخڕا ئەوە شێعرەشی گوت:

سەرم بکەمە بــــــــــــــەردەبازی تۆ
هیچم نەکردووە لە پــای عـــــیشـــقی تۆ
حەز دەکەم بـبـمە خـۆڵـی ســـەر ڕێـگەت
بەشـکم بنووسـێم وە پای جــــــــــوانی تۆ

کە شـــێعرەکەی تەواو کرد، زۆر لە کوڵ دەســـتی کرد بە گریان. ئینجا بەدیعولجەمال گوتی: «شـازادە ئەمن ترسـم لەوەیە کە ئەگەر پشـت بە تۆ ببەسـتم، ئەتۆ دوایە پشـتم تێ کەی. چونکە مرۆڤەکان زۆر بێ گفت و بەڵێنن و لەسـەر قسـەی خۆیان نامێنن. زۆر بە فێڵ و دەغەن. هەر وەک حەزرەتی سـولەیمان بلقیسـی بە داوی خۆشـەویسـتی گرت و کاتێک یەکێکی لە بلقیس پێ جوانتر بوو. ئەوی خستە لاوە و لە بیری کرد.» سەیفولملووک گوتی: «بینایی چاوم خودا تەواوی مرۆڤەکانی وەک یەک نەئافراندووە. گەر خودا بیهەوێ ئەمن لە سەر گفت و بەڵێنی خۆم دەبم و هەر چۆن بێ شانی وەبەر دەدەم.»

دەستــــــــــــــم پێ لە تۆ بەرنابێ قەت قەت
ئەگەر بە تـیـخـیـش مـن بـکەن لەت لەت

بەدیعولجەمال گوتی: «کەوایە دانیشــە با بەڵێن بە یەک بدەین کە یەکتر ئازار نەدەین و خەیانەت بە یەکتر نەکەین. هەرکەس خەیانەت بە یەکتر بکا خودای گەورە تۆڵەی بکاتەوە. ســەیفولملووک دانیشــت و لەگەڵ بەدیعولجەمال دەســتیان لە دەســتی یەکتر نا ســوێندیان خوارد کە بەســـەر یەکتردا دڵ بە کەســـی دیکە نەدەن. ئیدی یەکتریان لە ئامێز گرت و لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە گریان. سەیفولملووک لە خۆشیان ئەوە شێعرەشی گوت:

لە خۆشــیـانـت مـــــاڵەکەم وەک بەهـارە
شێوەی جـــــــــــوانت لە چاومدا دیارە
بە تـــــــــــــۆوە ژیان مانایەکی هەیە
گەر تــۆم نەبـێ ژیــان لام ڕەش و تــارە

دوای ئەوەی کە بەدیعولجەمال و سـەیفولملووک گفت و بەڵێنیان بە یەکتر دا، هەستان لە ناو باخدا دەسـتیان کرد بە پیاسـە کردن. کەنیزێکیش شـیرینی و شـەرابی بە دوادا دەگێڕان و لەگەڵیان دەڕۆیشـت. تا وا بوو بەدیعولجەمال دانیشـت و کەنیزەکە شـیرینی و شەرابەکەی لە پێش دانان. سەیفولملووکیش دانیشت و دەستەملان بوون.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! بەدیعولجەمال گوتی: «شـــازادە ئەگەر بێتە باخی ئێرەم لەوێ تاوڵێکی گەورەی حەریری سوور دەبینێ. مەترسە بچووە ژوورێ، پیرێژنێکی لێیە لە سەر تەختێک دانیشتووە. ژیرانە سڵاوی لێ بکە. لە نێو دەرگاکە جووتێک کەوشی زێرکفتی لێیە. ئەو کەشـانە هەڵگرە ماچیان بکە و لە سـەر سـەرتی دانێ و پاشـان بیانخە بن هەنگڵت و دەستەونەزەر سـەرت داخە و لە پێش پیرێژنەکە ڕاوەستە. ئەگەر لێی پرسـی ئەتۆ کێی و چۆن هاتوویە ئێرە و ئەو کەوشانەت بۆ هەڵگرتووە. ئەتۆ هیچ مەڵێ هەتا ئەو کەنیزەی من دەگاتێ و قسەی لەگەڵ دەکا و دڵی بۆت نەرم دەکا. بەشکوو جوابت بداتەوە.

دوای ئەوە بەدیعولجەمال قاوی کردە ئەو کەنیزە کە ناوی مەرجانە بوو، پێی گوت: «کـارێکم پێتە ئەگەر جێبەجێی کەیـت ئەوە بەڵێن بێ ئـازادت دەکەم و تـازە قەت ئەو چاکەیەت لە بیر ناکەم و ڕێزێکی تایبەتت دەبێ لە لای من.» کەنیزە گوتی: «خاتوون پێم بڵێ کارەکە چییە تا بە گیان و دڵ جێبەجێی کەم.» بەدیعولجەمال گوتی: «کارەکەم ئەوەیە، ئەو لاوەم بۆ هەڵگرە و بیبە تاوڵەکەی داپیرم لە باخی ئێرەم. کاتێک ئەو کەوشـــەکانی داپیرەی منی هەڵگرت و داپیرەم لێی پرسی ئەتۆ کێی و لە کوێوە هاتووی و ئەو پێڵاوانەت بۆ هەڵگرتووە و چ کارێکت هەیە. ئەتۆ خێرا خۆ بە ژووریدا بکە و ســڵاو بکە و بڵێ خانمەکەم، ئەمن ئەو گەنجەم هێناوە و ئەوە کوڕی پاشـــای میســـرە. ئەو کوڕە هەر ئەو کوڕەیە کە چووەتە کۆشـکی مەشـید و کوڕی ئەزرەقشـای کوشـتووە و شـاژن دەوڵەت خاتوونی لە و دۆخە ڕزگار کردووە و بە ســـلامەتی هێناوییەتەوە لای باوکی. ئێســـتا من ئەوم هێناوەتە لای مزگێنیت داتێ و ئەتۆش ئەو خەڵات بکەی.» ئەوجار لێی پرســـە بڵێ: «خانم تۆ ئەو خودایە ئەو گەنجە لەبەردڵانە یان نا؟» ئەویش دەڵێ: لەبەردڵانە. ئینجا بڵێ خـانمەکەم بە خودا ئەو لاوە لاوێکی دڵاوا و جوامێرە و پـادشـــای میســـرە و گەلێک تایبەتمەندی زۆر جوانی هەیە. ئەگەر ئەو لێی پرســـی باشـــە چ کارێکی هەیە؟ بڵێ کە خانمەکەم بەدیعولجەمال ســـڵاوی دەگەیاندی و دەیگوت تا کەی بە تەنیا و بێ هاوژین لە ماڵێ دانیشـم. دوای ئەوە بڵێ، باشـە بۆ هەتا بۆخۆتان ماون بە مێردی نادەن. ئەویش دەڵێ جا ئەمن بڵێم چی و چۆنی بە مێرد بدەم. جا ئەگەر بۆخۆی کەسێکی بە دڵە پێم بڵێ تا لێی مـارەکەم. ئەتۆ خێرا بڵێ کە خـانمەکەم، کچەکەت ســـڵاوت دەگەیەنێ و دەڵێ ئێوە دەتانەویســـت من لە حەزرەتی ســـولەیمان مارە بکەن. هەربۆیە وێنەکەی منتان لە نێو کەوایەکدا بۆ نارد. چونکە قسـمەت نەبووە ئەویش کەواکەی بە دیاری ناردووە بۆ میسـر. پاشـای میسـریش کەواکەی داوە بە کوڕەکەی. کوڕی پاشـای میسـر کەواکەی کردووەتەوە و وێنەکەی منی دیوە و ئاشـــقم بووە. دایک و بابی بەجێ هێشـــتووە و دەســـتی لە دونیا

شـتووه. له تاو خۆشـەویسـتی من تەواوی دونیا گەڕاوە و کوێری و مەینەتی زۆری دیوە کەوتووەتە ناو داو و تەڵە و مەترسی زۆرەوە.

کورتی کەینەوە ئاخری کەنیزە سـەیفولملووکی لە قەڵاندۆشـی کرد و پێی گوت چاوت لێک نێ. سـەیفولملووک چاوی لێک نا. کەنیزە فڕی بۆ ئاسـمان دوای ماوەیەک گوتی: «شـازادە چاوت هەڵێنە. سـەیفولملووک چاوی هەڵێنا. سـەیری کرد لە باخی ئێرەمە. دوای ئەوە مەرجانە پێی گوت: «سـەیفولملووک بچووە ئەو خێوەتەوە. سـەیفولملووک ناوی خودای هێنا و وە ژوورر کەوت. پیرێژنێکی دیت لەوێ لە سـەر تەختێک دانیشـتبوو. کەنیز دەورەیـان دابوو. بەڕێزەوە سـڵاوی کرد، کەوشـەکـانی هەڵگرت و مـاچی کرد و ... بەدیعولجەمال چۆنی گوتبوو ئاوای کرد. پیرێژنە گوتی: «ئەتۆ کێی و لەو کوێوە هاتووی و کێ تۆی هێناوەتە ئێرە. ئەو کەوشانەت بۆ هەڵگرتووە و چ کارێکت پێمە تا جێبەجێی کەم؟» لەڕێوە کەنیزە هاتە ژووریێ و بە ڕێزەوە سـڵاوی کرد. ئەو قسـانەی کە بەدیعولجەمال گوتبووی هەمووی دووپات کردەوە. پیرێژن کە ئەو وتانەی بیست تووڕە بوو، بە کەنیزەی گوت: «چۆن شتی وا لە بەینی ئینس و جیندا دەبێ؟»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و حەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! پیرێژنە گوتی: «ئینس لە کوێ و جین لە کوێ؟!» ســـەیفولملووک گوتی: «خانمەکەم ئەمن کۆیلەی تۆم و زۆر زوو بۆت دەردەکەوێ کە من لە ســـەر گفت و بەڵێنم و کەســـی دیکەم وەبەر چاو نایە. پیرێژنە ماوەیەک ســـەری داخســـت و چوو لە هزرەوە. ئەوجار ســـەری هەڵێنا و گوتی: «کوڕی چاک گەلۆ لەســـەر قەول و قەراری خۆت دەبی یان نا؟» ســـەیفولملووک گوتی: «خانم بەو کەســـەی کە ئاســـمان و زەوی دروســـت کردووە من لە سەر قەول و قەراری خۆم دەبم.» پیرێژنە گوتی: «کە وایە منیش کارەکەت بۆ رادەپەڕێنم. جارێ بچووە لە ناو باخدا پیاســـە بکە و بگەڕێ و لەو میوانەی بخۆ چونکە میوەی ئاوا لە دونیادا نییە. هەتا کەسێک دەنێرم بە دوای شـــایاڵی کوڕمدا با ئەویش بێ و لەگەڵ ئەویش ڕاوێژ بکەم. هیوادارم دژایەتی من نەکا و بەدیعولجەمـالت لێ مـارە بکـا. ســـەیفولملووک کە ئەو خەبەرە خۆشـەی بیسـت خۆشـحاڵ بوو سـپاسـی پیرێژنەی کرد و دەست و لاقی ماچ کرد و هاتە دەرێ و چوو بۆ ناو باخ.

پیرێژنە ڕووی لە کەنیزەکە کرد و گوتی: «برۆ بزانە شایاڵی کوڕم لە هەر کوێیە بانگی کە بێتە ئێرە. کەنیزە چوو لە دوای شـــایاڵشـــا، دیتییەوە و هێنایە لای پیرێژنەی دایکی. با پیرێژنە لێرە خەریکی ڕاوێژ بێ.

ســـــەیفولملووک لە باخدا دەگەڕا کە لە پڕدا پێنج کەس لە هۆزی جان کە لە خزمانی ئەزرەقشـــا بوون تووشـــی بوون و گوتیان ئەوە بکوژی کوڕی ئەزرەقشـــاە. ئەوە چۆنە هاتووەتە ئێرە؟ گوتیان دەبێ فێڵێکی لێ بکەین. ئیدی وردە وردە لێی چوونە پێشـــێ و لە پەنای دانیشتن و گوتیان: «کوڕی چاک، چاکت کرد کوڕی ئەزرەقشات کوشت و دەوڵەت خاتوونت ڕزگار کرد ئەو گڵاوە هەر بە فێڵ و دەغز سیحری لە دەوڵەت خاتوون کرد. ئەگەر تۆ ئەوت ڕزگـار نەکردبـا قەتی ڕزگـار نەدەبوو. دا پێمـان بڵێ بزانین چۆنت کوشـــــت؟ ســـــەیفولملووک گوتی: «لە ژێر ســـــێبەری کلکەوانەکەی حەزرەتی ســـــولەیمان توانیم بی کووژم. لەجێوە دوو کەسیان دەستیان گرت و دوو کەسی دیکە لاقەکانیان گرت و یەکیش دەستی بە دەمییەوە گرت و وە حەوایان خست. لە وڵاتی خۆیان نیشتنەوە و بردیانە بەر دەمی ئەزرەقشا دایان نا و گوتیان: «بکوژی کوڕەکەتمان هێنا.»

ئەزرەقشا گوتی: «ئەوە ئەتۆی وا کوڕە بێ گوناحەکەی منت کوشت؟» سەیفولملووک گوتی: «بەڵێ، ئەمن کوشـــــتم، بەلام لە خۆڕا نەمکوشـــــتووە. ئەو لەتمی لە منداڵی کۆیلە کردووە و بردوویە لە کۆشـــــکی مەشـــــید و بیری موعلەتەدا بەندی کردووە و لە خزم و کەسی دابڕاندووە. ئەمن بە یارمەتی و بەرەکەتی ئەو ئەنگوستیلەیەی لە دەستمدایە کوشتم.

که ئەزرەقشـــا زانی ســـەیفولملووک بکوژی کوڕەکەیەتی. خێرا بانگی وەزیر کرد و پێی گوت: «ئەوە بکوژی کوڕەکەی منە. ئێستا دەڵێی چی لێ بکەین؟ بە شێوەیەکی زۆر ناخۆش بیکووژین یان بیهێڵینەوە بە شـــێوەی جۆراوجۆر ئازار و ئەشـــکنجەی بدەین؟» وەزیری گەورە گوتی: «ئەندامێکی ببڕین.» یەکی دیکە گوتی: «هەموو ڕۆژێ بە شـێوەیەک ئازاری بدەین.» یەکی دیکە گوتی: «ســـیرەتی ببڕین.» ئەویتر گوتی: «قامکەکانی بپەڕێنە و لە ئاوردا بی سووتێنە.» یەکی تر گوتی: «لە داری بدە.»

ئەزرەقشـا میرێکی بوو کارزان و لێ زان و دنیادیتوو، کە ئەزرەقشـا قەت لە قسـەی دەرنەدەچوو. ئەو میرە هەسـتا کرنۆشـی برد و گوتی: «گەورەم ئەمن قسـەیەک لە کاری ئەو کوڕەدا دەکەم و ئەگەر لە ئەماندا بم.» پاشـا گوتی: «تۆ لە ئەمان دای قسـەکەت بکە.» گوتی: «گەورەم لەو چەنگەیەدا کوشـــتنی ئەو کوڕە بە باش نازانم. بە چەند هۆ یەک ئەو ئێســـتا دیلە و لە بەر دەســـتی خۆت دایە، هەر کات پێت خۆش بێ دەیکووژی. ئەو کوڕە بەدیعولجەمالی کچی شایاڵشای مارە کردووە و بووە بە خزم و کەسی ئەو. ئەو کوڕە لە ناو باخی ئێرەمدا دەبێ و پیاوەکانی تۆ بێ خەر لەوە دەچن دەیگرن و دەیهێنن بۆ لای تۆ. ئەویش درۆی لەگەڵ ئێوە نەرکردووە و هەموو شـــتێکی گوتووە. ئەگەر بێتوو تۆ ئەو بکووژی. دوایە شـــایاڵشـــا داوای خوێنی ئەو دەکا و لەشـــکرت دێنێتە ســـەری بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە. خۆ تۆش ناتوانی بەرەنگاری ئەو ببییەوە.

ئەزرەقشـــا قســـەکەی ئەوی لا بەجێ بوو. فەرمووی ســـەیفولملووک بخەنە بەندەوە. سەیفولملووک ئاوای بە سەر هات.

بەدیعولجەمال کاتێک هاتە لای باوکی لە پارکی ئێرەم، کەنیزێکی نارد بە شـــوێن ســـەیفولملووکدا. کەنیزە زۆر گەڕا ســـەیفولملووکی نەدیتەوە. نـاچـار گەڕاوە لای بەدیعولجەمال و گوتی: «ســـەیفولملووکم نەدیتەوە.» بەدیعولجەمال بانگی دەرکەوانەکانی کرد و پرسیاری لێ کردن، ئەوان گوتیان: «ئێمە دیتمان لە بن دارێک دانیشتبوو، پێنج کەس لە هۆزی ئەزرەقشا لە لای دانیشتبوون و قسەیان لەگەڵ دەکرد. دوای ئەوە دمیان گرت و هەڵیانگرت و فڕین.»

بەدیعولجەمال کە ئەوەی بیســـت تێکچوو. تووڕە بوو هەســـتا چوو بۆ لای باوکی پێی گوت: «بابە ئەوە چ پاشـایەتییەکە کە پیاو و خزمەتکاری ئەزرەقشـا بێنە ناو باخی ئێمەوە و میوانەکەمان بەرن. ئەتۆش زیندوو بی.

دایکی شـــایاڵشـــاش کوڕەکەی ســـەرکۆنە دەکرد و دەیگوت: «ڕۆڵە نابێ قەت بهێڵی کەســـێک ئاوا ســـووکایەتیمان پێ بکا.» شـــایاڵشـــا گوتی: «دایە ئەوە مرۆڤە و کوڕی ئەزرەقشـای کوشـتووە. دیسان ئەوە ئینسە و ئەزرەقشا جیننە. چۆن ئەمن بچم لە سـەر

مرۆڤێک دوژمنایەتی ئەو بکەم. دایکی گوتی: «ئەمن کارم بەوە نییە، تۆ دەبێ بچی بە سەر ئەزرەق‌شادا بدەی و ئەگەر میوانەکەمان زیندووە بە ساخی بیهێنییەوە ئەگەر ئەزرەق‌شا ئەوی کوشتووە ئەوە ئەزرەق‌شا و دارودەستەکەی بە زیندوویی و قۆڵبەستکراوی بێنە ئێرە با بۆ بۆخۆم بیان کووژم و وڵاتەکەشیان وێران کەم. ئەگەر ئەو کارەی گوتم وا نەکەی قەتت گەردن ئازاد ناکەم و ئەو شیرەی داومێی حەڵاڵت ناکەم.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و حەفتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دایکی شایاڵشا که ئاوای بە شایاڵشای کوڕی گوت، شایاڵشا فەرمانیدا لەشکر ساز بێ و بکەوێتە ڕێ. لەبەر دڵی دایکی و بە پێی چارەی دیاریکراو بەرەو وڵاتی ئەزرەق شا بزووت. بە لەشکرێکی لە ئەژمار نەهاتووەوە ڕۆیشتن و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە سەر ئەزرەقشا.

ئەزرەقشایش بە لەشکرێک بە قەد ئەستێرەی ئاسمانەوە بەرەنگاریان بووەوە. شەڕ لە نێوان ئەو دوو لەشکرە سەری هەڵدا. لەشکری ئەزرەق شا تێک شکا. هێزەکانی شایاڵ شا، ئەزرەقشا و منداڵەکانی و گەورەکانی دەوڵەتەکەیان بە دیل گرت و قوڵبەستیان کردن و هێنایاننە کن شایاڵشا. شایاڵشا گوتی: «ئەزرەق، کوا سەیفولملووکی میوانم.» ئەزرەقشا گوتی: «شایاڵ من و تۆ هەرکمان جنین. چۆن لە سەر مرۆڤێک کە کوڕی منی کوشتووە خوێنی هەزاران هەزار جننت ڕشت؟»

شایاڵ گوتی: «لەو قسانە گەڕێ، ئەگەر ئەو زیندوویە بڵێ بیهێننە ئێرە تا تۆ و هەموو دیلەکانی دیکەش ئازاد بکەم. ئەگەریش کوشتبێتت ئەوە ئەتۆش و مندا و خزم و کەست هەمووی دەکووژم. ئەزرەقشا گوتی: «ئەوە مرۆڤێک لە لای تۆ لە منیش و منداڵەکانی منیش بۆ تۆ ئازیزترە؟» شایاڵشا گوتی: «کوڕەکەی تۆ زوڵمی کردووە و کچی خەڵکی ڕفاندووە و لە کۆشکی مەشید و چاڵی موعەتتەلەدا دایناوە و بەندی کردووە.» ئەزرەق شا پێی گوت: «ئەو مرۆڤە لە لای منە و زیندووشە، بەڵام تۆ قازی بە و لە نێوانماندا قەزاوەت بکە.» فەرماندرا سەیفولملووکیان هێنا. شایاڵ شا، ئەوانی ئاشت کردەوە و خەڵاتی کردن و نووسراوەیەکی لە نێوان ئەزرەقشا و سەیفولملووکدا نووسی کە تازە ئاشت بوونەوە باس لە داوای خوێنی کوڕەکەی ئەزرەقشا ناکرێ. ئەزرەقشا هەتا سێ ڕۆژان میوانداری لێ کردن. دوای ئەوە شایاڵشا سەیفولملووکی هێناوە بۆ دایکی. دایکی کە سەیفولملووکی بە ساغ و سەلیمی دیت زۆر خۆشحاڵ بوو. شایاڵشا سەری لە جوانی و ڕێکوپێکی و خانەدانی سەیفولملووک سووڕ مابوو. ئەوجار دایکی بەسەرهاتی سەیفولملووکی لە ئەوەڵەوە تا کۆتایی بۆ کوڕەکەی باس کرد و باسی ئەوەشی بۆ کرد کە بە تەمایە بەدیعولجەمالی بداتێ. شایاڵشا گوتی: «دایە هەر کارێک تۆ بە باشی بزانی من ملکەچم و پێی ڕازیم. بەدیعولجەمال و سەیفولملووک هەڵگرە و بەرەو سەرانديب برۆ و لەوێ جێژنێکی شادی وەڕێ بخەن. چونکە کوڕێکی جوانچاک و باشە و لە ڕێی بەدیعولملووکیشدا زۆری زەحمەت و نارەحەتی کێشاوە.

دایکی شایاڵشا ئەوانی هەڵگرت و بەرەو سەرانديب وەڕێ کەوت و چووە باخەکەی کە دایکی دەوڵەت خاتوونی لێ بوو. بەدیعولجەمال کاتێک دەوڵەت خاتوونی دیت ڕووداوەکەی سەیفولملووکی لەگەڵ ئەزرەقشای بۆ گێڕاوە. سەیفولملووک هەستا چووە لای

تاجولملووکپاشا و پێی گوت: «گەورەم پاشا، ئەمن تکایەکم لە خزمەتتدا هەیە.» تاجولملووک گوتی: «بە خودا ئەوەندەت چاکە لەگەڵ من کردووە، ئەگەر داوای گیانیشم بکەی ناڵێم نا.» سەیفولملووک گوتی: «داوات لێ دەکەم کە دەوڵەت خاتوون بدەی بە ساعدی برام.» تاجولملووک قسەکەی سەیفولملووکی نەشکاند و گوتی: «ئەگەر دەوڵەت خاتوون ڕازی بێ ئەمن قسەم نییە.» پرس کرا و دەوڵەت خاتوون گوتی: «بڕیار بڕیاری بابمە.» گەورەکانی دەوڵەت بانگ کران و دەوڵەت خاتوونیان لە ساعد مارە کرد و تاپۆ نووسرا. زێڕ و زێو بە سەر خەڵکدا هەڵاویشترا و شار ڕازاوە، جێژن و خۆشی وەڕێ خرا. سەیفولملووک تا چل ڕۆژان لەگەڵ بەدیعولجەمالدا ڕایبوارد و نەهاتنە دەرێ. دوای ئەوە بەدیعولجەمال گوتی: «شازادە داوا و ئاواتێکت لە دڵدا ماوە؟» سەیفولملووک گوتی: «نا وەڵڵا، هیچ داوا و ئاواتێکم نەماوە مەگین ئەوەی دەمهەوێ بچمەوە میسر چاوێکم بە دایک و بابم بکەوێ و هەواڵێکی ئەوان بپرسم.» لەڕێوە بەدیعولجەمال بە خزمەتکارەکانی فەرموو: «سەیفولملووک و ساعد بگەیەننەوە میسر.» خزمەتکارەکان ئەوانیان گەیاندەوە میسر.

سەیفولملووک و ساعد چوونەوە لای دایک و باوکیان و حەوتوویەک لە لای ئەوان مانەوە. دوای ئەوە ماڵاواییان لێ کردن و گەڕانەوە بۆ سەراندیب. هەر کاتێک بیری ماڵە بابیان کردبا ئەوە ئەو جنتانە خێرا ئەوانیان دەگەیاندەوە میسر و دوای حەوتوویەک دەگەڕانەوە. بەو جۆرە تا ئاخر ژیانیان لە کەیف و خۆشیدا بوون هەتا قووتدەری خۆشییەکان لێیان پەیدا بوو. پاکە ئەو خودایە کە قەت نامرێ.

### بەسەرهاتی حەسەنی بەسری و نورولنسا

یەکی دیکە لەو بەسەرهاتانە ئەوەیە کە لە زەمانی زوودا لە شاری بەسرە کابرایەکی بازرگان بوو، دوو کوڕ و ماڵێکی زۆری هەبوو. کە کابرا مرد کوڕەکانی بابیان ناشت و ماڵەکەیان کردە دوو بەش. هەرکەسەی بەشی خۆی هەڵگرت و دووکانی دانا. یەکیان مسەگەر و یەکیشیان زێڕینگەر بوو. ڕۆژێک لە ڕۆژان زێڕینگەرەکە لە دووکان دانیشتبوو کە کابرایەکی عەجەم بە بەر دووکانەکەیدا تێ دەپەڕی ڕاوەستا و چاوێکی لە کارەکەی کرد. کوڕەشی زۆر جوان و ڕێکوپێک هاتە بەر چاو و وەبەر دڵی کەوت. ئەو زێڕینگەرە ناوی حەسەن بوو. عەجەمە چووە پێش و گوتی: «کوڕی من بە خودا ئەتۆ زۆر کوڕێکی قۆز و کەشخەی و حەیفە خەریکی زێڕگەری بی. ئەمن منداڵم نییە و پیشەیەکیشم هەیە لە دونیادا کەس نییەتی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و حەفتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کابرا عەجەمە گوتی: «کوڕم من کارێک دەزانم باشـــترین کاری دونیایە. زۆرکەس داوای کردووە، فێری بکەم. ئەمن فێری کەسم نەکردووە. بەڵام پێمخۆشە فێری تۆی بکەم و تۆ لە جێی کوڕی خۆم دانێم. لە ماڵی دونیا خەنیت بکەم و لە دەســـت ئەو ئاور و دووکەڵ و کوتکوەشاندنەت ڕزگار بکەم. حەســەن گوتی: «کەی ئەو کارەم فێر دەکەی؟» کابرا گوتی: «سۆزی دێم بۆ لات و مس بۆ دەکەم بە زێڕی بێ خەوش.»

حەســـەن بە و خەبەرە زۆر دڵخۆش بوو. ماڵاوایی لە عەجەمە کرد و چووەوە ماڵێ. سڵاوی لە دایکی کرد و دانیشت. خواردنەکەی خوارد. لە خۆشیان حەجمینی نەبوو. هەر لە فکری ئەو بابەتەدا بوو. دایکی پرســی: «ئەوە چییە بۆ جۆرێکی؟» حەســەن شــتەکەی بۆ دایکی گێڕاوە. دایکی گوتی: «کوڕی من وریابە نەکەی باوەڕ بە قســـەی خەڵک بکەیت. بە تایبەت ئی عەجەمان کە هەموو گیانیان فڕوفێڵە و ســـاختەچین. بە داوی کیماگەرییەوە دەســت بە ســەر ماڵی خەڵکدا دەگرن. حەســەن گوتی: «دایە ئێمە خۆ شــتێکی وامان نییە تەماعی تێ کردبین و بیهەوێ لێ مان بســتێنێ و داوامان بۆ بنێتەوە. ئەو کابرایە پیاوی چاکە و خودا منی خستووەتە بەر دڵی و لەگەڵم دلۆڤانە.»

دایکی لە داخان بێ دەنگ بوو. بەڵام حەســـەن هەتا بەیانی لە خۆشـــیان خەوی لێ نەکەوت و هەر بیری لەو کارە دەکردەوە.

کە ڕۆژ بووەوە چوو بۆ دووکان، هێشـــتا دووکانی هەڵنەگرتبوو، عەجەمە پەیدا بوو. حەسەن هەستا و ویستی دەستی عەجەمە ماچ بکا. عەجەمە نەیهێشت و گوتی: «حەسەن ئەتۆ باوەشـــێنەکە بێنە و کورەکەت ســازکە و ئاگرەکەت بکەوە. حەســەن کارەکانی کرد. عەجەمە گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئەرێ مســت لە لایە؟» حەســەن گوتی: «لەتە مسـێکی لێیە.» عەجەمە گوتی: «بە گازێک بیکە کوتی چکۆلە چکۆلە.» حەســەن هەمووی ورد ورد کرد و خستییە بووتەکەوە[1] و بای لێ دا هەتا جوانجوان سوور بووەوە.

عەجەمە دەســـتێکی برد بۆ ســـووچی کڵاوپێچەکەی و تۆزێکی دەر هێنا وەکوو کلی زەرد وابوو. بە قەدەر نیو درەمێکی لە بووتەکە کرد و بە حەســـەنی گوت: «بای لێ دە.» حەســەن بای لێ دا هەتا ئەوەی تێیدا بوو، بوو بە زێڕی تەواو. حەســەن کە ئەوەی دیت لە خۆشیان سەری لێ شێوا و تۆڵا[2] زێڕەکەی هەڵگرت و لە ئاوەکەی خست. کە سارد بووەوە

---

[1]. بووتە: دەفرێکی گڵییە کە کانازی تێدا دەتوێننەوە.

[2]. تۆڵا: پارچەیەک لە شتێک، شمش، شیش.

له محەکی دا. ســــەیری کرد بوو بە زێڕێکی زۆر جوان و بێ خەوش و گرانبایی. ئینجا سەری بردە پێشێ هەتا دەستی عەجەمە ماچ کا. عەجەمە نەیهێشت. پێی گوت: «ئەو زێڕە هەڵگرە و بیبە لە بازاڕ بی فرۆشــــە و پارەکەت وەر گرە و باســـــی هیچ مەکە.» لەڕێوە حەسەن چوو بۆ بازاڕ و تۆلاکەی دا بە دەلاڵ. دەلاڵ محەکی لێ دا و هەزار درەمی لە سەر دانا. بازرگانان لێی کۆ بوونەوە و نرخەکەیان بردە سەرێ هەتا گەیشتە پازدە هەزار درەم. بە پازدە هەزارەکە حەسەن زێڕەکەی فرۆشت و گەڕاوە ماڵێ و شتەکەی بۆ دایکی گێڕاوە. دایکی پێی پێ کەنی و گوتی: «سوبحانەڵلا.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و هەشتایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەنی زێڕینگەر کە بەسەرهاتەکەی ئەوڕۆی بۆ دایکی گێڕاوە، دایکی لەبەر ناڕەحەتیان هیچی نەگوت و بێ دەنگ بوو. حەسەنی حەپۆلیش دەستی دا دەستاوەنگەکە و بردی بۆ دووکان عەجەمە، بۆی بکا بە زێڕ. عەجەمە لێی پرسی: «ئەو دەستکاوەنگەت بۆ هێناوە؟» حەسەن گوتی: «دەمەوێ بی توێنمەوە و بیکەم بە زێڕ.» عەجەمە پێکەنی و گوتی: «مەگەر تۆ شێتی لە ڕۆژێک دا دوو تۆلا زێڕ دەبەی بۆ بازاڕ؟ یانی تۆ نازانی ئەگەر خەڵک بەوە بزانن دەکوژرێین. کوڕی من ئەگەر ئەو کارەت فێر دەکەم، خۆ نابێ لە ساڵێ جارێک زیاتر دەکاری بکەی. جارێکت بەسە.» حەسەن گوتی: «ڕاست دەفەرمووی گەورەم.» دوای ئەوە حەسەن هەستا و بووتەکەی خستە سەر گڕەکە. عەجەمە گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئەوە بە تەمای چ بکەی؟» حەسەن گوتی: «دەمهەوێ ئەو کارەم فێر کەی.» عەجەمە پێکەنی و گوتی: «سوبحانەڵلا، چەندە گەوج و نەفامی. ئەتۆ قەت شیاوی ئەوە نی فێری ئەو کارە بی. مەگەر دەکرێ هەر ئاوا سووک و ئاسان لە بازاڕ و لەبەر چاوی خەڵک ئەو کارە فێر بی؟!! ئەگەر ئێمە لێرە خەریکی ئەو کارە بین خەڵک بە کیمیاگەرییەکەمان دەزانن و خەبەر بۆ حاکم دەبەن و دەکووژرێین. ڕۆڵە گیان ئەگەر دەتهەوێ فێری ئەو کارە بی دەبێ بێیە ماڵەکەی من.» حەسەن لەڕێوە دووکانی گاڵە دا و لەگەڵ عەجەمە وەڕێ کەوت. کەمێکی لەگەڵ ڕۆیشت و قسەی دایکی کەوتەوە بیر و تووشی نیگەرانی و دڵەڕاوکێ بوو. نەختێک ڕۆیشت و ڕاوەستا. عەجەمە ئاوڕێکی لێ داوە سەیری کرد ڕاوەستاوە، پێکەنی و گوتی: «ئەوە تۆ شێتی، ئەمن ئەو هەمووە لەگەڵ تۆ چاکم کەچی لێم دڕدۆنگ و نیگەرانی؟ ئەگەر تۆ لەوە نیگەرانی بێیە ماڵی من ئەمن لەگەڵت دێمەوە ماڵی ئێوە لەوێ فێرت دەکەم.» حەسەن گوتی: «باشە مامە وا دەکەین.» عەجەمە گوتی: «بکەوە پێشم با بڕۆین.»

حەسەن کەوتە پێشی و عەجەمەش بە دوایدا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە ماڵی حەسەن. حەسەن چووە ژوورێ و دایکی ئاگادار کردەوە کە عەجەمەی لەگەڵە. عەجەمەش لە بەر دەرگا ڕاوەستابوو. دایکی حەسەن فەرش و شتی ڕاخست. حەسەن چووەوە دەرێ و عەجەمەی لەگەڵ خۆی بردە ژوورێ و بۆخۆی دەستی دا مەجوعمەیەک و چوو بازاڕ. خواردەمەنی کڕی و هاتەوە و بە عەجەمەی گوت: «بخۆ با نان و نمەکی ئێمەت کردبێ، چونکە هەرکەس نان و نمەکی کەسێکی کردبێ و خەیانەتیان پێ بکا. خودا تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە. عەجەمە بزەیەکی هاتێ و گوتی: «کوڕم، جا کێ هەیە ڕێزی نان و نمەکی لەبەر چاو نەبێ؟»

پاشان عەجەمە لەگەڵ حەسەن تێری نان خوارد و گوتی: «حەسەن هەڵواشم بۆ بێنە.» حەسەن دەسبەجێ هەستا چوو لە بازاڕ چەندین جۆر هەڵوای کڕی و گەڕاوە. ئەو قسەیەی عەجەمەی پێ خۆش بوو. کە هەڵواکەیان خوارد عەجەمە گوتی: «جا کوڕی وەک تۆ لە کوێ پەیدا دەبێ نهێنی دڵتی بۆ بدرکێنی؟» دوای ئەوە دیسان گوتی: «باوەشێن و بووتەکەم بۆ بێنە.» حەسەن خۆشحاڵ بوو بە ڕاکردن چوو لە دووکان باوەشێن و بووتەکە و تەواوی کەرەسە و شتەکانی دیکەی هێنا و بە غار هاتەوە لە بەر دمی عەجەمە دانینا. عەجەمە کاغەزێکی دەر هێنا و گوتی: «حەسەن بەو نان و نمەکەی کە لە ماڵی ئێوە کردوومە ئەگەر بە قەت منداڵی خۆم بۆم ئازیز نەبای، ئەو کارەم فێر نەدەکردی. بەڵام بە خودا جگە لەو نەختە ئیکسیرەی لەو کاغەزە دایە هیچی دیکەم پێ نەماوە. بەڵام کوڕی خۆم، ئەگەر نیو درەم لەوەی لەو کاغەزە دایە لە دە ڕەتڵ مسی بدەی ئەو دە ڕەتلە دەکا بە زێڕی تەواو و بێ خەوش. ئەو کاغەزە سەد مسقاڵی میسری ئیکسیر تێدایە. دوای ئەوە تەواو دەبێ. ئەمن ئیکسیری دیکەت بۆ ساز دەکەم.» حەسەن وەرەقەکەی لێ وەر گرت و چاوێکی لێ کرد. سەیری کرد لەو تۆزەی پێشوو زەردتر و گەشترە. حەسەن گوتی: «گەورەم ناوی ئەوە چییە و لە کوێ وەگیر دەکەوێ؟» عەجەمە بزەیەکی هاتێ و گوتی: «بۆ پرسیار دەکەی؟» ئەتۆ کارت بەوە نەبێ. بچۆ شتێکی مسی بێنە و لەت لەتی بکە و لەو بووتەی هاوێ.

حەسەن چوو لەتە مسەکانی هێنا و لە بووتەکەی کرد. بای لێ دا تا تەواو سوور بووەوە. عەجەمە کەمێکی لەو تۆزەی لە وەرەقەکەدا بوو، کردییە ناو بووتەکەوە. لەڕێوە مسە سوورەوەبووەکان بوون بە زێڕی تەواو. حەسەن کە ئاوای دیت شاگەشکە بوو. هۆشی لای خۆی نەما. عەجەمە گوتی: «حەسەن ئێستا تۆ کوڕی خۆمی و لە گیانم ئازیزتری. کچێکیشم هەیە لێتی مارە دەکەم.» حەسەن گوتی: «ئەمن نۆکەری تۆم. هەر چاکەیەکم لەگەڵ بکەی پاداشەکەی لە خودا وەردەگرییەوە.» عەجەمە گوتی: «بە هێز و خۆڕاگر بە، قازانجێکی زۆرت پێ دەگا.» بە دوای ئەوەدا نەختێکی هەڵوا لە گیرفانی دەر هێنا و دای بە حەسەن. حەسەن دەستی ماچ کرد و هەڵواکەی لێ وەرگرت و خواردی بێ خەبەر لەوەی کە چی بە سەر دێ. هەرکە هەڵواکەی قووت دا، بێ هۆش بوو. عەجەمە زۆر خۆشحاڵ بوو. هەستا و گوتی: «عەڕەبی لە عەڕەب بوو لە مێژ ساڵ بوو لە تۆ دەگەڕام.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! حەســـەن کە بێ هۆش بوو، لەوێ کەوت. عەجەمە بە لەز هەســـتا دەســـت و قاچی حەســـەنی بەســـت. ســـندووقێک لەوێ بوو خســـتییە ناو ســـندووقەکەوە و دەرگاکەی لە ســـەر داخســـت. ســـندووقێکی دیکەی هێنا، هەرچی بە کێش ســـووک و نرخ گرانبایی بوو وەک تۆڵای زێڕ و شت لە سندووقەکەی نا و دەرکی سندووقکەی داخست و چووە دەرێ. یەکســـەر چوو بۆ بازاڕ باربەرێکی هێنا و ســـندووقەی پێ هەڵگرت و بەرەو کەشـــتی عەجەمان ڕۆیشـــت. کەشـــتیوانێکی عەجەم لەوێ چاوەڕێی ئەو بوو. کە گەیشـــتنە قەراخ دەریا قاوی کردە پاپۆڕڤانەکان کە هەســـتن با وەڕێ کەوین، ئەمن کارەکەم جێبەجێ کرد. پاپۆڕڤانەکان چارۆکەی کەشـــتیان هەڵدا و کەشـــتی وەڕێ کەوت. با عەجەمە بڕوا. سەرێکی دایکی حەسەن بدەین.

دایکی حەســـەن، هەتـا شـــەو هەر چـاوەڕێی حەســـەن بوو. کە حەســـەن هیچ سەروسۆراخێکی نەبوو هەستا هات بە دوایدا. سەیری کرد ماڵەکەی چی تێدا نەماوە. زانی کوڕەکەی شتێکی بە سەر هاتووە و ون بووە. بەربووە سەروگوێلاکی خۆی و جلی لە بەر خۆی دادڕی و فرمێسکی هەڵوەراند و ئەو شێعرەی دەخوێندەوە.

ڕۆڵە گـــــــــیان لە کوێی چرای مـاڵەکەم
نازانی بێ تـــــــــــۆ چۆنە حاڵەکەم
چەندم پـــــــــێ گوتی عەجەم بێ فەڕن
هەموو درۆزن، پـــــــــیس و بەدفەڕن
جەرگـم کـون کـونە خـوێـنـی لـێ دەتـکـێ
زانیم ئەو پیســـە، پـــــێی کردووی ئەتکێ

ئیدی هەتا بەیانی هەر گریا و کڕووزاوە. دراوســـێکانیان لێی کۆ بوونەوە و پرســـیاریان لێ کرد. دایکی حەســـەنیش باســـی عەجەمەی بۆ گێڕانەوە و پێشـــی وا بوو، تازە چاوی بە کوڕەکەی نـاکەوێتەوە. هەر ئـاوا بە دیوەکـانـدا دەگەڕا و چـاوی دەگێڕا لە پڕ ئەو نووسراوەیەی لە سەر دیوار دیت:

ئەی ئەو کەســـەی بـۆم دەگەڕێـی و هەر نـامـبـیـنـیـیەوە
بوونی من خەوێک بـــــــــوو، تازە قەتی نایبینییەوە

دایکی که ئەوەی دیت لە قوڵپەی گریانی دا. دراوســـێکانی زۆریان دڵخۆشـــی داوە و پاشـان چوونەوە ماڵەکانیان. دایکی حەســەن شـەو و ڕۆژ پیشـەی گریان بوو. لە ماڵەکەی خۆیدا گڵکۆیەکی ســاز کردبوو کێلێکی لە پشــت ســەری چەقاندبوو، نێوی حەســەن و ڕێکەوتی ونبوونەکەی لە سـەر نووسـیبوو. بەردەوام لە سـەری دادەنیشـت و لێی دوور نەدەکەوتەوە. ئەوە کاری دایکی حەسەن بوو.

عەجەمە گاور بوو، موسـوڵمانان زۆریان خۆش نەدەویست. ئەویش هەر موسـولمانێکی وەگیر کەوتبا دەیکوشت. پیسی و گڵاوییەکەی گەیشتبووە جێیەک کا شاعیر گوتوویە.

هێندە گڵاو و پـــــــــــــیس و بەدفەڕ بوو
شـــەیتـان لە ئـاســـتـی هەر وەکـوو پەز بـوو

ئەو گەمارە ناوی بەهرام بوو. ئەو، هەموو سـاڵێک موسـوڵمانێکی دەگرت و دەیکوشـت. پێی وا بوو کە بەو کارە ئاواتەکانی وەدی دێن و دۆعای گیرۆدە دەبێ.

بە کورتی، کاتێک بەهرامی مەجووس فێڵەکەی ســەری گرت. ســندووقەکانی خســتە کەشــتییەکەوە و هەتا ڕۆژئاوابوون ڕۆیشــتن. کە ڕۆژ ئاوا بوو لایاندا لەنگەریان گرت و هەتـا بەیـانی لەوێ بوون. کە ڕۆژ بووەوە وەڕێ کەوتنەوە و پـاپۆڕیـان ئـاژووت. بەهرام داوای کرد ئەو ســندووقەی حەســەنی تێدایە بۆی بێنن. خزمەتکارەکان ســندووقەکەیان بۆ هێنا. گاورە سندووقەکەی هەڵپچڕی و حەسەنی هێنا دەرێ و کەمێکی سرکە لە لووتی کرد. حەســەن پشــمی و هێڵنجی دا و بەنگەکەی هێناوە. ئینجا چاوی هەڵێنا و چاوێکی لەملا و ئەولای خۆی کرد. سـەیری کرد ئەوە لە کەشـتیدایە و عەجەمەش لە لای دانیشـتووە. زانی کە ئەوە ئەو گاورە پیسە بەڵایەکی بە سەر هێنا و ئەو ڕۆژەی دایکی لێی دەترسا بە سەری هاتووە. لە دڵی خۆیدا گوتی:«خودا یارمەتیم بدەی خۆڕاگر بم.» ئینجا ڕووی لە عەجەمە کرد و بە کەنەفتییەوە گوتی: «بـاوکە گیـان، ئەو کـارانە چین و نـان و نمەکەکە چی لێ هات؟» عەجەمە چاوێکی لێ کرد و گوتی: «ســەگی عەڕەب، ئی وەک من چووزانێ نان و نمەک چییە؟ ئەمن هەزاران منداڵی موســـوڵمانی وەکوو تۆم کوشــتووە و ئەوە تۆ دەبییە هەزار و یەکەمین. حەسەن بێدەنگ بوو. زانی کە تازە چارەنووس کاری خۆی کردووە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! گاورە فەرمانی دا: دەســـتی بکەنەوە و کەمێکی ئاو دەنێ. لەو جەنگەیەدا پێدەکەنی و دەیگوت: «قەســەم بە تیشــک و ئاور قەت باوەڕم نەدەکرد بکەوییە داوی منەوە. ئیدی ئەوە ئاور فریام کەوت و لە گرتنی تۆدا یارمەتی دام. ئەمنش دەتکەمە قوربانی بۆ ئاور بەشــکوو لێم ڕازی بێ.» حەســەن گوتی: «نمەک بە حەرام دەرچووی.» گاورە زللەیەکی لە حەسەن دا و بە زەویدا دا. دوای ئەوە فەرمانی دا ئاور بکەنەوە. حەسەن گوتی: «ئەو ئاگرەت بۆ چییە؟» گاورە گوتی: «ئەو ئاگرە ئافرێنەری منە. ئەگەر تۆش ئەو بپەرەستی نیوەی ماڵەکەمت دەدەمێ و کچەکەشمت لێ مارە دەکەم.» حەسـەن لێی تووڕە بوو بە ســـەریدا گوڕاند و گوتی: «چارەڕەش ئەوە تۆ گاوری و ئافرێنەری ئاســـمان و زەویت لە بیر کردووە و ئاگر دەپەرەستی؟!» گاورەش تووڕە بوو. گوتی: «عەڕەبی سەگ، ئەوە لەبەرتگرانە بێیە ســـەر دینی من؟!» ئەو گڵاوە ســووژدەی بۆ ئاگرەکە برد. ئینجا بە کۆیلەکانی گوت: «حەســـەن بە ڕووەوە درێژ بکەن. کۆیلەکانی حەســـەنیان بە ڕووەوە لە ســـەر زەوی درێژ کرد. گاورە بە قامچییەک کە لە چەرم هۆندرابووەوە ئەوەندەی لێ دا هەتا ئازای لەشــی پچڕپچڕ بوو. ئەویش دەپاڕاوە و دەلالاوە. کەسـیش گوێی نەدایە. ئینجا سەری هەڵێنا و لە بەر خودا و پێغەمبەر و حەزرەتی عەلی پاڕاوە و فرمێسکی هەڵڕشت و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

شـێری سـەربەرز و هەڵکەوتەی دەسـتـــــــــــــــی خودا
بەردەســـتێرەی درەوشـــاوەی دەســـتـــــــــــــی خودا
ڕزگـــارم بـــکە لە دەســـــتـــی خـــوێـــڕیـــیە پـــیـــاوان
دەســـــتـــی هـــانـــام بـــگـــرە زوو ئەی دەســـــتـــی خـــوا

دوای ئەوە گاورە بە کۆیلەکانی گوت هەڵیســێنن و خواردنی بۆ بێنن. حەســـەن دمی لە هیچ نەدا. گاورە شـەو و ڕۆژ ئازار و ئەشکنجەی دەدا. ئەویش دانی بە خۆیدا دەگرت و لە بەر خودا دەپاڕاوە. سێ مانگ ئاوا لە کەشتیدا بوون. دوای ئەوە خودای تەعالا ڕەشەبایەکی نارد کە ئاســمانی ســـەر دەریای ڕەش داگیرا. دەریا خرۆشــا و پێل هەســـتا و پاپۆڕەکە شانەوەشانی کرد. کەشتیوانان ترسیان ڕێنیشت و گوتیان: «بە خودا ئەوە هەمووی ئاهی ئەو منداڵەیە، خودا خەریکە غەززەبمان بۆ دەنێرێ. ئینجا هەســـتان کۆیلەکانی گاورەکەیان کوشت. گاورە کە زانی ئەوە کۆیلەکانیان کوشت، ترسا و قۆڵی حەسەنی گرت و جلە زبر و شڕەکانی لە بەر داکەند و جلی نەرم و تازەی دایە و بەڵێنی دا فێری پیشـەی کیمیاگەری

بکا و بیباتەوە بۆ شـــارەکەی خۆی. گوتیشـــی: «ڕۆڵە گیان چاو لە ئاکاری خراپم مەکە.» حەســـەن گوتی: «چۆن من تازە باوەڕ بە تۆ بکەم؟» گاورە گوتی: «ڕۆڵە گیان جا ئەگەر گوناه نەبایە، لێ بووردەییش نەدەبوو. ئەمن بۆیە ئاوام لەگەڵ کردی هەتا ڕادەی خۆڕاگریت تاقی بکەمەوە.»

پاپۆڕڤانەکان بە ڕزگار بوونی حەسـەن خۆشـحاڵ بوون و حەسـەنیش دۆعای بەخێری بۆ کردن. لەڕێوە بایەکەی خســت و وڵات ڕووناک بووەوە. حەســـەن بە گاورەکەی گوت: «عەجەمە دەچین بۆ کوێ؟» عەجەمە گوتی: «ڕۆڵە گیان دەچین بۆ چیای ســەحاب، لەوێ گیای ئیکسـیری لێیە. ئینجا سـوێندی بە تیشـک و ئاور خوارد کە تازە ئازاری نادا و کاری پێی نابێ. حەسەن بەو قسەیەی خۆشحاڵ بوو دەستی کردەوە بە خواردن و خەوتن. سێ مانگی دیکە ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە دەشـتێکی پان و بەرین کە خیزەکانی سـپی و زەرد و سەوز و ڕەش بوو.

کاتێک پاپۆڕەکە لەنگەری گرت و ڕاوەستا. عەجەمە هەستا و گوتی: «حەسـەن هەستە با دابەزین بە ئامانجی خۆمان گەیشتین. حەسەن خێرا هەستا و لەگەڵ عەجەمە لە پاپۆڕەکە دابەزین. گاورە شتەکانی خۆی بە پاپۆڕڤانە سپارد و لەگەڵ حەسـەن لە کەشتییەکە دوور کەوتنەوە و لە چاو ون بوون. لەوێ گاورە دانیشــت و تەپڵێکی مســـی چکۆلەی لە گیرفانی دەرهێنا کە وێنەی تەلیســـم و شـــتی لە ســـەر کێشـــرابووەوە. تەپڵەکەی لێ دا. لەجێوە گێژەڵووکەیەک هەستا. حەسـەن پێی سەیر بوو. ترسا و لە هاتنەدەرێی پەشیمان بووەوە و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا.

گاورە چاوێکی لێ کرد و گوتی: «ڕۆڵە ئەوە چ بووە؟ بە تیشـــک و ئاگر کە هیچت لێ ناکەم و ئەگەر کارم پێت نەبایە نەمدەهێنـــا لە کەشـــتییەکە دابەزی دەمهەوێ کارەکە بە نێوی تۆوە بێ. لە نێو ئەو گێژەڵووکەیەدا شتێکی تێدایە سواری دەبین و ئێمە لەو بێروونە دەباتە دەرێ.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! عەجەمە گوتی: ئێمە لەو بێروونە دەباتە دەرێ، ئیدی لە دەست ڕێگا ڕۆیشتنیش نەجاتمان دەبێ. هێشتا قسەکانی عەجەمەکە تەواو نەببوو کە سێ دانە وشتر لە نێو گێژەڵووکەهاتنە دەرێ. عەجەمە بۆخۆی سواری یەکیان بوو، حەسەنیش سواری یەکیان. بار و شتەکەشیان لەوی دیکە نا و ڕۆیشتن. حەوت ڕۆژی دیکە لە ڕێیەدا بوون. جا گەیشتنە شوێنێکی زۆر سەرسەوز و خۆش. لەوێ دابەزین. حەسەن قوببەیەکی دیت لە سەر چوار کۆڵەکەی زێڕ دابەسترابوو. گاورە و حەسەن چوونە بن قوببەکەوە. نان و شتەکەیان خوارد و حەسانەوە. حەسەن لە دوور چاوی بە بینایەکی گەورە کەوت، لە گاورەی پرسی: «ئەو کۆشەکە ئی کێیە؟» گاورە گوتی: «ئەوە ئی وەچەی شەیتانە.» حەسەن گوتی: «هەستە با بچین بزانین خۆش.» گاورە گوتی: «حەسەن ناوی ئەو کۆشکە لە لای من مەهێنە، چونکە دوژمنێکی منی لێیە کە بیرەوەرییەکی خۆشم لێی نییە. ئێرە جێی نییە دەنا هەمووم بۆ دەگێڕایەوە.» دوای ئەوە تەپڵە مسییەکەی لێ دا. وشترەکان هاتنەوە. لەڕێوە هەستان سوار بوون و هەتا حەوت ڕۆژی دیکە بە ڕێیەدا ڕۆیشتن.

کە بوو بە ڕۆژی هەشتەم، گاورە پرسی: «حەسەن چی دەبینی؟» حەسەن وەڵامی داوە کە لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا هەورێک دەبینم. گاورە گوتی: «ئەوەی دەیبینی کێوێکە هێندە بەرزە هەورەکەی کردووە بە دوو بەشەوە و هیچ هەورێک لە سەرووی ئەوەوە نییە. کارەکەی ئێمە لەو سەرە جێبەجێ دەبێ و ئەمن ئەتۆم بۆیە هێناوە بچی ئەو کارەم بۆ جێبەجێ بکەی.» حەسەن کە ئەوەی بیست تەواو دەستی لە خۆی بەردا و بە گاورەی گوت: «تۆ ئەو کەسەی دەیپەرەستی پێم بڵێ ئەتۆ چیت دەوێ و منت بۆ هێناوە؟» گاورە گوتی: «کاری کیمیا جێبەجێ نابێ هەتا ئێمە گیایەک پەیدا نەکەین کە قەت هەوری لێ نەدرابێ. ئێستا ئەو کێوەی ئەو هەورەی دوو لەت کردووە لووتکەکەی لە سەرووی هەورەکانەوەیە و هەور ناتوانێ سێبەری بە سەردا بکا. ئەو گیایەی ئێمەش دەمانهەوێ لەوێ وەگیر دەکەوێ. کاتێک ئەو گیایەمان وەگیر کەوێ ئەمن کارەکەت فێر دەکەم.» حەسەن بە ترس و هیوابڕاوییەوە گوتی: «وایە گەورەم.» بەڵام دەستی لە ژیان شوتبوو، نارەحەتی ئەوە بوو بۆ بە قسەی دایکی نەکردبوو. لە بەر خۆیەوە ئەو شێعرەی گوت:

گەر ڕۆژێ گێڕایانەوە بەسەرهاتم
بزانە خۆشیم نەدیوە. بە سەر، هاتم
حەک بە زیاد بێ ئەو ژیان و بەخت و شانسە
تاک و دەمرم ژیان بۆ من بەند و حەبسە

بەڵێ، گاورە و حەسەن هەر وا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کێوەکە. حەسەن لە سەر کێوەکە ماڵێکی دیت. حەسەن لە گاورەکەی پرسی: «ئەو ماڵە چییە لەو سەر؟» گاورە گوتی: «ئەو ماڵی دیو و درنج و جندۆکانە.» دوای ئەوە گاورەکە لە وشترەکە دابەزی و بە حەسەنیشی گوت دابەزێ. ئینجا سەری حەسەنی ماچ کرد و پێی و گوت: «ئەگەر لەگەڵت خراپ بووم تکایە لێم خۆش بە.» دوای ئەوە عەجەمە هەنبانەیەکی کردەوە و دەستاڕێکی دەرهێنا. لەو هەنبانەیە کەمێکی گەنم هێنا دەرێ و بەو دەستاڕە هاڕی. پاشان گرتییەوە و هەویرێکی پێ کرد. ئەوجار ئاگری کردەوە و سێ نانی پێ کرد. دوای ئەوە تەپڵە مسییەکەی هێنا دەرێ و لێی دا، خێرا وشترەکان پەیدا بوون.

گاورەکە یەکێک لە وشترەکانی کوشتەوە و کەوڵی کرد. بە حەسەنی گوت: «بزانە چیت پێ دەڵێم، بە گوێم بکە.» حەسەن گوتی: «باشە بە قسەت دەکەم.» گاورە گوتی: «بچووە نێو ئەو کەوڵەوە، ئەمن کەوڵەکە دەدرووومەوە و لێرەی دادەنێم. دوای ئەوە باڵندە دێن و هەڵدەگرن و دەتبەنە سەر ئەو کێوە. ئەو کێردەش لەگەڵ خۆت بەرە هەر زانیت ئەوە باڵندەیەک تۆی برد و لە سەر کێوەکە دایناى بەو کێردە کەوڵەکە بدڕە و وەرە دەرێ. باڵندەکان لێت دەترسن و هەڵدێن. ئەتۆ لەو سەرەوە هەرای من بکە، ئەودەم من پێت دەڵێم چ بکەی.» ئینجا هێنای سێ نانەکە و هەنبانەیەکی ئاو لەگەڵ خستە ناو کەوڵەکەوە و کەوڵەکەی درووەوە. بۆخۆی لێی دوور کەوتەوە. ئینجا باڵندەیەکی گەورە هاتە سەری و هەڵیگرت و بردی لە سەر لووتکەی شاخەکە داینا. حەسەن کە زانی باڵندەکە لە سەر لووتکەی کێوەکە داینا، خێرا بە وێردەکە کەوڵەکەی دڕی و هاتە دەرێ و هەرای گاورەکەی کرد.

گاورەکە کە گوێی لە دەنگی ئەو بوو کەیفی ساز بوو لە خۆشیان سەمای کرد و هەڵپەڕی و پێی گوت: «بچووە ئەو لای کێوەکە و چیت دیت پێم بڵێ.» حەسەن واوە چوو سەیری کرد لەوێ ئێسک و پرووسک و چرپی و چاڵی لێ بوو. بە گاورەکەی گوت ئەوانەی لێیە. گاورەکە گوتی: «منیش هەر ئەوانەم دەویست، ئەوانەم بۆ بەردەوە خوارێ.» حەسەن ئەو چرپی و چاڵ و سووتەمەنییەی بۆ بەرداوە خوارێ. گاورەکە گوتی: «ئەمن هەر ئەوەندەم کار بە تۆ بوو. جا ئەگەر پێت خۆش هەر لەو سەرە بمێنەوە دەنا لەوێرا خۆت فڕێدە خوارێ.» گاورە ئەوەی گوت و ڕۆیشت بە لای کاری خۆیەوە. حەسەن گوتی: «سوبحانەڵڵا ئەو گلاوە هەڵیخەڵەتاندم.» جا ئەو جار لەو سەر کێوە دانیشت و دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە.

ئەی چەرخی گەردوون بۆ وام لێ دەکەی
بۆچی بێ بەزە بەو دەردەم دەبەی
هێند بەرزەفڕ بووم بۆیە وام لێ هات

تـــــــــــــــــــــۆش باش دەزانی باڵ و پەڕم بکەی
هەر هەڵکـــــــــــــــــــــشانێک سەرکەوتن نییە
دەبـــــــــــــــــــــــێ بزانی بە کوێ و چۆن دەگەی

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی حەوسەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسـەن کە زانی ئەوانە تەواوی فڕوفێڵ بوون و عەجەمە بە شـێتی زانیوە دەستی کرد بە گریان. دوایە هەستا و چاوێکی لەملا و ئەولا کرد و چوو بۆ ئەولای کێوەکە. لەوێڕا دەریایەک دیار بوو کە هەر شــەپۆلێکی بە قەد کێوێک دەبوو. چووە قەراخ دەریاکە دانیشت و ئەوەندەی دەیزانی قورئانی خوێند و لە بەر خودا پاڕاوە و تکای لێ کرد فریای کەوێ و لەو ڕۆژڕەشییە ڕزگاری بکا.

دوای ئەوە نوێژی مردووی لە ســەر خۆی خوێند و خۆی لە دەریاکە هاویشـت. پێل و شــەپۆلەکان بە ئەمری خودا بردیان هەتا بە ســاغ و ســەلیمی پەڕاندیانەوە قەراخ دەریا. خۆشحاڵ بوو شوکری خودای کرد. دوای ئەوە هەستا وە دوای خواردەمەنی کەوت. گەڕا گەڕا هەتا ڕێی کەوتە لای ئەو کۆشــکەی کە گاورەکە گوتی لە لای من نێوی مەهێنە و دوژمنی منی لێیە. حەسـەن گوتی: «بە خودا هەر دەبێ بچمە نێو ئەو کۆشکەوە ڕەنگە بۆ من باش تەواو بێ. ڕاست چووە نێو کۆشکەکەوە لە دالانی کۆشکەکە سەکۆیەکی لێ بوو، دوو کچی مانگ‌ئاسـا لە سـەری دانیشـتبوون. تەختەی شـەترەنجیان دانابوو یاریان دەکرد. یەکیان ســەری بەرز کردەوە و بەوپەڕی خۆشــحاڵییەوە گوتی: «ئەوە مرۆڤە و پێم وابێ بەهرامی مەجووس ئەو ساڵ هێناوییە.» حەسـەن کە ئەوەی بیست کەوتە سـەر زەوی و دەســتی کرد بە شــین و گریان و گوتی: «ئەمن هەر ئەو لێقەوماوەم کە بەهرام هێناومی. کچە منداڵکارەکە بە خوشــکە گەورەکەی گوت: «دادە ئەوە بزانە کە ئەوە برای منە، بە شــادییەکانی شــاد و بە خەم و ناڕەحەتییەکانی ناڕەحەت دەبم. دوای ئەوە هەســتا و لە ئامێزی گرت و تەوێڵی ماچ کرد. دەستی گرت و بردییە ژووری. جلی پاشایانە و شکۆداری دایە تا لە بەر کا. خواردنی بۆ هێنا و هەردووک خوشــکەکە نانیان لەگەڵ خوارد و پێیان گوت، بەســەرهاتی خۆتمان لەگەڵ ئەو گلاوە لە ســەرڕاوە بۆ بگێڕەوە، جا دوایە ئێمەش بەســەرهاتی خۆمانت بۆ دەگێڕینەوە با بزانی ئەو خوێڕییە کێیە و دووری لێ بکەی.» حەســەن کە ئەو وتانەی بیســت و ئەو هەموو چاکی و دلۆڤانییەی لەوان دیت، کەمێک ئەهوەن بووەوە و بەســەرهاتی خۆی بۆ گێڕانەوە. کچەکان گوتیان: «پرســیاری ئەو کۆشــکەت لێ کرد یان نا؟»گوتی: «بەڵێ لێم پرســی.» گوتی: «ئەوە کۆشــکی وەچەی شـەیتانە و ئەمن ئەو کۆشکەم پێ خۆش نییە.» کەنیشکەکان توورە بوون و گوتیان: «شا ئەو گلاوە ئێمەی بە بەچکە شـەیتان داناوە.» حەسـەن گوتی: «بە خودا وای گوت.» کیژە چکۆڵەکە گوتی: «بە خودا دەبێ دەردی ســەگی دەمێ و شـنەی ژیانی لێ ببڕم. حەســەن گوتی: «چۆنی دەبینییەوە و چۆنی دەکووژی؟» کچەکە گوتی: «ئەو لە باخێکدا دەژی کە باخی مەشیدی پێ دەڵێن، حەتمەن دەیکووژم.»

ئەوجار خوشـــکە گەورەکەی گوتی: «ئەوەی لە باری ئەو گڵاوەوە گوتی هەمووی وا بوو. ئێستا تۆش بەسەرهاتی خۆتمان بۆ بگێڕەوە با قەتی لە بیر نەچێتەوە.» کچە چکۆلەکە گوتی: «کاکە ئێمە شازادەین، باوکی ئێمە پاشای جندۆکانە و لەشکر و خزمەتکاری لە جنن و دێو هەیە. ژنێک و حەوت کچیشـــی هەیە. باوکم ئەوەندە لە خۆبایی و خۆ بە زلزان و شایی بە خۆیە، حازر نەبوو ئێمە لە هیچ پیاوێک مارە بکا. لەبەر ئەوە ڕاوێژکار و وەزیر و شتی خۆی کۆ کردەوە و پێی گوتن: «ئێوە شوێنێکتان پێ شک دێ کە دار و میوەی زۆری لێ بێ و هیچ کەس لە جن و ئینس ڕێی نەکەوێتە ئەوێ؟» ئەوان پرســـیان: «قوربان ئەو شـــوێنەت بۆ چییە؟» گوتی: «دەمەوێ ئەو حەوت کچەم بنێرمە ئەوێ.» گوتیان: «قوربان شوێنێک کە شیاوی ئەوان بێ، کۆشکی جەبەلوسسەحابە. ئەویش ئەو کۆشکەیە کە کاتی خۆی ئەو دێوانەی کە جوابی حەزرەتی ســـولەیمـانیـان نەدابووەوە و دەرکران، چوون ئەوێیان ئاوەدان کردەوە. کاتێکیش ئەوان تۆپین ئیدی تا ئێســـتا هەر وا چۆڵە و کەس پێی پێیدا نەچووە. چونکە ئەوێ لە ئاوەدانی دوورە و کەس ڕێی تێی ناکەوێ. دەوروبەری ئەو کۆشــکەش پڕ لە داروردەخت و میوەی زۆروزەوەند. ئاوێکی شــیرن و خۆشــیشــی لێیە، ئەوەندە ســـازدە هەر دەڵێی بەفراوە. هەر نەخۆشـــێک لەو ئاوە بخواتەوە حەتمەن چاک دەبێتەوە. بابم کە ئەوەی بیســت ئێمەی ناردە ئێرە، کاروانێکی بە هەموو پێداویســتییەکەوە لەگەڵ نـاردین هەتـا ئێرە. هەر کـاتێکیش بیهەوێ بمـانبینێ ئەوە جـادووبـازی هەیە لە چاولێکدانێکدا دێن دەمانبەنە لای ئەو. چەند ڕۆژێک لە لای ئەو دەبین و پاشان دەمانهێننەوە ئێرە. ئێستا پێنج کەس لە خوشکەکانمان چوون بۆ ڕاو. جارەی دوو کەسمان لەو خوشکانە نۆرە حەســـانەوە و دانیشـــتنیانە. ئەوڕۆ نۆرەی من و ئەو خوشـــکەمە لە ماڵێ بین و خواردەمەنیان بۆ ســـاز بکەین. هەمیشـــە لە بەر خودا دەپاڕاینەوە کەســـێکی مرۆڤمان بۆ بنێرێ لێرە هاوڕێمان بێ و بێ تاقەت نەبین. ســـپاس بۆ خودا کە چاومان بە دیداری تۆ ڕوون بووەوە. ئێستاش تۆ هیچ نیگەران مەبە و لێرە زۆر چاکت بۆ دەگوزەرێ.

حەســـەن بەو قسـانە خۆشـحاڵ بوو. شـوکری خودای کرد. دوای ئەوە کچە هەسـتا و حەســەنی بردە دیوێکەوە. حەسـەن لەو دیوەدا ئەوەندەی فەرشـی گرانبای و شتی جوان و چاک دیت هەر باســـی ناکرێ. دوای ئەوەی ماوەیەکی پێ چوو، خوشــکەکانیشـــی لە ڕاو گەڕانەوە. ئەوان هەواڵی هاتنی حەسەنیان بۆ گێڕانەوە. خوشکەکانیشیان خۆشحاڵ بوون و چوونە ئەو دیوەی حەسەنی لێ بوو. سڵاویان لێ کرد و زۆریان بەخێرهاتن کرد. حەسەن لە لای ئەوان خەریکی عەیش و نۆش بوو، لەگەڵیان دەچوو بۆ ڕاو. ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان بوو تا تەواو لەش و جەســتەی بووژاوە و هێزی هاتەوە بەر و خۆی گرتەوە. لەگەڵ کچان خەریکی ڕاو و ســـەیران بوو. ڕۆژێک خوشــکی چکۆلەیان کە پەیمانی خوشــک و برایەتی لەگەڵ حەســـەن بەســتبوو. بە خوشــکەکانی گوت: «گوتی کە گاورەکە پێی گوتوون ئەوانە

بەچکە شەیتانن.» خوشکەکان بەڵێنیان دا کە ئەو گڵاوە بکوژن. وابوو ساڵی دوایە، گاورە لەگەڵ کوڕێکی وەک مانگی چاردە هاتەوە و لە خوار کۆشکەکە باری خست. لەو جەنگەیەدا حەســـەن لە بن دارێک لە قەراخ چۆمی دانیشـــتبوو. هەر کە دیتی ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و دەستی لە خۆی شوت.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن ترسا و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، چوو بە کچەکانی گوت: «خوشکینە بیکەن بۆ خاتری خودا یارمەتیم بدەن با ئەو گڵاوە بکووژین، ئەوە دیسان چووە منداڵی یەکێک لە موسوڵمانە خانەدانەکانی بە دیل گرتووە و کۆت و زنجیری کردووە. بە خراپترین شێوە ئازاری دەدا. ئێستا دەمهەوێ حەتمەن بیکووژم و تۆڵەی خۆمی لێ بستێنمەوە و ئەو کوڕەش ڕزگار بکەم بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. ئێوەش یارمەتیم بدەن. خودا پاداشی چاکەتان بداتەوە. کچەکان گوتیان: «حەسەن لە ڕێی خودا و لەبەر خاتری تۆ ئێمە هەوڵی خۆمان دەدەین. ئینجا دەمامکیان لێ دا و دەستیان دا چەک. ئەسپێکیان بۆ حەسەنیش هێنا کە لە باشترین ئەسپەکان بوو. چەکیان دا بە حەسەنیش.

دوای ئەوەی هەموویان چوونە ئەوێ سەیریان کرد ئەوە گاورە وشترێکی کوشتووەتەوە و کەوڵی کردووە. هەڕەشە لە کوڕەکە دەکا بچێتە ناو کەوڵەکەوە. حەسەن لە پشتەوەڕا چوو لە پشت سەری وێستا و گوتی: «ڕاوەستە خوێڕی.» گاورە ئاوڕی داوە و حەسەنی دیت. ئینجا گوتی: «ڕۆڵە ئەوە تۆیت، چۆنت ڕزگار بوو، چۆن هاتییە ئێرە؟» حەسەن گوتی: «خودانەناس، خودا ڕزگاری کردم، ئێستا ئەوە تۆ پێوە بووی و خودا تۆڵەی ئەو زوڵمانەت لێ دەکاتەوە، بۆخۆت گوتت هەرکەس خەیانت بە نان و نمەک بکا، خودا تۆڵەی لێ دەکاتەوە. چونکە تۆ خەیانتت بە من کرد، ئەوە خودا خستییە بەر دەستی من و تازە ڕزگار بوونت ئاستەمە.» گاورەکە گوتی: «کوڕم تۆ لە گیان ئازیزتری بۆ من.» حەسەن گوێی نەدایە و چووە پێشێ بە شیرێک لە نێو قەدەوە دوو لەتی کرد. دوای ئەوە دابەزی و زارکی هەنبانەکەی کردەوە. تەپڵەکەی دەهێنا و لێی دا. لە ڕێوە سێ وشتر لە بەر دەمیان قوت بوونەوە. حەسەن کۆت و زنجیری لە کوڕەکە کردەوە و سواری یەکێک لە وشترەکانی کرد. تۆشە و پێداویستی ڕێگایەی لە دوو وشترەکەی دیکە نا و پێی گوت: «تۆ بگەڕێوە بۆ وڵاتەکەی خۆت.» ئەو کوڕە دۆعای بە خێری بۆ حەسەن کرد و لێی دا ڕۆیشت.

کچەکان بە کوژرانی گاورەکە خۆشحاڵ بوون و سەریان لە ئازایەتی حەسەن سووڕ ما و دەست خۆشیان لێ کرد. حەسەنیان هەڵگرت و پێکەوە گەڕانەوە بۆ کۆشک و دەستیان کرد بە عەیش و نۆش و کەیف و ئاهەنگ. حەسەن دایکی لە بیر چووبووەوە. ڕۆژێک لە کاتێکدا ئەوان خەریکی عەیش و نۆش بوون لە دوور تۆزێک لە دەشتاییەکان هەستا. کچەکان گوتیان: «حەسەن هەستە، بڕۆ لە باخ لە نێو ئەو دار و شتە خۆت بشارەوە، مەشترسە هیچ نابێ. لەڕێوە حەسەن چوو لە دیوێکەوە و دەرگاکەی لە سەر خۆی داخست.

پاش ماوەیەک تۆزەکە کەمێک نیشتەوە، لە نێو تۆزەکەدا لەشکرێکی لە بژارنەهاتوو لە لایەن باوکی کچەکانەوە گەیشتێ. کچەکان جێگای باشیان بۆ سوارەکان دابین کرد و هەتا سێ ڕۆژان میوانداریان لێ کردن. ئینجا لێیان پرسین چۆنە هاتوون؟ ئەوان گوتیان: «پاشا ناردوونی ئێوە بەرین.» گوتیان: «ئێمە بۆ دەبن.» فەرماندەی لەشکرەکە گوتی: «یەکێک لە پاشاکان زەماوەندی کردووە و دەیهەوێ ئێوەش لەو خۆشییەدا بەشدار بن.»

کچەکان پرسیان: «چەندمان پێ دەچێ؟» فەرماندە گوتی: «بێجگە لە چوون و هاتنەوە دوو مانگتان پێ دەچێ.»

کچەکان هاتنە لای حەسەن و پێیان گوت: «ئێرە ماڵی خۆتە، بێ ترس و نیگەرانی لێرە بمێنەوە و کەس بێرەدا نایە، خەمی هیچت نەبێ. هەتا ئێمە دێینەوە. ئەوەش کلیلی دیوەکان. بەڵام تکات لێ دەکەین فلانە دیوە مەکەوە چونکە هیچ کارێکت بەوێ نییە.»

دوای ئەوە کچەکان ماڵاواییان لە حەسەنی زێڕینگەر کرد و لەگەڵ لەشکرەکە وەڕێ کەوتن و حەسەن بە تەنیا لە ناو کۆشکدا ماوە. بەڵام وردە وردە ترس و نیگەرانی بە سەریدا زاڵ بوو. نارەحەت بوو. خەمی کچەکانی بوو. ئەو دونیا بەرینەی لە بەر چاوی تەنگ بوو. کچەکانی وەبیر هاتەوە و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تا کەنگێ سەرگەردان و شێواو و دڵبەخەم
شەو و ڕۆژ بە تاقی تەنیا، وەکوو دیل لێرەم
دوور لە وڵات، مات و مەلوول دەستەوئەژنۆبم
ڕەنگە ڕۆژێ بێ لەگەڵ گورگیش ببمە هاودەم

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و هەشتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن بە تەنیا دەچوو بۆ ڕاو و نچیری دەگرت و دەیهێناوە دەیکوشتەوە و دەیخوارد. هەتا وای لێ هات لە تەنیاییدا ترسی ڕێنیشت و دایمە لە دڵەڕاوکێ دا بوو. بێ تاقەت بوو هەستا یەک بە یەک دیوەکان گەڕا. شتی جوان و جێی سەرنجی دەدەی. بەڵام چونکە کچەکان لە ماڵ نەبوون هیچ شتێک تامی نەبوو. هۆشی هەر لە لای ئەو دەرگایە بوو کە کچەکان گوتبوویان نەیکاتەوە. لە زەینی نەدەچووە دەرێ، حەجمینی نەبوو. ئەو خوشکەی من لە خۆڕا نەیگوت ئەو دەرگایە نەکەمەوە، دەبێ شتێکی تێدا بێ کە نایانهەوێ کەس لێی ئاگادار بێ. خۆ بە خودا نەیبینم دڵیشم دەتۆقێ. وەڵڵاهی هەر دەیکەمەوە، بزانم چی تێ دایە ئەگەر گیانیشمی لە سەر دانێم. ئیدی دەستی دا کلیل و چوو دەرگاکەی کردەوە. لەوێ هیچی نەدی بەڵام نێردیوانێکی تێدا بوو کە پلیکانەکانی لە عەقیقی یەمانی بوو. لەو نێردیوانە چووە سەرێ هەتا چووە سەر بانی کۆشکەکە. لەوێ شوێنێکی لێ بوو، کە هەمووی دار و باخ و گوڵی کێوی و مەل و باڵندەی دەنگخۆش بوو. لە سەر کۆشکەکە دانیشتبوو. لەو جەنگەیەدا کە ورد دەیڕوانییە دەوروبەر چاوی بە دەریایەکی گەورە کەوت کە شەپۆلەکانی وەک کێو بەرز دەبوونەوە. هەر وا بە سەربانی کۆشکەکەدا دەهات و دەچوو تا گەیشتە کۆشکێکی دیکە. لەو کۆشکەدا دیوێکی دیکەی تێدا بوو کە لە یاقووتی سوور و سەوز و دیوارەکانی لە زێڕ و زێو چێ کرابوو. دارودیوارەکەی تەواوی نەقاشی کرابوو. لە نێوەڕاستی ئەو دیوەدا حەوزێکی گەورەی تێدا بوو، پڕ لە ئاو. لە سەر ئاوەکە تەختێکی لە داری سەندەڵ و عوود چێ کرابوو. لە قەراخ حەوزەکە مەلی دەنخۆش و جوانی لێ بوو. حەسەن لە خۆشی ئەو شوێنە حەبەسابوو. لەوێ دانیشت و بەملاولادا چاوی دەگێڕا، کە لە پڕدا دە دانە باڵندە لە لای دەشت و بێروونەوە هاتن بۆ سەر ئەو گۆلە. حەسەن لە دوور زانی ئەو باڵندانە دێنە سەر ئەو گۆلە بۆ ئاوخواردنەوە. چوو لەولاوە خۆی حەشار دا. گوتی با نەسلەمێنەوە بڕۆن.

باڵندەکان هاتن و لەسەر دارێکی بەرز نیشتن. حەسەن تەماشای کرد یەکێک لە باڵندەکان لەوانی دیکە جوان و بەرچاوتر بوو. ئەوانی دیکە هەموو لەو ئاڵا بوون و خزمەتیان دەکرد. حەسەن پێی سەیر بوو. ئەو باڵندە جوانە بە دندووک لەوانی دیکەی دەدا و گەورەیی بە سەردا دەکردن. ئەوانی دیکە سڵیان لێ دەکرد. حەسەن لە دوور سەیری دەکردن. دوای ئەوە باڵندەکان چوونە سەر تەختەکە هەڵنیشتن. هەرکام لەوان بە چنگ و دندووک پەڕوباڵیان داماڵی. هەر یەکی بوو بە کچێک وەک مانگی چواردە. دە کیژی گوڵڕوخسار چوونە ناو ئاوەکەوە زۆریان مەلە و گاڵتە و جەفەنگ کرد. ئەو باڵندە بەرچاو و جوانەکە لەوێشدا بە سەر ئەوانیدا زاڵ بوو. کچەکانی دیکەی دەگرت و لە ئاوەکەی ڕۆ

دەکردن. کچەکانی دیکە لە بەری هەڵدەهاتن و نەیاندەوێرا دەستی بۆ بەرن.

حەسەن کە ئەوانەی دیت بە جارێ ئاوەزی شێوا. زانی کە خوشکەکان لە خۆڕا بەویان نەگوتبوو کە ئەو دەرگایە نەکاتەوە.

کورتی کەینەوە، حەسەن ڕاوەستابوو ڕووبەڕوویان تفی قووت دەدا و شەیدای کچە جوانەکەیان ببوو. لە تاوانی و لە خۆشەویستیانی دەستی کرد بە گریان.

پاش ماوەیەک کچەکان لە گۆلەکە هاتنە دەرێ. حەسەن ڕاوەستابوو تەماشای دەکردن و ئەوان حەسەنیان نەدیتبوو. حەسەن سەری لەو هەموو جوانییەیان سووڕ مابوو. کچەکان هەریەکی جلوبەرگی خۆی لە بەر کرد و ئەو کچە ڕووگەشە کراسێکی سەوزی لە بەر کرد و بە جوانی و دەلالی خۆی گاڵتەی بە عالەم دەکرد و بە ڕەوتی ئاسکانەوە داخی بە دڵی سەلو و شمشادەوە نا. لێو و ددان و ڕوخساری بە جۆرێک بوون، وەک شاعیر دەڵێ:

یاقووتی سوور و مرواری و شەکرن ئەوانە
کێ دەڵێ ئەو تۆپە گوڵە لێو و ددانە
ست دەکا دڵ و دەیخاتە داوی عیشقەوە
شیرینی و دڵڕفێنی ئەو لێوە جوانە

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن کە کچەکانی دیت لە گۆلەکە هاتنە دەرێ، نوقمی سەیری جوانی و دەلالی کچە گەورەکەیان بوو. هەر لە بەر خۆیەوە شیعری دەخوێندەوە. کچەکان جلەکانیان لە بەر کردەوە و دەستیان کرد بە کایە و جەفەنگ و قسە گێڕانەوە. حەسەنیش ڕاوەستابوو تەماشای دەکردن. نوقمی دەریای سەرسووڕمان و ئەودالی خیالی هەوسار پچڕاوی بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «بە خودا ئەو خوشکانە لە خۆڕا بە منیان نەدەگوت ئەو دەرگایە نەکەمەوە دەترسان ئۆگر و ئەڤینداری یەکیان بم. ئەو جار جوان لە جوانی و ڕێکوپێکی و شەنگ و شەپاڵی کچەکە ورد بووەوە و بۆی دەکەوت بە ڕاستی دەلالە هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ئازەر و مانـــــــــــــی کە کاریان لە سەر دڵبەر کردووە
بەبێ ڕووی وەکوو مانگ و زولفی وەک عەنبەر کردووە
عەنبەری زولف و هـــــــــــەیڤی ڕوخساری دڵبەرم منی
بێ پێویستی بە وێنەکەی مانـــــــــــــی و ئازەر کردووە
هەم سمتی خڕ و قەڵەوە و هەم ناوقەدی باریـــــــــــــک
ئەڤـــــــــــــــین و هێمنی منی فرە و لەڕ کردووە
هەروەک و زنجـــــــــــیر و زرێ گووی لە کارم کردووە
ئاڵقە و زنجـــــــــــیری بسکی منی دەستبەسەر کردووە

بە کورتی، کچەکان بەردەوام خەریکی گەمە و کایە بوو و حەسەنیش ڕاوەستابوو چاوی تێ بڕیبوون هەتا ئێوارە. ئەو کچە بە هاوڕێکانی گوت: «کچانی پاشا، ڕۆژ درەنگە و شارەکەشمان لێرە دوورە، هەستن با بڕۆینەوە شوێنەکەی خۆمان. بە لەز هەستان پەڕ و باڵەکەیان لە خۆیان شەتەک داو لە شەقەی باڵیان دا و فڕین. حەسەن دەستی لێ شوتن و هیوای لە دەست دا. ویستی هەستێ، نەیتوانی فرمێسکەکانی بە سەر گۆنایدا هاتنە خوارێ و ئەو شیعرەی خوێندەوە:

هەشت شتم هەشت شتی بە سانایی لە دەست دەر چوو
لـــــــــێو ئاڵ و چاو کەژاڵم وەک مەل لە دەستم بەر بوو
لەش قەراری، دڵ خۆزگەی، زار وتە و گـــــــــیان شادی
لەپ جام و ئیشیتا حەز و ڕوو ڕەنـــــــــگ و چاویش خەوی
شـــــــین و ڕۆمە بولبول ئاسا، چاویــــــــش پڕ لە خوێنە

ئەو کەوە دەنگ ڕوبابەم کە وا بێ ســـــــــــــەر و شوێنە

دوای ئەوە وردە وردە لە ســــەربانی کۆشـــکەکە هاتەوە خوارێ و چووەوە دیوەکەی خۆی و دەرگای لە سەر خۆی داخست و ئەژنۆی خەمی لە باوەش گرت. نە هیچی خوارد و نە هیچی خواردەوە. هەتا بەیانی هەر لە دەریای فکر و خەیالاندا مەلەی کرد. کە ڕۆژ بووەوە ئەو شێعرەی گوت:

دوێ شـــەو لە ســـوێت هـاوارم ئـاســـمانی کەڕ دەکرد
ڕۆندک لە چـــــــــــاوم دەڕژا و دەوروبەرمی تەڕ دەکرد
جاری وا بوو وەکـــــــــــــــوو عوود دەروونم هەڵدەقرچا
جـار جـار لە گـــــوێن ئـاوردان دووکەڵم لێ هەڵدەســتا
هۆشم دەهات و دەچـــــــــــــــوو ئەتوم بەدی نەدەکرد
لە ئاوێنەی خەیاڵــــــــــــــــــیشمدا هاتوچۆت دەکرد

کە ڕۆژ بووەوە، دەرگای کردەوە و چووە ئەو شـــوێنەی کە ڕۆژی ڕابردوو پێیدا وە ســـەر کەوت. هەر بەوێدا وە ســـەر کەوت چوو لە شـوێنێک کە دەیڕوانییە ناو باخ و گوڵ شتەکە، دانیشت هەتا بوو بە شەو. بەڵام مەلەکان نەهاتن. حەسەن دەستی کرد بە گریان و ئەوەندە گریا هەتا بێهۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە، وردەوردە لە ســـەربانی کۆشـک هاتە خوارێ. ئەو دونیا ڕووناک بەرینەی لە بەر چاو تەنگ و تاریک بوو. ئەو شـــەوە هەتا تاوهەڵاتی بەیانی یەک تەکان گریا. حەســـەن خەو و خواردنی نەبوو، ئارام و قەراری لێ بڕابوو. لە بەر خۆی ئەو شێعرەی دەخوێندەوە.:

عیشــقی ئەو وام لێ دەکا من هەر بە ســـەر خۆمدا بدەم
ئـاور لە لەســـەرەخـۆی و هـۆش و ژیـریـم بەر دەدەم
تا ئەو ڕۆژەی ئەڤـــــــــــــینی ئەو پاشا بێ بە سەرمەوە
من لە بۆ پـاراســـتنی ئەو شـــەو و ڕۆژم یەک دەخەم

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە ئەوی حەوسەد و هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەنی زێڕینگە کە زۆر وەڕەز و تامەزرۆی هاودەمێک بوو، شێعری دەخوێندەوە و لە کۆشکدا بە تەنیا دەگریا و دەکڕووزاوە. وا بوو ڕۆژێک لە دوور سەیری کرد تۆزێک هەستا. حەسەن لە کۆشک هاتە خوارێ. ئەوەندەی نەخایاند کە سوارەکان گەیشتنێ و دەوری قەڵایان دا. حەوت کەنیشکەکە لە ئەسپ دابەزین و چوونە کۆشکەوە. شیر و شتەکەیان لە خۆیان کردەوە. بەڵام کچی گچکە شیر و شتەکەی لە خۆی نەکردەوە و یەکڕاست چوو بۆ دیوەکەی حەسەن، تەماشای کرد حەسەن لەوێ نییە. کەوتە پێوشوێنی هەتا لە پەنایەکدا دیتییەوە. سەیری کرد ئەوە لەڕ و کز و خەمبار لە سووچێکدا دانیشتووە. ڕەنگ زەرد و لێوبەبار. هێندە گریاوە چاوەکانی بە قووڵدا چووە. کچە کە ئەوەی دی ئاوی ئەژنۆی چوو. گوتی: «ئەوە چ بووە؟ بۆ وات لێ هاتووە؟ کاکە گیان پێم بڵێ با فکرێکت بۆ بکەمەوە. بە قوربانت بم پێم بڵێ با خەمی دڵت بڕەوێنم.» حەسەن دەستی کرد بە گریان و ئەو دوو بەیتەی گوت:

ئاخ و داخ هەڵدەکێشم لە تاوی عیشقی کەسێک
کە قەت قەت یادم ناکا بە سەد ساڵانیش جارێک
چاوێک لە چاوی چاوەڕوانم ناکا پڕ بە دڵ
تا ببینێ خوێنی دڵ لە چاوی مندا چەلێک

کچە سەری لە ڕەوانبێژی حەسەن سووڕ ما و گوتی: «کاکە ئەوە کەی کەوتوویتە ئەو داوەوە، کەی وات لێ هات، شێعر بڵێی و ئاوا ئەسرین ببارێنی؟ تۆ ئەو خودایە ڕاستیم پێ بڵێ چ بوو؟ خەریکە دڵم بتۆقێ و شێت بم. دنیام لە بەر چاو تاریک بووە. حەسەن ئاخێکی هەڵکێشا و فرمێسکی هاتە خوارێ و گوتی: «خوشکەکەم دەترسم ئەگەر ڕاستیت پێ بڵێم، یارمەتیم نەدەی بە ئاوات بگەم. بەڕەڵام کەی هەتا بە داخ و دەردی خۆمەوە بمرم.» کیژەکە گوتی: «نەوەڵا، چۆن شتی وا دەکەم، ئەمن گیانیشمت لە پێناودا دادەنێم.» ئیدی حەسەن ڕوودوای خۆی و کچەکانی بۆ گێڕاوە، گوتی کە لەو ڕۆژەوە کە ئەوە کچانە لە بیچمی باڵندە هاتنە قەراخ ئاوەکە و لەوێ بوون بە کچ ئەمن دە ڕۆژە نە خەوم هەیە و نە خۆراک، دیسان دەستی کردەوە بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

خۆزگە شتی هێندە جوانم هەر نەدەی بایە
ئەوەی من دیتم تا هەتا لە زەینم دایە
ئێستە دڵم هەڵدەقرچێ لە گوێن برێشکە
ژانی ئەڤین هێند بە سۆیە لە گوتن نایە

خوشـكـەكەشـی دەسـتی كرد بە گریان و زگی پێی سـووتا و بەزەیی بە غەریبییەكەیدا هـات و پێی گوت: «كـاكە گیـان لەوە ئەرخەیـان بە ئەمن لە تۆش زیـاتر خۆم دەخەمە مەترسـییەوە و سـەرم دەكەمە بەردەبازی بە ئاوات گەیشـتنت. فكرێكت بۆ دەكەمەوە تا بە خۆشەویستەكەت بگەی. بەڵام براگیان یەك تكات لێ دەكەم، ئەو شتەی لە لای خوشكەكانم بـاس نەكەی بـا بە نهێنی بمێنێتەوە دەنـا هەردووكمـان دەكوژرێین. ئەگەر ئەوان بـاسـی كردنەوەی دەرگاكەیان كرد ئەتۆ بڵێ ئەمن نەم كردووەتەوە. قسـەكەی ئێوەم هەر لە بیر بوو.» حەسەن گوتی باشە بە چاوان وا دەكەم. ئینجا سەری كچەی ماچ كرد. دڵی حەساوە. چونكە زۆر لەوە دەترسـا كە ئەو كچەی خوشـكی ئەو بوو بزانێ دەرگاكەی كردووەتەوە. دوای ئەوە بە خوشكی گوت شتێكی بداتێ بیخوا.

خوشكەكەی خێرا هەستا و حەسەنی بەجێ هێشت. چووەوە لای خوشكەكانی بە دڵێكی نارەحەت و چاوی بە فرمێسكەوە. خوشكەكانی گوتیان: «ئەوە چ بووە؟ بۆ وا نارحەتی؟» ئەویش گوتی: «براكەم نەخۆشـە و دە رۆژە هیچ نەخواردووە. ئەوان گوتیان باشـە بۆ نەخۆش كەوتووە؟ كچە گوتی: «هەر ئێ رۆیشتی ئێمە و بە تەنیا مانەوەی بووە.» كچەكان كە ئەوەیـان زانی خەمیـان بوو بۆی نـارەحەت بوون و گوتیـان: «وەڵا فەقیرە نـاحەقی نەبووە.» ئیدی هەستان چوون سوارەكانیان بەڕێ كردەوە و هاتنەوە ژووریٚ و چوون بۆ لای حەسەن. سڵاویان لێ كرد سەیریان كرد، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و تەواو تێك چووە. بەزەییان پێیدا هات و دەسـتیان كرد بە گریان. ئیدی لە لای دانیشـتن و دڵخۆشـیان داوە، ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی لە ڕێدا تووشی ببوون، هەموویان بۆ گێڕاوە باسی بووك و زاواكەیان بۆ كرد. دوای ئەوە ئیدی هەتا مانگێك هەر دەهاتنە لای و قسە باس و شۆخیان لەگەڵ دەكرد. بەڵام ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر تێك دەچوو. ویشك هەڵدەهات و خرابتر دەبوو. كچەكان بۆی دەگریان و بۆی بە پەرۆش بوون، بە تایبەت كچە چكۆلەكەیان هەر بە كەس ژێر نەدەبووەوە.

دوای مانگێك كچەكان پێیان خۆش بوو بچن بۆ ڕاو، سـاز بوون و داوایان لە خوشـكە گچكەكەشـیان كرد سـاز بێ بەڵام ئەو گوتی بە خودا ئەمن ناتوانم و تاقەتم نییە بێم. ئەمن لە لای براكەم دەمێنمەوە و ئاگام لەو دەبێ. بەشكوو چاكتر بێ. خوشكەكانی كە وەفاداری ئەویان دیت دەسـت خۆشـیان لێ كرد و گوتیان ئەوەندەی تۆ چاكە لەگەڵ ئەو غەوارەیەدا بكەی خودا پاداشـی چاكەت دەداتەوە. دوای ئەوە خوشـكە چكۆلەكەیان لە لای حەسـەن بەجێ هێشت و خواردەمەنی و پێداویستی بیست ڕۆژیان هەڵگرت و لێیاندا ڕۆیشتن.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەمشـەویش كۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

# كە شەوی حەوسەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــكۆ! كچەكان خوشــكە چكۆلەكەیان لە لای حەســەن بەجێ هێشــت و بۆخۆیان چوون بۆ ڕاو. كاتێک ئەوان لە كۆشــک دوور كەوتنەوە، خوشــكەكەی حەســەن ڕووی لە حەســەن كرد و گوتی: «كاكە گیان هەســتە ئەو شــوێنەی كە كچەكانت لێ دیت پێشانم بدە.» حەسـەن خۆشـحاڵ بوو. ویسـتی هەستێ لەگەڵی بچێتە ئەوێ بەڵام هێند بێ هێز بوو نەیتوانی بڕوا. كچە لە باوشــی كرد و بردییە ســەربانی كۆشــک. حەســەن ئەو شوێنەی لەوێوە كچەكانی دیبوو پێشانی خوشكەكەی دا. كیژۆڵەكە گوتی: «كاكە گیان ورد پێم بڵێ كە ئەوان چۆن هاتن.» حەســـەن چی بە كچەكانەوە دی بوو، لە ئەوەڵەوە بۆی گێڕاوە و پەســنی ئەو كیژەشــی كرد كە دڵی گرتبووی. كاتێک باســی ئەو كیژەی بۆ كرد ناســییەوە. ڕەنگی زەرد بوو حاڵی تێک چوو. حەســەن گوتی: «خوشـكێ ئەوە بۆ ڕەنگت زەرد هەڵگەڕا؟» كچە گوتی: «براگیان ئەو دەلال و جوانە كچی یەكێک لە پاشـــاكانی جندۆكەكانە و ئەو ئینس و جنێكی زۆری لە بەر دەســت دایە. ســیحر باز و جادووبازێكی زۆری لە ژێر دەسەلات دایە، شار و وڵاتێكی زۆری هەیە. بابی ئێمە یەكێک لە بریكارەكانی ئەوە. مەمنا هێندەی لەشكر و وڵات هەیە قەت كەس ناتوانێ بە سەریدا زاڵ بێ. شـوێنێكی بۆ كچەكانی خۆی چێ كردووە بە پانی و درێژایی یەک فرسەخ. لە هەر چوار لایەوە چۆمی گەورەی تێیدا دەهەرەكێ و نە ئینس و نە جن كەس ناتوانێ قاچ بخاتە ئەوێوە. بیســـت و چوار هەزار ســـواری قەیرە كچی هەیە. كە هەر كام لەوان ئەگەر بێت و ســـوار بن و كەرەسەی شەڕ لە خۆ دەن، لەگەڵ هەزار سواری چالاک بەربەرەكانی دەكەن. حەوت كچی هەیە كە ئازایی و بە زەبریان بەرابەری تەواوی ســپاكەیەتی. پاشــا كچە گەورەكەی خۆی كردووە بەرپرســی ئەو شــوێنەی باســم بۆ كردی. ئەو كچە گەورەشــی لە ئازایی و ســـوارچاكی و بیر و پلان و شـــارەزایی ســـیحربازی لە هەموو خەڵكی گۆی زەوی لە سەرترە. ئەو جلە باڵ و پەڕانەی كە پێی فڕیون ئی كارزانی و لێ زانی سیحربازانی هۆزی جانە. ئەگەر تۆ دەتهەوێ دەســتت بەو كچ ڕابگا و زەماوەندی لەگەڵ بكەی لێرە دانیشـــە، چونكە ئەوان سەری هەموو مانگان دێنە ئێرە. هەر كە زانیت ئەوان هاتن لە پەنایەكدا خۆت حەشــار بدە. بەڵام دەخیلت بم نەهێڵی بتبینن. چونكە هەموومان دەكووژرێین. لە شــوێنێكی وا دانیشە كە لێیان نیزیک بی ئەتۆ ئەوان چاک ببینی و ئەوان تۆ نەبینن. ئەوان كە ویستیان جلەكـانیـان داكەنن، ئەتۆ جوان چـاو لێ بكە بزانە كـامیـان جلی ئەو كیژەیە وا تۆ دڵت گرتوویەتی. دوای ئەوەی ئەوان چوونە نـاو ئـاوەكەوە، بچووە جلەكـانی ئەو كچە بێنە و دەســـت لە جلی ئەوانی دیكە مەدە. ئەو جلە تۆ بەو كچە دەگەیەنێ. بەڵام وریا بە كە تۆ جلەكانت هەڵگرت ئەو دەیهەوێ فریوت دا و بتخاپێنێ. دەڵێ: «ئەی ئەو كەســـەی جلەكانی

من هەڵگرتووە، جلەکام بدەوە. ئەمن تازە ئەوە لە لای تۆم و لە ژێر فەرمانی تۆ دام و بێ قسەییت ناکەم. بەڵام دەخیلت بم جلەکانی نەدەیەوە چونکە بە سەرتەوە ناچێ و دەتکووژێ. کۆشکەکەی ئێمەش بە سەرماندا کاول دەکا و بابیشمان دەکووژێ. بەڵام کچەکانی دیکە کە دیتیان جلەکانی ئەو دزراوە ئەو بە تەنیا بەجێ دێڵن و دەفڕن. ئیدی بچووە بۆ لای و پیلی بگرە و بیهێنە بۆ لای خۆت تازە ئەو ئی تۆیە. بەڵام دەبێ لەوە بە دوا ئەو جلە پەڕانەی هەڵگری و نەیدەیەوە، لە لای خۆت ڕایگری. بێت و وەدەســـتی کەوێ دەتوانێ بفڕێ. ئاوا ناتوانێ بچێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. دوای ئەوەی گرتت بیبەوە ماڵەکەی خۆت بەڵام تا بۆت دەکرێ مەهێڵە بزانێ تۆ جلەکانیت هەڵگرتووە.

حەســـەن کە ئەو ڕێنوێنییەی لە خوشـکەکەی بیسـت. دڵی ئەهوەن بووەوە و خەمی لە دڵدا نەما و سەری خوشکەکەی ماچ کرد. دوای ئەوە هەستان و لەگەڵ کچەکە لە سەربانی کۆشک هاتنە خوارێ. بۆ بەیانییەکەی، حەسەن هەستا و دەرگای کردەوە و چووە سەربانی کۆشـک. هەتا شـەو لەوێ دانیشـت. خوشـکەکەی خواردن و شـەرابی بۆ دەبرد و تەنانەت جلی لێ دەگۆڕی. حەســەن ئەو شـەوەش چووەوە و بەیانی زوو هاتەوە جێی خۆی. ئیدی بەردەوام ئەوە کاری حەســـەن بوو. تا مانگ نوێ بووەوە. هەر چاوەڕێی ئەوان بوو. هەتا وا بوو پەیدا بوون. حەســەن چوو لە ســووچێکدا خۆی مات دا. مەلەکان هاتن و هەر یەکی لە شـوێنێک نیشـتن و پەڕەکانیان لە خۆیان کردەوە. ئەو کچەی حەسـەن بە تەمای بوو لە جێیەکی نیزیک حەســـەن نیشـــت. کاتێک کەنیشـــکەکان چوونە ناو ئاوەکەوە، حەســـەن بە ئارامی چوو جلەکانی هەڵگرت. خودا ڕوحمی پێ کرد و هیچکام لە کیژەکان نەیاندیت. ئەوان خەریکی یاری و جەفەنگ بوون. کاتێک کچەکان لە کایە و گەمە وەستان و لە گۆلەکە هاتنە دەرێ، هەرکەســەی چوو پەڕەکانی خۆی لە خۆی داوە. گراوەکەی حەسـەن جلەکانی نەدیتەوە. دەســتی کرد بە شــین و گریان و لە خۆدان و ســەروقژ ڕنینەوە. خوشـکەکانی گوتیان: «ئەوە چ بووە؟» ئەویش پێی گوتن. ئەوانیش دەستیان کرد بە گریان و لە خۆ دان. کاتێک بوو بە شـــەو نەیانتوانی لەوێ بمێننەوە. ناچار ئەویان لە ســـەربانی کۆشــک بەجێ هێشت و بەرە و ماڵ فڕین.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و نەوەد هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن که زانی کچەکان بەجێیان هێشت و ڕۆیشتن. گوێی بۆ ڕاگرت. گوێی لێ بوو دەیگوت: «ئەی ئەو کەسەی جلەکانی منت هەڵگرتووە و منت بە ڕووتی هێشتووەتەوە، تکات لێ دەکەم جلەکانم دەوە با عەیبی خۆمی پێ داپۆشم. هیوادارم خودا ئەو پەندەی منت بە سەر نەهێنێ. حەسەن کە ئەوەی بیست هۆشی لای خۆی نەما و تاقەتی بە سەر چوو. لەڕێوە هەستا هەڵات پیلی گرت و کێشای و لە سەربانی بردییە خوارێ و بردییە دیوەکەی خۆی. کەواکەی خۆی بە سەردا دا. کچە هەر دەگریا و گازی لە قامکی خۆی دەگرت.

حەسەن هەستا دەرگاکەی لە سەر داخست و بۆخۆی چوو بۆ لای خوشکی و ئەوەی ببوو هەمووی بۆ گێڕاوە. خوشکی کە ئەوەی زانی هەستا و چوو بۆ لای کچەکە. تەماشای کرد ئەوە مات و مەلوولە دانیشتووە و دەگری. خوشکی حەسەن کڕنۆشی بۆ برد و سڵاوی لێ کرد. ئەو کیژە دەلالە بە کیژۆڵەکەی گوت: «کچی پاشا، گەلۆ دەبێ لەگەڵ کچی پاشا ئاوا بکرێ؟ خۆ تۆ دەزانی باوکی من پادشایەکی مەزنە و تەواوی پادشای جنیان لە ترسی ئەو دەلەرزن و سیحرباز و جادووباز و دێوی دونیای لە بەر دەستیدایە و لەشکرێکی لە ئەژمار نەهاتووی هەیە. کچەکانی پاشا ئەو کارە بۆ ئێوە جوان نییە. کوڕە مرۆڤتان لە لای خۆتان ڕاگرتووە و ڕێتان پێشان داوە بتوانێ زەفەر بە ئێمە بەرێ. دەنا ئەو کوڕە لە کوێ دەتوانێ بێتە هەرێمی ئێمەوە.»

خوشکی حەسەن گوتی: «شاژن، ئەو کوڕە مرۆڤە زۆر کوڕی چاکە و ئەو بە تەمای کاری خراپ نییە. بەس ئاشقی تۆ بووە و تۆی چووەتە دڵییەوە. ژنان بۆ پیاوان ئافرێندراون. ئەگەر ئەو کوڕە تۆی خۆش نەویستبا ئاوا کز و لاواز نەدەبوو، وا خەریکە گیانی دەرچێ.» کیژۆڵەکە تەواوی ئەوەی حەسەن لە خۆشەویستی ئەو بە سەری هاتبوو هەمووی بۆ گێڕاوە.

کاتێک شاژن قسەی کیژۆڵەکەی بیست دەستی لە ڕزگاربوونی شوت. ئەوجار خوشکی حەسەن هەستا و شاژنی بەجێ هێشت. کراسێکی بۆ هێنا و کردییە بەرێ. خواردن و شەرابی بۆ هێنا و لە پێشی دانا و خواردنەکەی لەگەڵ خوارد و دڵخۆشی داوە، ترس و دڵەڕاوکێکەی تەواو بوو. وردە وردە بە قسەی خۆش دڵی نەرم کرد. بەڵام هەتا بەیانی هەر گریا. کە ڕۆژ بووەوە شاژن ژیر بووەوە و بە خوشکی حەسەنی گوت: «ئێستا کە خودا ڕەزای لەسەر ئەوە بووە چارەنووسم ئاوا بێ و لە وڵاتی خۆم دوور کەومەوە، منیش ڕازیم بە ڕەزای خودا.» خوشکی حەسەن لەڕێوە هەستا خۆشترین دیوی ئەو کۆشکەی بۆ

ڕازاندەوە و بۆی ئامادە کرد. هەمیشە لە لای دادەنیشت و دڵخۆشی دەداوە هەتا وای لێ هات، ڕق و تووڕەیی وەلا نا و خەمی لە دڵی برا و پێکەنی و بە ژیانی نوێی ڕازی بوو. ئەوجار خوشکی حەسەن هاتە لای حەسەن و پێی گوت: «هەستە برۆ لای شاژن و دەست و قاچی ماچ کە.» حەسەن هەستا چوو بۆ لای شاژن و ناوچاوانی ماچ کرد و پێی گوت: «ئەی خانمی خانمان و ئەی سەرتۆپی جوانان. لەوە ئەرخەیان بە ئەمن ئەتۆم بۆ هیچ شتێک نەگرتووە جگە لەوەی غوڵامت بم و ئەو خوشکەشم کڵفەتت بێ. خانمەکەم ئەمن بە تەمام بە پێی ڕێوشوێنی پێغەمبەر تۆ مارە بکەم و بتبەمەوە بۆ شارەکەی خۆم. پێکەوە لە شاری بەغدا ئاکنجی بین. کۆیلە و کەنیزت بۆ بکڕم. دایکێکم هەیە، باشترین دایکی دونیا لە خزمەتتدا دەبێ. لە دونیادا هیچ شارێکیش بە قەد شاری ئێمە خۆش نییە. هەر شتێکی کە لەو شارە دایە باشترین شتی وڵاتانە. خەڵکەکەی هەمووی ڕووخۆش و لێو بە بزەن. لەو کاتەدا کە حەسەن ئەو قسانەی دەکرد لە دەرکی کۆشکیان دا.

حەسەن هاتە دەرێ کیژۆڵەکان لە بەر دەرگا بوون کە لە ڕاو گەڕابوونەوە. حەسەن بە دیتنیان خۆشحاڵ بوو. ئەوان شوکری خودایان کرد کە حەسەن چاک ببووەوە و لە ئەسپەکانیان دابەزین و چوونە کۆشکەکەوە. هەرکەسەی چووە دیوەکەی خۆی. جلی سواریان داکەند و حەریر و دیبایان لە بەر کرد. ئەو نچیرانەی هێنابوویانەوە هێندێکیان سەر بڕین و هێندێکیان لە دیوێکی کۆشکدا داکرد. حەسەن کارمامز و بزنەکێویی و شتەکانی سەر دەبڕی و ئەوانیش خەریکی قسە و جەفەنگ بوون. هەتا حەسەن ئاژەڵەکانی کەوڵ کرد. کچەکان یەکی کەمێکیان گۆشت هەڵگرتوو دەستیان کرد بە سوور کردنەوەی. ئەوجار حەسەن چوو بۆ لای کچە گەورەکەیان و سەری ماچ کرد. سەری کچەکانی دیکەشی ماچ کرد. کچۆڵەکان گوتیان: «چییە حەسەن ئەوە بوا بە ڕەحم و دلۆڤان بووی. دەبێ چ بێ، وا هەر نییە؟ پێمان سەیرە ئەتۆ پیاوێکی مرۆڤی و ئێمە کچە جن.» لەڕێوە حەسەن چاوی پڕ بوو لە ئاو دەستی کرد بە گریان. کیژۆڵەکان گوتیان: «حەسەن تۆخودا بۆ دەگری، خۆشییەکەت لێ تاڵ کردین؟ دەڵێی بیری دایکت و ماڵێت کردووە. ئەگەر ئەوەیە دەتنێرینەوە بۆ وڵاتەکەت؟» حەسەن گوتی: «بە خودا پێمخۆش نییە لە ئێوە دوور کەومەوە.» کچەکان گوتیان: «ئەی لەبەر چی وا ناڕەحەتی؟» حەسەن لەبەر ترس و شەرم نەیتوانی باسی خۆشەویستییەکەی لەگەڵ ئەو کچە بکا. ناچار بێدەنگ بوو. پێی نەگوتن، بۆ. خوشکی حەسەن هەستا و بە خوشکەکانی گوت: «ئەو مەلێکی ڕاو کردووە و دەیهەوێ ئەو مەلەی بۆ کەوی بکەن.» کچەکان ڕوویان لە حەسەن کرد و گوتیان: «تۆ چۆنت بوێ ئێمە ئاوا دەکەین، پێمان بڵێ چی بووە، پێویست بە شاردنەوە ناکا.» حەسەن بە خوشکەکەی گوت: «دا بۆخۆت پێیان بڵێ، ئەمن لە ڕووم هەڵنایە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی حەوسەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن بە خوشکەکەی گوت: «ئەتۆ بەسەرهاتەکەی منیان بۆ بگێڕەوە.» خوشکی حەسەن گوتی: «خوشکەکانم، کاتێک ئێمە ئەو فەقیرەمان لێرە بە تەنیا بەجێ هێشت و چووین بۆ سەفەر؛ ئەویش کە بە تەنیا دەبێ ترس و دڵەڕاوکێ وای لێ دەکا نیگەرانی ئەوە بێ نەکا کەسێک لە نێو کۆشکدا بێ، بۆخۆتان دەزانن مرۆڤ کەمێک گەوجن، هەڵدەستێ دەچێ ئەو دەرگایە دەکاتەوە کە دەچێ بۆ سەربانی کۆشک، دەچێ و لەوێ بە تەنیا دادەنیشێ و لە ترسان چاو بەولاولادا دەگێڕێ. لە پڕدا دە دانە باڵندە دەبینێ کە دێن لە قەراخ گۆلەئاوەکە دەنیشن. سەیر دەکا یەکێک لە باڵندەکان لەوانی دیکە باوخۆشتر و لە بەر چاوترە و بە دندووک لەوانی دیکە دەدا. ئەوانیش ناوێرن دەستی بۆ بەرن. دوای ئەوە باڵندەکان بە دندووک باڵ و پەڕەکانیان لە خۆیان دەکەنەوە. هەرکام لەوان دەبێ بە کیژێکی لە ڕادەبەدەر دەلال و جوان، حەسەنیش ئەوە ڕاوەستاوە و چاویان لێ دەکا. کچەکان دەچنە ئاوەکەوە و خەریکی یاری و کایە دەبن. ئەو کچە جوانەیان کچەکانی دیکە لە ئاوەکەدا قوم دەکا. بەڵام کچەکانی دیکە ناوێرن دەستی بۆ بەرن. جوانییەکەی سەیر دەبێ.

بەو جۆرە کە تەواو لە کایەکردن تێر دەبن، لە ئاوەکە دێنە دەرێ و پەڕەکانیان لە خۆیان دەدەنەوە و هەڵدەفڕن و دەڕۆن. حەسەن لە تاوان هۆشی نامێنێ و دڵی هەر بە لایانەوە دەبێ. لە دڵی خۆیدا پەشیمان دەبێتەوە کە بۆ جلەکانی ئەو کیژەی هەڵنەگرتووە. بەو جۆرە ئەڤین کاری تێ دەکا و لە خەو و خواردنی دەکا. هەتا دیتمان چی لێ کرد. بەردەوام حاڵی ئاوا دەبێ هەتا سەری مانگ. ئەو دەم کچەکان بە پێی پێشەی دایمیان سەری مانگ دێنەوە و پەڕ و باڵ لە خۆیان دەکەنەوە و دەچنەوە لە ئاوەکەوە. حەسەنیش لە ڕێوە پەڕ و باڵی کچە جوانەکە دەدزێ و لە شوێنێک دەیشارێتەوە. پاش ماوەیەک کە ئەوان لە مەلە تێر دەبن لە ئاوەکە دێنە دەرێ. کچەکان هەموویان پەڕ و باڵەکە لە خۆیان دەدەنەوە و هەڵدەفڕن و دەڕۆن. ئەو کیژە خان و مانەش لەوێ دەمێنێتەوە. حەسەنیش دەچێ دەستی دەگرێ و لە سەربانی کۆشک دەیهێنێتەوە خوارێ.

کچەکان کە ئەوە دەبیستن. دەڵێن ئێستا ئەو کچە جوانەی دەڵێن لە کوێیە؟ خوشکی حەسەن گوتی ئەو لە لای منە. کچەکان گوتیان دا پێمان بڵێ دەنکێکی چۆنە. خوشکی حەسەن گوتی: «دادە جوانی و دەلالی و ڕێکوپێکی و بەژن و باڵا و چاو و برۆی و خاڵی ئەو بە جۆرێکە کە شاعیر دەڵێ:

ڕوخسار نییە بەفری سامڕەندە ئەوەی من دیتم

پەلکە نییە و داو و کەمەندە ئەوەی من دیتم
لێوی لالی یار گەش و سوورە وەک خوێنی کۆتر
شیرینە ماچی لێوی شەهدە، ئەوەی من دیتم
هەر چەند دەڵێن مرواری بەرهەمی ئاوی سوێرە
مرواری دەریای شیلە و قەندە، ئەوەی من دیتم
ڕووی تورکستانی و خاڵی هیندی ئەوەندە کۆکن
لێک دێنەوە وەک قفل و بەندە، ئەوەی من دیتم
ئەو شۆخە کە لە باخدا هەستێتە سەر پێ بێ شک
سوژدەی بۆ دەبا سەلو وەک بەندە، ئەوەی من دیتم
ئەو دەم و لێو و پێکەنینە جوانەی هەیەتی
دڵ و دین دەبا لە گوێن جەردە، ئەوەی من دیتم
ئەگەر بێتوو، ئەو شۆخە لە نێو خەڵکدا دەرکەوێ
دونیا دەشێوێنێ بە خەندە، ئەوەی من دیتم

کاتێک کیژەکان پەسنی ئەو کیژەیان بیست ڕوویان لە حەسەن کرد و گوتیان: «دا پیشانمان بدە!» حەسەن هەستا و ئەوانی برد بۆ دیوەکەی خۆی. کاتێک کیژەکان چوونە ژوورێ و چاویان بەو هەموو جوانییەی ئەو کەوت، کرنۆشیان بۆ برد و سڵاویان لێ کرد. پێیان گوت: «کچی پاشای گەورەمان، لەوە ئەرخەیان بە ئەگەر زانیبات کە ئەو مرۆڤە لاوە چی لە دڵدایە و چەندە ئۆگر و شەیدای تۆ بووە پێت سەیر دەبوو. دڵنیاش بە کە دڵ و خۆشەویستییەکی پاک و بێخەوشی هەیە. دەیهەوێ تۆ بە پێی ڕێوشوێنی ڕەسووڵی خودا مارە بکا. ئەگەر ئێمە بمان زانیبا کە کچان پێویستیان بە کوڕان نییە، قەت نەمان دەهێشت ئەو کارە سەر بگرێ و ئەگەر باڵ و پەڕەکانی تۆی نەسووتاندبایە ئەوە لێمان دەستاند و دەمان دایەوە. دوای ئەوە یەکێک لە کچەکان لەگەڵ شاژن ڕێک کەوتن و بوو بە بەرگریکاری ئەو و لە حەسەنی مارە کرد و دەستی دا دەست حەسەن. ئاهەنگێکی شیاوی کچە شایان بۆ ساز کرد و حەسەنیان برد بۆ لای. حەسەن کە حەز و ئیشتیای دامرکا حەز و خۆشەویستی بۆی زیاتر بوو. بەو زەماوەندە خۆشحاڵ بوو، ئەو شیعرەی خوێندەوە:

دوێشەوێ یارم بە سەری کردمەوە
چی خەم و دەرد بوو لە بیری بردمەوە
سووک بوو دڵم کە باری خەمی دانا
گەشاوە لێوم بە کەنین خۆی ڕانا

کۆتری شـــادیـــــــــــــــــــــم هەر باڵەفەڕەی بوو
لەوەتی بوو خۆشـی ئاوای نەدیبـــــــــــــــــــــــوو

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی حەوسەد و نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن کە ئەو شێعرەی خوێندەوە کچەکان لە بەر دەرگا وەستابوون. بە شاژنیان گوت: «ئەتۆ ئێمەت سەرکۆنە دەکرد، ئێستا دیوتە چۆن لە خۆشەویستیتدا شێعر دەڵێ و پەسنت دەکا؟» شاژن بەو قسەیەی ئەوەندی دی دڵی خۆش بوو. دوای ئەوە حەسەن هەتا چل ڕۆژ لەگەڵ شاژن لە عەیش و نۆشدا بوون. کچەکان هەموو ڕۆژێ جێژنێکی تایبەتیان بۆ دەگرتن و دیاری و پێشکەشیان بۆ دێنان. شاژن وردە وردە خزم و کەسی لە بیر کرد و ئۆگری بوو. هەتا وا بوو شەوێک حەسەن خەوتبوو، خەونی بە دایکییەوە دیت. لە خەونیدا دایکی دیت کز و لاواز و ڕەنگ زەرد بوو. هێزی تێدا نەبوو. بە حەسەنی گوت: «ڕۆڵە گیان، ئەوە بۆخۆت لە کەیف و خۆشی خۆت دایت و منیشت لە بیر چووەتەوە؟ چاو لە من کە لە تاوی تۆ چم لێ هاتووە. ئەمن قەت تۆم لە بیر ناچێتەوە و هەر یادت دەکەم. ئەوە لە لای خۆم قەبرێکم بۆ دروست کردووی بۆ ئەوەی هەمیشە لە بەر چاوم بی. ڕۆڵە گیان بڵێی نەمرم و چاوم بە تۆ بکەوێتەوە.» لەو جەنگەیەدا حەسەن لە خەو ڕاپەڕی و هەتا بەیانی هەر گریا و فرمێسکی هەڵوەراند و نارەحەت بوو. کچان هاتن بۆ لای حەسەن و سڵاویان کرد. وەک جاران دەستیان کرد بە گاڵتە و جەفنگ. حەسەن ڕووی تێ نەکردن و هێند نارەحەت بوو، یەک قسەشی نەکرد. کچەکان لە شاژنیان پرسی: «ئەوە حەسەن بۆ ئاوایە؟» شاژن گوتی نازانم چی بووە. کچەکان گوتیان دا لێی پرسە بزانە چی بوو. شاژن چوو بۆ لای و گوتی: «گەورەم ئەوە چ بووە؟» حەسەن ئاخێکی هەڵکشا و دەستی کرد بە گریان و خەونەکەی بۆ شاژن گێڕاوە و ئەو شێعرەی گوت:

گەر وڵاتت بۆ بکەن بە تۆپی گوڵ
بۆت وەڕازێن وەکوو خونچەی سەر چڵ
خۆڵ و خاکی وڵات و کۆڵانەکەت
ناگۆڕێوە بە کۆشکی جیرانەکەت

شاژن گەڕاوە و بۆ کچەکانی گێڕاوە. کە کیژەکان شێعرەکەی ئەویان بیست بەزەییان پێیدا هات و پێیان گوت: «ئێستا کە تۆ بیری دایکت کردووە، ئێمە بۆمان نییە پێشت بگرین. ئەوەندەی بۆشمان بکرێ یارمەتیت دەدەین. بەڵام نابێ پێمان لێ ببڕی و ئەگەر تەنانەت ساڵێ جارێکیش بێ دەبێ سەرمان بدەی.» حەسەن گوتی: «بە چاوان ئێوە چۆن بڵێن من وا دەکەم.» کچەکان لەڕێوە هەستان توێشووی ڕێگایەیان بۆ پێچاوە و بووکیشیان بە زێڕ

و زێو و خشـــڵی جوان ڕازاندەوە. ئەوەندەشـــیان دیاری بۆ پێچاوە کە لە ژمار نەدەهات. دوای ئەوە تەپڵە مســـەکەیان لێدا. وشـــتر ئامادە بوون. خواردەمەنی و دیارییەکانیان لە یەکیان نا و حەســـەن و بووکیش یەکی ســـواری یەکیان بوون. بۆ ماوەی ســـێ ڕۆژەڕێ بەڕێیان کردن. بەو ســـێ ڕۆژە ڕێگای ســـێ مانگیان بڕیبوو. لەوێوە کچەکان ماڵاواییان لێ کردن و گەڕانەوە. کچە گچکەکەیان کە خوشکی حەسـەن بوو، حەسـەنی لە باوەش گرت و ئەوەندە گریان تا بێهۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە ئەو شێعرەی گوت:

جـــــــــــــــەستەم تاقی دەکەیەوە بە بەڵا
دڵـــــــــــــــــــیشم بە دەرد و ژانی دابڕان
کـێ گـوتـی تـۆ قەول و پەیـمـان شـــکـێـن بـی
کـێ پـێـی گـوتـی بـگـری ڕێـگەی هەنـدەران

کە شـــێعرەکەی تەواو بوو، ماڵاوایی لە حەســـەن کرد و داواشـــی لێ کرد، کاتێک ڕۆیشتەوە شارەکەی خۆیان ئەو لە بیر نەباتەوە و بە شەش مانگ جارێک سەرێکی لێ بدا. گوتیشـی کە کاتێک کارێکت بوو یان ترسـێکت بوو، تەپڵەکە لێ دە تا وشـترەکان بێنە لات. سـوار بە و وەرەوە ئێرە. حەســـەن گفت و بەڵێنی پێ دان و سـوێندی بۆ خواردن کە زوو زوو ســـەریان بدا و پێیان لێ نەبڕێ. ئەوجار ســـوێندی لێ خواردن دەبێ بگەڕێنەوە. کەنیشـکەکان گەڕانەوە و بە دڵێکی خەمبارەوە بە تایبەت کیژۆڵەکە کە خوشـکی حەســـەن بوو. شەووڕۆژ هەر دەگریا. جا با کچەکان بڕۆنەوە... بزانین حەسەن چ دەکا.

حەسـەن و خێزانی شـەو و ڕۆژ ڕێگایان بڕی، هەتا گەیشتنەوە ماڵی خۆیان لە بەسـرە. وشترەکانی بەر دا و بۆخۆی چوو دەرگاکە بکاتەوە. گوێی لە دەنگی خەفەتباری دایکی بوو کە جەرگی سووتاوەوە دەگریا و دەیگوت:

لە کوێی کوڕم مـایەی حەیـاتـــــــــــــــی من
خەمت بۆتە خەو و خۆراکـــــــــــــــــــی من
جەرگـم ســـــووتـاوە و کـوێـر بـووە چـاوانـم
دەمـــــــــــــــــــــرم و ناتبینمەوە دەزانم
بە هـــــــــــــــــیوای دیداری تووە ماوم
هەرچەند مـــــــــــــــــن لە یادتدا نەماوم

ئیدی حەســـەن لەگەڵ دایکی دەســـتی کرد بە گریان و لە دەرگای دا. دایکی گوتی: «کێیە؟» حەسەن گوتی: «بیکەوە.» کە دایکی حەسەن دەرگاکەی کردەوە و ئەوی دیت بێ

هۆش بوو و کەوتە ســەر زەوی. حەســەن هەر بە دەوریدا هات هەتا وە هۆش هاتەوە. کە وە هۆش هاتەوە هەستا و حەسەنی لە ئامێز گرت و ناوچەوانی ماچ کرد. ئەوجار حەسەن چوو شــتەکانی هێنا ژووریّ. شــاژن هەر تەماشــای حەســەن و دایکی دەکرد. دوای ئەوە دایکی حەسەن بە هاتنەوەی کوڕەکەی دڵی حەساوە ئەو شێعرەی گوت:

ئەوڕۆکە چەندە ڕۆژێـــــــــــــــــــــکی خۆشـــە
وڵات پڕپڕە لە گـــــــــــــــــــــــــەشـە و نەشـە
ســـــپــاس بــۆ خــودای ئــاســــمــان و زەوی
نەمـــــــــــــــــــــــــــــردم و ئاواتم هاتە دی
بڵێی دیـــــــــــــــــــــــــسـان من خەون نەبینم
وا کــوڕەکەی خــۆم بە چــاو دەبـــــــیــنــم

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی حەوسەد و نەوەد و سێیەم هاتەوە

خاوەن شکۆ، دایکی حەسەن لەگەڵ حەسەن دەستیان کرد بە قسەکردن و لێی پرسی: «ئەرێ کوڕم لەگەڵ عەجەمەدا چیت کرد و بە کوێ گەیشتن؟» حەسەن گوتی: «دایە ئەو خۆ موسوڵمان نەبوو ئەوە گاورێکی ئاگر پەرست بوو. ئیدی ئەوەی کە عەجەمە لەگەڵی کردبوو هەمووی بۆ گێڕاوە. کە چۆن بردوویە بۆ چیای سەحاب و لەوێ لە پێستی وشتری خستووە و زارکەکەی دروومەتەوە و لە وێ دایناوە تا دوایە باڵندەیەک بردوویەتە سەر لوتکەی کێوەکە و لەوێ ئێسک و پروسکی مردووی دیوە بە کورتی یەک بە یەکی ئەوەی وا بە سەری هاتبوو هەمووی بۆ دایکی گێڕاوە. کە دایکی بەسەرهاتەکەی ئەوی بیست سەری سووڕ ما و شوکری خودای کرد. دوای ئەوە هەستا چوو بۆ لای بارەکان و پرسیاری کرد چی تێدایە. حەسەن هەرچی لە بارەکەدا بوو هەمووی پیشانی دایکی دا. دایکی حەسەن زۆر خۆشحاڵ بوو. ئەوجار هاتەوە لای شاژن و لە لای دانیشت. کە چاوی بەو پەریڕووە کەوت واقی وڕ ما و سەری لەو هەموو جوانی و دەلالییەی سووڕ ما. دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵی و بەخێرهاتنی کرد و دڵخۆشی داوە. ئینجا ڕووی لە حەسەن کرد و گوتی: «ئێمە بەو هەموو زێڕ و زێوەوە ناتوانین لێرە بژین پێمان دەڵێن کیماگەری دەکەن. هەستن با ماڵەکەمان بەرینە بەغدا لەوێ ماڵی خەلیفەی لێیە. لەوێ شوێنێک بۆ ئێمە ببینەوە و بۆخۆت لە دووکانێک خەریکی کڕین و فرۆش بە. بەشکوو خودا بە بۆنەی ئەو ماڵەوە دەرکی ڕەحمەتی بەسەرماندا بکاتەوە.»

حەسەن قسەکەی دایکی پێ جوان بوو. هەستا چوو خانووەکەی فرۆشت و لە تەپڵەکەی دا و وشتر ئامادە بوون. کەلوپەل و ماڵەکەی لە وشترێک دا و دایکی و خێزانی سواری وشترەکانی دیکە کرد و وەڕێ کەوتن. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ڕووباری دیجلە. لەوێ کەشتییەکی بە کرێ گرت و تەواوی ماڵەکەی لێ دا و بای خوازراو هات، هەتا گەیشتنە بەغدا. حەسەن لە کەشتییەکە دابەزی و چوو لە کاروانسەرایەک دیوێکی بە کرێ گرت. کەلوپەلەکانی برد لەوێ داینا و ئەو شەوە لە کاروانسەرا مانەوە.

کە ڕۆژ بووەوە جلەکانی گۆڕی لە کاروانسەرا چووە دەرێ. دەلاڵێک تووشی بوو، لێی پرسی: «چ کارێکت هەیە؟» حەسەنی زێڕینگەر گوتی: «دەمهەوێ خانوویەکی گەورە و خۆش بە کرێ بگرم.» دەلاڵەکە خانوویەکی هەبوو پیشانی دا. حەسەن خانووەکەی کە ئی وەزیرێک بوو، بەجێی هێشتبوو. پەسند کرد و بە سەدهەزار دینار کڕی و پارەکەی دایە و گەڕاوە بۆ کاروانسەرا. کەلوپەلەکەی بردە خانووەکەیەوە. ئینجا چوو بۆ بازار کەلوپەلی پێویستی ماڵیی وەک فەرش و دەفر و شتی وا و چەند کۆیلەیەک و کۆیلەیەکی گەورە و

یەکی منداڵکارەشی بۆ ماڵێ کڕی. لەگەڵ ژنەکەی خەریکی عەیش و نۆشی خۆیان بوون. هەتا سێ ساڵ بە خۆشی و شادی ڕایان بوارد. هەتا وا بوو خودا دوو کوڕی دانێ. یەکیان ناو نا مەنسوور و ئەوی دیکەیانی ناو نا ناسر.

دوای ئەوە کەوتەوە یادی کچەکان و بیری کردن. هەوای دیداری ئەوان لە سەری دا. هەستا هاتە بازاڕ و هێندێک شتی جوان و شیاوی کڕی. دایکی هۆکاری کڕینی ئەو شتانەی پرسی. حەسەن گوتی: «دەڵێم بچم سەرێکی خوشکەکانم بدەم چونکە ئەوان زۆریان چاکە و گەورەیی لەگەڵ کردم. ئیشەڵلا زوو دێمەوە.» دایکی گوتی: «ڕۆڵە گیان، زۆرت پێ نەچێ ئەمن لەوە زیاتر بەرگەی دووری تۆ ناگرم.» حەسەن گوتی: «دایە گیان، با پێت بڵێم چ بکەی لەگەڵ خێزانم. دایە پەڕ و باڵەکەی خێزانم خستووەتە ناو سندووقێک و لە فڵانە جێ خستوومەتە ژێر گڵەوە. وریابە خێزانم دەستی پێی ڕانەگا. چونکە ئەگەر شاژن دەستی پێی ڕابگا ئەوە دەیکاتە بەری و دەفڕێ و منداڵەکانیش دەبا. تازە ئەمن دەستم پێی ڕاناگا و لە تاوانی دڵم دەتۆقێ. دایە تکات لێ دەکەم باسی ئەوە نەکەی. ئەوە کچی پادشای جندۆکانە و لە نێو پادشاکانی جان لەویان گەورەتر تێدا نییە. ئەوەش بزانە ئەو شاژنە گوڵەجەرگەی باوکێتی. ئەتۆ لە خزمەتیدابە و ئاگات لێی بێ لە دەرکێ نەچێتە دەرێ یان لە پەنجەرێوە چاو لە دەرێ نەکا. ئەمن زۆر نیگەرانی ئەوم. ئەگەر ئەو شتێکی بۆ بێتە پێشێ ئەمن لە تاوانی خۆم دەکووژم.» دایکی حەسەن گوتی: «ڕۆڵە خودا نەکا من دژایەتی تۆ بکەم. مەگەر ئەمن شێتم قسەکانی تۆ پشتگوێ بخەم. ئەتۆ بە ئاسوودەیی سەفەری خۆت بکە، بەڵام زوو بێیەوە و زۆرت پێ نەچێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و نەوەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن کە چوو بۆ سەفەر ژنەکەی بە دایکی سپارد. ڕێکەوت وا بوو، ژنەکەی گوێی لە قسەکانی ئەوان ببوو. حەسەن دوای ئەوە هەستا تەپڵەکەی لێدا وشترەکان ئامادە بوون، دیارییە عێراقییەکانی لە وشترەکان دا و بۆخۆشی سواری یەکیان بوو. ماڵاوایی لە لە دایکی و ژنەکەی و منداڵانەکانی کرد. لە دوا چرکەدا دیسان بە دایکی گوتەوە ئاگات لە خێزانم بێ. لە شار وەدەر کەوت. شەو و ڕۆژ دەشت و دەر و شاخ و کێوی بڕی هەتا بە دە ڕۆژ گەیشتە کۆشکی کچەکان و چووە لای خوشکەکانی و دیارییەکانی داگرت. کاتێک خوشکەکان ئەویان دیت زۆر خۆشحاڵ بوون و شوکری خودایان کرد کە ساغ و سەلیمە. هەر وەک جاران بردیانە ژوورێ و هەواڵپرسی دایکی و خێزانیان کرد. حەسەن پێی گوتن کە خێزانی دوو کوڕی بووە. دوای ئەوە کاتێک خوشکەی، حەسەنی ئاوا بەکەیف و چەلەنگ دیت. خۆشحاڵ بوو ئەو شێعرەی گوت:

شوکر و سپاس بۆ خودا نەمردیم و دیتمان
دوای چەند ساڵ جارێکی برای خۆشەویستمان

حەسەن هەتا سێ مانگ لەوێ میوانیان بوو، بە خێر و خۆشی ڕایانبوارد. بەڵام بچینەوە لای دایکی و خزانی حەسەن.

دوای ئەوەی حەسەن ڕۆیشت، خێزانی یەک دوو ڕۆژ لەگەڵ دایکی دانیشت. سێیەمین ڕۆژ بوو گوتی: «ئەخە چۆن دەبێ سێ ساڵ بێ من نەچووبمە گەرماو. ئەوەی گوت و دەستی کرد بە گریان. دایکی گوتی: «کچەکە ئێمە لێرە غەوارەین و مێردەکەشت لە ماڵ نییە. ئەو لە ماڵ بایە دەیبردی. ئەتۆ بۆخۆت دەزانی خۆ من کەس ناناسم. بۆخۆم لە ماڵێ ئاوت بۆ گەرم دەکەم و سەرت بۆ دەشۆم. شاژن گوتی: «خانمەکەم، ئەگەر تۆ شتی ئاوات بە کەنیزەکانیش گوتبایە خێرا داوایان لێ دەکردی بیانفرۆشی و لە لات دانەدەنیشتن. خانمەکەم پیاوان لەخۆبایین، هێند بەرچاوتەنگن لە دڵی خۆیاندا دەڵێن کە ئەگەر ژنەکەمان بچێتە دەرێ تاز دەبێ بە قەحبە. بۆ خۆشت دەزانی ژنان هەموویان وەک یەک نین. ئەگەر ژنە بۆخۆی پێی خۆشە نەبێ کەس ناتوانێ قامکی بۆ بەرێ. ئەگەر ئیشتیای لێ بێ کارێک بکا. بە نەهێشتنی چوون بۆ گەرماو هیچ ناکرێ.» شاژن ئەوەی گوت و دەستی کرد بە قسە بە خۆ گوتن.

دایکی حەسەن دڵی بۆی سووتا. لەڕێوە هەستا پێداویستی گەرماوی بۆ ساز کرد. بردی بۆ گەرماو. کە چوونە گەرماوەکە و جلەکانیان داکەند، ژنان چاویان تێ بڕی و

هەموو واقیان وڕ ما. کەس لە چاولێکردنی تێر نەدەبوو. تاریفی چووە دەرەوە و ژنان هورووژمیان هێنا بۆ گەرماو. دەرزیت هەڵاویشتبا وە زەوی نەدەکەوت. ڕێکەوت وا بوو کە یەکێک لە کەنیزەکانی خەلیفە هارووەنڕەشیدیش هات بۆ گەرماو. کە پێیان دەگوت توحفەی عوودژەن. کاتێک کەنیزەکە گەیشتە لای شاژن سەری لە جوانی و دەلالی شاژن سووڕ ما. نەیدەتوانی بچێتە ئاوەکە و خۆی بشوا. ڕووبەڕووی دانیشتبوو چاوی تێ بڕیبوو. هەتا شاژن خۆی شوت و هاتە دەرێ. جلەکانی لە بەر کردەوە. ئەوەندەی دیکەش جوان بوو. ژنان چاویان لە سەر هەڵنەدەگرت. شاژن لە گەرماو هاتە دەرێ و توحفەی عوودژەنیش بە دوایدا هاتە دەرێ و لەگەڵی ڕۆیشت هەتا بەردەرگای لەگەڵ چوو. ماڵەکەیانی دیاری کرد و مالاوایی لێ کرد و گەڕاوە کۆشکی خەلیفە. چووە لای سەیزادە زبێد و کڕنۆشی برد. سەیزادە زبێد لێی پرسی: «توحفە، بوا درەنگ هاتییەوە لە گەرماو؟» توحفە گوتی: «خانم، کچێکی ئەوەندە جوانم دی تا ئێستا بووکی ئەوەندە جوانیشم نەدیتووە. هەر دانیشتبووم تەماشای ئەوم دەکرد. سەروشتیشم نەشتووە. باوەڕ بفەرموو ئەگەر خەلیفە ببینێ مێردەکەی دەکووژێ و لە خۆی مارە دەکا. چونکە لە نێو ژناندا شتی ئاوا جوان پەیدا نابێ. ئەمن پرسیارم کردووە دەڵێن مێردەکەی کابرایەکی بازرگانە و ناوی حەسەنی بەسرییە. کە لە گەرماو هاتینە دەرێ لەگەڵی ڕۆیشتم هەتا گەیشتەوە ماڵێ. ماڵەکەیان لە خانووی فلان وەزیر دان. ئەو خانووە دەرگایەکی بەرەو دیجلەیە و دەرگایەکی بە ویشکیدا دەکرێتەوە. ئەیڕۆ خانم بە خودا ئەمن لەوە دەترسم خەلیفە ناوبانگی ئەو ببیستێتەوە و یاسای شەرع پشت گوێ بخا. کابرا بکووژێ و لە خۆی مارە بکا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کەنیزە کە ئەوەندەی پەسن و تاریفی جوانی ئەو کچە بۆ سەیزادە زبێد کرد، سەیزادە بانگی کرد و گوتی: «یانی ئەو کچە جوانی و دەلالییەکەی گەیشتووەتە جێگایەک کە خەلیفە لەبەر ئەو دینەکەی لە دەست بدا و شەرع پێشێل بکا؟ خودا دەزانی دەبێ ببینم. ئەوە دەیبینم خۆ بە خدا ئەگەر وەک دەڵێی ئاوا نەبێ تۆ دەکووژم. شتی وا چۆن دەبێ ئەو کچە لە سێسەد و شەشت ژنی خەلیفە جوانتر بێ؟»

کەنیزە گوتی: «خانم بە خودا نە لە کۆشکی خەلیفە و نە لە بەغدا و نە لە ناو عەرەب و عەجەمدا شتی هێندە جوان نییە. ئیدی سەیزادە زبێد بانگی مەسروروری شیروەشێنی کرد و پێی گوت: «مەسروور بچووە ماڵە فلانە وەزیر و ئەو ژنەی لەوێیە لەگەڵ منداڵەکانی و پیرێژنەکە بێنە ئێرە. وەزیر کڕنۆشی برد و چووە بەر دەرگای ماڵی حەسەنی بەسری و لە دەرگای دا. دایکی حەسەن گوتی: «کێیە؟» مەسروور گوتی: «پیاوی خەلیفەم.» پیرێژنە دەرگای کردەوە. مەسەروور سڵاوی کرد و پیرێژنەش سڵاوەکەی ئەستاندەوە و گوتی: «فەمروو چ کارێکت هەیە؟» مەسروور گوتی: «سەیزادە زبێد خێزانی خەلیفە داوای کرد تۆ و بووکەکەت و نەوەکانت بێن بۆ لای سەیزادە. هێندەیان تاریفی جوانی و شەنگ و شەپاڵی بووکەکەت کردووە پێی خۆشە بتانبینێ.» دایکی حەسەن گوتی: «مەسروور، ئێمە لەو شارە غەریبین و کوڕەکەشم لە ماڵ نییە. ڕێمان نادا بچینە دەرێ. ئەمن دەترسم شتێک بێتە پێش و کوڕەکەم کە هاتەوە، لە تاوان خۆی بکووژێ. کاکە تکایە بۆ شتێک کە لە دەسەڵاتی ئێمەدا نییە زۆریمان لێ مەکە.» مەسروور گوتی: «خانم، ئەگەر بمزانیبا مەترسییەک هەیە ڕووم لێ نەدەنای. بەس سەیزادە زبێد دەیهەوێ چاوی بە بووکەکت کەوێ. تۆ دژایەتی مەکە با پەشیمان نەبییەوە. دایکی حەسەن نەیدەتوانی بە قسەی سەیزادە نەکا. گەڕاوە ژووری و بووکەکەی و منداڵەکانی ساز کرد هاتنە دەرێ و بە دوای مەسرووردا ڕۆیشتن. هەتا گەیشتنە کۆشکی خەلیفە. مەسروور بردنییە ژووری بۆ لای سەیزادە زبێد. ئەوانیش کڕنۆشیان برد و دۆعایان بۆ سەیزادە کرد و گوتیان: «بەڵام بووکەکەی پەچەکەی لا نەدابوو.» سەیزادە گوتی: «هەرچەند باوە لە ئاست مرۆڤ ڕووی خۆی داپۆشێ پەری، بەڵام پەچەکەت لادە با ڕووخسارت ببینم. کچە کڕنۆشی برد و پەچەکەی لە سەر ڕووی، وەک ڕۆژی لادا. سەیزادە کە دیتی عەبەسا، ئەوەی لە وێ بوو هەموو تاسان. سەیزادە هەستا و لە باوەشی گرت و لە سەر تەختەکەی دانا. فەرمووی کراسی شکۆدار و ملوانکەی گرانبایی بۆ بێنن. کە شتەکانیان هێنا سەیزادە کراسەکەی لە بەر کرد و ملوانکەکەی بە ملیدا کرد و گوتی: «ئەی خانمی خانمان و ئەی خۆری جوانان.

که جـــــــــــــوانی له ڕادەبەدەرت دەبینم
سەرم بـــــــــــــۆ ئافرێنەرت دادەنەوێم
ســـووڕ ماوە ســـەرم لەو دەســـتڕەنگینەی که وا
قەتم نەدیوە و له سیـــــــــــــماتدا دەیبینم

شـــاژن گوتی: «خانمەکەم، ئەمن جلوبەرگێکی پەڕم هەیە، ئەگەر ئەو لەبەر بکەم ســـەد هێندە جوان دەبم.» ســـەیزادە گوتی: «کوا جلوبەرگەکەت له کوێیە؟» شـاژن گوتی: «ئەوە له لای خەســـوومن. داوای لێ بکە بیهێنێ.» ســـەیزادە زبێد گوتی: «دایە گیان تۆ گیانی من هەســـته بچووە بیانهێنە با له بەری کا تێر تەماشـــای بکەم. دوایه جلەکانت دەدەینەوە بیانبەوە.» پیرێژنە گوتی: «خانمەکەم، درۆ دەکا تا ئێســـتا دیوتانە کەس جگه له باڵندە و پەلەوەر باڵ و پەڕی هەبێ؟» شـاژن گوتی: «خانمەکەم، بە گیانی تۆ ئەو جلانەی من ئەوە له ســندووقێک دان و ســندووقەکەش له ســووچی ماڵێ له بن گڵ خراوە.» ســەیزادە زبێد لەجێوە ملوانکەیەک که بایی خەزێنەی پاشا و قەیسەر بوو دەری هێنا و به پیرێژنەی گوت: «تۆ گیانی من ئەوەم لێ وەرگرە و بچۆ ئەو جلانە بێنە.» پیرێژنە گوتی: «ئەمن ئەو جلانەم نەدیوە و پێشـــیان نازانم.» ئیدی ســـەیزادە له پیرێژنە تووڕە بوو. بە ســـەریدا گوڕاند و کلیەکانی لێ ئەســتاند و بانگی مەســرووری کرد و گوتی: «ئەو کلیلانە بەرە و بچووە ئەو ماڵە و له فڵانە جێدا ســندووقێک له بن زەوی دایە، ســندووقەکە دەر بێنە و بیشــکێنە. ئەو کراسەی له پەڕ و باڵە بیهێنە بۆ من.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی حەوسەد و نەوەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سەیزادە زبێد کە بە مەسروروری گوت بچێ بۆ جلەکان، مەسروور خێرا دەرپەڕی. دایکی حەسەنیش وە دوای مەسروور کەوت و زۆر پەشیمان بوو لەوەی کە بردبووی بۆ گەرماو. مەسروور و دایکی حەسەن گەیشتنەوە ماڵێ و شوێنەکەیان داوە و مەسروور سندووقەکەی دەرهێنا و قفڵەکەی شکاند. کراسە پەڕەکەی لە سندووقەکە دەر هێنا و بردی بۆ سەیزادە. سەیزادە لێی وەرگرت و کەمێکی ئەمبەرەوبەر کرد و چاوی لێ کرد. شێوەی چێ کردنەکەی زۆر بەلاوە سەیر بوو. بە کچەکەی گوت: «ئەوەیە کراسە پەڕەکەت؟» کچە گوتی: «بەڵێ خانم.»

ئیدی دەستی برد و جلەکانی هەڵگرت. لە خۆشیان گەشاوە. ئینجا هەستا و لە بەری کردن. منداڵەکانی لە باوەشی کرد و بە هێز و دەسەڵاتی خودا بوو بە مەلێکی خۆش خەت و خاڵ و بە زمانێکی پاراوەوە گوتی: «گەلۆ ئەو جلانەم لێ جوانترە یا ئەوانی دی؟» هەنتەشیان گوتیان: «خانمی خانمان تۆ لە هەر جل و بەرگێکدا هەر جوانی.»

پاشـــان کچە گوتی: «خانمەکەم، کارێک کە لە هەموو کارەکان چاکترە و من دەیکەم ئەوەیە، ئیدی دوو منداڵەکەی هەڵگرت و لە شـــەقەی باڵی دا و فڕی. لە ســـەر ســـەربانی کۆشک نیشت. خەڵکەکە بە حەسرەتەوە چاویان لێ دەکرد و گوتیان: « پەریڕووخسار ئێمە تا ئێستا شتی وامان نەدیبوو.» کاتێک شاژن ویستی بەرەو وڵاتەکەی خۆی بفڕێ حەسەنی وەبیر هاتەوە و گوتی: «خانمەکەم، جوان گوێ لەو شـیعرە ڕاگرە.» ئیدی ئەو شـیعرەی خوێندەوە:

ئەمن کە شەرمـــــــــــــــــی مانگی تابانم
کەنیشـــکی پـادشـــای گەورەی پەریـانم
ڕۆژێ چـــــــــــــووبوومە ناو گۆلێکەوە
لەگەڵ خـــــــــــوشـکانم هەموو پێکەوە
جلم داکەندن لەش وەکـــــــــــوو شـفرە
پێســـتێکی چەرمـوو، هەر دەتگوت بەفرە
گەر ئەو جلانەم لە بەردا نەبـــــــــــــێ
مرۆڤ دەتوانێ بە ســەرما زاڵ بـــــــێ
حەسەنی بەسری بە پەنایـــــــــــــــەکدا
جلەکـانمی برد زوو خـــــۆی حەشـــار دا
بەو جۆرە مـــــــــــنی بۆخۆی داگیر کرد

ڕەوتی ژیانمی ئەو لە ڕیسمە برد
ئەو، بوو بە مێردم و منیش ژنی ئەو
شەمەنی من بوو منیش بوتی ئەو
کە کوڕەکەت ڕۆی بیرم کردەوە
ئەو پەڕ و باڵەم بستێنمەوە
لە بەرم کردن پەڕ و باڵەکەم
فڕیم بەرەو لای کەس و کاڵەکەم
دەزانم ڕۆژێ عەودالم دەبێ
لە دوڕگەی واقم، تۆ پێی بڵێ بێ

کە شێعرەکەی تەواو کرد، سەیزادە پێی گوت: «خانمی خانمان وەرە خواری با تێر سەیرت بکەین.» کچە گوتی: «تازە شتی وا نابێ، ئاوی ڕژاو کۆوە نابێ. دوای ئەوە بە دایکی حەسەنی گوت: «خانمەکەم، ئەگەر کوڕەکەت هاتەوە و بیری منی کرد و ویستی بمبینێ. ئەمن ئەوە لە دوڕگەی واقم پێی بڵێ بێ بۆ لام.» ئەوەی گوت و منداڵەکانی لە ئامێز گرت و فڕی و ڕۆیشت. دایکی حەسەن دەستی کرد بە شین و گریان و لە خۆدان و خۆ ڕنین هەتا بێ هۆش کەوت. کە وەهۆش هاتەوە سەیزادە پێی گوت: «دایە گیان خۆ من نەمدەزانی ئاوای لێ دێ. ئەگەر منت تێ گەیاندبا زۆریم لێ نەدەکردی. دایە خۆ تۆ بە منت نەگوت ئەو پەرییە. گەرنم ئازا کە دایە گیان.» پیرێژنە کە هیچ چارەیەکی نەبوو گوتی: «گەردنت ئازا بێ.»

دوای ئەوە لە کۆشکی خەلافەت هاتە دەرێ و بەرەو ماڵی خۆیان چووەوە. کە گەیشتەوە ماڵێ دەستی کرد بە گریان و لە خۆ دان هەتا بێ هۆش بوو. دوایە کە وە هۆش هاتەوە و بیری کردەوە کە بووکەکەی و نەوەکانی نەماون ترسی ڕێنیشت و یادی کوڕەکەی کرد و ئەو شێعرەی گوت:

کۆچ و دووریی، کێ گۆچی کردن خوایە
ئازاری برینی کۆچ لە باس نایە
چی وای نەما کەشتی تەمەنم ڕۆچێ
بە شەپۆلی یادی تۆ لەو دەریایە
چۆن باڵ لێ دەم، لە هەوای یادی تۆدا
نەمرم و جاری بژیم بەو هەوایە

دوای ئەوە هەستا و سێ گڵکۆی لە ژووریدا چێ کرد و شەو و ڕۆژ لە سەریان گریا و لالاوە. کە کوڕەکەی هەر نەهاتەوە و زۆری پێ چوو. ئەوەندەی دیش نیگەرن و پەرێشـــان بوو. لە بەر خۆیەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

خۆشەویستیت لە دڵ و گـــــــــــــــیانم دەرناچـــێ
بەژن و باڵای ڕێـــــــــــــــــــکت لە بەر چاو لاناچێ
ئەو هەمـــــــــــــــــــوو داخەی کە لە ســەر دڵم کۆیە
دەزانم دەمرم و ئـــەو هـــــەر لە جێی خــــــۆیە
لە مێژە دڵـــــــــــــــــــــــــم گفتی بە زولفت داوە
بێ بەڵێن نەبـــــــــــــــــــــــێ تازە، نەکشێتە دواوە

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دایکی حەسەن شەو و ڕۆژ دەگریا و ئەوە حاڵی بوو.

حەسەنیش کاتێک گەیشتە کۆشکی کیژەکان، کیژەکان سوێندیان دا کە دەبێ سێ مانگ لەوێ بمێنێتەوە. کە ســێ مانگەکە تەواو بوو، کچەکان دە باریان زێڕ و زێو بۆ پێچاوە. لەگەڵ توێشــووی ڕێگایەی و بەڕێیان کردەوە. حەســەن ســوێندی لێ خواردن، دەبێ بگەڕێنەوە. کچەکان هاتنە بەرەوە بۆ مالاوایی لە پێشدا کچە چکۆڵەکە کە خوشکی حەسەن بوو، هاتە پێشــێ و حەســەنی لە ئامێز گرت و هێندە گریا هەتا بێ هۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە ڕووی لە حەسەن کرد و گوتی:

بە تەمــای بــڕۆی ئــاخ لە دەســــت تەمــات
چۆنی پەیـدا کەم مـن شـــوێن و جێگـات
بە چاوم ئاوزەنـــــــــــگت بۆ چێ دەکەم
بەشکوو گلێنەم مــــــــــــاچ بکا ژێر پات

دوای ئەوە کچێکی دیکەیان هاتە پێشێ:

کەنین کۆچی کرد لە ڕوومــان، گریــان میوانە
کلەی چــاومــان کــاڵ بۆتەوە دەردمــان گرانە
خۆزگە نەمان بـــــــــــیستبایە، کۆچ و دابڕان
دووریتمان نەدیـــــــــــبا و مابایەوە لە لامان

ئینجا کچی چوارەم هاتە پێشێ لە کاتێکدا:

گوڵە مـــــــــــــێلاقە لە چاوی جوانیدا پشکووتـــبوو
مرواری لە سەر گۆنای لە دووی یەک ڕیزیان بەستبوو
چاو پڕ لە پاڕانەوە، سەرڕێژ بوو لە خـــــــۆشەویستی
چی خەمی دونیا هەبوو لە سەر ڕووخساری نـــیشتبوو

کچی پێنجەمیش هاتە پێشێ و جۆرێک بوو کە شاعیر دەڵێ:

ســــــــــــوێراوی دیدە و شەکراوی دەمی تێکەڵ ببوو

سـەروبسـکی وا شـێوابوو تێکەڵ و پێکەڵ ببوو
هـێز و تاقەت و توانا هیچ کە شکی نەدەبرد
ئەو کەنەفەتی و پەلکوتانە بەرەو نەمانی دەبرد

دوای ئەو کچی شەشەم بۆ مالآوایی، حەسەنی لە ئامێز گرت لە کاتێکدا:

تـینی هەناسەی باسی گڕی دەروونی دەکرد
شـەپۆلی دەریـای خەمی لەچـاوی سـەری دەکرد
لە ولاتـی سیمایدا ئالآی خم هەڵدرابوو
دەرد و مەینەت لە ناخیا تەواو خۆی حەشـاردابوو

ئەوجار کچی حەوتەم حەسەنی لە ئامێز گرت و گوتی:

هیچم بۆ نایە زمـانم لاڵە
دووریـت لە بـۆ مـن ئەوەنـدە تـاڵە
تەمەنـام لە خـودا تەنیـا ئەوەیە
بمرم نەمـێنم چیدی بەم حاڵە

دوای ئەوە حەسـەن مالآوایی لێ کردن و دەسـتی کرد بە گریان تا لە تاوان بێ هۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە ئەو شیعرەی خوێندەوە:

هەر دەڕۆم و بە خۆم نـیـیە سـووکە ئـاوڕ دەدەمەوە
نازانم چیـم بە جێ ماوە لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە
بـاش دەزانم کە تەواو نیم نـیـوەم لاتـان بە جێ مـاوە
ئەو نـیـوەیەی بە کەس نـایە وەک یـادگـار بەجـێ مـاوە

ئیدی بەرەو بەغدا ڕۆیشت تا گەیشتە دارولسەلام. نەشی دەزانی دوای ئەو چی ڕووی داوە. کە چووەوە ماڵێ و دایکی دیت، تەماشـای کرد دایکی هێندە تێک چووە هەر نەختێکی لێ ماوەتەوە. ئیدی وشـترەکانی بەڕێکردەوە و بۆخۆی چووە کن دایکی و چاوی بۆ ژن و منداڵەکەی گێڕا دیار نەبوون. هەسـتا چوو بۆ لای شـوێنی سـندووقەکە سـەیری کرد سـندووقەکە شـکاوە و لە وێ فڕێ دراوە. ئیدی زانی ئەوە شـاژن باڵ و پەڕەکەی دەرهێناوە. منداڵەکانی هەڵگرتووە و فڕیوە و ڕۆیشـتووە. لەڕێوە هاتەوە لای دایکی، دایکی

بێ هۆش کەوتبوو. وە هۆشی هێناوە و لێی پرسی ژن و منداڵەکەی لە کوێن. دایکی گریا و گوتی: «ڕۆڵە گیان ببنە پێشباری قیامەتت ئەوەتا ئەوە قەبرەکەیانە چوو گڵکۆکەیانی پێشان دا. حەسەن کە ئەوانەی دیت لە تاوان بێ هۆش بوو هەتا نیوەڕۆ وە هۆش نەهاتەوە. دایکی بە بێ هۆش بوونی حەســەن ئەوەندەی دیش ناڕەحەت بوو و ئیدی بەجارێک دەســتی لە ژیان شــوت. حەســەن کە وە هۆش هاتەوە بە چەپۆک بەربووە ســەروگوێلاکی خۆی و جلەکانی بەری دادڕی و هەر هات و چوو گوتی:

قەتــم نەدی جــارێــکــی لەگەڵــم بە وەفــا بــی
کــوا شــــەرتــی وەفــا وایە ئەمــن ئــاوا و تــۆش وا بــی

دوای ئەوە هەڵیکێشا شیر و بەرەو دایکی چوو و گوتی: «ئەگەر ڕاستییەکەیم پێ نەڵێی ئەوە ســــەرت لە بنەوە دەبڕم و خۆشــــم دەکووژم.» دایکی گوتی: «ڕۆڵە شــــیرەکەت لە کالانەکەی خەوە و دانیشــە با هەموو شــتێکت بۆ بگێڕمەوە.» کە حەســـەن لە لای دایکی دانیشــت، دایکی هەموو شــتێکی لە ئەوەڵەوە تا کۆتایی موو بە موو بۆ باس کرد و گوتی: «ڕۆڵە کاتێک ژنەکەت گڕووی لە گەرماو گرت و دەســتی کرد بە گریان. ترســام دوایە لە لای تۆ شکایەتم لێ بکا و ئەتۆش لێم تووڕ بی. خۆ ئەگەر سەیزادەش لێم تووڕە نەبا و بە زۆر کلیەکەی لێ نەستاندبایەم قەتم نەدەدانێ. کوڕی خۆم خۆ دەزانی دەستی خەلافەت لە هەموو دەستان بە هێزترە. کە کراسەکەیان هێنا سەیزادە کەمێکی ئەمدیو ئەودیو پێ کرد. دوای ئەوە ژنەکەت کراســـەکەی لێ وەرگرت و دڵی خۆش بوو لە بەری کرد. لەجێوە بوو بە مەلێکی جوان و لە نێو کۆشــکدا کەمێک هات و چوو دوایە چووە ســـەر گوێســـوانەی کۆشـــک. ئەوجار بە منی گوت: «ئەگەر کوڕەکەت هاتەوە و بیری منی کرد و حەزی لە دیدارم بوو، پێی بڵێ بێ بۆ دوڕگەی «واق» ئەوە بوو تەواوی ڕووداوەکە.

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتــایی پێ هــات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن کە ئەوەی بیست، لە تاوان بێ هۆش بوو، ئیدی هەتا شەو وە هۆش نەهاتەوە. کە وە هۆش هاتەوە بە چەپۆک لە سەر و گوێلاکی دا و لە سەر زەوی وەک مار لە خۆی دەئالا. دایکی لە پشت سەری دانیشت تا تۆزێک ئەهوەن بووەوە و ئەو شێعرەی گوت:

هەر هەناسەیەک دەدەم لە دەست دووریت دەناڵێنم
خـــــــــــــــــوزگە با بیگەیەنێ پێت، ئاخ و ئۆفی ناڵێنم
ئەخە چ بکەم جگە لە ئاخ و ئـــــــــــــــۆف و داد و فغان
لۆمەم مەکە لە سوێی تۆیە گریان و ڕۆڕۆ و شینم
شەختە لێی دا باخی ژیـــــــــــــــــــنم وا گەڵا ڕێزانمە
دوور لە باڵای سەوزی تۆ بێ بەهارە ساڵی ژینم

کە شێعرەکە تەواو بوو، هەستا لە ماڵەکەدا بە گریانەوە دەستی کرد بە هاتوچۆ و چەمەرە خوێندنەوە. هەتا پێنج ڕۆژان ئەوە کاری بوو. خەو و خواردن و خواردنەوەی نەبوو. دایکی لە بەری دەپاڕاوە و تکای لێ دەکرد تەواوی کا و چی دی نەگری. کەچی ئەو جوابی دایکی نەدەداوە و هەر دەگریا و دەناڵا و ئەو شێعرانەی دەخوێندەوە:

تا باری خەمت لە سەر دڵـــــــــــــــــــی من کۆ بێ
کول و زوخـــــــــــــــــــاو و خەفت لێم وەکو دەبێ
شیـــــــــــــــــــــــــــــرنی بە تۆ گەیشتنم باس ناکرێ
مەگەر تاڵی دووریـــیەکەت لە بیرمی بەرێ

شەوێکی خەونی بە ژنەکەیەوە دیت کە مات و پەشێو بوو دەگریا. بە گریانەوە لە خەو ڕاپەڕی و ئەو شێعرەی گوت:

دەلالم خوا نەکا من تۆ مات ببـــــــــــــــــینم
لە خەونـــــــــــــــــــیشمدا ناتوانم وات ببینم
دوێشەوێ هاتیتە خەونی من گیانەکەم
ماتم بینی من خۆڵی کوێ وەسەر کەم

ئیدی هەتا بەیانی هەر گریا. مانگێک ئەوە کاری بوو. دوای ئەوە بە دڵی دا هات بچێ بۆ لای خوشکەکان. تەپڵە مسییەکەی لێ دا و وشترەکان حازر بوون. لە عێراق ماڵێکی زۆر کرێ و لە وشتری دا و بۆخۆشی سوار بوو. ماڵەکەی بە دایکی سپارد و ڕۆیشت. ڕۆیشت هەتا گەیشتە کۆشکی کیژەکان. دیارییەکانی داگرت. کچەکان زۆر خۆشحاڵ بوون. پرسیاریان کردە کە ئەوە چۆنە وا زوو گەڕاوییەوە خۆ ئەوەندە لە مێژ نییە چوویەوە.

حەسەن دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بەختەوەریم خەونێک بوو کە کۆتایی هات
بە کۆچی یارەکەم خۆشیشم دوایی هات
داباری بە سەرمدا بارانی خەفەت
پەنام هێناوەتەوە مەڵێن بۆچی هات
ئێرە بوو سەرچاوەی ئەو بەختەوەرییە
فریام کەون بەختەوەریم ویشکایی هات

ئیدی دڵی لە بوورەوە هات و بە لادا کەوت. کچەکان تێی ئاڵان و دەستیان کرد بە گریان. کاتێک حەسەن وەخۆ هاتەوە ئەو شێعرەی گوت:

دڵی بردم و ڕۆیی، خۆی لێ شاردمەوە
خوایە دڵخۆشی دڵم چۆن بدەمەوە
بێ ئەوی، ئەوێی وا لە من تاڵ کردووە
تا ئەو نەیەتەوە ئەوێ ناچمەوە

کە شێعرەکە کۆتایی هات، دیسان دەستی کرد بە گریان و بە دەم گریانەوە ئەوە شێعرەشی گوت:

دەزانی دڵم! گوڵەکەم چی لێ کردم؟
بێ وەفا بوو، خەیانەتی لێ کردم
دڵم نەقیمێک بوو لە دەستیدا بردی
گوڵم کۆچی کرد و ڕۆی، بێ وەفا بردی

دوای ئەوە دیسان هێندە گریان تا لە سەرخۆ چوو، پاش ئەوەی هاتەوە سەرخۆ، ئەو شێعرەشی خوێندەوە:

بەهـارێکی ڕەنگین بوویت، جێت نەکردم، ویستی من نەبوو
لافاوێکی سەرشێت بوویت کە نەتبردم، ویستی من نەبوو
ژینێک کە تۆی تێدا نەبێ، من بۆ چیمە خۆشەویستەکەم
ڕۆیشتی و جێت هێشتم بۆ خەم و دەردم. ویستی من نەبوو

کە خوشکەکەی حەسەن گوێی لەو شێعرە بوو، ئەویش لەو حاڵەدا دەستی کرد بە گریان و لە خۆدان و گوتی: «کاکە توخودا ئەوە چی بووە بۆم بگێڕەوە. حەسەن بەدم گریان و هەنیسکدانەوە ڕووداوی فڕینی شاژنی بۆ گێڕانەوە، کە شاژن لە جەنگەی ڕۆینەکەیدا چی بە دایکی گوتووە. باسی ئەوەی کرد کە گوتبووی ئەگەر پێی خۆش بوو بم بینێ بێ بۆ دوورگەی واق.»

کچەکان کە ئەو نێوەیان بیست چاوێکیان لێک کرد و سەریان داخست. دوای ئیستێک سەریان هەڵێنا و گوتیان: «بە داخەوە ئەگەر بتوانی بچییە ئاسمان ئەوە دەتوانی بچییە لای ئەویش.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و نەوەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن کە ئەوەی بیست فرمێسکی هاتە خوارێ و ئاوای گوت:

چەندی بە سەر خۆمدا زاڵ بووم ڕاناپەڕێ کارم
پێی تێ ناخا یارم هەرچەند، چۆڵم کردووە ماڵم
بەو خەیاڵەوە تێ پەڕی داخەکەم تەمەنم
کە کۆتایی دێ کەتنگیڕی زولفت لەگەڵم
نەبوە تێری بەیانیم ئامانجی نەپێکابێ
دەبێ چ بووبێ وا، کاریگەر نین تیرەکانم

کە شێعرەکانی تەواو بوو، دەستی کرد بە گریان و کچەکانیش زگیان پێی سووتا و لەگەڵ ئەو دەستیان کرد بە گریان. پاشان دڵخۆشیان داوە و دۆعایان بۆ کرد و گوتیان کە ئیشەڵلا پێیان شاد دەبییەوە.

ئەوجار خوشکەکەی حەسەن گوتی: «برا گیان نیگەران مەبە و خۆت نارەحەت مەکە حەتمەن دەیان بینییەوە. لە قەدیمەوە گوتوویانە هەرکەس لە سەر سەبرانە لە سەر خێرانە. شاعیریش لەو بارەوە دەڵێ:

لە دوای تەنگانە هەر فەرعانەیە
بەختەوەرە ئەوەی سەبری هەیە

دوای ئەوە گوتی: «براکەم ورە بدە بەر خۆت. بەهێز بە. خەم و دەرد مرۆڤ لە پێ دەخا. ئەتۆ لێرە بمێنەوە و بحەسێوە تا من فکرێکت بۆ دەکەمەوە و بە ژن و منداڵەکانت شاد کەمەوە. کارێک بکەم وەک شاعیر دەڵێ:

ئێمە دەستمان هەڵێنین و شەو دۆعایەک بکەین
خەفەتی دابڕانت بە جۆرێک لە دڵ کەین

ئیدی حەسەن هات لە پەنا خوشکی دانیشت. خوشکی دڵخۆشی داوە و هۆکاری ڕۆیشتنی ژنەکەی لێ پرسی. حەسەن هۆکارەکەی پێ گوت. کیژۆڵەکە گوتی: «براکەم بە خودا ئەمن ویستم بڵێم ئەو باڵ و پەڕەی بسووتێنە کەچی شەیتان لە بیری بردمەوە.»

به کورتی هەر خوشکی بە دەوریدا دەهات و قسەی خۆشی بۆ دەکرد. کەچی ئەو هەر کوڵی دڵی دانەدەمرکا و دەستی پێ دەکردەوە:

ئـــااااای لەو ڕۆژەی کە چـــاوم بە چـــاوی کەویـــتەوە
دڵـــــــــــــــــــــــی سیس و ژاکاوم سەر لە نوێ بژێتەوە
سڕ و تاریـــــــــــــــــکە ژینم بێ تۆ ژیانم تاڵە
هـــــــــــــــــیوا وەبەر خۆم دەنێم دیتنەوەشت مەحاڵە
دەســـــتهەڵگر نیم تـــا مـــاوم، هەر شــــین و ڕۆڕۆ دەکەم
چش بـــا بەو دەردە بمرم پــــــــاشـــــی تۆ من چی بکەم

دیسان حەسەن درێژەی داو گوتی:

دەســـــتهەڵگـــــــــــری ئاوات نیم، تاکوو بە ئاوات نەگەم
یـــا گـیـــان لە لەش دەردەچــێ، یـــا ئـــاخـــری پـێـی دەگەم
بە دڵـم گـوت چـاوەکەم دەســـــــت هەڵـگرە. گـوتـی پـێـم:
دەبـــــــێ بە گڕ خـۆمـدا بچمەوە من، چۆن وا دەکەم
ناگــــــــــــــــیرێ هەموو ڕۆژێ یارێک وەک بێ وەفایان
من ماوم و ئاتەگی، من هـــــــــــــــــــەر پەنای بۆ دەبەم

کە خوشکەکەی، حەسەنی لەو حاڵەدا دیت، هەستا بە گریانەوە چوو بۆ لای خوشکەکانی و لە لای ئەوان زۆر گریا و خۆی بە سـەر کەوشـەکانیاندا دا و قاچی ماچ کردن. داوای لێ کردن یارمەتی براکەی بدەن. ئەوانیش بەڵێنیان پێ دا کە لە بیر ئەوەدا بن کە بە جۆرێک حەسەن بگەیەننە دوڕگەی واق. دوای ئەوە حەسەن ساڵێک لە لای ئەوان ماوە و فرمێسکی لە چاوی ویشـک نەبوو. ئەو کچانە مامێکیان هەبوو. ناوی شـێخ عەبدولقودووس بوو. ئەو مامەیان کچە گەورەکەیانی زۆر خۆش دەویسـت و سـاڵێ جارێک دەهات بۆ لای. کچەکان بەســـەرهاتی حەســـەنیان بۆ مامیان گێڕاوە کە چۆناوچۆن گاورەکە هەڵیخەڵەتاندووە و چ پەندێکی بە ســـەر هێناوە. لە ئاخریدا حەســـەن چۆنی کوشـــتووە. مامیان کەیفی بەو بەســـەرهـاتە کردبوو. تووڕەکەیەکی دابوو بە کچە گەورەکە و گوتبووی: «برازا خۆشەویستەکەم، ئەوە هەر کاتێک گرفتێکت بوو ویستت من فریات کەوم ئەوە دەنکێک لەو عوودانە دەرهێنە و لە ئاوری هاوێ من خێرا دەگەمە لات. ئەوە قسەی سەرەتای ساڵ بوو.

کچە گەورەکەیان بە خوشـــکەکانی گوت: «ئەوە ســـاڵ تەواو بوو، مامم هەر نەهات. دا ئـاگر بکەنەوە و تووڕەکە عوودەکەم بۆ بێنن.» کیژەکـان خۆشـــحـاڵ بوون و تووڕەکە

عوودەکەیان بۆ هێنا و ئاگرەکەیان کردەوە. خوشــکی گەورە کەمێکی لە عوودەکە خســتە سـەر ئاورەکە و یادی مامی کردەوە. هێشتا عوودەکە تەواو نەسـووتا بوو کە لە جەرگەی بێرووندا تۆزێک هەســتا. ئەوەندەی پێ نەچوو، پیاوێکی فیل ســوار وە دەر کەوت.کە هاتە پێشێ مامیان بوو. لە فیلەکە دابەزی و کچەکان ئەوێیان لە ئامێز گرت و ماچیان کرد.

دوای ئەوە لەگەڵ کچەکان دانیشـت و دەسـتیان کرد بە وتووێژ. کچەکان گوتیان کە بۆ دیار نی. شــێخ قودووس گوتی: «ئەمن لەو جەنگەیەدا لەگەڵ ئامۆژنتان دانیشــتبووم کە بۆنی عوودەکەم بۆ هات. ئیدی ســـواری ئەو فیلە بوون خێرا خۆم گەیاندە ئێرە. برازاکانم بڵێن بزانم چیتان دەوێ؟» کیژۆڵە گوتی: «مامە بیری تۆمان دەکرد، ئەوە سـاڵ تەواو هەر نەهاتی. چونکە ســاڵان هەر کە ســاڵ تەواو دەبوو دەهاتی، ئیدی ئێمەش نیگەران بووین.» شێخ گوتی: «ئەزقەزا قەرار بوو سۆزی بێم.» کچەکان زۆریان بەخێرهاتن کرد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەدەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کچە گەورەکە گوتی: «مامە، ئێمە باسی حەسەنی بەسەریمان بۆ کردبووی کە بارامی گاور چۆناوچۆن ئەوی هێنا بوو، چ دەردێکی دابوویە و دوایەش ئاخری ئەو بارامی گوشت. باسی کچەکەی پاشا ئەکبەرێشمان بۆ کردبووی، کە چەندی کوێری لە دووی دی هەتا وەدەستی هێنا و مارەی کرد و بردییەوە بۆ شارەکەی خۆیان.» شێخ عەبدولقودووس گوتی: «بەڵێ لە لیرمە بۆتان گێڕامەوە. ئێستا چی بە سەر هاتووە؟» کچە گوتی: «مامە حەسەن لەو کچە دوو کوڕی بوو، بەڵام ئەو کچە فێڵی لە حەسەن کردووە و کاتێک حەسەن لە ماڵ نەبووە، دەستی کوڕەکانی گرتووە و هەڵفڕیوە ڕۆیشتووە. بە دایکی حەسەنیشی گوتووە کە ئەگەر ویستی بمبینێ بێ بۆ دوڕگەی واق.

شێخ عەبدولقودووس کە ئەوەی بیست سەری ڕاوەشاند و قامکێکی خستە بەینی ددانییەوە و سەری داخست. ئینجا زۆری قامک لە عەرزەکە وەر دا. دوای ئەوە چاوێکی لە ڕاست و چەپی خۆی کرد و سەرێکی ڕاوەشاند. حەسەن لە دوور ئاگای لێ بوو. کچەکان گوتیان: «مامە وەڵاممان دەوە دڵمان تۆقی.» شێخ سەری هەڵێنا و گوتی: «ئەو کوڕە خۆی تووشی گرفتێکی زۆر گەورە و گران کردووە و ڕزگاری بووین ئەستەمە و قەت ناتوانێ بچێ بۆ دوڕگەی واق. کچەکان حەسەنیان قاو کرد. حەسەن هاتوو و دەستی شێخی ماچ کرد. شێخ ئەوی لە لای خۆی دانا. کچەکان گوتیان: «مامە ئەوەی بە ئێمەت گوت بە براکەشمان بڵێ با بزانێ.» شێخ گوتی: «ڕۆڵە ئەو فکرە لە سەرت دەرکە چونکە چوون بۆ ئەو دوڕگەیە کاری تۆ نییە. ئەگەر جنێی باڵدار و ئەستێرەی گەڕۆکت لە بەر دەستیدا بێ. چونکە لێرەوە تا ئەو دوڕگەیە بێرووێی پان و بەرین و حەوت دەریای بێ کۆتایی و حەوت کێوی بەرزت لەبەرە. چۆن دەتوانی بگەیە ئەوێ و کێ دەتگەیەنێتە ئەوێ؟! تکات لێ دەکەم، بێ کە بۆ خاتری خودا دەست لەو خەیاڵە هەڵگرە و ئەوەندە خۆت ئازار مەدە.»

حەسەن کە ئەو قسەیەی لە شێخ عەبدولقودووس بیست هێندە گریا هەتا دڵی لە بوورەوە هات. کچەکان تێی ئاڵان و ئەوانیش لە تاوانی دەستیان کرد بە گریان. بە تایبەت خوشکە چکۆلەکەیان هێندەی لە سەر و گوێلاکی خۆیدا هەتا ئەویش بێ سەر و زمان کەوت. شێخ عەبدولقودووس کە ئاوای دی زگی پێیان سووتا و بە حەسەنی گوت. نارەحەتیش مەبە بزانم کارێکت بۆ ناکەم. دوای ئەوە بە حەسەنی گوت هەستە ڕەگەڵم کەوە با بڕۆین. حەسەن هەستا و ماڵاوایی لە کچەکان کرد و وە دوای شێخ کەوت. شێخ داوای فیلی کرد. فیلیان بۆ هێنا. شێخ سوار بوو حەسەنیشی سوار کرد. سێ شەو و ڕۆژ بەڕێوە بوون تا گەیشتنە چیای بەرزی شین. ئەو کێوە ئەشکەوتێکی تێدا بوو دەرگاکەی لە

ئاسن بوو. شێخ دەستی حەسەنی گرت و دایبەزاند. ئەوجار بۆخۆشی دابەزی و فیلەکەی بەڕەڵا کرد. بەرەو دەرکی ئەشکەوتەکە چوو لە دەرگاکەی دا. دەرگاکە کراوە. کۆیلەکەیەکی ڕەش هاتە دەرێ و بە دەستێکی شیر و بە دەستەکەی دیکەی مەتاڵێکی پۆڵای پێ بوو. کە شێخ عەدولفودووسی بینی شیر و مەتاڵی فڕێ دا ئەو لاوە و هات دەستی شێخی ماچ کرد.

دوای ئەوە شێخ دەستی حەسەنی گرت و چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە و کۆیلەکەش دەرکی ئەشکەوتەکەی پێوەدا و بە دوایاندا چووە ژوورێ. حەسەن تەماشای کرد ئەشکەوتێکی زۆر گەورەیە ماوەی یەک مایل هەر بە دالانێکدا ڕۆیشتن. گەیشتنە قەڵای گەورەگەورە. بەرەو شوێنێک چوون کە دوو دەرگای مسی گەورەی لێ بوو. شێخ عەبدولقودووس یەکیانی کردەوە چووە ناوەوە و دەرگاکەی پێوە دا. بە حەسەنیشی گوت، لەوێ دانیشی. بەڵام دەغیلت بم بە هیچ جۆرێک نەچی دەرگاکە بکەیەوە و بێیە ژوورێ. ئەمن کەمێکم پێ دەچێ و زوو دێمەوە لات. شێخ کەمێکی پێ چوو گەڕاوە، کە گەڕاوە ئەسپێکی زین و لغاوکراوی لەگەڵ خۆی هێنا و بە حەسەنی گوت: «سواری ئەو ئەسپە بە.» دوای ئەوە شێخ دەرگاکەی دیکەی کردەوە، بێروونێکی بەرین دەرکەوت. شێخ عەبدولقودووس بە حەسەنی گوت: «کوڕم، ئەو نووسراوەیە بگرە و بەو ئەسپە بڕۆ، هەر کاتێک دیتت ئەو ئەسپە لە بەر دەکی وەها ئەشکەوتێک ڕاوەستا، ئەتۆ لە ئەسپەکە دابەزە و لغاوەکەی بە کەڵوەی زینەکە دا بکە و دەنگی بدە با بچێتە ناو ئەشکەوتەکەوە، بەڵام بۆخۆت مەچووە ژوورێ و هەتا پێنج ڕۆژ لە وێ ڕاوەستە. ڕۆژی شەشەم پیاوێکی ڕەش و ڕەشپۆش بە ڕدێنێکی درێژ و چەرمووەوە لە ئەشکەوتەکە دێتە دەرێ. ئەتۆ بە پیرییەوە بچووە و دەستی ماچ کە و شاقەلی بگرە و بە گریانەوە، خۆ بە سەر لاقی دا بدە تا بەزەیی پێتدا دێ و دەڵێ چ گرفتێکت هەیە و چیت بۆ بکەم. ئەوتۆش نووسراوەکەی بدەیە، لێت وەردەگرێ و قسەشت لەگەڵ ناکا. ئەتۆ لەوێ بەجێ دێڵێ و دەگەڕێتەوە بۆ ئەشکەوتەکە. ئەتۆ پێنج ڕۆژی دیکە لەوێ چاوەڕێ بە و نیگەران مەبە. لە ڕۆژی شەشەمدا ئەگەر ئەو کابرایە هاتەوە ئەوە بزانە کە کارەکەت جێبەجێ دەبێ، ئەگەر کۆیلەک هاتە دەرێ ئەوە بزانە ئەو کۆیلە بە تەمای کوشتنی تۆ دەبێ. تەواو.

بەڵام کوڕی من ئەوەندەش بزانەش کە هەرکەس دەست بداتە کاری گەورە دەبێ لە گیانی خۆشی ببوورێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی هەشتسەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شێخ عەبدولقودووس بە حەسەنی زێڕینگەری گوت هەر کەس شان وەبەر کاری گەورە بدا نابێ بیر لە تێداچوونیش بکاتەوە. ئەگەر دەزانی ناتوانی دەست لە گیانی خۆت بشۆی ئەوە سواری فیلەکە بەو بگەڕێوە لای خوشکەکانت. تا ئەوانیش بتنێرنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت. حەسەن بە کابراکەی گوت: «ئەمن هەتا بە ئاوات نەگەم تازە بە تەمای ژیان نیم، بە خودا قەت لەو ڕێگەیە ناگەڕێمەوە یان پێیان دەگەم یان لەو ڕێیەدا دەمرم. دوای ئەوە دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەڤیندار نییە ئەو کەسەی سەری بەختی ئەوڤین نەکا
ئەڤین سەری لە سەر دانێ بە خۆڕاییت گیر کەوتووە
دڕووی ڕێگای کەعبە چییە تا حاجی تەرکی ڕێ بکا
دڕووی سەر ڕێگەی ئاشقان حەریرە و ڕایان خستووە
نییە کەس خۆ لە تۆ بدا مەگین ئەودالێکی وەک خۆت
سۆزی یاری لە دڵدایە و ئەڤینیش پەکی خستووە

عەبدولقودووس کە ئەو شێعرانەی بیست زانی کە تاز ناگەڕێتەوە و قسە کاری تێ ناکا. ئەوجار گوتی: «کوڕی من، ئەوەش بزانە کە کۆمەڵە دوڕگەی واق خۆی حەوت دوڕگەیە و لەشکرێکی مەزنیشی لێیە کە تەواوی لەشکرەکە کچانی کەچینن. دانیشتوانی ئەو کۆمەڵە دوڕگەیەش دێو و درنج و جادووباز و سیحرباز و شتی وان. هەرکەس بچێتە ناو وڵاتەکەیانەوە گەڕانەوەی بۆ نییە. بیکە بۆ خاتری خودا دەست لە خەیاڵە نابەجێیە هەڵگرە. کوڕە ئەو کچە کچی پادشای ئەو حەوت دوڕگەیەیە. شیمانەی ئەوە ناکرێ بتوانی پێی بگەی. کوڕی من، ئەتۆ بە قسەی من بکە بەشکوو خودای مەزن کەسێکی باشترت بە قیسمەت بکا.»

حەسەن گوتی: «گەورەم، لە پێناو خۆشەویستی ئەودا ئەگەر دارم لە سەر بەرد نەمێنێ، هێشتا بە قەد سەرە موویەک لە خۆشەویستیم بۆی کەم نابێتەوە. بۆیە هەر دەبێ بچم بۆ دوڕگەی واق و خێزانم و منداڵەکانم ببینمەوە. ئیشەڵلا ناشگەڕێمەوە هەتا ژن و مداڵەکانم نەهێنمەوە.» کابرا گوتی: «جا کە ئەتۆ ئاوا بە هیممەتی بڕۆ.» حەسەن گوتی: «گەورەم تکایە دوعام بۆ بکە بەشکوو خودا یارمەتیم بدا بە دیتنیان شاد بم. دوایەش دڵی پڕ بوو، ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هیوا و ئاوات هەڵدەقوڵێ لە سەر چاوەی ئەوینی من
دیجلە و فورات دەکەونە ڕێ لە داوێنی دوو چاوی من
بڵێسەی دێ گڕی خۆشەویستی لە هەناوی مندا
دەتوێنێتەوە مۆمی جەستەم بەبێ بوونی پەپوولەی من
ئەگەر بیستان ئەڤینداریک سەری کردە، بەردەبازی یار
بزانن ئەوە پێڵاوی یار، بۆتە تاجی سەری من

کە شێعرەکەی تەواو بوو، ئەوەندە گریا تا دڵی لە خۆ بووەوە و کەوت. کە وە هۆش هاتەوە، کابار پێی گوت: «ڕۆڵە تۆ دایکت هەیە ئەویش بە ئاگری خەمت مەسووتێنە.» حەسەن گوتی: «گەورەم، بە خودا یان دەبێ ژن و منداڵەکەم ببینمەوە یان دەبێ لەو پەڕی کەساسی و لێ قەوماویدا بمرم.»

دیسان گریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

لەو ڕۆژگارە ڕەشەدا کارم جێبەجێ نابێ
زامی عیشقم کارییە و دەرمانەکەی پەیدا نابێ
ئەڤین خەفەتی لە سەر دڵم کەڵەکە کردووە
داخەکەم ئەڤینداری قەت بێ چەرمەسەری نابێ
یەعقووب ئاسا چاوەکانم لە ڕێیدا سپی بووە
هەواڵبەرێک لە میسرەوە بۆ کەنعان، پەیدا نابێ

کاتێک ئەو شێعرانەی خوێندەوە کابرا دەستی لە گەڕانەوەی شوت. نووسراوەی دایە و گوتی: «چۆنم پێ گوتی ئاوا بکە. لەو نووسراوەیەدا ئەتۆم بە ئەبولڕەویش بنی بلقیس سپاردووە. ئەو مامۆستای خۆم بووە کە تەواوی ئینس و جن کڕنۆشی بۆ دەبەن و لێی دەترسن. جا ئێستا هەستە بڕۆ.

حەسەن لغاوی ئەسپی شل کرد و ئەسپ دەرپەڕی و هەتا دە شەو و ڕۆژ تیژ تێپەڕی. هەتا گەیشتە دەرکی ئەو ئەشکەوتەی کە شێخ عەبدولقودووس گوتبووی. حەسەن لە ئەسپەکە دابەزی و لغاوەکەی بە کەڵوەی ئەسپەکەدا کرد و ئەسپەکەی بەڕێ کردە ئەشکەوتەکەوە. بۆخۆی لەوێ چاوەڕێ بوو. بیری لە ئاکامی کارەکەی دەکردەوە و نەشی دەزانی بە کوێ دەگا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن کاس و گێژ ببوو نەیدەزانی کارەکەی بە کوێ دەگا. دوای ئەوە وە یادی دایکی کەوتەوە کە چەندی کوێرەوەری و چارەڕەشی کێشاوە. ئینجا ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دایە تۆ پەیکەرەی دەرد و خەمی
لەگەڵ کول و کەسەردا هاودەمی
بۆ منت بوو بۆ چارەڕەشی خۆت
نەتزانی داری نیم، بەرم بێ بۆت؟
دڵنیابە هەر دێمەوە بۆ لات
بووک و نەوەکانیش دێنمەوە لات

هێشتا شێعرەکەی تەواو نەببوو، ئەبولڕەویش بنی بلقیس هاتە دەرێ. ئەبولڕەویش کابرایەکی ڕەش بوو، جلوبەرگی ڕەشیشی لە بەردا بوو. کاتێک حەسەن چاوی پێی کەوت بە نیشانەکانیدا ناسییەوە. زانی ئەوە ئەو شێخەیە کە شێخولقودووس گوتبووی. ئیدی خۆی بە سەر قاچیدا دا و ماچی کرد. ئاتەگی گرت و دەستی کرد بە شین و گریان و لالانەوە. شێخ گوتی: «کوڕی من چیت دەوێ بۆا دەکەی؟» ئیدی دەستی لە گیرفانی ڕاکرد و نووسراوەکەی دا بە شێخ. شێخ نووسراوەکەی وەرگرت و گەڕاوە بۆ ناو ئەشکەوتەکە و هیچ قسەیەکیشی لەگەڵ حەسەن نەکرد. حەسەن هەر وەک شێخ عەبدولقودووس پێی گوتبوو هەتا پێنج ڕۆژ لەوێ چاوەڕوان بوو. هەر دەگریا و ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

لە ئەڤیندا نیتە بەزە و دڵ دەبزوێنی
دەمکووژی بە تیری چاو و ناشمدوێنی
دەڕێژم ڕۆندکی چاوم، تۆ نایتە ڕێ
دڵەکەم ساتێ گوێی دەرێ، بۆ تۆ دەخوێنێ
بولبولێکی لانەواز و سەرلێ شێواوم
عەودالی تۆم سەرگەردانی ناو بەژ و ئاوم

ڕۆژی شەشەم کە تاو سەری لە کەل هێنا دەرێ ئەبولڕەویش هاتە دەرێ کراسێکی سپی لە بەردا بوو. بە ئاماژە بە حەسەنی گوت بچێتە ژوورێ. حەسەن چووە ناو ئەشکەوتەکەوە و زۆر خۆشحاڵ بوو. نیوە دانێک شێخ لەگەڵی چوو تا گەیشتنە دەرگایەکی

پۆلا. شــــێخ دەرگاکەی کردەوە و حەســـــەنی وە پێش خۆیدا بۆ ناو دالانێکی زێڕکاریکراو. ڕۆیشــتن هەتا گەیســتنە گۆڕەپانێکی بەرین کە باخێک لە نێوەڕاســتەکەیدا بوو. حەســـەن باخێکی دیت لە باخی بەهەشت خۆشتر. داری بەری وا تێک چڕژابوو سەیر. لە چوار لای ئەو باخەوە، چوار ژووری گەورەی تێدا بوو کە یەکی حەوزێک کە لە بەردی ڕوخام چێ کرابوو، لە نێوەڕاستەکەیاندا بوو. لە نێوەڕاستی هەر حەوزێکیش پەیکەری شێرێک لە سەر کوڵەکەیەک خۆی دەنواند. لە قەراخ هەر کامێکیشـیان کورسییەکی عاجیشـی لێ داندرابوو کە کەســـێکی لە ســــەر دانیشــــتبوو. کتێبێکی زۆری لە پێش بوو. عوود لە عووددانەکەدا دەســــــووتا. هەرکامیان یەکی چەند قوتابیان لە پێش بوو. ئەو شــــێخانە کتێبەکانیان پێ دەخوێندنەوە. کە شێخ ئەبولڕەویش و حەسەن چوونە ژووریّ، شێخەکان هەستانە سەر پێ و کڕنۆشـیان برد. شـێخ ئەبولڕەویش ئاماژەی کرد قوتابییەکانیان بنێرنەوە. هەر چوار شــێخەکە شـــاگردەکانیان ناردەوە و لەگەڵ شــێخ ئەبولڕەویش دانیشـــتن. هەواڵپرســــی حەسەنیان کرد. شێخ ئەبولڕەویش بە حەسەنی گوت: «بەسەرهاتی خۆتیان بۆ بگێڕەوە.» حەســەن دەسـتی کرد بە گریان و بەســەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە. شـێخەکان گوتیان: «بۆ ئەتۆ هەر ئەو کوڕەی کە گاورەکە لە پێســـتی وشـــتردا ناردبووەیە ســــەر کێوی ســــەحاب؟» حەســـــەن گوتی: «بەڵێ من هەوم.» گوتیان: « شـــێخ ئەبولڕەویش، کاتێک بەهرامی گاور ئەوی بە فێڵ ناردە ســـەر لووتکەی کێوی سـەحاب، ئەو چ شـتێکی سـەیری دیت و ئاخری چۆن هاتە خواریّ؟» شێخ ئەبولڕەویش گوتی: «حەسەن دا بۆیان بگێڕەوە کە لە سەر کێوی سـەحاب چیت دیت و چۆن هاتییەوە خواریّ.» حەسـەنی زێڕینگەر ئەو شـتە سـەیرانەی دیبووی و گەڕانەوەکەی لە سـەر کێو و کوشـتنی بەهرامی گاور و هەتا فڕینی ژنەکەی و بردنی منداڵەکانی و ئەو کوێرییانەی دیبووی هەمووی گێڕاوە. دانیشـتوان سـەریان سـووڕ مابوو. ڕوویان لە شـێخ ئەبولڕەویش کرد و گوتیان: «ئەی سـەروەری شێخان، ئەو کوڕە لێقەوماوە، پێویستە جەنابت یارمەتی بدەی تا ژن و منداڵەکەی ببینێتەوە و بیانباتەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شێخەکان گوتیان کە دەبێ تۆ یارمەتی بدەیت. شێخ گوتی: «برایان ئەو کارە مەترسی زۆرە. ئێوە بۆخۆتان دەزانن کە چوون بۆ دورگەی واق زۆر دژوارە و دانیشتوانەکەی هەمووی هێرشبەرن. لەشکرێکی بێ ئەژماریان هەیە. ئەمن سوێندم خواردووە قەت پێم نەخەمە ئەوێ. بۆ هیچ کارێ روویان لێ نەنێم. ئەو کورە چۆن دەتوانێ بگا بە کچی پادشای گەورە. کێ دەتوانێ یارمەتی ئەو بدا. گوتیان سەروەری شێخان، ئەو لاوە لە تاو خۆشەویستەکەی گیانی خۆی خستووەتە مەترسییەوە. لە لایەن شێخ عەبدولقودووسی برات، نامەی بۆ تۆ هێناوە. لە سەرتە یارمەتی بدەی. ئینجا حەسەن هەستا و خۆی بە سەر لاقی شێخ ئەبولرەویشدا دا و ئاتەگی گرت و دەستی کرد بە گریان و پارانەوە تا یارمەتی بدا ژن و منداڵەکانی بدۆزێتەوە. گوتی بێ ئەوان من ناتوانم بژیم. ئەوەی گوت دەستی کرد بە گریان، هەنتەشیان لەگەڵ ئەو دەستیان کرد بە گریان و بە شێخیان گوت: «دەستی ئەو لێقەوماوە بگرە، دەرفەتە با خوداش دەستت بگرێ.» شێخ گوتی: «ئینشائەڵڵا، لە قەدەر توانابیەکانی ئەو یارمەتی دەدەم. حەسەن دڵخۆش بوو، دەستی ئەویش و هەنتەشیانیشی ماچ کرد.

لەو جەنگەیەدا شێخ ئەبولرەویش داوای لێنووس و پێنووسی کرد و نووسراوەیەکی نووسی. لەگەڵ هەنبانەیەک کە عوود و بەرد و چەخماخی تێدا بوو، دای بە حەسەن. پێشی گوت: «ئەو هەنبانەیە هەڵگرە و هەر کاتێک تووشی گیروگرفت بووی، خێرا بیکەوە و بەو بەرد و چەخماخە ئاورێک بکەوە و عودێکی تێ هاوێ. ئەمن خێرا خۆم دەگەیەنمێ و فریات دەکەوم و لە گرفتەکە ڕزگارت دەکەم. دوای ئەوە بە حازریانی گوت: دێوێکی باڵدار بۆ حەسەن بێنن.»

کە دێوەکەیان بانگ کرد. شێخ نێوەکەی پرسی. گوتی: « من دەهەنێشی کوڕی فەقەتەشم. شێخ گوتی وەرە پێشێ. دێوەکە چووە بەرەوە. شێخ دمی بردە بن گوێی و سرتەیەکی لەگەڵ کرد. دێوە سەرێکی لەقاند و بێ دەنگ بوو. شێخ بە حەسەنی زێڕینگەری گوت: «ڕۆڵە هەستە بچووە کوڵی ئەو دێوە. ئەگەر ئەتۆی بەرەو ئاسمان برد و لەوێ گوێت لە زیکر و لائیلاهە ئیلەڵڵا و شتی مەلائیک بوو، نەچی تۆش لەگەڵیان بیڵێیەوە. دەنا تۆش و دێوەکەش هەپروون بە هەپروون دەبن. حەسەن گوتی: «ورتەم لێوە نایە.» شێخ گوتی: «حەسەن، تاریک و ڕوونی بەیانی ڕۆژی دووەم، ئەو دێوە تۆ لە ولاتێک دادەنێ کە وەک کافوور سپییە. ئەتۆ دە ڕۆژ بە تاقی تەنیا دەڕۆی هەتا دەگەیە دەروازەی شارێک. بچووە ناو شارەکەوە و پرسیار بکە پادشای شارەکە کێیە. کە ئەوت دیتەوە سڵاوی لێ

بکە و دەســتی ماچ کە و ئەو نووســراوەیەی بدەیە. ئینجا هەرچی ئەو پێی گوتی بە گوێی بکە.»

حەسەن لەرێوە هەستا و چووە کوڵی دێوەکە. شێخەکان دۆعایان بۆ کرد و بە دێوەیان سـپارد. دێوەکە وە حەوا کەوت. شـەوورۆژێک ڕۆیشت. دوای ئەوە نیشـتەوە و لە وڵاتێک کە وەک کافوور سـپی بوو، دایبەزاند و بۆخۆی گەڕاوە. حەســەن دە ڕۆژان بە تاقی تەنیا ڕۆیشت هەتا گەیشتە دەروازەی شارێک. چووە ناو شارەکەوە. پرسیاری ماڵی پاشای کرد و خەڵک پێشانیان دا. زانی ناوی پاشـا حەسـوونە، پادشـای وڵاتی کافوورە، لەشـکرێکی بێ ئەژماری هەیە. حەسـەن چوو ڕوخسـەتی خواست بچێتە لای پادشـا. کە چوو سـەیری کرد پادشــایەکی مەزنە، سـڵاوی کرد و پێچکەی کورسـی دەسـەڵاتی ماچ کرد. پاشـا پرسـی: «داواکەت چییە؟» حەسـەن نووسـراوەکەی دا بە پاشـا. پاشـا نووسـراوەکەی وەر گرت و ســەرێکی بزاوت و بە یەکێک لە پیاوەکانی گوت: «ئەو گەنجە بەرە میوانخانە و میوانداری بکەن. حەســەنیان برد بۆ میوانخانە. سـێ ڕۆژ لە وێ ماوە و جگە لە خزمەتکارێکی چکۆڵە کەسی لە لا نەبوو. کە بوو بە ڕۆژی چوارەم خزمەتکارە بردی بۆ لای پاشـا. پاشـا گوتی: «حەســەن ئەوە تۆی دەتهەوێ بچییە ناو دوورگەگەلی واق، وەک شـێخ بۆی نووســیوم؟» حەسەن گوتی: «بەڵێ.»

پاشـــا گوتی: «ڕۆڵە، لەو ڕۆژانەدا من بەرێت دەکەم بۆ ئەوێ، بەڵام لە بیرت نەچێ ڕێگاکەی زۆر تووش و ناخۆشە، بێروونی ویشک و برینگ و سامناکت لەبەرە، بەڵام ئەگەر هێدی و لەســەرخۆ بی بە ئاکامێکی باش دەگەی. بۆخۆشـم ئیشــەڵلا تێدەکۆشـم یارمەتیت بدەم بە ئامانجت بگەی. کوڕم، ئێرە لەشـــکرێکی دەیلەمی لێ بوو کە زۆریان هەوڵدا بچنە ناو دوورگەگەلی واقەوە بەڵام نەیانتوانی. ئەمن لەبەر خاتری شـــێخ ئەبولڕەویش، کوڕی کچەکەی بلقیس ناتوانم بتگێڕمەوە، لەو ڕۆژانەدا کەشـتییەکان لە دوورگەگەلی واقەوە بەرەو ئێرە دێن. ئەمن سواری کەشـتیت دەکەم و بە کەشـتیوانەکەت دەسپێرم تا ئاگای لێت بێ و بتگەیەنێتە دوورگەگەلی واق. هەر کەســیش لە کەشـــتییەکەدا پرســیاری لێ کردی بڵێ من زاوای پاشا حەسوون، خاوەنی وڵاتی کافوورم. کاتێک کەشتییەکە گەیشتە دوورگەگەلی واق و کەشـــتیوانەکە گوتی لە کەشـــتییەکە دابەزە. دابەزە. لەوێ هێندێک دووکانی کەپری لێیە بچووە لە بن یەکیان دانیشە. کە بوو بە شەو و وڵات تاریک بوو. سپای ژنان دەبینی کە لە دەوری شـتنەکان کۆ دەبنەوە و دێن لەوێ دادەنیشـن. ئەتۆ دەسـتی یەکێک لەو ژنانەی کە دێنە ناو دووکانەوە بگرە و داوای لێ بکە پەنات بدا، ئەگەر بێت و پەنات بدا تازە کارەکەت جێبەجێ دەبێ و ژن و منداڵەکەت دبینییەوە. ئەگەریش پەنای نەدای ئەوە بزانە چارەڕەش بووی و تازە تێدا دەچی و دەکوژرێی. بە داخەوە ئەمن هەر ئەوەندەم لە دەســـت دێ و تەواو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پاشا بە حەسەنی زێڕینگەری گوت: «ئەمن لەوە زیاترم لە دەست نایە و ئەگەر خوداش بە هاناتەوە نەیە قەت ناتوانی بگەیتە ئەوێ. حەسەن بەو قسەیە بێ هیوا بوو ئەوەندە گریا تا بێ هۆش بوو. کە وە هۆش کاتەوە ئەو شێعرەی گوت:

مردنی ناو دەشت و بێروون لە ماڵێ خەوتن چاکترە
ئەگەر بە مرادیشت نەگەی، لە ڕێی هیوادا مردنە

دوای ئەوە کڕنۆشی بۆ پاشا برد و گوتی: «پاشای مەزن، چەند ڕۆژی ماوە پاپۆڕەکان بێن؟» پاشا گوتی:«مانگێکی دیکە پاپۆڕەکان دێن. دو مانگیش لێرە خەریکی کڕین و فرۆشی شتەکانیان دەبن و دوایە دەگەڕێنەوە.» ئینجا پاشا حەسەنی زێڕینگەر ناردەوە میوانخانە و فەرمانی دا کە خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگی شیاوی بۆ دابین بکەن.

مانگێکی تەواو حەسەن لە میوانخانە بوو هەتا کەشتییەکان هاتن. پاشا و بازرگانەکان هاتنە دەرێ و حەسەنیشیان لەگەڵ خۆیان برد. حەسەن چاوی لێ کرد کە پاپاۆڕی گەورە لە نێو دەریادا بوون بە لۆتکە کەلوپەل و شتەکانیان دێنا ویشکی. لۆتکەکان خەڵکێکی زۆریشیان تێدا بوو. حەسوونپاشا حەسەنی زێڕینگەری لەوێ بەجێ هێشت و بۆخۆی گەڕاوە، هەتا خەڵکەکەی ناو کەشتییەکە شتەکانیان داگرت، هێندێکیان شت فرۆشت و هێندێکیان شت کڕی. شێ ڕۆژیان مابوو بگەڕێنەوە. ئێنجا حەسوونپاشا، حەسەنی زێڕینگەری هێنا و کەلوپەلی پێویستی سەفەری بۆ دابین کرد و ماڵێکی زۆریشی دایە. بانگی سەرۆکی کەشتییەکەی کرد و پێی گوت: «ئەو گەنجەم بۆ لەگەڵ خۆت بەرە. بەڵام با کەس قوشقی نەبێ و پێی نەزانێ. هەتا دەیبەیە دورگەگەلی واق.» سەرۆک گوتی: «زۆر باشە، بە چاوان دەیگەیەنمێ.» دوای ئەوە پاشا بە حەسەنی گوت: «ڕۆڵە گیان کارێک مەکە تێت بگەن نامۆ و لاوەکی. باسی خۆت لە لای کەس مەکە دەنا تێدا دەچی.» حەسەن ماڵاوایی لە پاشا کرد و زۆری دۆعا بۆ بەردەوامی و سەرکەوتنی پاشا کرد و ڕۆیشتە دەرێ. سەرۆکی کەشتی ئەوی لە سندووقێک خست و لە ئەنباری کەشتییەکەدا داینا و کەشتی ئاژووت. دە ڕۆژان بە ڕێوە بوون. کە بوو بە ڕۆژی یازدەیەم گەیشتنە قەراخ. سەرۆک ئەوی لە سندووقەکە هێنا دەرێ. حەسەن دیوگەلێکی زۆری لە قەراخ دەریا دیت. خۆی گەیاندە یەکێک لە دیوەکان کە لە هەموویان گەورەتر و باشتر بوو. لەوێدا خۆی شاردەوە. کە بوو بە شەو ژنگەلێکی زۆر هاتن هەموو شیری ڕووت بە دەستەوە. ئەو ژنانە کە شتەکانیان دیت سەرقاڵی ئەوان بوون. دوای ئەوە بۆ حەسانەوە هاتنەوە دیوەکان.

یەکێک لەو ژنانە هاتە ئەو دیوەی کە حەسەنی لێ بوو. حەسەن لەڕێوە خۆی بە سەر لاقیدا دا و لاقی ماچ کرد. داوێنی گرت و دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە، ژنە گوتی: «هەستە بزانم چییە بۆا دەکەی؟» حەسەن هەستا و دەستی ماچ کرد و گوتی: «خانمەکەم، پەنام بۆ هێناوی تکایە بەزەییت پێمدا بێ. لە ژن و منداڵەکانم دابڕاوم. ئەو ژنە بەزەیی پێیدا هات و زگی پێی سووتا. زانی کە ئەوە بۆ کارێکی گەورە خۆی خستووەتە مەترسییەوە و لە گیانی خۆی گوزەراوە. پێی گوت: «ڕۆڵە، مەترسە و نیگەران مەبە بچووەوە شوێنەی خۆت، هەتا سبەی شەو خۆت حەشار بدە. حەسەن گەڕاوە دیوەکە و خۆی حەشار دا. دوای ئەوە ژنەکان هەتا بەیانی لەوێ بوون و هەر مۆم و عوودیان ئایساند. کە ڕۆژ بووەوە بازرگانەکان شتەکانیان لە کەشتییەکان داگرت و هێنایانە قەراخاوەکە هەتا بوو بە شەو. حەسەنیش هەر بە چاوی بە فرمێسک و دڵی نیگەرانەوە لە شوێنەکەی خۆی. خۆی مات دابوو. کە لە پڕ هەر ئەو ژنە هات بۆ لای حەسەن. زرێیەک و شیرێک و زەرگێک و قایشێکی پشتێنی دایە و گەڕاوە. حەسەن کە ئەوانەی دیت زانی کە ئەو ژنە بۆ ئەوەی هێناوە حەسەن ئەو شتانە لە خۆی دا. لەڕێوە هەستا زرێکەی لە بەر کرد و قایشەکەی لە قەدی بەست و شیرەکەی لە قەدی دا و زەرگەکەی بە دەستەوە گرت و لە نێو دیوەکەدا دانیشت. ئەوە لە بەرەوەش هەر لە بەر خودا دەپاڕێتەوە و خەریکی زیکر خودایە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو کاتەی حەسەن لە دیوەکەدا دانیشتبوو، مۆم و مەشخەل و لەنتەر لە دوور وەدەر کەوتن کە دیار بوو سپای ژنانە هاتەوە. حەسەن هەستا لەگەڵیان ڕۆیشت هەتا گەیشتە لای خێوەتەکانی ئەوان. هەر یەکی چوونە ناو تاوڵێکەوە و حەسەنیش چووە تاوڵێکەوە. ڕێکەوت وا بوو ئەو خێوەتە ڕاست خێوەتی ئەو ژنە بوو کە حەسەن پەنای بۆ برد. ئەو ژنە کە هاتەوە تاوڵەکەی چەک و شتەکەی لەو لاوە دانا و زرێکەشی داکەند. حەسەن چاوێکی لێ کرد سەیری کرد یەکی چاو شینی کەپۆ زل، پیرێکی پەککەوتە بوو، ناحەزییەکەی بە جۆرێک بوو کە شاعیر دەڵێ:

ڕوخسارێکی هێندە دزێو، گەر بە دەرکیماڵێوە با
دێو و درنج گشت ڕای دەکرد. هەرچییەکی لەو ناوە با

پیرێژنە کە حەسەنی دیت سەری سوور ما و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوە چۆن هاتووەتەوە ئەو وڵاتە و بە کام پاپۆڕ هاتووە و چۆنە دەرچووە و هەر ماوە؟» لەو جەنگەیەدا حەسەن خۆی بەسەر قاچیدا دا و دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە. ئەوەندە گریان تا لە هۆش خۆی چوو. کە وە هۆش هاتەوە ئەو شێعرەی گوت:

خۆزگە ئەو شۆخە دڵبەرە جارێ بە لامدا تێ پەڕێ
بە بۆنی زیندووم کاتەوە گەش بمەوە وەک شەشپەڕێ
تا هێز لە ئەژنۆم دابێ بە دوایدا ڕاکەم و بڕۆم
ماندووبوون لە زاتمدا نییە، هەدا نادەم و هەر دەڕۆم

دوای ئەوە داوێنی ژنەی گرت و لە سەر سەری دانا و گریا و پاڕاوە پەنای بدا. پیرێژنە کە ئەو شین وگریانەی ئەوی دیت بەزەیی پێیدا هات و پەنای دا و پێی گوت: «مەترسە و پێم بڵێ چ کارەی و بۆ لێرەی؟»

حەسەن تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە. پیرێژنە سەری لەو بەسەرهاتە سوور ما و پێی گوت: «ئەرخەیان بە کە گەیشتوویەتە مەبەستی خۆت.» حەسەن لە خۆشیان شاگەشکە بوو. دوای ئەوە پیرێژنە سەرهەنگەکانی لەشکری بانگ کرد. ئەو ڕۆژە ڕۆژی ئاخری ساڵ بوو. کە سەرهەنگەکان هاتن پیرێژنە پێی گوتن: «بە تەواوی لەشکر ڕاگەیەنن کە سۆزی لەگەڵ تاوهەڵاتی بەیانی هەمووتان وەرنە دەرێ و

کۆ بنەوە. ئەوەی ســـەرپێچی بکا دەکوژرێ. ئەوان بە فەرمانی پیرێژنەکە هەموویان گورج دەرپەڕین و چوون لەشـــکریان ئاگادار کردەوە و بە لەز گەڕانەوە لای پیرێژنە. حەســـەن زانی کە ئەو پیرێژنە ســەرۆکی ئەو لەشـکرەیە. ئەو پیرێژنە ناوی شـەواهی و ناسـراوە بە ئومودداواهی. هێشـــتا فەرمانەکانی پیرێژن تەواو نەببوو کە خۆر لە گەل ســـەری هێنا دەر. لەڕێوە تەواوی لەشــکرەکە لە شــوێنەکەی خۆیان هاتنە دەرێ. جگە لە پیرێژن کە ئەو هەر لە تاوڵەکەی خۆی بوو.

کە لەشـــکرەکە بڵاوەی کرد و ئەو ناوە چۆڵ بوو، ئوموددەواهی بە حەســـەنی گوت: «کوڕم وەرە پێشــێ، حەســـەن چووە پێشــێ و ڕووبەڕووی ڕاوەســـتا. پیرێژنە پێی گوت: «هۆی چییە ئەتۆ ئاوا گیانت لە سەر دەستت داناوە هاتوویتە ئەو شوێنە پڕ مەترسییەوە؟ تەواوی ڕاســتییەکانم پێ بڵێ و هیچم لێ مەشــارەوە، چونکە دڵنیا بە من کارم پێت نییە و دەشت پارێزم. حەسەن ئەوجار ئیدی تەواوی بەسەرهات و ڕووداوەکانی کە بۆی هاتبووە پێشــێ لە ســەرەتاوە کە چۆن باڵندەکان هاتنە ســەر گۆلەکە و چۆنی گرت و لە خۆی مارە کرد، فڕینی بە دوو منداڵەکەوە هەمووی گێڕاوە.

پیرێژنە کە ئەوەی بیست ســەری ڕاوەشـاند و گوتی: «ســوبحانەڵڵا، چۆن بە ســلامەتی گەیشـتوویە ئێرە. بەس نەبوو تووشـی من بووی دەنا تووشـی هەرکەســی دیکە بای تازە دەکوژرای و بە ئاواتت نەدەگەیشـتی. ئێسـتا ئەمن دەمهەوێ یارمەتیت بدەم، تا دەسـتت بە ژن و منداڵەکەت ڕابگا. بەڵام ڕۆڵە گیان ژنەکەت لە حەوتەمین دورگە لە حەوت دورگەکەی واقە. لێرەوە تـا ئەوێش ڕێگەی حەوت مـانگە. دوای حەوت مـانگ دەگەیە شـــوێنێک کە ئەرزوتتویووری پێ دەڵێن واتە وڵاتی باڵندەکان. مەمنا ئەو شـــوێنە هێندەی باڵندە تێدایە لەبەر شــەقە شــەقی باڵ و قاووقیژ و قاســپە و قریوە و ســیرەتی باڵندان گوێت لە قســەی کەس نابێ.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پیرێژنە بە حەسەنی گوت: «لەو شوێنەوەی کە ئەرزوتتویووری پێ دەڵێن ئەگەر یازدە شـــەو و ڕۆژی دیکە بڕۆی. دەگەیە وڵاتێک کە ئەرزولوحووشـــی پێ دەڵێن واتە وڵاتی دڕندە کێوییەکان کە لەبەر لوورە و نەڕە و گوڕەی گورگ و پڵینگ و شێران کەس ئاگای لە کەس نییە. ئەگەر لەوێشەوە بیست ڕۆژان دوور کەوییەوە دەگەیە شـــوێنێک کە ئەرزوجننی پێدەڵێن واتە وڵاتی جندۆکان. لەوێش لەبەر زیلەزیلی جندۆکان و لرفە و گڕ و دووکەڵی زاری دێو و ئەژدیهاکان ڕێگەکان دەبەســترێن و چاو نابینێ و گوێ نابیستێ و کەس ناتوانێ ئاوڕ داتەوە. لەوێ ســوارەکان سـەریان وە کەڵەوەی زینەکانیان دەکەن و هەتا ســێ ڕۆژان ناتوانن ســـەر هەڵێنن. دوای ئەوە کێوێکی بەرزی لێیە و ڕووبارێکی بە خوڕ کە دەچنەوە کۆمەڵە دوورگەی واق. لە پەنا ئەو ڕووبارەش کێوێکی دیکەی لێیە پێی دەڵێن کێوی واق. واق ناوی دارێکە لەو چیایە کە ســـەر چڵ و پۆپەکانی وەک سەری مرۆڤ دەچن کە لە کاتی تاوهەڵاتندا ئەو سەرانە تێکڕا دەڵێن واق واق. جوانە ڕەوشـــتی پاشـــا. ئێمە کە گوێمان لێ بوو دەزانین کە ئەوە تاو هەڵات. هەروەها لە کاتی خۆرئاوابوونیشدا ئەو سەرانە دیسان دەنگ هەڵدەبڕن و هەر ئەو وشانە دەڵێنەوە. تەواوی ئەو لەشـــکرە کیژگەلێکی کەچینن. حاکمەکەشـــمان ژنێکە لە دوورگەی حەوتەم، ئەو حەوت دوورگەیە ڕێگای ســـاڵێک دوورن. پیاوان ناتوانن لە لای ئێمە بمێننەوە و ناشـــتوانن بگەنە ئەوێ. نێوانی ئێمە و شاژنیش ڕێگەی مانگێکە و تەواوی مسکێنانی ئەو حەوت دوورگەیە لە ژێر دەســـتی ئەودان و هۆزی جان و دێوەکان لە ژێر فەرمانی ئەو دان. ئەوەندەشـــی ســـیحرباز و جادووباز لەبەر دەســـتی دایە خودا بۆخۆی نەبێ کەس نازانێ ئەژماریان چەندەیە. ئەگەر تۆ لەوانە دەترسی ئەوە کەسێکت لەگەڵ دەخەم بتبا سواری کەشتیت کا و بگەڕێوە بۆ وڵاتەکەی خۆت. ئەگەریش لێرە دەمێنییەوە ئەوە کێشـــە نییە و جێت لە ســـەر چاومە و هەتا بە ئامانجت دەگەیەنم.

حەســـەن گوتی: «خانمەکەم، ئەمن لە تۆ جیا نابمەوە تا ژن و منداڵەکانم نەبینمەوە، ئەوســـەرەکەی دەمرم. پیرێژنە گوتی: «نیگەران مەبە و هیوادار بە، زۆر زوو ئاواتت وەدی دێنم. شاژنیش ئاگادار دەکەمەوە تا یارمەتیت بدا.»

حەسەن دەست و قاچی پیرێژنەی ماچ کرد و دۆعای بە خێری بۆ کرد. بیری لە ئاکامی کارەکەی خۆی دەکردەوە، منداڵەکانی وەبیر هاتەوە و بیری لەو هەموو کوێرییەی کردەوە کە بە سەری هاتووە و دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی گوت:

شـەو هەتا ڕۆژ فـــــــــــــــــــــــــینکە و گریان کاری منە

بـــــــــــــــــــيری خۆشی تۆ دیتەوە خولیای منە
دەریای دڵــــــــــــــــم ویشـک بووە، هێند گریاوم
هەر دێـــــــم بـۆ لات گەر نەشـــــهاتـم مـن نەمـاوم
چـــــێشـــتـم دەرد و کـوێـرەوەری و چەرمەســـەری
چـون ئـاشـــقـم کەس پـێـم نەڵـێ تـۆ ســەرســـەری

دوای ئەوە پیرێژنە گوتی تەپڵی جووڵە لێ دەن. لەشکر کەوتە رێ و حەسـەنیش لەگەڵ پیرێژن رۆیشـــت، بەڵام نوقمی دەریای پەرێشـــان و نیگەرانی بوو. لە بەر خۆیەوە هەر دەگریا و شـێعری دەخوێندەوە. داپیرەش هەر دڵخۆشـی دەداوە. رۆیشـتن هەتا گەیشـتنە دورگەی یەکەم لە حەوت دورگەکە. ئەو دورگەیە شـــوێنی باڵندەکان بوو. کە چوونە ناو دورگەکەوە، حەسەن لە بەر زۆری جریوە و قریوە و قاسپە و قاو و قیژ و هاژ و هووژ و قرتەقرت و شتی مەڵ و پەلەوەرەکان، ترسی رێنیشت و سـەری وەژان کەوت. هەردووک گوێچکەی خۆی گرتبوو. لە دڵە خۆیدا گوتی خودایە جا ئێرە ئاوا بێ بڵێی ولاتی ئاژەڵە کێوییەکان چۆن بێ. لەو جەنگەیەدا پیرێژن کە ئەوی ئاوا دیت گوتی ئەوە لە یەکەم دورگە ئاوا دەکەی بڵێی لەوانی دیکە چۆن بێ؟!

حەســـەن بە گریانەوە زۆر لە بەر خودا پاڕاوە تا یارمەتی بدا و لەو گیروگرفتانە رزگاری بکا و ئاواتەکەی وەدی بێنێ. هەر چۆنێک بوو لە دورگەی یەکەم تێ پەڕین. چوونە ناو ولاتی جنن و پەریانەوە[1]. حەســـەن کاتێک ئەو شـــوێنەی دیت هێندە ســـامناک و پڕ مەترسی بوو، لە تاوان لە هاتنەکەی پەشیمان ببووەوە. بەڵام تازە نەدەکرا ناچار پەنای بۆ خودا برد و دەســـتی کرد بە پاڕانەوە و لەگەڵیان رۆیشـــت تا لە دورگەی جنیانیش رەد بوون. گەیشتنە سەر رووبارەکە، لە داوێنی کێوە بەرزەکە لایان دا و تاوڵیان هەڵدا. پیرێژن فەرمـانی دا کەتێکی[2] مەڕمەڕینی ڕازاوە بە دوڕ و جەواهێراتیـان لە قەراخ چۆمەکە بۆ حەسـەن دانا. حەسـەن لە سـەر ئەو تەختە دانیشـت، خواردنی خوارد و بە پەڕۆیەک دم و لووتی خۆی هەڵدا بە جۆرکێک کە جگە لە چاوی هیچ کوێی دیار نەبوو. ئەوجار کۆمەڵە کیژێک هاتنە نیزیک تاوڵەکەی حەســـەن و خۆیان رووت کردەوە و چوون لە چۆمەکەوە. حەســـەنیش چاوی لێیان بوو. کچەکان خۆیان دەشـــووت و پێکەوە یاری و شـــەڕەئاویان دەکرد. ئاگاشـیان لێ نەبوو ئەوە حەسـەن سـەیریان دەکا. هەر وایان زانی حەسـەن یەکێک لە کچەکانی پاشایە. حەسـەنیش چاوی لە لەشی کافووری و بەلەکی تورت و سمتی خڕ و سپیان دەکرد. حەز و هەستی بزووتبوو. ئەو کیژە جوان و قژ کاڵانە کچی پاشاکان بوون.

---

[1]. لێرەدا لە دەقەکەی «عەبدوڵڵەتیفی تەسووجی»شدا باسی ئەرزولوحووش(ولاتی هۆڤییەکان) ناکا.

[2]. کەت: تەختی دوو کارە هەم بۆ خەو دەبێ و هەم بۆ دانیشتن.

کاتێک لە مەلە و خۆ شـــوتن تەواو بوون، لە ئاوەکە هاتنە دەرێ و خۆیان کۆ کردەوە و چوون بۆ گەڕان. ئینجا پیرێژنەکە فەرمانی دا هەمووی لەشـــکر یەکیەک و دوو بێن لەوێ خۆیان بشـــۆن و مەلە بکەن. بەشـکوو ئەوە خێزانی حەســەن لە لەگەڵیان بێ و حەســـەن بیناســـێتەوە. ئەو کچانە دەســـتە دەســـتە دەهاتن، خۆیان ڕووت دەکردەوە و دەچوون لە ئاوەکەوە. پیرێژنە لە حەسەنی دەپرسی ژنەکەی تۆیان لەگەڵ یا نا؟ حەسەنیش دەیگوت: نا خێزانم لەگەڵ ئەوانە نییە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی هەشتسەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! هەتا وا بوو کچێک هات سی کچی کەچینی مانگرِوخسار لە خزمەتیدا بوون. ئەویش جلەکانی داکەند و لەگەڵ خزمەتکارەکانی چوو لە ئاوەکەوە، بە ناز و عیشـــوەوە لەگەڵ کچەکان گەمە و یاری دەکرد و کچەکانی لە ئاوەکە رِۆ دەکرد. هەر ئاوا خەریکی شەرِەئاو و جەفەنگ بوون. تا ئاخری تێر کایە بوون و لە ئاوەکە هاتنە دەرێ و لە قەراخ ئاوەکە دانیشـتن. خاولی حەریری پرِ نەخش و نیگاریان بۆ هێنا. ئەویش وەری گرت و خۆی پێ وشک کردەوە. دوای ئەوە جل و بەرگ و کراس و شتەکەیان بۆ هێنا. ئەوانیشی کردە بەری و زێرِ و خشڵەکانی وەخۆی خست. دوای ئەوە هەستا و بە ناز و کرێشمەوە لە نێو لەشکردا کەوتە رِێ.

حەســـەن کە ئەوی دیت، کەوتە دڵەکوتە و گوتی: «خانمەکەم ئەو کچە زۆر وەک ئەو باڵندەیەی من لە ناو ئاوەکەدا دیتم دەچێ. ئەویش ئاوا لەگەڵ کەنیزەکانی بە نازەوە و عیشـەوەوە یاری دەکرد.» پیرێژنە گوتی: «حەســەن یانی ئەوە ژنەکەی تۆیە؟» حەســەن گوتی: «ناوەڵا خانم، من هێشـــتا کەســـی بە قەد ژنەکەی خۆم جوان و دەلال نەدیوە.» پیرێژنە گوتی: «حەســـەن دا پێم بڵێ دەنکێکی چۆنە، ئەمن تەواوی کچەکانی دورگەی واق دەناســـم. ئەگەر ئەتۆ پێم بڵێی دەنگێکی رِێک چۆنە، ئەوە من بۆت دەبینمەوە و فکرێکت بۆ دەکەمەوە. حەســەن گوتی: «ژنەکەی من دەنکێکی رِوو خۆشـــی باڵابەرزە. برۆکانی تێکەڵ بوونەوە زولفی ئاڵقە ئاڵقە و چاوی رِەشـە. هەنیەی وەک مانگ و گەلاوێژە و ئەنگوسـتیلەی لە قامکی دایە. سمتی پان و پۆرِ و بەلەکەی سپی و سۆڵە. لە جوانیدا بە جۆرێکە کە شاعیر دەڵێ:

پشکووتنی هێند دڵگیرە، دڵم تـــــــــــــــــینووی بینینێتی
گەرمی نیگای سـووری لێوی کاتێ بزە مـــــــــــــیوانێتی
ســـــەر کوڵمە تۆپە گوڵێکن، دەمـی خـونچەی نەکراوە
بـــالای بەرز، قەدی بـــاریـک، چـی چـــاوە، چـــاوەچـــاوێـتـی
بۆتە خرمــان و کۆگەی گوڵ هەرچی جوانییە تێیـدا هەیە
نازانم تاریـــــــــــــفی کوێی کەم، هەرچی بڵێم شـــایانێتی

داپیرە ماوەیەک سەری داخست و دوای ئەوە گوتی: «حەسەن ئەمنیش بە تۆوە تووشی پەند بووم. ســـەد خۆزگە هەر نەمناســـیبای. چونکە بە پێی ئەو پەســـن و تاریفەی تۆ ئەو تایبەتمەندییانە ئی کچی گەورەترین پادشـای پاشاکانی دورگەگەلی واقە. چاوت بکەوە و لە

خەوە ڕاپەڕە، ئەوە کاری تۆ نییە و قەتیش بەو ناگەیت. ڕۆڵە، نێوانی تۆ و ئەو وەک ئاسمان و زەوی وایە. دەست لەو خەیاڵ و پڵاوە هەڵگرە و وە دوای کڵاوی لار مەکەوە. منیش و خۆشت بە کوشت مەدە.»

حەسەن کە ئەو قسەیەی لە پیرێژنە بیست دەستی کرد بە گریان هەتا بووراوە و بە لادا کەوت. پیرێژنە ئاوی بە سەروچاویدا هەڵپڕژاند هەتا هێنایەوە سەرخۆ. بەڵام بەو قسەیە زۆر مات و مەلوول و خەمبار بوو. دەستی لە ژیان شوت و لە بەر خۆیەوە یەک تەکان هەر دەگریا. دوای ئەوە بە پیرێژنەی گوت: «دایە باشە چۆن ئەمن دوای ئەو هەموو کوێرییەی دیومە و گەیشتوومە ئێرە بگەڕێمەوە؟! ئەمن قەت باوەڕم نەدەکرد تۆ لە یارمەتی دانی من دەست هەڵگری و ماندوو بی. پیرێژنە گوتی : «ڕۆڵە گیان تۆ ئەو خودایە یەکێک لەو کچانە هەڵبژێرە با بۆت بێنم و لێت مارە بکەم. لەوە دەترسم وە دەست پاشا کەوی و ئەمن هیچ کارێکم لە دەست نەیە. بیکە بۆ خاتری خودا قامک لە سەر یەکێک لەو کچانە دانێ با لێت مارەکەین و بتدەینێ و بە سەلامەتی بگەڕێوە بۆ شارەکەی خۆت. منیش و خۆشت تۆشی ئەو زەلکاوە مەکە، چونکە لێت ڕوون بێ تازە هیچ کاممان ڕزگارمان نابێ. ئیدی حەسەن سەری داخست و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەوکەسەی لە توونیان ئەوە دەخنکێ
کوا لە پیس و خاوێنی ئاو دەپرسێ
با سەرم تێدا بچێ و یارم نەڵێ
منی لە بیر بردەوە لێم ناپرسێ
ڕێگەیەکە و تازە گرتوومەتە بەر
دڵی ئاشق کوا لە تووشی دەترسێ

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن شیعرەکەی تەواو کرد و گریا. پیرێژنە کەمێکی دڵخۆشی داوە و پێی گوت: «کوڕی خۆم بگەڕێوە بۆ شارەکەی خۆت. چون ئەمن تۆ بەرم بۆ لای ئەو، هەر دووکمان دەکوژرێین. چونکە تا ئێستا کەس مرۆڤی نەبردووەتە ئەو شوێنە. هەر ئەوە باشترە بگەڕێیەوە شارەکەی خۆت. ئەوەندەشت ماڵ و سامان دەدەمێ، کە پێویستیت بەو ژنانەش نەبێ. ئەتۆ بە قسەم بکە و خۆت بە هیلاک مەدە. حەسەن دەستی کرد بە گریان و خۆی بە سەر لاقیدا دا و ماچی کرد و گوتی: «چۆن ئێستا کە من نیزیک بوومەوە لە ماڵی خۆشەویستەکەم، بێ ئەوەی ئەو ببینم هەستم بگەڕێمەوە. تازە هەر ناکرێ نەیبینم شتی وا چۆن دەبێ.» ئیدی ئەو شیعرەی خوێندەوە:

لە هەموو لایەکەوە تیری دۆعام هاویشتووەتێ
هەر ئەوەندەم لە خودا دەوێ دانەیەکیان کاریگەر بێ
دڵەکەم، هێمن و لەسەرخۆ بە، ئاخرییەکەی دەگەی
بە کۆتایی ئەو شەوە تاریک و تنۆکە خەمت نەبێ

ئەوجار پیرێژنە زگی پێی سووتا و دڵخۆشی داوە و گوتی: «نارەحەت مەبە، تازە منیش یان تێدا دەچم یان تۆ بە ئاوا دەگەیەنم.» حەسەن بەو قسەیە سووکنایی هات و لەگەڵ پیرێژنە دەستیان بە قسە کرد هەتا بوو بە شەو.

کچەکان بڵاوەیان کرد و هەرکەسەی چووەوە تاوڵەکەی خۆی. دوای ئەوە پیرێژن حەسەنی هێنا بۆ ناو شار و لە شوێنێکی چۆڵدا شاردییەوە، تا کەس پێی نەزانێ و شاژنی لێ ئاگادار نەکەنەوە. بۆخۆشی خزمەتی دەکرد. ئەویش هەر دەگریا و بە پیرێژنەی دەگوت: «خانمەکەم، ئەگەر نەتوانم بگەمە ژن و منداڵەکەم خۆم دەکووژم. چونکە ئەو ژیانە هیچ کەڵکێکی بۆ من نییە. شاژنی ئەو دوورگەیەی کە ئەوانی لێ بوون نێوی نوورولهودا بوو. ئەو شاژنە حەوت خوشکی بوو، کە لە لای پاشای مەزن، پادشای حەوت دوورگەکە بوو. پێتەختی پاشای مەزن لە گەورەترین دوورگە لەو حەوت دوورگەیەدا بوو. نوورولهوداش کە گەورەترین کچی ئەو بوو لەو شارەی کە حەسەنی لێ بوو، دەسەڵاتدار بوو. کاتێک پیرێژنە دیتی حەسەن بە ڕاستی دەستی لە گیان خۆی شوتووە و دەی هەوێ ئەگەر گیانی لە دەست بدا لە هەڵوێستەکەی پاشگەز نابێتەوە، هەستا چوو بۆ کۆشکی شاژنە نوورولهودا. چووە ژووری و کڕنۆشی برد.

چونکە پیرژنەکە مافی پەروەردەی بە سەر شاژنەوە بوو، شاژنیش ئەوەی لە چاویدا

بوو، له لای شـاژن خۆشـەویسـت بوو. شـاژن نوورولهودا لەجێوە هەسـتا و پیرێژنەی له ئامێز گرت و له لای خۆی دانا. لێی پرسی: «ئەوە چۆنە هاتووی بۆ ئێرە؟» پیرێژنه گوتی: «خانمەکەم، هاتووم بۆ کاری خێر. شاژنی ڕۆژگار، شتێکی زۆر سەیرە و هاتووم پێت بڵێم و دەبێ یارمەتیشـم بدەی تا کارێکی خێر جێبەجێ بێ.» شـاژن گوتی: «دایە، پێم بڵێ ئەو چییە و له کوێیە؟» پیرێژنه بەسـەرهاتی حەسـەنی له سـەرەتاوە تا کۆتایی هەمووی بۆ گێڕاوە. تەواوی گیانی وەک مێژۆکە دەلەرزی. تا ئەوەی کە خۆی بە سەر قاچی شـاژندا دا و گوتی: «خانمەکە کەسـێک له قەراخاوەکە کەسـێک چووبوو له بن دیوەکان خۆی شـاردبووەوە. کە چووم داوای لێ کردم پەنای بدەم. منیش پەنام دا. لەگەڵ سـپای کچان لەگەڵ خۆم هێنام و لێرەش هێنامە ناو شـارەوە. هەر لەسـەرەتاوە بەردەوام باسـی هێز و دەسـەلات و مەترسـییەکانی ئێرە و ڕێگایەم بۆ کردووە، بەلام ئەو هێندە بیری ژن و منداڵەکەی دەکا، دەڵێ یان دەبێ بکوژرێم یان پێیان بگەم. بەردەوام دەگری و دەبارێنێ. خانمەکە ئەمن له نێو مرۆڤاندا کەسـی هێندە بەجەرگ و ئازام نەدیوبوو. ئەڤین هێندە بەسەریدا زاڵ بوو، گوێی له مەترسی و کوشتن و شت نییە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی هەشتسەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک پیرێژنە بەسەرهاتی حەسەنی بۆ شاژن نوورولهودا گێڕاوە. شاژن زانی چ باسە و ناڕەحەت بوو. ماوەیەک سەری داخست. دوای ئەوە سەری هەڵێنا و گوتی: «پیرێژنی گڵاو ئەوە وات لێ هاتووە مرۆڤێک بێنییە دورگەگەلی واق و بێ ئەوەی گوێ بدەیە زەبر و زاکوونی من بیهێنییە شارەکەی من؟ بە گیانی پاشا ئەگەر ئەمەگی تۆم لە چاویدا نەبایە هەر ئێستا بە خراپترین شێوە هەردووکتانم دەکوشت. بۆ ئەوەی هەتا هەتایە کەس نەوێرێ کاری ئاوا گەورە بکا. ئێستا هەستە بڕۆ ئەو مرۆڤەم بۆ بێنە ئێرە.

پیرێژنە لەڕێوە هاتە دەرێ و ئەوەندە ترسابوو، سەری لێ شێوابوو. نەیدەزانی ڕوو لە کاملا بکا. هەر ئاوا بە سەرگەردانی ڕۆیشت هەتا گەیشتە ئەو شوێنەی حەسەنی لێ بوو. پێی گوت: «هەستە بڕۆ لای شاژن تازە کۆتایی ژیانتە.» حەسەن لەڕێوە هەستا و پشتی بە خودا بەست و گوتی: «خودایە بەڵا و نەهاتیم لێ دوور خەوە و لەو گیروگرفتە ڕزگارم بکە.» ئیدی پیرێژن ئەوی برد هەتا بردییە بەر دەمی شاژن. لە ڕێگا پێی گوت کە چۆناچۆن لەگەڵ شاژندا بدوێ.

هەرکە حەسەن چووە لای شاژن، شاژن پەچەی داداوە. حەسەن سڵاوی کرد و کڕنۆشی برد. ئینجا ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەی خاوەن کەرەم، پەنای بێ پەنایان
کۆشکت ئاوەدان، دوور بی لە بەڵایان
هەژار و لێقەوماو چاویان لە تۆیە
پەنایان بدەی و، بگەی بە هانایان

کە حەسەن شێعرەکەی تەواو کرد، شاژن ئاماژەی بۆ پیرێژنەکە کرد کە بە حەسەن بڵێ وڵامی پرسیارەکانت بداتەوە. پیرێژنە گوتی: «کوڕی چاک، شاژن سڵاوەکەی ئەستاندییەوە و دەفەرمێ ناوت چییە و لە کام شارەوە هاتووی و ژن و منداڵەکانت ناویان چییە؟» حەسەن بە زمانێکی پاراو و بە ورەیەکی بەرزەوە گوتی: «شاژنی زەمان، ناوم حەسەنە. خەڵکی بەسەرەم. ناوی ژنەکەم نازانم بەڵام منداڵەکانم یەکیان ناوی ناسرە و ئەویدیکە ناوی مەنسوورە.» شاژن گوتی: «ئەی مرۆڤ، ژنەکەت منداڵەکانی لە کام شارڕا برد؟» حەسەن گوتی: «شاژن، لە شاری بەغداوە بردوونی.» مەلکە گوتی: «گەلۆ لە کاتی فڕینیدا هیچ گوتووە یان نا؟» حەسەن گوتی: «بەڵێ، بە دایکمی گوتووە ئەگەر کوڕەکەت هاتەوە و ناڕەحەتی ئێمە بوو، بیری کردین و ویستی بێ، پێی بڵێ بێ بۆ دورگەی واق

لەوێ دەمانبینی.» شاژن نوورولهودا سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: «ئەگەر ئەو تۆی خۆش نەویستبایە ئەوە ئەو قسەیەی بە دایکت نەدەگوت و ناو و نیشانی شارەکەی خۆی پێ نەدەگوتی.» حەسەن گوتی: «ئەی خانمی زەمان، ئەوەی بوو ئەمن بۆم گێڕایەوە و هیچ شتێکم لێ نەشاردوویەوە. ئێستا تکات لێ دەکەم پەنام بدە و یارمەتیم بدە بچمە لای ژن و منداڵەکانم. پاداشی خێریشت لە خودا وەرگرە. دوای ئەوە حەسەن دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تـــۆ کە دەســـــەڵاتـــداری زەمـــانـــی
خـــێـــر و چـــاکە بـــکە تـــا دەتـــوانـــی

شـــاژن نوورولهودا ماوەیەکی زۆر ســـەری داخســـت، دوای ئەوە ســـەری هەڵێنا و بە حەســـەنی گوت: «ئەوە ڕەحمم پێ کردی. ئێســـتا تەواوی کچی ئەو وڵاتەت پێشـــان دەدەم. ئەگەر ناســـیتەوە ئەوە بە تۆی دەســـپێرم، ئەگەر نەتناســـییەوە ئەو دەتکووژم و لە بەر دەرگای ماڵی ئەو پیرێژنە لە دارت دەدەم.» حەسەن گوتی: «ئەی شاژنی زۆژگار ئەوە ئەو مەرجەم قەبووڵ کرد.» ئیدی ئەو شێعرەی گوت:

گوڵی من، گـــــــــــــوڵێک نییە نەیناسمەوە لە ناو گوڵان
شـــــای گوڵانە ئەو، ئەی بە فیدای بێ ڕووح و دڵ و گیـان
گەر هاتــــــــــــوو کوێر بوو چاوم، ئەوم پێ نەناسییەوە
با جەللاد لە سەرم دا ئەو نەبینم بۆچـــــــــــــــیمە ژیان

ئەوجار شـاژن نوورولهودا فەرمووی: کچێک لە شـاردا نەمێنێتەوە نەهاتبێتە کۆشـک. بە ئوموودەواهی گوت لە شـاردا بگەڕێ و هەموو کچانی شـار کۆ کاتەوە. کە کچانی شـار کۆ بوونەوە، دەسـتە دەسـتە پێشـانی حەسـەنی دەدا. حەسـەن ژنەکەی نەدەدیت و دەیگوت: «ئەی شـاژنی ڕۆژگار بە گیان تۆ قەســـەم ژنەکەی منیان لەگەڵ ئەوانە نەبوو. شـاژن بە پیرێژنی گوت: «ئەوانەی لە کۆشـکیش دان بیانهێنە پێشـانی حەسـەنی بدە. کە تەواوی کچەکانیان هێنا و حەسـەن چاوی لێ کردن و ژنەکەی خۆیدا تێدا نەدیت. بە شـاژنی گوت: «شـاژنی بەڕێز، ژنەکەی منیان لەگەڵ نەبوو.» شـاژن تووڕە بوو بە سـەر دەورووبەریانیدا قیژاند و گوتی: «ئەو هەتیوە زۆڵە لە سـەر زەوی درێژ کەن و سـەری بپەڕێنن. تا ئیدی بە وڵاتەکەماندا نەیەتەوە.» بە سـێ چوارێک حەسـەنیان لە سـەر زەوی درێژ کرد. بە داوێنی کراسـەکەی چاویان بەسـت. بە شـیرەوە لە سـەری ڕاوەسـتان. چاوەڕێی دوایین فەرمانی شاژن بوون. ئوموودەواهی چوو پێشێ و کڕنۆشی بۆ شاژن برد. داوێنی گرت و خستییە

سەر سەری و گوتی: «شاژن بیکە بۆ خاتری حەقی پەروەردەت دەست ڕاگرە و مەیکووژە. چونکە تۆ دەزانی ئەوە نامۆ و غەریبە، زۆری کوێری کێشـــاوە تا خۆی گەیاندووەتە ئێرە. ئەمن نیگەرانی ئەوەم کە ئەگەر تۆ ئەو گەنجە بکووژی بە غەریبکوژ نێو دەرکەی و ناوت بکەوێتە ســەر زاری خەڵک. هەر چی هەیە، ئەو لە بەر دەســتی تۆ دایە. ئەگەر ئەو نەتوانێ ژنەکەی لەو شـــارەدا ببینێتەوە ئەوە کوشـــتنەکەی بۆ تۆ ئاســـانە. ئەمن ئەوم بۆیە پەنا دا چونکە لە تۆم ڕادەدی و گوتم ئەو وەک منداڵی خۆم وایە و لە قسەم دەرناچێ. جگە لەوەی ناشـــیکووژی یارمەتیشـــی دەدا، تا ژن و منداڵەکانی ببینێتەوە. ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر بێت و شـــاژن ئەو کوڕە ببینێ و گوێی بۆ ڕاگرێ کە چەند بە زمانێکی پارا و شیرین قسە دەکا، بەزەیی پێیدا دێ.» شاژن، ئەو لاوە تازە هاتووەتە ئەو شارەوە و نان و نمەکی ئێمەی کردووە، ئێمە هەر دەبێ ئاگامان لێی بێ.

لێرەدا بوو تیشکی بەربەیان لە کەل هاتە دەر و شەهرزاد کۆتایی بە بەشەچیرۆکی ئەو شەو هێنا.

# که شەوی هەشتسەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پیرێژنە گوتی: «ئێمە لە سەرمان فەرزە دەبێ ئاگامان لێی بێ. ئەتۆ بۆخۆت دەزانی کە ڕەنج و ئازاری دووری وەک هیشتێک نییە. بە تایبەت دووری ژن و منداڵ. ئێمە لەگەڵ ئەو لاوەدا پەیمانمان داوە و تەواوی ژنی ئەو شارەمان پێشان داوە، هەر ئەتۆ ماوی و ئەتۆش خۆی پێشان بدە. شاژن بزەیەکی هاتێ و گوتی: «جا چۆن شتی وا دەبێ کە ئەوە مێردی من بێ و منداڵی لە من بێ، تا ئەمن خۆمی پێشان بدەم.

ئەوجار شاژن گوتی: «دا بچن حەسەن بێنن.» حەسەنیان هێنا ڕووبەڕووی شاژن ڕایان گرت. شاژن پەچەکەی خۆی لە سەر ڕووخساری لا دا. حەسەن کە چاوی پێی کەوت یەک بە خۆی هاواری کرد و بێهۆش بوو. پیرێژنە گوڵاوی بە سەردا هەڵپرژاند تا وە هۆش هاتەوە و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

که دیـــــــــــــــم ئارامی گیانم، ئارامی گیانم برا
که دای لە چاوم تیشکی، هەر وەکوو تـــــــــــــیشکی چرا
ئەوەی لە داوی کەوێ، ئاستەمە ڕزگـــــــــــــــاری بێ
پێشـــەی ئەو هەر ســـووتـانە، دوور بێ یـا ڕووبەڕووی بێ
پرشـنگێکی تـــــــــــــیشـکی ڕووی، وەهای کار لە دڵم کرد
چی ســــەختی و تووشـــی ڕێ بوو، بە جـارێ لە بیرم کرد

کە ئەو شێعرەی خوێندەوە چاوێکی لە شاژن کرد و زیراندی و بە لادا هات. پیرێژنە گوڵاوی پێدا کرد و لێی پرسی: «چ بووە، بۆ وا دەکەی؟!» حەسەن گوتی: «دایکە گیان، ئەو شاژنە یان ژنەکەی منە یان زۆر وەک ئەو دەچێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و یازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شاژن بە پیرێژنەی گوت: «دایکە ئەو کوڕە غەریبە شێتە، وا ئاوام چاو لێ دەکا؟» پیرێژنە گوتی: « شاژن ئەوە بە دەست خۆی نییە، لە قەدیمەوە گوتوویانە شەیدای خۆشەویستی دەرمانی نییە. فەرقی ئەڤیندار و شێتیش نییە. دوای ئەوە حەسەن بە گریانەوە ئەو شیعرەی خوێندەوە:

دەبێ بەرەی دایکێک بن، لەگەڵ گراوەکەی من
بۆیە تیشکی ڕوخساری، کار دەکا لەو دڵەی من

ئیدی بە شاژنی گوت: «ئەتۆ خێزانی من نی، بەڵام زۆر زۆر شێوی خێزانم دەدەیت. شاژن نووروولهودا بە قسەکەی ئەو پێکەنی و ڕووی تێ کرد و گوتی: «ئازیزەکەم، جوان چاوم لێکە و بە لەسەرخۆیی وەڵامم دەوە، خەریکە کارەکەت جێبەجێ دەبێ و لە ئامانج نیزیک دەبییەوە. حەسەن گوتی: «گەورەی پاشایان، هەر چی پێت خۆشە لێم بپرسە. شاژن گوتی: «کوێی ژنەکەی تۆ لە من دەچێ؟» حەسەن گوتی: «خانمەکەم تەواوی ئەو سەر و ڕوخسار و بزە و ئاخاوتن و خوێنشیرینی و دەلالی و ڕێکوپێکییەی کە لە تۆدا هەیە لە خێزانیشمدا هەیە.» ئینجا شاژن ڕووی لە ئومووددەواهی کرد و گوتی: «ئەو گەنجە بەرەوە شوێنەکەی خۆی و بۆخۆت چاوەدێری بکە هەتا بزانم کارێکی بۆ ناکەم. ئەگەر ئەو لاوە کەسێکی وەفادار و جوامێر بێ، لە سەرمان پێویستە ئاریکاری بکەین. بە تایبەت کە هاتووە بۆ شاری ئێمە و پەنای بۆ ئێمە هێناوە. لەو ڕێیەدا زۆر کوێری کێشاوە و سەختی دیوە. گیانی خۆی خستووەتە مەترسییەوە. کە برتەوە مزڵەکەی بە خزمت کارەکانتی بسپێرە و بۆخۆت خێرا وەرەوە ئێرە.

پیرێژنە حەسەنی بردەوە مزڵەکەی و بە کەنیزەکانی سپارد و بۆخۆی بە لەز هاتەوە خزمت شاژن. شاژن گوتی: «خۆت پۆشتەکە و شیر و زەرگ و شت دەست دەیە و هەزار سواری بوێر و بەجەرگ ئامادە بکە.» پیرێژنە خۆی ساز کرد و هەزار سوای ئازا و نەترسی ئامادە کرد. شاژن فەرمووی کە بڕۆن بۆ شارەکەی باوکم و بچنە لای نوورونسای خوشکم و پێی بڵێن کە منداڵەکانم بۆ بنێرێ بیرم کردوون. بەڵام دایە باسی حەسەن نەکەی. ئەگەر منداڵەکانت لێ وەرگرت بڵێ خوشکت بیری دەکردی. ئیدی منداڵەکان بێنە و زوو بگەڕێوە، ئەو بۆخۆی بە دواتاندا دێ. ئەتۆ هەوڵ بدە بە لاڕێدا زوو خۆت بگەیەنەوە ئێرە. بێ ڕاوەستان. دیسان دەیڵێمەوە کارێک نەکەی کەس بە کاری حەسەن بزانێ. دایە سوێندم خواردووە ئەگەر ئەو خوشکەی من ژنی ئەو کوڕە بێ و ئەو منداڵانە

ئی ئەو بن ئەوە ئەمن کارێک بکەم حەتمەن بەیەکیان بگەیەنمەوە و ژن و منداڵەکەی خۆی بەرێ و بڕواتەوە بۆ شارەکەی خۆی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و دوازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شاژن سوێندی خوارد، نەک پێشی نەگرێ بگرە یارمەتیشی بدا ژن و منداڵەکەی بەرێ و بڕواتەوە بۆ شارەکەی خۆی. پیرێژنە باوەڕی بە شاژن کرد و ئیدی نەیزانی چی لە دڵ دایە. پیرێژنە دەستی شاژنی ماچ کرد و گەڕاوە بۆ لای حەسەن و قسەکانی شاژنی بۆ گێڕاوە. حەسەن لە خۆشیان ئاوەزی شێوا و هەستا سەری ماچ کرد. پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە سەری من ماچ مەکە، دمم ماچ کە. ماچی دمی منت پێ ناخۆش نەبێ، چونکە من کارێکم کرد لەگەڵ ژن و منداڵەکەت پێک بگەنەوە. ئێستا کەیفت ساز بێ و دڵت خۆش.» ئیدی ماڵاوایی لە حەسەن کرد و گەڕاوە. حەسەن ئەو شێعرەی گوت:

هەمە، بە هۆی چاوەڕوانیتەوە، مانگە دڵ ڕەقەکەم
دڵی گەرم و ئاهی سارد و خەم و تاقەتی زۆر و کەم
هەمە من، لە سوێی بینینی بالای بەرز و لەشی زێوین
ڕەنگی زەرد، ڕۆندکی سوور، لێوی ویشک و چاوی پڕ ئەسرین

پیرێژنە بەرەو ئەو دوڕگەیە چوو کە خوشکی شاژن نوورولهودای لێ بوو. نێوانی ئەو دوو شارەش سێ ڕۆژە ڕێ بوو. کاتێک پیرێژنە گەیشتە ئەو شارە چوو بۆ لای خوشکی شاژن و سڵاوی لێ کرد. پێی گوت کە شاژن نوورولهودا زۆرت بیر دەکا و تەنانت لێشت قەڵسە دەڵێ سەرێکم نادا. شاژن نوورونسا بە پیرێژنەی گوت: «ڕاست دەکا. حەقیەتی و منیش دانی پێدا دەنێم، کەمترخەمیم کردووە نەچوومە زیارەتی. هەر ئێستا دەچم بۆ زیارەتی. لەڕێوە فەرمانی دا لە دەرەوەی شار خێوەت هەڵدەن، دەچین بۆ سەفەر. دیاری و سەوقاتێکی زۆری بۆ خوشکی پێچاوە. باوکی شاژن لە بەرجەوەندی کۆشەکەوە ئەو تاوڵ و خێوەتانەی دیت و پرسیاری کرد چ باسە؟ پێیان گوت ئەو تاوڵ و خێوەتانە ئی نوورونسایە بە تەمایە بچێ بۆ لای نوورولهودای خوشکی. پاشا فەرمانی دا لەشکرێکی زۆر هەتا لای خوشکی لەگەڵی بچێ و بەڕێی بکەن. زێڕ و ماڵێکی زۆری لە خەزێنە دەرێنن و لەگەڵی بخەن. تەواوی ئەو خوشکانە لە دایک و بابێک بوون جگە لەو کیژەی کە ناوی نوورونسا بوو. نوورونسا لە دایکێکی دیکە بوو. کچی گەورەی ناوی نوورولهودا، دووەمین نەجمولسەباح، سێیەمین شەمسولزەحا، چوارەمین شەجەرەتوددوڕ، پێنجەمین قووەتولقولووب، شەشەمین شەرەفولبەنات و حەوتەمین کە لە هەموویان بچووکتر بوو، ژنی حەسەن، واتە نوورونسا بوو. دوای ئەوە پیرێژنە چووە پێشێ و دەستی نوورونسای ماچ کرد. شاژن گوتی: «ئەرێ تۆ کارێکت پێمە؟» پیرێژنە گوتی: «خوشکت فەرمووی کە

ئەو دوو زرێییەی کە بۆ کوڕەکانت ســـاز کردووە لە بەریان کە و بە منیان بســـپێرە با لە پێش ئێوەدا لەگەڵ خۆم بیـانبەم بۆ لای شـــــاژن و موژدەی هـاتنی تۆی پێ ڕاگەیەنم. نوورونذسا بە بیستنی ئەو قسەیە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و سەری داخست. ماوەیەک بیری کردەوە و ئینجـا ڕووی لە پیرێژنە کرد و گوتی: «دایە، ئەمن دوو دڵم، دڵم نیگەرانە، تـا ئێسـتا نە جین و نە ئینس ئەو منداڵانەی منیان نە دیتووە. دەترسـم ئێرەییان پێ بەرن، چاووزار کاریان تێ بکا. ئەودەم ئەمن شـێت دەبم.» پیرێژنە گوتی: «خانمەکەم ئەو قسـانە چییە؟ مەگەر ئەتۆ باوەڕت بە خوشکی خۆت نییە؟!»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! پیرێژنە گوتی: «یانی تۆ دڵت لە خوشـــکەکەی خۆت ناحەســـێتەوە منـداڵەکـانتی بنێرییە لای؟ جوان نییە بێ قســــەیی خوشـــکی گەورەت بکەی هەرچەنـد منداڵەکانیش ورد و ســـاوا بن و دڵیشــت نەیە. بەڵام ڕۆڵە خۆ من باش دەناســـی. دەزانی چەندم زەحمەت لەگەڵ ئێوە کێشـاوە تا ئێوەم گەورە و پەروەردە کردووە. ئێسـتا من ئەو منـداڵانەی تۆ دەبەم و وەک پەڕەی جەرگی خۆم دەیـان پـارێزم و وەک بیلبیلەی چـاوم ئاگاداریان دەکەم. ئەسڵەن نیگەران مەبە. ئەو سەرێکەی ڕۆژێک پێش ئێوە دەگەمە ئەوێ.» پیرێژنە ئەوەندەی پێ داگری کرد و ســمڕی نواند. لە لایەکی دیکەشـــەوە شــاژن دەترسـا خوشـــکی پێی ناخۆش بێ و لێی تووڕە بێ. هەر بۆیە ناچار پێمل بوو. نەشـــی دەزانی چ داوێکیان بۆ ناوەتەوە. ئیدی منداڵەکانیان بۆ هێنا. ئەویش ئامادەی کردن و جوان پێچاینەوە و زرێکانی کە بۆیانی ســاز کردبوو، لە بەری کردن و بە پیرێژنەی سـپاردن. پیرێژنە لاپەڕ لێی دا و خۆی گەیاندەوە لای شـاژن نووروڵهودا. شـاژن خۆشـحاڵ بوو لە باوەشـی گرتن. یەکیان لە سـەر ڕانی ڕاسـتی دانا و ئەویدیشـی لە سـەر ڕانی چەپی دانا. دوای ئەوە ڕووی لە پیرێژنە کرد و گوتی: «ئێستا بچووە حەسەن بێنە چونکە من داڵدەم داوە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و چواردەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شاژن نوورولهودا که به پیرێژنەکەی گوت بچووه حەسەن بێنه ئێره، پیرێژنه گوتی: «شــاژن ، ئەگەر حەســەن بێنمه ئێره و ئەو مندالانه لەو نەبن دەیکووژی یا لێی خۆش دەبی؟» شاژن زۆر تووره بوو، گوتی: «ئەخه پیرێژنی گلاو ئەتۆ سەبارەت بەو لاوه چت له بن سەری دایه. ئەی دەتهەوێ مرۆڤێک هەر وا به سووک و ئاسانی بێته شار و ولاتەکەمان و هەست و نەستی ئێمه بزانێ و سەری هەموو ڕاز و نهێنییەکمان هەڵداتەوه و هەســتێ وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچێ و بڕواته بۆ ولاتی خۆیان. دوایەش بڵێ ئەمن به سەر ولاتی سیحر و جادووباز و کاهینان و جندۆکه و دڕندان خۆم گەیانده دوڕگەکەلی واق و هاتمەوه کەسیش نەیتوانی بڵێ پشتی چاوت بڕۆیه؟ پاشان پادشـای تەواوی ولاتان لۆمه و سەکۆنەمان بکەن؟» ئینجا به سەر پیرێژنەکەیدا گوڕاند و گوتی: «شتی وا نابێ. به خودا ئەگەر بێت و ئەو مندالانه لەو نەبن هەر به دەسـتی خۆم لەت و کوتی دەکەم.» ئینجا یەکێک له پیاوەکانی دەربار و بیســت کۆیلەی لەگەڵ نارد و پێی گوتن: «بڕۆن ئەو کوڕەی له ماڵی ئەو پیرێژنەیه بیهێننه ئێره.» پەردەدارەکه لەگەڵ کۆیلەکان پیرێژنەیان پەلکێش کرد و ڕۆیشــــتن. پیرێژنه ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو دەلەرزی. ڕۆیشــــتن تا گەیشـــــتنه ماڵی پیرێژنەکه. حەســــەن که ئەوانی دیت، هەســــتا و ســــڵاوی کرد. پیرێژنه بێ ئەوەی وەڵامی سڵاوکەی بداتەوه، گوتی: «هەستا بڕۆ بۆ لای شاژن. ئەخه ئەمن چندم پێ گوتی بڕۆوه بۆ زێد و ولاتەکەی خۆت. به قسەی منت نەکرد. هەتا سـەری منیش و خۆشت به فەتەڕات دا. ئێستا هەسته بەرەو پێلی مردن بڕۆ.» حەسەن به خەجلاوی و پەشۆکاوی، هەستا چوو بۆ لای شاژن. پەردەدار و کۆیلەکان حەسەن و پیرێژنەیان بردەوه لای شاژن. حەسەن چاوی به منداڵەکانی خۆی؛ ناسر و مەنسوور کەوت. که له ســەر کۆشــی شــاژن دانیشــتبوون و ئەویش دەسـتی به سـەردا دێنان و دەیلاواندنەوه. حەســەن که چاوی به منداڵەکانی کەوت ناسینییەوه و له تاوان هەرای کردن. ئینجا وه دڵەکوته کەوت و له هۆش خۆی چوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

# که شەوی هەشتسەد و پازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن کە وە هۆش هاتەوە منداڵەکانی ناسییەوە. ئەو خۆشەویستییە زاتییەی لە وجوودیاندا بوو هانی دان لە کۆشی شاژن بێنە خوارێ و بچن بۆ لای حەسەن. لە هێز و دەسەڵاتی خوداییەوە زمانیان کراوە و گوتیان: «بابە». پیرێژنە و هەنتەشیان دڵیان پڕ بوو. دەستیان کرد بە گریان و گوتیان: «سپاس بۆ خودا کە دیداری باوکی بە قسمەت کردنەوە.» حەسەن لە ئامێزی گرتن و دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

لەو ماوەیەدا، من ئێوەم لێ دوور بوو
ژیانم لە تاوان شەوی دەیجوور بوو
خواردنەکەم، خەم و خەفەت، دەرد و کەسەر
خواردنەوەکەم، ژەهری هەلای سەد جوور بوو
سەیرە لە سوێی ئێوە نەمردووم، ماوم
هۆیەکەی خۆشەویستی بێ سنوور بوو

کاتێک شاژن تەواو بۆی دەرکەوت کە ئەو منداڵانە منداڵی حەسەن و نووروننسای خۆشکێتی، تەواو ڕقی لە خوشکی هەستا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که ئەوی هەشتسەد و شازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاونشکۆ، نوورولهودا قینی له خوشکەکەی هەستا و به سەر حەسەنیدا گوڕاند. حەسەن بێ هۆش بوو. که وه هۆش هاتەوه ئەو شێعرەی گوت:

له ژێر پێی ڕۆژگاردا پلیشامەوه
مردم و جارێ نەبوو بێی به لامەوه
بەشم لەو چەرخ و خوله چەرمەسەری بوو
بلێی مەینەت تەواو بێ، بێی به لامەوه؟

که شێعرەکەی تەواو بوو، ماوەیەک تێک چوو، پاشان وه خۆ هاتەوه. سەیری کرد ئەوه لاقیان گرتووه و ڕایدەکێشن. زۆر ترسا. ئیدی به تەمای ڕزگاربوونی نەبوو. پیرێژنەکه زۆری پێ ناخۆش بوو. له دڵی گران بوو. بەڵام نەشی دەتوانی لەگەڵ شاژن قسه بکا. که حەسەنیان له کۆشک بردە دەرێ. سەری لێ شێوابوو نەیدەزانی بچێ بۆ کام لا. ئەو دونیا بەرینەی له بەر چاو تەنگ و تاریک بوو. کەسی به دەورەوه نەمابوو. نه کەسێک قسەی لەگەڵ بکا. نه کەسێک دڵخۆشی بداتەوه. دەستی له خۆی شوت. نەیدەتوانی ئەملا و ئەولا بکا و کەسیشی لەگەڵ نەبوو. نەیدەزانی دەبێ بچێ بۆ کام لا و شارەزا نەبوو. بیری تێپەڕین به وڵاتی جن و دڕنداندا ئەوەندەی دی ترسی وەبەر نابوو. تەواو بێ هیوا ببوو. دەستی کرد به گریان هەتا دڵی له بوورەوه هات. که حاڵی باشتر بوو، کەوتەوه بیری ژن و منداڵەکەی و گوتی: «خۆزگه هەر نەهاتبام.» له بەر خۆیەوه ئەو شێعرەی گوت:

ئازیزم، دایانبڕاندم له تۆ و بردیانم
وەکوو دیل و بەندی شەڕ، من چاو به گریانم
بێ دەسەڵات و هەڵوەدای دەشت و سارایەم
ئازیز له سوێت، تاکوو ماوم چاو به گریانم

دوای ئەوه ئەو دوو بەیتەشی گوت:

له ئاسمانی ئەڤینم ئەستێرەی خەم دەدرەوشێ
له گەواڵه هەوریشی بارانی خەم دەپرژێ
کۆڵێ خەمم له کۆڵه و ڕێگای بێ ئامانج له بەر
دەبێ هەتاکوو من هەم ئەو کۆڵەم هەر له کۆڵ بێ

که شـێعرەکەی تەواو بوو بە دڵێکی خەمبارەوە کەوتە ڕێ تا لە شـار وەدەر کەوت. بە قەراغ چۆمەکەدا دەڕۆیشت. بێ ئەوەی مەبەستی بێ بچێتە شوێنێک.

نوورونتسـا ڕۆژێک دوای پیرێژنەکە کەوتە ڕێ. لەو کاتەدا پەردەداری باوکی هاتە لای و کڕنۆشی برد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و حەڤدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! نوورونسا دەیویست وەڕێ کەوێ، پەردەداری باوکی هات بۆ لای و گوتی:«شاژن ، پاشا ئەکبەڕی باوکت سڵاوی لێ دەکردی و دەیگوت هەتا لای من بێ.» شاژن هەستا، لەگەڵ پەردەدارەکە چوو بۆ لای باوکی. باوکی شاژن ، شاژنی لە لای خۆی لە سەر تەختەکە دانا و پێی گوت: «کچەکەم ئەو شەو من خەونێکم دیوە و نیگەرانی تۆم. دەترسم لەو سەفەرەدا تووشی خەم و پەژارەیەکی زۆر بی.» شاژن گوتی:«بابە خەونەکە، چۆن بوو؟» پاشا گوتی: «لە خەونمدا بوو، چوونە نێو خەزێنەیەکەوە، پڕ پڕ بوو لە زێڕ و گەوهەر و یاقووتی گەورەگەورە. لەو هەموو گەنجە حەوت دانەیان نەبێ هیچیانم وەبەر دڵی نەکەوت. ئەو حەوتەش لە تەواوی ئەو گەنجانە چاکتر بوون. ئەمن لەو حەوت گەنجە دەنکێکیانم کە لە هەموویان جوانتر و ڕێکوپێکتر و گرانباییتر بوو، هەڵگرت و هێنامە دەرێ. لە خۆشی ئەو گەوهەرە نەمدەزانی چ بکەم. هەر بە دەستمەوە بوو. تەماشای ئەمبەرە و بەریم دەکرد، کە لە پڕدا باڵندەیەکی غەوارە هات و لە دەستی ڕفاندم. بردی بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە هاتبوو. ئیدی ئەوەندە ناڕەحەت بووم، لە خەو ڕاپەڕیم. بەیانی بانگی لێکدەرەوەکانی خەونم کرد و بۆم گێڕانەوە. ئەوان گوتیان: «حەوت گەوهەرەکە، حەوت کچەکەی تۆن، کە کچە چکۆلەکەیانت بێ ویستی تۆ لێت دوور دەکەوێتەوە. ئێستا تۆش کە باشترین و خۆشەویسترین کچی منی ئەوە دەچی بۆ لای خوشکت و نازانم لەو سەفەرەدا چیت بە سەر دێ. بە قسەم بکە و مەچووە و بگەڕێوە کۆشکەکەی خۆت.» نوورونسا کە ئەو قسەیەی لە باوکی بیست، کەوتە دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەوە، ماوەیەک سەری داخست و بیری لە منداڵەکانی کردەوە. ئینجا گوتی: «باوکە شاژن نوورولهودا چاوەڕێی منە و چوار ساڵە یەکترمان نەدیوە. ئەگەر نەچم دڵی لێم دێشێ. هەر مانگێک لە لای دەمێنمەوە و دێمەوە. باشە بابە. جا ئەوە کێیە کە بتوانێ لە شارەکانی دیکەوە بێتە دوڕگەگەلی واق، کێ دەتوانێ بە ئەرزوولبەیزا و جەبەلولئەسوەد و دوڕگەی کافووردا بێ و لە مەڵبەندی مەل و باڵندە و کێوییەکانەوە تێ پەڕێ و بێتە دوڕگەی ئێمە. ئەتۆ نیگەران مەبە و لەوە دڵنیا بە کە کەس ناتوانێ پێ بنێتەوە وڵاتی ئێمەوە. لێم گەڕێ با بڕۆم. نوورونسا ئەوەندەی لە بەر هەڵخوێند هەتا ڕێی دا بڕوا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و هەژدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! کاتێک پاشـا ڕێگەی دا نوورونئسـا بچێ بۆ ماڵە خوشـکی، هەزار سـواری لەگەڵ نارد. پێشــی گوتن: لەگەڵی بچن و بەڕێی کەن. هەتا دەچنە دم چۆمی. ئێوە لەوێ ئاکنجی بن با نوورونئســا بچێتە ماڵە خوشــکی ئێوە چاوەڕێی بن تا دێتەوە لاتان. ئینجا ئێوە ئاگاتان لێی دەبێ و دەیهێنەوە لای خۆم. بە نوورونئساشی گوت، هەر دوو ڕۆژ لەوێ دەبی. نوورونئســاش گوتی: «باشــە بە چاوان بابە گیان.» دوای ئەوە هەسـتا، هاتە دەرێ. بابیشی لەگەڵی هاتە دەرێ و بەڕێی کرد. قسەکەی بابی کاری تێ کردبوو. نیگەرانی منداڵەکانی بوو. هەر بۆیە سـێ شـەو و ڕۆژان ڕۆیشــت تا گەیشــتە چۆمەکە. لە قەراغ چۆمەکە خێوەتیان هەڵدا و بۆخۆشی لەگەڵ یەک دوو کەس لە پیاوانی باوەڕ پێ کراوی شا چوونە ناو شارەوە. کە گەیشتنە کۆشکەکەی خوشکی و چوونە ژوورێ سەیری کرد، ئەوە منداڵەکان لە لای خوشـکی دەگرین و هاواری بابیان دەکەن. هەر بابە بابەیانە و فرمێسـک دەبارێنن. نوورونئســا کە ئەوانی ئاوا دیت لە ئامێزی گرتن و ماچی کردن و لێی پرســین: «کوا بابە؟ ئەگەر من بمزانیبا کە زیندووە و لە سـەر گۆی زەوییە لە بن بەردیش با پەیدام دەکرد.» ئیدی دڵی پڕ بوو گریا و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە.

بە گیان و بە دڵ تینووی دیداری ئەوم
سیس و ژاکاوم من لێو بەباری ئەوم
دیت پێدەکەنم یان لە کوڵم من
بە تەنیا نیم لە حزوور ڕووحی ئەوم من

کاتێک شـاژن نوورولهودا خوشــکەکەی دیت کە منداڵەکانی لە ئامێز گرتووە و دەڵێ ئەوەی بە سەرم هات بۆخۆم بە سەر خۆم هێنا و مریشک خۆڵ بە سەر خۆیدا نەکا کەس ناتوانێ بە ســەریدا کا. چوو منداڵەکانی لێ ئەســتاند و گوتی: «قەحبە ئەوە منداڵانەت لە کوێ هێناوە؟ ئەوە بە دزی بابم شووت کردووە یان تووشی ناپاکی بووی. ئەگەر تووشی زینا بووبی ئەوە دەبێ ســزا بدرێی و ئەگەر مێردت کردووە، بۆ هـاتوویەوە ئێرە و منداڵەکانت لێ کردووە؟»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشسکۆ! شساژن بە خوشسکی گوت: «ئەوە بۆ ئەو منداڵانت لە بابیان جوێ کردووەتەوە و هێناوتنە ئێرە؟ ئەی بۆ لە ئێمەیان دەشارییەوە؟! بۆ وا دەزانی ئێمە ئاگامان لە هیچ شتێک نییە؟ ئێمە بە هەموو شتێکی تۆ دەزانین.»

دوای ئەوە شساژن نوورولهودا بە کەنیزەکانی گوت خێرا قۆڵبەسستی بکەن و کۆت و بەندی کەن. کەنیزەکان فەرمانیان بەجێ گەیاند. ئینجا شساژن نوورولهودا گوتی بیرازی کەن. ئیدی بە قامچی تەواوی گیانیان ڕەش و شین کردەوە. پرچیان گرت و ڕایان کێشا بۆ بەندیخانە. شاژن نوورولهودا نامەیەکی بۆ پاشا ئەکبەڕی باوکی نووسی و هەموو شتێکی بۆ گێڕاوە و لە نامەکەدا نووسسی کە: پیاوێکی مرۆڤ لەو شسارەی ئێمە دەرکەوتووە، نوورونسا دەڵێ ئەمن بە پێی شسەرع و ڕێوشوێنی پێغەمبەر زەماوەندم لەگەڵ کردووە و دوو کوڕم لێی هەیە. هەتا ئێستاش ئەو منداڵانەی لە ئێمە شساردووەتەوە. هەتا ئەو مرۆڤە پیاوە کە ناوی حەسسەنە هاتە ئەو وڵاتەی ئێمە و گوتی کە نوورونسسا خێزانی منە، ماوەیەکی زۆرە منداڵەکانی هەڵگرتووە و هاتووەتە ئێرە. لە کاتی هاتنیدا بە دایکمی گوتووەکە ئەگەر کوڕەکەت هاتەوە و بیری ئێمەی کرد پێی بڵێ بێ بۆ دوورگەکەلی واق. کاتێک ئەو پیاوە هاتە ئێرە و ئاوای گوت، ئەمن ئەوم لە لای خۆم ڕاگرت. پیرێژنە ئومووددەواهیم نارد هەتا نوورونسام بە منداڵەکانییەوە بۆ بێنێ. بە پیرێژنەشم گوتبوو کە کارێک بکا منداڵەکان لە پێش دایکیانەوە بێنێ بۆ من. پیرێژنەش منداڵەکانی ڕۆژێک پێش ئەوەی دایکیان بگاتێ هێنا بۆ من. ئەمنیش ناردم ئەو کابرایە بێنن. سەیر ئەوە بوو هەر کە منداڵەکان چاویان بەو کابرایە کەوت ناسیان و چوون بۆ لای. ئیدی بۆم دەرکەوت کە ئەوە باوکیانە و نوورونسساش خێزانییەتی و قسسەکەی کابرا بە ڕاسست دەرچوو. خوشسکەکەی خۆم تاوانبارە. ئەمنیش لەبەر ئەوەی ترسسام لە لای خەڵکی دوورگەکان ئابڕوومان بچێ هەرکە نوورونسا گەیشتێ فەرمانم دا تەمبێیان کرد و خستمە بەندەوە. ئەوە هەواڵەکەیم پێ ڕاگەیاندی. ئێسستاش چاوەڕێ فەرمانم. چۆن دەسستوور دەفەرمووی ملکەچم. ئەتۆ بۆخۆت دەزانی ئەوە مایەی سەرشۆڕییە بۆ ئێمە. ئەگەر خەڵکی دوورگەکان ئەوە ببیستنەوە، سسەرکۆنەی جەنابت دەکەن. دەبێ زۆر زوو بە نووسسراو وەڵامم بدەیەوە. ئەوجار نووسسراوەکەی پێچاوە و دای بە پیاوێکی قۆچاخ و بەڕێی کرد. کابرا نووسسراوەکەی گەیاندە دەسست پاشسا ئەکبەڕ. پاشسا نامەکەی خوێندەوە و ڕقی لە کچەکەی خۆی شساژن نوورونسا هەڵگرت و لە وەڵامی نوورولهودادا نووسسی: «ئەوە ئەو کارەم بە تۆ سسپارد و خوێنەکەشسی گەردنت ئازا بێ. ئەگەر شستەکە ئاوایە ئەوە بێ کووژە و پرس بە من مەکە.» کاتێک نامەکەی پاشسا گەیشتە دەسست نوورولهودا، داوای کرد نوورونسسا بێنن. ئەویان بە

قۆڵی بەستراوەوە هێنایە لای شاژن. کۆت لە ئەستۆ و زنجیری لە دەست و پێدا بوو. کراسێکی کۆنی ئاسایی لە بەردا بوو. کاتێک نوورونێسا خۆی ئاوا بە پەستی و ژێردەستەیی دیت شوێن و پێگەی خۆی وەبیر هاتەوە و دەستی کرد بە گریان و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئەو ڕۆژە شاد و بە هێز بووم
ئەمڕۆکە سست و کەنەفتم
ئەو بادە خۆشەی ئەو ڕۆژە
ئێستە گرتوومی و پێی مەستم

دوای ئەوە ئەوەندە گریا هەتا دڵی لە بوورەوە هات. کە وە هۆش هاتەوە ئەو دوو بەیتەشی گوت:

فەلەک هاوار لە دەست بێ بەند و باریت
لە دەست کاری چەواشەت، پێچ و لاریت
وەکوو مریەم دەبێ سەرشۆڕی گەل بم
بە ئاواتی وەدەنگ هاتنی حەق بم

ئەوجار ئەو دوو بەیتەشی گوت:

دەبێ خەمی زارۆک و یارم بێ
یا خەمی خزم و کەس و کارم بێ
ئەوەندەی لە بیرمە، بێ خەم نەبووم
لە دەست ڕۆژگار ئاسوودە نەبووم

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێ شاژن نوورونسا شێعرەکانی تەواو کرد، شاژن نوورولهودا داوای نێردیوانی کرد. نێردیوانیان هێنا. فەرمانی دا نوورنسایان لە سەر درێژ کرد و جوان بەستیانەوە دەست و لاق و پرچیان لە پەیژەکە بەست. نوورونسا کە زانی نوورولهودا سۆزی بۆی نەماوە و بەزەیی پێیدا نایە و خۆی ئاوا بە کەنەفتی و داماوی دیت، هاواری کرد و دەستی کرد بە گریان و گوتی: «ئەرێ خوشکێ دڵت بۆ ئاوا ڕەق بووە و بەزەییت بە من و منداڵەکانمدا نایە، بۆ وام لێ دەکەی؟» نوورولهودا کە ئەوەی بیسن ئەوەندەی دیش لێی بە قیندا چوو، قسەی پێ گوت و گوتی: «قەحبە، خودا بەزەیی بەو کەسەدا نایە، بەزەیی بە تودا بێ. ئەمن بەزەییم بە تودا بێ؟» نوورونسا گوتی: «قەسەم بە خودا ئەو جۆرەی تۆ بیر دەکەیەوە وا نییە، من لە هەموو گوناحێک بە دوورم. ئەمن لەگەڵ کەس زینام نەکردووە. ئەمن بەوە نارەحەتم کە تۆ پێت وایە من زینام کردووە. بەڵام ئەوەندە بزانە خودا من لە دەست تۆ ڕزگا دەکا. ئەگەر کاری ئاوام کردبێ ئەوە بۆخۆی تۆڵەم لێ دەکاتەوە.» نوورولهودا کە ئەوەی لە نوورونسا بیست چوو لە فکرەوە و پێی گوت: «قەحبە چۆن ئاوا لەگەڵ من دەدوێی؟» ئیدی هەستا ئەوەندەی لێ دا هەتا لە هۆش خۆی چوو. کە وە هۆش هاتەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەڤینداری، دیاری دەستی من نەبوو بۆ جیهان<br>
یا گوناحێک کەمجار کردبێتم بە نیهان<br>
ئەتۆ بڕۆ وە دوای کاروباری خۆت بکەوە<br>
من ئەو کاتەی دڵم بەخشی ڕۆیشتم بەرەو نەمان

نوورولهودا کە ئەو شێعرەی لێ بیست، لە دین دەهری بوو. گوتی: «شێعرم بۆ دەڵێی و لە کردەی خۆشت پەشیمان نی؟» ئینجا گوتی دا شووڵ و قامچیم بۆ بێنن. بۆخۆی هەستا و ئەوەندەی لێ دا تەواوی گیان ڕەش و شین کردەوە. پیرێژنە کە ئەو توورەیییەی نوورولهودای بینی هەڵات، نوورولهودا فەرمانی دا بیگرنەوە و بیهێننە لای ئەو. کە هێنایان، گوتی: «درێژی کەن و بە پرچی بە دەوری کۆشکدا بیگێڕن و لە کۆشک فڕێی دەنە دەرێ.» ئەوان ئاوایان لێ هات.

حەسەنیش بە قەراخ چۆمیدا هەر وا دەڕۆیشت و دەستی لە هەموو شتێک شوتبوو. وا بوو گەیشتە دارێک، سەیری کرد لە سەر گەڵای دارەکە شتێک نووسراوە. دەستی کێشا و گەڵایەکی لێ کردەوە. کە جوان تێی ڕاما ئەو شێعرەی لێ نووسرابوو:

که سەبرت هەبێ هەمـــــــــــــــــوو کارێ سانا دەبێ
لە چـاڵـدا بی دەچییە ســـەر تەخـت، کە ســـەبرت هەبێ
ئـــــــــــــاکامی سەبرە، دار ڕۆژێ خاوەن بەر دەبێ
بە ئاواتت دەگەی، بێتـــــــــــــــــــوو هیممەتت هەبێ

کە ئەو شیعرەی دیت، دڵنیا بوو ڕزگاری دەبێ و ئەو پرشووبڵاوییە کۆتایی دێ. چەند هەنگاوێک ڕۆیشت سەیری کرد ئەوە بێروونێکی سامناک دیارە. دڵی و لەرزین و خورپە کەوت و ئەو شیعرەی خوێندەوە:

بڵـــــــــــــــــــــــێی دواڕۆژی نادیارم
چۆن بێ بۆ دڵەی بـــــــــــــــــێ قەرارم
ســـــەخـتـــی و مەیــنەت و نەهـــاتـــی
هەموو هاتن و تـــــــــــــــــــــۆ نەهاتی

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و بیست و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن ئەو شێعرەی خوێندەوە و گریا و گەڕاوە قەراخ چۆمەکە و کەمێک ڕۆیشت. دوو کوڕی منداڵی دیت کە کوڕی ئەو کاهین و سیحرباز و شتە بوون. گۆچانێکی مسی کە وێنەی تلیسمی جادوویی و شتی لە سەر نەخشێنرابوو لەگەڵ کڵاوێکی چەرمی کە سێ پەڕەی پۆڵای پێوە بوو لە بەر دەمیان بوو، لە سەری بە شەڕ دەهاتن. لە یەکیان دەدا. تا وای لێهات گیانی یەکتریان خوێناوی کرد. یەکیان دەیگوت: «گۆچانەکە ئی منە و ئەوی دیش دەیگوت دەبێ بۆ من بێ.» حەسەن چووە بەرەو و منداڵەکانی لە یەک کردەوە و لێی پرسین: «ڕۆڵە ئەو شەڕەتان لە سەر چییە؟» منداڵەکان گوتیان، مامە دا تۆ دادوەریمان بکە. ئەوە خودا تۆی بۆ ناردین با کێشەکەمان تەواو بێ. حەسەن گوتی: «جارێ ئێوە پێم بڵێن چ بووە با ئەمن بتوانم دادوەری لە نێوانتاندا بکەم.» منداڵەکان گوتیان: ئێمە دوو براین، بابمان سیحربازێکی گەورە بوو. لەو کێوەدا لە ئەشکەوتێکدا دەژیا. کە مرد، ئەو کڵاو و گۆچانەی لە پاش بە جێ ما. ئێستا ئەمن دەڵێم ئەو گۆچانە ئی منە و ئەویش دەڵێ دەبێ بۆ من بێ. ئەتۆ داوەری بکە و ئێمە لێک کەوە.

حەسەن گوتی: «کوڕی من ئێوە پێم بڵێن، ئەو گۆچان و کڵاوە چ جیاوازییەکیان هەیە و تایبەتمەندی هەر کامەیان چییە؟ دەبێ بزانم جا دەتوانم داوەری بکەم.» منداڵەکان گوتیان ئەوانە هەر یەکی نهێنییەکیان هەیە. بەڵام گۆچانەکە بەرابەرە لەگەڵ پیتاکی تەواوی حەوت دورگەکەی واق. کڵاوەکەش هەر وایە. حەسەن بە یەکیانی گوت: «ڕۆڵە ئەو شتە سادانە چۆن ئەوەندە دێنن، بۆ ئەوانە چ کارێکیان پێ دەکرێ. چ سرڕێکیان تێدایە. دا تۆ پێم بڵێ با من بتوانم فکرێکتان بۆ بکەمەوە.» ئەو منداڵەکە گوتی: «مامە، ئەوانە سرڕی سەیریان تێدایە، بابمان سەد و سی و پێنج ساڵی تەمەنی هەر بە دوای ئەوەوە بوو، کارێک بکا ئەوانە وا لێ بکا ئەو هەموو سیحر و جادووەیان تێدا جێ کاتەوە، لێ هاتوویبان بەرێتە سەرێ. وا بوو کاتێک ئەو کارەی کرد و تەواو بوو بۆ خۆشی کۆچی داویی کرد و مرد. ئێستا تایبەتمەندی ئەو کڵاوە ئەوەیە کە هەر کەس لە سەری بکا. کەس ناتوانێ ببینێ. ئەو گۆچانەش بە جۆرێکە کە بە هەر کەس بێ بە سەر حەوت هۆزی جندا فەمانڕەوایی دەکا و هەر کاتێک گۆچانەکەی لە عەرز دا ئەو حەوت هۆزە دێنە هەنتەشی و ئامادەی خزمەت دەبن. تەواوی پادشاکانی سەر گۆی زەوی کڕنۆشی بۆ دەبەن.»

حەسەن کە ئەو وتەیەی بیست ماوەیەکی باش سەری داخست و بیری کردەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆ بە خودا ئەمن زۆر لەو کوڕانە زیاتر، پێویستیم بەو گۆچان و کڵاوە هەیە. ئێستا وا چاکە بە فێڵێک ئەو گۆچان و کڵاوەیان لێ بستێنم و ئەو ژن و منداڵەم لە

دەست ئەو شاژن ستەمکارە ڕزگار بکەم و لێرەیان لابەم. لەو شوێنە پڕ مەترسییەیان ڕزگار کەم.» ئینجا سەری هەڵێنا و ڕووی لە کوڕەکان کرد و گوتی: «ئێستا بۆ ئەوەی ئەو شەڕەتان لە نێواندا نەمێنێ ئەمن کێبڕکێیەکتان لە نێواندا ساز دەکەم کامتان بەرەندە هاتنەوە ئەوە گۆچانەکە با بۆ ئەو بێ و کڵاوەکەش بۆ ئەوەی دیکەتان.» منداڵەکان ڕازی بوون و گوتیان باشە. ئەوجار گوتی: «منداڵەکان ئەمن بەردێک حەوا دەدەم هەرکامتان زووتر چوون بەردەکەتان هەڵگرتەوە و هێناتانەوە بۆ من، ئەوە ئەو بەرەندەیە و گۆچانەکە بۆ ئەو دەبێ. کڵاوەکەش بۆ ئەوەی دیکەیان.» منداڵەکان گوتیان: «زۆر باشە فکری چاکە و ئێمە پێی قایلین.»

حەسەن دەستی دا بەردێک و بە تەواوی هێزی خۆی بەردەی توورِ هەڵدا. منداڵەکان ڕایان کرد و بە دوای بەردەکەدا چوون و لە حەسەن دوور کەوتنەوە. حەسەن داهاتەوە کڵاوەکەی هەڵگرتەوە و دەستی دا گۆچانەکەش. چووە ئەولاترەوە بۆ ئەوەی ڕاستی و دروستی قسەکەی ئەوان تاقی بکاتەوە. وا بوو کوڕە چکۆلەکەیان زووتر بەردەکەی هەڵگرتبووەوە و گەڕاوە شوێنەکەی خۆی. سەیری کرد کابرا لەوێ نەماوە. ئەولا کابرا لای دی کابرا. هەرای براکەی کرد گوتی: «ئەوە کوا کابرای دادوەر؟» براکەی گەیشتێ و گوتی: «نازانم. منیش لێم دیار نییە. ئەوە هەڵکشا بۆ ئاسمان، یا بە زەویدا ڕۆ چوو.» زۆر بە دوای حەسەندا گەڕان نەیاندۆزییەوە. حەسەنیش لەولاوە ڕاوەستابوو. کوڕەکان قسە و جنێویان بە یەکتر دەدا و دەیان گوت: گۆچان و کڵاوەکەمان لە دەست دەرچوو نە بۆ من بوو نە بۆ تۆ. باوکمان باسی ئەو ڕۆژەی بۆ کردبووین بەڵام هیچمان لە بیرمان نەمابوو.

ئیدی منداڵەکان چوون بە دوای کاری خۆیانەوە و حەسەنیش کڵاوەی لە سەر کرد و گۆچانیش بە دەستەوە گەڕاوە بۆ نێو شار. لە ناو شاردا کەس ئەوی نەدەدی. ئینجا چوو بۆ کۆشک بۆ ئەو شوێنەی پیرێژنە ئوموودەواهی لێ بوو. پیرێژنە ئەوی نەدیت. حەسەن چوو لە پشت سەری پیرێژنە چەند شووشەیەکی لێ بوو جووڵاندنییەوە و یەکیان بەر بووەوە. ئوموودەواهی قیژاندی و دەرپەڕی. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوە شاژن نوورولهودا جندۆکەی بۆ ناردووم تا ئەو کارانەم لەگەڵ بکا. لە خودا داواکارم لە دەست ئەو شاژنە ڕزگارم بکا. ئەو کە ئاوا لە خوشکی خۆی بکا بە پرچ هەڵیهاوەسێ بڵێی چی لە من بکا.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه ئەوى هەشتسەد و بيست و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـكۆ! دایە ئوموودەواهی ترسـی ڕێنیشـت و گوتی: «جندۆكەكە، بیكە بۆ خاتری دەهەندەیی و دلۆڤانی و گەورەیی حەزرەتی سـولەیمان قسـەم لەگەڵ بكە و وڵامم بدەوە. حەسەن وە دەنگ هات و گوتی: «ئەمن جندۆكە نیم، ئەڤینداریكی هەڵوەدام، حەسەنی غەریبم.» ئینجا كڵاوەكەی لە سەر داكەند و وە دیار كەوت. پیرێژنە دەستی گرت و بردییە پەنایەكەوە و گوتی: «جا ئەوە ڕێی عەقڵە هاتوویە ئێرە؟ بڕۆ لە شـوێنێک خۆت بشـارەوە، بە خودا ئەو ژنەتیوە قەحبەیە دەردێكی دا بە ژنەكەت با بە دەواری شـڕی نەكردبێ. كاتێک ئەو لەگەڵ خوشكەكەی خۆی ئاوا بكا، بێت و تۆی وە دەست كەوێ بڵێی چت لێ بكا.»

ئیدی پیرێژنە ئەوەی بە سـەر ژنەكەیان هێنابوو، هەمووی بۆ گێڕاوە. دوای ئەوە گوتی: «شاژن ئێستا هەر دەستی خۆی دەشكێنێتەوە تۆی بەڕەڵا كردووە. ئەوە چەند كەسی بە دواتدا ناردووە بتگرنەوە و لەگەڵ ژن و منداڵەكانت بتكوژن.» دوای ئەوە پیرێژنەكە باسی ئازاردانەكەی خۆی كرد لە لایەن شاژنەوە. حەسـەن دەستی كرد بە گریان و بە پیرێژنەی گوت: «دایە ئەی ئەوە چۆن دەكرێ لە دەسـت ئەو شـاژن سـتەمكارە ڕزگارمان بێ و بچینەوە وڵاتەكەی خۆمان.» پیرێژنە گوتی: « ئاخ لە دەسـت تۆ كوڕە بڕۆ خۆت ڕزگار كە.» حەسـەن گوتی: «تازە بەبێ ژن و منداڵ بۆ هیچ كوێ ناچم. ئەگەر مەجبوور بم لە بەینیشیان بەرم.» پیرێژنە گوتی: «چۆن دەتوانی لە بەینیان بەری؟» ئینجا حەسـەن كڵاوە چەرم و گۆچانە مسـەكەی پیشـان دا.» پیرێژنە كە ئەوانەی دیت زۆر خۆشـحاڵ گوتی: «زۆر باشە بە خودا ئەگەر ئەوانەت وەگیر نەكەوتبا تازە خۆشت و ژن و منداڵەكەشت تێدا دەچوون. بەڵام ئەوجار ڕزگارت دەبێ. چونكە من ئەو كڵا و گۆچانە دەناسم و خاوەنەكەیان مامۆستای من بوو. ئەمن سیحر لەو فێر بووم. ئەو لە دونیادا لە هەمووكەس سیحربازتر بوو. كاتێک ئەوانەی تەواو كرد فەوتی كرد. بیسـتوومە بە منداڵەكانی گوتووە كە ئەو گۆچان و كڵاوە بۆ ئێوە نابێ. كەسـێكی غەوارە دێتە ئەو وڵاتە و بە فێڵ ئەوانەتان لێ دەسـتێنێ. منداڵەكان بە بابیان دەڵێن بابە دا پێمان بڵێ بزانین چۆنمان لێ دەسـتێنێ؟ ئەو مامۆسـتایە گوتوویە ئەمن نازانم چۆنتان لێ دەستێنێ. دا پێم بڵێ چۆنت لێ ئەستاندن؟» حەسەن چۆنیەتی لێ ئەستاندنی كڵاو و گۆچانەكەی بۆ پیرێژنە گێڕاوە. پیرێژنە كەیفی ساز بوو گوتی: «كوڕم، ئێستا كە خودا ئەو نیعمەتەی بە قسـمەت تۆ كردووە، گوێ بگرە بزانە چیت پێ دەڵێم، ئەمن تازە لە لای ئەو شـاژن لەتمكارە نامێنمەوە و دەچم بۆ ئەشـكەوتی سـیحربازان لەگەڵ ئەوان دەژیم هەتا دەمرم. ئەتۆش كڵاوەكە لە سـەرت نێ و بچووە لای منداڵەكانت. لەوێ گۆچانەكەت لە زەوی كوتە بڵێ خاوەنی ئەو ناوانە وەرنە ئێرە، لەڕێوە هەموو دەگەنێ. ئیدی چیت پێ خۆشە پێیان بكە.»

حەســەن مالاوایی لە پیرێژنە کرد. کڵاوەکەی لە ســەر کرد و دەســتی دا گۆچانەکەی. چوو بۆ ئەو شــوێنەی خێزانی لێ بوو. چووە ژووری. سەیری کرد ئەوە خێزانی بە پرچی هەڵواســـراوە، خەریکە گیان دەدا و منداڵەکانیش لەوێ کایە دەکەن. ئەویش چاوی لە منداڵەکانییەتی و ئەو شێعرە دەخوێنێتەوە:

شایانی ئەو لەتم و ستەمە نـــــــــیم، لێ دەکرێ
مـن کـێـم کـوشـــتـووە؟ نـازانـم بۆچـیـم لـێ دەکـرێ؟
ئـــــێش و ئـازاریش لە تـاوانـم هـۆن هـۆن دەگـریـن
ئەی مـنـداڵـی بـێ کەسـوکـارم چـیـیـان لـێ دەکـرێ؟
هاوار بۆ ڕزگارکەرێک، بێت و ڕزگارم بــــــــــــکا
منی پەلوپۆکراو لێرە چـــــــــــیم پێ دەکرێ؟

حەسەن بە دیتنی ئەو دۆخە و بە بیستنی ئەو هاوارە ئەوەندە گریا هەتا لە هۆش خۆی چوو. کە وە هۆش هاتەوە ســـەیری کرد منداڵەکانی خەریکی یاری کردنن و دایکیشـــان لە تاو ئێش و ئازاری گیانی، بێ هۆش بووە. ئیدی کڵاوەکەی لە ســـەری داگرت منداڵەکان وێکڕا هاواریان کرد باوکە باوکە گیان. حەســەن لەڕێوە کڵاوەکەی لە ســەر کردەوە و لە بەر چاوی منداڵەکان ون بوو. دایکی منداڵەکان وە هۆش خاتەوە دیتی ئەوە منداڵەکان دەگرین و بابە بابەیانە. وەیزانی بابیان وەبیر کەوتووەتەوە و بۆی دەگرین. ئەویش لەگەڵ ئەوان دەســتی کرد بە گریان. خوێناوی چاوی وەک سـێڵاو داڕژا خوارێ و ئەو شـێعرەی گوت:

دوێنێم لە پێرێ خراپتر و ئەمڕۆم لە دوێـــــــــنێ
ڕۆژگار لەگەڵم بە شەڕە و تەوژمم بۆ دێـــــــــنێ
ئەمـڕۆ و ڕۆژانـی پـێشـــووم، کە وا تـژی بـوو لە ژان
بڵێی سـبەینێ و ڕوژانی دی چـــــــــیم بە سـەر بێنێ
گوناهم هەر ئەوە بوو بـــــــــیری ئێوەم کردبوو
ئـاهـــــــــی حەســـەنە، گەر فیلی ڕۆژگـار پێم لێ نێ

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن ئاگای لێ بوو خێزانی ئەو شێعرانەی دەگوت. سەیری ئەو شانەوشانی دەکرد بزانێ ئەو مندالانە بۆ هەر بابە بابەیانە. کە کەسی نەدیت سەری سوور ما. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەو مندالانە بۆ وا دەکەن.»

حەسەن کە ئاوای دیت، کڵاوەکەی داکەند و خۆی پێشانی مندالەکانی داوە. مندالەکان دیسان دەستیان پێ کردەوە: بابە بابە. دایکیان کە گوێی لە بابە بابەیان بووەوە، گوتی: «سوبحانەڵلا، بڵێ ئەو مندالانە بۆ هەر هەرای باوکیان بکەن؟ ئەو بابە بابەیان لە چییە؟» ئیدی ئەو شێعرەی خوێندەوە:

مزگێنی، دڵم بۆنی کراسی وا دێ
بۆنی سۆزی ئەو لەگەڵ سۆزەی بادا دێ
هەستی بوونت نەستمانی هەژاندووە
دەڵێی نەورۆزە و وەرزی بەهاری دادێ
دەگەڕێ رووحی گەورەت بە سەرمانەوە
دەمانبەیەوە ماڵێ ئەو ڕۆژە دادێ

حەسەن ئیدی تاقەتی نەما و چوو لە بەر دەمی ژنەکەی ڕاوەستا. ژنەکەی کە حەسەنی دیت وەهای قیژاند کە تەواوی دانیشتوانی کۆشکی ڕاچڵەکاند. دوای ئەوە بە حەسەنی گوت: «ئەوە چۆن هاتوویە ئێرە؟» حەسەن دەستی کرد بە گریان. ژنەکەی بە حەسەنی گوت: «ئێستا کاتی گریان نییە، بیکە بۆ خاتری خودا پێم بڵێ چۆن هاتوویتە ئێرە؟ برۆ لە پەنایەکدا خۆت بشارەوە با کەس نەتبینێ و خوشکم نەبیستێتەوە. دەنا هەردووکمان دەکووژرێن.» حەسەن گوتی: «خانمەکەم ئەمن دەستم لە ژیانی خۆم بەرداوە هاتوومە ئێرە یان تۆ دەبمەوە یان بە زەلیلی و کەنەفتی لە بەر دەستیاندا دەمرم. نوورونسا کە ئەوەی بیست بزەیەکی هاتێ و سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: «ئەمن جگە لە خودای مەزن بە کەس ڕزگار ناکرێم. ئەتۆ برۆ خۆت ڕزگار بکە و خۆت مەخە تەنگەژە و هیلاکەتەوە، چونکە خوشکم لەشکرێکی لە ئەژمارنەهاتووی هەیە. بەربەرەکانیت لەگەڵ ئەو پێ ناکرێ. پێت وا نەبێ دەستم دەگری و هەر وا ئاسان دەمبەیەوە. لێرە چوویە دەرێ، ئەی لەو هەمووە قۆناخە پڕ مەترسییە چۆن تێپەڕ دەبێ؟ خێرا لێرە برۆ دەرێ و ئەوەندەی دیکە خەمم بۆ زیاد مەکە و بیر لەوە مەکەوە بتوانی من ڕزگار کەی لە بیر خۆت دابە.» حەسەن گوتی: «سۆمایی چاوم بە گیانی تۆ لێرە ناچمە دەرێ هەتا ئەتۆش لەگەڵ خۆم نەبەمە

دەرێ و نەتبەمەوە بۆ شـارەكەی خۆمان.» ژنەكەی حەسـەن گوتی: «چۆن دەتوانی كاری وا بكەی؟ كێشــــە لەوە دایە تۆ ئەگەر بەســــەر تەواوی هۆزی جـان و ســـیحرباز و جادووبازەكاندا زاڵ بی، دیســــان ناتوانی من ڕزگار بكەی برۆ لە فكری خۆتدا بە لە من گەڕێ. بەشكوو خودا بۆخۆی فریام كەوێ و ڕزگارم كا.» حەسەن گوتی: «جوانی جوانان، من هـاتووم بەو گۆچـان و كڵاوە تۆ ڕزگـار بكەم. ئینجـا خەریـک بوو، بۆی دەگێڕاوە چۆناوچۆنی ئەو گۆچان و كڵاوە وەگیر كەوتووە كە شــــاژن نوورولهودا پەیدا بوو، گوێی لێ بوو قسەی دەكرد. حەسـەن هەركە نوورولهودای دیت كڵاوەكەی لەسـەر كرد و لە چاو ون بوو. شــاژن هاتە پێشـــێ بە خوشـكی گوت: «قەحبە ئەوە كێ بوو لەگەڵی دەدوای؟» نوورورننسا گوتی: «جا ئێرە جگە لەو منداڵانە كێی لێیە لەگەڵی بدوێم.؟» شـاژن دەسـتی دا قامچی و ئەوەندەی لێ دا هەتا بێ هۆش بوو. حەسـەنیش ڕاوەسـتا بوو چاوی لێ دەكرد. دوای ئەوە شــــاژن گوتی: «لێرە لای بەن و بیبەن بۆ شـــوێنێكی دیكە. كەنیزەكان خێزانی حەســـەنیان كردەوە و بردیان بۆ شـــوێنێكی دیكە. حەســـــەنیش لەگەڵیان چوو بۆ ئەوێ. نوورورننســــایان بە بێ هۆشـــی لەوێ فڕێ دا. دوای ماوەیەک وە هۆش هاتەوە و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هەتا بمـــــــــــــــــــــــــــێنم جگە لە تۆ یاری دیم نابێ
لەگەڵ كەســـــی دی جـــــــــــــگە لە تۆ پێوەنـدیم نـابێ
گەر بێـت و بە ئـانقەســـــتیش برەنجێنی دڵـــــــی من
دڵنیا بە لە بەر چـــــــــــــــــــــــاوم ناكەوی گوڵی من

كە شـێعرەكەی تەواو بوو، كەنیزەكان چوونە دەرێ. لەو جەنگەیەدا حەسـەن كڵاوەكەی لە سـەر داكەند. نوورونسـا گوتی: «پیاوەكە دەزانی چیم بە سـەر دێ؟ تەواوەی ئەوانە ئی ئەوەیە كە من لەگەڵ تۆدا ئاوام كرد و بێ ئیجازەی تۆ لە ماڵ هاتمە دەرێ. پیاوەكە تۆخودا ئەو هەڵەیەی من بە دڵ مەگرە. ژنان قەدری پیاوان نازانن و لەبەر گەوجیان مێردەكانیان بەجێ دێڵن. ئەمن دان بە تاوانەكەی خۆمدا دەنێم و بەڵێن دەدەم ئەگەر بێت و ئەو جارە یەک بگرینەوە تاز قەد هەڵەی وا دوو پات نەكەمەوە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەمشـــــەویش كۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

## كە شەوی هەشتسەد و بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشكۆ! خێزانی حەسەن تۆبەی كرد و داوای لێ بووردنی كرد. حەسەن پێی گوت: «ڕووناكی چاوم، ئەتۆ هەڵەیەكت نەكردووە و هەڵە لە منەوە بوو بەجێم هێشتی و ڕۆیشتم. بە كەسێكم سپاردی نەیزانی ئاگای لێت بێ. ئێستاش خۆشەویستەكەم خودا ئەو توانایی پێداوم ڕزگارت بكەم. ئەگەر حەز دەكەی بتبەمەوە شارەكەی بابت و تا ئەو كاتەی پێت خۆشە لەوێ بژی دەنا دەڵێی دەتبەمەوە شارەكەی خۆمان.» خێزانی حەسەن گوتی: «تازە بە خودا نەبێ بە كەس ڕزگارم نابێ. ئەتۆ بڕۆ بە لای كاری خۆتەوە. دەست لە من هەڵگرە. ئەتۆ نازانی ئەو وڵاتە چەند پڕ مەترسییە. ئەگەر بێت و بە قسەی من نەكەی بۆت دەردەكەوێ كە ئەو هۆزە چی بە سەر منیش و خۆشت دێنن. دوایە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هەموو بێ خەبەر لە دین و شەریعەت
هەموو بێ خەبەر لە خودا و پێغەمبەر
نە هیچكەس ڕێوشوێنی هۆزی دەزانێ
نە دەبیستێ دەنگی ئەڵلاهوئەكبەر
وەكوو دێوی ڵاكراو هەموو پیر و لاو
وەک بەرازی كێوی ناحاڵی و سەر كەر

دوای ئەوە گریا و منداڵەكانیشی لەگەڵی دەسیتان كرد بە گریان. كەنیزەكان گوێیان لە گریانەكەیان بوو، چوون بۆ لایان. سەیریان كرد ئەوە شاژن نووروننسا لەگەڵ منداڵەكانی دەگرین. حەسەنیان نەدیت. كەنیزەكانیش خەمی ئەوانیان بوو دەستیان كرد بە گریان. حەسەن هەتا شەو ڕاوەستا تا نۆبەدار و كاردار و شتەكان چوونە خەوگەكانیان. ئینجا چووە پێشێ و خێزانی كردەوە و سەری ماچ كرد و لە باوەشی گرت. دوای ئەو كوڕە گەورەكەشی لە باوەش كرد. خێزانیشی كوڕە گچكەكەی لە باوەش كرد و لە كۆشک هاتنە دەرێ هەر ئاوا ڕۆیشتن هەتا دەروازەی كۆشک. سەیریان كرد، دەروازە داخراوە. حەسەن زۆر ناڕەحەت بوو، گوتی: «بیری هەموو شتێكم كردبووەوە، بیرم لەوە نەكردبووەوە. ئەگەر هەر ئاوا لێرە بمێنینەوە ئەوە بەیانی دەمانگرن، نازانم چ بكەم؟» پاشان ئەو شێعرەی خوێندەوە:

سووڕێنەری چەرخی گەردوون بۆ ئەونـدە بێ ڕەزایە
كە شەو دادێتەوە دیسان بۆمان لە بۆسە دایە

کەس لە کـار و بـاری نـاگـا، پـێـچەڵەوپـووچـی کـاریەتـی
کاڵەکەمارانە و هەنگوین هەمـــــــــــــــووی لە ســـەر ســـفرەیەتی

حەسەن دوای ئەو شێعرە زۆر گریا. ژنەکەشی لەگەڵی دەستی کرد بە گریان و تەواوی ئەو نەهاتییانەی بە سەریان هاتبوو، هاتەوە بیری.

کۆڕی یـاران ئـاخـــــــــــــــرییەکەی وا یەکتریـان دیتەوە
ئەگەر نەیـار لـێـیـان گەڕێ ڕێـگەی خـۆیـان دیـتەوە

بە دوای ئەودا ئەو بەیتەشی گوت:

هەرکە بـوومە ئـاڵـقەڕیـزی دەرکـی مەیـخـانەی ئەڤـیـن
هەر دەمەی پەیـدا دەبـێ لـێـم دڵـپـڕێـکـی گەرمەشــــیـن

ژنەکەی حەسەن گوتی: «خۆشەویستەکەم ئێمە بە کوژران نەبێ بە هیشتێک ڕزگارمان نابێ و هەر مردن دەتوانێ ئێمە لەو هەموو چارەڕەشـییە ڕزگار بکا.» لەو قسـانەدا بوون دەنگێک لە پشـت دەرگاکەوە گوتی: «خانمەکەم بە خودا ئەمن دەرگا لە تۆ و لە حەسـەنی مێردت ناکەمەوە هەتا ئەوەی دەڵێم بە قســـەم نەکەن.» هەرکە گوێیان لەو قســـانە بوو، ویســـیتان بگەڕێنەوە بۆ ئەو شـــوێنەی لێی بوون. کە لە پڕدا دەنگەکە گوتی: «ئەوە بۆ بێدەنگن و جواب نادەنەوە؟» وا بوو ئەوان دەنگەکەیان ناســـییەوە کە دەنگی شـــەواهی ئوموودەواهی بوو. ئیدی پێیان گوت: «تۆ چۆن بڵێی وا دەکەین. جارێ ئەتۆ دەرگاکەمان لێ بکەوە، کە ئێستا کاتی ئەو قسانە نییە.» پیرێژنە گوتی: «بە خودا دەرگاتان لێ ناکەمەوە هەتا سوێندم بۆ نەخۆن کە منیش لەگەڵ خۆتان دەبەن و لە دەست ئەو قەحبە ستەمکارە ڕزگارم دەکەن. ئەگەر ئێوە بە ســـلامەتی دەرچوون ئەوە منیش دەردەچم ئەگەر ئێوە تێدا چوون با منیش تێدا چم. ترســـم نییە. خۆ ئەو قەحبە لەتمکارە لە ســـەعاتێکدا دەیان جارم دەکووژێ.» ئەوان کە پیرێژنەیان ناســـییەوە ئیدی ســـوێندیان بۆ خوارد و بەڵێنیان پێ دا لەگەڵ خۆیان بیبەن. ئینجا پیرێژنە دەرگای کردەوە. حەسـەن و ژن و منداڵەکەی لە دەرکی کۆشک چوونە دەرێ. سەیریان کرد ئەوە پیرێژن سواری کووپەیەکی گڵی بووە و پەتێکی لە ملی کووپەکە کردووە. کووپەکە لە ژێریدا وەک ئەسپی ڕەسەن هەڵبەزدابەزێتی.

پیرێژنە ئەوجار لە حەســـەن و خێزانی چووە پێشـێ و پێی گوتن: «بە دوای مندا وەرن و لە هیشـــتێک مەترســـن. چونکە من چل دەروازەی فێڵی جادوو فێر بووم. کە هەرە کەمەکەیان ئەوەیە کە من دەتوانم ئەو شارە بکەم بە دەریا و دانیشتوانەکەی بکەمە ماسی.

بەلام قەد لە ترسی باوکی شاژن ناتوانم ئەو توانابیانەم وەدەر بخەم. چونکە ئەو خەلکێکی زۆری بە دەورەوەیە. بەلام لەوە بە دوا ئێوە تواناییەکانی من دەبینن. حەســـەن و خێزانی خۆشحاڵ بوون و هاتبوونە سەر ئەو باوەڕەی کە تازە ڕزگاریان دەبێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەلگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی هەشتسەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشكۆ! حەسەن و خێزانی لەگەڵ پیرێژنە چوونە دەرەوەی شار. حەسەن گۆچانەكەی لە زەوی كوتا و گوتی: «ئەی خزمەتكارانی ئەو نێوانە وەرنە لای من. لەپڕدا زەوی زاری كردەوە و حەوت دێوی زەلام كە لاقیان لە قووڵایی زەویدا و سەری لە لای هەورەكان بوو هاتنە بەر دەمی حەسەن و كڕنۆشیان برد. هەموویان پێكەوە گوتیان: «گەورەم ئێمە گوێ بە فەرمانی تۆین پێمان بڵێ چی بكەین؟ ئەگەر دەفەرمووی دەریاكان ویشك بكەین و كێوەكان لە جێی خۆیان بگوێزینەوە؟» حەسەن بە بیستنی ئەو قسانە هێز و وورەی هاتە بەر و پرسی: «ئێوە كێن و ناوتان چییە؟ لە كام هۆزن؟» دێوەكان دیسان كڕنۆشیان برد و گوتیان: ئێمە حەوت پادشاین یەكی بە سەر حەوت هۆزدا دەسەڵاتدارین و لە ژێر فەرمانمان دان. ئێمە ئەو حەوت كەسە بە سەر چل و نۆ هۆز و تایفەدا دەستمان دەڕوا بەڵام كۆیلە و ئاڵقەبەگوێی تۆین. ئەو گۆچانە ئی هەركەس بێ ئەوە ئێمە هەموو ئاڵقەبەگوێی ئەوین. كاتێک حەسەن گوێی لەو هەواڵە بوو زۆر خۆشحاڵ بوو، پیرێژنە و خێزانیشی هەر وا. دوای ئەوە حەسەن پێی گوتن: «ئەمن دەمهەوێ ئێمە بەرن بۆ ناو هۆز و تایفەی خۆتان.» گوتیان: گەورەم ئێمە ناوێرین ئێوە بەرینە ناو هۆز و تایفەی خۆمان. دەترسین تووشی كێشە بن. چونكە ئەوانەی ئێمە دەستەیەک سەریان پێوە نییە، هێندێک هەر سەرن لەوێ كەوتوون و ئی دڕەندە و مەترسیداریان تێدایە بۆ ئێوە باش نییە. ئێستا كارێكی دیكەمان پێ بڵێ با جێبەجێی بكەین. حەسەن گوتی: «كە من و خێزان و ئەو پیرێژنە پاكە و ئەو منداڵانە بەرنە شاری بەغدا.» ئەوان كە ئەو وتەیان بیست سەریان داخست. حەسەن گوتی: «ئەوە بۆ هیچ ناڵێن بۆ جواب نادەنەوە؟» ئیدی ئەوان هەموویان بە یەكەوە گوتیان ئێمە زەمانی حەزرەتی داودی كوڕی سولەیمان بەڵێنمان بە حەزرەتی سولەیمان داوە كە مرۆڤ لە كۆڵ و قەڵاندۆش نەكەین. ئیدی لەو دەمەوە، مرۆڤمان هەڵنەگرتووە. بەڵام ئێمە دەتوانین ئەسپی جندۆكانتان بۆ بێنین كە ئێوە بەرنەوە بەغدا. حەسەن گوتی: «ڕێگای ئێرە تا بەغدا چەندەیە؟» هەموو پێكەوە گوتیان بۆ سوارێكی ئازا و بەدەو حەوساڵەڕێیە. حەسەن سەری سووڕ ما و پێی گوتن: «ئەی من چۆن بە ساڵێک هاتووم؟» دێوەكان گوتیان: خودای تەعالا دڵی چاكەكارانی بۆ نەرم كردووی بوونە هۆی زوو هاتنی تۆ. دەنا ئەو وڵاتەت بە خەونیش نەدەدی و قەت نەدەگەیشتی ئێرە. چونكە شێخ عەبدولقوددووس كە تۆی سواری فیلەكە كرد و دوای ئەویش سواری ئەسپی مەیموونی كردی، ڕێگای سێ ساڵی بۆ كردییە سێ ڕۆژ و شێخ ئەبولڕەویشیش كە تۆی بە دەهەنێش سپارد، دیسان ڕێگای سێ ساڵی بۆ كردییە سێ ڕۆژ. تەواوی ئەوانە لە بەزەیی و كەرەمی خوداوە بوو. شێخ ئەبولڕەویش لە وەچەی ئاسفی كوڕی بەرخیایە كە نێوی پیرۆزی لە

بەرە.

حەسەن کاتێک ئەو قسانەی ئەوانی بیست بە جارێک حەبەسا بوو. شوکری خودای کرد کە بەو حاڵەوە توانیویەتی خۆی بگەیەنێتە ژن و منداڵەکەی. شوکری خودای کرد کە ئەو کارە سەختەی بۆ ئاسان کردووەتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەرێ بڵێی خەون نەبینم؟» دوای ئەوە ڕووی لە پاشای جندۆکان کرد و گوتی: «ئەگەر بە سواری ئەسپەکانی ئێوە بچین بە چەند ڕۆژان دەگەیەننە بەغدا؟» وەڵامی داوە: «ساڵێکی تەواوتان پێ ناچێ. بەڵام کاری دژوار و مەترسی گەورە و بێڕوونی ویشک و برینگ و سامناکتان لە بەرە. تووشی شوێنی ناخۆش و پڕ خەتەر دەبن. گەورەم زۆر سەختە ئێوە لە هەموو مەترسییە بە سلامەت دەرچن»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پاشای جان بە حەسەنی گوت: «گەورەم، قەت نەچی لەو دورگانەی ئێرە کەمترخەم بی، هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە پاشا ئەکبەر و سیحر و جادوو بازەکانی بەلایەکتان بە سەر بێنن. شیمانەی ئەوە دەکرێ لەپڕدا بە سەرمان دادەن و ئێوەمان لێ بستێنن. هەر کەسیش ئەو هەواڵە ببیستێ، سەرکۆنەی ئێمە دەکا و دەڵێ چۆن ئێوە خەیانتان بە پاشا ئەکبەر کردووە. کچەکەی ئەوتان لەگەڵ مرۆڤێکدا لە شار بردووەتەوە دەرێ؟ ئەگەر بۆخۆت بە تەنیا لەگەڵمان بێی ئەوە کارەکە بۆ ئێمەش ئاسانترە. بەلام ئێستا کە هەلوێستت گرتووە، پشت بە خودا ببەستە. ئەو خودایە توانیوییە تۆ بگەیەنێتە ئێرە، دەشتوانێ بشت گەیەنێتەوە لای دایکت. ئەتۆ پشت بە خودا ببەستە و مەترسە ئێمەش ئەوە لەگەڵتین هەتا دەتگەیەنینەوە بەغدا. حەسەن سپاسی کردن و پێی گوتن: «زوو ئەسپەکان بێنن.» ئەوان قاچێکیان لە زەوی کوتا و زەوی قەڵەشاوە. ڕۆچوونە خوارێ ون بوون. ئەوەندەیان پێ نەچوو سێ ئەسپی زینکراویان هێنا. هەر ئەسپەی دوو خورجێنێ پێوە بوو. کە لە چاولێکدانێکدا یەکیان خێگەیەکی ئاو هاتێ و ئەویدیشیان تۆشەی ڕێیە. ئەوجار ئەسپەکانیان هێنا پێش و حەسەن سواری یەکیان بوو. کوڕە گەورەکەی لە پێش خۆی دانا. خێزانیشی سوای یەکیان بوو، کوڕە چووکەکەی لە پێش خۆی دانا و پیرێژنەش سواری یەکیان بوو. کەوتنە ڕێ ئەو شەوە هەتا بەیانی یەکسەر ڕۆیشتن. کە ڕۆژ بووەوە لە ڕێگاکە لایان دا و ڕوویان لە کێوێک کرد. ئەوە بەردەوام هەر زیکری خوداش دەکەن. ئەو ڕۆژە هەتا بەیانی هەر بە داوێنی ئەو کێودا ڕۆیشتن. لەپڕ حەسەن کێوێکی ڕەشی دیت وەک دووکەڵ بە ئاسمان هەڵچووبوو. حەسەن ئایەیەکی قورئان خوێندەوە و لە دەست شەیتان پەنای بۆ خودا برد. کە چوونە پێشێ سەیریان کرد ئەوە کێو نییە و بەڵکوو درنجێکە سەری بە قەرای گومبەزێک و ددانەکانی وەک شاخی کەرگەدەن و لووتی وەک مەسینە و زاری لە زارکی ئەشکەوتی دەکرد. سەریشی لە هەوران دەسوو. حەسەن کە چاوی بەوە کەوت لە ترسان داهاتەوە و کڕنۆشی بۆ برد و زەوی ماچ کرد. درنجەکە گوتی: «حەسەن مەترسە ئەمن سەرۆکی دانیشتوانی ئەو ولاتەم و ئەوە یەکەم دورگە لە کۆمەڵە دورگەی واقە. ئەمنیش موسوڵمانی خودا پەرستم. کاتێک بیستمەوە تۆ لێرەی، بە ئاواتم دەخواست چوو بام بۆ ولاتێکی دیکە و لە نێو ئەو سیحر و جادووبازان ڕۆیشتبام. چووبامە شوێنێک نە ئینس و نە جنی لێ نەبێ. لەوێ خەریکی عیبادەت و خوداپەرستی بم تا دەمرم. ئێستا دەمەوێ لەگەڵ ئێوە کەوم و ڕێنوێنیتان کەم تا لەو دورگەکەلە دەچنە دەرێ. ترستان لە من نەبێ چونکە من موسوڵمانم. کاتێک حەسەن ئەو قسەیەی بیست کەیفی ساز بوو و گوتی تازە ڕزگارمان بوو. ئیدی ڕووی لە درنجەکە کرد و گوتی: «خودا

جەزای بە خێرت بداتەوە.» ئینجا درنجە وە پێشیان کەوت و ئەوانیش ئەرخەیان بوون. دەستیان کرد بە گاڵتە و جەفەنگ. حەسەن بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ ژنەکەی دەگێڕاوە و دەڕۆیشتن هەتا بوو بە ڕۆژ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و بیست و حەوتەم هاتەوە.

گوتی: خاوەنشـــکۆ! ئەوان بە دڵێکی ئاســـوودە بە دوایدا ڕۆیشـــتن هەتا ڕۆژ بووەوە. ئەسپەکان وەک بروسکە دەڕۆیشتن. دەستیان برد لە خورجینەکان خواردەمەنیان دەر هێنا و خواردیان و پاشان ئاویان خواردەوە. تیژ تێ دەپەڕین و درنجەکە ڕێبەریان بوو. ئەوانی لاڕێ کرد و هەتا مانگێک بە قەارخ دەریادا ڕۆیشـــتن. کە بوو بە شـــەوی ســـی و یەکەم، تۆزێک لە دوور وەدیار کەوت. بە جۆرێک کە ڕۆژی ڕووناکی وەک شەو لێ کرد. حەسەن کە تۆزەکەی دیت، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. پیرێژنە ڕووی لە حەســـەن کرد و گوتی: «ڕۆڵە ئەوە لەشـــکری دورگەگەلی واقە و ئێســـتا دەمانگرنەوە و دەمان کووژن.» حەســـەن گوتی: «دایە ئەی چ بکەین؟» پیرێژنە گوتی: «گۆچانەکەت لە زەوی کوتە.» حەســـەن گۆچانەکەی لە زەوی کوتا. لە ڕێوە حەوت کەس لە پاشـــاکانی جندۆکان هاتنە دەرێ و ســـڵاویان لە حەســـەن کرد و کڕنوشـــیان بۆ برد. ئینجا گوتیان: «حەســـەن نیگەران مەبە.» حەســـەن بە قســـەکەی ئەوان ئەهوەن بووە و پێی گوتن: «ئەی پاشـــاکان ئێســـتا ڕۆژی فریاکەوتن و یارمەتییە.» پاشـــاکان گوتیان: «حەســـەن ئەتۆ لەگەڵ هاوڕێکانت بچووە ســـەر ئەو کێوە. ئەوانە بۆ ئێمە بەجێ بێڵە ئێمە دەزانین ئەتۆ لە ســـەر حەقی و ئەوان باتڵن. خودا بۆخۆی یارمەتیمان دەدا.» حەســـەن لەگەڵ ژن و منداڵەکانی و پیرێژنە لە ئەســـپەکانیان دابەزین و چوونە سەر کێوەکە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی هەشتسەد و بیست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک حەسەن لەگەڵ ژن و منداڵەکانی و پیرێژنە چوونە سەر کێوەکە. شاژن نوورولهودا لەگەڵ کەنیزەکانی گەیشتنێ. لەشکری جندۆکان پێشیان پێ گرتن. شەڕ لە نێوان ئەو دوو لەشکرە دەستی پێ کرد. ئازا و بوێرەکان ڕادەوەستان و بەربەرەکانیان دەکرد و ترسنۆک و خوێڕییەکان ڕایان دەکرد. جندۆکەکان لە زاریانەوە گڕیان ئاراستەی یەکتر دەکرد. هەتا بوو بە شەو. لایەنەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان و لە ئەسپەکان دابەزین. دوای شەڕەکە پاشای جندۆکان چوونە سەر کێوەکە و کڕنۆشیان بۆ حەسەن برد. حەسەن سپاسی چاکە و دڵسۆزیانی کرد و دۆعای سەرکەوتنی بۆ کردن. لێشی پرسین لە شەڕی ئەوڕۆتان لەگەڵ شاژن نوورولهودادا چۆن بوون؟ گوتیان: «ئەوان ناتوانن لە بەرابەر ئێمەدا خۆڕاگرن. سێ ڕۆژ نابا تێکیان دەشکێنین. دوو هەزار کەسیان لێ بە دیل دەگرین و تاقمێکی زۆریان لێ دەکووژین. ئەتۆ خەمت نەبێ.»

دوای ئەوە ماڵاواییان لێ کرد و گەڕانەوە بۆ لای لەشکرەکەی خۆیان و ئاگایان لە لەشکرەکەی خۆیان بوو، تا تاو هەڵات. کە تاو هەڵات سواری هەر دووک لا سوار بوون و بە گژ یەکدا چوونەوە و وەک دوو دەریا شەپۆلیان دەدا و شەپۆلاسا هێرشیان بۆ یەک دەبرد. ئاگری شەڕ هەر دەهات و گەرمتر دەبوو، شەویش ماڵی زینیان چۆڵ نەکرد و شەڕ بەردەوام بوو، کوشت و کوشتار درێژی خایاند هەتا لەشکری دوڕگەگەلی واق شکستی هێنا و تاقمێکی زۆریان لێ کوژرا و شاژن نوورلهودا و گەورەکانی وڵاتەکەی بە دیل گیران.

پاشای جندۆکان هاتنە لای حەسەن و تەختێکی زێڕی ڕازاوە بە دوڕ و گەوهەری جۆراجۆریان بۆ هێنا. تەختێکی دیکەشیان هێنا لە پەنا ئەو دایان نا، بۆ نوورونسای خێزانی حەسەن. تەختێکی دیکەشیان بۆ پیرە ئومووددەواهی هێنا. دوای ئەوە دیلەکانیان یەکە یەکە بە دەست بەستراوی و پەت کراوی هێنا پێش حەسەن و ڕایان گرتن.

پیرە کە چاوی بە شاژن نوورولهودا کەوت، پێی گوت: «گڵاوی قەحبەی ستەمکار ئێستا تۆ شیاوی ئەوەی بە کلکی ئەسپێکەوە بتبەستنەوە و لە دەشت و سارایەک بەڕەڵات کەن و دوو گەماڵی برسیشت تێ بەردەن، هەتا ونجڕ ونجڕت کەن و هەر بە زیندووی بتخۆن. چونکە تۆ ئاوات لەو خوشکە بێ گوناحەت دەکرد. ئەوە لە کاتێکدا ئەو هیچ تاوان یان کارێکی نەشیاوی نەکردبوو. لە سەر دەستی ڕێوشوێنی پێغەمبەر مێردی کردبوو. مێردکردن و ژنهێنان یەکێک لە سوننەتەکانی سەروەری پێغەمبەرانە. ژنان بۆ پیاوان ئافرێندراون.» لەو جەنگەیەدا حەسەن دەستووری دا تەواوی دیلەکان بکووژن.

پیریژنەکەش پێی گوتن تەواوی دیلەکان بکووژن و یەک دانەشیان بە زیندووی مەهێڵنەوە. کاتێک شاژن نوورونسا خوشکەکەی خۆی ئاوا دیت خەمی بوو دەستی کرد بە گریان. شاژن نوورولهودا گوتی: «خوشکێ ئەوە کێیە وا ئێمەی لە ناو وڵاتەکەی خۆماندا بە دیل گرت و بە سەرماندا زاڵ بوو؟» شاژن نوورونسا گوتی: «دادە ئەو پیاوە ناوی حەسەنە، خودا بە سەر ئێمەی دا سەر خست. هۆی سەرکەوتنەکەشی جگە لەو گۆچان و کڵاوە هیچ دیکە نەبوو.» شاژن نوورولهودا کە ئەوەی زانی دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە لە بەر خوشکێ. هەتا کارێکی کرد، نوورونسا بەزەیی پێیدا هات و بە مێردەکەی گوت: «چی لە خوشکم دەکەی؟ ئێستا ئەو دیلە و لە بەر دەستی تۆ دایە کارێکی واشی نەکردووە ئاوای سزا بدەی.» حەسەن گوتی: «هەر ئەوەیکە تۆی ئازار داوە زۆرە.» نوورونسا گوتی: «هەرچی لە منی کردووە ئەمن ئازادی دەکەم و لێی خۆش دەبم. ئەتۆ هەر بە هێنانی من جەرگی باوکمت بە کوتکەوە داوە، ئێستا ئەگەر خوشکیشم بکووژی باوکم چی لێ دێ؟» حەسەن گوتی: «شاژن ، تۆ ڕاست دەکەی. حەق بە تۆیە. چۆنت پێ خۆشە وا بکە.» ئینجا شاژن نوورونسا فەرمانی دا هەموو دیلەکان بەر دەن. تەواوی دیلەکانیان لەبەر خوشکەکەی بەر دا.

دوای ئەوە نوورونسا خوشکەکەی لە ئامێز گرت و هەر دووکیان بە یەکەوە گریان. دوای ئیستێک شاژن نوورولهودا بە خوشکەکەی گوت: «خوشکێ گیان ئەگەر خراپەشم لەگەڵ کردووی لێم خۆش بە، چونکە بۆخۆم دان بە تاوانەکەی خۆمدا دەنێم. نەدەبوا وام لەگەڵ کردبای. نوورونسا گوتی: «ئەوەی بە سەرم هات بەشی من بوو، دەبوو بە سەرم بێ و لەگەڵ چارەنووس چ ناکرێ. ئیدی پێکەوە لە سەر تەخت دانیشتن. نوورونسا نوورولهودا و ئومودەواهی پێکەوە ئاشت کردەوە. ئەوانیش گەرنی یەکیان ئازاد کرد. دوای ئەوە حەسەن لەشکری جندۆکانی ناردەوە و سپاس و دەستخۆشی لێ کردن. ئینجا نوورونسا بەسەرهاتی حەسەنی مێردی بۆ خوشکێ گێڕاوە کە چەندی کوێری دیوە. گوتی: «بە ڕاستی خودا ڕەحمی کرد تۆی خستە شوێن ئێمە و ئەو لەشکرەت ئاوا بەزی و شکستی خوارد. ئێستا جێی خۆیەتی بەو هەموو زەحمەتەی بزانین. شاژن نوورولهودا گوتی: «خوشکێ، بە خودا ڕاست دەکەی، ئەو پیاوە زۆری تاڵی و سوێری بە دوای تۆ کێشاوە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شاژن نوورروننسا بە خوشکەکەی گوت: «ئەو پیاوە بە بۆنەی منەوە تووشـــی ڕەنج و ناڕەحەتییەکی زۆر بوو، مرۆڤ دەبێ حەق بڵێ، پیاوێکی زۆر جوامێرە و جێی ڕێزە.» ئەو شەوە ئەو دوو خوشکە هەتا بەیانی هەر خەریکی قسە و باس و وتووێژ بوون. کە ڕۆژ بووەوە مالاواییان لە یەک کرد. شاژن نوورروننسا پیرە و خوشکی بەیەکەوە ئاشـــت کردەوە. حەســـەن گۆچانی لە زەوی کوتا، خزمەتکارانی گۆچان لە زەوی وەدەر کەوتن. سـلاویان لە حەسـەن کرد و کڕنۆشـیان بۆ برد. گوتیان: «سـپاس بۆ خودا وا تۆی بە ئاوات گەیاند. ئێســتا فەرمان بدە لە خزمەتت داین.» حەســـەن گوتی: «دوو ئەســپ لە باشترین ئەسپەکانمان بۆ بێنن.» ئەوان لە ڕێوە دوو ئەسپی باشی زین و لغاوکراویان بۆ هێنان. حەسـەن سـواری یەکێک لە ئەسپەکان بوو. کوڕێکیانیشـی لە پێش خۆی سـوار کرد. ژنەکەشـی سـواری ئەسـپەکەی دیکەیان بوو. کوڕەکەی دیکەی لەگەڵ خۆی سـوار کرد. شاژن نوورولهوداش لەگەڵ پیرێژنە سوار بوون و گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان.

حەســەن و خێزانی ماوەی مانگێک بە ڕێیەدا ڕۆیشـــتن تا لە شـــارێک نیزیک بوونەوە. دەوروبەری ئەو شـارە هەمووی چۆم و دارسـتان بوو. بۆ حەسـانەوە لایاندا ناو باخێک و دانیشتن. خەریکی قسە و وتووێژ بوون کە دەستە سوارێک پەیدا بوون. حەسەن کە ئەوانی دی، لەبەریان هەستا و بەرەو پیلیان چوو. پاشا حەسوون، خاوەنی مڵکی کافوور و قەڵای ئاژەڵان، لە پێشیانەوە دەڕۆیشت. حەسـەن چووە پێش و سـڵاوی کرد و دەسـتی ماچ کرد. پاشـا حەسـوون دابەزی و لەگەڵ حەســەن لە بن دارەکە دانیشــت. زۆری پێ خۆش بوو حەســـەن بە ســـڵامەتی و دەســـکەوتەوە گەڕاوەتەوە. پیرۆزبایی لێ کرد و لێی پرســـی چۆناچۆن ڕزگارت بوو. حەسەن تەواوی ڕووداوەکانی بۆ گێڕاوە. پاشا حەسوون واقی وڕ مـا و گوتی: «ڕۆڵە، قەت قەت، جگە لە تۆ کەس نەهـاتووەتە کۆمەڵە دوڕگەی واق و بە سـڵامەتیش گەڕابێتەوە. کارەکەی تۆ کارێکی ســـەیرە. دوای ئەوە حەســـەن ڕوخســـەتی خواست هەستێ لەگەڵ خێزانی بڕوا. پاشا ڕوخسـەتی دا. حەسـەن و خێزانی سـوار بوون. پاشـــا حەســـوونیش ســـوار بوو. تا ڕێگای دەڕۆژان بەڕێی کردن. دوای ئەوە ماڵاوایی لە حەســـەن کرد و گەڕاوە. حەســـەن لەگەڵ خێزانی مانگێکی دیکە ڕۆیشـــتن، تا گەیشـــتنە ئەشکەوتێکی گەورە کە گڵ و خۆڵی ئەو ئەشکەوتە لە مسێکی زەرد بوو. ژنەکەی حەسەن بە حەسەنی گوتی: «چاو لەو ئەشکەوتە کە بزانە دەیناسی یان نا؟» حەسەن گوتی: «ئەرێ دەیناسـم. ئەو ئەشـکەوتە شـێخێکی تێدایە ناوی ئەبوولڕەویشــە کە گەورەیی و چاکەیەکی زۆری لەگەڵ من کردووە. چونکە ئەو بوو بە هۆی ناسـیاوی من و پاشـا حەسـوون. ئیدی حەسەن بەسەرهاتی خۆی و ئەبوولڕەویشی بۆ خێزانی گێڕاوە وا بوو شێخ ئەبوولڕەویش

له ئەشکەوتەکە هاتە دەرێ. حەسەن کە چاوی پێی کەوت بە لەز لە ئەسپەکەی دابەزی و دەستی ماچ کرد. شێخ سڵاوی لە حەسەن کرد و لەوەی کە ساخ و سەلیمە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی. لەگەڵ خۆی بردییە ژووریٚ و دەستیان کرد بە قسە کردن. حەسەن چی کرد و چی دی و چی بەسەر هات هەمووی بۆ شێخ گێڕاوە. شێخ بە بیستنی باسی گۆچان و کڵاوەکە سەری سوور ما و گوتی: «ڕۆڵە، خۆ ئەگەر ئەو گۆچان و کڵاوە نەبایە، قەتت نەدەتوانی ئەو ژن و منداڵانەت ڕزگار بکەی. ئەوان هەر ئەوا خەریکی ئاخافتن بوون لە دەرگای ئەشکەوتەکەیان دا.

شێخ ئەبوولڕەویش دەرگای کردەوە. سەیری کرد ئەوە شێخ عەبدولقوددووس بە سواری فیل لە بەر دەرگا وێستاوە. کە چاوی پێی کەوت دابەزی. شێخ ئەبوولڕەویش زۆر زۆر خۆشحاڵ بوو. چووە پێش و شێخ عەبدولقوددووسی لە ئامێز گرت. دوای ئەوە شێخ عەبدولقوددووس چووە ئەشکەوتەکەوە. حەسەنی لە ئامێز گرت و زۆر خۆشحاڵ بوو لەوەی کە حەسەن بە سڵامەتی گەڕاوەتەوە. لێی پرسی ئەوە چۆنت ڕزگار بووە؟

حەسەن سەربهوردەی خۆی تا ئەو شوێنەی دەگاتە باسی گۆچان و کڵاوەکە هەمووی بۆ گێڕاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و سییەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! حەسەن گەیشتە باسی گۆچان و کلاوەکە. شێخ عەبدولقوددووس گوتی: «کوڕم شوکری خودا کە تۆ ژن و منداڵەکەت ڕزگار کرد و ئیدی تۆ کێشەیەکت نەماوە. بەلام ڕۆڵە گیان خۆ بۆخۆت دەزانی کە ئێمە بووینە هۆی ئەوەی تۆ بگەیە دورگەگەلی واق و ئەو چاکەیەمان لەگەڵ کرد؟ ئێستا تکات لێ دەکەم کە گۆچانەکەی بدە بە من و کلاوەکەش بدە بە شێخ ئەبوولڕەویش. حەسەن کە ئەو قسەیەی بیست، سەری داخست لە ڕووی هەڵنەدەهات بلێ ناتان دەمێ. دوای ئەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو دوو شێخە زۆریان یارمەتی من دا و ئەوان بوون ببوونە هۆی ئەوەی، ئەوێ ببینمەوە و بچمە دورگەگەلی واق. ئەگەر ئەوان نەبان ئەمن قەت نە ژن و منداڵەکەی خۆم دەدیتەوە و نە ئەو کلاو و گۆچانە. ئینجا سەری هەڵێنا و گوتی: «شێخی مەزن، ئەمن ئەوانەتان دەدەمێ بەلام من لەوەش دەترسم پاشا ئەکبەڕی باوکی شاژن نووروننسا بە لەشکرەوە بێ و بە سەر شارەکەی ئێمەدا بدا. ئەگەر کارێکی ئاوا ڕوو بدا خۆ من جگە لەو گۆچان و کلاوە هیچی دیکە شک نابەم بەربەرەکانی پێ بکەم. شێخ عەبدولقوددووس گوتی: «ڕۆڵە گیان ترست نەبێ، ئێمە لێرە سیخوڕ و چاوەدێر دادەنێین و هەرکەس لە لای پاشا ئەکبەڕەوە بەرە و لای تۆ ببزوێ خێرا پێشی دەگرین. حەسەن کە ئەوەی دیت، لە ڕوودا ما و کلاوەکەی دا بە شێخ ئەبولڕەویش و بە شێخ قوددووسیشی گوت: «ئەتۆش ئێمە بەرەوە بۆ ئاخ و وڵات خۆمان هەتا ئەو گۆچانەش بدەم بە تۆ. هەردووک شێخەکە خۆشحاڵ بوون و هەتا سێ ڕۆژان لەو ئەشکەوتدا مانەوە.

دوای ئەوە شێخ عەبدولقوددووس لەگەڵ حەسەن کەوتنە ڕێ و بە ڕێگای ئاسان و نیزیکتردا ڕۆیشتن هەتا لە زێدی حەسەن نیزیک بوونەوە. حەسەن بە نیزیک بوونەوە لە وڵات و دایکی کەیف ساز بوو. شوکری خودای کرد و ئەو دوو بەیتەی گوت:

ئەوەی ئەیبینم من، ڕاستە یا خەونە خوایە
دوای ئەو ڕۆژڕەشییە، ئەو ڕۆژە ڕوونە خوایە
ئەخە ئەو ماوەیە لە پیری ناخۆشتر بوو
تێپەڕی، هاتەوە لە گەنجی خۆشتر خوایە

کاتێک جوان تێراما کۆشکی شین و کێوی سەحابی بینی.

شێخ عەبدولقوددووس پێی گوت: «حەسەن مزگێنیم دەیە ئەو شەو میوانی کچە برازاکانمی.» حەسەن و ژنەکەی بەو هەواڵە خۆشحاڵ بوون. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە

کۆشـــکەکەی ئەوان. کیژەکـان زانیـان و هـاتنە دەرێ و ســـڵاویـان لێ کردن. شـــێخ عەبـدولقوددووس گوتی: «برازاکـانم ئەوەش براکەتـان کە ئـاواتەکەیم وەدی هێنـا و لە دیتنەوە و هێنانەوەی و ژن و منداڵەکەی یارمەتیم دا.» کچەکان دڵخۆش بوون بەوەی کە حەســەن و ژن و منداڵەکانی بە دیداری یەکتر شـاد بوونەوە. ئەو ڕۆژە بۆ ئەوان جێژنێکی گەورە بوو. خوشکەکەی حەسەن هات و حەسەنی لە ئامێز گرت و دەستی کرد بە گریان. حەســەنیش لەگەڵ ئەوە دەســتیان کرد بە گریان و زۆریان گلەیی لە ڕۆژگار کرد، وا ئاوا لێکیان دادەبڕێ. ئەو شێعرەی خوێندەوە:

زمـــان لە زارمـــدا بە شـــێـوەی خەنـــجەر
نــیـگــا لە چـاومـــدا هەر وەکـــوو پەیـــکــان
دڕکـــی دووریـــت هـــێـــنـــد درا لە چـــاو و دل
خـــوێـــنـــاو ڕوخســـــارمـــی کـــردۆتە گـــوڵســـــتـــان

دوای ئەوە حەسەن گوتی: «خوشکەکەم هۆکاری سەرەکی دیتنەوەی ئەو ماڵ و منداڵەم و یەکتر دیتنەوەمان ئەتۆ بووی و هەمووی لە دڵسۆزی و بەزە و دلۆڤانی تۆ دەزانم. ئەتۆ لە هەمووکەس زیاتر یارمەتیت دام لە و گێژاوە ڕزگارم بێ.»

ئیدی ئەوجار حەســەن دانیشــت و لە ســەرڕاوە چی بەســەر هاتبوو. چی دیت و چی کردبوو، ئەو هەموو ڕووداوە سەیر و سەمەڕانەی تووشی ببوو، موو بە موو هەمووی بۆ گێڕانەوە. دوای ئەوە هاتەوە سەر باسی گۆچان و کڵاوەکە و گوتی: «شێخ ئەبولڕەویش و شێخ عەبدولقوددووس داوایان لێ کردم ئەوانم دا بەوان، ئەویش بەس لەبەر تۆ.» خوشکی حەسـەن سـپاسـی کرد و دۆعای تەمەندرێژی بۆ کرد. حەسـەن گوتی: «بە خودا قەت ئەو هەموو چاکەیەی تۆم کە لە ئەوەڵەوە لەگەڵ منت کردووە لە بیری ناکەم.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و سی و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەوجار خوشکی حەسەن ڕووی لە نوورونسای خێزانی حەسەن کرد و گوتی: «کەنشکی پاشا ئەکبەر، چۆن دڵت هات حەسەن و منداڵەکانی لێ هەڵبڕی و ئەو داخە بخەیە سەر دڵی حەسەن و تووشی ئەو هەموو ناڕەحەتی و چەرمەسەرییەی بکەی؟ دەتهەویست حەسەن سیل و دیقانەوە بمرێ و لە تاوان دڵی بتۆقێ و سەربنێتەوە؟» شاژن بزەیەکی هاتێ و گوتی: «ئەوە خودا وای پێ باشە و کاری چارەنووس بوو. لە قەدیمەوە گوتوویان هەرکەس چاڵ بۆ خەڵک هەڵکەنێ بۆخۆی تێ دەکەوێ. ئەویش منی لە دایک و بابم هەڵبڕی.» دوای ئەوە خواردمەنیان هێنا و خواردیان و خواردیانەوە و زۆریان گەمە و جەفەنگ کرد. هەتا دە ڕۆژان لە لای ئەوان مانەوە. دوای ئەوە خۆیان ساز کرد برۆن. خوشکی حەسەن ماڵ و دیارییەکی زۆر زەوەندی بۆ پێچانەوە و لە ماڵاواییدا حەسەنی لە باوەش گرت و حەسەنیش ئەوی لە ئامێز گرت و گریان و ئەو بەیتانەی خوێندەوە:

هەرچەند دەکەم بەقا ناکەم تۆ لێم دوور بی
بچییە هەر کوێ کۆتری لانەی دڵی منی
چارەنووس زۆر بێ ڕەحمانە هەڵداوێرێ
ئاشقە و ماشقە بۆ شوێنی دوور هەڵدەدێرێ
دووریت دەردێکی بەژانە باوەڕ ناکەم
من بژیم و دوور لە باڵای جوانت هەڵکەم

دوای ئەوە حەسەن گۆچانەکەی دا بە شێخ عەبدولقوددووس. شێخ سپاسی کرد و سواری فیلەکەی بوو گەڕاوە شوێنەکەی خۆی. حەسەنیش لەگەڵ خێزانی و منداڵەکانی دوو مانگ بە شاخ و کێو و دەشت و دەردا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە بەغدا.

حەسەن چووەوە بەر دەرگای خۆیان و لە دەرگای دا. دایکی حەسەن بە هۆی ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوەی کوڕەکەی لە خەو و خۆرادن کەوتبوو. کار و پیشەی شەو و ڕۆژی هەر شین و گریان بوو. دەستی لە هاتنەوەی کوڕەکەی شوتبوو. هەمیشە هەر ناوی حەسەنی لە زار بوو پێی هەڵدەگوت. حەسەن لە پشت دەرگاکە ڕاوەستابوو، گوێی لە دایکی بوو دەگریا و ئەو شێعرەی دەگوت:

شەو لە جێی خەو خەمی تۆمە
بە ڕۆژدا شین و ڕۆ ڕۆمە

بەڵێـــــــــــــــــــــــــــنتدا زوو بێیەوە
وا بێیەوە نامـــــــــــــــــــــــــــبینییەوە

کاتێک دایکی حەسەن شێعرەکەی تەواو کرد گوێی لە دەنگی حەسەن بوو. لەڕێوە خۆی گەیـانـدە دەرگـاکە. کە دەرگـای کردەوە کوڕەکەی و ژن و منـداڵەکـانی دیـت لەوێ ڕاوەســـتابوون. لە خۆشـــیان زیقاندی و بێ هۆش بوو. حەســـەن هەر بە دەوریدا هات و لاواندییەوە تا وە هۆش هاتەوە. دوای ئەوە بانگی کۆیلەکانی کرد. بێن ئەو شـتانەی لەگەڵ خۆی هێنابووی بیانبەنە ژووریّ. دایکی حەسـەن کە وە هۆش هاتەوە حەسـەنی لە باوەش گرت و دەسـت و سـەروچاو و لاقی ماچ کرد. ئینجا بووکەکەشی لە لاوەش گرت و ماچی کرد و پێی گوت: «ئەی کچی پاشـــا ئەکبەڕ ئەگەر من هەڵەیەک یان تاوانێکم دەرحەقی تۆ کردووە داوای لێ بووردنت لێ دەکەم و لێم خۆش بە.» ئینجا ڕووی لە کوڕەکەی کرد و گوتی: «کوڕەکەم بۆ ئەوەندەت پێ چوو؟» حەسـەن تەواوی بەسـەرهاتی سـەفەرەکەی بۆ گێڕاوە. دایکی حەســەن کە ئەو شـتانەی بیسـت ویشـک بوو، حەبەسـا بوو. پاشـان گوتی: «ڕۆڵە بە خودا ئەو گۆچان و کڵاوەت لە خۆڕا لە دەسـت داوە. ئەگەر تۆ ئەوانت لە دەسـت نەدابا دەتوانی دەسـت بە سـەر تەواوی گۆی زەویدا بگری. بەڵام دیسـان شـوکری خودا کە لەگەڵ ژن و منداڵەکانت بە سلامەت گەڕاونەتەوە.»

کە ڕۆژ بووەوە حەسـەن هەستا جلوبەرگی شکۆداری لە بەر کرد و چوو لە بازاڕ کۆیلە و کەنیز و باغ و زەوی و زاری باشی کڕی. ئیدی تا دوایین ساتەکانی تەمەنی لەگەڵ دایکی و ژن و منداڵەکانی بە خێر و خۆشی ژیانیان تێپەڕ کرد. تا مردن میوانی دانە دانەیان بوو. پاکە ئەو خودایەی مردنی بۆ نییە.

## چیرۆکی خەلیفە ڕاوچی

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە لە دەورەی خەلافەتی هاڕوونەڕڕەشـــید لە بەغدا کابرایەکی ماسـیگر بوو، ناوی خەلیفە بوو. زۆر هەژار و نەدار و مەینەتبەش بوو. ڕێکەوت وا بوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆڕ و داوی هەڵگرت و بە پێی خووی هەموو ڕۆژێ، چوو بۆ قەراخ چۆم بۆ ڕاو. قۆڵ و ئاتەگی هەڵکرد و یەک دوو جاریّ تۆڕی هاویشـــتێ. هیچی بۆ نەگیرا. هەتا دە جاران تۆڕی هاویشـــتێ هیچی بۆ نەگیرا. زۆری پێ ناخۆش بوو. دڵی گیرا و پێی ســـەیر بوو. تۆبەی کرد و گوتی: «ماشـــاءاللّە کان مالم یشـــاء لم یکن.» خودا ڕۆزی دەدا. یەکێک ئەوەندەی دەداتێ لە ئەژمار نەیە و ژیانی یەکی دیشـــی تاڵ دەکا. کەسیش حەقی نییە ڕوو گرژ کا.

ئەنــواداران ئەنــوايــان وەک ئــاســـــمــان بەريــنە
بێ ئەنوا، چی شـــوێن هەیە وەک دوژمن لێی بەقینە

دوای ئەوە ماوەیەک دانیشت و سەری داخست. ئینجا ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

خـــــــــــــــــــاوەنی کەون و کارسازی کاران
هـــــــــــــــــــێمنیبەخشی دڵەی زامداران
تاجـــــــــــــــــــی بەخت ئەنێی تۆ لە سەر کەسێک
یەکـــــــــــــــــــیش پەک دەخەی لە بەر با و باران
یەکـــــــــــــــــــیش بەرەڵا هەر وەکوو سەگێک
هەڵوەدا لە ناو کـــــــــــــــــــووچە و بازاڕان

دوای ئەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: «وەڵاهی ئەو جاریش تاقی دەکەمەوە و دبۆڕەکەی لە ئاوەکە دەهاوێمەوە. بەشکوو بە ڕەحم و گەورەیی خۆی دڵم نەشکێنێ. ئینجا دەستی هەڵێنا و بە هەموو هێزییەوە تۆڕەکەی فڕێ دا ناو چۆمەکە. ماوەیەک ڕاوەســتا. ئەوجار کێشــای هەستی کرد قورسە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خەلیفە ڕاوچی هەستی کرد شتێک پێوە بووە. وردە وردە کێشایە دەرێ سەیری کرد ئەوە مەیموونێکی شەل پێوە بووە! گوتی: «پەنا بۆ خودا ئەو بەدبەختییە چییە؟ هاشا ئەو شانسەی ئێمە لەو ڕۆژە ڕەشەدا شتی چۆنم تووش دەبێ. بەڵام قەیناکا دەی چی لەگەڵ چارەنووس دەکەی. ئینجا هێنای دەست و لاقی مەیموونەی بە دارێکەوە لە قەراخ چۆمەکە بەستەوە. قامچییەکی پێ بوو، دەری هێنا دەستی لێ هەڵێناوە ویستی لێیدا. لە خوداییەوە مەیموونە وە قسە هات و بە زمانێکی ڕەوان گوتی: «خەلیفە دەست ڕاگرە و لە من مەدە. لە من گەڕێ با هەر لێرە ببەستریمەوە ئەتۆ برۆ تۆڕ باوێ لەسەر خودا. خودا بۆخۆی بژیوت دەدا.

خەلیفە ڕاوچی کە گوێی لەو قسەیە بوو دەستی ڕاگرت و چوو دیسان تۆڕەکەی لە چۆمی هاویشتەوە. دوای ئیستێک چاوەڕوانی دەری کێشا. دیتی لە جاری پێشوو قورسترە. وردە وردە کێشای هەتا هێنایە دەرێ. سەیری کرد ئەوە مەیموونێکی چاو خوماری دەست بە خەنەیە و کراسێکی کۆنیشی لە بەر دایە و هەر پێشدەکەنێ. خەلیفە ڕاوچی گوتی: «سپاس بۆ خودا وا ماسییەکانی ئەو ڕووبارە هەمووی بوون بە مەیموون. ئینجا گەڕاوە بۆ لای ئەو مەیموونەی وا لە دارەکە بەستبوویەوە. پێی گوت: «ئەخە بەدفەڕی ناموبارەک لە سایەی تۆوە تووشی مەیموونێکی دیکەش بووم. ئەوەش ئی سەر و نەشەمەی تۆی خوار و خێچ و نالەبار بوو، تووشی ئەوەش بووم.» دیسان دەستی دا قامچییەکەی و چوو لێی دا. مەیموونە گوتی: «خەلیفە، بیکە بۆ خاتری خودا لە من خۆش بە و بەو مەیموونەی دیکەم ببەخشە. هەرچی دەتهەوێ بەو بڵێ ئەو ڕێنوێنیت دەکا.» ناچار قامچییەکەی دانا و چوو بۆ لای مەیموونەکەی دیکە. مەیموونی دووەمی گوتی: «خەلیفە ئەگەر تۆ بە قسەم بکەی و دژایەتیم نەکەی، ئەوە کارێک دەکەم تۆ پێویستیت بە کەس نەمێنێ.» خەلیفە گوتی: «هەرچی بڵێی بە قسەت دەکەم.» مەیموونە گوتی: «لە من گەڕێ با بەو دارەوە ببەستریمەوە، ئەتۆ بچووە تۆڕ لە چۆمی هاوێ جا دوایە پێت دەڵێم چ بکەی.»

خەلیفە ڕاوچی لەڕێوە دەستی دا، تۆڕەکەی و چووە قەراغ چۆمەکە و تۆڕەکەی تێ هاویشتەوە. ماوەیەکی باش چاوەڕێ بوو تا شتێک پێوە بێ. دوای ئەوە تۆڕەکەی کێشا. سەیری کرد زۆر لە جارەکانی دیکە قورسترە. زۆری هەوڵ لەگەڵ دا تا دەری کێشا. سەیری کرد مەیموونێکی سوور پێوە بووە و کراسێکی شینی لە بەر دایە. گوتی: «سوبحانەڵلا ئەورۆ وادیار، ڕۆژێکی نامەبارەکە. تەواوی ئەوانەش لە بن سەری مەیموونی یەکەم دایە. ئەوە بڵێی ئەو ڕووبارە ماسی تێدا نەمابێ یان من هاتووم بۆ ڕاوە مەیموون؟

سـپاس بۆ خودا وا ماسـییەکانی کردووە بە مەیموون.» دوای ئەوە ڕووی لە مەیموونی سێیەم کرد و گوتی: «بێ فەڕ ئەتۆ لە کوێوە هاتی و کێی؟» مەیموونەکە گوتی: «بۆ تۆ من ناناسـی؟» خەلیفە گوتی: «ناوەڵڵا ناتناسـم.» مەیموونەکە گوتی: «ئەمن مەیموونی ئەبولسەعاداتی یەهوود سەڕڕافم.» خەلیفە گوتی: «ئەتۆ چکارێک بۆ ئەو دەکەی؟» هەموو بەیانی و ئێوارەیەک چاوێکم لێ دەکا و بەو بۆنەوە دە دیناری وەگیر دەکەوێ. ئینجا خەلیفە ڕاوچی ڕووی لە یەکەم مەیموون کرد و گوتی: «بێ فەڕ، چاو لە مەیموونی خەڵکی بکە پێ و قەدەمیان چەند باشـە. چەند سـەر بە ڕزقن. منیش لە سـایە سـەری تووە ئەوڕۆ هیچم وەگیر نەکەوتووە و ئێسـتا برسـیم. دەزانم هەتا یەک دوو ڕۆژی دی لە برسـان دەمرم.» ئینجا دەسـتی دا قامچییەکە و سـێ جاری هەڵسـووڕاند کە لە مەیموونەکەی ڕاکێشێ، وا بوو مەیموونەکەی ئەبولسەعاداتی یەهوود سەڕڕاف گوتی: «خەلیفە لەو گەڕێ وەرە ئێرە با پێت بڵێم چ بکەی.» ئینجا خەلیفە قامچییەکەی فڕێ دا و لێی چووە پێشـێ و گوتی: «بەڵێ گەورەی مەیموونـان دەڵێی چی؟» ئەتۆ لە ئێمە گەڕێ بۆخۆمـان لێرە ئەوە دانیشـتووی و بڕۆ قەراخ ئاوەکە و قولاپ باوێ. هەرچی وەگیرت کەوت بیهێنە بۆ لای من تا شتێکت فێر کەم. چونکە قازانج و بەرژەوەندیی تۆ لەوە دایە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و سی و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! مەیموونە گوتی: «هەرچی پێوە بوو، بی هێنە لای خۆم تا شـــتێکی چاکت فێرت کەم کە بۆ تۆ زۆر باش دەبێ و قازانج دەکەی. خەلیفە ڕاوچی لە ڕێوە دەستی دا تۆڕ و بەرەو قەراخ ئاوەکە ڕۆیشت و ئەو شێعرەشی لە بەر خۆیەوە خوێندەوە:

تۆ کە ڕۆژ و شەو، ئاڵـــــــــــــــــوگۆڕ دەکەی
ئەو هەمـــــــــــــــــوو گیانلەبەرە تێر دەکەی
مەل لە ئاسمان و ماســـــــــــــــــی لە دەریا
ڕســـــقـیــان دەدەیـت و بـێ بەشــــیــان نــاکەی
دەیجا چی دەبێ ڕســـقی منــــــــــــــیش بەی
گەپـــچـــاری دەســـــتی مەیــــــمـوونـم نەکەی
خوایە ڕســـقم بە و، شـــەرمـــــــــــەندەم مەکە
موحتاجی دەستی ناپـــــــــــــــــیاوم مەکە

کە شـێعرەکەی تەواو بوو. چوو بۆ سـەر ئاوەکە و تۆڕەکەی تێ هاویشـت و ماوەیەک ڕاوەسـتا. دوای ئەوە دەرکێشـاوە دەرێ. ماسـییەک بە تۆڕەکەوە ببوو، کە سـەرێکی زل و کلکێکی درێژ و دوو چاوی هەبوو کە وەک ئەسـتێرە دەدرەوشـاوە. کاتێک خەلیفە ئەوەی دیت خۆشحاڵ بوو، چونکە تا ئەو ڕۆژە ماسی ئاوای نەگرتبوو. بەو پەڕی سەرسووڕمانەوە ماسـییەکەی برد بۆ لای مەیموونەکەی ئەبولسـەعاداتی یەهوود سـەڕڕاف. کەیفی ئەوەندە سـاز بوو دەتگووت تەواوی دنیای وەگیر کەوتووە. مەیموونەکە گوتی: «خەلیفە، چی لەو ماسـییە دەکەی و چۆن لەگەڵ مەیموونەکەی خۆت دەسـازێی؟» خەلیفە گوتی: «گەورەی مەیموونەکـان ئەتۆ ئەوە بزانە کە من ئەو مەیموونەی خۆم دەکووژم. لە جیـاتی ئەو تۆ دەکەم بە مەیموونی خۆم و ئیشـتیـات لە چی بێ هەموو ڕۆژێ بۆت پەیـدا دەکەم و دەرخواردت دەدەم.»

مەیموونەکە گوتی: «ئێسـتا کە من لە جێی ئەو دەکەی بە مەیموونی خۆت. با شـتێکت پێ بڵێم بە قازانجی تۆ بێ. بە پەتێک شتێک من لەو دارە ببەستەوە و بۆخۆت بڕۆ تۆڕەکەت لە دیجلە هاوێوە. ماوەیەک ڕاوەسـتە، ئەوجار قولاپەکەت دەرکێشـەوە، سـەیر دەکەی ماسییەکەی وا پێوە بوو کە قەتت ماسی وا نەدیوە. ئەودەم ئەو ماسییە بێنە لای من تا پێت بڵێم چی لێ بکەی.»

لەڕێوە خەلیفە ڕاوچی هەسـتا چوو قولاپەکەی لە چۆمی هاویشـتەوە و ماوەیەکی باش

لەوێ چاوەڕێ بوو شتێک پێوە بێ. داوەکەی دەرکێشا. تەماشای کرد ماسییەکی سپی پێوە بووە وەک کاریلە. کە لە تەواوی ژیانیدا ماسی ئاوای نەدیتبوو. ئیدی گرتی و هێنایەوە لای مەیموونەکە. مەیموونەکە گوتی: «کەمێک گیای سەوز بڕنەوە و نیوەی گیایەکە لە بنی قرتاڵەکەدا ڕاخە و ماسییەکەی لە سەر دانێ و بەشەکەی دیکەی گیایەکە بخە سەر ماسییەکە. با ئێمەش هەر بە دارەکەوە بەسترابینەوە. لە ئێمە گەڕێ. بۆخۆت قرتاڵەکە هەڵگرە و بڕۆ بۆ ناو شاری بەغدا. هەرکەس قسەی لەگەڵ کردی، یان شتێکی لێ پرسی وەڵامی مەدەوە. هەر بڕۆ تا دەگەیە بازاڕی سەڕرافییەکان. لە لای سەرەوەی بازاڕەکە گەورەی سەڕافەکان، ئەبولسەعادات دەبینی کە لە سەر کەتێک[1] دانیشتووە و پاڵی وە باڵنجێکەوە داوە. دوو دانە سندووقی بۆ زێڕ و زێو لە پێشە. کۆیلە و کاردارەکانی لە بەر دەمی وێستاون. ئەتۆ بچووە پێشێ و سڵاو بکە. بڵێ جەنابی ئەبولسەعادات ئەمن ئەوڕۆ چووم بۆ ماسی گرتن و لە نییەتی تۆ تۆڕم لە چۆمی خست. خودای تەعالا ئەو ماسییەی لە شانسی تۆ بە داوەکەمەوە کرد. بەو جۆرە جوولەکەکە ماسییەکەت لێ وەر دەگرێ و دینارێکت دەداتێ، ئەتۆ نەتهەوێ. دوو دینارت دەداتێ وەری مەگرە دەیکاتە سێ هەر وەری مەگرە. هەرچەند بە قەد قورسایی ماسییەکەت زێڕ داتێ، هەر وەری مەگرە. ئەوجار جوولەکەکە دەڵێ هەرچیت دەوێ بیڵێ با بتدەمێ. ئەتۆ بڵێ بە خودا ئەمن ئەو ماسییە نافرۆشم مەگەر بە دوو وشە. ئەگەر جوولەکەکە گوتی: ئەو دوو وشەیە چییە؟ ئەتۆ بڵێ: هەستە و بە دەنگێکی بەرز بڵێ، خەڵکینە ئەوە من مەیموونەکەی خۆم لەگەڵ مەیموونی خەلیفە ڕاوچی گۆڕییەوە و ڕۆزی خۆم لە بەرابەر ڕۆزی ئەودا گۆڕییەوە. جا ئەگەر شتێکی وا سەری گرت، ئەوە ئەمن هەموو بەیانی و ئێوارەیەک دێمە لای تۆ لە سایەی خێر و بەرەکەتی ڕوخساری منی مەیموون، ئەوە دە دینارت وەگیر دەکەوێ. ئەو دەم تۆ لە جێی ئەبولسەعادات جوولەکە دەوڵەمەند دەبی و ئەویش لە جێی تۆ هەژار و لێقەوما و دەبێ و قەت هیچی وەگیر ناکەوێ. ئێستا تۆ بە قسەی من بکە با ڕزگارت بێ. خەلیفە ڕاوچی گوتی: «سەرۆکی مەیموونان، هەر چی گوتت بە قسەت دەکەم. بەڵام ئەی چی لەو مەیموونە نامەبارەکە بکەم.» ئەویش و منیش لە ئاوەکە هاوێوە. خەلیفە ڕاوچی چووە پێشێ و پەتەکەی لە مەیموونە کردەوە و لە نێو ئاوەکەدا بەڕەڵای کردن. بۆخۆشی ماسییەکەی هەڵگرت و شۆردییەوە و لە گیای گرت و قرتاڵەی لە سەر شانی دانا و ئەو دوو بەیتە شێعری گوت:

هەڵدەستم دەرۆم دەیدۆزمەوە
لە بن بەردیش بێ دەیبینمەوە
شانسم پەت دەکەم هەر وەکو تولە

---

[1]. تەختێکی دوو کارەیە هەم بۆ دانیشتن دەبێ و هەم خەوتن.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خەلیفە ڕاوچی قرتاڵەی لە سەر شانی دانا و بەدەم شێعر خوێندنەوەوە ڕۆیشت هەتا گەیشتە ناو شاری بەغدا. خەڵک کە دیتیان ناسیان و چاک و چۆنیان لەگەڵ کرد و لێیان پرسی چیت هێناوە؟ خەلیفە ئاوڕی لە کەس نەداوە و ڕۆیشت هەتا گەیشتە بازاری سەڕافییەکان. هەر وەک مەیموونەکە پێی گوتبوو. ڕۆیشت و لە دووکانەکان ڕەد بوو هەتا گەیشتە دووکانی جوولەکەکە. سەیری کرد ئەوە لە سەر کەتێک دانیشتووە و کۆیلە و بەردەستیش ڕاوەستاون. خەلیفە هەرکە چاوی پێی کەوت ناسییەوە. چووە پێش و ڕاوەستا. جوولەکەکە سەری هەڵێنا و ئەوی ناسییەوە و لێی پرسی: «ها خەلیفە، چیت دەوێ؟ ئەگەر کەسێک قسەی پێ گوتووی یان لەگەڵ کەسێک شەڕت بووە با لەگەڵت بێم بۆ لای خەلیفە مافت بستێنم.» خەلیفە گوتی: «نا ئەوە نییە، بە گیان تۆ کەس قسەی پێ نەگوتووم. ئەوڕۆ لە ماڵ هاتمە دەرێ و گوتم لە سەر بەختی ئەبولسەعادات دەچم بۆ ماسی گرتن. چووم و تۆڕم لە دیجلە هاویشت و ئەو ماسییەی پێوە هات. ئەوجار ماسییەکەی بە گیاوە هەڵگرت و لە پێش جوولەکەکەی دانا. جوولەکەکە ماسییەکەی زۆر بە دڵ بوو گوتی: «بە تەورات قەسەم دوێشەوە لە خەونمدا بوو لە بەردەم عێزرا[1] ڕاوەستابووم کەچی پێی گوتم: «ئەبولسەعادات دیارییەکی باشم بۆ ناردووی.» وادیارە هەر دەبێ ئەو ماسییە بێ.»

ئینجا ڕووی لە خەلیفە ڕاوچی کرد و گوتی: «تۆ ئەو دینەت جگە لە من کەس ئەو ماسییەی دیوە؟» خەلیفە گوتی: «ناوەڵڵا. ئەی باشترین یەهوود جگە لە تۆ کەس نەیدیوە.» ئەوجار جوولەکەکە دەستی برد و دینارێکی لە سندووقە دەرهێنا و داییێ. خەلیفەش مەمنا لە ژیانیدا قەتی زێڕ نەدیتبوو، وەری گرت و لە گیرفانی نا و گوتی: «سوبحانەڵڵا ئەی شای شایان.» ئیدی لەو پەڕی خۆشحاڵید هەنگاوی نا بڕوا، کە قسەکەی مەیموونەکەی وەبیر هاتەوە ئیدی دینارەکەی بۆ یەهوودەکە هاویشت و گوتی: «ها ئەوە زێڕەکەت ماسییەکەم دەوە. پێت وایە خەڵک گەپچاری تۆن؟» جووەکە کە گوێی لەو قسەیە بوو دوو دیناری دیکەشی دایە. خەلیفە گوتی: «ماسییەکەم دەوە و هەر لێی گەڕێ. جووەکە پێنج دیناری دایە و گوتی: «نرخی ماسییەکە چەندەیە ئەوەندە وەرگرە و تەماع مەکە.» خەلیفە ئەوانەی وەرگرت و بە دڵێکی خۆشەوە ڕۆیشت. چاوی لە زێڕەکان دەکرد و سەری سووڕ مابوو. دەیگوت خودایە ئەو هەموو زێڕەی من هەمە خەلیفەی بەغداش نییەتی. کە گەیشتە ئەوسەری بازاڕەکە وەبیری هاتەوە کە مەیموونەکە باسی دوو وشەکەی کرد. دەسبەجێ

[1]. عێزرا: ناوێکی عیبرییە. شێخێکی گەورەی جوولەکانیشە.

گەڕاوە و دینارەکانی لە کۆشی جوولەکە هاویشت. جوولەکە گوتی: «ئەرێ خەلیفە ئەوە بۆ وا دەکەی چت لە گیانی من دەوێ؟ دەڵێی نرخی دینارەکانت چەندت درەم دەوێ دەتدەمێ.» خەلیفە گوتی: «ناوەڵڵا، نە دینارم دەوێ و نەدرەم. ماسییەکەی خۆم دەوێتەوە.

ئیدی جووەکە تووڕە بوو، بە سەریدا گوڕاند و گوتی: «کاکی ڕاوچی، ماسییەکت داومێ دینارێک ناهێنێ ئەمن پێنج دینارم داوێ. هێشتا ئەتۆ ناڕازی؟! مەگەر تۆ شێتی. باشە تۆ پێت وایە ئەو ماسییە چەندە دێنێ؟» خەلیفە گوتی: «ئەمن ئەو ماسییە بە زێڕ و زیو نافرۆشم. ئەو ماسییەی بە دوو وشە دەفرۆشم. بێت و هەر دوو وشە بڵێی ئەمن ئەو ماسییەت دەدەمێ. جووەکە کە ئەو قسەیەی بیست و چاوی زەق کردەوە و پشووی سوار بوو. ددانی لە چیرەوە برد و بە ڕاوچییەکەی گوت: «ئەی خوێڕیترن موسوڵمان ئەتۆ دەتهەوێ بە ماسییەک دەست لە بیروباوەڕی چەندین ساڵەم کە لە باپیرانمەوە بۆم بە جێ ماوە هەڵگرم. ئینجا بانگی نۆکەر و کۆیلەکانی کرد، وەرن تێی هەڵدەن.» نۆکەر و کۆیلەکانی هاتن ئەوەندەیان لێ دا هەتا جووەکە گوتی: «باشە بەسییەتی دەست ڕاگرن.» خەلیفە ڕاوچی هەستاوە. جووەکە گوتی: «پێم بڵێ ئەو ماسییە بایی چەندەیە؟ پێم بڵێ با بتدەمێ و گوناهباری تۆ نەبم. بە دینم ئەوەندەی بڵێی دەتدەمێ. خەلیفە گوتی: «ئەمن زێڕ و پارەم لە تۆ ناوێ، ئەو دوو وشەیە نەبێ.» جووەکە گوتی: «هەڵەم نەکردبێ ئەتۆ دەتهەوێ من موسوڵمان کەی وا نییە؟» خەلیفە گوتی: «کاکی جوو، بە خودا ئەگەر تۆ ببی بە موسوڵمان، ئەو موسوڵمان بوونەت هیچ قازانجێکی بۆ موسوڵمانان نابێ و هیچ زیانێکی بۆ یەهوودیش نابێ. ئەگەر هەر ئاوا بە کافریش بمێنییەوە دیسان هیچ قازانجێکت بۆ جووەکان و هیچ زیانێکت بۆ موسوڵمانان نابێ. کەوایە ئەوەی من لە تۆم دەوێ هەر ئەوەندەیە هەستێ سەر پێ و بڵێی خەڵکینە ئێوە شایەد بن ئەوە من مەیموونەکەی خۆم لەگەڵ مەیموونی ئەو ڕاوچییە و بەختەکەی خۆم لەگەڵ بەختی ئەو ڕاوچییە گۆڕییەوە. جووەکە گوتی: «حەح جا ئەگەر تۆ هەر ئەوەندەت دەوێ ئەوە کارێکی ئاسانە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! یەهوودییەکە گوتی: جا ئەوە کارێکی ئاســانە. دوای ئەوە جووەکە هەســتا و گوتی: «خەڵکینە ئەوە ئێوە شـایەد بن و بزانن کە من مەیموونەکەی خۆم لەگەڵ مەیموونی ئەو ڕاوچییە و بەختەکەی خۆم لەگەڵ بەختی ئەو ڕاوچییە گۆڕییەوە.» ئەو جار ڕووی لە خەلیفە کرد و گوتی: «ئەوەش ئەوە خۆ هیچی دیکەت ناوێ؟» خەلیفە گوتی: «ناوەڵڵا، هیچی دیکەم ناوێ.» جووە گوتی: «کەوایە بە ڕێی خۆتدا بڕۆ بە ســـڵامەت.» ئیدی خەلیفە لە ڕێوە دەستی دا قرتاڵە و تۆڕەکەی خۆی و ڕۆیشتەوە بۆ قەراخ ڕووبارەکە و تۆڕی لە ئاوەکە هاویشت. پاش ماوەیەک تۆڕەکەی دەرکێشا، سەیری کرد زۆر قورسە. بە زۆری هێنایە دەرێ. تەماشای کرد پڕ لە ماسیی. ژنێک هات دینارێکی دایە و ماسییەکی لێ کڕی. دوای ئەوە یەکی دی هات و ماســـییەکی دیکەی لێ کڕی. ئیدی ئاوا بەردەوام فرۆشـتی هەتا بایی دە دیناری فرۆشـت. بە دە ڕۆژان بایی سـەد دیناری زێڕی فرۆشـت. ڕاوچییەکە ماڵەکەی لە گەڕەکی بازرگانەکان بوو. شـەوێک لە ماڵێ خەوتبوو، لە دڵی خۆیدا بە خۆی گوت: «هەموو کەس دەزانێ کە تۆ ڕاوچییەکی هەژار بوو، ئێســـتا ســـەدهەزار دینارت کۆ کردووەتەوە. هەر بینا خەلیفە هارووونەڕڕەشید لە یەکێک لەو خەڵکەی بیستەوە و پێویســتیشــی بەو پارەیە بێ. هەر بۆیە کەسـێک ڕاسـپێرێ و بڵێ کەمێکم پارە دەوێ و بیســتووشــمە کە تۆ ســەدهەزار دیناری زێڕت هەیە. ئەو زێڕانەم بە قەرز بدەیە. ئەودەم منیش دەڵێم خەلیفە ئەمن پیاوێکی هەژارم و هەرکەس عەرزی کردووی، من ســـەدهەزار دیناری زێڕم هەیە، درۆی عەرز کردووی. چونکە من نە درەمم هەیە و نە دینار. ئەو دەم خەلیفە دەمداتە دەســت دارۆغە و دەڵێ دا تێی هەڵدەن تا ڕاســتییەکەی دەڵێ و ئەو ســەد دینارەمان دەداتێ. کەوایە باشترین کار ئەوەیە کە ئەوەندە خۆم ئازار بدەم هەتا خووی پێ دەگرم. لەڕێوە هەسـتا و جلەکانی داکەند و قەمچییەکی هەڵگرت. پاڵپشـتێک لەوێ بوو، هەر قەمچییەکی لە پاڵپشـــتەکە دەدا و یەکی لە خۆی دەدا و دەیگوت: «ئاااای ئاااای بە خودا درۆیە هەر کەس دەڵێ ئەمن پیاوێکی هەژارم و هیچ شک نابەم درۆ دەکا.»

کە جیرانەکان ئەو قســـە و هاتوهاوارەیان بیســـت، لە نێو خۆیاندا گوتیان: «ئەو فەقیرە چی بە سـەر هاتووە، دەنگی قەمچی و لێدان و هاتوهاوار دێ، نەکا دزی چوو بێتە سـەر؟» ئیدی هەموویان هاتنە دەرێ و ڕوویان لە ماڵی خەلیفە کرد. سەیریان کرد درگاکە داخراوە! گوتیان: ڕەنگە دزەکان بە ســـەر دیوارەکەیاندا چووبنە ژووری. وا باشــە ئێمەش بە ســـەر سەربان و دیواردا بچینەوە ژووری.

وا بوو، بە ســـەر ســـەربان و دیوارەکەیاندا چوونە ژووری، کەچی ســـەیر دەکەن ئەوە

خەلیفە خۆی ڕووت کردووەتەوە و بە قەمچی لە گیانی خۆی بەربووە. دراوسێکان پرسیان کرد ئەوە چ بووە، خەلیفە بوا لە خۆت دەکەی؟ خەلیفە گوتی: «خەڵکینە ئێوە ئاگادار بن کە من کەمێکم دینار پاشەکەوت کردووە، لەوە دەترسم کە خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید پێم بزانێ و بانگم بکا و داوای پارەکەم لێ بکا. ئەمنیش حاشـــای لێ بکەم و ئەویش لێم بدا. ئێســـتا بۆیە خۆم ئازار دەدەم هەتا خووی پێ بگرم و بتوانم خۆمی لەبەر ڕاگرم. بازرگانەکان زۆری پێ پێکەنین و گوتیان خودا خێر و بەرەکەت نەدا بە خۆت و ماڵت ئەوشـــەو ئێمەت شـــێت کرد. ئینجا خەلیفە دەســـتی لە ئازاردانی خۆی هەڵگرت و هەتا بەیانی خرپ لێی خەوت. بەیانی کە لە خەو هەســـتا ویســـتی بچێ بە لای کارەکەیەوە. کە پارەکەی وەبیر هاتەوە، گوتی ئێســـتا ئەگەر ئەو پارەیە لە ماڵێ دانێم ڕەنگە دز بێ و بیدزێ. ئەگەر لەگەڵ خۆم بیبەم، هات و کەسێک پێی زانیم و وەدوام کەوت و لە شوێنێک بۆم چوو لە بۆسەوە. لە پڕدا پەلامارم داتێ و بمکوژێ و زێڕەکان بەرێ و بڕوا. چار نییە دەبێ فکرێکی باش بۆخۆم بکەمەوە. لە ڕێوە هەســـتا بەنێکی هێنا و وەک ملوانکە چنی و جێ جێ دینارە زێڕەکانی تێ خســـت و ســـەری دروو. پاشـــان لە ملی کرد. تۆڕ و قرتاڵە و گۆچانەکەی هەڵگرت و بە لەز خۆی گەیاندەوە قەراخ دیجلە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی هه‌شته‌د و سی و شه‌شه‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشکۆ! خه‌لیفه خۆی گه‌یانده ڕووباری دیجله. که گه‌یشته ئه‌وێ داوی هاویشتێ. که هێنایه‌وه ده‌رێ هیچی پێوه نه‌ببوو. له‌وێ ڕۆیشت و چووه شوێنێکی دیکه و هه‌ر ئاوا جێگۆڕکێی کرد و هه‌تا ڕێگای دانێک له شار دوور که‌وته‌وه. هه‌ر تۆڕی تێ هاویشت و هیچی به ده‌سته‌وه نه‌هات. ئینجا له به‌ر خۆیه‌وه گوتی: «به خودا له‌و جاره زیاتر تۆڕی تێ ناهاوم. جا یان گاڵ دێ یان په‌مۆ.» ئه‌وجار به‌و په‌ڕی تووڕه‌یی و به هێزێکی زۆره‌وه تۆڕه‌که‌ی حه‌وا دا. له حه‌وادانه‌که‌دا ملوانکه‌که‌ی له ملی داماڵا و له ئاوه‌که که‌وت. له تاوی زێڕه‌کانی تۆڕه‌که‌ی به‌ردا و به له‌ز جله‌کانی داکه‌ند و خۆی له ئاوه‌که هاویشت. هه‌ر ڕۆیشته خوارێ و هاته‌وه سه‌رێ، چووه خوارێ و هاته‌وه سه‌رێ و هیچ خه‌به‌رێک له زێڕه‌کان نه‌بوو. ئه‌وه‌نده هاته سه‌رێ و چووه‌وه له ئاوه‌که‌وه تا ته‌واو هیلاک بوو. بڕستی لێ بڕا. ناچار له ئاوه‌که هاته ده‌رێ و تۆڕه‌که‌ی ده‌رکێشاوه و چووه‌وه لای شته‌کانی، سه‌یری کرد جگه له قرتاڵه و گۆچانه‌که‌ی ته‌نانه‌ت جله‌کانیشی نه‌مابوو. له دڵی خۆیدا گوتی: «بۆیه ده‌ڵێن: 'کۆسه چوو بۆ ڕیش سمێڵیشی دانا.' ڕاست له منی ڕوو داوه.» دوای ئه‌وه تۆڕه‌که‌ی له خۆیه‌وه پێچا و قرتاڵه‌که‌ی له سه‌ر شانی دانا و ده‌ستی دا گۆچانه‌که‌ی. وه‌ک وشتر به وێرغه ده‌ڕۆیشت و هه‌ر چاوی له ڕاست و چه‌پی خۆی ده‌کرد و ڕای ده‌کرد. تۆز له سه‌ر و ڕوخساری نیشتبوو. ده‌تگوت دێوه و له زیندانی سوله‌یمان هه‌ڵاتووه. خه‌لیفه ڕاوچی ئاوای لێ هات.

خه‌لیفه هاڕوونه‌ڕه‌شید، بازرگانێکی گه‌وهه‌رفرۆشی بوو. ئیبنی قه‌رناسیان پێ ده‌گوت. هه‌موو بازرگان و ده‌ڵاڵه‌کان ده‌یانزانی که ئیبنی قه‌رناس بازرگانی خه‌لیفه‌یه و ئه‌و گه‌وهه‌ر و شته به بایخانه‌ی له به‌غدادا ده‌فرۆشران له پێشدا ده‌گه‌یشته ده‌ست ئیبنی قه‌رناس ته‌نانه‌ت ئه‌و که‌نیز و کۆیلانه‌ش که ده‌فرۆشران له پێشدا بۆ ئه‌ویان دبرد.

ڕۆژێک له ڕۆژان ئیبنی قه‌رناس له دووکانه‌که‌ی خۆی دانیشتبوو، گه‌وره‌ی دلاڵه‌کان هاته لای. که‌نیزێکی پێ بوو که هه‌تا ئه‌وڕۆ هیچ دیده‌یه‌ک شتی ئاوای نه‌دیتبوو. یه‌کێک له تایبه‌تمه‌ندییه باشه‌کانی ئه‌و ئه‌وه بوو، به سه‌ر هه‌موو زانست و پیشه‌یه‌کدا زاڵ بوو. شاره‌زایی له هه‌موو ئامێره مووسیقییه‌کاندا هه‌بوو. شێعری خۆش خۆش ده‌هۆنییه‌وه. کاتێک که‌نیزه‌که‌یان پێ ناساند، ئه‌ویش به پێنج‌هه‌زار دیناری زێڕی سوور کڕی و کراسێکی گرانبایی به هه‌زار دینار بۆ کڕی و له‌به‌ری کرد و هێنای بۆ لای خه‌لیفه هاڕوونه‌ڕه‌شید. خه‌لیفه ئه‌و شه‌وه له‌گه‌ڵ که‌نیزه‌که بوو، ڕاده‌ی زانست و شاره‌زایی ئه‌وی تاقی کرده‌وه و بۆی ده‌رکه‌وت له هه‌موو بارێکه‌وه بێ هاوتایه. ئه‌و که‌نیزه ناوی قووه‌تولقلووب بوو، بسکی

تاتا و لوولی بە جۆرێک بوو کە وەک شاعیر دەڵێ:

قەف قەفی بسکت ئەزیـــــــــــــــــزم، بێت و میوانی ملم بێ
هێنـد بە هێزە دەســـتی بســـکـت، جـا کوا من ڕزگـارم دەبێ
هـــــێنـد لە بەنـدی ئەوەدام مـن بەنـدی تۆ بم، نـازدارەکەم
لێم ببوورە خۆشەویـــــــــــــــستم قەت نامەوێ خۆ ڕزگار کەم

کە بوو بە ڕۆژ خەلیفە هارووونەڕڕەشـید بانگی ئیبنی قەرناسـی کرد و شـەشـەهەزار دیناری نرخی کەنیزەکەی دایە. ئیدی دڵی چووە سەری و سەرقاڵی ئەو بوو. خاتوو زبێدی ئامۆزای و کەنیزە تایبەتەکانی لە بیر چووەوە و مانگێکی تەواو لە دیوی کەنیزەکە نەهاتە دەرێ، بۆ نوێژی هەینی نەبێ. گەورەکانی دەوڵەت ئەو شـتەیان پێ ناخۆش بوو. پەنایان بردە بەر جەعفەری بەرمەکی وەزیر بۆ ڕاوێژ. جەعفەر ڕاوەسـتا هەتا ڕۆژی هەینی. لە مزگەوتی جامیعە خۆی گەیاندە هارووونەڕەشید و قسـە و باسێکی زۆر هێنا گۆڕێ. هەتا هێنایە سـەر باسـی ئەڤین و خۆشـەویسـتی. بۆ ئەوەی خەلیفە بدوێنێ. خەلیفە گوتی: «جەعفەر، دەازنم بە تەمـای بڵێی چی. بە خودا بە دەسـت خۆم نییە و دڵم بە داوی خۆشـەویسـتییەوە بووە. نازانم کۆتاییەکەشـی بە کوێ دەگا.» جەعفەری وەزیر گوتی: «خەلیفە گەورەم، لە بیرت نەچێ ئەو کەنیزە واتە قووەتولقلووب کەنیزی تۆیە. جوان نییە ئەتۆ ئاوا گیرۆدەی بیت. ئەمن شـتێکی دیکەت پێ دەڵێم کە قازانجی تۆ لەودایە. ئەویش ئەوەیە کە باشترین شت بۆ پاشایان ڕاو و خۆشگوزەرانی و شایی و شادییە. ئەگەر تۆ هەستی بڕۆی بۆ ڕاو و ماوەیەک خۆت سەرقاڵ بکەی ڕەنگە ئەو کەنیزەت لە بیر بچێتەوە. خەلیفە گوتی: «جەعفەر قسـەکەت جوانە و ئاماژەت بە شـتێکی جوان کرد. وە خەبەرت هێنام.» ئیدی هەرکە لە نوێژەکە تەواو بوون، هەر لەوێ لەگەڵ جەعفەر سوار بوون چوون بۆ گەشت و گەڕان.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خەلیفە هارووونەڕرەشید لەگەڵ جەعفەر هەر ئاوا دەڕۆیشتن، تا گەیشتنە دەشتێک. خەلیفە و جەعفەر هەر کامەیان سواری ئێسترێک ببوون و لە پێش سوارەکانەوە دەڕۆیشتن و خەریکی قسە و باس بوون. خۆرەتاو، وڵاتی زۆر گەرم کردبوو. توونییەتی دەستی لە ئەوکی خەلیفە توند کردبوو. هەر چاوی بەولا و لادا دەگێڕا. شتێکی ڕەشی لە سەر تەپکێک دیت. بە جەعفەری گوت: «ئەرێ ئەتۆش شتێک لەو سەر تەپکە دەبینی یان نا؟» جەعفەر گوتی: «بەڵێ ئەی خەلیفەی جیهان، منیش شتێکی ڕەش لەو سەر تەپکە دەبینم. خەلیفە گوتی: «ڕەنگە کەسێک بێ و ئاگای لە بێستان بێ. بە دڵنیایی ئاوی پێ شک دێ و ئاوی لێ دوور نییە.» جەعفەر گوتی: «ئەوە من دەچم بۆ لای و ئاوت بۆ دێنم.»

خەلیفە هارووونەڕرەشید گوتی: «یەستری من لە ئی تۆ خۆشڕەوتترە. ئەتۆ لێرە بە تا لەشکر دەگاتێ. ئەمن بۆخۆم دەچم بۆ لای و لەوێ ئاو دەخۆمەوە و زوو دەگەڕێمەوە. ئیدی هارووونەڕرەشید توند یەسترەکەی ئاژووت و وەک با خۆی گەیاندە سەر ئەو تەپکەی، ڕەشاییەکەی لە سەر دیار بوو. کە لێی نیزیک بووەوە سەیری کرد ئەوە خەلیفە ڕاوچی بە ڕووتی لەوێ ڕاوەستاوە. تۆڕێکی لە خۆیەوە پێچاوە و چاوەکانی وا سوور بوون وەک ئاگر داییسان. کووڕ ببۆوە و خوڵاوی دەتگوت دێو و درنجە. خەلیفە هارووونەڕرەشید سڵاوی لێ کرد و ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی داوە. بەڵام ئەوەندە تووڕە بوو ئاگر لە زاری دەهاتە دەرێ. خەلیفە هارووونەڕرەشید لێی پرسی: «ئەرێ کاکە ئاوت پێیە؟» خەلیفە گوتی: «ئەوە تۆ شێتی یان من بە شێت دەزانی، هەها دیجلە لە پشت ئەو کێوەیە.» ئیدی خەلیفە هارووونەڕرەشید ئەسپەکەی تاو دا و چووە سەر چۆمی ئاوی خواردەوە و یەسترەکەشی ئاو دا. دوای ئەوە گەڕاوە بۆ لای خەلیفە ڕاوچی و لێی پرسی: «ئەرێ کاکە ئەتۆ بۆ لێرە ڕاوەستاویی و چ کارەی؟» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «کاکە ئەو پرسیارەت لە پرسیارەکەی دیکەت سەیرترە کە داوای ئاوت کرد.»

بۆ مەگەر ئەو تۆڕ و شتە بە سەر شانمەوە نابینی؟» خەلیفە هارووونەڕرەشید گوتی: «کەوایە ڕاوچی.» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «بەڵێ ڕاوچیم.» خەلیفە هارووونەڕرەشید گوتی: «ئەی ئەوە جلوبەرگ و پێچ و کڵاوەکەت کوا؟» سەیر بوو ڕێک ئەو شتانەی لێی دزرا بوو ئەوانە بوون کە خەلیفە گوتی.

خەلیفە ڕاوچی کە ئەوەی بیست، شکی تێ کرد، کە ئەو شتەکانی هەڵگرتبێ. خێرا وەک برق لە بەرزاییەکە هاتە خوارێ و لغاوی یەسترەکەی هارووونەڕرەشیدی گرت و گوتی:

«کاکە ئەو شــتانم دەوە، تاقەتی گاڵتە و جەفەنگم نییە. هاڕوونەڕەشــید گوتی: «بە خودا من جلوبەرگی تۆم نەدیوە و ناشزانم لە کوێن.» خەلیفە هاڕوونەڕەشید دموچاوی پان و دمی چکۆلە بوو. خەلیفە ڕاوچی پێی گوت: «پێم وا بێ تۆ زووڕناژەنی. کارم بەوەی نەداوە هەرچییەک بی جلەکانم دەوە، دەنا بە خودا بەو گۆچانە ئەوەندەت لێ دەدەم بە خۆتدا بڕی.»

هاڕوونەڕەشــید کە گۆچانەکەی لە دەســت خەلیفە ڕاوچیدا دیت، لە دڵە خۆیدا گوتی: «بە خودا ئەمن دەرەقەتی ئەو ســـواڵکەرە نایەم و بەرگەی زەربەی ئەو گۆچانەی ناگرم. کەوایەکی حەریری لەبەردا بوو، دایکەند و دای بە خەلیفە ڕاوچی و گوتی: «ها ئەو کەوایە بۆ تۆ. لە جیاتی جلەکانی خۆت. خەلیفە ڕاوچی چاوێکی لەمدیو و ئەودیوی کەواکە کرد و گوتی: «حەح جا ئەوە چییە؟ جلەکانی خۆم دەی ئاوایان دێنا. خەلیفە هاڕوونەڕەشـــید گوتی: «جــارێ ئەوە بکە بەرت، هەتــا جلەکــانی خۆت بۆ دەبینمەوە.» خەلیفە ڕاوچی کەواکەی خەلیفەی لە بەر کرد. چونکە کەواکە درێژ بوو بۆ بەری نەدەبوو. وێردێکی بە لێواری قرتاڵەکەیەوە کردبوو. بەو وێردە بە ئەندازەی سێ بستی لە ئاتەگی کەواکە بڕی و کەواکە هاتە ســـەر چۆکی. دوای ئەوە ڕووی لە هاڕوونەڕەشـــید کرد و گوتی: «کاکی زووڕناژەن، ئەرێ ئەتۆ بەو زووڕنا لێدانە مانگێ چەندە دەکەوی؟» خەلیفە گوتی: «ئەمن مــانگێ دە دینـار زێڕی ســـوور دەکەوم.» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «حەح فەقیرە، وەڵا پێم ناخۆشـــە، قەســـەم بە خودا ئەمن ڕۆژێ دەدینار دەکەوم. ئەگەر پێت خۆشـــە وەرە ببە بە شــاگردی من و کارم لەگەڵ بکە با فێری ماســـیگرتنت بکەم و بتکەم بە شـــەریکی خۆت. هەموو ڕۆژێ پێنج دینارت دەدەمێ. ئەگەر مامۆســـتاکەت قســـەیەکیشـــی کرد ئەمن بەو گۆچانە وەڵامی دەدەمەوە. خەلیفە هاڕوونەڕەشید گوتی: «زۆر باشە پێم خۆشە.» چوونە قارخ چۆمی، خەلیفە ڕاوچی گوتی: «هەر ئێســـتا لەو کەرە دابەزە با فێری ماســـیگرتنت بکەم.» خەلیفە هاڕوونەڕەشـید لە یەسـترەکەی دابەزی. یەسـترەکەی بەسـتەوە و خۆی هەڵکرد. خەلیفە ڕاوچی بە هاڕوونەڕەشیدی گوت: «زووڕناژەن ئەو تۆڕەی ئاوا بە ســەر دەسـتی ڕاسـتتدا دە و لە ئاوا لە دیجلەی هاوێ. خەلیفە هاڕوونەڕەشـید بەو جۆرەی کرد کە خەلیفە ڕاوچی فێری کردبوو. ئینجا تۆڕەکەی لە دیجلە هاویشـت و ماوەیەک ڕاوەسـتا. دوای ئەوە تۆڕەکەیان دەرکێشـــا. هێند قورس بوو نەیان دەتوانی دەری کێشـــن. خەلیفە ڕاوچی گوتی: «زووڕناژەنی بەدفەڕ، ئەگەر کەواکەتم لە لە جێی جلەکانم لێ ئەســـتاندی، ئێسـتا ئەو تۆڕەم بپچڕێ کەرەکەت لێ دەسـتێنم و ئەوەندەشـت تێ هەڵدەدەم ڕێگەی ماڵێ نەزانی.» خەلیفە هاڕوونەڕەشـــید گوتی: «وەرە با پێکەوە بیکێشـــین. ئیدی پێکەوە بە زەحمەتێکی زۆر تۆڕەکەیان کێشا دەرێ. کە سەیران کرد پڕ بوو لە ماسی ڕەنگاوڕەنگ.

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! تۆڕەکە پڕ بوو لە ماســـی ڕەنگاوەنگ. خەلیفە ڕاوچی بە خەلیفە هارووننەڕەشـــیدی گوت: «زوڕناژەن، هەر چەند زۆر ناحەز و دزێوی بەڵام ئەگەر فێری ماسیگرتن بی ماسیگرێکی بە توانا دەبی. ئێستا تۆ سواری کەرەکەت بەو بچووە بۆ بازار دوو جەواڵ بێنە با ماســییەکان لە کەرەکەی تۆ نێین. تەرازوو ســەنگ هەیە لەگەڵ خۆمان دەیبەین. ئەتۆ هیچ کارێکت نییە جگە لەوەی کە تەرازووەکەی هەڵدەکێشــی و ماســییەکان دەکێشــی. ئەو هەموو ماسـییە بایی بیسـت دیناریش دەبێ. ئێسـتا بڕۆ بۆ جەواڵەکان بەڵام زوو بێیەوە، ڕانەوەسـتی.» خەلیفە هارووننەڕەشـید سـواری یەسـترەکەی بوو. خەلیفە ڕاوچی لە لای ماسییەکان بە جێ هێشت. هەتا گەیشتەوە لای جەعفەر و وان، هەر بە خۆی و ڕاوچی پێکەنی. جەعفەر کە چاوی بە خەلیفە کەوت بە پێکەنینەوە دەهاتەوە گوتی: «ئەوە تۆ چووی ئاو بخۆیەوە، کەچی وادیارە چووی بۆ ناو باخ و باخات بۆ کەیف و خۆشـــی و ســـەیران. خەلیفە لە خودای تەعالام دەوێ خۆشـــی و شـــادیت بەردەوام بکا و خەم و نارەحەتیت لێ دوور بکاتەوە. دەی چ بوو بۆ وا دەرەنگ هاتیتەوە؟» خەلیفە پێکەنی و پێی گوتن: «تووشی شتێکی سەیر بووم و کارێکی سەیرم بۆ هاتە پێشێ.»

ئیدی خەلیفە بۆی گێڕانەوە کە تووشـــی خەلیفە ڕاوچی بووە و وەیزانی ئەو جلەکانی دزیوە و کەواکەی خۆی داوەتێ و بە کورتی ئەوەی بەســـەری هـاتبوو، هەمووی بۆ گێڕانەوە. جەعفەر گوتی: «خەلیفە بە خودا بە تەمـا بووم داوای ئەو کەوایەت لێ بکەم. بەڵام ئێستا دەچم لە ڕاوچی دەکڕم.» خەلیفە گوتی: «جەعفەر کوڕە سێ بستی لە ئاتەگی کەواکە دەرهێنا. بەڵام جەعفەر، ماســـییەکی زۆرم گرتووە ئەوە لە لای مامۆســـتاکەم واتە خەلیفە ڕاوچییە، ئێســـتا چاوەڕێی منە دوو جەواڵ بەرم و بچم ماســـییەکان لە یەســـترەکە دەین و بیبەین لە بازاڕ بیفرۆشین. پارەکەش بەش کەین.» جەعفەر گوتی: «ئەمن کڕیارتان بۆ دێنم ماســـییەکانتان لێ بکڕێ.» خەلیفە هارووننەڕەشـــید گوتی: «جەعفەر قەســـەم بە ڕووحی باپیران هەرکەس بچێ یەکدانە لەو ماســـییانەی کە لە لای مامۆســـتاکەم، خەلیفە ڕاوچییە بۆم بێنێ یەک دانە دیناری زێڕی سوور دەدەمێ.»

ئەو هەواڵەی بە نێو کۆیلەکانی نێو لەشـــکردا بڵاو بووەوە، کۆیلەکان هەڵاتن بۆ لای خەلیفە ڕاوچی و دەوریـان دا. خەلیفە ڕاوچی چـاوەڕێی خەلیفە هـارووننەڕەشـــید بوو. کۆیلەکان لە چوار لاوە تێی ئاڵان و ماســـییان لێ دەکڕی و لە پێچی[1] خاوێنیان تێ دەپێچا. لە سەر ماسی بە شەڕ دەهاتن. خەلیفە ڕاوچیش دەیگوت قسەی تێدا نییە ئەو ماسییانە لە

---

[1]. پێچ ئەو کوتە قوماشەیە لە دەوری کڵاوەکەی سەریان دەپێچا.

ماسییەکانی بەهەشتن. ئەوجار دوو ماسی بە دەستی ڕاستی گرت و دوو ماسیش بە دەستی چەپی و چووە ناو ئاوەکەوە و هەتا سینگی ڕۆیشتە خوارێ و دەیگوت: «خودایە تکات لێ دەکەم هەر ئێستا شەریکەکەم بگەیەنەوە. لەو جەنگەیەدا کۆیلەیەک کە وە دوایە کەوتبوو. گەیشتێ. سەیری کرد ماسی نەماوە. چاوێکی لەملا و لەولا کرد. خەلیفەی دیت لە ناو ئاوەکەدا بوو. ماسییەکانیشی بە دەستەوە بوو. هەرای کرد، وەرە دەرێ. ڕاوچی گوتی: «ماسی نەماوە برۆ بە دوای کاری خۆتدا.» کۆیلەکە چووە پێش و گوتی: «ماسییەکم بۆ بێنە پارەکەشیت دەدەمێ.» خەلیفە گوتی: «ئەوە تۆ گەوجی دەڵێم ئەو ماسییانە نافرۆش و ئەوەندەشی لە سەر مەڕۆ.» کۆیلە گۆپاڵی لێ ڕاست کردەوە و بۆی چووە پێشێ. خەلیفە ماسییەکانی بۆ هاویشت و گوتی: «وا مەکە ها ئەوە ماسییەکان، دیاری لە شەڕ باشترە.» ئیدی کۆیلەکە ماسییەکانی هەڵگرت و دەستی لە گیرفانی ڕاکرد. درەمێکی تێدا نەبوو. بە ماسیگرەی گوت: «شانست نییە، یەک دینار و درەمم پێ نییە. بەڵام وەرە بۆ دارولخەلافە و بڵێ کارم بە خواجە سەندەلە، خزمەتکارەکان دەتهێنن بۆ لای من. ئەگەر بێی بۆ لای من ئەوە بە ناهۆمێدی بەڕێت ناکەم. خەلیفە گوتی: «ئەوڕۆ ڕۆژێکی بە فەڕ بوو، هەر لە سەرەتاوە دیار بوو.» ئەوجار ماسیگرە تۆڕەکەی هاویشتە سەر شانی و بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ. ڕۆیشت تا گەیشتە ناو شار. خەڵک کەواکەیان دەدیت و سەیریان دەکرد. وا بوو ڕاوچی بە کۆڵانێکدا ڕۆیشت کە دووکانی جلدرووی خەلیفەش لەو کۆڵانەدا بوو. هەرکە جلدرووەکە کەواکەی خەلیفەی هاروونەڕڕەشیدی لە بەر خەلیفە ڕاوچیدا دیت. لێی پرسی: «خەلیفە ئەوە ئەو کەوایەت لە کوێ بوو؟» ماسیگرە گوتی: «ئەمن ئەوەم لە کەسێک وەرگرت و فێری ماسیگرتنم کرد و ئەویش کۆیلەیی منی قەبووڵ کرد. ئیدی منیش لێی خۆش بووم و دەستیم نەپەڕاند. چونکە ئەو جلەکانی منی دزی بوو. هەر بۆیە ئەویش ئەو کەوا جوانەی خۆی لە جیاتی جلەکانم دا بە من. دروومانکار زانی ئەوە خەلیفە هاروونەڕڕەشید تووشی بووە و گاڵتە و جەفەنگی لەگەڵ کردووە و ئەو کەوایەشی داوەتێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دروومانکاری خەلیفە هارپوونەڕەشید زانی کە خەلیفە گاڵتە و جەفەنگی لەگەڵ کردووە. خەلیفە ڕاوچی چووەوە ماڵەکەی خۆی.

خەلیفە هارپوونەڕەشید هەر لەبەر ئەوە چووبووە دەرێ هەتا ماوەیەک لە قووەتولقلووب دوور کەوێتەوە و سەرقاڵی شتێکی دیکە بێ.

زبێدەی خێزانی خەلیفە کە تاریفی قووەتولقلووبی زانی و بیستییەوە کە خەلیفە تەواو هۆگر و شەیدای بووە. لە بەخیلیان کە پیشەی ژنانە. ئێرەی بە قووەتولقلووب برد. لە خەو و خواردن بوو. دایمە چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بوو کە خەلیفە بڕواتە دەرێ و داوێک بۆ قووەتولقلووب بنێتەوە. کاتێک زانی کە خەلیفە چووە بۆ نێچیرگە بە کەنیزەکانی گوت بە فەرشی حەریر وڵاتی پڕ فەرش کەن و خواردن و هەڵوا دانێن و بەنگیش لە هەڵواکە بکەن. بە یەکێک لە کەنیزەکانی گوت بچووە بڵێ خەلیفەژن زبێدە بانگهێشتی کردووی بۆ میوانی و پێشی بڵێ کە خەلیفەژن خواردوویەتەوە و حەزی لە بەزم و ئاهەنگ و گۆرانی خۆشە. قووەتولقلووب لەجێوە هەستا، ئیدی نەیدەزانی چ داوێکیان بۆ ناوەتەوە. لەگەڵ ڕاسپاردەکەی خاتوو زبێدە ڕۆیشت هەتا چوونە هەنتەشی خاتوو زبێدە. کڕنۆشی برد و بە پێوە ڕاوەستا و سڵاوی کرد و گوتی: «سڵاو لە داپۆشەری پایەبەرز.» خودای تەعالا بەبەخت و هاتت زیاد کا. لەو جەنگەیەدا خاتوو زبێد چاوی لێ کرد و ویشکی جوانی و ڕێکوپێکی و دەلالی بوو، سەیری کرد، جوانیکە کە هیچ وێنەگەرێ شتی وای بە زەیندا نەهاتووە و هیچ نەققاشێ تا ئێستا شتی وای نەقش نەکردووە و بسک و کەزییەی کاری کەمند دەکا و چاوی جیهان بە دیتنی بە مۆلەق دەوێستێ و مانگی چاردە لە ئاستی دەچەمێتەوە.

چرای ڕوخساری، مۆمی شەوی ئاشقانە
لێوی ئاڵی ئەو، شەرابی مەیپەرستانە
باڵای، باڵای بەرزی بەختی بەختەوەران
داوی کەزییەکەی کەمەندی جوانپەرستان
شەکر ئێرەی بە خوێنی شیرینی دەبا
عەقیق کاڵ دەنوێنێ لە ئاست لێوی ئاڵیدا

خاتوو زبێد کە چاوی پێی کەوت بەخێرهاتنی کرد و گوتی: «ئەی قووەتولقلووب دانیشە با تاوێک بە ئامرازی خۆشی، خۆشی ڕابوێرین و بە دیداری جوانی تۆ شاد و دلخۆش

بین.» قووەتولقلووب دانیشـــت. هەر بە دانیشـــتنەوە دەفەکەی هەڵگرت و بە جۆرێک تێی چڕاند کە وڵاتی وە ســـەما خســـت. ئینجا دەفی دانا و چەنگەکەی هەڵگرت. دوای ئەوە چەنگەکەی دانا و دەستی دا عوودەکە و تارەکانی توند کردەوە، لە پەنا خۆی گرت و چوار شـێوازی جیای ژەنی، گورانییەکی لەگەڵ گوت کە تەواوی دانیشـتوانی وە جۆش خسـت. پاشان ئەو دوو بەیتییەی خوێندەوە:

دەڵـێـن بەهەشــــت هەیە پــان و بەریــنە
پڕ لە مەی ئاڵ و حـــــــــــــــــۆری خۆێنشیرینە
مــن کە لــێــرە مەی ئــاڵ و حــۆری وام بــێ
نایدەم بە بەهەشتی بەرین ئەم ژیـــــــــــــــنە

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی هەشتسەد و چلەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــكۆ! كە قووەتولقلووب لە بەر چاوی خاتوو زبێدە عوودەكەی لێ دا و شێعرەكەی خوێندەوە، ئینجا هەستا دەستی بە سەما كرد. سەمایەكی وای كرد كە خاتوو زبێدە هۆگری بوو. لە دڵە خۆیدا گوتی: «ئەو كوڕە مامەم لە خۆڕا ئاوا گیرۆدەی نەبووە و بۆ ئەوە نابێ سـەركۆنەی كەی ناحەقی نییە.» دوای ئەوە قووەتولقلووب كڕنۆشـی برد و دانیشـــت. خواردن و هەڵوایـان هێنـا. ئەو هەڵوایەی كە بەنگیـان تێ كردبوو لە پێش قووەتولقلووبیـان دانـا. قووەتولقلووب لەو هەڵوایەی خوارد و هێشـــتا هەڵواكە تەواو لە گەدەیدا هەرس نەببوو كە كاری خۆی كرد و سـەری لە گێژەوە هات و بێ هۆش بوو، بە لادا هـات. خـاتوو زبێـدە گوتی: «بیبەن لە فلان دیودا داینێن.» خـاتوو زبێـدە چی بە كەنیزەكان گوتبوو، جێبەجێیان كرد. ئینجا پێی گوتن بچن سندووقێكم بۆ بێنن و قوڵكەیەكی قەبراسا هەڵكەنن. لە نێو خەڵكیشدا دەنگۆ بڵاو كەنەوە كە قووەتولقلووب لە پڕدا مردووە و هەركەس بڵێ قووەتولقلووب زیندووە دەكوژرێ.

وا بوو، لەو كاتەدا خەلیفە لە ڕاو گەڕاوە و یەكەم قسـەی ئەوە بوو لە قووەتولقلووبی پرسـی. یەكێك لە خزمەتكارەكان چووە پێش و كڕنۆشـی برد و گوتی: «تەمەنی خەلیفە درێژ بێ، قووەتولقلووب پارووی لە گەرووی گیرا و مرد.» خەلیفە گوتی: «كۆیلەی گلاو، خودای تەعالا قەت هەواڵی خۆشـت بە گوێدا نەدا.» دوای ئەوە هەسـتا هاتە كۆشـك و هەركەسی دی، هەواڵی قووەتولقلووبی لێ پرسی. ئاخری هێنایان سەر قەبرە قەستینەكە و پێشانیان دا. كە چاوی بەو قەبرە كەوت دەستی كرد بە هاتوهاوار و گریان و ئەوە بەیتەی خوێندەوە:

بۆیە كانی زۆرە زۆر شـــــــین و ڕۆ بۆ باخ دەكا
چون مەلی خۆشـخوێنی نەمـا و لە شـەققە بـاڵی دا
بێ ئەو مەلە باخ لە لای كەلاوەیەكی چـــــــۆلە
لە جـێـی مەلـی بـاڵ ڕەنـگـیـن قەلـێـكـی ڕەش و حـۆلە

دوای ئەوە مات و مەلوول بوو.

زبێـدەش كـاتێ زانی خەلیفە بـاوەڕی كردووە، قووەتولقلووب مردووە، نـاردی قووەتولقووبیان هێنا و لە سندووقیان خست و بە خزمەتكارەكەی گوت. خێرا ئەو سندووقە بەرە لە بازاڕ بیفرۆشـە. بەڵام قەراری لەگەڵ بكە كە بەو مەرجە پێت دەفرۆشـم سـەرەكەی هەڵنەپچڕی. كە فرۆشـتت پارەكەشـی بكە بە خێر. خزمەتكارەكە سـندووقەی هەڵگرت و

بردی بۆ بازاڕ. با ئەو بڕوا....

خەلیفە ڕاوچی کە ڕۆژی لێ بووەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوڕۆ وا چاکە بچم بۆ لای ئەو خواجە ســەندەڵەی دوێنێ ماســییەکەی لێ کڕیم. بۆخۆی گوتی وەرە بۆ دارولخەلیفە پارەکەت دەدەمێ. ئیدی خەلیفە ڕاوچی لە ماڵ هاتە دەرێ و بەرەو دارولخەلیفە چوو. کە گەیشتە کۆشک سەیری کرد، دەستەیەک لە کۆیلە و کاردارەکان ڕاوەستاون و دەستەیەک دانیشــتوون. جوان چاوێکی پێدا گێڕان. خواجە ســەندەل چاوی بە خەلیفە ڕاوچی کەوت و ناســییەوە، ئەویش ئەوی دیت و ناســییەوە و گوتی: «ڕەشــۆ، قەول و بەڵێن ئاوا نابێ.» خواجە ســـەندەل پێکەنی و دەســـتی لە گیرفانی ڕاکرد شـــتێکی بداتێ. لە پڕدا بوو بە هەراوهوریا. خواجە ســـەندەڵ ســـەری هەڵێنا دیتی ئەوە جەعفەری وەزیر لە لای خەلیفە هاتووەتە دەرێ و ئەوانەی کارێکیان هەیە تێی هالاون. خواجە سـەندەلیش هەستا چوو بۆ لای جەعفەر و ســەرقاڵی قسـە بوون. خەلیفە ماوەیەکی زۆر ڕاوەستا و خواجە ئاوڕی لێ نەداوە. خەلیفە ڕاوچی توورە بوو، دەسـتی بۆ ڕاداشـت و هەرای خواجە سـەندەلی کرد و گوتی: «هۆی ڕەشـــۆک، وەرە جارێ من بەڕێ کە با بڕۆم.» خواجە ســـەندەل گوێی لە دەنگی بوو، بەڵام لەبەر جەعفەر لە ڕووی هەڵنەهــات ئــاوڕی لێ بــداتەوە. درێژەی بە قسەکانی دا لەگەڵ وەزیر. خەلیفە ڕاوچی قاوی کرد و گوتی: «هۆی کۆیلۆک، بۆ خۆت کەڕ دەکەی و مافی خەڵک نادەی؟ خودا ئەو کەســـانە ترۆ کا وا شـــت لە خەڵک دەســـتێنن و دوایەش خۆیان گێل دەکەن.» خواجە دیســـان هەرچەند گوێی لێ بوو، خۆی کەڕ کرد و لە ڕووی هەڵنەهات قســـە بە جەعفەر ببڕێ. وەزیریش ئاگای لێ بوو کە ئەو دەســـت بۆ لای ئەوان ڕادەدێرێ و لەگەڵ خواجە سەندەلییەتی. بەڵام نەیزانی دەڵێ چی. بە خواجە سەندەلی گوت: «ئەو هەژارە چی لە تۆ دەوێ؟» ســـەندەلی خزمەتکار گوتی: «وەزیر، مەگەر ئەوە ناناسی؟» وەزیر گوتی: «ئەمن ئەوە لە کوێ بناسم. خۆ لەوڕۆ زیاتر نەمدیوە.» خزمەتکارە گوتی: «وەزیر ئەوە هەر ئەو ڕاوچییەیە وا لە قەراخ دیجلە ماســـییەکانیان لێ تالان کرد. بەڵام کاتێک من گەیشتمێ چی وای پێ نەمابوو. لە نێو ئاوەکە ڕاوەستابوو چوار ماسیشی بە دەســـتەوە بوو. ئەمن نەمویســـت بە دەســـتی خاڵی بێمەوە لای خەلیفە، پێم گوت: «ئەو ماســیيانەم دەیە، پارەکەیت دەدەمێ، کە ماســییەکانی دامێ دەســتم لە گیرفانم دا هیچم پێ نەبوو، بیدەمێ. گوتم ســـبەینێ وەرە دارولخەلیفە دەتدەمێ. ئێســـتا کە هات دەســـتم برد پارەکەی دەمێ کەچی ئەتۆ هـاتییە دەرێ. ئەمن لە خزمەت تۆدا بووم و ئەویش لە مێژە چاوەڕێیە بۆیە لێم توورەیە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی هەشتسەد و چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە خواجە بەسەرهاتەکەی خۆی لەگەڵ خەلیفە بۆ جەعفەری وەزیر گێڕاوە، جەعفەر بزەیەکی هاتێ و گوتی: «ئەی سەرکاردار مەگەر تۆ ئەو ناناسی وا داواکەی بەجێ ناهێنی؟» سەندەلی کاردار گوتی: «ناوەڵلا من ناینسام.» وەزیر گوتی: «ئەوە شەریک و مامۆستای خەلیفە هاروونەڕەشیدە. چونکە ئەوڕۆ خەلیفە ناڕەحەت و خەمبارە، ئەو ڕاوچییە ڕەنگە ببێتە هۆی سووکبوونی خەمی خەلیفە و دڵخۆشی کا. ئێستا تۆ لێرە بیخافڵێنە هەتا من دەچم لەگەڵ خەلیفە قسە دەکەم، بەشکوو بیبەمە لای خەلیفە. بە بۆنەی ئەوەوە خەم و خەفەت لە دڵی خەلیفە بچێتە دەرێ و تۆزێک خۆشحاڵ بێتەوە و خەمی قووەتولقلووبی لە دڵ بچێتە دەرێ. شتێکیش بدا بەو بژیوی خۆی پێ دابین بکا و خێرێکیش بە تۆ بگا.»

جەعفەری وەزیر گەڕاوە لای خەلیفە و سەندەلی کارداریش بە کۆیلەکانی گوت کە خەلیفەی ماسیگر لە قسە بگرن. خەلیفەی ماسیگرە گوتی: «ڕەشۆک خێری چاکت کرد، ئەمن هاتووم قەرزەکەت لێ بستێنمەوە، ئەتۆ کۆیلەت لە من خرکردۆتەوە لە قسەم گرن؟» جەعفەری وەزیر چوو بۆ لای خەلیفە. سەیری کرد، دانیشتووە و سەری داخستووە، مات و مەلوول لە بەر خۆیەوە ئەوە شێعرەی دەگوتەوە:

مانگ هات و میوانم بوو، ڕۆیی و بێ تاوی کردم
وەکوو خەونێکی خۆش، ساتێ سەرخۆشی کردم
بەرگەی ئەو داخە ناگرم سەبر و قەرارم نییە
سەبر و قەراری بردم، بێ ئەو تاقەتم نییە

جەعفەری وەزیر سڵاوی لە خەلیفە کرد. خەلیفەش سەری هەڵێنا و سڵاوەکەی ئەستاندەوە. جەعفەر گوتی: «ئەگەر ڕێم بدەی ئەو نۆکەرەی خۆت شتێکت عەرز دەکا.» هاروونەڕەشید گوتی: « مەترسە چی دەڵێی بیڵێ. ئەتۆ کۆڵەکەی قایمی خەلافەتی.» جەعفەر گوتی: «ئەمن لێرە کە چوومە دەرێ بە تەما بووم بڕۆمەوە ماڵێ، شەریک و مامۆستاکەی تۆم دیت لە بەر دەرگا ڕاوەستابوو، گلەیی لە تۆ دەکرد دەیگوت ئەمن ئەوم کرد بە شەریکی خۆم و فێری ماسیگرتنم کرد، چوو جەواڵ بێنێ ماسییەکانی تێکەین و بیبەین بۆ بازاڕ کەچی چاوم پێی نەکەوتەوە، خۆ نە شەریکایەتی ئاوا دەبێ و نە داب و دەستووری شاگردی و مامۆستایی ئاوا دەبێ.» خەلیفەی زەمان ئەگەر تۆ لەگەڵی شەریکی ئەوە هیچ ئەگەر شەریک نی پێی بڵێ بچێ لەگەڵ یەکی دیکە ببێتە شەریک. خەلیفە

هارووونەڕەشید کە ئەو قسەیەی بیست بزەیەکی هاتێ و کەمێک خەمی سووک بوو گوتی: «تۆ حەقی خەلافەت پێم بڵێ بە ڕاســـتە یان گاڵتەم لەگەڵ دەکەی؟» جەعفەر گوتی: «بە گیانی خەلیفە بە ڕاستمە و ئەوە لە بەر دەرگا وێستاوە.» خەلیفە گوتی: «جەعفەر بە خودا ویستەکەی وەدی دێنم جا ئەگەر دڵی لێم ئێشا بێ یان شتێکی بە لامەوە هاتبێ، ئەوە بۆی قەرەبوو دەکەمەوە و حەقەکەی پێ دەگا.» دوای ئەوە خەلیفە هارووونەڕەشــــید گوتی: «کاغەزێکی وەرگرت و کوت کوتی کرد. بە جەعفەری گوت: «بیســـت جۆرە چاکە، جا لە دینارێکەوە بگرە هەتا هەزار دینار و لە کەمترین پلەوە بگرە هەتا پلەکانی خەلافەت و بیست جۆرە ســزا لە لێدانەوە بگرە هەتا کوشــتن بنووســە. جەعفەر تەواوی ئەوانەی بەو پێیەی خەلیفە گوتبووی نووســـی. دوای ئەوە خەلیفە فەرمووی: «جەعفەر، بە ڕووحی پـاکی باپیرانم قەســـەم و ســـوێند بەو نیزیکییەی کە من لەگەڵ حەمزە و عەقیل هەمە، خەلیفە ڕاوچی بانگ دەکەم و پێی دەڵێم یەکێک لەو کوتە کاغەزانە هەڵگرە، کامەیانی بۆ دەرکەوت ئەوە پێی دەگەیەنم. جا خۆی و شـانسی. ئەگەر خەلافەتیش بێ ئەوە بۆخۆم لادەچم و ئەو لە جێی خۆم دادەنێم. ئەگەر کوشـتن و سزا و پەڕاندنیش بێ ئەوە جێبەجێی دەکەم. ئێستا بڕۆ ئەوە ڕاوچییە بێنە ئێرە.» کە جەعفەر ئەوەی بیســـت لە دڵی خۆیدا گوتی: «پەنا بۆ خودا ئەوە هاتوو پشـکێک بۆو فەقیرە وەدەرکەوت ســـەری تێدا بچێ، ئەودەم گوناحەکەی دەکەوێتە ئەستۆی من. ناچاریشم بیبەمە لای خەلیفە. پەنا بۆ خودا. خودا چۆنی پێ خۆشە با وا بێت. ئیدی جەعفەر چوو بۆ لای خەلیفە ڕاوچی و قۆڵی گرت و بردی، کاردارەکان لە پێش و پاش و قەراغەوە لەگەڵ وەزیر دەڕۆیشـتن. خەلیفە ڕاوچی لە بەر خۆیەوە دەیگوت، گرتنەکەم بەس نەبوو، ئەولا و ئەولاشـــتان گرتووم تا هەڵنەیەم. خۆزگە من نەهاتبامە لای ئەو ڕەشـــی گڵاوە. جەعفەر دوای ئەوەی کە بە حەوت داڵان و نیڤکۆیـانـدا تێپەڕی بە خەلیفەی ماســـیگری گوت: «چاوت هەڵێنە کە ئێســـتا لە بەر دەمی خەلیفە لە ســـەر زەوی دەبی.» ئیدی پەردەیان لادا. خەلیفەی ماسیگر چاوی بە خەلیفە هارووونەڕەشید کەوت کە لە ســـەر تەخت دانیشـتبوو، گەورەگەورەکان لە دەوروبەری وێســـتابوون. خەلیفە ڕاوچی ئەوی ناســـییەوە. چووە پێشـــێ و پێی گوتی: «چۆنی چاکی کاکی زووڕناژەن؟ کارێکی جوانت نەکرد دوای ئەوەی ماســـیگرتنم لێ فێر بووی، ئەمنت لە لای ماســـییەکان دانا و دوایەش نەهـاتییەوە. ســـەرە ڕای ئەوەش کۆیلکـان بە ســـواری وڵاخی جۆراوجۆرەوە هێرشـیان بۆ هێنام و ماسییەکانی منیان تاڵان کرد. وا دیارە تەواوی ئەوانە لە بن ســەری تۆدا بوون. ئەگەر تۆ زووتر جەواڵەکانت هێنابا بایی سەد دینارمان زیاتر ماسی دەفرۆشت. ئێســـتا کە من هاتووم حەقی خۆم وەرگرم لێرەدا بەندم دەکەن. نازانم کێ تۆی لێردا بەند کردووە بۆ لێرەی؟»

خەلیفە هارووونەڕەشـید بزەیەکی هاتێ و گوتی: «وەرە پێشـێ و یەکێک لەو کاغەزانە

هەڵگره. خەلیفه ڕاوچی گوتی: «ئەی زووڕناچی، دوێنێ ڕاوچی بووی، ئێستا بوویه فاڵگر! بەڵام ئەوەی بزانه کە هەرکەس پیشە زۆر بگۆڕێ ژیانی ئاڵۆز و شێواوتر دەبێ.» جەعفەری وەزیر گوتی: «قسە مەکە دەنکێک لەوانە هەڵگره.» ئینجا خەلیفه ڕاوچی چووه پێشێ. دەستی برد و گوتی: «هەر بینا دیتان ئەو فاڵگرەوەیه دیسان بووەوە بە شاگردی من. شانسی لە ڕاوچیتی دایە.» کوتە کاغەزێکی هەڵگرت و دای بە خەلیفه و پێی گوت: «زووڕناژەن ڕاستم پێ بڵێ چی تێدایە و هیچم لێ مەشارەوە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خەلیفە ڕاوچی گوتی: «ڕاستی بڵێ ئەو کاغەزە چی تێدا نووسراوە؟» خەلیفە هاڕوونەڕڕەشـــید کاغەزەکەی دا بە جەعفەری وەزیر و گوتی: «ها بیخوێنەوە.» جەعفەر چاوی لە کوتە کاغەزەکە کرد و گوتی: «ئەی هـاوارا.» خەلیفە گوتی: «جەعفەر چی تێدا نووســـراوە؟» جەعفەر گوتی: «نووســـراوە ســـەد قامچی لە ڕاوچی بدەن.» کاردارەکان ســـەد قامچیان لە ڕاوچی دا. ئەوجار خەلیفە ڕاوچی هەســـتا و گوتی: «حەک کایەی ئاوا بە زیاد نەبێ. بۆ لێدان و بەند کردن لە لای ئێوە کایەیە؟» جەعفەری وەزیر گوتی: «خەلیفە، چۆن دەبێ ئەو توونییە هەژار لە دریاڕا بە تینوێتی بگەڕێتەوە؟ تکات لێ دەکەم بە دەستی بە تاڵ بەڕێی مەکەوە و ڕێی بدە با کاغەزێکی دیکەش هەڵگرێ بەشکوو ئەوە خودا بە ســـەری کاتەوە و بە دڵێکی خۆش لە دەرکی خەلیفە بڕواتە دەرێ.» خەلیفە گوتی: «کوڕە جەعفەر بە خودا ئەگەر وەرەقەی کوشـتنی بۆ بێتە دەرێ دەیکوژم. ئەو دەم کوناحەکەی دێتە ئەســـتۆی تۆ.» جەعفەر وەڵامی داوە: «ئەگەر بکوژرێ دەحەســـێتەوە.» خەلیفە ڕاوچی بە جەعفەری گوت: «حەک نەحەسـێیەوە بۆ من بەغدام بە تۆ تەنگ کردووە و پێتخۆشـــە بکوژرێم؟» جەعفەر گوتی: «کاغەزێک هەڵگرە و زۆر قســـە مەکە.» خەلیفەی مـاســـیگر دەســـتی برد و کوتە کاغەزێکی دیکەی هەڵگرت و دای بە جەعفەر. جەعفەر کاغەزەکەی خوێندەوە و مات بوو. خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید پرسی: «دەی کوڕی یەحیا، بۆ مـات بووی؟» جەعفەر وڵامی داوە: «خەلیفە، لە وەرەقەکەدا نووســـراوە هیچ مەدەن بە خەلیفە ڕاوچی.» هاڕوونەڕڕەشـید گوتی: «وا دیارە هیچی لە لای ئێمە بە قسـمەت نەبووە لێی گەڕێ با بڕوا. جەعفەری وەزیر گوتی: «خەلیفە بیکە بۆ خاتری ڕووحی پاکی باپیرانت با ســـێیەمین دانەش هەڵگرێ، بەشـــکوو شـــتێکی باشـــی بۆ بێ.» خەلیفە ڕازی بوو یەکی دیکەش هەڵگرێ. ڕاوچی دەسـتی برد و یەکی دیکەشـی هەڵگرت. لەویشـدا نووسـرابوو کە دینارێک بدەن بە ڕاوچی. جەعفەری وەزیر بە ڕاوچی گوت: «چ بکەم ئەوە زۆریشـم هەوڵ بۆ دای وا دیارە خودای تەعالا لەو دینارە زیاتر بە قســـمەت تۆی نەکردووە.» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «بەڵێ، سەد قامچی بە دینارێک وەڵا سەودایەکی جوانە. لەشت ساخ نەبێ.»

هاڕوونەڕڕەشید بە قسەکەی خەلیفە ڕاوچی پێکەنی. کاتێک ڕاوچی گەیشتە بەر دەرکی کۆشـــک، خواجە ســـەندەل چاوی پێی کەوت و پێی گوت: «کاکی ڕاوچی، لەو دیارییەی خەلیفە بەشی ئێمەش بدە.» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «ئەی ڕەشۆکی گلاو، ئەمن سەد داریان لێ داوم دینارێکیان داومێ ها ئەوەش دینارەکە بۆی هاویشـت و دەسـتی کرد بە گریان و ڕۆیشـت. خواجە سـەندەل کە ئاوای دیت، زانی دەڵێ چی. لەڕێوە یەک دوو کۆیلەی لە دوو نارد و گێڕایانەوە. بۆخۆی دەســـتی لە گیرفانی ڕۆ کرد و هەذبانەیەکی زێڕی ســـوور دەرهێنا. کردییەوە و زێڕەکانی بژارد. ســـەد دینار بوو. بە ڕاوچی گوت ها ئەوە لە جیاتی

ماسیـیەکانت برۆ بە دوای کاری خۆتدا. ئیدی خەلیفە راوچی خۆشـحاڵ بوو. ئەو سـەد دینارە لەگەڵ دینارەکەی خەلیفە دابووین هەڵی گرت و لێید دا ڕۆیشـت لە کۆشـک چووە دەرێ. ئێشـی جێ دارەکانی لە بیر چووەوە. وا بوو ڕێی کەوتە بازاڕی کەنیزفرۆشـان. سەیری کرد ئاپۆرەیەکی گەورە ساز بووە و خەڵک بە ئاڵقە دەوری شتێکیان داوە. دڕی بە خەڵکەکە دا و چووە بەرەوە. لەوێ ڕاوەسـتا. چاوی بە کابرایەک کەوت، سـندووقێکی پێ بوو. کۆیلەیەکیش لە سـەر سـندووقەکە دانیشـتبوو. کابرا هەرای دەکرد و دەیگوت کێ حازرە کەسـنەبینە[1] بکا و ئەو سـندووقە بکڕێ کە لە ماڵی خاتوو زبێدە هاتووەتە دەرێ. بازرگانێک گوتی: «بە خودا کڕینی شـتی ئاوا جێی مەترسـییە. دیسـانیش من حازرم بە بیست دینار بیکرم. یەکی دیکە گوتی: «ئەمن بە پەنجا دینار دەیکرم.

کورتی کەینەوە، بازرگانەکان هەر ئاوا لە سـەر یەکیان زیاد کرد، هەتا گەیشـتە سـەد دینار. دەلاڵ جاری دا و گوتی: «بازرگانەکان کەس هەیە زیاتری کا.» خەلیفە راوچی گوتی: «ئەمن ئەو سـندووقە بە سـەد و یەک دینار دەکرم.» بازرگانەکان کە گوێیان لە قسـەی خەلیفە راوچی بوو، پێی پێکەنین و بە گاڵتە گوتیان: «بیدە بە خەلیفە راوچی و سەد و یەک دیناری لێ بستێنە. کابرای دەلاڵ گوتی: «زۆر باشە. ئەمن ئەو سندووقە نافرۆشم جگە بە خەلیفە راوچی نەبێ. خەلیفە ئەوە سـندووقەکە و پارەکەم دەیە خودا لێت مەبارەک کا.» خەلیفە لە ڕێوە هەنبانەکەی دەرهێنا و زێڕەکانی دا بەو کۆیلەیەی سندووقەکەی هێنا تا بی بژێرێ. بەو شێوەیە سندووقەکەی کڕی. کۆیلەکەش زێڕەکەی بە سەر هەژاران و نەداراندا بڵاو کردەوە و کردی بە خێر و گەڕاوە بۆ کۆشک و خاتوو زبێدەش زۆر خۆشحاڵ بوو.

خەلیفەش سندووقەکەی لە سەر شانی دانا. هێندە قورس بوو چۆکی دەفیزاند، بە هەزار زەحمەت هەتا بەر دەرگای ماڵەکەی خۆی برد. لەوێ داینا سـەر زەوی. ئینجا دانیشـت و فکری کردەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆزگە دەمزانی ئەو سندووقە چی تێدایە؟» پاشان دەرگای ماڵی کردەوە و بە زۆری بردییە ژوورێ. زۆری هەوڵ دا سەرەکەی بۆ هەڵنەگیرا. لە بەر خۆیەوە گوتی: «پێم سەیرە، ئێستا ئەوەم بۆ کڕیوە. سەرەکەشی هەڵناگیرێ ناچارم دەبێ بیشـکێنم، تا بزانم چی تێدایە. ئەوجار هەسـتا قفڵەکەی بشـکێنێ زۆری هەوڵدا بۆی نەشکا. وا چاکە جارێ لێی گەڕێم بۆ سبەینێ جارێ با کەمێک بحەسێمەوە. ویستی بخەوێ. بەڵام سـندووقەکە دیوەکەی وا گرتبوو بۆخۆی جێی نەدەبوو. ناچار لە سـەر سـندووقەکە خەوت. ئەوەندەی پێ نەچوو، خرتە خرتێک لە نێو سندووقەکەوە هات. خەلیفە ڕاپەڕی و لە ترسان خەوی زڕا.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. سەودایەکە کە کڕیار بۆی نییە چاو لە شتەکە بکا. دەبێ هەر ئاوا بیکرێ. خۆی و شانسی خۆی.

# که شەوی هەشتسەد و چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خەلیفە ڕاوچی شێت بوو، هەستا حەوا و گوتی: «ئەوە جندۆکەی تێدایە. هەر باشتر، بۆم هەڵنەپچڕدرا. دەنا جندۆکان بەو شەوە دەیانخواردم. ئێستا نەیدەزانی چ بکا. پاشان چووەوە سەر سندووقەکە و خەوتەوە. دیسان سندووقەکە جووڵاوە. خەلیفە ویستی چرایەک شتێک بێنێ هیچی وەگیر نەکەوت. ئیدی هاتە دەرێ و هەرای جیرانەکانی کرد. جیرانەکانی لە خەو ڕاپەڕاند و هاتن گوتیان: «ئەوە چی بووە خەلیفە؟» خەلیفە گوتی: «چرایەکم بۆ بێنن، جندۆکە هاتووەنەتە ماڵەکەمەوە.» خەڵکەکە پێی پێکەنین و چرایەکیان بۆ هێنا. خەلیفە چراکەی لێ وەرگرتن و چووەوە ماڵەکەی خۆی و قفڵەکەی بە بەردێکی گەورە شکاند و دەرکی سندووقەکەی کردەوە. سەیری کرد کچێکی تێدایە وەک حۆری، بەنگی خواردووە و بە ڕێکەوت هێناوییەتەوە[1] . وە هۆش هاتووەتەوە. کچە چاوی هەڵێنا و گوتی: «یاسەمەن و سووسەن وەرنە لای من.» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «بژی بەنگ.» ئیدی کچە هاتەوە سەر خۆ و چاوی بە خەلیفە ڕاوچی کەوت و لێی پرسی: «ئەتۆ کێی و من لە کوێم؟» خەلیفە وەڵامی داوە: «ئەتۆ لە ماڵە منی.» قووەتولقلووب پرسی: «ئەمن لە کۆشکی هاروونەڕڕەشید نیم؟!» خەلیفە گوتی: «شێتە هاروونەڕڕەشید کێیە؟ ئەتۆ کەنیزی منی و ئەمن ئەوڕۆ ئەتۆم بە سەد و یەک دینار کڕیوە.»

کاتێک کەنیزە ئەو قسەی لەو بیست لێی پرسی ناوی تۆ چییە؟» ئەمن ناوم خەلیفەیە و بەختەوەر بووم، ئەمن باوەڕەم نەدەکرد ئەوەندە بەختەوەر بم.» کیژە پێکەنی و بە خەلیفەی گوت: «ئەگەر خواردەمەنییەک، شتێک هەیە بۆم بێنە برسیمە.» خەلیفە گوتی: «بە خودا قومە ئاوێکم نییە و بۆخۆشم دوو ڕۆژە هیچم نەخواردووە و بۆ پاروویەک داماوم.» کچە پێی پێکەنی و گوتی: «هەستە لە جیرانەکان شتێکم بۆ وەرگرە بە خودا ئەوە لە برسان دەمرم.» خەلیفە ڕاوچی هەستا و لە ماڵێ ڕۆیشتە دەرێ و هەرای جیرانەکانی کرد. دراوسێکان لە خەو ڕابوون و گوتیان: «خەلیفە ئەوە چ بووە دیسان؟» خەلیفە گوتی: «برسیمە و بە خودا لە برسان خەوم لێ ناکەوێ.» جیرانەکان، ماڵێک نان و ماڵێک پەنیر و ماڵێک خەیار و ئاوا هەر یەکی شتێکیان بۆ هێنا. خەلیفە ئەوانەی لە کۆشی کرد و هەمووی هێناوە لە بەر دمی کچە داینا و پێی گوت: «بە قوربانی تۆ بم بخۆ هەرکەس لەگەڵ من بێ لەو جۆرە شتانە دەخوا.» کیژە گوتی: «بە بێ ئاو چۆنی بخۆم ئەوە هاتوو لە گەرووم گیرا.» خەلیفە گۆزەیەکی شکاوی گڵی هەبوو دەستی دایە چووە دەرێ و هەرای دراوسێکانی کرد. گوتیان: «خەلیفە ئەوە ئەوشەو بوا دەکەی دیسان چ بووە؟» خەلیفە

---

[1]. هێناوییەتەوە: ڕشاوەتەوە.

گوتی: «نانتان دامێ خواردم، ئێستا تینوومە. چاکەکەتان تەواو بکەن و کەمێکم ئاو دەنێ. یەکێک لە جیرانەکان گۆزەیەک و ئەوی دی جەڕڕەیک و یەکی دیکەشان کیتەڵەیەکی پڕ لە ئاوی بۆ هێنا. خەلیفە گۆزەکەی خۆی پڕ کرد لە ئاو و گەڕاوە لای کچەکە و پێی گوت: «ئیدی خۆ هیچت ناوێ و کارت نەماوە.» ئێستا بە سەر هاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە.» کچە گوتی: «ئەگەر تۆ من ناناسی ئەمن خۆمت پێ دەناسێنم. ئەمن قووەتولقلووبی کەنیزی هاروونەڕڕەشیدم. خاتوو زبێد ئێرەیی پێ بردووم و بەنگی دەرخوارد داوم و لەو سندووقەی خستووم.»

دوای ئەوە قووەتولقلووب گوتی: «شوکری خودا باشم رزگار بوو، هیچم بە سەر نەهات. ئەو کارە هەمووی بە قازانجی تۆ تەواو بوو. چونکە خەلیفە ئەوەندەت ماڵ دەداتێ لە سەرت زیاد بێ.» خەلیفە هاروونەڕڕەشید هەر ئەوە نییە ئەوڕۆ من لە کۆشکەکەی بەند کرابووم؟» قووەتولقلووب گوتی: «بەڵێ بۆخۆیەتی.» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «بە خودا تا ئێستا کەسم لەو زووڕناچیە بەخیلتر و گەوجتر نەدیوە. ئەوڕۆکانێ دە داری لە من دا و دینارێکی دامێ. هەرچەند من ئەوم فێری ڕاوە ماسی کرد و کردیشم بە شەریکی خۆشم.» قووەتولقلووب گوتی: «ئەو قسە ناحەزانە مەکە و چاوت بکەوە و ئەگەر ئەمجارە دیتت ژیرانە هەڵسوکەوت بکە با غەنیت بکا.» خەلیفە ڕاوچی کە ئەو قسەیەی بیست وەک خەوتبێت و لە خەو هەستێ ئاوا بوو. بە هۆی دڵپاکی و پیاوچاکییەوە خودا هۆش و گۆش و داب و دەستووری خستە دڵییەوە. ئەوجار بە قووەتولقلووبی گوت: «بە سەر چاو، تۆ چۆن بڵێی من وا دەکەم.» دوای ئەوە بە قووەتولقلووبی گوت: «فەرموو بخەوە.» قووەتولقلووب خەوت و بۆخۆشی هەتا بەیانی لەو لاوە لە دووری ئەو خەوت. کە ڕۆژ بووەوە قووەتولقلووب داوای پێنووس و لێنووس و جەوهەری لێ کرد. خەلیفە خێرا چوو بۆی پەیدا کرد و هێنای. قووەتولقلووب نامەیەکی بۆ ئیبنی قرناس کە بنووسی خەلیفە بوو، نووسی و هەموو شتێکی لە نامەکەدا بۆ باس کرد. ئاگاداری کردەوە ئەوە لە لای خەلیفە ڕاوچییە. دوای ئەوە نامەکەی دا بە خەلیفە ڕاوچی و پێی گوت: «ئەو نامەیە بەرە بۆ بازاڕی گەوهەرفرۆشان و لەوێ بپرسە دووکانی ئیبنی قەرناسی گەوهەرفرۆش کامەیە. ئەگەر پێشانیان دای، نامەکەی دەیە و هیچ مەڵێ.» خەلیفە ڕاوچی نامەکەی وەرگرت و چوو بۆ بازاڕی گەوهەرفرۆشان. لەوێ بە پرسیار دووکانی قرناسی گەوهەرفرۆشی دیتەوە. چووە ژوورێ و سڵاوی لە ئیبنی قەرناس کرد و ئەویش جوابی سڵاوەکەی داوە. بەڵام چ بە هێندی نەگرت. لێی پرسی: «چیت دەوێ؟» خەلیفە لەڕێوە نامەکەی دایە. ئیبنی قەرناس قاقەزەکەی لێ وەرگرت. وەیزانی پارسەکێکە و خێری دەوێ. بە یەکێک لە خزمەتکارەکانی گوت نیو درەمی دەیە. خەلیفە ڕاوچی گوتی: «ئەمن نەهاتووم بۆ خێر. نامەکە بخوێنەوە. ئیبنی قەرناس قاقەزەکەی خوێندەوە و زانی چ باسە. هەر بۆیە نامەکەی

ماچ کرد و له سەر چاوی دانا.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئیبنی قەرناس قاقەزەکەی ماچ کرد و لە سەر چاوی دانا. هەستا و بە خەلیفەی گوت: «کاکە گیان ماڵەکەت لە کوێیە؟» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «کارت بە ماڵی من چییە؟ بە تەما نی بچی کەنیزەکەم لێ بدزی؟» ئیبنی قەرناس گوتی: «کەنیزی تۆ نادزم، دەمهەوێ خواردن بۆ تۆ و بۆ ئەویش بکڕم.» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «ماڵەکەم لە فڵان جێیە.» ئیبنی قەرناس گوتی: «زۆر باشە خودا سلامەتت کا.» ئیدی ئیبنی قەرناس دوو دانە لە کاردارەکانی بانگ کرد و پێی گوتن: «ئەو کابرایە بەرنە دووکانی موحسین سەڕراف و هەزار دیناری زێڕی لێ وەرگرن و بیدە بەو کابرایە و خێرا بیهێننەوە لای خۆم. کاردارەکان خەلیفە ڕاوچیان بردە لای موحسینی سەڕراف و هەزار دیناری زێڕی سووریان لێ وەرگرت و دایان بە خەلیفە و خێرا هێنایانەوە دووکانی ئیبنی قەرناس. سەیری کرد ئەوە ئیبنی قەرناس سواری یەسترێک بووە هەزار دیناری زێڕی سوور دێنێ و کۆیلە و خزمەتکارێکی زۆر لەملا و لەولای ڕاوەستاون. یەسترێکی زین و لغاو کراویش لە پەنا یەسترەکەی ئەو بوو کە هەر شێوەی ئەو یەسترەی دیکەی دەدا. ئیبنی قەرناسە بە خەلیفەی گوت: «سواری ئەو یەسترە بە.» خەلیفە ڕاوچی گوتی: «بە خودا ئەمن ناتوانم سواری ئەوە کەرە بم. دەمخا. ئیبنی قەرناس گوتی: «هەر دەبێ سوار بی.» ئیدی خەلیفە چووە پێش و ڕوو بە پشتەوە سوار بوو دەستی بە کلکی گرت و دەنگی دا. لەڕێوە یەسترە دەرپەڕی و خەلیفەی بەرداوە. دەورووبەریان پێی پێکەنین. خەلیفە هەستاوە و گوتی: «ئەمن پێم نەگوتن ناتوانم سواری کەری گەورە بم.»

ناچار ئیبنی قەرناس خەلیفەی لە بازاڕ بەجێ هێشت و بۆخۆی چوو بۆ لای خەلیفە هاروونەڕڕەشید و پێی گوت کە کەنیزەکە ئاوای لێ بەسەر هاتووە. دوای ئەوە گەڕاوە قووەتولقلووبی بردە ماڵە خۆیان. کاتێک خەلیفە هاتەوە ماڵێ خەڵکی گەڕەکی دیت لە سەر کۆڵانەکەیان کۆ بوونەوە. خەڵکەک هەر یەکەی قسە دەکا. یەک دەڵێ: «خەلیفە ئەوڕۆ هەڵاتووە.» یەکی دیکە پرسی: «ئەو کەنیزەی لە کوێ هێنابوو؟» یەکی دیکە گوتی: «ئەو شێتە کەنیزەکەی لە ڕێیەدا بە مەستی دیوە و هێناوییەتەوە. پاشان کە دەزانێ کارەکەی خراپە هەڵاتووە.» ئەوان خەریکی قسە بوون کە خەلیفە ڕاوچی هاتەوە. خەڵکی گەڕەک لێیان پرسی: «ئەرێ لێقەوما و چۆنی؟ نازانی چیت بە سەر هاتووە؟» خەلیفە گوتی: «ناوەڵڵا نازانم.» پێیان گوت: هەر ئێستا پیاو و کاردارەکانی خەلیفە هاتن کەنیزەکەتیان گرت و بردیان. بۆ تۆش گەڕان نەیاندیتییەوە. خەلیفە چاوی لەوان نەکرد و یەکسەر گەڕاوە چوو بۆ دووکانی ئیبنی قەرناس. ئیبنی قەرناسی دیت بە سواری دەڕۆیی. پێی گوت: «بە خۆدا لە تۆ نەدەوەشاوە بۆخۆت من لێرە سەرقاڵ کەیت و کۆیلە و کاردارەکانت بنێرییە

ماڵەکەی من!» ئیبنی قەرناس گوتی: «شێتە وەرە و قسە مەکە.» ئیدی ئیبنی قەرناس بردی بۆ ماڵێکی زۆر خۆش. خەلیفە سەیری کرد ئەوە کەنیزەکە لەوێ لە سەر تەختێک دانیشتووە و دە دانە کەنیزی مانگ ڕوخساریش لە هەنتەشی ویستاون. کە ئیبنی قەرناس قووەتولقووبی دیت کرنۆشی بۆ برد. قووەتولقلووب لێی پرسی: «لەگەڵ خاوەنم کە منی کڕیوە و دارونەداری لە سەر من داناوە چیت کردووە؟» ئیبنی قەرناس گوتی: «خاتوون، هەزار دیناری زێڕم داوەتێ.» ئەوجار بەسەرهاتی خەلیفەی لە ئەوەڵەوە تا کۆتایی بۆ قووەتولقلووب گێڕاوە. قووەتولقلووب پێکەنی و بۆخۆشی هەزار دیناری زێڕی دا بە خەلیفە و پێی گوت: «ئەو زێڕانە هەمووی دیارییە لە لایەن منەوە، ئیشەڵڵا خەلیفەش ئەوەندەت دەداتێ خەنی بی. ئەوان خەریک بوون قسەیان دەکرد کە کاردارێک لە لایەن خەلیفەوە هات و گوتی: «خەلیفە کە زانی قووەتولقووب لە ماڵی ئیبنی قەرناسە نەیتوانی ڕاوەستێ و منی ناردووە لە دوای.» قووەتولقلووب خەلیفە ڕاوچی لەگەڵ خۆی برد و چوو بۆ لای هاڕوونەڕڕەشید. کە گەیشتنە لای هاڕوونەڕڕەشید کرنۆشی برد. هاڕوونەڕڕەشید هەستا و زۆری بەخێرهاتن کرد و هەواڵی پرسی. پاشان لێی پرسی کێ ئەوی کڕیوەتەوە. قووەتولقلووب گوتی: «پیاوێکە ناوی خەلیفە ڕاوچییە و ئێستا لە پشت دەرگاکە ویستاوە. وەک دەڵێ چونکە لەگەڵ خەلیفە شەریک بووە و حیسابێکی لەگەڵ خەلیفە هەیە. خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید بانگی ڕاوچی کرد و ڕاوچی هاتە ژوورێ کرنۆشی برد و زۆری دۆعا با تەخت و شکۆ و خەلافەتەکەی کرد و شوکری نیعمەتەکانی کرد. خەلیفە پێی سەیر بوو. سەری سووڕ ما. پێکەنی و گوتی: «ڕاوچی دوێنێش لەگەڵ من شەریک بووی یان نا؟» ڕاوچی قسەکەی ناسی و بە زمانێکی زۆر ڕەوان و پاراو دەستی پێ کرد: «خەلیفە بەو کەسەی تۆی کردووەتە خەلیفە بەس دیتوومە و دەستنوێژم لێی نەشکاوە، ئیدی تەواوی ڕووداوەکەی لە ئەوەڵەوە تا کۆتایی بۆ باس کرد. باسی ئەو کاردارەشی کرد کە سەد دینارەکەی دایە. گوتیشی کە ئەو سەد دینارەی کاردارەکە دایێ لەگەڵ یەک دینارەکە هەڵم گرت و چووم بۆ بازاڕ. سندووقێک کە نەمدەزانی چی تێدایە کڕیم. باسی خەوتن لە سەر سندووقەکە و نان و ئاو وەرگرتن لە جیرانەکان و هەمووی بۆ گێڕاوە. خەلیفە پێکەنی و دڵی حەساوە و پێی گوت: «چونکە ئاوا ئەمانەتدار بووی چیت پێویستە داوا بکە. خەلیفە ڕاوچی هیچی نەگوت. ئیدی خەلیفە پەنجا هەزار دیناری زێڕی دایە و کەوایەک لە کەواکانی خۆی دا بە خەلیفە ڕاوچی. یەسترێک و چەند کۆیلە و کەنیزیشی بۆ نارد. خەلیفە ڕاوچی بۆخۆی وەک شای لێ هات و خەلیفە هاڕوونەڕڕەشیدی بە قووەتولقلووب شادمان بووەوە و زانیشی کە تەواوی ئەو فڕوفێڵانە لە بن سەری خاتوو زبێدەی ئامۆزایدا بووە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! هارووونەڕەشــید زانی تەواوی ئەو کارانە لە بن ســەری خاتوو زبێدەی ئامۆزای دایە. ئیدی قینی لێی هەســتا و لێی نیزیک نەدەبووەوە و خۆی تێ نەدەگەیاند. خاتوو زبێدە کە بەو کارەی زانی، زۆر ناڕەحەت بوو، کوڵمە سوورەکانی زەرد هەڵگەڕا. کە تاقەتی نەما و لەوە زیاتر نەیتوانی بە سەر خۆیدا زاڵ بێ، کەسێکی ڕاسپاردە لای کوڕە مامەکەی، هاڕووەنەڕەشید و داوای لێ بووردنی لێ کرد و دانی بە تاوانەکەی دانا و ئەو دوو بەیتەی بۆ نووسی:

کێیە هەڵەی نەکردبــــــــــــــــێ بێژە
ژیان بێ هەڵە چـــــــــــــــۆن دەبێ بێژە
تـــــــــــــــاوان بە تـاوان ولام بەیتەوە
ئەو دەم مــن و تــۆ وەک یەک دێــنەوە

کە نامەکەی خاتوو زبێدەی خوێندەوە، زانی ئەوە دانی بە کردە خراپەکەی خۆیدا ناوە و داوای لێ بووردن دەکا. ئیدی بەزەیی پێیدا هات و لێی خۆش بوو. خاتوو زبێدەش زۆر دڵخۆش بووە. دوای ئەوە خەلیفە هارووونەڕەشید مانگانە پەنجا دیناری بۆ خەلیفە ڕاوچی بڕیبووەوە و ئاگای لێی بوو.

ئەوجار خەلیفە ڕاوچی ویستی لە لای خەلیفە هارووونەڕەشید بێتە دەرێ، کڕنۆشی برد و هاتە دەرێ و ڕۆیشت. کە گەیشتە دەرگای کۆشک، ئەو کاردارەی کە سەد دینارەکەی دابووێ چاوی پێی کەوت و ناســییەوە و لێی پرســی: «ڕاوچی ئەوە بە چی ئەوەندە خۆشەویست بووی؟» خەلیفە ڕاوچی تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ کاردارەکە گێڕاوە. کـاردارەکە زۆری پێ خۆش بوو بە تـایبەت لەوەی کە ئەو ببووە هۆی ئەوەی خەلیفە ڕاوچی لە هەژاری ڕزگاری بێ. ئەوجار کاردارەکە بە خەلیفەی گوت: «ئەتۆش لەو هەمووە ماڵە کەمێک بەشی من بدە و دیارییەکم دەیە.» لەڕێوە خەلیفە دەستی لە گیرفانی ڕاکرد و کیســـەیەک کە هەزار دیناری زێڕی تێدا بوو، دەری هێنا و دای بە کاردارەکە. کاردارەکە کیسەکەی داوە و دۆعای بەخێری بۆ کرد. سەریشی لەو هەموو دەستودڵبازییەی سوور ما. ئینجا خەلیفە سـواری یەسترێک بوو، کۆیلە و خزمەتکار لەملا و لەولایەوە دەڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کاروانسەرایەک. خەڵک چاویان لێ دەکرد و سەریان سوور مابوو کە ئەوە چۆناوچۆن بەو پلە و پایەیە گەیشتووە. ڕاوچی لە یەسترەکەی دابەزی و خەڵک لێی چوونە پێش و پرســـیاریان لێ کرد کە ئەوە چۆناوچۆن ئاوا خۆشـــبەخت بووە. خەلیفە ڕاوچی

بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕاونە. دوای ئەوە ماڵێکی گەورەی کڕی و هەموو پێداویستییەکی بۆ کڕی و ئەو دوو بەیتەی لە سەر سەردەرانی خانووەکەی نووسی:

خـۆیەتـی خـانەخـوێـی خـانـووی ژیـان
ئەویـش پـێشـــوازی دەکـا لە مـیـوان
چەند ڕۆژێ لێرە مـــــــــــــیوانی ئەوم
خـاوەن مـاڵە، چـاو لە دەســـتـی ئەوم

دوای ئەوە یەکێک لە قەیرە کچە جوانەکانی شـــارەکەی هێنا و پێکەوە بە خێر و خۆشـــییەوە ژیان. کاتێک ئەو گشـــتە بەختەوەری و ئەو ڕزق و ڕۆزییەی دیت، شـــوکری خودای کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ماڵ و حاڵم هەیە و ژیـــــــــــانی خۆش
تێپەڕی ڕۆژانـــــی ســـەخـت و نـاخۆش
دیارە لە خۆڕا هــــــــــــیچ وەدی نایە
بەرهەمی ڕاســتــــــــــییە ئاکاری تۆش
شـــــــــــوکری خودا هەر نیعمەتی ئەوە
هـــــــــێزی پـاکی من، وا هـاتە خورۆش

**چیرۆکی مەسرووری بازرگان**

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە لە زەمـانی زوودا بـازرگـانێک هەبوو ناوی مەسـروور بوو. بۆ خوێنشـیرنی و ڕووخۆشـی کەس نەیدەگەیاندێ و زۆر دەوڵەمەند بوو. عاشقی ئافرەتی جوان بوو. هەر ڕۆژەی لە شادیگەیەک بوو.

ڕێکەوت وا بوو، شـەوێک لە شـەوان لە خەونیدا بوو لە باغێکی خۆشـدا چواردانە مەلی لێ بوو. یەکێک لەوان کۆترێک بوو هێند سپی بوو، دەتگوت زێوی کاڵە. ئەو کۆترەی وەبەر دڵی کەوت و دڵی زۆر پێی خۆش بوو. لە پڕدا بـاڵندەیەکی گەورە هـات و ئەو کۆترەی ڕفاند. ئەوەندەی پێ ناخۆش بوو لە خەوەکەی ڕاپەڕی. لە تاوان هەتا بەیانی خەوی لێ نەکەوتەوە و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەوڕۆ دەبێ بچم بۆ لای کەســێک ئەو خەونەم بۆ لێک داتەوە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و چل و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مەسروری بازرگان بەیانی زوو هەستا و لە ماڵ وەدەر کەوت زۆر رۆیشت کەسی وەگیر نەکەوت خەونەکەی بۆ لێک داتەوە. ناچار گەڕاوە ماڵەکەی خۆی. لە رێگادا وەبیری هاتەوە بچێتە ماڵی یەکێک لە بازرگانەکان. کە گەیشـــتە بەر دەرگاکەیان گوێی لە دەنگێک بوو کە بە نارەحەتییەوە ئەو شێعرەی دەگوتەوە:

روو لە کـوێ کەم لە دڵـمـدا جـوانـیـت ئـاوری کـردۆتەوە
دەرکی بەختم داخراوە و بەو نەبێ قەت ناکـــــــــــــریتەوە
کـانــی بەزەی گەر نەتـۆقـێ مـن بە لـوورەو نەیـخـۆمەوە
دڵـنـیـام وشـــکەســـی دەگـرم بەو داخەش ســـەر دەنێمەوە

کاتێک مەسـروور گوێی لەو شـێعرە بوو، چاوێکی لە ناو ماڵەکە کرد. باخێکی خۆش و سـەرسـەوزی دیت. تەماشـای کرد، پەردەیەکیان لە نێو باخەکەدا کێشـاوە کە بە گەوهەر و یاقووت و شـتی گرانبایی ڕازاوەتەوە. لە پشـت پەردەکە چوار کچی لێیە کە یەکیان لەوانی دی منداڵکارترە و برۆی تێکەڵ و کەوانی و دمی چووکە و سیمای شێوەی مانگی چواردە دەدا.

لێوە یان گوڵی سوورە پشکووتـــــووە لەسەر رووومـــــای
ئەو گوڵەی نەخشاندوویە دەوری مرواریـــــــدی سیـــــمای
ورشـــەی هەنییەی دێ لە دووررا مـاڵی دڵ ڕووناک دەکـا
تـــــــــــــیری برژانگ دڵ دەپێکێ و برینی وەک دەکا

کاتێک مەسرووری بازرگان ئەوی دیت، چووە ژووری و هەتا لای پەردەکە چوو. کیژە جوانەکە ئاوڕی داوە و ئەوی دیت. مەسروور سڵاوی لێ کرد. کیژەکە وەڵامی سڵاوەکەی داوە. کاتێک مەسروور لە جوانی ئەو کیژە ورد بووەوە، دەسەڵاتی نەما و ئەژنۆی سست و دڵی وە لێدان کەوت.

ئینجا سەیری ناو باخەکەی کرد. تەماشای کرد، وڵات وەک خرمانی گوڵانە و لە هەموو جۆرە گوڵێک لە ناو باخدا دەبیندرێ. هەر لە وەنەوشە و یاسەمەن و گوڵی سوورەوە بگرە هەتا داری میوەی جوارجۆر... ئاو لە چوار لاوە لە بەر هەیوانەکان هەڵدەڕژێ. مەسرووری بازرگان چاوی لە یەکەم هەیوان کرد، ســـەیری کرد لە ســـەردەرانەکەی ئەو دوو بەیتە

نووسراوه:

تالاریکی پـــــــــــــــــیرۆز و بە فەڕم
خۆش و ســـــــــــــەرسەوز، بەهاری تەڕم
نموونەی خـــــــــــــــۆشی سەرسەراکانم
بە ســـــەر بەرزیــیەوە لە دوور دەڕوانــم

دوای ئەوە چاوی لە هەیوانی دووەم کرد. لە ســــەر ســــەردەرانەکەی ئەو دوو بەیتە بە ئاوی زێڕ نووسرابوو:

گوڵزاریکە جێگەی خۆشــــی و شـــــادی و ســـــەرمەســـــتییە
شـــــــــــــوێنی بەزم و ئاواز و جێی جێژن و ســـــەربەســـتییە
ئاوی ســـــــــــــــــــــارد و دڵڕفێن، گەشــە وەکوو چاوی یار
خـــــــــــــــــــــــۆشــە جار جار لەو ناوە دەســت بخەیتە ملی یار

ئێنجا سەرنجی دایە سەر هەیوانی سێیەم، کە ئەو دوو بەیتەی بە ئاوی شینی ئاسمانی لە سەر سەردەرانەکەی ئاوا نووسرابوو:

دەکرێ بیــنـــای ئەو کـۆشـــــــــــــــــــکە پتەوتـر بێ
پێشـــــەنگی کـامەرانی دەســـــــــــــــــــــتی تێـدا بێ
مەمنا بەردچنەکەی شـــــــــــــــــــــــــــینێکی ئاوییە
ئـاســـــمـــان جـارجـار هەســــــت دەکـا لە نـاویـــیە

دوای ئەوە، سەیری هەیوانی چوارەمی کرد. سەیری کرد ئەو بەیتەش لەوێ نووسرابوو:

بەرۆکــــی نەگــــرێ بەدکــــار، خــــودایە
کــێ بــارگە و بــنەی لەم کــۆشــــکە دایە

دوای ئەوە کیژە مانگڕووخســـارەکە بە مەســـرووری گوت: «کاکە بۆ بێ ڕوخســـەت خواستن، هاتوویە ماڵی خەڵکەوە و چاو لە ژنی خەڵک دەکەی؟» مەسرووور گوتی: «خانم، ئەو باخەم دیت کە پڕ لە گوڵ و ســەوزایی و چیمەن و جوانییە و دیســان دەنگی خۆشــی باڵندەکان کاریکیان کرد، هۆشم لای خۆم نەما و هاتمە ژوورەوە. چاوێک دەگێڕم و پاشان دەڕۆم بە لای کاری خۆمەوە.» کیژە گوتی: «بە خێر بێی، خۆشحاڵت کردین.» مەسروور

هێندەی ئەو گفت و لفت و ڕوخسارەی پێ جوان بوو، ئەو شێعرەی خوێندەوە:

شـــــــــــــــەکر پرژاندنە ئەو ئاخاوتن و پەیڤینە
گفت و لفتی هـــــــــــێندە لە بەر دڵ، جوان و شـیرینە
کەســـێک تۆ ببینێ و شـــێت و شـــەیدا نەبێ حەتمەن
گێل و گـــــــــــــــێژ و گەمژەیە، حەپۆلە ئەو، تەفکینە

زەینولمەواسیف کە شێعرەکەی مەسرووری بیست، چاوێکی لێ کرد، ئەو چاوە کاری لە دڵی کرد و کاری خۆی کرد. بە شێعر ئاوا وڵامی داوە:

خۆت لە گڕی ئەڤینم بپارێـــــــــــــــــــــزە تکایە
تینی بڵێســـەی ئەڤین بـــــێ ئەمـان و ڕەزایە
لادە بـڕۆ بە ڕێـتـدا ئەتـۆ خـورتـێـکی، کەشـــخە
هەن هەزارانی دیـــــــــــــــکە بۆ تۆ دێنە ڕەدایە

مەسروور کە ئەوەی بیست، بە سەر خۆیدا زاڵ بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «چارە هەر ئەوەیە جارێ لەگەڵی بە سەبر بم.» کە بوو بە شەو بە شەو شەمدانی زێڕینیان دانا. کچە داوای خواردنی کرد، لە هەموو جۆرە خواردنێکیان دانا. خواردنەکەیان خوارد و دەستیان شوشت. زەینولمەواسف گوتی: «ئەمن تینووی یاری شەترەنجم تۆ شەترەنج دەزانی؟» مەسروور گوتی: «بەڵێ دەزانم» ئنیجا کچە داوای تەختە شەترەنجی کرد. لەڕێوە هێنایان. تەختەکەیان لە ئاونووس و شەفرە دروست کردبوو. بە ئاوی زێڕیش نووسیبوویان. مۆرەکانیشی لە دوڕ و یاقووت بوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: «خاوەنشکۆ، کە تەختە شەترەنج و مۆرەکانیان هێنا، مەسروور بە دیتنیان واقی ورما. زەینولمەواسف ڕووی لە مەسـروور کرد و گوتی: «ئەتۆ مۆرە سـوورەکانت دەوێ یان سـپییەکان؟» مەسـروور وەڵامی داوە: «جوانی جوان تۆ سـوورەکان هەڵگرە چونکە سـوورەکان لە بەر دڵانن و تۆش کە لە بەر دڵانی ئەوانە شـیاوی تۆن. سـپییەکان دانێ بۆ من.» زەینولمەواسـف مۆرە سـوورەکانی هەڵگرت و لە بەرانبەر سـپییەکان ڕیزی کردن. دەستی کێشا مۆرە ببزوێنێ. مەسروور کە قامکەکانی دیت لە تاوان دڵی سیس بوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. هەر بۆیە زەینولمەواسـف چاوی لێ کرد و گوتی: «مەسـروور ئاگات لە خۆت بێ، خۆت ڕاگرە.» مەسروور گوتی: «ئەی پەریڕوو:

خۆ دەزانم دەبێ عـاشـق سـەبری هەبێ<br>ئەی ئەگەر نەتـوانم دەبێ چارە چ بێ

بە کورتی، مەسـروور هێندە گیرۆدە و شـەیدا ببوو، کە زەینولمەواسف شـایەکەی مات کرد و بە سـەر مەسـرووردا زاڵ بوو. زانی ئەڤین کاری خۆی کردووە و هۆشـی لە مەسروور بڕیوە، پێی گوت: «ئەوجار بێ مەرج یاریت لەگەڵ ناکەم.» مەسروور گوتی: «لە سەر هەر شتێک دەڵێی دەیکەم.» زەینولمەواسف گوتی: «ئەتۆ سوێند بخۆ و منیش سوێند دەخۆم کە هیچکاممان یەکتر فریو نەدەین.» ئیدی هەردووکیان سـوێندیان خوارد. ئەوجار زەینولمەواسـف گوتی: «مەسـروور ئەگەر من بەرەندە بووم ئەوە دە دینارت لێ دەسـتێنم، ئەگەر ئەتۆ لە منت بردەوە ئەوە بە مراد دەگەی.» مەسـروور پێی وا بوو لێی دەباتەوە گوتی: «خانمەکەم، دەبێ لە سەر قسەی خۆت سوور بی، ئەمن ئەتۆ بە شارەزاتر لە خۆم دەازنم.» زەینولمەواسف گوتی: «زۆر باشە.» دەستییان کرد بە یاری و سەربازیان بزاوت و قەڵاکانیان لێ نیزیک کردنەوە و ئەسپەکانیان بردە پێشێ. زەینولمەواسف دیبایەکی شینی بە سـەرەوە بوو. ئەوی لە سـەری کردەوە و قۆڵی هەڵکرد و زەندی بلوورینی وە دەر خسـت. دەسـتی بۆ مۆرە سـوورەکان برد و بە مەسـرووی گوت: «وریای خۆت بە.» مەسـروور بە دیتنی ئەو زەندە سـپی و سـۆڵانە پەرێشـان بوو. هۆشـی لای خۆی نەما. ویستی دەست بۆ مۆرە سپییەکان بەرێ کەچی بۆ مۆرە سوورەکانی برد. زەینولمەواسف گوتی: «هۆی مەسـروور ئەوە لە کوێی؟ سـوورەکان ئی منن. سـپییەکان ئی تۆن؟» مەسروور گوتی: «هەر کەس بێ لە جێی من ئاقڵی لە جێی خۆی نامێنێ.»

بە کورتی، زەینولمەواسف زانی کە مەسروور هۆشی هەر لای ئەوە، گوتی: «مەسروور کاتێک بە مراد دەگەی کە یارییەکەم لێ بەریتەوە. ئەمنیش هەر یارییە و سەد دینارم دەوێ. دەنا یاری ناکەم.» مەسروور گوتی: «ئەتۆ چت لەوەی داوە من بە مەرجەکە ڕازیم..» ئیدی

درێژەیان بە یارییەکەیان دا. هەر زەینولمەواسف یاری بردەوە و مەسروور سەد دیناری دانا. هەتا بەیانی ئەوە کاریان بوو. مەسروور تاقە یەک جاریشی نەبردەوە. ئەوجار مەسروور هەستا. زەینولمەواسف گوتی: «چییە مەسروور چیت دەوێ؟» مەسروور گوتی: «دەچمەوە ماڵێ و زێڕ و ماڵ دێنم. بەشکم بە ئاوات بگەم.» زەینولمەواسف گوتی: «چی دەکەی بیکە.» مەسروور بە لەز چووەوە ماڵێ و ئەوەی هەیبوو هێنای. کە هاتەوە لای زەینولمەواسف ئەو شێعرەی خوێندەوە:

سەر و ماڵم دەکەم بە فیدای بەژن و باڵاکەت
عەوداڵ و هەڵوەدام، کەوتووم لە دەرک و سەراکەت
ڕوحمێ بکە بە حاڵی زار و پەرێشانی من
دڵی شەیدام لێ دەدا بۆ شیرینە ڕەزاکەت

کاتێک مەسروور شێعرەکەی تەواو بوو، دەستیان کردەوە بە یاری. هەر دایاننا و مەسروور دۆڕاندی هەر دایاننا مەسروور دۆڕاندی. هەتا سێ ڕۆژ ئەوە کاریان بوو. هەتا زەینولمەواسف تەواوی ماڵەکەی لە مەسروور بردەوە. ئەوجار گوتی: «مەسروور چ دەکەی؟» مەسروور گوتی: «لە سەر دووکان دەیکەم.» زەینولمەواسف گوتی: «نرخەی دووکانەکەت چەندەیە؟» مەسروور گوتی: «پێنسەد دینارە.» پێنجا جاری دیکەش کردیانەوە و هەر پێنج جارەکە زەینولمەواسف بردییەوە و مەسروور دۆڕاندی. دوای ئەوە لە سەر کەنیز و باخ و مەزرا و زەوی و زار و خانووبەرە کردیان. وا بوو مەسروور هەموی بە زەینولمەواسف دوڕاند. دوای ئەوە زەینولمەواسف ڕووی لە مەسروور کرد و گوتی: «هیچی وات ماوە لە سەری بکەین؟» مەسروور گوتی: «بەو کەسەی منی خستووەتە داوی خۆشەویستی تۆوە، ئیدی هیچم نەماوە.» زەینولمەواسف گوتی: «مەسروور ئەگەر لە کارەکەت پەشیمان بوویتەوە، ئەوە ماڵەکەت دەدەمەوە. هەستە لێرە بڕۆ. گەرنیشت ئازاد دەکەم.» مەسروور گوتی: «بەو کەسەی ئەو کارانەی ڕێک خستووە، ئەگەر تۆ داوای گیانیشم بکەی هێشتا پێم کەمە.» ئەوجار زەینولمەواسف گوتی: «چونکە ئاوایە هەستە بچۆ قازی و شایەد بانگ کە ئەو ماڵانەم بە نێو کە.» ئیدی لەڕێوە قازی و شایەدی بانگ کرد. قازی کە چاوی بە زەینولمەواسف کەوت دەستی تێکەڵهاتوو و سەری لێ شێوا. مەسروور گوتی: «قازی نووسراوەیەک بنووسە و تەواوی ئەو ماڵ و سامانە بە نێوی زەینولمەواسف بکە. قازی کاغەزەکەی نووسی و تەواو ماڵ و سامانی مەسrووری بە نێوی زەینولمەواسفەوە کرد و شایەدەکان واژۆیان لە سەر کرد و کار تەواو بوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک زەینولمەواسف ماڵ و سامانەکەی مەسروور به نێو خۆی کرد، به مەسروور گوت: «ئێستا هەستە برۆ، وە دوای کاری خۆت کەوە.» کەنیزی زەینولمەواسف که ناوی هیووب بوو، ڕووی له مەسروور کرد و گوتی: «دەزانم دڵت پڕه شێعرێکمان بۆ بخوێنەوه.» مەسروور ئەو شێعرەی بۆ خوێندەوە:

چــــــــــــۆن برۆم من، تازه ڕەگم داکوتاوه
نەمامی خۆشەویـــــــــــــــستیم لێره چەقاوه
کــۆچ واتــای ویشــکبــوون و نەمــانــی مــنه
داوا بکه گـــــــــــــــــوڵم به بەرمەوه ماوه

دوای ئەوه هیووب گوتی: «مەسروور وەڵا شێعرێکی دیکەشمان بۆ بخوێنەوه.» مەسروور ئەو چەند بەیتەشی خوێندەوه.

لێم گەڕێن ئەورۆکه لــــــــــــــــێرەم با بژیم
ژین که به تۆ گەیـــــــــــــــشتن بێ بۆ نەژی
کوڵمی ئاڵ و لـــــــــــــــــێوی لاڵ لێره هەبێ
ئەمــن هەســــتــم لــێــره بــڕۆم چــۆن دەبــێ

کاتێک زەینولمەواسف ئەو شێعرانەی بیست، سەری له زمانپاراوی و شاعیرییەکەی سووڕ ما و گوتی: «مەسروور، دەست لەو خۆ شێتکردنه هەڵگره و وه دوای کاری خۆت کەوه. ئەتۆ تەواوی ماڵ و سامانەکەت له یاری شەترەنجدا دۆڕاند و به ئاواتت نەگەیشتی. ئێستا هیچ ڕێگایەک نییه بۆ ئەوەی تۆ به ئامانج بگەیەنێ.» مەسروور ڕووی له زەینولمەواسف کرد و پێی گوت: «خانمەکەم، چیت دەوێ داوام لێ بکه با بۆت بێنم.» زەینولمەواسف گوتی: «مەسروور خۆ تۆ ماڵت نەماوه.» مەسروور گوتی: «بینایی چاوم، ئەگەر بۆخۆشم هیچم نەمابێ خەڵک یارمەتیم دەدا.» زەینولمەواسف گوتی: «کەسێک که تا ئێستا بۆخۆی یارمەتی خەڵکی داوه چۆن دەتوانێ داوای یارمەتی بکا؟» مەسروور گوتی: «ئەمن ئەوەندەم خزم و کەس و دۆست و ئاشنا هەیه که داوای هەرچییەک بکەم دەست به ڕوومەوه نانێن.» زەینولمەواسف گوتی: «دەیباشه، چوار شاخەم میسکی بۆنخۆش و

چوار دەفری گرانبایی و چوار ڕەتڵم[1] عەنبەر و چوارهەزار دیناری زێڕ و چوار سـەد کراسـی دیبای مەلەکانەی داوێن زێڕینم دەوێ. مەسـروور جا ئەگەر ئەوانەت پێ دێ، ئەوە دەتوانی بە من بگەی.» مەسـروور گوتی: «خانمی خانمان هێنانی ئەوانە بۆ من کارێکی ئاسانە و هەر ئێستا ئەوەی داوات کردووە بۆت دێنم.» ئەوەی گوت و لە ماڵ چووە دەرێ. زەینولمەواسف هیووبی کەنیزی بە دوادا نارد. تا بزانێ لە لای خەڵک ڕێز و ڕوومەتی لە چ ئاستێک دایە. لەو جەنگەیەدا کە ئەو لە کۆڵان و گەڕەکەکانی شـاردا دەسـووڕاوە چاوی بە هیووب کەوت. ڕاوەستا تا هیووب گەیشتێ. لێی پرسی: «هیووب دەچی بۆ کوێ؟» هیووب گوتی: «خانمەکەم منی بە دوای تۆدا نارد، بزانم ڕێز و حورمەتت لە لای خەڵکی چۆنە.» مەسرروور گوتی: «هیووب، بە خودا هیچ شک نابەم و هەژار قەدر و ڕێزی نییە.» کەنیزەکە گوتی: «ئەی ئەگەر ئاوایە بۆ گفت و بەڵێنت بە زەینولمەواسـف دا؟» مەسـروور گوتی: «زۆرن ئەوانەی کە قەول و بەڵێنەکانیان نابەنە سـەرێ. ئەڤیندار ناچار درۆ بکا.» هیووب کە ئەو قسـەیەی بیسـت گوتی: «خەمت نەبێ بە خودا ئەمن هەوڵی خۆم دەدەم، بۆ ئەوەی ئێوە پێک بگەن. ئینجا هیووب ئەوی لەوێ بەجێ هێشـت و بۆخۆی گەڕاوە بۆ لای زەینولمەواسـف و گریا و گوتی: «خانم بە خودا ئەو کابرایە لە لای خەڵک قەدر و ڕێزێکی زۆری هەیە.» زەینولمەواسف بە کەنیزەکەی گوت: «ناکرێ لە دەست چارەنووس ڕا بکەی. بەڵام ئەگەر ئەمن دڵی بدەمێ دەترسـم خەڵکمان تێ بگا.» کەنیزە گوتی: «خانمەکەم خۆ جگە لە من و کەنیزەکەی دیکەت، واتە سکووب کەسی دیکە نازانێ و ئێمەش مەحاڵە نهێنی تۆ لای کەس بدرکێنین. چونکە ئێمە کەنیزی دێرینی تۆین.» زەینولمەواسـف کە ئەوەی بیست سەری داخست. کەنیزەکەکان پێیان گوت: خانم، وا باشە کە کەسێک بنێری لە دووی بێتەوە و بۆخۆت دەسـتی بگری. نەهێڵی دەسـتی بۆ لای هەمووکەسـێک درێژ بکا. زەینولمەواسـف قسـەکەی ئەوانی لا پەسـند بوو. داوای پێنووس و لێنووسـی کرد و ئەو شێعرانەی نووسی:

کـاتـێـک کە خـۆر کـۆی کـردەوە بسـک و کەزیەکەی
بگەڕێـــوە نەچی بچی پشت لێرە بکەی
بۆ ڕازی کردنی دڵـــێک کە ماڵی خۆتە
بگەڕێی ماڵ بە ماڵ بچـــی لە دەرگە بدەی

دوای ئەوە نامەکەی پێچاوە و دای بە هیووبی کەنیزی. کەنیزە نووسـراوەکەی هەڵگرت و بردی بۆ مەسـروور، مەسـروور نارەحەت و پەرێشـان دەگریا و ئەو شـێعرەی دەخوێندەوە.

---

[1]. پێوانەی قورسایی: ڕەتڵێک لە ئێران بەرابەری سەد مسقاڵە و بە وڵات جیاوازە.

چـاوەکـانم ویشــکی ڕێن و لە ســەر هەســتن گوێچکەکـانم
ئەتـۆ بـێـخەم ڕایـدەبـوێـری ڕۆژگـاریـش بـێـخەیـاڵ دەڕوا
قەت ناپرسی دەبێ ئـــــــــــــــێستا عاشقانی من چی بکەن
کەســێـک ژیـــبــنی دۆڕانـد بۆ من دەبێ ژیـانی چۆن بڕوا

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و چل و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مەسروور خەریکی خوێندنەوەی شێعر بوو، لەو جەنگەیەدا هیووب گوێی لە دەنگی ئەو بوو. لە دەرگای دا. مەسروور هەستا و دەرگای کردەوە. هیووب لە دەرگاکە هاتە ژوورێ و نووسراوەکەی دا دەست مەسروور. مەسروور نامەکەی وەرگرت و خوێندییەوە و بە هیووبی گوت: «خاتوون چۆنە؟» هیووب گوتی: «لە نامەکەدا دیارە چۆنە.» مەسروور دیسان نامەکەی کردەوە و بە خوێندنەوەی خۆشحاڵ بوو. ئیدی ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

دەڵێن دڵ ئاگای لە دڵە، دڵی من لە سوێی لە کوڵە
دەریشم کا هەر دێمەوە، قەت قەت نازێم بێ ئەو گوڵە
بولبولی دڵم ناسرەوێ دەڵێ بێ ئەو ژینم ناوێ
مەل ئاشقی هێلانەی بێ بەبێ ئەوێ نازی تاوێ

دوای ئەوە وەڵامی نامەکەی نووسییەوە دای بە هیووب. هیووب نووسراوەکەی وەرگرت و گەڕاوە بۆ لای خانمەکەی. کە گەڕاوە لای خانم دەستی کرد بە تاریفی مەسروور یەکیەک ئامازەی بە چاکەکانی ئەو کرد. زەینولمەواسف گوتی: «هیووب، مەسروور هەر نەهات.» هیووب وڵامی داوە و گوتی: «هەر ئێستا دەگەڕێتەوە.» هێشتا ئەوان قسەکەیان تەواو نەکردبوو، مەسروور لە دەرگای دا. هیووب دەرگای کردەوە و مەسرووری هێنا لای خانم. زەینولمەواسف سڵاوی لێ کرد و هێنای لە پەنا خۆی داینا. دوای ئەوە بە کەنیزەکەی گوت: «کراسی گرانبایی وشکۆدار بێنە.» هیووب لەڕێوە هەستا و کراسی پەڕاوێز زێڕینی بۆ هێنا. زەینولمەواسف کراسی شیاوی لە بەر مەسروور کرد و بۆخۆشی کراسێکی شکۆداری لە بەر کرد. جوقەی ڕازاوە بە مرواری خاوی لە سەر نا و دەسماڵێکی دیبای ڕازاوە بە گەوهەری جۆراجۆری لە دەوری کڵاوجوقەکەی هاڵاند. ڕیحانە و عەنبەری بە بسکییەوە کرد و خۆی بە میسک و عەبیر بۆنخۆش کرد. عوودی لە عووددانەکە کرد. ئەوجار هیووب چاوێکی لێ کرد و گوتی خاتوون:

نابێ شۆخ و شەنگی ئاوا، چاوی پێی کەوێ هەر چاوێ
دەبێ دۆعای لێ بخوێنرێ بۆ وەی نەیبینێ هەر چاوێ

دوای ئەوە زەینولمەواسف هەستا و بە عیشوە و نازەوە هات و چوو. هیووب گوتی: «خاتوون ...

ڕەوت و ڕۆینەکەت دەڵـــــــــــــێی ڕەوتی کەوە
ئەو هـــــــــــــەژارەت شێت کرد بەسە داکەوە
هێند لەبەر دڵی کچـــــــــــــیش ئاشقت دەبێ
مەســــرووری ســـــەرگەردان ئەی چۆن شـــێت نەبێ

زەینولمەواسف سپاسی هیووبی کرد. دواى ئەوە ڕووی لە مەسروور کرد. مەسروور هەستا و گوتی:

ئەوە تۆی یـان ســـەلوی دارســـتـانی
یـا پەریـت و لە بیچمی ئـــــینســـانی

دوای ئەوە زەینولمەواسف دانیشت و مەسرووری لە پەنا خۆی دانیشاند و داوای کرد سفرە ڕاخەن. کەنیزەکان خوانیان ڕاخست و لە دەوری خوانەکە ئەو دوو بەیتە نووسرابوو:

وەرن با بادە بنۆشـــــــــــــــــین و شادی بکەین
خەمی دڵ بە با دەین و قەتـــــــــــیش یادی نەکەین
دوێکە ڕابرد و نەما، ســـــــــــــــۆزیش دێ؟ نازانم
ئێمە و بـادە و پیـاڵەین، دەرفەتە شـــاد بین تـا هەین

دوای ئەوەی خواردنیان خوارد، بادەیان هێنا. ئەوەندە پیاڵە ئەو دەســـتەودەســـتی کرد، هەتا هەموویان کەیفیان ســـاز بوو. ئەوجار مەســـروور پیاڵەیەکی وەرگرت و ئەو دوو بەیتەی گوت:

ئەو شـــــووشـــەیەم وێـدە کە دووگـیـانە بە بـادە
دووگیانە بە شـــــــــــادی ئەو بادە، ســـەری بادە
بـا ســـــــــــووڕ بخۆم و بێ خەم بم و بێم بە لادا
دڵ و یـار کۆکن، خـــــــــــەمی دڵ بچێ بە بـادا

کاتێک مەسروور شێعرەکەی تەواو بوو، زەینولمەواسف گوتی: «مەسروور هەر کەس نان و نمەکی ئێمەی کردبێ، ئەرکی ســـەر شـــانمانە ئاگامان لێی بێ. ئێســـتا کە تۆ نان و پێخۆری ئێمەت خواردووە ئەوە تەواوی ماڵ و ســـامانەکەتم دایەوە. مەســـروور وەڵامی داوە: «خانم ئەگەر ئەو سوێندەی لە نێوان من و تۆدا بوو، درۆ بێ ئەوە من دەڕۆم و دەبم

به موسولْمان.» ئەوجار هیووبی کەنیزی گوتی: «خانمەکەم، خودام هێنایە تکایە ئەگەر بێت و لە قسەم دەربچی و بە قسەم نەکەی ئەو شەو ئەمن لەوماڵەدا ناخەوم.» زەینولمەواسف گوتی: «هیووب، هیشتێک بەبێ دڵی تۆ نابێ، هەستە برۆ کۆرێک برازێنەوە.» کەنیزەکان چوون دیوێکی دیکەیان رازاندەوە و بۆنخۆشیان کرد و سفرەیان راخست و شەرابیان ریز کرد. پیاڵە لە نێوان زەینولمەواسف و مەسروور کەوتە هاتوچۆ هەتا تەواو سەرخۆش بوون.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی هەشتسەد و پەنجایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشكۆ! كاتێک ئەوان كەیفیان ساز بوو، زەینولمەواسف گوتی: «مەسروور ئەوەندەی نەماوە بە ئاواتت بگەی، لە بارەی پێککەیشتنی ئەڤین و ئەڤندارەوە شێعرێکی تازە بڵێ.» لەجێوە مەسروور ئەو شێعرەی خوێندەوە:

شەوێک زۆر خۆشـــــم رابوارد یارم میوان بوو
بزە و پێکەنـــــین و جەفەنگ، شەوچەلەمان بوو
شەرابی ئاڵ لە ناوماندا ئەرکی دەکـــــێشا
خەم و دەردی چەندین ساڵی لە دڵ دەرکـــــێشا
میوەی ڕەنگاوڕەنگ و بە تام خوانـــــی دەنەخشاند
هەرمێ و هەنار و نارنج، ئـــــیشتیایان دەبزواند
سەرەتای ئەو شەوە، سەما و خۆشی و هەڵپەڕین
نیوەشەو مەستی، کـــــۆتای شەو ماچ و تێخزین
یادی ئەو شەوە خـــــۆشە قەت لە دڵ دەر ناچێ
دڵم مـــــیوانی دڵم بوو چۆن لە بـــــیر دەچێ؟

زەینولمەواسف بە بیستنی ئەو شێعرانە شاگەشکە بوو، گوتی: «بژی، مەسروور. دوای ئەوە مەسرووری لە ئامێز گرت و ماچی کرد. مەسروووریش چێژێکی بینی کە قەت بە تەما نەبوو، پێی بگا. بەو جۆرە هەردووکیان بە ئارەزووی دڵی خۆیان گەیشتن. لەو جەنگەیەدا زەینولمەواسف بە مەسرووری گوت: «ئێستا ماڵی تۆ لە من حەرامە، چونکە ئێمە بووینە هاوڕێی یەک. ئیدی زەینولمەواسف تەواوی ماڵەکەی داوە بە مەسروور. ئینجا بە مەسرووری گوت: «مەسروور ئەرێ باخێکت هەیە بێین بۆ خۆشی و سەیران؟» مەسروور گوتی: «باخێکم هەیە لە باخی بەهەشتیش خۆشترە و لە سەر گۆی زەوی تای نییە.» ئیدی مەسروور گەڕاوە ماڵەکەی خۆی و بە کەنیزەکانی گوت: خواردنێکی شایانە ساز کەن و کۆڕێکی شیاو ئامادە بکەن. کەنیزەکان چۆن ڕاسپاردرابوو وڵاتیان ڕازاندەوە و خواردن ئامادە کرا. زەینولمەواسف لەگەڵ کەنیزەکانی هات بۆ ماڵەکەی. خواردنیان خوارد و شەرابیان خواردەوە. دوایە زەینولمەواسف گوتی: «مەسروور شێعرێکی جوانم بە زەین گەیشت، پێمخۆشە لەگەڵ عوود بیخوێنمەوە.» مەسروور گوتی: «خاتوونەکەم. بیخوێنەوە.» زەینولمەواسف عوودەکەی لە سەر دەستی دانا و تارەکانی توند کردەوە و بە دەنگێکی ئاسمانی ئەوە شێعرەی خوێندەوە:

ئێستا به گوڵی ڕووت که ئـــــــــــــــــێره ڕازاوه‌ته‌وه
ســـه‌لوی بـالآت شـــانســـی من لێره گیرســـاوه‌ته‌وه
گوڵستانێکه بـــــــــــــــــێ هاوتا و منی میوان لێره
مه‌لـــــــــــــــــێکی لانه‌وازم و لێره من ماومه‌ته‌وه
بزه‌ی شـــــــــــــــــیرینته ناهێڵێ من لێره بڕۆم
ده‌نا ئه‌و مه‌له نـــــــــــــــــیم، بکه‌ومه ناو داوته‌وه

دوای ئه‌وه زه‌ینولمه‌واسـف گوتی: «مه‌سـروور، قه‌سـیده‌یه‌کمان که له باره‌ی وتووێژی دوو دڵداره‌وه بێ، بۆ بڵێ با کوڕه‌که‌مان خۆش بێ.

لێره‌دا بوو، مـاوه‌ی چیرۆکی ئه‌مشـــه‌ویش کۆتـایی پێ هـات و شـــه‌هرزاد درێژه‌ی چیرۆکه‌که‌ی هه‌ڵگرت بۆ شه‌وێکی دیکه.

# که شەوی هەشتسەد و پەنجا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مەسروور ئەو قەسیدەیەی بۆ خوێندەوە:

ئەو ڕۆژە کـــــــــیژێکم دی بە لەنجە و لار
ســــەرخۆش بوو دەهــــات بکەوێ جار و بار
دڵم بە لەز کەوتە، تەپە و پرســـــــــوک بوو
دیتی وا ناز دەفرۆشـــــــــــێ بە هەزار
کــــــــــــیژێکی ڕەزاسووکی لە بەر دڵان
چــــــــــــاوەکانی پڕ لە ناز مەست و خومار
وتم کـــــــــــــیژێ دێیە ناو ئامێزمەوە
نەکا لەشی ناسکت ببێ بریـــــــــــــندار
وتـــــــــــــی لاچۆ گەنجێکی بێ ئەزموونی
ئەڤـــــــینداری ڕاســــــــتی کوا مل دەکا لار
پشـــــــــــــــیلە پاییزەیەکم با دەمبا
ئـــــــێستە تۆ هاتووی و لێم دەکەی پرسیار
شاعیر، ببـــــــــــینە تۆ بە چاوی دڵت
کوێیە شـــــــــوێن و جێگەکەت و کێیە یار

زەینولمەواسف کەیفی بەو شێعر ساز بوو گوتی: «مەسروور ئەوە خەریکە ڕووناک دەبێ، هەستە با بڕۆین دەنا ئابڕوومان دەچێ.» مەسروور کە ئەوەی بیست، هەستا و زەینولمەواسفی بردەوە ماڵەکەی خۆی و پاشان هەر بیری لە جوانی و دەلالی ئەو دەکردەوە. کە تاو هەڵات و وڵات ڕووناک بوو، مەسروور هەستا چوو دیارییەکی گرانبایی بۆ کڕی و بردی بۆ زەینولمەواسف و لە لای دانیشت. ئیدی ئاوا ماوەیکی زۆر هەر پێکەوە ڕایان دەبوارد. هەتا وا بوو ڕۆژێک نامەیەک لە لایەن مێردی زەینولمەواسف هات کە گوتبووی بەو زووانە دێمەوە لات. زەینولمەواسف گوتی: «هیوادارم قەت نەگاتەوە و چاوم پێی نەکەوێتەوە. چونکە بێتەوە خۆشییەکەمان لێ تاڵ دەکا.» ئیدی ناردی لە دووی مەسروور و دەستیان کرد بە وتووێژ. زەینولمەواسف گوتی: «مەسروور نامەیەکی مێردەکەم هاتووە گوتوویە بەو زووانە لە میسر دەگەڕێمەوە. چ بکەین خۆ ئێمە بێ یەک هەڵناکەین؟» مەسروور گوتی: «ئەمن نازانم چمان لێ دێ، ئەتۆ باشتر مێردەکەی خۆت دەناسی و لە هەموو ژنانیش ژیر و وریاتری، دەتوانی فێڵێک ساز بکەی پیاوان سەری لێ

دەرنەکەن.» زەینولمەواسف گوتی: «ئەو پیاوێکی توورە و تۆسن و شایی بە خۆیە. ئەگەر زانیت لە سەفەر هاتووەتەوە، وەرە بۆ لای. سڵاوی لێ بکە و لە لای دانیشە. پێی بڵێ کاکە گیان ئەمن کابرایەی هەزوێڵەفرۆشـــم، هێندێکی بۆنی جۆراجۆر لێ بکڕە و وردە هاتوچۆی لەگەڵ خۆش بکە. چی گوت بڵێ وایە، ڕەنگە ئاوا فێڵەکەی من ســـەر بگرێ.» مەسروور گوتی: «وا دەکەم.»

دوو سێ ڕۆژی پێ چوو مێردی زەینولمەواسف لە سەفەر هاتەوە. زەینولمەواسف بە هاتنەوەی خۆشـحاڵ بوو، سـڵاوی لێ کرد. مێردەکەی کە چاوی پێی کەوت ئەوی زەرد و شێواو هاتە بەرچاو، هۆکارەکەشی ئەوە بوو، زەینولمەواسف چووبوو دەموچاوی بە ئاوی زەعفەران شـوشـتبوو. لەگەڵ هێندێک فڕوفێڵی ژنانە بۆ ئەوەی خەمبار و پەشـێو دیار بێ. مێردەکەی لێی پرسی: «ئەوە بۆ ئاوا تێک چووی؟» زەینولمەواسف گوتی: «لەو ڕۆژەوەی تۆ ڕۆیشـــتووی من و کەنیزەکانم مات و مەلوول و بووین و بێ تۆ کەس نازانێ ژیانمان چۆن تێپەڕ دەبێ.»

بە کورتی، زەینولمەواســف دەگریا و باســی ڕۆژانی ســەختی بێ ئەویی دەکرد و بە مێردەکەی دەگوت: «ئەگەر کەســێکت لەگەڵ بـایە ئەمن ئەوەنـدە نـاڕەحەت نەدەبووم. دەیگوت، گەورەم تۆخودا ئەگەر ئەوجار چووی بۆ ئەملا و ئەولا زوو زوو خەبەر و باسی خۆتمان بۆ بنێرەوە با ئەوەندە ناڕەحەت نەبم.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مێردی زەینولمەواسف کە گوێی لە قسەکانی ئەو بوو، گوتی: «بە خودا ڕاست دەکەی ئەوجار بە قسەت دەکەم.» دوای ئەوە مێردی زەینولمەواسف هێندێک لە ماڵەکەی برد و چوو دووکانی کردەوە و دەستی کرد بە کڕین و فرۆش. لە پڕدا مەسروور لێی وەژوور کەوت. سڵاوی کرد و لە لای دانیشت. ماوەیەکی زۆر خەریکی وتوویژ بوون. دوای ئەوە هەنبانە زێڕەکەی دەرهێنا و دای بە مێردی زەینولمەواسف و گوتی: «ئەو دینارانەم لێ وەرگرە و بایی ئەوەندە دینارەم بۆنی جۆراجۆر بدەیە.» مێردی زەینولمەواسف بایی دینارەکانی شت دایە. بەو جۆرە ئیدی بەردەوام هات و چۆی دەکرد. تا وا بوو ڕۆژێک کابرا بە مەسرووری گوت: «دەمەوێ لەگەڵ کەسێک ببمە شەریک.» مەسروریش گوتی: «منیش بە تەمای ئەو کارە بووم. چونکە باوکم لە وڵاتی یەمەن بازرگان بوو، ماڵێکی زۆری بۆ بەجێ هێشتم. دەترسم ئەو ماڵەم لێ بڵاو بێتەوە و لە دەستم بچێ. کابرای مێردی زەینولمەواسف گوتی: «دەی لەگەڵ من ببە بە شەریک، با پێکەوە سەفەر بکەین و وەک برای چاک فێری کڕین و فرۆشتنت دەکەم.» مەسروور گوتی: «دەی سپاسیشت دەکەم.» دوای ئەوە کابرا مەسرووری بردەوە ماڵی خۆی و لە داڵان ڕایگرت و بۆخۆی چووە ژوورێ بۆ لای زەینولمەواسفی خێزانی و پێی گوت: «لەگەڵ کەسێک بووم بە هاوڕێ و ئێستا بانگهێشتم کردووە و میوانمانە. خواردنێکی خۆشمان بۆ ساز بکە.» زەینولمەواسف زانی ئەو کەسە مەسرووورە، زۆر خۆشحاڵ بوو. چێشتێکی زۆر بە تەمام و شایانەی بۆ ساز کرد. دوای ئەوە هاتەوە بە زەینولمەواسفی گوت: «لەگەڵم وەرە لای میوانەکە و بەخێرهاتنی بکە. زەینولمەواسف تووڕە بوو، گوتی: «ئەمن دەبەیە لای کەسێکی بێگانە و غەوارە، وەڵا تەواومان کرد. ئەگەر ئێستا لەت لەتم کەی نایەم. جا تۆ شەرم لەو دەکەی، خۆ ئەو نەسرانییە و ئێمە جوولەکە و ئێمە دەمانهەوێ پێکەوە ببین بە هاوڕێ و برادەر.» زەینولمەواسف گوتی: «ئەمن قەت نایەم بۆ لای کەسێکی بێگانە و غەوارە کە نە دیومە و نە دەیناسم.» ئەوە کابرای مێردی وایدەزانی خێزانی بە ڕاستییەتی، هەر بۆیە پێداگری کرد، هەتا ئاخری قایلی کرد بچێ بۆ لای مەسروور و سڵاوی لێ بکا و چاک و خۆشی لەگەڵ بکا. مەسروور سەری داخستبوو. وەک ئەوەی بڵێ شەرم دەکەم. مێردی زەینولمەواسف ڕووبەڕووی مەسروور دانیشت و چاویان لێک دەکرد. هەتا ڕۆژ ئاوا بوو. مەسروور گەڕاوە ماڵەکەی خۆی. گڕی خۆشەویستی لە دەروونیدا بڵێسەی دەستاند.

بەڵام مێردی زەینولمەواسف بیری لە ڕێکوپێکی و ئاکارجوانی هاوڕێکەی دەکردەوە. کە بوو بە شەو، ژنەکەی خواردنی هێنا. بولبولێکیان هەبوو، هەر کاتێک کابرا نانی دەخوارد

دەهاتە لای و خواردنی لەگەڵ دەخوارد و دەچووە سەر سەر و سەر شانی. ئەو ماوەیە کە کابرا لە ماڵ نەبوو خووی بە مەسروور گرتبوو. کاتێک مەسروور شتێکی دەخوار دەهاتە لای و لەگەڵی دەخوارد و دەچووە سەر شان و سەری. کە مەسروور ون بوو، خاوەنی بولبولە هاتەوە. بولبولەکە ئەوی نەدەناسییە و لێی نەدەهاتە پێشێ. کابرا پێی سەیر بوو، بیری دەکردەوە کە بڵێی بۆچی ئەو بولبولە نەیە بۆ لام.

زەینولمەواسف هۆش و بیری هەر لە لای مەسروور بوو. خەوی لێ نەدەکەوت. هەتا دوو سێ شەوان ئەوە حاڵی بوو. شەوی چوارەم کابرای جوولەکە نیوەشەو بە دەنگی خێزانی خەبەری بووەوە، کە گوێی ڕاگرت نێوی مەسرووری دێنا. لێی کەوتە شکەوە بەڵام، بێدەنگەی لێ کرد و وەسەر خۆی نەهێنا. کە ڕۆژ بووەوە هەستا چوو بۆ دووکان و لە دووکان دانشت. مەسروریش هات و سڵاوی کرد. جووەکەش جوابی سڵاوەکەی داوە و بە سەر و ڕووی خۆشەوەوە چاک و چۆنی لەگەڵ کرد. دوای ماوەیەک وتووێژ لەگەڵ مەسروور. کابرا گوتی: «هەستە با بڕۆینەوە بەڵێننامە و شتەکەمان بنووسین. مەسروور گوتی: «زۆرم پێ خۆش و لە خزمەتت دام.» کە گەیشتنەوە ماڵی جووەکە زوو خزانی لە هاتنی مەسروور ئاگادار کردەوە کە بە تەمان بەڵێننامەی شەریکایەتی دەنووسین و ئەتۆش میواندارییەکی باش بکە. پێویستە تەتۆش لەوێ بی و ئاگاداری چۆنییەتی شەریکایەتییەکەمان بی. زەینولمەواسف گوتی: «تکات لێ دەکەم لە من گەڕێ با ئەمن نەیەمە لای پیاوی بێگانە. جووەکە بێدەنگەی لێ کرد و بە کەنیزەکانی گوت خواردن و شت ساز بکەن. دوای ئەوە بانگی بولبولەکەی کرد. بولبولەکە هاتە خوارێ و چوو لە سەر کۆشی مەسروور هەڵنیشت و خاوەنی خۆی نەناسییەوە. لەو جەنگەیەدا لە مەسرووری پرسی: «براکەم ناوی تۆ چییە؟» مەسروور ناوی خۆی پێ گوت. سەیری کرد ئەوە هەر ئەو نێوەیە کە شەوانە ژنەکەی لە خەودا دەیڵێتەوە. دوای ئەوە جوولەکەکە ئاوڕی داوە، سەیری کرد ئەوە خێزانی بە چاو و برۆ شتێک بە مەنسوور دەڵێ. زانی ئەوانە شتێکیان لە نێوان دایە و یەکتریان خۆش دەوێ. پاشان بە مەسرووری گوتی: «کاکە گیان ڕوخسەتم بدە تا ئامۆزاکانیشم ئاگادار بکەمەوە، با ئاگایان لەو شەریکایەتییە هەبێ و شایەدمان بن.» مەسروور گوتی: «چۆنت پێ خۆشە با وا بێ. لەڕێوە جووەکە هاتە دەرێ و چوو لە شوێنێک خۆی مات دا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! جووە لە ماڵێ هاتە دەرێ و چوو لە شوێنێک کە ئەوانی لێ دیار بوو خۆی مات دا بە جۆرێک کە ئەواو ئەویان لێ دیار نەبوو. دوای ئیستێک زەینولمەواسف لە هیووبی پرسی: «خواجە چی لێ هات؟» هیووب وەڵامی داوە: «لە ماڵ چووە دەرێ.» زەینولمەواسف گوتی: «دەرگاکە داخە و مەیکەوە هەتا ئەو لە دەرگا بدا. ئەودەم ئێمە ئاگادار کەوە جا بیکەوە. کەنیزە گوتی: «بە سەر چاو وا دەکەم.» جووەکەش ئەوانی لێ دیار بوو. سەیری کرد، زەینولمەواسف پیاڵەیەکی شەڕاب بۆ تێ کرد و بە گوڵاو و میسک بۆنخۆشی کرد و دایە دەست مەسروور. مەسروور هەستا و پێی گوت: «قەسەم بە خودا ئاوی دمی تۆ لە شەراب خۆشترە.»

بە کورتی، ئەوان پیاڵە شەرابیان دەدا بە یەکتر و ئەویش چاوی لێ بوو. سەری لەو هەموو خۆشەویستییەی بەینیان سووڕ مابوو. ئیدی قینی هەستا و بە ڕقەوە گەڕاوە بەر دەرگا و لە دەرگای دا. کەنیزە گوتی: «خانم خاوەنم گەڕاوە.» خانم گوتی: «دەرگای لێ بکەوە بە خێر نەیەتەوە.» ئیدی سکووب هات و دەرگای کردەوە. جووەکە گوتی: «ئەوە بۆ دەرگاتان داخستبوو؟» کەنیزە کە گوتی: «کاتێک تۆ لە ماڵ نابی، شەو و ڕۆژ ئەوە کاری ئێمەیە.» جووەکە گوتی: «زۆر زۆر باشە بژی، کاری چاک دەکەی.» دوای ئەوە چووە ژوورەوە و هیچی وە سەر خۆی نەهێنا و گوتی: «مەسروور ئەو باسی شەریکایەتییە هەڵگرە بۆ کاتێکی تر.» مەسروور گوتی: «زۆر باشە گەورەم تۆ چۆن بڵێی وا دەکەم.» ئیدی مەسروور هەستا و گەڕاوە بۆ ماڵەکەی خۆی. مێردی زەینولمەواسف نەیدەزانی چ بکا و بڵێ چی، سەری لێ شێوابوو. بەجارێکی ئاوەزی شێوا و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «بولبولەکەشم مەیلی ناوم و کەنیزەکانیش دەرگام لێ دادەخەن. ئیدی هێندە ناڕەحەت بوو. ئەو شێعرەی خوێندەوە.

تۆ قەلاسا نزم فڕ و خوێڕی گـــــــــــــــــــــــــری
فـێـر نەبـووی تـۆ، بەرگەی لـوتـکەی بەرز نـاگـری
خۆت پەســـتـــــــــــــــــی رووگەت پەین و پاڵە و پرزە
چـــــــــــــــــــــــــــــــووزانی تۆ ڕێزی گەورەیی بگری
من نەگبەتم خـــــــــــــــــــــــــۆشم دەوێی بە قەد چاو
کوا دەهێڵم بە ئاســــــــــــــــــــــانی دەست هەڵگری

زەینولمەواسف کە ئەو شێعرەی بیست تەواوی ئەندامی وە لەرزە کەوت و گۆنەی

زەرد هەڵگەڕا و بە کەنیزەکەی گوت: «گوێت لەو شـــێعرە بوو یان نا؟»کەنیزەکە وەڵام یداوە: «قەتم نەبیستووە شێعری ئاوا بخوێنێتەوە. بەڵام لێی گەڕێ با چی دەڵێ بیڵێ.»

کاتێک مێردی زەینولمەواسـف کەوتە پێوشـوێنی و ڕاسـتی شـتەکەی بۆ دەرکەوت، لە دڵی خۆیدا گوتی وا دیارە دووری نەخەمەوە و نەیبەم بۆ هەندەران ئەو شـــتەی لە دڵی ناچێتە دەرەوە و دەسـت لەو کارە هەڵناگرێ. ئیدی تەواوی ماڵ و سـامانەکەی فرۆشـت و بە فێڵ نامەیەکی نووســـی و بۆ ژنەکەی خوێندەوە و گوتی: «ئەو نامەیە خزمەکانی من بۆیان نووسـیوم و داوایان کردووە بچین بۆ لایان. زەینولمەواسـف گوتی: «باشـــە ئەوە چەندە لەوێ دەمێنینەوە؟» گوتی: «دوازدە ڕۆژ.» ئیدی زەینولمەواسـف دڵی نەشـکاند و ڕازی بوو. گوتی: «کەنیزەکانیشـــم بێنم یان نا؟» جووە گوتی: «لەو کەنیزانە هیووب و سکووب بێنە و ختووب با لێرە بێ. دوای ئەوە کەژاوەیکی ڕازاوەی بۆ ئەوان ئامادە کرد و ئامادەی سەفەر بوون. زەینولمەواسفیش کەسێکی ناردە لای مەسروور و پێی ڕاگەیاند کە ئەوە مێردەکەی بە تەمایە لێکیان هەڵاوێرێ. ئەتۆ پەیمانشکێنی مەکە و گفت و بەڵێنییەکانت لە بیر نەچێ. ئەمن زۆر لە پیلان و گەلاڵەکانی دەترسم. دوای ئەوە جووە بڕیاری سەفەری دا و کەوتنە خۆ سازکردن. زەینولمەواسف دەستی کرد بە شین و گریان و شەو ڕۆژ ئەوە پیشـەی بوو. خەو و خواردنی نەبوو. لە کۆتاییدا زەینولمەواسـف کە زانی مێردەکەی تازە پاشـــگەز نابێتەوە و هەر دەڕوا زێڕ و جلوبەرگەکەی هەموو کۆ کردەوە و بە ئەمانەت لە لای خوشـکی دانا و ڕووداوەکەشـی بۆ خوشـکی گێڕاوە. ئینجا ماڵاوایی لە خوشـکی کرد و گەڕاوە ماڵەکەی خۆی. کە گەڕاوە سـەیری کرد ئەوە مێردەکەی ماڵەکەی لە وشـتران داوە، ئامادەی سـەفەرە. زەینولمەواسـف بە ناڕەحەتی و ماتەمییەوە لەوێ ڕاوەسـتا و بیری لە ئازاری دووری دەکردەوە. ڕێکەوت وا بوو کە مێردی زەینولمەواسف کارێکی بۆ هاتە پێش و لە ماڵ چووە دەرێ. لەو جەنگەیەدا زەینولمەواسف هات لە سەر دەرکی یەکەم. ...

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! زەینولمەواسف هات لە سەر دەرکی یەکەم، ئەو شێعرەی نووسی:

نـــــــــــــووسراوە! کە لەو سەرە نووسراوی
بلـــــــــــــــێ بە یارم تۆ ڕاسپێردراوی
یـــــــــــــــارەکەت بە ئازارەوە ڕۆیی
جـێـی هـێشـــت دڵ و خـزم و کەس و خـۆیـی
بە یادی تۆوەوە فرمـــــــــــێسکی باراند
هەر وەکو شـــــــــــێتان وڵاتی دەدواند

دوایە هاتە دەرکی دووەم و لە سەر ئەویش ئەو شێعرەی نووسی:

ڕۆیشـــتم و کـۆڵـی خەمـی قـورســـم لە کـۆڵ دا
بە کێو و شـــاخ و بەنـدەن و بە دەشـــت و دۆڵـدا

دوای ئەوە گەیشتە دەرگای سێیەم و ئەو شێعرەی نووسی:

بە دڵـــــــــێکی پڕ لە خەم و پەرێشانەوە دەڕۆم
بەرەو دیاری غەریـــــــبی و بێ دڵ و بێ یار تڕۆم
هەر دەڕۆم و دادەبـــــــڕێم، لە خۆم و لە دڵەکەم
گەردوون زۆر بێ بەزەیە نـازانم ڕوو لە کوێ دەکەم

پاشان گەڕاوە ژووری و بە گریانەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئاخ لە دەست ئەو دابڕانە بـــــــــــۆچی هێندە جەرگبڕە
ئێدی گوڵی خـــــــــــۆشەویستی نابێ شین بێ لەو قاقڕە
جـا کوا ئەمن دەگرم بەرگەی ئەو داخ و دەرد و مـاتەمە
خەمی دونیا کـــــــــــۆکەنەوە لە چاو خەمی من هەر کەمە

دوای ئەوە مێردەکەی هاتەوە و ئەوی لە سەر ئەو کەژاوەیەی کە بۆی ساز کردبوو دانا. کاتێک زەینولمەواسف لە نێو کەژاوەی سەر وشترەکە دانیشت ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئـاخـری ڕۆیشـــتـم و خـەون نەبـوو ئەو تـرس و خـۆفە
دیـاره دەبێ بژیم لەگەڵ ئەو خـــــــەم و ئـاخ و ئۆفە
دار و بەردی وڵاتەکەم ئاگاتان لە یـــــــــــارم بێ
هەر چەنـد دڵـم لە لایەتـی و لە بەر چـاوم ون نـابـێ
دەڕۆم بـۆ نـازانـم کـوێ، بـێ ئەوەی هـێـزی پـێـم هەبـێ
جەســـتە هەر دەڕوا و بێ ئەوەی ڕووحیشـــی تێدا مـابێ

مێردەکەی هاتە لای پێی گوت: «زەینولمواســـف، خەمی ماڵێت نەبێ و خۆت ناڕەحەت مەکە زوو دەگەڕێینەوە.» هەر ئاوا بەردەوام دڵخۆشی دەداوە و قسەی لەگەڵ دەکرد. هەتا لە شار چوونە دەرێ و ڕێیان داگرت. زەینولمواسف ئیدی تازە دەستی شوت و لێی سوور بوو هەموو شتێک وە ڕاست گەڕا. هەر بۆیە زۆر زۆر ناڕەحەت و پەرێشان بوو.

مەســـرووور لە ماڵێ دانیشـــتبوو، نەیدەزانی ڕوو لە کوێ کا. هەســـتی کردبوو ئەوە خۆشـــەویســـتەکەی دەڕوا، لەڕێوە هەســـتا چووە ماڵەکەیان. ســـەیری کرد دەرگاکەیان پێوەدراوە و ئەو شیعرەی لە سەر نووسراوە. ئیدی شیعرەی خوێندەوە و بێ هۆش بوو. کاتێک وە هۆش هاتەوە، هەستا چووە ژوورێ و گەیشتە دەرکی دووەم. لەوێش چاوی لێ کرد، وەک دەرکی سێیەم شیعری لێ نووسراوە. کە ئەو شیعرەشی خوێندەوە، ئەوەندەی دیش ئاوری گرت و خۆشەویستییەکەی زیاتر بوو. لەگەڵ ئەوەشدا خەمی زیاتر بوو. ئیدی هاتە دەرێ و کەوتە شوێن خۆشەویستەکەی. بە هەڵاتن چوو هەتا گەیشتە کاروانەکەیان. سەیری کرد ئەوە زەینولمەواسف لە دواوەی کاروانکەیە و لە نێو کەژاوەکەدا دانیشتووە. مێردەکەشـی لە پێشـەوەیە. ئیدی دەسـتی بە کەژاوەکەوە گرت و لە تاوی کۆچی یار ئەو شیعرەی خوێندەوە:

ئەرێ دڵڕەق تۆ پێم نـاڵێی ئەو گوڵەی من بۆ کوێ دەبەی
ئەو گوڵە دڵی لای منە نەچی جەستەی ســــــاردی ببەی
گەر چارەنووس دەسەڵاتی داوە بە تۆ هـــــــــێواش برۆ
جەستەی بێ دڵیشی، ناســــــک و نازدارە ئازاری نەدەی
گەر سەدان ساڵ لە من دوور بێ ڕیشەی دڵم هەر پێی دەگەم
لە هەر کوێ بێ بروســـکاســـا دەبێ ئاخری هەر پێی بگەم

زەینولمەواسف کە ئەو شیعرەی بیست زانی ئەوە مەسرووورە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! زەینولمەواسف زانی ئەوە مەسرووورە، لە ڕێوە دەستی کرد بە گریان و کەنیزەکانیشی لەگەڵی دەستیان کرد بە گریان. ئینجا گوتی: «مەسروور بیکە بۆ خاتری خودا بەسە بگەڕێوە با مێردەکەم نەمان بینێ. مەسروور کە گوێی لە دەنگی بوو، خەریک بوو بێ هۆش بێ لە تاوان ئەوە شێعرەی خوێندەوە:

تـۆ نـازانـی چەنـد بەژانە دووركەوتـنەوەی كەژاوەی دڵ
دەبـــــــــێ دڵت وەک بەرد وابێ، بولبول دابڕێنی لە گوڵ
ئەو کابرایە بـــــــــــــێ ڕەزایە چۆن دڵی دێ ئاوا بکا
مەلێکی ئەڤـــــــــــینداری وا، دوورخاتەوە لە گوڵ و چڵ

بەو جۆرە مەســــروور هەر دەگریـان و دەنـالاّ و بە دوای کـاروانـدا دەڕۆیشـــــت و زەینولمەواســـفیش لە بەری دەپـاڕاوە کە پێش ئەوەی ولات ڕوونـاک بێ بگەڕێتەوە بـا ئابڕوویان نەچێ. ئیدی مەســـروور چووە پێش کەژاوەکە و مالاوایی لێ کرد و بێ هۆش کەوت. کاتێک وە هۆش هاتەوە کاروان لە دوور دەڕۆیشـــت. ئیدی چاوی تێ بڕین و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تۆ وا ڕۆیشـتی و من مامەوە و دەرد و کەســــــــــەر
دانە دانەی شـوێنپێکانت دەخـــــــــــــــــەمە سـەر سـەر
نەمدەزانی خـــــــــــــــــــــۆشی چییە هەتا تۆ نەبوویت
نەم دەزانـــــــــــــی بە دەردی دووری تـا تۆ نەچوویـت
بڕۆمەوە باوەشــــــــــــــــــــــــــــی سامناکی بێ تۆیی
بچـــــــــــــــــــــــــێژمەوە من ژیانی پووچی بێ هۆیی

دوای ئەوە گەڕاوە مـاڵەکەی، وەک ئەوەی لە خەو ڕاپەڕابـێ بە ئـاواتـی دیـداری خۆشـەویسـتەکەی خۆی بە ژووریدا کرد. کەچی سـەیری کرد خۆشـەویسـتەکەی چۆڵی کردووە و لەو مـاڵەدا نەمـاوە. زۆر گریـا. وای لێ هـات بێ هۆش بوو. چی وای نەمـابوو بمرێ. کە وە هۆش هاتەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئاخرێکەی تۆ ڕۆیشـتی و ئەمن بە تەنیا مامـــــــــــــەوە
بیرەوەریـت وەفـادارە هەموویـان دێن بە لامــــــــــــەوە

هەر چۆنێـک بێ لە ئێســـتـاوە، خۆم لەگەڵیـانـا دەژیم
تـا دەمرم، جـارجـارەیەک پێـدەکەنم دەنـا دەگریــــــم

دوای ئەوە مەسروور گەڕاوە ماڵەکەی خۆی. با ئەو بگەڕێتەوە...

مێردی زەینولمەواسـف، زەینولمەواسـفی برد، هەتا لە دە شـاران تێپەڕین و لەوێ لایان دا شارێک. زەینولمەواسف لەوێڕا نامەیەکی بۆ مەسروور نووسی و دای بە هیووب و پێی گوت: «ئەو نامەیەم بۆ بنێرە بۆ مەســــروور و با بزانێ کە مێردەکەم چۆن فێڵی لە ئێمە کرد.» کەنیزە نامەکەی لێ وەرگرت و بۆی نارد. کە نامەکە گەیشـتە دەسـت مەسـروور و خوێنـدییەوە، هێنـدە گریـا هەتـا بەر پێی تەڕ بوو. ئەویش نـامەیەکی نووســـی و بۆ زەینولمەواسفی نارد و بەو شێعرە تەواوی کردبوو:

خــــــــــــۆشەویستیت هەوایەکە دەگەڕێ بە ناو گەردوونا
لە هەرکوێ بیـت هەر دێتەوە دەچێ بە کونـی گەرووما

کە نامەکە گەیشــتە دەسـت زەینولمەواسـف، کردییەوە و خوێندییەوە. پاشــان دای بە هیووب و گوتی: «لای کەس دەنگ مەکە.» ئەوەندەی پێ نەچوو مێردەکەی زانی کە ئەوان نامە بۆ یەکتر دەنێرن. ئینجا زەینولمەواسـف و کەنیزەکانی هەڵگرت و ڕێگای بیست ڕۆژی دیکە لەو شـارەش دوور کەوتنەوە. چوونە شـارێکی دیکە. با زەینولمەواسـف و وان لەوێ بن.

مەسروور لە خەو و خواردن بوو. ئۆقرەی لێ هەڵگیرا و بەردەوام لە ئاخم و ڕۆدا بوو. هەتا وا بوو، شـەوێک لە خەونیدا بوو کە زەینولمەواسف لە باخێک هاتە لای و لە باوەشـی گرت. لەڕێوە لە خەوەکەی ڕاپەڕی. کاتێک زەینولمەواســـفی نەدی و زانی خەونە، ئیدی ئاوەزی تێک چوو. هۆش و گۆشـی نەما و فرمێسـکی هاتە خوارێ. ئەو شـەوە هەر چۆنێک بوو ڕۆژی لێ بووەوە و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دوێ شـەو هاتیتە خەوم، ئامــــــــــــــێزت بۆ گرتمەوە
خـۆشــــی بـارانـت کـردم، لە خەم دوورت خســـتمەوە
هەژار خـــۆزگە ژیـــانـــم درێـــژەی ئەو خەوە بـــا
ئیتر ژیانی ڕاســتــــــــــــــــــیم تا ئەبەد نەدیتبا

دوای ئەوە هەســـتا چوو بۆ لای ماڵەکەی زەینولمواســـف، بەدەم گریانەوە بە دەوری

خانووەکەیاندا هات و چوو. کە لە پڕدا زەینولمواســـــفی هاتە بەر چاو. گڕی ئەڤینی کڵپەی سەند و خەم و دەردی سەری کرد و لە ئاستە خۆی بێ هۆش کەوت.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و پەنجا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مەسروور کە هاتەوە سەرخۆ ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئای خوایە خەمێکی چەندە قورسـە، لە باس نایـــــــە
ڕوو لە هەر لایەک دەکەم سـیـمـای لە بەر دەمـمـایە
ڕووحی وەها تێکەڵاوی ڕووحم بووە قەت قـــــــەت
ناتوانم لە بیری بکەم گەر بشم کەن لـــــەت لـــــەت

دوای ئەوەی شێعرەکەی تەواو کرد، لە لایەکی ماڵەکەیانەوە دەنگی قڕاندن هات. گوتی: «سـوبحانەڵڵا، خۆ کوند و قەلەڕەشـە هەر لە کاولاش و کەلاوە و شـت دەبن. بڵێی چ بێ. ئاخێکی هەڵکێشا و بە داخ و کەسەرەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ڕۆژگـاری چەوت کـارت بـۆچ وا گەنـد و ڕەشـە
ئێرە جێگەی شالــــــــــــــــــــوورە یا قەلەڕەشە
حەیف نییە ئەو گوڵزارە بێ بولبـــــــــــــــول بێ
حوکم و دەسـەڵات بە دەسـت شـوومترین مەل بێ

زەینولمواسـف، خوشـکێکی هەبوو ناوی نەسـیم بوو. کە لەو جەنگەیەدا لە شـوێنێکی بەرزەوە دەیڕوانییە مەسـروور. کە ئەوی ئاوا دیت، دەسـتی کرد بە گریان و ناڵین و بە دڵێکی بە خەمەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

پەپوولەی شـەیدا دەگەڕێ خونچەگوڵی گـــــوم کردووە
قەلی ڕەشـیش بە قاڕە قاڕ مێشـکی پەپـــوولەی بردووە
دارستانێکە بێ درەخت مـــــــــــەلی ئاشق لێرە بڕۆ
بێ هـێلانە چ دەکەی تۆ هـێلانەکەت لێ تێک چووە

مەسـروور کە گوێی لە دەنگی نەسـیم بوو، زۆر چاک گریا. خوشـکی زەینولمواسـف، ئاگای لە خۆشەویستی نێوان ئەو دوانە بوو. بە مەسرووری گوت: «تۆ ئەو خودایە بێرەدا مەیە، نەوەک خەڵک وا بیر بکەنەوە کە لەبەر من دێیە ئێرە. ئەتۆ بەو کارەت خوشـکەکەی منت تووشـی دوورەوڵاتی کرد. بزانە منیش تووش ناکەی. بۆخۆت دەزانی ئەگەر تۆ نەبای دیوی خوشـکەکەم ئێسـتا چۆڵ نەدەبوو. ئێسـتاش دان بە خۆتدا بگرە. مەسـروور کە ئەو

قســـانەی بیســـت. زۆر گریا و پێی گوت: «نەســـیم، ئەگەر بمتوانی با بفڕم، ئەوەندەی بیر دەکەم هەر ئێســتا دەفڕیم بۆ لای. چۆن دەتوانم دان بە خۆمدا بگرم؟! نەسـیم گوتی: «جگە لە دان بە خۆدا گرتن هیچی دیکەت پێ ناکرێ.» مەســـروور گوتی: «تۆ خودا لە زمان خۆتەوە نامەیەکی بۆ بنووسە و وەڵامەکەی پێشـانی منیش بدە با دڵم بحەسـێتەوە. نەسـیم گوتی: «بە دڵ و بە گیان.»

ئیدی جەوهەر و کاغەزی وەرگرت و مەسروور حەز و ئیشتیا و تاڵی و سوێرییەکانی ڕۆژگاری دووری بۆ نەســیم دەگێڕاوە و دەیگوت بنووســە: «ئەو نووســراوەیە لە زمان، نەمامێکی ســووتاوی ئاگری دووری و ئەڤینداریکی پەشـێو و عەوداڵە کە شـەو و ڕۆژ خەو خۆراکی نییە و دایمە ئەســرین لە چاوانی دەتکێ. خەم و ماتەم قەڵافەتی تێک شــکاندووە. دەڵێی کۆترە و فڕینی لە بیر چووەتەوە، خەم و پەژارە کز و لاوازی کردووە و چی وای نەماوە تێداچێ. دنیای ڕووناکی لە بەر چاو تەنگ و تاریک بووە و شــووشـــەی تاقەتی لە شکانە. شـەو و ڕۆژ هاودەمی شنە و سروە و ئەو نەرمەبایانە و لەگەڵیان سـازگارە. ئەو شێعرەش بنووسە:

سـەرتۆپی جوانان هـــــــــــــێمای دەلالی
تۆ بە هەواڵـــــــــــــــــــی یارت نازانی
فەقیرە، هێلانەی لـــــــــــێ تێـک چووە
ئەقـڵ و ئـاوەزی لە دەســـــت دەرچـــووە
لەگەڵ دار و بەرد وتـــــــــــــوویژ دەکا
هێندەت بیر دەکا نازانـــــــــــــێ چ بکا

نەسیمی خوشکی زەینولمواسف سەری لە شاعیری و زمانپاراوی مەسروور سوور ما. دوای ئەوە نووســـراوەکەی بە میســـک و عەنبەر بۆنخۆش کرد و دای بە یەکێک لە بازرگانەکان و گوتی: «ئەو نامەیەم بۆ بگەیەنە دەســـتی خوشـــکم زەینولمواســـف یا کەنیزەکەی واتە هیووب. جگە لەو دوانە نەیدەی بە کەسـی دیکە.» بازرگان گوتی: «باشـە بە ســـەر چاو.» کاتێک نووســـراوەکە گەیشـــتە دەســـت زەینولمواســـف زمان و شـێوەی داڕشتنەکەی ناسییەوە و زانی ئەو وشە و پەخشانە جوانە کاری مەسرووورە. نامەکەی ماچ کرد و لە سەر چاوی دانا. ڕۆندک بە ڕووی دا هاتە خوارێ. ئەوەندە گریا تا بێ هۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە داوای جەهەر و کاغەزی کرد و وەڵامی نامەکەی نووسـییەوە و کوڵ و کۆی ئەوینی هەڵڕشت. باسی داخ و دەردی دووری و حەز و تاسەکانی بۆ کرد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی هەشتسەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! زەینولمواسف لە وەڵامی نامەکەی مەسروورردا نووسی کە ئەو نامەیە بۆ خاوەنی گیان و جەستە و پاشای ڕوح و ڕەوانم، ئەوکەسەی لە تاوانی مات و مەلول و شێواو و پەرێشانم و دووری کەلەلای کردووم. ئەو دوو بەیتەشی نووسی:

مەلێکی لانەوازم پەڕیوەی هەندەران
بیری هێلانەکەم دەکەم و دڵداری جوان
خۆشەویستم ڕەنگە سەیر بێ ئەمن ماوم
یادی تۆیە کە وزە و توانایی پێ داوم

ئەوجار نامەکەی بە عەبیر و میسک تەواو کرد و دای بە بازرگانێک و پێی گوت: «ئەو نامەیەم بۆ بدە بە دەستی خوشکم و جگە لەو نەیدەی بە کەسی دیکە.» کاتێک نامەکە گەیشتە دەست نەسیم. نەسیم نامەکەی نارد بۆ مەسروور. مەسروور نامەکەی ماچ کرد و لە سەر چاوی دانا و ئەوەندە گریا هەتا بێ هۆش بوو. با مەسروور لەوێ بێ هۆشی بکەوێ....

مێردی زەینولمواسف کە زانی ئەوان خەریکی نامە گۆڕینەوەن، لەو شارە ڕۆیشت. زەینولمواسف و کەنیزەکەی بردە شارێکی دیکە. زەینولمواسف گوتی: «سوبحانەڵلا، ئەوە هەتا کەی هەر ئەوشارە و شارمان پێ دەکەی؟» جوولەکەکە گوتی: «دەبێ ڕێگای ساڵە ڕێیەک لە وڵاتی خۆتان دوورتان خەمەوە. هەتا نەتوانن نامە بۆ یەک بنێرن. پاشان دەبێ بزانم چۆناوچۆنت ئەو ماڵەی من داوە بە مەسروور دەبێ تەواوی ئەو ماڵەت لێ بستێنمەوە. پێشت بسەلمێنم کە مەسروور بە کاری تۆ نایە و ناتوانێ تۆ لە دەست من دەر بێنێ.» دوای ئەوە چوو بۆ لای ئاسنگەر و ئاڵقە و زنجیری بۆ کڕین و هێنایەوە. جلەوبەرگە بە شکۆکانی لە بەر داکەند و جلی پەشمین و کەتانی لە بەر کرد. بانگی ئاسنگەر کرد و گوتی: «ئەو کەنیزانەم بۆ غەل و زنجیر بکە.» یەکەم کەس کە هێنایە پێشێ زەینولمواسف بوو. کاتێک ئاسنگەرەکە ئەوی دیت، هۆشی پەڕی و قامکی خۆی گەزت و هۆگری بوو. بە جووەکەی گوت: «ئەو کەنیزانە چ تاوانێکیان کردووە؟» جووەکە وەڵامی داوە: «ئەوانە کەنیزی من و دزیان لێ کردووم و هەڵاتوون.» ئاسنگەرەکە گوتی: «خودا هیوابڕاوت کا. ئەگەر ئەو کەنیزانە لە لای قازیقازییان بایەن و ڕۆژێ هەزار گوناهیان کردبا لێی بە هێند نەدەگرتن. جگە لەوەش چ وەک دزیش ناچن و هێمای دزبوونیان تێدا نابینم. چۆنیان غەلوزنجیز دەکەی!؟» دوای ئەوە ئاسنگەرە لە بەری پاڕاوە کە ئاڵقە و

زنجیریان لە پێ نەکا. کاتێک زەینولمواسـف دیتی کە ئاسـنگەرەکە تکایان بۆ دەکا پاوانەی زنجیریـان لە پێ نەکـا. بە جووەکەی گوت: «بیکە بۆ خـاتری خودا مەمبە لای ئەو کـابرا غەوارەیە.» جووەکە گوتی: «ئەی چۆن ڕووبەڕووی مەسروور دانیشتی؟» زەینولمواسف هیچی نەگوت. لە کۆتاییدا بە قسـەی ئاسـنگەرەکەی کرد و پاوانەیەکی سـووکی لە پێی زەینولمواسـف کرد. بەڵام پـاوانەی کەنیزەکـانی دیکە قورس و گران بوو. لەشـی زەینولمواسـف نەرم و ناسـک بوو. بەرگەی توند و تیژی نەدەگرت. بەڵام ئەویش وەک ئەوان جلی کەتان و پەشمی لەبەردا بوو، کە لەبەر زبریان هەموو گیانی دەڕنی. تا وای لێ هات هەموویان لەڕ و لاواز بوون و ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕا.

ئاسـنگەریش ئەوەندە ئاشـقی زەینولمواسـف ببوو، تەواو لە کەللەی دابوو. بە دڵێکی بە خەمەوە ئەو شێعرەی دەخوێندەوە.

بیسـتبووم کـیژی جـوان هەیە ئەمـن نەمـدیـبـوو
چەنـد چـارەڕەش بـووم کە شـتی وام نەدیبوو
هەرچی گوڵە دەبێ ئاو بە دەستـیدا کا
بەرتیلیش دەبـێ بدا، ئەو کارە بکا

سـەیر لەوەدا بوو، ئەو ڕۆژە بە ڕێکەوت قازیقازییان بە لای ماڵی ئاسـنگەردا هات. گوێی لە دەنگێکی خەمگین بوو، ئەو شـێعرانەی دەخوێندەوە. کەسـێکی نارد بە دووی ئاسنگەردا. کە ئاسنگەرە هات. لێی پرسی: «ئەو پەریزادە کێیە وا بە داوی خۆشەویستییەوە بووی؟» ئاسنگەر چووە پێش و دەستی قازی ماچ کرد و گوتی: «خودا تەمەنی قازی درێژ کـا، ئەو پەریزادەی کە منی ئـاوا لێ کرد، ژنێکی ڕوومـانگی مووقەترانی، بـاڵا سـەلوی چاوڕەشـی قەدباریکە کە لە بەندیان کردووە.» چۆن بوو بۆ قازی گێڕاوە. قازی گوتی: «کاکی ئاسنگەر داپێم بڵێ، من دەتوانم فریای کەوم و ئازادی کەم. حەقی بۆ لە جوولەکەکە بستێنم. ئەگەر بێت و ئەتۆ جێگاکەیم پێ نەڵێی ڕۆژی پەسلان مشکولۆزمەی دەبی و خودا تۆڵەی ئەویش لە تۆ دەکاتەوە.» ئاسـنگەر لەڕێوە هەسـتا و وە پێش قازی کەوت بەرەو ماڵی زەینولمواسـف. دەرگاکەیان دەخرابوو. گوێیان لە دەنگێکی خەمبار بوو. ئەو دەنگە زەینولمواسـف بوو کە لە دەسـت بەخت و بەندی گرانی زاڵەی بوو و ئەو شـێعرەی دەخوێندەوە:

من و بەند و کۆت و زنجـیر و ترۆ
خۆشـەویسـتی و ئەو هەمـوو ئـازارە بـۆ؟
بـوام لـێ دەکەی مـن هـیچ تـاوانـم نـییە

دڵــمه کــردوویه و ئەویــش لای مــن نــیــیه
ئەو بەجـــــــــــی مــاوه له شـــوێن و زێـدەکەم
بــۆیه دایــم ڕوو به ڕووگەم شـــیـــن دەکەم

کاتێک کابرای ئاسـنگەر گوێی لەو شـێعره بوو ئەسـرینی خوێن له چاوی هات. دوای ئەوه له دەرگای دا. زەینولمواســف و کەنیزەکان گوتیان کێیه له دەرکه دەدا؟ گوتی: «منم ئاسنگەرەکە.» دوای ئەوه پێی گوتن قازیشــی لەگەڵه. قازی ئاسـنگەری ئاگادار کردەوه که بڕیاری قازی وایه ئێوه دەبێ بێنه لای من تا دادتان بکەم.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

## که شەوی هەشتسەد و پەنجا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک ئاسنگەرە قسەکەی قازی بۆ زەینولمواسف گێڕاوە. زەینولمواسف گوتی: «کاکی ئاسنەگەر چۆن دەتوانین بچین بۆ لای قازی، وەک دەزانی دەرگاکانمان لێ داخراوە و زنجیر و پاوانەشمان لە پێ دایە. ئاسنگەر گوتی: «ئەمن کلیلم هەیە و دەرک و قفڵەکان دەکەمەوە. زەینولمواسف گوتی: «ئەی کێ ماڵی قازیمان پیشان دەدا؟» ئاسنگەر گوتی: «ئەمن ماڵی قازیتان پێشان دەدەم.» زەینولمواسف گوتی: «ئەی چۆن ئێمە بەو جلە کەتانانەوە بچینە لای قازی؟» ئاسنگەر گوتی: «قەیناکە، ئەگەر قازی ئێوە ئاوا ببینێ، زیاتر بەزەیی پێتاندا دێ.» دوای ئەوە ئاسنگەرە گەڕاوە کلیلی بۆ قفڵەکان درووست کرد. زوو گەڕاوە لای ئەوان و کۆت و زنجیر و پاوانەکانی لە دەست و پێی کردنەوە و هەتا بەر دەرگای ماڵی قازی بردن. دوای ئەوە هیووب، کەنیزی زەینولمواسف. جلە کەتانەکانی لە بەر خانمەکەی داکەند و بردی بۆ گەرماو و جلی شکۆداری حەریری لە بەر کرد. زەینولمواسف ڕەنگی هاتەوە سەرخۆی.

جووەکەش میوانی یەک دوویەک لە بازرگانەکان بوو. زەینولمواسفیش خۆی لە گوڵ دا و جوان خۆی تیفتیفە دا و چوو ماڵی قازی. قازی کاتێک چاوی پێی کەوت لە بەری هەستا. زەینولمواسف بە گفت و لەبزێکی شیرین و خۆش سڵاوی لێ کرد و وەبەر تیری نازی برژانگی دا و گوتی: «خودای تەعالا تەمەنی قازی درێژ کا.» دوای ئەوە، یەک یەک باسی ئەوەی کرد کە جووەکە چۆناوچۆن ئازاری داون و کۆت و بەندی کردوون. ئینجا تاریفی ئاسنگەرەکەی کرد، کە چۆناوچۆن بە هانایانەوە چووە و دەست و لاقی لە کۆت و بەند ڕزگار کردوون. قازی لێی پرسی: «کچەکە ناوی تۆ چییە؟» وڵامی داوە و گوتی: «ناوی من زەینولمواسفە و ناوی ئەو کەنیزەشم هیووبە.» قازی گوتی: «چەند ناوێکی خۆشە، هەم ناوێکی پڕ واتا و هەم لە زمان خۆشە.»

زەینولمواسف نەرمە بزەیەکی هاتێ و دەستی وە بەر دەمی دا. قازی پرسی: « زەینولمواسف، مێردت کردووە یان نا؟» گوتی: «نا مێردم نەکردووە.» قازی لێی پرسی: «لە سەر چ دینێکی؟» وەڵامی داوە، دینی ئیسلام و شایەدوئیمانی هێنا. قازی لێی پرسی: «زەینولمواسف، تافی گەنجیت چۆن لەگەڵ ئەو جووە بردووەتە سەر؟ زەینولمواسف وەڵامی داوە: «قازی بەڕێز، خودای تەعالا تەمەنی تۆ درێژ کا و بە ئاواتت بگەیەنێ. باوکم پازدەهەزار دیناری زێڕی بە پێی شەرع دا بەو جووە هەتا بازرگانی پێوە بکا و قازانجەکەشی بە نیوەیی بێ. کە باوکم مرد ئەوەش وە تەماع کەوت و منی لە دایکم خواست. دایکم پێی گوت: «ئەمن چۆن ئەو لە سەر دینەکەی خۆی وەرگێڕم و بیدەم بە

یەهوودییەک. بە خودا دەچم شکایەتت لێ دەکەم. ئەویش ترسا و ماڵەکەی هەڵگرت و چوو بۆ شاری عەدەدن کە شاری خۆی بوو. ئێمە بیستمانەوە کە لە شاری عەدەنە. کەوتینە پێ و شــوێنی. کە ئەومان لەو شــارە دیتەوە. بە ئێمەی گوت: «ئەمن بەو ماڵەی ئێوە کڕین و فرۆش دەکەم و بەشــی ئێوەشــی لێ دەدەم. ئێمەش باوەڕمان پێ کرد. ئیدی بەردەوام فێڵی لێ دەکردین و فریوی دەداین تا وا بوو لە بەندی کردین و ئاڵقە و زنجیری لە پێ کردین و بە کەیفی خۆی ئازاری داین. ئێمە نامۆ و غەریبین و جگە لە خودا، حەزرەتی قازی کەس شک نابەین.»

قازی کە ئەو بەسەرهاتەی بیست، بە کەنیزەکەی زەینولمواسفی گوت: «گەلۆ ئەو کچە خانمی تۆیە و ئێوە غەوارەن و خانمەکەت مێردی نەکردووە؟» هیووب وەڵامی داوە: «بەڵێ ئەوەی ئەو گوتی ڕاستە.» قازی گوتی: «ئەوەم لێ مارە بکەن، ئەمن بەڵێن دەدەم کە ئەگەر ئێوە لە دەســت ئەو گلاوە ڕزگار نەکەم و تۆڵەی ئێوەی لێ نەکەمە، ســەد دانە کۆیلە ئازاد بکەم و چەنـدین مـانـگ بە ڕۆژوو بم و بە پێیـان بچم بۆ حەج و خێر و خێراتێکی زۆر بکەم.» هیوب گوتی: «باشـــە بە قســـەت دەکەم و فەرمانت بە جێ دێنم.» قازی گوتی: «ئەرخەیان بن و خەم مەخۆن، دڵخۆشــی خانمەکەت بدەوە. ســبەینێ ئیشــەڵڵا دەنێرم ئەو گلاوە بێنن و تۆڵەی ئێوەی لێ دەکەمەوە. جا ئەودەم دەبینن کە چۆن بە هەموو شێوەیەک ئازاری دەدەم.» کەنیزە دۆعـای بە خێری بۆ کرد و گەڕاوە. ئەویـان لەوێ نوقمی تین و کەف و کوڵی خۆشـــەویســـتی کرد و بەجێیان هێشــت. کە ئەویان لە وێ بە جێ هێشــت پرســـیاری ماڵی قازییەکی دیکەیان کرد. ماڵی قازی دووەمیشـــیان پێ گوتن. چوونە لای و بەســـەرهاتەکەیان بۆ گێڕاوە. هەر ئاوا بەو جۆرە قازی ســـێیەم و چوارەمیشـــیان ئاگادار کردەوە. هەموو قـازییەکـانیش تەمـاعیـان تێ کرد و خوازبێنیـان لێ کرد. ئەویش وەڵامی هەموویانی بە بەڵێ داوە کە شوویان پێ بکا. هیچ کامیشیان یەکتریان نەدەزانی. جووەکەش ئەوە ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نییە و خەریکی میوانی و کەیف و ئاهەنگی خۆیەتی.

کە ڕۆژ بووە، هیووب هەستا و کراسێکی شکۆداری لە بەر زەینولمواسف کرد و جوان ڕازانـدییەوە و بردی بۆ لای چوار قـازییەکە کە لە کۆڕی حوکم دانیشـــتبوون. کـاتێک زەینولمواســف هەموویانی لەوێ دیت، پەچەکەی لە ســەر ڕووخســاری لا دا و ســڵاوی لێ کردن. ئەوانیش ســڵاوەکەیان ئەســتاندەوە و ئەویان ناســییەوە. ئەوەی خەریکی نووســین بوو، پێنووســەکەی لە دەست بەربووەوە. ئەوەی دەئاخفی زمانی تێکەڵ هات و قسەکردنی لە بیر چووەوە. ئەوەی خەریکی ژمێریاری بوو حیســـابەکەی لێ تێک چوو. تێکڕا گوتیان جوانی جوانان، ئەی دەلال خەمت نەبێ ئێمە مافی تۆ لەو گلاوە دەســـتێنین و تۆ بە ئاواتت دەگەیەنین. زەینولمواسف دۆعای بە خێری بۆ کردن و گەڕاوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و پەنجا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! زەینولمواســـف مالاوایی لێ کردن و گەڕاوە. هەتا ئێســـتاش جووە خەریکی میوانی و ڕابواردن بوو لەگەڵ هـاوڕێکـانی. هیچ خەبەرێکی لەو کـارانە نەبوو. زەینولمواسف دانە دانەی خاوەن قەڵەمانی دەدیت کە دەیانهەوێ یارمەتی بدەن و لە دەست ئەو گلاوە ڕزگاری بکەن. دوای ئەوە گریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

نیمە هاودەمـــــــــــــــــــــــی گوێ بداتە ڕازی دڵم
دڵی چـــــــــــــــی کـانگـای خەم و ئێش و برک و کوڵم
منی تەنـــــــــــــــــــــیا، بێ دەرەتان، بێ کەس و کارم
لەتـــــــــــــــــــــم و سەرکوت بردوویە ئارام و قەرارم
ناهێڵێ ئاســـــــــــــــــــــوودە دانیشم و بۆخۆم بژیم
مەرگەژیـــنە مەرگەژیـــن، ئەو ژیـــنەی مـــن دەژیـــم

دوای ئەوە دەســـتی دا کاغەز و هەرچی یەهوودییەکە بە ســـەری هێنا بوو، نووســـی و نووسراوەکەی پێچاوە و دای بە هیووب و گوتی: «ئەو نووسراوەیە ڕاگرە تا دەینێرین بۆ مەســـروور. ئەوان کە خەریکی ئەو قســـانە بوون، جووەکە هـاتە ژوورێ و ئەوانی بە خۆشـــحاڵی دیت و گوتی: «ئەوە چۆنە وا کەیفســـازن مەســـروور نامەی بۆ ناردوون؟» زەینولمواســـف گوتی: «ئێمە جگە لە خودای تەعالا یارمەتیدەری دیکەمان نییە. هەر ئەویش ئێمە لەو لەتمە ڕزگار دەکا. ئەگەر تۆ ئێمە نەگێڕییەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان ئەوە ســـبەینێ ئێمە لە لای قازی شکایەتت لێ دەکەین. جووە گوتی: «ئەوە کێ پاوەنی لە لاقتان کردەوە؟» ئەوە دەبێ یەکی ئاڵقەیەکی دە ڕەتلیتان بۆ چێ کەم و بە دەوری شـــاردا بتانگێڕم. هیووب گوتی: «ئەو کارەی بە تەمای بە ســەر ئێمەی بێنی ئیشـەڵلا بە سـەر خۆت دێ. سبەینێ لە لای قازی خۆت دەبینییەوە.»

هەتا بەیانی هەر خەریکی ئەو شـــەڕەدندووکە بوون. کە ڕۆژ بووەوە جووە چووە لای ئاسنگەر تا پاوەنی قورسیان بۆ چێ بکا. لەو جەنگەیەدا زەینولمواسف و لەگەڵ کەنیزەکانی هەســـتان چوون بۆ دادگە و هەر چوار قازییەکەش لەوێ بوون. ســـلاویان لێ کردن. قازییەکانیش وەلامی ســـلاوەکەیان داوە. دوای ئەوە قازی قـازییان چوار کەســـی لە گەورەکانی دادگای نارد بە دوای جووەکەدا. تا بی هێننە دادگا. ئەوە لە زەینولمواســـف با بزانین جووەکە چی کرد.

جووەکەش کە پاوەنەکانی دروســـت کرد، گەڕاوە ماڵێ. ســـەیری کرد، ژنەکەی و

کەنیزەکانی لە ماڵێ نین. پێی سەیر بوو. بیری دەکردوە بڵێی چووبنە کوێ کە لەو جەگەیەدا پیاوەکانی قازی بۆی هاتنە ژووریێ و وەری گەڕانێ. لە سەر زەوی خستیان و بە ڕاکێش ڕاکێش بردیان بۆ لای قازی. کاتێک قازی قازییان جووەی دیت بە سەریدا گوڕاند و گوتی: «ئەی دوژمنی خودا ئەوە ئاوات لێ هات، کاریێ ئاوا بکەی و ئەو ژنانە لە وڵاتی خۆیان دوور خەیەوە و ماڵەکەشیان لێ داگیر کەی؟ ئێستاش دەتهەوێ ئەوان بکەیە یەهوودی!؟ جووەکە گوتی: «گەورەم قازی، ئەوە ژنی خۆمە. قازییەکان کە ئەوەیان بیست، تێکڕا بە سەریاندا گوڕاند و گوتیان: «دا لە دەمی دەن و لە سەر زەوی درێژی کەن و تێی هەڵدەن. ئەو گوناحەی ئەو بۆ لێ خۆشبوون نابێ. ئیدی کۆیلە تێی هاڵان و جلی حەریریان لە بەر داکەند و کەتانیان لە بەر کرد، لە سەر زەوی درێژیان کرد و چەنەیان تاشی و زۆریان لێ دا. پاشان پشت و ڕوو سواری گوێدرێژیان کرد و کلکیان دا دەستی و بە ناو شاردا گێڕایان. دوای سووکایەتی پێ کردنێکی زۆر هێنایانەوە لای قازی. هەر چوار قازییەکە بڕیاریاندا لە پێشدا هەر چوار پەلی ببڕن و پاشان لە داری دەن. جووە بەو قسانە تۆقی و هۆشی لای خۆی نەما و گوتی: «قازییەکان چتان لە من دەوێ؟» گوتیان: «ئەو کچە ژنی من نییە و تەواوی ئەو ماڵەی من ئی ئەوە، ئەمن زوڵمم لێ کردووە لە وڵاتی خۆی دوورم خستووەتەوە.» جووە ناچار دانی بەوانەدا نا. قازییەکان کاغەزێکیان نووسی و ماڵەکەیان لێ ئەستاند و بە نێو زەینولمواسفەوەیان کرد و قەباڵەکەشیان دایە. زەینولمواسف لە لای ئەوان هاتە دەرێ هەرکەس چاوی بەو هەموو جوانییەی ئەو دەکەوت، شێت و شەیدای دەبوو. هەر کام لە قازییەکان پێیان وا بوو کە زەینولمواسف بۆ ئەو دەبێ. بەڵام زەینولمواسف کاتێک چووەوە ماڵەکەی خۆی ساز کرد. ئەوەی لە سەنگدا سووک و لە نرخدا گرانبایی بوو، پێچایەوە. هەرکە وڵات تاریک داهات. لەگەڵ کەنیزەکانی ملی ڕێیەیان گرت و هەتا سێ دانە شەووڕۆژ یەک بین ڕۆیشتن. ئەوان با بڕۆن...

قازییەکانیش حوکمی بەندکردنی جووەکەیان دا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـکۆ! قازییەکان فەرمانیان دا جووەکە بەند بکەن. بۆ بەیانییەکەی قازی و شـایەدەکان چاوەڕێی زەینولمواسـف بوون. زەینولمواسـفیش نەچوو بۆ لای هیچ کام لە قازییەکان. ئینجا قازیقازییان کە زەینولمواسف لە پێشدا چووبووە لای ئەو گوتی: «ئەورۆ ئەمن بێ تاقەتم و دەمەوێ لە دەرەوەی شـار کەمێک بگەڕێم.» چوو سـواری یەسترەکەی بوو، غولامۆکەکەی هەڵگرت و لە نـاو کۆڵان و گەڕەکەکانی شـاردا دەسـتی کرد، بە سـووڕانەوە و زۆر گەڕا و سۆراخی کرد کەچی هیچ هەواڵێکی لێیان نەزانی. لەو کاتەدا کە ئەو دەگەڕا سـەیری کرد، قازییەکانی دیکەش ئەوە هەر یەک بە لایەکدا دەسـووڕێنەوە. کەسـیش شـکی بۆ ئەوە نەدەچوو کە زەینولمواسـف لەگەڵ ئەوانی دیکەش دا قەول و قەراری دانابێ. قازیقازیان لە سـێ قازییەکەی دیکەی پرسـی ئەوە لە چی دەگەڕێن وا لە کۆڵان و گەڕەکانی شـاردا دەسـووڕێنەوە؟ ئەوان هۆکارەکەیان پێ گوت. قازی کە زانی ئەوانیش بە دەردی ئەو گیرۆدەن و کێشـەکەیان هەر یەکە، ئیدی هەموو یان بە یەکەوە دەسـتیان کرد بە گەڕان و پشـکنین و هیچ هەواڵێکیان وەگیر نەکەوت. ماندوو شـەکەت گەڕانەوە ماڵێ و هەرکەسـەی لە تاوان لە جێدا کەوت. دوای ئەوە قازی قازییان کەوتەوە یادی ئاسـنگەر. کەسـێکی نارد بە شـوێنیدا. کە هات لێی پرسـی: «ئەرێ ئاسـنگەر هیچ هەواڵێکت لە زەینولمواسـف هەیە یان نا؟ ئەگەر بزانم پێی نازانی تەواوی گیان بە قامچی ونجڕ ونجڕ دەکەم.» ئاسنگەر کاتێک ئەو قسەیەی لە قازیقازییانی بیست. ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئەو شـــــــــــۆڕەژنەی تۆ لە خەمی دای
ئاواتەخوازم گیانم بـــــــــــــێ فیدای
خەڵکی ئەو شارە هەڵـــــــــــــوەدای ئەون
گشـــــت وەک مـن و تـۆ کەوتـوونەتە دوای
بووەتە ئاو و چـــــــــــــــووە لە عەرزەوە
یا بۆتە مەل و فرِیـــــــــــــــوە بۆ حەوای

دوای ئەوە گوتی: «گەورەم قازی، لەو کاتەوەی کە لە خزمەت جەنابت مەرەخەس بووە. ئیدی نەمدیوەتەوە. لەو ڕۆژەوە منی شـێت و هار کردووە و لە بەر خەیاڵی ئەو خەو و خۆراکم نییە و جگە لە خەیاڵی ئەو بیرم لە هیشتێک نەکردووەتەوە. چووشـم بۆ ماڵەکەیان نەمدیتەوە و ئەوەندەی پرسـیاریشـم کرد، کەس بە هەواڵی نازانێ. هەر دەڵێی ئاوە و چووە

له زەوییەوە یان فڕیوە بۆ ئاسمان. قازیقازییان بە بیستنی قسەکانی ئاسنگەر وای قیژاند وەخت بو گیانی دەرچێ. دوای ئەوە قازی نەخۆش کەوت و لە جێدا کەوت. قازی و شایەدەکانی دیکەش هەر وا نەخۆش بوون و کەوتنە ژێر چاوەدێری نۆشدارەوە. دوای ئەوە گەورەگەورەکانی وڵات هاتنە لای قازیقازییان و هەواڵیان پرسی. ئەویش ئاخی هەڵکێشا و ئەوەی لە دڵیدا بوو هەڵی ڕشت و ئەو شیعرەی خوێندەوە:

لۆمەم مەکەن گەورەکانم ئەقڵم لە ڕێسمە دەرچووە
پەریزادێک لێم دەرکەوت دڵمی بە تاڵان بردووە
ماقووڵی و زانست و هونەر لە ئاستی سووک و چرووکن
بێت و ئەو کیژەم بۆ ببێ دەستم لە هەموو شتووە

قازیقازییان دوای ئەوەی ئەو شیعرەی خوێندەوە زۆر گریان. پاشان یەک بە خۆی هاوارێکی کرد و گیانی دەرچوو. قازیان شوشت و کفنیان کرد و بە خاکیان سپارد. ئەو دوو بەیتەشیان لە سەر کێلەکەی نووسی:

خوایە بۆخۆت باش دەزانی لە تاوان بۆ لات هاتەوە
کارێک بکە ڕۆژی پەسڵان بە دیداری شاد بێتەوە

دوای ئەوە چوونە لای قازی دووەم. نۆشداریشیان لەگەڵ بوو. چاک و خۆشیان لەگەڵ کرد و هەواڵی ناساخییەکەیان لێ پرسی. قازی باسی دەردەکەی خۆی بۆ کرد و ئەوانیش سەرکۆنەیان کرد. قازی بەو شیعرە وەڵامی دانەوە:

یاران مەکەن سەر کۆنە و لۆمەی تاڵان کراوان
دڵێکم بوو ئەویشی برد چۆن نەمرم لە تاوان
هەرکەس جارێک چاوی بەو مانگە کەوتبایە دەمدی
سەری هەڵدەگرت، ڕووی دەکردە دەشت و دەراوان

دوای شیعرەکەی پڕ بە گەرووی ئاخێکی هەڵکێشا و گیانی دەرچوو. هەنتەشیان کفن و دفنیان کرد و ناشتیان. ئەوجار چوون بۆ لای قازی سێیەم، سەیریان کرد، ئەویش لە جێدا کەوتووە. ئەویش وەکوو ئەوانی دیکەی لێ بەسەر هات. قازی چوارەم و شایەدەکانیش لە سۆیێ خۆشەویستی زەینولمواسف نەخۆش کەتن و گیانیان دەرچوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەوان لە وێ ئاوایان لێ هات.

زەینولمواسف و کەنیزەکانی چەند شەوورۆژ ئاوا ڕۆیشتن هەتا مەودایەکی زۆریان بڕی، ڕێکەوت وا بوو ڕێیان کەوتە دێرێک و لەو دێرەدا سۆفییەکی گەورەی مەسیحی لێ بوو. ناوی دانس بوو. ئەو دێرە چل دانە قەشەشی لێ بوو. کاتێک سۆفی ڕوخساری جوانی زەینولمواسفی دیت لە دێرەکە هاتە خوارێ و هۆگری بوو. پێی گوت دە ڕۆژ لێرە بمێنەوە با ماندووی ڕێگات لە لەش دەرچێ. زەینولمواسف و کەنیزەکانی لەوێ لایان دا. کاتێک سۆفی ئەو گشتە جوانییەی لەودا دیت دانە دانە قەشەکانی دەنارد دڵی نەرم کەن بۆ سۆفی. کەچی کە دە چوونە لای و چاویان پێی دەکەوت سۆفیان لە بیر دەچووەوە و شێت و شەیدای دەبوون و بۆ خۆیان پێ دەگوت. ئەویش وەڵامی نەدەدانەوە و بە دڵشکاوی و هیوابڕاوی دەیناردنەوە. تا وای لێ هات هەر چل کەسەکە چوونە لای و ئەویش داوای لێ بووردنی لێ کردن و جوابی نەدانەوە. سۆفی دانس خەریک بوو لە تاوانی دڵی بتۆقی لە دڵی خۆیدا گوتی: فایدەی نییە، لە قەدیمەوە گوتیانە: «ما حک جسمی غیر ظفری و لاسعی فی مرامی مثل و اقدامی.» واتە: کەس وەک نینۆکی خۆم پشتی من ناخورێنێ و کەس وەک خۆم بۆ گەیشتنی من بە ئاواتم هەنگاو هەڵناهێنێتەوە. دوای ئەوە هەستا و چێشتێکی خۆشی لێ نا. چێشتەی هەڵگرت و بردی لە بەر دەمی زەینولمواسف دایناو داوای لێ کرد بخوا. زەینولمواسف دەستی برد و ناوی خودای هێنا و لەگەڵ کەنیزەکانی نانیان خوارد. دوای ئەوە سۆفی پێی گوت: «خانم دەمەوێ چەند بەیتێکت بۆ بخوێنمەوە.» زەینولمواسف گوتی: «فەرموو بخوێنەوە.» سۆفی ئەو چەند بەیتەی بۆ خوێندەوە:

شوکر و سپاسم بۆ بنووس، نووسی لە چارەم چارەنووس
ئەو ڕۆژە بێ و لەو دێرەدا ببێ بە میوانم وێنووس
خۆمت بۆ قوربانی دەکەم تۆ چۆن بڵێی من وا دەکەم
ڕووحمێک بە دڵی زارم کە با من خۆمت فیدا بکەم
فیدا بکەم ڕووح و گیانم، بەشکوو تۆ بزەیەکت بێ
بزەت ماچی بە دواوە بێ چش با سۆفی ئاوارە بێ

کاتێک زەینولمواسف ئەو چەند بەیتەی لەو بیست ئەویش بەو دوو بەیتە وەڵامی داوە:

## که شەوی هەشتسەد و شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەوان لە وێ ئاوایان لێ هات.

زەینولمواسف و کەنیزەکانی چەند شەووڕۆژ ئاوا ڕۆیشتن هەتا مەودایەکی زۆریان بڕی، ڕێکەوت وا بوو ڕێیان کەوتە دێرێک و لەو دێرەدا سۆفییەکی گەورەی مەسیحی لێ بوو. ناوی دانس بوو. ئەو دێرە چل دانە قەشەشی لێ بوو. کاتێک سۆفی ڕوخساری جوانی زەینولمواسفی دیت لە دێرەکە هاتە خوارێ و هۆگری بوو. پێی گوت دە ڕۆژ لێرە بمێنەوە با ماندووی ڕێگات لە لەش دەرچێ. زەینولمواسف و کەنیزەکانی لەوێ لایان دا. کاتێک سۆفی ئەو گشتە جوانییەی لەودا دیت دانە دانە قەشەکانی دەنارد دڵی نەرم کەن بۆ سۆفی. کەچی کە دە چوونە لای و چاویان پێی دەکەوت سۆفیان لە بیر دەچووەوە و شێت و شەیدای دەبوون و بۆ خۆیان پێ دەگوت. ئەویش وەڵامی نەدەدانەوە و بە دڵشکاوی و هیوابڕاوی دەیناردنەوە. تا وای لێ هات هەر چل کەسەکە چوونە لای و ئەویش داوای لێ بووردنی لێ کردن و جوابی نەدانەوە. سۆفی دانس خەریک بوو لە تاوانی دڵی بتۆقی لە دڵی خۆیدا گوتی: فایدەی نییە، لە قەدیمەوە گوتیانە: «ما حک جسمی غیر ظفری و لاسعی فی مرامی مثل و اقدامی.» واتە: کەس وەک نینۆکی خۆم پشتی من ناخورێنێ و کەس وەک خۆم بۆ گەیشتنی من بە ئاواتم هەنگاو هەڵناهێنێتەوە. دوای ئەوە هەستا و چێشتێکی خۆشی لێ نا. چێشتەی هەڵگرت و بردی لە بەر دەمی زەینولمواسف داینا. داوای لێ کرد بخوا. زەینولمواسف دەستی برد و نێوی خودای هێنا و لەگەڵ کەنیزەکانی نانیان خوارد. دوای ئەوە سۆفی پێی گوت: «خانم دەمەوێ چەند بەیتێکت بۆ بخوێنمەوە.» زەینولمواسف گوتی: «فەرموو بخوێنەوە.» سۆفی ئەو چەند بەیتەی بۆ خوێندەوە:

شوکر و سپاسم بۆ بنووس، نووسی لە چارەم چارەنووس
ئەو ڕۆژە بێ و لەو دێرەدا ببێ بە میوانم وێنووس
خۆمت بۆ قوربانی دەکەم تۆ چۆن بڵێی من وا دەکەم
ڕووحمێک بە دڵی زارم کە با من خۆمت فیدا بکەم
فیدا بکەم ڕووح و گیانم، بەشکوو تۆ بزەیەکت بێ
بزەت ماچی بە دواوە بێ چش با سۆفی ئاوارە بێ

کاتێک زەینولمواسف ئەو چەند بەیتەی لەو بیست ئەویش بەو دوو بەتە وەڵامی داوە:

مـامه ســـــۆفـی چـارەنـووس تـازە کـاری خـۆی کـردووە
چـارەکەم خـۆم نـووســـیـومە و تـازە لە خشـــتەم بـردووە

کاتێک سۆفی شێعرەکەی ئەوی بیست، گەڕاوە خانەقا. سەری لێ شێوابوو نەیدەزانی چ بکا. ئەو شەوەش خەوت. کە شەو تاریک درەنگ بوو. هەوا تەواو تاریک بوو، زەینولمواسف هەسـتا بە کەنیزەکانی گوت: «هەسـتن ئێمە دەرەقەتی چل دانە قەشـە نایەین. ئەوانە هەر یەکەی دەیهەوێ من بۆ ئەو بم. کەنیزەکان هەسـتان و سـواری یەک سـمەکانیان بوون و بەو شەوە لە دێر چوونە دەرێ.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی هەشتسەد و شەست و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! زەینولمواسف لەگەڵ کەنیزەکانی لە دێر چوونە دەر و ملی ڕێیەیان گرت و ڕۆیشتن. هەر ڕۆیشتن هەتا تووشی کاروانێک بوون. ئەو کاروانە لە عەدەنەوە هاتبوو. زەینولمواسف گوێی لێ بوو کە لە نێو کاروانەکەوە دەنگ دەهات باسی ئەویان دەکرد و نێوی ئەو قازی و شایەدانەیان دێنا کە لە ئەڤین و خۆشەویستی ئەو گیانیان دەرچووبوو. دەیانگوت: «خەڵکی شار قازی دیکەیان داناوە و مێردەکەی زەینولمواسفیان بەر داوە.»

کاتێک زەینولمواسف ئەوەی بیست، ڕووی لە کەنیزەکانی کرد و گوتی: «هیووب گوێت لێیە؟» هیووب گوتی: «جا لە جێیەک سۆفی و قەشە، کە بەوە بە ناوبانگن دووری لە ژنان دەکەن، کەچی ئاوا دەکەن بۆ تۆ، چ چاوەڕوانییەکت لە قازی هەیە کە دەڵێن: «لا رهبانیة فی الاسلام.» واتە: لە ئیسلامدا ناکرێ دەست لە چێژی دنیایی هەڵگری. بەڵام وا چاکە تا پێیان نەزانیوین بڕۆینەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان. با ئەوان بڕۆنەوە ...

قەشەکانی دێر کە ڕۆژ بووەوە هاتن بۆ لای زەینولمواسف سڵاوی لێ بکەن. سەیریان کرد لەوێ نییە. وە دڵە کوتە کەوتن و ناڕەحەت و پەرێشان بوون. لە پڕدا قەشەی یەکەم کراسی سەر تا خوار دادڕی و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

کە هات و ڕابرد و شێواندی، دڵ و ئەڤـــــــــــــــینم
ڕوو لە کوێ کەم لە دەســـتم چوو ئافەتی دیـــــــــنم
کـوا دەژیـم بـێ ئەو چەلەنـگ و شـــەنـگ و شـــەپاڵە
دەزانم دەردەچێ گیانم تازە نایـــــــــــــــــــــبینم

دوای ئەو قەشەی دووەم ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئای لە خۆم چارەڕەشـــــــــــــــــێ خۆزگە هەر کوێر بایەم
خۆزگە ئەو دێرەم بە جــــــــــــــــێ هێشتبایە و ڕۆیبایەم
وەک بـریســـــکە چەنـد چـرکەیەک ژیـنـمـی ڕوونـاک کـرد
خۆزگە ژینمی ڕووناک نەدەکرد و مـــــــــــــــــــــردبایەم

ئینجا قەشەی سێیەم ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئەڤـیـن هــات و وێـرانـی کـرد کـۆخـی تەنـیـایـیـم

شـڵەقاندی گۆمی مەند و خۆشـــــــــــــــــــــــی ئارامیم
گـوڵـزاری بـێـکەســـــیـم پـڕ لە گـوڵـی ڕەنـگـاوڕەنـگ
بە هــاتنـت وەک خەزانێـک تووشــــــــــــــــی قــاقڕیم

دوای ئەوە قەشەیەکی دیکە ئەوە بەیتانەی خوێندەوە:

ئێمە دەرکی دونیـــامـان لە ســــەر خۆمـان داخســـتووە
دەرێ حۆری لێیە ئەوەنیە ڕێی لێرە کەوتـــــــــــــــــــــووە
تازە دەمرم بێت و ئەو ڕووپاکە نەبــــــــــــــــــــــینمەوە
فیدای ئەو بەژن باڵایەی بم وا منی کوشـــتــــــــــــــووە

ئەوجار قەشەیەکی دیکە ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

خوایە ئیمانم ســـەد هێندە زیــــــــــــــــــــــــــادی کرد
پەرچــۆیەک بـــوو ئەو ڕێـــبــازمـــی دیــاری کـــرد
بێ چرای ڕووخســاری تاریـــــــــــــــــــــــــــکە ڕێم
بێت و ئەو نەیەتەوە هەڵدێــــــــــــــــــــــــــــــــرە ڕێم

بەو شێوەی قەشەکانی دیکە هەموو دەگریان و شێعریان دەخوێندەوە. بەڵام سۆفی کە گەورەی قەشەکان بوو، چونکە ئەو زۆر بە تەما بوو، بەو گوڵندامە بگا و پێی نەگەیشتبوو، لە هەموویان لە کوڵتر بوو. لە بەر خۆیەوە ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

کۆشکی ئاواتم لە سەر وێــــــــــــــــــــــنا کردووە خوایە
ئەو هەموو دەلالییەت چۆن ئافرانـــــــــــــــــــدووە خوایە
تیری برژانگی کاری، لە جـــــــــــــــــەرگ و دڵ کردووە
خوێناوی لە دەروونما جەڵتەی بەستووە خـــــــــــــوایە
نــاتــوانـم نەکەومە دووی هەرچەن هـێـزی پـێـم نـیـیە
بـێ ڕووح چـون دەکـرێ بـژیـم ڕووحـمـی بـردووە خـوایە

دوای ئەوەی تەواوی قەشـــەکان دەســـتیان لەو مانگرۆخســـارە شـــوت. هاتە ســـەر ئەو باوەڕە کە سیمای ئەو بەنەخشێنن و لە لای خۆیان ڕایگرن. ئەو کارەیان کرد و بەردەوام بە قوربان و سەدەقەی بوون، هەتا هەموویان لە تاوان دڵیان توقی.

زەینولمواسفیش بەرەو دیداری خۆشەویستەکەی ڕۆیشت و ڕۆیشت هەتا گەیشتەوە ماڵەکەی خۆی. دەرگای کردەوە و چووە ژووریٚ. ناردی لە دوای نەسیمی خوشکی. خوشکەکەی بە هاتنەوەی زۆر خۆشحاڵ بوو. خێرا فەڕش و کراسی گرانبایی بۆ هێنا. فەڕشەکانیان ڕاخست و کراسەکانی لە بەر کرد. پەردەی دیبای جوانی هەڵاوەسی و عوود و عەنبەری لە جیٚ عوودەکە خست و وڵاتی بۆن خۆش کرد. ئینجا خۆی ڕازاندەوە. مەسروریش خەبری لە هیچ نەبوو. دەستەملانی خەم و ماتەم بوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پیٚ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی هەشتسەد و شەشت و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! زەینولمواسف دوای ئەوەی خۆی ڕازاندەوە لەگەڵ ئەو کەنیزانەی نەیبردبوون بۆ سەفەر دانیشت و تەواوی ئەو شتانەی بە سەریان هاتبوو بۆی گێڕانەوە. دوای ئەوە ڕووی لە هیووب کرد و چەند درەمێکی دایە و گوتی: «بچووە کەمێک شلە بکڕە و بیهێنەوە. هیووب لە ڕێوە چوو خواردن و شەرابی کڕی و هاتەوە. خواردنەکەیان خوارد. ئینجا هیووبی نارد بۆ لای مەسروور گوتی بچووە بزانە لە کوێیە و چ دەکا.

مەسروووریش خەو و خواردن و تاقەتی نەمابوو. جار لەگەڵ جار خۆشەویستی و ئەڤینی پەرەی دەستاند و تەواوی وجوودی دەگرتەوە. شێعری دەخوێندەوە. دەچوو بۆ لای ماڵی زەینولمواسف و دەرک و دیوای ماڵەکەیانی ماچ دەکرد. لەو جەنگەیەشدا چووبووە ئەوە شوێنەی بۆ ئاخرین جار ماڵاوایی لێ کرد. لەوێ ئەوە شێعرەی دخوێندەوە:

دەزانم دەردی یەعقووب چەند گران بوو  
شەو و ڕۆژی چلۆن ئاوێتەی ژان بوو  
چلۆن سۆما لە چاوانی برا بوو  
چلۆن ئاور بە جەرگییەوە درا بوو  
چاوەڕوانی چلۆن هەناوی کوڵی  
خورجێنی خەم و دەردی دا بە کوڵی  
منیش یەعقووب ئاسا وا دەردەدارم  
برینی دووری یار دەدا ئازارم  
منیش وەک ئەو چرای ماڵیان دزیوم  
منیش چارەڕەشم، خۆشی نەدیوم

دوای ئەوە گەڕاوە ماڵێ و دانیشت و دەستی کرد بە گریان هەتا خەوی لێ کەوت. خەونی دیت. لە خەونیدا بوو، زەینولمواسف هاتبووەوە و لە ماڵەکەی خۆی دانیشتبوو. لە ڕێوە لە خەو ڕاپەڕی و دەستی کرد بە گریان. پاشان هەستا و بەرەو ماڵی زەینولمواسف کەوتە ڕێ و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

بە بۆنی کراسی یۆسف پیرەدار چرۆ دەر دەکا  
منی ویشکهەڵاتووی قرچ بە بۆنی ئەو دەبێ چ بکەم  
بەو خەونەی ئەوشۆکانێ دیم هێزم لە لەشی گەڕاوە  
دڵنیام یارم دێتەوە، دەبێ من لە خۆشیان چ بکەم

که شێعرەکەی تەواو بوو سەیری کرد گەیشتووەتە بەر دەرگای ماڵی زەینولمواسف. بۆنێکی خۆشی لەو دەوروبەرەوە بەر لووت کەوت. کەوتە دڵەکوتە و ڤیانی سەری کرد. هەر وا سەرگەردان چووە پێش، هەتا لە پڕدا هیووب وەدەر کەوت چاویان پێک کەوت. هەردووکیان لە ڕادە بەدەر خۆشحاڵ بوون. هیووب هاتە پێش و سڵاوی لێ کرد و پێی گوت: «مزگێنیم دەیە، زەینولمواسف هاتووەتەوە و گوتیشی ئەوە زەینولمواسف ناردوومی لە دوای تۆ.» مەسروور لە ڕادە بەدەر خۆشحاڵ بوو. ئەوجار هەردووکیان گەڕانەوە بۆ لای زەینولمواسف. کاتێک زەینولمواسف چاوی بە مەسروور کەوت لە سەر تەختەکە هاتە خوارێ و مەسرووری لە ئامێز گرت و ماچی کرد. ماوەیەکی زۆر لە باوەشی یەکتردا بوون و یەکتریان ڕاموسی. هەتا وا بوو لەبەر خۆشەویستی زۆر و هەڵچوونی هەستیان بێ هۆش بوون و بە لادا هاتن. کە وە هۆش هاتنەوە، زەینولمواسف بە هیووبی کەنیزی گوت شەراب بێنن. هیووب خانم چی پێ گوترابوو، جێبەجێی کرد و ئەوان دەستیان کرد بە بادە خواردنەوە. ئیدی ئەوە کاریان بوو هەتا بوو بە شەو. شەو هەرکام لەوان بەسەرهاتی خۆی گێڕاوە جا چیان بەسەرهاتبوو مووبەموو هەموویان بۆ یەکتر گێڕاوە. دوای ئەوە زەینولمواسف بە مەسرووری کرد کە موسوڵمان بووە و کەنیزەکانیش ئیمانیان هێناوە و گەڕاونەتەوە بۆ لای خودا. کە ڕۆژ بووە، زەینولمواسف فەرمانی دا قازی و شایەد بێنن. کە قازی و شایەد هاتن پێی گوتن، ماوەی من تەواو بووە و دەمهەوێ لە مەسروورم مارە بکەن. قازی مارەی کرد و تاپۆیان نووسی و شایەدەکان واژۆیان لە سەر دا. دوای ئەوە مەسروور و زەینولمواسف خەریکی عەیش و خۆشی و نۆشی خۆیان بوون.

جووەکەی مێردی زەینولمواسف کە خەڵک لەوێ لە بەند بەریان دا. بەرەو شارەکەی خۆیان ڕۆیشت و ڕۆیشت هەتا ڕێگای سێ ڕۆژی ما بگاتەوە شارەکەی خۆیان. زەینولمواسف بەو شتەی زانییەوە. خێرا هیووبی بانگ کرد و پێی گوت: «بچووە بۆ گۆڕستانی جووەکان و گڵکۆیەک ساز کە و گوڵ و ڕیحانە و شتی لە سەر بچێنە و جوان ئاوپڕژێنی بکە و دەوربەرەکەی بماڵە. ئەگەر جووەکەش هاتەوە و هەواڵی منی پرسی بڵێ ئەوندە لە دەست تۆ نارەحەت بوو. بیست ڕۆژ دەبێ مردووە. ئەگەر گوتی قەبرەکەی لە کوێیە. لەگەڵی بچووە ئەو قەبرەی پیشان بدە، بزانە بە جۆرێک بە زیندووی لە گۆڕی ناخەی.» هیووب گوتی: «باشە بە چاوان، چۆن بڵێی وا دەکەم.» دوای ئەوە زەینولمواسف فەرش و شتەکەی پێچاوە و بردی لە سارداواکە دانا و بۆخۆی لەگەڵ مەسروور چوو بۆ ماڵە ئەوان دەستیان کرد بە عەیش و نۆشە و خواردن و خواردنەوە، تا ئەو ڕۆژەی جووەکە هاتەوە و لە دەرگای دا. هیووب گوتی: «کێیە، لە دەرگا دەدا؟» جووە گوتی: «خاوەنەکەتە. هیووب دەرگای کردەوە و دەستی کرد بە گریان. جووە گوتی: «چی بووە بۆ دەگری؟ خانمەکەت لە کوێیە؟» هیووب وەڵامی داوە لە داخی تۆ نەخۆش کەوت و هەر

بەو نەخۆشییە چوو. جووە کە ئەوەی بیست، سەری سوورِ ما و دەستی کرد بە گریان. پاشان بە هیووبی گوت: «قەبری خانمەکەت لە کوێیە؟» هیووب جووەی لەگەڵ خۆی برد بۆ گۆرِستان و بردییە سەر ئەو قەبەرەی کە بۆی هەڵکەندبوو. لەو جەنگەیەدا جووە زۆر گریا و بەدەم گریانەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە.

گەرچی تۆ بێ مەیل بوویت و منت نەویست
منت بە هەزار دەرد برد و ئەوت خۆشویست
سەرەرِای وەش لە بیرت ناکەم تا ماوم
خۆشم ویستی، خۆشم دەوێی بە قەد چاوم
هەستە ئازیز مردن بۆ تۆ نەهاتووە
با من بمرم، وا منت لەبەر چاو کەوتووە

دوای ئەو شێعرە دیسان گریا و ئەو شێعرەشی گوتەوە:

بۆچ وەکوو گەرما لە دەست سەرما را بکا، رات کرد؟
بۆچی ژیانت کردە مەیدانی تەرِاتێن و وات کرد؟
بێ تۆ ژیان بە لامەوە ئەستەم و مەحاڵە
چۆن دەتوانم هەڵکەم، لە ناو ئەو ژینە تاڵە

کە شێعرەکەی تەواو بوو بە دڵێکی پڕ لە خەم و نارەحەتییەوە ئەوەندە گریا هەتا بێ هۆش بوو. هیووب لەو جەنگەیەدا کە هەر زیندوو بوو بەڵام بێ هۆش بوو، بەلەز سەری گلکۆ سازکراوەکەی لابرد و لە قەبرەکەی خست. دوای ئەوە گڵەکەی وەسەر کرد و جوان بە زیندووی ناشتی و گەرِاوە بۆ لای خانمەکەی. چی لێ کردبوو، هەمووی بۆ زەینولمواسف گێرِاوە. زەینولمواسف خۆشحاڵ و کەیف ساز بوو ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئای چەندە خۆشە ئازاد بی و خاوەنت نەبێ
سەربەست بژی لە ژیانا، بەربەندت نەبێ
هاوژینی خۆت بە دڵی خۆت هەڵبژێری
هەتا ماوی لەو ژینەدا ملۆزمت نەبێ

دوای ئەوە بە دڵێکی خۆش و بێ خەم پێکەوە ژیان. هەتا وا بوو تێکدەری خۆشی و شادی لە یەکی بڵاو کردن. دیارە ئەوەی دەمێنێتەوە هەر خودایە و بەس.

## چیرۆکی عەلی نوورەددین

یەکێک لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە لە زەمانی زوودا بازرگانێک لە میسر بوو ناوی تاجەددین بوو. خاوەن کۆیلە و کەنیز و خزمەتکار بوو. هاتوچۆی شارە دوور و نیزیکەکانی دەکرد و بە دەریا پڕ گەنگەشەکاندا سەفەری دەکرد. کوێری زۆر دیبوو. لە هەموو ئاوانی دابوو تەڕ نەبوو. مەترسی و سارد و گەرمی ڕۆژگاری زۆر دیبوو. تاڵی و سوێری و شیرینی دنیایەی چێشتبوو. جوانچاک و قسەخۆش بوو. تا بڵێی دەستڕۆیشتووە و شتومەک و کەلوپەلی هەموو شارەکانی: حومس، بەعلەبەک و مەغرب. کۆیلە و کەنیزی تورکی و حەبەشەیی و ڕۆمی و میسری هەبوو. لەگەڵ تەواوی ئەوانەشدا جوانچاک و لەبەردڵان بوو. هەر وەک لە پەسنیدا دەڵێن:

بازرگانێک، دونیا دیتوو بە زیپک و زاکوون
شارەزای ڕێگە و بانەکان، دەریا و بێروون
بە ئەزموون و کاڵا ناس و یەکجار شارەزا
جێی باوەڕ بازرگانانی خاوەن بۆچوون

ئەو بازرگانە کوڕێکی هەبوو ناوی عەلی نوورەددین بوو، دەتگوت مانگە. ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر وەک ڕۆژانی دی لە دووکان دانیشتبوو، کوڕە بازرگانەکان تێی هالابوون، هەر وەک ئەستێرە دەوری مانگی دابێ. ئەو خورتە ڕوخساری وەک دیبای شووشتەری و هەنییەی هەیڤئاسا و قەدی باریک و ڕێکوپێک و پێستی وەکوو زێو بوو. بە جۆرێک کە شاعیر دەڵێ:

لاوچاکێ بوو، نموونەی نەبوو لە دونیا
ڕێکوپێک و باڵا بەرز بوو، وەک ڕەعنا
ڕەزا سووک و خوێنشیرین و لە بەر دڵان
چەندی دەتکرد تێر نەدەبووی لە تەماشا

یەکی دیکە لە پەسنیدا دەڵێ:

خۆرێ بوو ئەو، لە ماڵی تاجەددین هەڵات
لەوێ هەڵات ڕوناکی دایە گشت وڵات
کوڕی چی گەوهەرێکی درەوشاوە بوو
ڕاستت دەوێ گەش وەک ئاوی سەرچاوە بوو

کورتی کەینەوە، کوڕە بازرگانەکان بانهێشتیان کرد و پێیان گوت: «عەلی، پێمان خۆشە هەر ئەوڕۆ لەگەڵمان بێی بۆ فلانە باخ بۆ سەیران. عەلی گوتی: «با بە باوکم بڵێم، هەتا بەو نەڵێم ناتوانم بێم.» لەو جەنگەیەدا کە ئەوان خەریک قســـە کردن بوون، تاجەددینی باوکی، بەوێدا هات. عەلی گوتی: «باوکە ئەو کوڕە بازرگانە بانگهێشــتیان کردووم دەڵێن لەگەڵمان وەرە بۆ فلانە باخ دەچین بۆ ســـــەیران. ئەتۆ لێم ڕێم دەی لەگەڵیان بچم یان نا؟» باوکی گوتی: «باشە ڕۆڵە گیان لەگەڵیان بچووە.» دوای ئەوەش کەمێکی زێڕ و زیو دایە و گوتی: «بچن خۆشتان بێ.» لەڕێوە کوڕە بازرگانەکان سـوار بوون و عەلی نوورەددینیش سـوار بوو و چوونە باخێک. لەو باخەدا ئەوەی دڵ بە ئاواتی خواستبا و چاو ویستبای تێیدا بوو. دەرگاکانی ئەو باخە وەک و باخی بەهەشت دەچوو، ناوی دەرکەوانەکەش ڕەزوان بوو. بە هەموو لایەکی ئەو باخەدا ڕەز خۆیان کێشـــابووەوە. ترێ ســـوورەکەی ئۆخژنی بە دڵی فینجان دێنا و ترێ سـپییەکەی بازاڕی زێوی دەشـکاند و ڕەشـەکەی تەشـەری بە میسـک سارادا دەدا. لەو باخەدا شەفتالوو و هەنار و هەرمێ و سێو لە تامیان دەر کردبوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی هەشتسەد و شەست و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک کوڕە بازرگانەکان چوونە ناو باخەکەوە، ترێی جۆراجۆریان دیت. لەو ترێیانەی شاعیر دەڵێ:

تـرێـی چـی، تـرێ هەر وەک شەوچرا
چاو دادەگرێ و لە دوور دڵ دەبا
شۆڕە و بووە هێشوو دەلەرێتەوە
لە گوێی کیژی باخ دەتروسکێتەوە
هەر وەک مرواری پالیان وێک داوە
گلارە ترێ گشت بە حەواوە
هێشا هیچ نەبووە هەستت مەست دەکا
ڕۆژێ بێ بگا بڵێی چی بکا؟

پاشان چوونە خانووی باخەکە. سەیریان کرد باخەوانەکە لەوێ دانیشتووە. دەتگوت باخی بەهەشتە. لە سەردەرانەکەی ئەو شێعرە نووسرابوو:

کانگای پشوو، وچانی دڵ و مێشکە ئێرە
فرێ دە چی خەم و کەسەرە، وەرە ئێرە
ڕابوێرە و هەڵدە بادە و خەم بە با دە و خۆش بە
سەرخۆش بە لەگەڵ یارەکەت بەهەشتە ئێرە

ئینجا چوونەوە ناو باخەکە کە پڕ بوو لە میوە و مەل و باڵندەی جۆراوجۆر. ئاوێکی ڕوون وەک چاوی قرژاڵ بە بن دارەکاندا دەڕۆیشت. وەک شاعیر دەڵێ:

دەڵێن ئێرەمێک هەیە، ڕەنگە ئێرە بێ
پڕ پڕ لە سێو و هەنار و هەرمێ و بەهێ
مەیدانی تەڕاتێنی گوڵ و بولبولان
تژییە و لەو شتانەی دڵ دەیانخوازێ

دارەکان ئەوەندەیان میوە پێوە بوو کە لە باس نایە. هەنارەکانی دەتگوت مەمکی گراوی گوڵعوزارە. کە شاعیر دەڵێ:

هەنار چ هەنار سوور وەک دەمی یار
دەتروسکێتەوە سست دەکا دەمار
ئای لەو هەنارەی دانە دانەیە
جوانییەکەی دەڵێی ڕێک ئەفسانەیە
عەقیق و یاقووت، پاڵیان وێک داوە
چاو پێی دەکەوێ، دم پڕ لە ئاوە
هەنار خڕ و تورت وەکوو مەمکی یار
چاوبڕکێیانە لە سەر سینگی دار

لەو باخەدا هەرمێ و سێوی وای لێ بوو چاو لە بینینیان تێر نەدەبوو.

دار بە داری دارەکان، داری بەرن
دار، بەری گرتووە، ئەو ساڵ مەحشەرن
میوەگەڵ هێند گەش و تورت و پڕ ئاون
سێو و هەرمێ بە پتەیەک تەقاون
قەپاڵی لێدەی چۆڕاوگە دەبەستێ
لیک و ئاوی تا سەر سینگت ناوەستێ

هەنجیری سەوز و سوور و هێشووە خورمای ئەو باخە مرۆڤیان سەرسام دەکرد. وەک شاعیر دەڵێ:

دار هەژێر بەو دیمەنە جوانەیەوە
هەر خۆشە لە بنی بحەسێیەوە
بەری شیرین و خۆشە، زۆر بە تامە
عەقڵ لە ئاستیدا، کاس و سەر سامە
هێشووە خورما بە دارەوە، نیشتووە
مەلی چاویشم لە سەری نیشتووە
وەک و ڕێوی و تریی ڕەزە بەرزەکە
دەبێ بڵێم خورما هیچ و بێ کەڵکە

سێوە سوورەکانی بە سەر دارەوە سێویل ئاسا دەتروسکانەوە وەک شاعیر لە پەسنیدا دەڵێ:

ئـای سـیـوی سـوورم پـێ جـوانە
تـورت و گـەش لە بەر دڵانە
شـێوەی کوڵـمی یارم دەدا
لە دوورڕا ترو سـکە دەدا

دیسان بەهێی تووری[1] و حەڵەبی و ڕۆمی لێ بوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

[1]. لێرەدا مەبەست کێوی توور و دەوروبەرییەتی.

## کە شەوی هەشتسەد و شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بەهێی بۆنخۆش و ڕەنگیان دەدیت کە مرۆڤی لە هۆش خۆی دەبرد. وەک شاعیر دەڵێ:

بەهێی زەردی گەش خۆرا دەتروسکا
بۆنە خۆشەکەی ڕووحی دەخستە سەما

نارجی ئەو باخە هەر لە پەسن نایە، وەک شاعیر دەڵێ:

سەروبسکی داری نارنج پرش و بڵاوە
ڕەنگی زەرد و سەوز سەریان لێک داوە لەو ناوە
هەر نارنجێک خۆرێکە بۆخۆی دەتروسکێ
ئای لەو هەموو جوانییەی لێرە لەگەڵ دڵ دەدوێ

تورنجە زێوینەکانی هەر ئاوا بوون وەک شاعیر دەڵێ:

تورنج و نارنج، لیمو و پرتەقاڵ
جیا ناکرێنەوە جیاوازان بەحاڵ
سەرچاوەی سوود و قازانجی زۆرن
لە ناو میواندا هەردەڵێی خۆرن

لەو باخەدا پۆل‌پۆل یاسەمن و سونبول و نەسرین و شیلان و وەنەوشە و گوڵی ڕەنگاوڕەنگی دیکە خێوەتیان هەڵدابوو. دوای ئەوەی تێر لە باخدا گەڕان. هاتنە خانووی باخەکە دانیشتن. عەلی نوورەددینیان بردە لای سەرەوە دایان نا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شه‌وی هه‌شتسه‌د و شه‌ست و شه‌شه‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشكۆ! كوڕه بازرگانه‌كان دانیشتن و عه‌لی نووره‌ددین له لای سه‌ره‌وه له سه‌ر فه‌رشی په‌ڕاوێز زێڕین دانیشت و پاڵی به پشتیی دیباوه دابوو. ئینجا ڕه‌زوان باوه‌شێنێكی هێنا له په‌ڕی مروشتر كه له سه‌ری نووسرابوو:

مێش، كوا ده‌ست له شیله‌ی شیرینیی هه‌ڵده‌گرێ
بۆ وه‌ده‌رنانی ڕه‌قیب باوه‌شێنت ده‌وێ

دوای ئه‌وه كوڕه بازرگانه‌كان پێچوكڵاویان داكه‌ند و كه‌وایان داكه‌ند و خۆمانه دانیشتن و ده‌ستیان كرد به قسه كردن. باسی هه‌موو شتێكیان ده‌كرد. له هه‌مان كاتیشدا سه‌ریان له جوانی و قۆزی و ده‌لالی عه‌لی نووره‌ددین سووڕ مابوو. چاویان له سه‌ر هه‌ڵنه‌ده‌گرت. پاش ماوه‌یه‌ك كۆیله‌یه‌كی تازه لاو كه مه‌جۆعمه‌یه‌كی چێشت له سه‌ر سه‌ر بوو له ماڵی یه‌كێك له كوڕه بازرگانه‌كانه‌وه هێنابووی وه‌ژوور كه‌وت. چێشته‌كه‌یان له ده‌فری زێڕ و بلوور كردبوو. كه خواردنه‌كه‌یان دانا. كوڕه بازرگانه‌كان هاتنه پێش و خواردنه‌كه‌یان خوارد و به ئاو و سابوونی بۆنخۆش ده‌ستیان شوت به ده‌سره‌ی حه‌ریر ده‌ستیان وشك كرده‌وه. دانیشتبوون خه‌ریك بوون قسه‌یان ده‌كرد كه باخه‌وانه‌كه مه‌جۆعمه‌یه‌كی پڕ له گوڵی هێنا. كوڕه بازرگانه‌كان گوتیان دا بیهێنه ئێمه بێ گوڵ كه‌یفمان ساز نابێ. باخه‌وانه گوتی: «ئه‌من خوویه‌كم هه‌یه هه‌ر كه‌س شێعرێكی خۆشم بۆ نه‌ڵێ گوڵی ناده‌مێ.» ئه‌و كوڕانه ده كه‌س بوون. یه‌كێك له‌و كوڕانه گوتی: «گوڵه بێنه بۆ من با شێعرێكی شیاوت بۆ بڵێم.» باخه‌وانه‌كه چه‌پكه گوڵێكی دا به‌و. كوڕه چه‌پكه گوڵه‌ی وه‌رگرت و ئه‌و دوو به‌یته‌ی بۆ گوت:

چاوه‌كه‌م چاوت ماچ ده‌كه‌م
گوڵی جوان بابه‌تی منه
بۆ كوێ ده‌چی واوه مه‌چه»
شتی جوان قابیلی منه

دوای ئه‌وه باخه‌وانه چه‌پكه گوڵێكی دا به یه‌كی دیكه. ئه‌ویش گوڵه‌كه‌ی وه‌رگرت و ئه‌و دوو به‌یته‌ی بۆ گوت:

بژی باخه‌وان بۆ گوڵت

باخەوانی لە تۆ جوانە
ئەو گوڵە جوانانەی ئەتۆ
هەر قابیلی دەسگیرانە

دوای ئەوە باخەوانە چەپکە گوڵێکی دا سێیەمن و ئەو کوڕەش گوڵەکەی وەرگرت و ئەو بەیتەی بۆ گوت:

گوڵێکم دەوێ تای نەبێ
شێوەی یاری جوانم بدا
کە بۆم شاگەشکە بێ
بڵێ ڕاست شێوەی خۆم دەدا

ئەوجار گوڵی دا بە چوارەمین و ئەویش لێی وەرگرت و ئەو بەیتەی بۆ خوێندەوە:

گوڵێکی بۆنخۆشم دەوێ
دڵ بۆ بۆنی خۆش ناسرەوێ
بۆنێکی وا بێ پێی مەست بم
نەک هەر مەست یەکسەرە سست بم

دوای ئەو چەپکە گوڵی دا بە پێنجەمین گەنج و ئەویش لێی وەرگرت و ئەو بەیتەی بۆ خوێندەوە:

زەحمەت مەکێشە باخەوان
جوانیش نەبێ قەیدی نییە
یارەکەی خۆم هێندە جوانە
پێویستیم بە جوانی نییە

دوای پێنجەمین، گوڵی دا بە لاوی شەشەم و ئەویش ئەو بەیتەی خوێندەوە:

زەحمەت نەبێ باخەوان گیان
من گوڵێکی جوانم دەوێ
یارەکەی من هێندە جوانە

## شتی جوان نەبێ نایەوێ

ئەوجار باخەوان چەپکە گوڵی دا بە کوڕی حەوتەم و ئەویش ئەو بەیتەی بۆ گوت:

باخەوان گیان سەر پشک بە
خۆت گوڵێکی جوانم دەیە
تازە من ژنم هێناوە
هیچ بڕوبیانووم نەماوە

باخەوان گوڵی بۆ هەشتەمنییش ببرد و ئەویش لێی وەرگرت و ئەو بەیتەی بۆ گوت:

باخەوان باخت هەر ئاوەدان بێ
دایمە قرتاڵەت پڕ گوڵی جوان بێ
لەو سیانەش دە با یەکیان ئی من بێ
قەیناکا هەر چەند زۆریش جوان نەبێ

دوای ئەو نۆرە گەیشتە لاوی نۆیەم و ئەویش لێی وەرگرت و ئەو شێعرەی بۆ گوت:

کاکە گیان یاخوا دەست و بۆنت خۆش
ڕۆژی ئاوا خۆش نابێ فەرامۆش
ژیانت پڕ لە جۆش و خورۆش بێ
سەر و دڵیشت وەک بۆنت خۆش بێ

لە کۆتاییدا گوڵی دا بە دەمین کەس و ئەویش چەپکە گوڵەکەی لێ وەرگرت و ئەو بەیتە شێعرەی بۆ گوت:

زۆر دەترسم بەختەکەم خەوتبێ
گوڵێکی سیسم وە بەر کەوتبێ
گوڵی ئاخری کەوتە دەستی من
لە ژن هێنانیش وا بێ شانسی من

کاتێک چەپکە گوڵەکانیان لێ وەرگرت. باخەوان بەزمی شەرابی ساز کرد و پیاڵەی زێڕین پڕ لە بادەی ئاڵی لە سەر سفرە دانا و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

لاوەکان لەو باخەدا هەمـــــــــــوو شت مەستە
بولبول مەســـتی گوڵ، مەلیش ئی باخ و هەســـتە
درەخت مەســـــــــتی چەم و ڕووبار و هــەوایە
هەڵدەن شەراب، جێ مەمێنن لەو هـــــــــەوایە

باخەوان پیاڵەیەکی بلوورینی بۆ خۆی تێ کرد و هەڵی دا. ئەوجار یەکی پیاڵەیەکی دا بە یەک بە یەکی کوڕە بازرگانەکان، تا ســـەرە گەیشـــتە عەلی نوورەددین. باخەوان پیاڵەیەکی تێ کرد و دایە دەستی. نوورەددین گوتی: «ئەتۆ تۆ دەزانی من قەتم ئەوە نەخواردووەتەوە، خواردنەوەی گوناحێکی گەورەیە و خودا لە کتێبەکەیدا نەهی لێ کردووە. باخەوان گوتی: «کاکە گیان ئەگەر تۆ هەر لەبەر حەرام بوونی نەتخواردووەتەوە ئەوەندە بزانە کە خودا زۆر لێبووردە و دلۆڤانە و لە گوناهی گەورەش خۆش دەبێ چ بگا بەو جۆرە گوناهانە. شاعر لەو بارەوە دەڵێ:

تۆ پێت وایە ئەو خودایە هێند دڵڕەقە و بـــــــــــــــــــێ ڕەزایە
گەر بێـت و تۆ تـاوێ شـــــاد بی، دەت ســــووتێنێ لەو دونیـایە

دوای ئەوە یەکێک لە کوڕەکان سوێندی لێ خوارد کە دەبێ بخواتەوە و یەکی دیکە هاتە پێش و تەڵاقی خوارد دەبێ بخواتەوە. یەکی دیکە هات لەبەری پاڕاوە. عەلی نوورەددین لە ڕوودا مـا و پیـاڵەیەکی لێ وەرگرت و قومێکی خواردەوە و کەمێکی لە زاریدا ڕاگرت و گوتی: «ئەوە تاڵە.» باخەوان گوتی: «ڕاســـتە تاڵە بەڵام قازانجی زۆرە، خەمدەرەوێنێ و نەخۆشی دەپەڕێنێ و یارمەتی هەرسی خواردن دەکا و ترسنۆکان، نەترس دەکا.»

گەر هەمـوو کەس بیزانیبـا بە ســـوود و قـازانـجی شـــەراو
دەخوراوە لە گشـــت شـــوێنێ بە ئاســـانی لە جـــــــیاتی ئاو

ئیدی ئەوە ناکرێ تەواوی قازانجەکانی یەک یەک لێرە باس بکەین. ئینجا ڕەزوان هەستا چوو ســـەر ســـندووقەکەی هەڵگرت و کەمێکی شـــەکر دەر هێنا و لە پیاڵەکەی کرد و بە نوورەددینی گوت: «ئەگەر لەبەر تاڵیان بۆت ناخورێتەوە، ها ئەوە تاڵییەکەشـــیم چا کرد. نۆشی گیانتی کە. ئیدی نوورەددین پیاڵەکەی بە سەرییەوە نا.

دوای ئەوە یەکی دیکە لە کوڕە بـازرگـانەکـان پیـاڵەیەکی دیکەی تێ کرد و گوتی: «نۆکەرتم کاک عەلی، ئەو پیالەیەی بخۆوە. یەکی دیکەش پیاڵەیەکی تێ کرد و بۆی هێنا منیش نۆکەرتم لەبەر دڵی منیش ئەو پیاڵەیە و یەکی دیکەش هات و ســـوێندی دا و یەکی

دیکەش بەو جۆرە..

بە کورتی، هەر کام لەو دە کەســـە هەر یەکی بە جۆریک یەکی پیاڵەیەکیان دەخوارد دا. نووردەین بە تەواوی ژیانی شـەرابی نەخواردبووەوە. بەو شـەرابە سـەری لە گێژەوە هات و مەست و سـەرخۆش بوو و زمانی سڕ بوو. قسـەی بۆ نەدەکرا. ئینجا گوتی: «کوڕەکان دەزانن ئێوە زۆر کوڕی چاک و قسـەخۆشـن و ئێرەش زۆر خۆشـە. بەڵام حەیف، ئامێری موزیک و شـادیی لێ نییە. بادە و شـەراب بەبێ شـادی و سـەما و هەڵپەڕین هەر نەبێ باشترە. وەک شاعیر دەڵێ:

خۆشـــی و شـــادی بە بێ مووزیـک
وەک، بادەی بـــــــــــێ مەزە وایە
بڕۆن ئامـــــــــــــێر و شت بێنن
دە با خـــــــــــۆش بین ئەگەر وایە

لەو جەنگەیەدا باخەوانە لاوەکە هەستا و سواری یەستری یەکێک لە کوڕە بازرگانەکان بوو، ڕۆیشـــــت. پاش ماوەیەک هاتەوە.کیژێکی ژیکەڵەی جوانی، ڕوو چەرمووی، مەمک هەناری، تازە پێگەیشتووی، قەد باریکی، موو فڕی لەگەڵ خۆی هێنا. وەک شاعیر دەڵێ:

هەر تاڵێکی قژی ئەو کەنیشـکە جـــوانە
هـاڵا بوو لە پێی دڵی یەک لەو لاوانە

ئەو کەنیشکە ڕووهەتاوە کراسێکی ئاسمانی لە بەر دا و چارشێوێکی سەوزی بەسەروە بوو. هەرکەس دیتبای سەری لێ دەشێوا و هۆشی لای خۆی نەدەما.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! باخەوان کچێکی هێنا لە جوانی و بەژن و باڵادا بێ وێنە، دەتگوت لە ماڵی خۆزگەوە هێنراوە:

دەلالی پارچەیەک بوو بە بەژنـــــــــــــــــــی براوو
ئەوەی دڵ خۆزگەی بۆ دەخواســـت لەو کیژەدا بوو

دوای ئەوە باخەوانەکە بەو کەنیشـــکەی گوت: «ئەی جوانی جوانان و خانمی خانمان، مەبەســتی ئێمە لە هێنانی تۆ بۆ ئێرە ئەوە بوو کە ببێ هاوڕێ و هاودەمی ئەو لاوە قۆز و شۆخ و شەنگە. چونکە ئەو یەکەم جارییەتی دێتە جێی ئاوا. کچە گوتی: «ئەگەر لە پێشدا بە منتان بگوت بایە ئەوەی پێم بوو دەمهێنا.» باخەوان گوتی: «خانمەکەم ئەمن دەگەڕێمە بۆت دێنم.» کچە گوتی: «دەی زۆر باشە بچووە بۆم بێنە.» باخەوان گوت: «نیشـانەیەکم دەیە با بمدەنێ.» کچە لەچکەیەکی دایە.

باخەوانەکە لەڕێوە وەدەر کەوت و زووش گەڕاوە. بوخچەیەکی حەریری سەوزی هێنا. کچە بوخچەکەی وەرگرت و کردییەوە. لە بوخچەیەدا ســـی و دوو کوتە داری عوودی قوماری تێدا بوو. ئەو کوتە دارانەی پێکەوە لکاند. بوو بە عوودێکی کاری هیند. دوای ئەوە کچە عوودەکەی بە دەســـتەوە گرت و تێلەکانی توند کردەوە و خســـتییە بن پێلی و چەند شێوازی ژەنی و گەڕاوە شێوازی یەکەم. و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەوشـــەو وا دیارە مـــــــــــــــــــــــــیوانی مانگم
دەبـــێ بـــژەنـــم خـــۆشــــتـــریـــن ئـــاهەنـــگـــم
ئەوە دیـــاریـــم بـــێ، لە بـــۆ شـــــای گەنـــجـــان
یان فیدای بـــــــــــــــــــــــکەم دڵ و ڕوح و گیان

کاتێک نوورەددین ئەو شێعرەی لە کچە بیست، بە چاوی خۆشەویستییەوە تێی ڕوانی و دڵی چووپێ. بە جۆرێک کە لە تاوان خەریک بوو لغاوی ئاوەزی لە دەســـت بەر بێ. کچەش هەر وا. کاتێک کچە لە هەنتەشـــیانی ڕوانی نوورەددین لە نێو ئەواندا وەک مانگ دەچوو لە نێو ئەستێراندا. ئەوەندە ئاکارجوان و ڕاوێژجوان و لەبەر دڵان بوو. وەک شاعیر دەڵێ:

کانییەکی هەڵقـــــــــــــــــــــولاوی ناو بێروون

لاوێکی ڕێکـــــــــــــــوپێک، بە نەزم و زاکوون
جوانچـاک و خوێنشـــیرین، مەنـد و مـاقووڵ بوو
گەنجێـــــــــــــــکی نەرم و نیان، لە بەر دڵ بوو

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی هەشتسەد و شەست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! عەلی نوورەددین کە شێعرەکەی لە کچە بیست، سەری لە ڕەوانبێژی و زمانپاراوییەکەی سووڕ ما و بەو دوو بەیتە وەڵامی داوە:

گوڵ بۆخۆی هەر یەکپارچە دیـــــــــــارییە
ئەویش گوڵی وەک تۆ کە تـــــــــــای نییە
ئەمن سەرسامم بە دیـــــــــــــــــداری تۆ
کۆڕی ڕووناک کرد تیشـــــکی جوانی تۆ

کە عەلی نوورەددین ئەو شـــێعرەی خوێنـدەوە، کچە دوو ئەوەنـدە ئۆگری بوو. خۆشـەویسـتی بۆی زیاتر بوو. واقی وڕمابوو. لە بەرابەر ئەو بەژن و باڵا و، ئەو هەموو جوانی و ڕێکوپێکییەی نەیتوانی خۆی ڕاگرێ و دیســـان دەســـتی دا عوودەکەی و ئەو شێعرەشی خوێندەوە:

مەلێکی لانەوازم من ڕێم دە لادەمە باخـــــــــەکەت
کە باخەکەت پەنایەکە لە بۆ حەســـــــانەوە و پشوو
تینووم، ڕێم دە بخۆمەوە لە ئاوی کانـــــــیاوەکەت
دەزانم ئاوی کانییەکەت وەبەر مردووش دێنێ پشـــوو

کە کچە شێعرەکەی تەواو کرد، نوورەددین کە نوقمی جوانی و زمانپاری و خوێنشیرینی کچە بوو، لغاوی ئاوەزی لە دەست دەرچوو خۆی پێ نەگیرا و هەستا چوو کچەی لە ئامێز گرت. کچەش باوەشـــی بەو داگرت و ناوچاوانی ماچ کرد. عەلی نوورەددینیش ناو دەمی ماچ کرد. هەنتەشیان ئەو کارەیان بەلاوە سەیر بوو. هەستانە سەر پێ. عەلی نوورەددین کە وە هۆش هاتەوە تریق بووەوە و کچەی بەر دا. کچەی دەســتی بەر دا عوودەکەی هەڵگرتەوە و چەند شێوازی دیکەی لێ دا و گەڕاوە سەر شێوازی یەکەم و ئەو شێعرانەی خوێندەوە:

داری ئەڤین کە چرۆی کرد کوا وەرز و مەرز دەناسێ؟
دڵ کە فڕی لە هێــــــــلانە قەفەس و مەفەس ناناسێ
ببوورن کۆڕی هاوڕێیان، من قەفەســــــی خۆم دیتەوە
لوول دەکەم باڵم بۆ ناوی، تازە لێـــی دوور ناکەومەوە

عەلی نوورەددین کە ئەو قسە خۆش و شێعر جوانانەی بیست، کەیفی ساز بوو. ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەو سیـــــــــــنگەی من قەفەست بێ دایەدڕم بۆ ئازادیت
هەر چەند ئازادیشـــت نەوێ هەر بەو مەرجە لەگەڵ من بیت
بەختەوەریت ئاواتمە گوڵـــــــــــــخونچەی ئەشق و جوانی
حەیفە بە باڵای تۆ نەبڕێ، بەخـــــــــــــتەوەری و کامەرانی

کاتێک عەلی نوورەددین ئەو شێعرەی خوێندەوە، کچە لە ڕادەبەدەری کەیفی پێ کرد و دەستی دا عوودەکەی باشترین شێوازەکانی لێ دا و تەواوی نەواو ستڕانەکانی لێ داوە و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بەختەوەریـــــــــــــــم ئەو کاتەیە تیر تۆ لە باوەشم گرم
تۆ پێم بڵێی دڵتم دەیە منیش ســـینگمت بۆ هەڵبدڕم

لەو کاتەدا عەلی نوورەددین زۆر زۆر خۆشحاڵ بوو بەو شێعرە وەڵامی داوە:

من کە کوژراوی ســـینگی تۆم چۆن دەهێڵم تۆ وا بکەی
ئەو سینگە نەرم و گۆشتنەت بۆ دڵـــــــــــی من ئازار بدەی
دڵی منیش با بۆ تۆ بێ، تازە من خۆم دۆڕانــــــــــــــدووە
لە قوماری ئیشقی تۆدا من دەستم لە خۆم شـــــــــۆردووە

کاتێک کچە ئەو شێعرەشی بیست و ڕەوابێژی و زمانپاراوی ئەی دیت، خۆی پێ نەگیرا و عەلی نووردەددینی بۆ لای خۆی ڕاکێشـا و ماچێکی کرد و عەلی نوورەددینیش ماچێکی کرد. کە لە ماچ و موچ بوونەوە. کچە عوودەکەی دەست دایە و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

شوکور و سپاس بۆ ئەو خوایە، لە باوەشی یاردا خـــــــــۆم دیت
میوەی بەری خۆزگە و بریام، نەمردم بە چاوی خـــــــــــۆم دیت
چ یار ئەویش جوانترین یار، بێ هاوتا لە دێـــــــــــــهات و شار
گوڵێک هەر بۆ من ڕوابوو، قسمەتم وا بـــــــــــــوو ئەوم دیت

بە دوای ئەودا ئەو شێعرەشی خوێندەوە:

بڵێم تۆ چیمی، چـاومی؟ لە چـاوم لام ئـازیزتری
بۆ ژیـانی تـاریکی من گەلێـک لە تـاو ڕوونـاکتری

عەلی نوورەددەین سـپاسـی کچەی کرد و دەسـتخۆشـی لێ کرد. کیژە لەجێوە هەسـتا هەرچی زێڕ و خشـــڵی پێی بوو دایکەند و لە پەنا عەلی دانا و هەنیەی ماچ کرد. خاڵەکانی سەر ڕوومەتی ڕاموسی و زێڕ و خشڵەکانی خۆی پێشکەشی عەلی کرد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کچە هەرچی زێڕ و جلی گرانبایی بوو پێشکەشی عەلی نوورەددینی کرد. پێشی گوت: «بینایی چاوم دیارییەکەم لە قەدەر خۆمە.» عەلی نوورەددین دیارییەکەی لێ قەبووڵ کرد. ئینجا هەستا چاو و دم و گوڵمی ماچ کرد. کە کۆڕەکەیان تەواو بوو عەلی نوورەددین هەستا. کچە گوتی: «گەورەم دەچی بۆ کوێ و ئەو دڵە سووتاوە لاتە دەبەی بۆ کوێ؟» عەلی گوتی: «دەچمەوە ماڵە بابم.» کوڕە بازرگانەکان سوێندیان دا کە لە لای ئەوان بخەوێ. عەلی نوورەددین بە قسەی نەکردن و سواری یەسترەکەی بوو. چووەوە ماڵی خۆیان. دایکی لە بەری هەستا و گوتی: «ڕۆڵە گیان تا ئێستا بەو شەو درەنگییە لە کوێ بووی؟» بە خودا من و باوکت لە تاوانت حەجمینمان نەبوو، ڕووحمان هەر لە لای تو بوو. ئیدی لە باوەشی گرت و ماچ کرد. بۆنی شەرابی بۆ هات. گوتی: «ڕۆڵە گیان بەو هەمووە چاکی و دوورە پەرێزییەتەوە ئەوە چۆنە شەرابت خواردووەتەوە و بێ ئەمری خودای خۆت کردووە؟» لەو جەنگەیەدا کە ئەوان قسەیان دەکرد بای عەلی نوورەددین گەیشتەوە. عەلی نوورەددین چوو خۆی لە جێیەدا خست و وای نیشاندا کە نەخۆشە. باوکی گوتی: «ئەوە چ بووە، نوورەددین بۆ لە جێیە دایە؟» دایکی گوتی: «خەوتووە و ناساغە.» باوکی چوو هەواڵی بپرسێ، بۆنی شەرابی بۆ هات. ئەویش قینی لە شەرابخۆران بوو. بە نوورەددینی گوتی: «ڕۆڵە ئەوە هیچ و پووچیت کەیشتووەتە ئاستێک شەراب بخۆیەوە؟!» عەلی نوورەددین کە گوێی لەو قسەیەی بابی بوو، چونکە مەست بوو ڕاست بووەوە و زللەیەکی لە بابی دا. ڕێکەوت وا بوو زللەکە چاوی ڕاستی بابی گرت و خوێن بە لاچاویدا هاتە خوارێ و بێ هۆش بوو. گوڵاویان بە سەردا هەڵپرژاند تا وە هۆش هاتەوە. ویستی لێی دا دایکی نوورەددین نەیهێشت. تاجەددینی بازرگان تەڵاقی خوارد ڕۆژ بێتەوە دەستی ببڕێ. دایکی کە ئەوەی بیست نارەحەت بوو. نیگەرانی کوڕەکەی بوو. هەر لە بەر تاجەددین پاڕاوە هەتا تاجەددین خەوی لێ کەوت. دایکی نوورەددین ڕاوەستا تا مانگ هەڵات و نوورەددین مەستییەکەی ڕەوی. ئەوجار پێی گوت: «نوورەددین ئەو کارە خراپە چ بوو لەگەڵ بابت کرد؟» نوورەددین گوتی: «چم کردووە؟» دایکی نوورەددین پێی گوت: «بە زللە چاوی ڕاستی باوکت کوێر کردووە و ئەویش تەڵاقی خواردووە کە بەیانی دەستت بپەڕێنێ.» نوورەددین زۆر پەشمیان بووەوە. دایکی گوتی: «ڕۆڵە پەشیمای تازە سووردی نییە. ئێستا هەستە هەڵێ بەشکوو ڕزگارت بێ. دوای ئەوە چوو سەری سندووقەکەی کردەوە و توورەکەیەک کە سەد دیناری زێڕی تێدا بوو، دای بە نووردەددین و پێی گوت: «هەر کاتێک ئەو زێڕانەت تەواو بوو، پێم بڵێ توورەکەیەکی دیکەت دەمێ. ئەگەر کەسێکیشت نارد بەو کەسەدا لە بارودۆخی خۆتم ئاگادار بکەوە. بەشکوو خودا ڕێگایەکت

به ڕوودا بکاتەوە و بێیەوە ماڵەکەی خۆت.»

نوورەددین ماڵاوایی لە دایکی کرد و ویستی بڕواتە دەرێ. توورەکەیەکی گەورە لە پەنا سندووقەکە بوو کە دایکی لە بیری چووبوو، لە سندووقەکەی خاتەوە. ئەو توورەکەیەش هەزار دیناری زیڕی سوور تێدا بوو. نوورەددین دەستی دا ئەویش و هەردووکیانی لە باخەڵی خست و بەرەو بوولاق[1] ڕۆیشت. بۆ تاوهەڵاتی بەیانی گەیشتە بوولاق و چووە قەراخ دەریا. لەوێ کەشتییەکی دیت دەچوو بۆ ئەسکەندرەییە. بە کەشتیوانەکەی گوت: «منیش لەگەڵ خۆت بەرە.» کەشتیوان گوتی: «لە خزمەتت داین لاوی جوانچاک.» لەڕێوە عەلی نوورەددین چوو بۆ بازاڕ و پێداویستی سەفەری کڕی و گەڕاوە لای کەشتییەکە. کەشتیوان کەشتی ئاژووت هەتا گەیشتنە شاری ڕەشید. عەلی نوورەدین گەمییەکی دیت بەرەو ئەسکەندرییە دەچوو. سواری گەمییەکە بوو تا گەیشتنە پردێک کە قەنتەرەی جامییان پێ دەگوت. عەلی نوورەددین لە گەمییەکە دابەزی و بە بابولسدووردا چووە ئەسکەندەریە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. شارێکی چکۆلەیە لە نیزیک قاهیری ئەو کات.

## كە شەوی هەشتسەد و حەفتایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک عەلی نوورەددین چووە ناو شاری ئەسکەندەرییە، سەیری کرد، شارێکی سەرسەوز و خۆشە. وەرزی سارد و سەرما بە سەر چووە و بەرەو بەهارە. دار گوڵیان کردووە و چۆم و ڕووبارەکان بە خوڕن. شارێکی جوان و ڕێکوپێکە و خەڵکەکەی قسەخۆش و جوانچاکن. گەر بێت و دەرگاکانی شار داخرێ خراپە لەو شارەدا ناکرێ ئەوەندە باشن. شاعیر دەڵێ:

ئەسکەندەریە ئەی شاری زانست و هونەر
باخ و باخاتت خۆش و با سەفا و، گیانپەروەر
دەحەسێتەوە ڕێبواری ماندوو و غەوارە
هەرکە دێتە ژێر سێبەری خۆشی ئەو شارە
دار و بەردی شار مرواری و لۆلۆ و یاقووتە
شاری ژیان پڕ لە ڕسق و ڕۆزیی و قووتە

نوورەددین بە کۆڵان و گەڕەکەکانی ئەو شارەدا ڕۆیشت، تا گەیشتە بازاڕی هەزوێلەفرۆشەکان. کابرایەکی بە ساڵاچوو لە دووکانەکەی هاتە دەرێ و سڵاوی لە عەلی نوورەددین کرد و دەستی گرت و بردییەوە ماڵی خۆیان. عەلی نوورەددین سەیری کرد. کۆلانێکی ئاوپرژێنکرا و ماڵدراو، سێبەری دارەکان وڵاتی داگرتبوو. سۆزەیەکی بەهەشتی و دڵڕفێن دەهات. ئەو کۆڵانە سێ ماڵی تێدا بوو. یەکیان حەوشەیەکی بەرین و بەربڵاو. دالانێکی گەورە. ئەو حەوشەیە هەمووی ئاوپرژێنکراو و ماڵدراو، هەمووی بەردی ڕوخامی تێگیرابوو. بۆنی گوڵ وڵاتی داگرتبوو. ئینجا کابرا و نوورەددین چوونە ژوورێ و کابرا خواردنی هێنا و خواردیان. دوای ئەوە کابرا لێی پرسی: «ئەوە لە کەیەوە لە میسرەوە هاتووی؟» نوورەددین وەڵامی داوە باوکە گیان دوێنێ هاتووم. کابرا پرسی: «ناوت چییە؟» وەڵامی داوە: «ناوم عەلی نوورەددینە.» کابرا گوتی: «ڕۆڵە گیان ئەوەندەی لێرەی خۆم لێ ون مەکە هەتا جێگایەکت بۆ چۆڵ دەکەم، بۆخۆت تێیدا بە.» عەلی گوتی: «گەورەم خۆتم پێ بناسێنە.» کابرا گوتی: «ئەمن ساڵێکیان بۆ بازرگانی چوومە میسر، شتەکانی خۆم فرۆشت و شتی دیکەم کڕی و پێویستیم بە هەزار دیناری زێڕ بوو. باوکی تۆ بێ ئەوەی من بناسێ هەزار دیناری دامێ و بارمتە و نیشان و شتیشی لێ وەر نەگرتم. وا بوو هاتمەوە و پاش ماوەیەک پارەکەم لەگەڵ دیارییەک بۆ بردەوە کە هاتم، ئەودەم تۆ هێشتا زۆر منداڵ بووی. ئێستا ئەگەر بە هیوای خودا بە تەمام ئەو چاکەی بابت لەگەڵ منی کرد.

منیش لەگەڵ تۆی بکەمەوە. کاتێک نوورەددین ئەو قسەیەی بیست خۆشحاڵ بوو. توورەکەکەی کە هەزار دینارە زێڕەکەی تێدا بوو، دای بە کابرا و پێی گوت: «با ئەوە بە ئەمانەت لە لای تۆ بێت. هەتا پێویستیم پێی دەبێ.» نوورەددین چەند ڕۆژێک لەو شارە ماوە و خەریکی گەڕان و سەیرانی باخ و سەیرانگە و عەیش و خۆشی بوو. هەتا سەد دینارەکەی کە دایکی داییێ تەواو بوو. ئەوجار هاتەوە لای کابرا هەزوێلەفرۆش هەتا لە هەزار دینارەکە کەمێکی لێ وەرگرێ و بۆ خەرج کردن. کابرا لە دووکان نەبوو لەوێ دانیشت، تا بێتەوە. چاوی لە بازرگانەکان دەکرد و بەولا و لادا چاوی دەگێڕا، کە عەجەمێکی یەستر سوار هات کچێکی جوان و لەبەردڵانی لە پاشکۆی خۆی سوار کردبوو. لەو کچانە بوو کە شاعیر لە تاریفی زولف و ڕوخسار و لێوی شیرینی دا دەڵێ:

لێو شەکەری هەیڤ ڕوو، بسک لە سەرشانی
باڵا سەلوی چاو کەژاڵ، ئەبرۆ کەوانی
بە لار و لەنجە خۆ با دەدا وەکو کۆتر
دێت و دەچێ ناز دەفرۆشێ، بە چاوانی

دوای ئەوە عەجەمە لە یەسترەکە دابەزی و کەنیزەکەشی داگرت و بانگی دەلالی کرد. دەلال هات. پێی گوت: «ئەو کەنیزەم بۆ بێنە سەر سەودایە.» دەلال کچەی لە سەر کورسییەکی ئاونووس و عاج دانا و پەچەی لە ڕووی لادا. ڕوخسارێکی وەک مانگ و خۆر وەدەر کەوت. بە جۆرێک ئاوی لە چاو دێنا. وەک شاعیر دەڵێ:

جوانێک کە هەر تاڵە موویەکی داوێکە
دەرباز بوون لە ئەفینی بەس خەیاڵێکە
چی پێت وایە جوانییە تێیدا وەکۆیە
مانگێکە بۆخۆی، ئەستێرە لێی وەکۆیە

ئینجا دەلاڵەکە بە بازرگانەکانی گوت: «چەند بۆ ئەو گەوهەرە هەڵبژرادە و ئاسکە سلکە دادەنێن؟» یەکێک لە بازرگانەکان سەری سەودای دامەزراند و سەد دیناری دانا. یەکی دی دووسەد دینار و سێیەمین سێ سەد دینار و هەر ئاوا بازرگانەکان نرخەکەیان بردە سەرێ هەتا گەیشتە نۆسەد و پەنجا دیار.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بازرگانەکان نرخی کەنیزەکەیان بردە سەرێ هەتا گەیشتە نۆسەد و پەنجا دینار. لەو جەنگەیەدا دەلاڵەکە ڕووی لە عەجەمە کرد و گوتی: «نرخی کەنیزەکەت گەیشتووەتە نۆسەد و پەنجا دینار ڕازی سەوداکە سەر بگرێ؟» عەجەمە وەڵامی داوە: «کەنیزە بۆخۆی ڕازییە یان نا؟ من ڕەزایەتی ئەوم دەوێ. چونکە ئەمن زۆرم ئەرک بە سەر ئەوەوە بووە و نەخۆش بووم. زۆرم پێوە ماندوو بووە. ئەمنیش سوێندم خواردووە هەتا بۆخۆی پێی خۆش نەبێ نایفرۆشم. قسە لەگەڵ خۆی بکە ئەگەر ڕازی بوو، ئەوە باشە ئەگەر ڕازی نەبوو ئەوە هیچ، نایفرۆشم.» لەو جەنگەیەدا دەلاڵ چووە پێش و بە کەنیزەکەی گوت: «خانمی خانمان ئەوە خاوەنەت ئیختیاری داوەتە دەست خۆت. ئێستاش نۆسەد و پەنجا دیناریان داناوە، تۆ ڕازی بتفرۆشم؟» کەنیزە گوتی: «کڕیارەکەم پێشان بدە با ببینم.» دەلاڵەکە بازرگانێکی بە سالاچووی پێشان دا. کەنیزە ماوەیەک سەیری کابرای کرد و بە دەلاڵەکەی گوت: «ئەتۆ شێتی یا گەوجی؟» دەلاڵەکە گوتی: «ئەوە بۆ وا دەڵێی؟» کەنیزە گوتی: «دەی دڵت بڕوایی دەدا منی منداڵ بدەی بەو کابرا پیرە؟: شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

قەت قەل و گوڵیان نەگوتووە هاودەم بن  
خرمانی کەکرە و قامیشی شەکر کۆ بن  
کیژی تازە نەمام بۆ پیاوی پیر نابێ  
پیاوێکیش وا بکا دەبێ خەرەفابێ

که کابرای بازرگان ئەو قسە ناحەزەی لە کەنیزەکە بیست، تووڕە بوو. بە دەلاڵەکەی گوت: «گلاو ئەتۆ هیچ کارێکت نەبوو، ئەمن بانگ کەی بۆ کڕینی کەنیزێکی چرووکی وا لە لای ئەو هەموو بازرگانە قسە بە من بڵێ. ئینجا دەلاڵەکە بە کەنیزەی گوت قسەی ناحەز مەکە، دەزانی ئەو کابرایە کەیخودا و ڕاوێژکاری بازرگانەکانە. کەنیزە بزەیەکی هاتێ و گوتی: «مەگەر قسەکەی مەهەستیت نەبیستووە کە دەڵێ:

ئەو هێلانە کۆنەی تۆ جێگەی من نابێتەوە  
دڵی پڕ لە هیوای من بە دیتنت ناکرێتەوە  
من مەلێکی تیژباڵم عەرش و قورشم بۆ نییە  
نوای تۆ زۆر نەوییە کوا جێی من دەبێتەوە

دوای ئەوە کەنیزە بە دەلاڵەکەی گوت: «بە خودا ئەمن ڕازی نابم بەو کابرایەم بفرۆشی.

به یەکی دیکەم بفرۆشـــە. چونکە دەترســـم تازە ئەو پێی عەیب بێ من ڕاگرێ و ئیدی ئەو دەست و ئەو دەستم پێ بکەن. ئەو جار دەڵاڵەکە ئاماژەی بە کابرایەکی سەر و سیما پیاو کرد و گوتی: «ڕازی بە کاک شـەریفەددینت بفرۆشـم؟» کچە چاوێکی لە کابرا کرد و دیتی کە ئەویش پیرە، بەڵام ڕدێنی ڕەنگ کردووەتەوە. بە دەڵاڵەکەی گوت: «ئەمن نەمگوت ئەتۆ شێتی. تۆ بۆ هەر بە پیر و فەرتووتم دەفرۆشی؟ بۆ ئەمن گەبچارم لە پیرێکەوە دەمبە لای پیرێکی دی. دەڵێی دیواری کۆنن و خەریکن بڕووخێن یان دەڵێی دێون و هەورە تریشـــقە لێی داون؟!» پیری یەکەم شایانە وای پێ بگوترێ چونکە شاعیر دەڵێ:

ئەمــن ســــرک و بــزۆز و دڵ بە دونــیــام
ئەتۆ پیر و کـــــــــــــــــــەنەفت و تەرکەدونیای
ئەمــن خــاوەنــی هــێــز و تــیــن و هــیــوام
ئەتۆ بێ هـێز و گوڕ، ســـــــت و بێ هـیوای

بەڵام پیری دووەم کە ڕدێنی ڕەنگ کردووە بەو جۆرەیە کە شاعیر دەڵێ:

بە ڕواڵەت قــیــت و قــۆزە، وەک خەدەنــگە
حەیــف، ســـەر و ســـمــێـڵـی هەمـوو ڕەنـگە
چڵێ سپی لە ڕدێـــــــــــــــــــنیدا نییە
ئەگەر ورد بگەڕێی ڕەشـــــــــــــــی تیا نییە

کاتێک کابرای مصـبوع اللحیە (= ڕدێن ڕەنگی) ئەو قسـەیەی لە کەنیزە بیست، تووڕە بوو. بە دەڵاڵەکەی گوت: «ئەوڕۆ کەنیزۆکێکی گەوجت هێناوە. قسـە بە هەموو کەس دەڵێ و نازانێ قسەی جوان بکا. ئیدی بازرگانەکە بۆی هات و لە دەڵاڵەکەی دا. دەڵاڵەش دەستی کەنیزەی گرت و پێی گوت: «قەســـەم بە خودا لەوەتی هەم کەنیزی هێندە بێ شـــەرم و ڕووهەڵماڵراوم نەدیوە. ئەوڕۆ ڕسقی منیشت بڕی و بازرگانەکانیشت لێ کرد.» دوای ئەوە کابرایەکی بازرگان بە ناوی شەهابەددین دە دیناری خستە سەر نرخی کەنیزەکە. دەڵاڵەکە پرســی بە کەنیزەکە کرد. کەنیزە گوتی: «با بێ ببینم شـتێکی لێ دەپرسـم بزانم لە ماڵێ هەیەتی یان نا؟ ئەگەر ئەو شـتەی دەڵێم هەیبوو، ئەوە بەوم بفرۆشـە.» دەڵاڵە کەنیزەکەی بەجێ هێشـــت و چووە لای بازرگانەکە و گوتی: «کاک شــەهابەددین ئەو کەنیزە دەڵێ شـتێکی لێ دەپرسـم ئەگەر ئەو شـتەی لە ماڵدا هەبوو، ئەوە ڕازی دەبێ دەنا ڕازی نابێ. ئەوە دیتیشت کە چی بەو بازرگانانەی هاوڕێت دەگوت.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! دەلالەکە بە شـــەهابەدینی گوت: «بە خودا ئەمن ناوێرم ئەو بێنم، دەترســـم چی بە جیرانەکانت کرد، ئاواش بە تۆ بکا و ئەتۆ لێم نارەحەت بی. ئەگەریش بۆخۆت پێت خۆشە ئەوە دەیهێنم. بازرگانەکە وەلامی داوە: «بیهێنە.»

دەلالەکە چوو کەنیزەکەی هێنا. کەنیزە چاوێکی لە شەهابەددین کرد و پرسی: «گەورەم لە مالدا بالنجی پەڕت هەیە یان نا؟» شەهابەددین وەلامی داوە: «بەلێ خوێنشیرینەکەم. دە بالنجم لە مالدا هەیە. جا پێم بالنجی پەڕت بۆ چییە؟» کەنیزە گوتی: «دەمهەوێ کاتێک تو خەوتی لە ســـەر دمتی دانێم با بخنکێی.» دوای ئەوە ڕووی دەلالە کرد و گوتی: «دەلالی پەستی نەفام تۆ بۆ تێناگەی هەر دەچی لەگەل ئەو پیرانە سەودا دەکەی؟!» ئیستێک لەوە پێش منت نیشـــانی دوو کەس دا یەکی هەر یەکی عەیبێکیان هەبوو. ئەوجار پێشـــان کاک شـــەهابەددینم دەدەی، دوو عەیب و ئیرادی هەیە. یەکەم کەچەلە و دووەم ئەوەی کە کۆسەیە و شاعیر لە بارەی ئی وەک و کاک شەهابەددین دەلێ:

کەچەلـــیـــی و کـــۆســـــەیـــی هەرکـــیـــان پـــێـــکەوە
خوا نەکا بن بە ڕیشـی هـــــــــــــــــێچ کەسێکەوە
ســـــەر ڕووت و زیـــپـــکـن بـــێ و، ڕدێـن چـلە چـلە
مرۆڤ بە بینینی هـــــــــــــــــــــــــــێقی دێتەوە

شـــەهابەددین کە ئەو قســـانەی لە کەنیزەکە بیســـت لە دووکانەکەی هاتە دەرێ و هات ناوقەدی دەلالەکەی گرت و گوتی: «گلاو، ئەو چییە هێناوتە، کەنیزێکت بۆ هێناوین جنێو و قســـەی ناحەزی بە دانە دانەی ئێمە گوتووە. ئیدی دەلالەکە دەســـتی کەنیزەکەی گرت و ڕۆیشـــت و گوتی: «بە خودا قەســـەم لە تەواوی ژیانمدا کەنیزی لە تۆ بێ چاوڕوو و بێ ڕەوشـــترم نەدیوە. لە تۆ بێفەڕ و پێ و قەدەم خرابترم نەدیوە. ئەوڕۆ ڕســـقی منت بڕی و خێرت بە ناوچاوەوە نەبوو. مەگەر مست و زللەی بازرگانەکان.»

دوای ئەوە دەلال کەنیزەی هێنا بۆ لای بازرگانێک کە خاوەنی کۆیلە و غولامێکی زۆر بوو. بە کەنیزەی گوت: «ڕازیت بە کاک عەلائەددینی بازرگانت بفرۆشـــم؟» کەنیزە وەلامی داوە، کاکی دەلال ئەو بازرگانەش تاسە و، سـەر ڕووتاوەیە و شـاعیر لە بارەی ئی ئاواوە دەلێ:

کەلـــەی پـــیـــاوی تـــاس وەکـــوو کـــوولەکە

ڕواڵەتــی لـــووســـــه و نـــاوەکەی پـــووکە

ئەوجار دەلال کەنیزەی بردە لای بازرگانێکی دیکە، کەنیزە تێی ڕاما سـەیری کرد چەنەی درێژە. گوتی: «دەلالی گەوجی نەفام مەگەر نەتبیستووە کە هەرکەس چەنەی درێژە ئاوەزی کەمە و لەشت ناگا. شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

خۆ لە پیاوی قـــــوڵە نەدەن فیتنەیە
کاری فیتنە شەڕ و گـــــێرەوکێشەیە
چەنە درێـــژ، زۆر دەڵـــێ و کەم تـــێ دەگـــا
چـاره کە ڕەش بـوو، بە پـیـاوی وا دەگـا

ئیدی دەلالەکە دەستی گرت و گەڕاوە پێی گوت: «وەرە بتبەمەوە لای خاوەنەکەت. ئەو قازانجەی ئەوڕۆ بە منت گەیاندووە بەسـەمە تێر دەخۆم.» کەنیزە لە بازاڕدا هەر چاوە چاوی بوو. لە پڕدا چاوی بە نوورەددینی میسـری کەوت. سـەیری کرد، کوڕێکی قۆز و ڕێکوپێک و جوانچاکە. وەک تاریفکەران دەڵێن:

سەروی دارستان، ڕێی کەوتـــــبووە ناو بازاڕەوە
قاشێک لە مانگ بوو، ئەو ڕۆژە هاتــــبووە خوارەوە
بەژن و بالا هێندە ڕێـــــــک و سەرنج ڕاکێش بوو
کەسـێک دیتبای، لەوێ دەسـت بەجێ بێ هۆش دەبوو

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کەنیزە کەوتە کەمەندی خۆشەویستی نوورەددینەوە و ڕووی لە دەڵاڵەکە کرد و گوتی: «گەلۆ ئەو لاوە لە نێو ئەو بازرگانانە داواکاری من نەبوو. نرخەکەی نەبردووەتە سەرێ؟» دەڵاڵ گوتی: «ئەو لاوە لاوەکییە و خەڵکی میسرە. باوکی یەکێک لە بازرگانە گەورەکانی میسرە. ئەو ماوەیەکە میوانی یەکێک لە هاوڕێکانی بابییەتی. لە بارەی نرخی تۆ هیچی نەگوت نەبەکەم و نەبەزۆر.» کچە کلکەوانە یاقووتە گرانبایییەکەی لە دەستی دەرهێنا و بە دەڵاڵەکەی گوت: «ئەمن بەرە لای ئەو لاوە جوانچاکە. ئەگەر ئەو من بکڕێ ئەوە ئەمن ئەو کلکەوانەیە لەبەر ئەو هەموو زەحمەتەی ئەوڕۆ بە بۆنەی منەوە تووشی بووی دەیدەم بە تۆ.»

دەڵاڵە خۆشحاڵ بوو. خێرا کەنیزەی بردە لای نوورەددین. کەنیزە نوقمی سیمای جوانی ئەو بوو. سەیری کرد لە جوانیدا بە جۆرێکە، وەک شاعیر دەڵێ:

کـــــــــــــوڕ نییە مانگە لە پەیـــــــکەری مرۆدا
خۆ ناگرن جــــــــــــوانان لە بەر تیـــــــری برۆیدا
قــــــــــــەد و بـــــاڵا، قەد و بـــــــاڵا نییە سـەلوە
هەر دڵەو بـــــــــــــە دوویەوەن کە ڕادەبرێ بەوێدا

دوای ئەوە کەنیزە چاوی لە نوورەددین کرد و پێ گوت: «گەورەم، ئەرێ تۆ ئەو خودایە ڕاستیم پێ بڵێ من جوانم؟» عەلی نوورەددین گوتی: «خانمی خانمان بۆ لە دونیادا کەس لە تۆ جوانترە؟» کەنیزە گوتی: «ئەی بۆ بازرگانەکان نرخی منیان بردە سەرێ و تۆ هیچت نەگوت؟ تۆ منت بە دڵ نەبوو؟» نوورەددین وەڵامی داوە: «ئەگەر من لە شاری خۆم بایەم. تەواوی سامانەکەم پێ دەدای.» کەنیزە گوتی: «کەنیزە گوتی: «گەورەم، ئەمن ناڵێم من بە نرخێکی گران بکڕە. هەر دەڵێم لەبەر من کەمێک بخە ســــەر نرخەکەم.» نوورەددین تریق بووە و بە دەڵاڵەکەی گوت: «نرخەکەی گەیشـــتە چەندە؟» دەڵاڵە وڵامی داوە: «نرخەکەی گەیشتە نۆسەد و پەنجا دینار، بەڵام پیتاکی سوڵتان لە سەر فرۆشیارە.» نوورەددین گوتی: «بە هەزار دینار بیدەن بە من، حەقدەستی خۆشت لە فرۆشیارەکە وەرگرە.»

کەنیزە چووە پێشـــێ و گوتی: «ئەمن خۆم بەو لاوە جوانچاکە فرۆشـــت.» یەکێک لە هەنتەشـــیان گوتی: «پیرۆزە.» یەکی دیکە گوتی: ئەوانە شـــایانی یەکن. دەنکێکی تر گوتی: گڵاوی کوڕی گڵاوە هەرکەس لە ســـــەری زیاد کا. نوورەددین واقی وڕما بوو کاتێک کە دەڵاڵ قازی و شایەدی هێنا و قەباڵەی کڕین و فرۆشیان نووسی. کەنیزەیان بە نوورەددین

سپارد و پێیان گوت خودا لێت مەبارەک کا. ئەتۆ بۆ ئەو چاکی و ئەویش شایانی تۆیە.

لەو جەنگەیەدا نوورەددین شـــەرمی لە بازرگان کرد و ئەو هەزار دینارەی بە ئەمانەت لە لای کابرای هەزوێلەفرۆشـــی دانابوو لێی وەرگرتەوە پارەکەی دا. کەنیزەشـــی بردەوە ماڵی کابرای بهەزوێلەفرۆش. کاتێک کەنیزە چووە ژووریّ ســـەیری کرد کەلوپەلی کۆن و فەرشی کۆن ڕاخراوە. ئیدی بە نوورەددینی گوت: «گەورەم، ئەوە بە لاتەوە ئەوەندەم بایخ نەبوو بمبەیەوە ماڵی ئەســـڵی خۆت.» نوورەددین گوتی: «گوڵە جوانەکەم، بە خودا ئەمن لێرەدا دەژیم و ئێرەش ئی کابرای هەزوێلەفرۆشـە. وەک یارمەتی پێی داوم. منیش وەک تۆ غەوارەم و کوڕی بازارگانێکی میسرم.»

کەنیزە گوتی: «گەورەم، ئێرە بۆ ئێمە تەواوە تا دەگەڕێینەوە بۆ شـارەکەی خۆت. بەڵام خاوەنم، هەستە بچووە کەمێک خواردن و شەراب و نوقڵ و شت بکڕە.» نوورەددین گوتی: «گوڵەکەم، ئەمن هەر ئەو هەزار دینارەم بوو، کە تۆم پێ کڕی ئیدی هیچی دیکەم نییە.» کەنیزە گوتی: «ئەتۆ لەو شـــارەدا ناســـیاوێکت هەیە پەنجا درەمی بە قەرز لێ وەرگری و بۆم بێنی هەتا پێت بڵێم چی لێ بکەی؟» نوورەددین وەڵامی داوە: «جگە لەو هەزوێلەفرۆشە کەســی دیکە شـک نابەم.» ئیدی هەسـتا چوو بۆ لای هەزوێلەفرۆش و سـڵاوی لێ کرد. کابرای هەزوێلەفرۆش سـڵاوەکەی ئەسـتاندەوە و گوتی: «ڕۆڵە ئەوڕۆ هەزار دینارت داوە بە چی؟» نوورەددین گوتی: «مامە کەنیزێکم کڕیوە.» هەزوێلەفرۆش گوتی: «ئەتۆ شـێتی هەزار دینارت داوە بە کەنیزێک؟» خۆزگە دەمزانی ئەو کەنیزە چۆنە؟» نوورەددین وەڵامی داوە: «مامە ئەو کچێکی فەرەنگی زادەیە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! هەزویلەفرۆشەکە پێی گوت: «ڕۆڵە گیان، باشترین فەرەنگیزادە لە شاری ئێمە سەد دینار دەکا. لە کڕینی ئەو کەنیزەدا فێڵیان لێ کردووی. ئەگەر خۆشت ویستووە هەر ئەوشەو لەگەڵی بە و کەیفی خۆتی لەگەڵ بکە و بەیانی بیبە بیفرۆشەوە. ئەو سەرێکەی دوو سەد دینار زەرەر دەکەی وا بزانە لێیان دزیوی.» نوورەددین گوتی: «مامە ڕاست دەفەرمووی بەڵام بۆخۆت دەزانی من لەو هەزار دینارە زیاتر هیچم شک نەدەبرد. ئەویشم ئەوە داوە بەو. ئێستا هیچم نییە بیخۆین. تەنانەت درەمێکیش. جارێ تۆ گەورەیی بفەرموو ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکە، پەنجا درەمێکم بە قەرز دەیە با خەرجی کەم تا سبەینێ.

سبەینێ کە ئەوم فرۆشتەوە پارەکەی تۆ دەدەمەوە. کابرا گوتی: «ڕۆڵە گیان ئەتۆ جارێ منداڵی و ئەو کەنیزەش جوانە ڕەنگە نەتوانی بیفرۆشی. ئەتۆ ماڵێکت نەماوە کە بۆی خەرج بکەی و ئەو پەنجا درەمەش تەواو دەبێ. دوای ئەوە دیسان لێم قەرز دەکەیەوە. دیسان تەواو دەبێ، دیسان بۆ سێیەم و چوارەم و هەتا دە جاران پارەم لێ قەرز دەکەی و خەرجی دەکەی. دوای ئەوە ئیدی ئەگەریش بێیەوە ئیدی من ئاوڕت لێ نادەمەوە.» دوای ئەوە کابرا پەنجا درەمی دایە.

نوورەددین درەمەکانی وەرگرت و هاتەوە بۆ لای کەنیزەکە. کەنیزەکە گوتی: «گەورەم، ئێستا بچووە بۆ بازاڕ لەو درەمانە بیست درەمی لێ بدە بە ئاورێشمی ڕەنگاوڕەنگ و سی درەمەکەی دیکەشی گۆشت و نان و شیرنی و میوە و شەراب و سەوزەی لێ بکڕە و بیهێنەوە. نوورەددین چوو بۆ بازاڕ و چۆنی پێ گوتبوو ئاوای کرد. کاتێک هاتەوە ماڵێ کەنیزە هەستا قۆلی لێ هەڵماڵی و خواردنێکی خۆشی ساز کرد و هێنای داینا. خواردنەکەیان خوارد. دوای ئەوە شەرابیان هێنا و خواردیانەوە. ئەوەندەیان خواردەوە هەتا نوورەددین مەست بوو خەوی لێ کەوت. ئینجا کچە هەستا لە بوخچەکەی خۆی هێندێک بزمار و شتی دەرهێنا و کارگەکەی دامەزراند و دەستی کرد بە کار. ئیدی بەردەوام کاری کرد هەتا زوننارێکی جوانی چنی. دەستێکی پێدا هێنا و جوان تاسولووسی کرد و پێچایەوە و لە ژێر سەرینەکەی خست. ئینجا جلەکانی داکەند و چوو لە پاڵ نوورەددین خزا و خۆی تێ هەڵسوو هەتا لە خەوی هەستاند. سەیری کرد کچێکی لە پەنایە لە نوقرە جوانتر و لە حەریر نەرمترە و لێوی ئاڵ و ڕوخساری جوانی بە جۆرێک بوو وەک شاعیر دەڵێ:

شلیکی دەمی شیلەی لێ ئەتکێ
کەسێ بیبینێ حەیای بۆ ئەچێ

کوڵمەی ســـوور و گەش ئەتروســـکێتەوە
بە گەرمی لەشـــی ئەبـــــــــــــووریتەوە

لە جێیەکی دیکەدا دەڵێ:

پێستی وەک حـــــــــــــەریر نەرم و نیانە
ڕەگ و دەمـــــــــــــاری ناوی عەیانە
خوێنی ســـوور و گەش لە ژێر پێســـتیدا
هاتوچۆ دەکا و دڵـــــــــــــــی پیاو دەبا

ئینجا نوورەددین ئامێزی پێدا گرت و پاش ماوەیەک هەڵگۆفین چێژی لێ بینی. ســەیری کرد ئەوە بوخچەیەکی نەکراوە و خونچەیەکی نەپشکووتووە وەک شاعیر دەڵێ:

بەهــارە و ژین لەگەڵ یــاردا، خەونێکە کەم کەس دەیبینێ
نۆبەرەی گوڵی ڕەنگاوڕەنگ، هەمووت لە بەر دەســـتیدا بێ
یارە جوانەکەم کەچینە و خـــــــــــــونچەیەکی نەکراوەیە
هەرکەسێک یاری وای هەبـــــــــــێ لە ژینیدا حەساوەیە

دوای ئەوە نوورەددین هەتا لای بەیانی هەر لەگەڵ کەنیزە خەریکی عەیش و کامەرانی بوون.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و حەفتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! نوورەددین لەگەڵ کەنیزە هەتا لای بەیانی هەر لە ئامێزی یەکتردا خەریکی کامڕەوایی بوون. وەک شاعیر دەڵێ:

شـــەو، ســـوڵتـانی هەردوو جیهـان بوون ئەوان
عەرز و ئاسـمان واقی وڕ مابـــــــــــوو لەوان
هەرچی خۆشـی و بەختەوەری و بـــــــــریا بوو
بـــــــــــــێ کەم و زۆر، بۆ ئەوان هەڵڕژابوو

کە تاو هەڵات و نوورەددین لە خەو هەســـتا، ســـەیری کرد ئەوە کەنیزە ئاوی هێناوە. ئیدی هەردووکیان خۆیان شـوت و نوێژیان کرد و خواردنیان خوارد. کچە دەسـتی برد لە بن سەرینەکە زوننارەکەی کە شەو چنیبووی دەر هێنا و دای بە نوورەددین و گوتی: «ئەو زوننارە بگرە.» نوورەددین گوتی: «ئەو زوننارەت لە کوێ بوو؟» ئەو وەڵامی داوە گوتی: «ئەوە هەر ئەو ئاوریشـــمانەی کە کڕیبووت. شـــەو چنیومە. ئێســـتا هەســـتە بڕۆ بازاڕی عەجەمان و بیدە بە دەلاڵ تا کڕیاری بۆ کۆ بکاتەوە. لە بیســـــت دیناری کەمتر نەدەی.» نوورەددین گوتی: «جوانکیلەکەم، چۆن شـتێکی کە بە بیسـت درەم کڕدرابێ، بیسـت دینار دەکا. ئەوە لە کاتێکدا ئەتۆ هەر شـەوێکیشـت کارت لە سـەر کردووە.؟» کەنیزە وڵامی داوە و گوتی: «گەورەم تۆ نرخەکەی نازانی بچۆ بیدە بە دەلاڵ. دەلاڵ بۆخۆی کڕیاری بۆ کۆ دەکاتەوە. ئەودەم نرخەکەیت بۆ دەردەکەوێ.»

نوورەددین زوننارەکەی لێ وەرگرت بردی بۆ بازاڕ و دای بە دەلاڵ و گوتی بیفرۆشـە. بۆخۆی لە سـەر سـەکۆی پێش دووکانێک دانیشت. دەلاڵ ماوەیەک ون بوو، هاتەوە گوتی: «کاکە، هەســـتە بیســـت دیناری نرخی زوننارەکەت وەرگرە.» کاتێک نوورەددین گوێی لە قسەی دەلاڵەکە بوو، سەری سووڕ ما. هەستا و بیست دینارەکەی وەرگرت و هەمووی دا بە حەریری جۆراجۆر هەتا کەنیزە بیکا بە زوننار. دوای ئەوە حەریرەکانی هێنا و هاتەوە ماڵێ. بە کەنیزەکەی گوت: «ئەوەی تەواوی بکە بە زوننار و زوننار چنینیش فێری منیش کە خۆ من لە تەواوی ژیانمدا پیشـــەی لەوە باشـــترم نەدیوە و هیچ کارێکیش لەوە پڕ داهاتتر نابێ. بە خودا ئەوە هەزار بەرابەر لە بازرگانی چاکترە. کەنیزە بە قســـەکەی ئەو پێکەنی و گوتی: «گەورەم، هەسـتە بچووە بۆ لای کاکی هەزوێلەفرۆش و بڵێ سـی درەمی دیکەشـــم بە قەرز دەیە لەگەڵ پەنجـا درەمەکەی دیکە ســـبەینێ دەتـدەمەوە.» لەڕێوە نوورەددین هەسـتا چوو بۆ لای هەزوێلەفرۆش و پێی گوت: «گوتی سـی درەمی دیکەشـم

دەیە سبەینێ هەشتا درەمت بۆ دێنمەوە .» کابرا سی درەمی دایە. نوورەددین لێی وەرگرت و چوو لە بازاڕ گۆشت و شەراب و شیرینی و سەوزەی لێ کڕی و گەڕاوە ماڵێ. کەنیزە ناوی مریەمی زونناریە بوو. مریەم لەڕێوە هەستا و خواردنێکی خۆشی ساز کرد. خوانی ڕاخست و شەرابی هێنا. خواردنەکەیان خوارد و دەستیان کرد بە شەراب خواردنەوە ئەوەندەیان شەراب خواردەوە هەتا مەست بوون. کچە سەری لە قۆزی و کەشخەیی نوورەددین سووڕ ما و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەمن چەند بەختەوەرم قۆزترین خورت یاری منە
لە هەموو بارێکەوە پڕ بە دڵی زاری منە

مریەم بەردەوام شەرابی بۆ تێکرد و دواندی هەتا نوورەددین مەست بوو بە لا داهات. مریەم خێرا هەستا و دەستی کرد بە زوننار چنین. کە زوننارەکەی تەواو کرد. ڕێکوپێکی کرد و پێچایەوە و لە بوخچەی خست. خۆی ڕووت کردەوە و چوو لە پاڵ نوورەددین تێخزا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مریەمی زوننارییە لە پاڵ نوورەددیندا خەوت و هەتا بەیانی رایانبوارد. دوای ئەوە هەستا و زوونناری دا بە نوورەددین و گوتی: «بیبە بۆ بازاڕ و بە بیست دینار بیفرۆشە.» نوورەددین زوونناری وەرگرت و چوو لە بازاڕ بە بیست دینار فرۆشتی و چوو بۆ لای کابرای هەزویلەفرۆش و هەشتا درەمەکەی داوە و زۆری سپاس کرد. کابرای هەزویلەفرۆش لێی پرسی: «رۆڵە کەنیزەکەت فرۆشتەوە یان نا؟» نوورەددین گوتی: «چۆن دەکرێ رووح لە جەستەم دەرهاوێم.»

دوای ئەوە باسی کارەکەی مریەمی بۆ کابرا گێڕاوە. کابرا زۆر خۆشحاڵ بوو گوتی: «رۆڵە بە خودا زۆرت خۆشحاڵ کردم. ئەمن لەبەر ئەوەی باوکتم زۆر خۆش دەوێ پێم خۆشە کاروباری تۆ جوان رێکەوێ.» دوای ئەوە نوورەددین ماڵاوایی لە هەزویلەفرۆشەکە کرد و چوو گۆشت و میوە و سەوزی و شەراب و شیرینی کڕی و وەک رۆژان گەڕاوە لای مەریەم.

کورتی کەینەوە، نوورەددین و مریەم زوننار بەردەوام لە خێر و خۆشی و کەیف و شادیدا بوون. مریەم هەموو شەوێ زوونناریکی دەچنی و نوورەددین بەیانی دەچوو دەیفرۆشت بە بیست دینار. چەند درەمێکی لێ خەرج دەکرد و ئەوی دیکەی دەدا بە مریەم. هەڵی گرێ. ساڵێک ئاوا تێپەڕی. مریەم بە نوورەددینی گوت: «گەورەم، سۆزی کە زوونارەکەت فرۆشت ئاوریشمی حەوت ڕەنگ بکڕە با باڵاپۆشێکت بۆ بچنم بازرگان هیچ، هیچ شازادەیەکیش شتی وای لە بەردا نەبێ. نوورەددین چوو بۆ بازاڕ و حەریری جۆراوجۆری کڕی هێنایەوە بۆ مریەم. مریەم زوننار بە حەوتوویەک باڵاپۆشەکەی تەواو کرد و دای بە نوورەددین. نوورەددین بە شانیدا دا و چوو بۆ بازاڕ. خەڵک پۆل پۆل و دەستە دەستە دەهاتن بۆ سەیری رێکوپێکی و قوزی حەسەن و جوانی باڵاپۆشەکەی و دەوریان دەدا. نوورەددین هەر وا ژیانی تێپەڕ دەکرد، هەتا وا بوو شەوێک نوورەددین خەوتبوو. کە وە خەبەر هات سەیری کرد مریەم دەگری و لە بەر خۆیەوە ئاوای دەگوت:

ئای لە من سەر شینی بابان وێرانێ بۆ وێ هەواڵێ
ئەو شەو خەونێکم دیوە وێران دەکەن لەمە ماڵێ
لەمە حاڵێ، دەبێ رووبکەین، دە دەرکی یەزدان
بمانپارێزێ لە شەڕی ناحەز و بەدخوازان

نوورەددین گوتی: «خانمۆڵەکەم بۆ دەگری؟» مریەم وەڵامی داوە: «لە ترسی جیا

بوونەوە دەگریم هەر لە خۆڕا دڵم خەبەری داوە جیـا دەبینەوە!» نوورەددین گوتی: «خـانمەکەم جا کێ ئێمە لێک جوێ دەکاتەوە؟ من دنیـام بە تۆوە دەوێ.» مریەم گوتی: «قســـەم بە خودا ئەمن هەزار ئەوەندەم تۆ خۆش دەوێ کە تۆ منت خۆش دەوێ.» بەڵام هەر کەس کەمترخەم بێ، کێشــە و کوێرەوەری دەرد و مەینەتی دێتە رێ و لە کۆتاییشــدا تووشی پەشیمانی دەبێ. شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

وریا بن ڕۆژگار ســـــــــــــەودایە دەکا
کـــــــــــــــێچی ئاڵوگۆڕ بە گایەک دەکا
نرخـــــــــــــــــــی بەختەوەری زۆر گرانە
لە دەســــتــــی نەدەن ئەو زێـــڕە جـــوانە
لەگەڵ ئــی نــاپــاک هەڵســــوکەوت مەکەن
حاشـا لە خێر و بێڕیـــــــــــــــــشـی بکەن

دوای ئەوە گوتی: «نوورەددین گەورەم، ئەگەر ناتهەوێ لە من جیا بییەوە ئەوە خۆ لە پیاوێکی فەرەنگی مەدە، کە چاوی ڕاستی کوێرە و لاقیشـی شـەلە. ئەمن لە خەودا دیتم کە هـاتبووە ئەم شــــارە و پێم وا بێ بەس لەبەر منیش هـاتبوو. نوورەددین گوتی: «خۆری جوانـان، بێت و من چـاوم پێی بکەوێ دەیکوژم.» مریەم گوتی: «گەورەم، مەیکووژە و قسـەشـی لەگەڵ مەکە. سـەودای لەگەڵ مەکە. بەشـکوو خودای گەورە لە شـەڕی ئەومان بپارێزێ.» کە ڕۆژ بووەوە نوورەددین زوننـاری بردە بازاڕ و لە ســـەر ســـەکۆی پێش دووکانێک دانیشــت. دەســتی کرد بە قســەکردن لەگەڵ کوڕە بازرگانەکان. لەو جەنگەیەدا پیاوێکی فەرەنگی لەگەڵ حەوت کەســـی فەرەنگی دیکە هـاتنە نـاو بازاڕەکەوە. چاوی بە نوورەددین کەوت و دیتی کە بالاپۆشـــێکی ناوازەی لە بەردایە. چووە پێش و لە پەنایان ڕاوەســتا. ســووچێکی بالاپۆشــەکەی گرت و ماوەیەک تێی ڕاما و ئەوبەرەوبەری پێ کرد. عەلی نوورەددین کە چـاوی بەو کـابرا فەرەنگییە کەوت، ســـەیری کرد تەواوی ئەو نێو نیشـــانەکانەی کە مریەم گوتبووی لەودا هەبوو. ئیدی نوورەددن لێی توورە بوو. فەرەنگی گوتی: «بۆ لێم توورە دەبی شـتێکم لێ دزیوی؟ هیچم لێ هەڵگرتووی؟» نوورەددین گوتی: «لێم دوور کەوە گلاو.» فەرەنگی گوتی: «موسوڵمان تۆ ئەو دینەت پێم بڵێ ئەو بالا پۆشە کێ بۆی چنیوی؟» نوورەددین گوتی: «ئەوە کاری دایکمە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و هەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک لە وەڵامی فەرەنگییەکەدا نوورەددین گوتی ئەوە کاری دایکمە. فەرەنگی پرسی: «نرخێکی باشت دەمێ، پێم دەفرۆشی؟» نوورەددین گوتی: «ئەوەی نە بە تۆ دەفرۆشـم و نە بە یەکی دیکە. چونکە ئەوە بۆ من چێ کراوە.» فەرەنگی گوتی: «پێم بفرۆشـە هەر ئێسـتا پێنسـەد دینارت دەدەمێ با ئەو کەسـەی ئەوەی بۆ تۆ چنیوە با یەکی دیکە بۆ تۆ بچنێ.» نوورەددین گوتی: «ئەمن قەت ئەوەی نافرۆشـم. باڵاپۆشـی وەک ئەوە نەک لەو بازاڕە لەو شارەشدا نییە.» فەرەگی گوتی: «کاکە بە شەشسەد دیناری زێڕی بێ خەوش دەفرۆشـی یان نا؟» ئیدی هەر ئاوا بەردەوام نرخەکەی بردە سـەرێ هەتا گەیشـتە نۆسـەد دینار. نوورەددین گوتی: «خودای تەعالا منی موحتاجی فرۆشتی نەکردووە. ئەمن بە دوو هەزار دیناریشـی نافرۆشـم.» فەرەنگییەکەش بەردەوام زیادی دەکرد و دەیویسـت تەماعی وە بەر نێ. گەیـاندێ هەزار دینـار. تـاقمێک لە بـازرگـانەکـان گوتیـان: «ئەگەر نوورەددینیش نەیفرۆشـێ ئەوە ئێمە پێمان فرۆشـتی. پارەکەی دەیە.» نووردین گوتی: «قەتی نافرۆشم» یەکێک لە بازرگانەکان گوتی: «ڕۆڵە، ئەو باڵاپۆشە ئەگەر زۆر زۆر بێنێ سـەد دینار دێنێ. ئەو فەرەنگییە هەزار دیناری داوێ بۆ نایدەیەی. نۆسـەد دینار لە خێری بـا ئەوەی بۆی چنیوی یەکی دیکەت بۆ بچنێ. ئەو دەم هەزار دینـارت لەو دوژمنی دینە وەگیر دەکەوێ.»

نوورەددین لە ڕووی بازرگانەکاندا ما و باڵاپۆشـەکەی بە هەزار دینار فرۆشـت و پـارەکەی وەرگرت. دوای ئەوە ویسـتی بچێتەوە بۆ لای کەنیزەکەی و شـتەکەی بۆ بگێڕێتەوە. فەرەنگی گوتی: «هەنتەشـیان مەهێڵن نوورەددین بڕوا چونکە ئەوشـەو ئێوە و نوورەددین میوانی منن. جا شـەرابی ڕۆمی حەوت ساڵەم هەیە. لەگەڵ میوەی جۆراجۆر و شـیرینی و سـەوزی چاک و جوان. ئەوشـەو هەمووتان بە هاتنتان سـەرفەرازم کەن. بازرگانەکان گوتیان: «کاک نوورەددین هەر ئەوشەو لەگەڵمان وەرە با کەمێک بەیەکەوە لە ماڵی ئەو فەرەنگییە دڵاوایە دانیشـین و قسـە و باس بکەین. دوای ئەوە سـوێندیان دا و نەیانهێشـت بڕواتەوە ماڵێ. وا بوو هەسـتان و دووکانیان گاڵە دا و نوورەددینیان لەگەڵ خۆیان برد و لەگەڵ کابرای فەرەنگی ڕۆیشـتن. هەتا گەیشـتنە ماڵێکی گەورە و خۆش و ڕازاوە بە نەخش و نیگار. فەرەنگی لە هەیوانەکە سـفرەیەکی پڕ لە نەخش و نیگاری بۆ ڕاخسـتن کە کەس نەیدەزانی کاری کوێ بوو. دەفری گرانبایی چینی و بلووری پڕ لە وێنە و نەققاشـی جۆراوجۆر لە سـەر سـفرەکە ڕیز کرد. شـەرابی کۆنی ڕۆمیان هێنا دایان نا. فەرمانی دا، مەڕێکی قەڵەویان کوشتەوە. ئینجا ئاوریان کردەوە و لەو گۆشتەیان برژاند و دەرخواردی بازرگانەکان و عەلی نوورەددینیان دا. بە دوای ئەودا شـەرابیان بۆ تێ کردن.

ئەوەندەیان بۆ تێ کردن تا نوورەددین مەست بوو.

کاتێک فەڕەنگی زانی کە نوورەددین تەواو مەســـت بووە و هۆشـــی بە لای خۆیەوە نەماوە، پێی گوت: «نوورەددین ئەوشـەو ئێمەت سـەربەرز کرد. هەزار جار ئافەرین بۆ تۆ. بەوجۆرە سـەری قسـەی لەگەڵ کردەوە و لێی چووە پێشێ و لە پەنای دانیشت. ماوەیەکی باش بە قسەکردن ئاوەزی سـەرقاڵ کرد. ئینجا لێی پرسی: «کاک نوورەددین، ئەو کەنیزەی پارەکە لە لای ئەو بازرگانانە بە هەزار دینار کڕیت، بە پێنج هەزار دینار نایفرۆشـــی. تا چوار هەزار دینـار قـازانج بکەی؟» نوورەددین وەڵامی داوە: «قەت قەت.» بە بەردەوە فەڕەنگییەکە هەر بادەشـی دەدایە و نرخەکەی بۆ دەبردە سـەرێ بۆ ئەوەی وەبەر تەماعی خا. هەتا گەیاندییە دەهەزار دینار. نوورەددین مەمنا زۆر مەســـت بوو لە لای بازرگانەکان گوتی: «زۆر باشـە ئەوە فرۆشـتم. دەهەزار دینای زێڕم دەیە.» فەڕەنگی کەیفی سـاز بوو. بازرگانەکانی بە شایەد گرت و ئەو شەوەیان بە عەیش و نۆش و کەیف خۆشی بردە سەر. کە بوو بە ڕۆژ فەڕەنگی بانگی کرد بە کاردار و شتەکەی گوت. پارەکەی بۆ بێنن. فەڕەنگی دەهەزار دیناری زێڕی ســـووڕ بۆ بژارد و گوتی: «نوورەددین ئەو زێڕە بگرە ئەوە. نرخی کەنیزەکەت کە دوێنێ شـەو لە حوزووری ئەو بازرگانانە پێت فرۆشـتم. نوورەددین گوتی: «گلاو ئەمن هیچم نەفرۆشـــتووە درۆ دەکەی. ئەمن کەنیزم نییە.» فەڕەنگی گوتی: «ئەتۆ ئەوت فرۆشــــت و ئەوە ئەو بازرگانانەش دەزانن و شـــایەدن.» بازرگانەکان گوتیان: «نوورەددین ئێمە شـــایەدین کە تۆ کەنیزەکەت بە دەهەزار دینار فرۆشـــت. هەســـتە و پارەکەی وەرگرە. خودا کەنیزی لەوە باشترت بە قسمەت دەکا. نوورەددین تۆ ئەو کەنیزەت بە هەزار دینار کڕی و ئەوە ســـاڵ و نیوێکە هەموو شـــەوی لەگەڵی جووت دەبی. هەر شـەوەی زوننارێکیشـی بۆ دەچنی کە دەتفرۆشـت بە بیسـت دینار. ئێسـتا داوتە بە دەهەزار دینار و نۆهەزار دیناریش قازانج دەکەی ئیدی چیت دەوێ. ئەگەر خۆشـیشـت دەوێ ئەوە لەو دەمەوە لەگەڵی بەسـە ئیدی. ئێسـتا پارەکەت وەرگرە و کەنیزێکی لەویش چاکتر بکڕە. یان کچێک لە کچە بازرگانەکان بخوازە و مارەی کە. نیوەی ئەو پارەیە بدە بە مارەیی ئەو ژنەت و نیوەکەی دیکەش بکە بە ســـەرمایە و بـازرگانی پێوە بکە. ئیدی بەردەوام لەو قســـانەیان بە گوێی نوورەددیندا دەدا، تا ئاخری نوورەددین دەهەزار دینارەکەی وەرگرت. لە ڕێوە فەڕەنگی قازی و شایەدی هێنا و بەڵگەی فرۆشیان نووسی. ئەوەش نوورەددین.

مریەم زوننارێش ئەو شـــەوە بەدەم چاوەڕوانییەوە هەتا بەیانی گریا. کاتێک کابرای هەزوێلەفرۆش گوێی لە دەنگی گریانی ئەو بوو، ژنەکەی ناردە لای. ژنی بەهەزوێلەفرۆشەکە چووە لای و هۆی گریانەکەی لێ پرســی. مریەم گوتی: «دایە، ئەوە نیوەشـەوە و هێشـتا خاوەنەم نەهاتووەتەوە. ئەمن لەوە دەترسم کەسێک بە فێڵ منی لێ بکڕێ.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی هەشتسەد و حەفتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ژنی هەزویلەفرۆشەکە پێی گوت: «ئەگەر ئەو ماڵە پڕ کەن لە زێڕ، نوورەددین ئەوەندەی تۆ خۆش دەوێ قەتت نافرۆشێ. رەنگە هێندێک کەس لە میسرەوە هاتبن و جارێ نەیانهێشتبێ بێتەوە. ئیشەڵڵا بەیانی دێتەوە بۆ لات. ئەتۆ جارێ ئەوشەو خۆت نارەحەت مەکە و ئەوە منیش لە لای تۆ دەخەوم.

کورتی کەینەوە، ژنی هەزویلەفرۆش هەر قسەی لەگەڵ مریەم کرد و سەرقاڵی کرد و خافڵاندی هەتا رۆژ بووەوە. مریەم چاوی بە خاوەنی کەوت کە لە سەری کۆڵانەکەوە وەدەر کەوت. پیاوە فەرەنگییەکەی ناو خەونەکەش لەگەڵ کۆمەڵێک بازرگان بە دوایدا دەهاتن. مریەم کە ئەوانی دی گیانی وە لەرزین کەوت و رەنگی زەرد هەڵگەڕا. ژنی هەزویلەفرۆش کە ئاوای دیت لێی پرسی: «خانم گیان، ئەوە بۆ دەلەرزی و رەنگت زەرد هەڵگەڕاوە. مریەم وەڵامی داوە و گوتی: «بە خودا دڵم خەبەری دابوو جیا دەبینەوە.» دوای ئەوە ئاخێکی هەڵکێشا و رۆندکی رژانە خوار و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

رۆژم بێ نووورەددین قەت روونـاک نابێ
بێ ئەو چۆن، پێم هێزی رێ رۆینی دەبێ
ئەو گیانمە و ژیان بێ گیان مەحاڵە
بە زیاد نەبێ ئەو ژینە بێ ئەو تاڵە

دوای ئەوە بە خێزانی هەزویلەفرۆشی گوت: «خانمەکەم ئەمن پێم نەگوتی بە پیلانێک منیان لە نوورەددین کڕیوە، ئێستا گومانم لەوەدا نییە، منی بەو فەرەنگییە فرۆشتووە. ئەوە ئەمن پێم گوت خۆ لەو فەرەنگییە نەدەی. بەڵام هیچ لەگەڵ چارەنووس ناکرێ. ئەوان لەو قسانەدا بوون کە نوورەددین وەژوور کەوت. کەنیزەکە لێی ورد بووەوە، سەیری کرد. رەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و دەلەرزێ. لێی پرسی: « نوورەددین ئەوە منت فرۆشتووە؟» نوورەددین دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

شەراب ئەوشەو بە بای دادا ژینی خۆشی بەهاریم
بوو بە تۆفانێکی دڵرەق وەراندی گوڵی شادیم

دوای ئەوە نوورەددین داوای لێبووردنی لێ کرد و گوتی: «تازە وای لێ هات، بە خودا ئەو خەڵکە فێڵیان لێ کردم. بەڵام هیوادارم ئەوە کەسەی ئێمەی لێک کردەوە، پێکیشمان

شـاد کاتەوە.» مریەم گوتی: «ئەخە ئەمن پێم نەگوتی خۆ لەو فەڕەنگییە مەدە. دوای ئەوە نوورەددینی لە باوەش گرت. تەوێڵی ماچ کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

مـن لە هەر کـوێ بـم، هەر بە هەوای تـۆ دەژیـم
دڵـــــــــم لە لاتە، من بەبـــــــــێ دڵ چۆن بژیم

ئەوان لە باوەشـــی یەکتردا بوون کە فەڕەنگی هاتە ژووری و ویســـتی قاچی خاتوو مریەم ماچ بکا. مریەم زللەیەکی لە لاڕوومەتی دا و گوتی: «گڵاو لێم دوور کەوە. ئەوەندە بە دوامەوە بووی، هەتا فێڵت لە خـاوەنم کرد. فەڕەنگی داوای لێبووردنی کرد و گوتی: «خانم، تاوانی من نەبوو، خاوەنت نوورەددین بە مەیلی خۆی تۆی بە من فرۆشت. بە دینی مەسیح ئەگەر تۆی خۆش ویستبا نەیدەفرۆشتی. وەک شاعیر دەڵێ:

ئەڤیندار ئەڤـــــــــــــــــــیندار بێ، فێڵی لێ ناکرێ
ئەگەر بـێـت و جەســـــتەی لەت لەت کەن بە خەنـجەرێ

ئەو کەنیزە کچی پاشای فەڕەنگیان بووە. هاتنەدەری لە شاری خۆیان و بەجێ هێشتنی ماڵی بەسـەرهاتێکی سـەیری هەیە کە ئێمە ئەوتان بە شـێنەیی بۆ دەگێڕینەوە با خوێنەران و بیسەرانی کەیف بکەن.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتسەد و حەفتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مریەم زوننار کچی پاشای فەرەنگ بوو. لە بەر دەستی دایک و بابی خۆی بە ڕێز و حورمەتەوە گەورە کرا و بار هاتبوو. ڕەوانبێژی و نووسین و زانستی ژمێریاری و زانستی ئەستێرەناسی و سوارکاری زۆر باش فێر ببوو. هەموو پیشەیەکی دەستی وەک دروومان و ڕستن و چنین و زوننار و تێهەڵکێشانی زێڕ و لەو جۆرە کارانەدا ئەوەندە شارەزا بوو، کەس تای نەدەکرد. لە جوانی و دەلالی و شەنگوشۆخیدا یەکە ئافرەتی دەورانی خۆی بوو. پادشای دورگەکان هەموویان خوازبێنیان کردبوو. بەڵام باوکی ئەوەندەی خۆش دەویست نەیدەتوانی قایل بێ، لێی دوور کەوێتەوە. هەر بۆیە نەیدەدا بە کەس. ئەو پادشایە جگە لەو نە نێرینە و نەمێوینە منداڵی نەبوو.[1] ڕێکەوت وا بوو لەو سالانەدا ئەو کچە نەخۆش کەوت و کەوتە ئاویکەدانەوە. باوکی نەزری کرد کە ئەگەر لەو نەخۆشییە هەستێتەوە فلانە دێر لە فلانە دورگە زیارت بکا. ئەو دێرە لە لای ئەوان پلەوپایەیەکی تایبەتی هەبوو. خەڵک نەزر و شتیان بۆ دەکرد و داوای خێر و بێریان لێ دەکرد.

کاتێک مریەم لە نەخۆشییەکەی هەستاوە و چاک بووەوە، ویستی بەڵێنییەکەی بەرێتە سەر. باوکی مەریەمی بە کەشتی نارد بۆ دێرەکە هێندێک لە کچی گەورەکانی دەوڵەتیشی لەگەڵ نارد و خزمەتکاریشی لەگەڵ خستن. کاتێک کەشتییەکە لە دێرەکە نیزیک بووەوە، کەشتییەک لە کەشتی موسوڵمانەکان پەیدا بوو، تەواوی ئەوانەی لەگەڵ مریەم لەو کەشتییەدا بوون، بە کەلوپەلەوە هەمووی بە تالان بردن و بردنی لە شاری قیروان فرۆشتنی. ڕێکەوت وا بوو، مریەم تووشی بوو بە تووش عەجەمێکی بێ هەوەسەوە کە توانایی نیزیکی لەگەڵ ژنان نەبوو. ئەوی کڕی بەس بۆ خزمەت کردنی خۆی. وا بوو عەجەمە نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی زۆری خایاند. مریەم ئەوەندەی بۆی کرا، خزمەتی کرد، هەتا عەجەمە چاک بووەوە. عەجەمە هەمیشە بیری لەوە دەکردەوە کە بە جۆرێک وەڵامی چاکەی مریەم بداتەوە. ڕۆژێک بە مریەمی گوت: «داوایەکم لێ بکە.» مریەم گوتی: «تەنیا داوام ئەوەیە کاتێک منت فرۆشت بە کەسێکم نەفرۆشی کە بۆخۆم پێم خۆش نەبێ. بە کەسێکم بفرۆشە بۆخۆم ڕازی بم.» عەجەمە بەڵێنی پێدا بە گوێی بکا. دوای ئەوە عەجەمە داوای لێ کرد، موسوڵمان بێ و مریەمیش موسوڵمان بوو. فێری عیبادەت و داب و دەستووری موسوڵمانەتی بوو. قورئان و حەدیسی پێغەمبەری لە بەر کرد. کاتێک

---

[1]. لەو دەقەدا ئاماژە بەوە کراوە کە ئەوە لە وەرگێڕنەکەیدا هەڵە کراوە دەنا لە دەقە ئەسڵییەکەیدا نووسراوە: «کچی دیکەی نەبووە دەنا کوڕی زۆر بووە.

هێنای بۆ شاری ئەسکەندەرییە هەروەک گوتمان ئەوی بە عەلی نوورەددین فرۆشت. هۆی هاتنەدەری لە شاری خۆی ئەوە بوو.

بەڵام باوکی، پادشـــای فەرەنگ کاتێک ئەو هەواڵەی پێگەیشــت، دونیای لێ تاریک بوو. پاپۆرگەلێکی وەرێ خســـت و ســـەرهەنگ و ئازا و بەجەرگگەلێکی وە دوا خســـت. ئەوان تەواوی دروگەگەلی موســـوڵمانانی لێ گەڕان بەڵام بێ ئاکام بوو. هیچ هەواڵێکی مریەمیان وەگیر نەکەوت و بە هیوابڕاوی گەڕانەوە. بـاوکی زۆری خەمی مریەم بوو، هەر ئەو فەرەنگییە کوێرە کە گەورەترین وەزیری بوو، لە فێڵ و کەڵکبازیدا بێ هاوتا بوو، ڕایسپارد وە دوای مریەم بکەوێ و تەواوی شـــارەکانی موســـوڵمانانی لێ بگەڕێ. ئەگەر بە یەک کەشـــتی زێڕیش بێ بیکڕێ و بیهێنێتەوە. ئەو گڵاوە تەواوی شـــار و دورگەکانی لێ گەڕا، هەتا گەیشتە ئەسکەندەرییە. بە پرسیار بە شوێنەکەی زانی کە لە لای نوورەددینە. ئیدی بە فێڵ هەر وەکوو باســـمان کرد، مریەمی لە نوورەددین کڕی. کاتێک مریەم کەوتە گیر وەزیرەکەی باوکی دەستی کرد بە گریان. وەزیر گوتی: «خانم مەگری. هەستە بە بڕۆینەوە لای باوکت لەوێ بە ســـەربەرزی و ئازادی لە نێو خزم و کەس و کۆیلە و کەنیزی خۆتدا بژی. با لە دەست داخ و دەردی غەریبی و غەوارەیی ڕزگارت بێ. ئەمنیش ئەو ئەو هەموو دەربەدەری و ســـەرگەردانییە لەبەر تۆ دەکێشـــم بەســـە ئیدی. ئەوە ســـاڵ و نیوێکە لە تۆ دەگەڕێم.

دوای ئەوە وەزیری پاشـــای فەرەنگیان قاچی ماچ کرد و زۆری لەبەر پاڕاوە و لاڵاوە. بەڵام ئەو زیاتر تووڕە دەبوو. گوتی: «گڵاو خودا بە ئاواتت نەگەیەنێ.» ئەوجار پیاوەکانی وەزیر یەســـترێکی زینکراو بە زینی ڕازاوە بە زێڕ و جەواهێراتیان هێنا و خاتوو مریەمیان سوار کرد. سایەوانێکی دیبا کە ئەستوونەکانی لە زێڕ بوو بۆ قایم کرد. لەولا و لەولاوەیەوە ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە دەریا. ئەویان سـواری لۆتکەیەک کرد و گەیاندیانە پاپۆرێک. وەیز یەکچاو و شەل فەرمانی بە پاپۆرڤانەکان کرد، ببزوون. لەرێوە پاپۆرڤانەکان چارۆکەکانیان هەڵدا و لەنگەریان هەڵکێشـا و پاپۆریان ئاژووت. مریەم چاوی هەر لە ئەسـکەندەرییە بوو، هەتا ئەسکەندەرییە لە چاو ون بوو. ئەوجار بە کوڵ دەستی کرد بە گریان.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتەد و هەشتایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مریەم ڕۆندکی داباراند و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

چۆن دەتوانێ ڕۆژگار، بمبا و لە بیریم باتەوە
چۆن دڵی دێ ئەو دڵەی من لەو دڵەم دوور خاتەوە
بێ وەفایە ڕۆژگار شک نابا هیچ ڕەحم و بەزە
بێتوو بەزەی هەبایە نەدەبوو بە قاتڵی بزە

ئیدی کاری مریەم بوو بە شین و گریان و چەمەرە خوێندنەوە. سەرهەنگەکان دڵخۆشیان دەداوە و ئارامیان دەکردەوە. گوێی بە قسەی ئەوان نەدەبزووت و ئارام و قەراری نەبوو. بەدەم گریانەوە ئەو شێعری دەگوت:

تازە بەشی من هەر گریان و شین و ڕۆیە
کوڕی ئاوا لە کوێ هەیە، نییە درۆیە
دەبێ بپاڕێمەوە و بە خەون بیبینم
بە خەونیش بیبنم باشە مەرگی نەبینم
دڵی من چۆن ڕازی دەبێ بە خەون و خەیاڵ
دەڕۆم هەر دەیبینمە، گەر فرێبێتم بە باڵ

ئەوە حاڵی خاتوو مریەم بوو...

عەلی نوورەددین میسری، دوای ڕۆیشتنی مریەم دونیای لێ تەنگ و تاریک بوو. سەبر و تاقەتی نەما و گەڕاوە بۆ ماڵێ. ماڵێ لە بەر چاو تاریک بوو. جلکەکانی مریەمی هەڵدەگرت و بە باوەشییەوە دەگوشین. دەگریا و ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

بۆنی کراسەکەت دێ، نیمە چاوی بینینی
چۆن دەکرێ کراس، تۆی تێدا نەبی، بیبینی
ئەڤینت لە دڵمدا وێنەی تۆی چێ کردووە
هەر جارەی کراسێکی بە بەژنی ئەو گرتووە

دوای ئەوە هەستا و بە دەوری ماڵەکەدا گەڕا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

کۆترەکەم هەڵفڕی و ڕۆیشـــت هێلانەکەی چۆڵ کردووە
خۆشـــی و شـــادی ئەو هێلانەی هەمووی لەگەڵ خۆی بردووە

پاشان هەستا و دەرکی ماڵێی گاڵە دا و بەرەو دەریا ڕۆیشت. چاوی لە شوێنی ئەو کەشتییە دەکرد کە مریەمی لێ سوار بوو. ئاخێکی هەڵکێشا و فرمێسکەکانی هاتنە خوارێ و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ڕۆیشـــتی یار ئۆغرت خێر بێ، ســـەفەرەکەت ســـەرەوخێر بێ
منیش لێرە ماومەتەوە، دەســـت هەڵگر نیم پێت وا نەبێ
من ناتوانم بمێنمەوە هەر دێم بۆ لات خۆشەویـــستم
هەڵخەڵەتاوم گیانەکەم ئەو کارە نەبوو من ویـــستم

نوورەددین لەو جەنگەیەدا دەگریا یەک بە خۆی هاواری دەکرد: مریەم، مریەم. کابرایەک لە پاپۆڕێک هاتە دەرێ. چاوی بە نوورەددین کەوت دەگریا و ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

هەم بـــوو کەنـــیـــزێـــکـــی جـــوان
تـــا بڵێی دڵپـــاک، دڵـــســـۆڤـــان
ژنێک بوو فـــریشتە ئاسا
وا بـــوو شـــەیـتـانـێـک لـێـم ڕاســـا
بە فـــرت و فـــێـــڵ کەری کـــردم
لە ژیـــن و ژیانی کردم
فریـــشتەکەی منی ڕفاند
خەنـــجەری لە دڵـــی مـــن چەقـــانـــد

کابرا لێی پرســـی: «ڕۆڵە، لەوە دەچێ بۆ ئەو کچە بگری کە دوێنێـــەو لەگەڵ ئەو فەرەنگیانە ڕۆیشـــت. نوورەددین کە ئەو قســـەیەی بیســـت دڵی لە بوورەوە هات و بە لادا هات، تا دەرنگانێک وە هۆش خۆی نەهاتەوە. کە هاتەوە ســـەر خۆی زۆر گریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

مامە ئـــەگەر تۆ ڕێـــشاندەرم بی
لەو چـــاڵە ڕەشـــە ڕزگـارکەرم بی
خـودای بـانـی ســـەر ئـاگـای لـێـت دەبـێ
لە گـــیروگرفـت ڕزگـارت دەبێ

کابرا که سەیری نوورەددینی کرد. دیتی گەنجێکی ئاوا ڕێکوپێک و جوانچا و قسەزان و زمانپاراوە، بەزەیی پێیدا هات و زۆری خەم بوو. ئەو کابرایە سـەرۆکی پاپۆڕێک بوو کە دەچوو بۆ شارەکەی بابی مریەم. ئەو پاپۆڕە سەد بازرگانی موسوڵمانی تێدا بوو. کابرا بە نوورەددینی گوت: «سەبرت هەبێ، ئەوەی لە سەر سەبرانە لە سەر خێرانە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک سەرۆک بە نوورەددینی گوت تۆ دەگەیەنمە مریەم. نوورەددین پرسی: «کەی دەکەونە ڕێ؟» کابرا گوتی: «سێ ڕۆژی ماوە وەڕێ کەوین.» نوورەددین بە قسەکەی سەرۆک زۆر خۆشحاڵ بوو. زۆری سپاس کرد. دوای ئەوە یادی دەورانی پێکەوەبوونی کرد و گریا و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ناکرێ ئەمن و ئەتۆ لە یەکتر دابڕێین
لەو هەموو بیرەوەرییە خۆشە هەڵبڕێین
کەیف و خۆشی و بەختەوەری نێوانی ئێمە
هەر وەک خونچە دەپشکووتن لە ژیانی ئێمە

دوای ئەوە چوو بۆ بازاڕ و تۆشە و پێداویستی سەفەرەکەی کڕی گەڕاوە لای پاپۆڕەکە. کە سێ ڕۆژە تەواو بوو. پاپۆڕڤان چارۆکەی هەڵدا و کەشتی لێخوڕی. پەنجا و یەک ڕۆژ بوو، بە ڕێوە بوون، کە چەتەی دەریایی دەوریان دان و پاپۆڕەکەیان تالان کرد و خەڵکەکەشیان بە دیل گرت و بردیانن بۆ شاری فەڕەنگیان بۆ لای پاشاکەیان. پاشا فەرمانی دا بیانخەنە بەندیخانەوە. نوورەددینیشیان لەگەڵ بوو. کاتێک ویستیان بیانبەنە بەندیخانە ئەو کەشتییەی کە مریەم و وەزیرە کوێرەی تێدا بوو گەیشتێ. وەزیر چوو بۆ لای پاشا و مزگێنی هێنانەوەی کچەکەی، مریەم زوونناری دایە. پاشا فەرمانی دا، شار برازێننەوە. بۆخۆشی لەگەڵ تەواوی لەشکرەکەی چوو بۆ قەراخ دەریا بۆ پێشوازی مریەمی کچی.

کاتێک مریەم لە کەشتییەکە هاتە دەرێ، پاشا لە ئامێزی گرت. شازادە مریەم سڵاوی لێ کرد. ئەسپێکیان بۆ شازادە هێنا. شازادە سوار بوو. هاتن هەتا گەیشتنە کۆشک. دایکی شازادە بە پیلییەوە چوو لە باوەشی گرت. شازادە سڵاوی لێ کرد. دایکی هەواڵی پرسی و گوتی: «کچەکەم، کەچینی یان نا؟» شازادە گوتی: «دایە، ئافرەتێک دەست بە دەست بفرۆشرێ چۆن هەر کەچین دەبێ؟» کاتێک دایکی ئەو قسەیەی بیست دونیای لە بەر چاو تاریک بوو. چوو بۆ پاشای گێڕاوە. پاشا زۆری لە بەر گران بوو، شتەکەی لەگەڵ گەورە بەرپرسانی وڵات و قەشەکان باس کرد. ئەوانیش گوتیان: «پاشا تازە ئەوە لەگەڵ موسوڵمانان تێکەڵ بووە خاوێن نابێتەوە. مەگەر ئەوەی کە سەد کەس لە موسوڵمانان بکوژێ.» لەو جەنگەیەدا پاشا داوای کرد، دیلەکان بێنن. عەلی نوورەددین یەکێک لەوان بوو. پاشا فەرمانی دا بیان کوژن.

یەکەم کەس کە کوستیان سەرۆکی کەشتییەکە بوو. دوای ئەوە بازرگانەکانیان یەک یەک کوشت. هەر عەلی نوورەددین مابووەوە. چاویان بەست و بردیانە کوشتنگەکە و ویستیان بی کوژن. لەو جەنگەیەدا پیرێژنێک هات و گوتی: «پاشا ئەتۆ گفتت دابوو، هەرکات دیلتان گرت پێنج دانەیانمان دەنێ بۆ خزمەت کردنی کلیساکان. ئەوە ئێستا کچەکەت بە سلامەت هاتووەتەوە و منیش هاتووم بۆ پێنج کەسەکە. لە سەر قەول و بەڵێنی خۆت بە.» پاشا بە پیرەی گوت: «بە حەزرەتی مەسیح لەو دیلانە جگە لەو لاوە کەس نەماوە. ئەوە بە تەمان ئەویش بکوژن. جارێ ئەوە بەرە و خزمەتی کلیسای پێ بکە. هەتا موسوڵمانی دیکە دێنن. ئەو دەمیش چواری دیکەت دەدەمێ.»

پیرێژنە دۆعای بە خێری بۆ پاشا کرد و عەلی نوورەددینی لە کوشتنگەکە هەستاند و تێی راما. زۆری پێ لاوێکی جوانچاک بوو. لەگەڵ خۆی بردی بۆ کلیسا و پێی گوت: «ڕۆڵە جلەکانت داکەنە. ئەتۆ بەو جلانەوە شیاوی خزمەت کردنی پاشایانی.» نوورەددین جلەکانی داکەند. پیرێژن کراسێکی جاو و باڵاپۆشێکی کەتانی دایە، بیکاتە بەری. پێچ و کڵاوێکی کەتانیشی دایە لە سەری بکا و خەریکی خزمەتی کلیسا بێ.

نوورەددین حەوت ڕۆژان خەریکی خزمەتی کلیسا بوو. وا بوو پیرێژن هاتە لای نوورەددین و گوتی: «گەنجۆ، جلە حەریرەکانی خۆت بکە بەرت و ئەوەش دە دینار خێرا لێرە برۆ دەرێ. ئەورۆ برۆ بۆخۆت بگەڕێ مەیەوە ئێرە، دەنا دەکوژرێی.» نوورەددین پرسی: «بۆ دەبێ برۆمە دەرێ.» پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە، کچی پاشا، خاتوو مریەم دێ بۆ زیارەتی کلیسا. چونکە لە دەست موسوڵمانان ڕزگاری بووە. قوربانی کردووە و نەزری داوە و دەبێ بە پێی نەزرەکەی بکا. چوارسەد کچی ڕوومانگی لەگەڵە. یەکێک لەوان کچی وەزیرە لەگەڵ کچی گەورە گەورەکانی دەوڵەت کە هەموویان دێنە ئێرە. ئەگەری هەیە چاویان پێت بکەوێ و لەڕێوە بتکوژن. ئیدی نوورەددین دە درەمەکەی لە پیرێژنە وەرگرت و چوو جلە حەریرەکانی خۆی لە بەر کرد و چوو بۆ بازاڕ. تەواوی کۆڵان و گەڕەکی ئەو شارە گەڕا تا جوان شارەزا بێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! نوورەددین دوای ئەوەی ماوەیەک ون بوو، گەڕاوە بۆ کۆشــک. سەیری کرد مریەمی زوننارییە لەگەڵ چوارسەد کچی جوان هاتنە کەنیسەکەوە. نوورەددین کە چاوی بە مریەم زوننار کەوت، لغاوی تاقەتی لە دەست دەرچوو. یەک بە خۆی هاواری کرد: مریـــــەم مریـــــــــەم. کچەکان کە گوێیان لە دەنگی نوورەددین بوو کە هاواری دەکرد مریەم مریەم. شـیرەکانیان لە کالان دەرکێشـا و پەلاماری نوورەددینیان دا بیکوژن. مریەم جوان لێی ورد بووەوە و ســـەرنجی دایە. ناســـییەوە. خێرا بە کەنیزەکەکانی گوت: «دەســت ڕاگرن. ڕەنگە شـێت بێ. بە ڕەنگ و ڕواڵەتیدا دیارە شــێتە.» کاتێک نوورەددین گوێی لە قسەی شازادە مریەم بوو. بە قەستی کەف و کوڵی دەردا و خۆی خێچوخوار کرد و خۆی خسـتە باری شـێتی. فێی هێنا خۆی و وە لینگەفرتە کەوت. مریەم گوتی: «نەمگوت شـێتە.» بیهێننە لای خۆم و لێی دوور کەونەوە. ئەمن عەڕەبی دەزانم. بزانم چاکی ناکەم و دەرمانێکی بۆ نابینمەوە. ئیدی کچەکان بە ســـێ چوارێک هەڵیان گرت و بردیان بۆ لای شـازادە مریەم و بۆخۆیان دوور کەوتنەوە. شـازادە مریەم گوتی: «نووردەددین، ئەوە هەر لەبەر من گیانی خۆت خسـتووەتە مەترسـییەوە و گەیشـتوویە ئێرە؟ نوورەددین وەڵامی داوە.

هـۆش و ئـاوەزم فـڕیـن کـاتـێ تـۆ ڕۆیشـــتـی
گەر تـۆم نەبـێ نـازانـی چەنـدە خـۆشـــە شـــێـتـێـتـی

مریەم گوتی: «گلەیی و گازندەت لە کەس نەبێ، ئەمن لە پێشـــدا پێم گوتی بە هیچ جۆرێک خۆ لەو وەزیرە شـــەل و کوێرە مەدە و قســـەی لەگەڵ مەکە. دەتخاتە داوەوە. بۆخۆت بە قسەت نەکردم و هەر بە قسەی خۆت کرد. ئەمن نەک هەر بە خەون، بەڵکوو بە دڵ زانیم ئەو وەزیرە هەر لەبەر من هاتووەتە ئەو شـــارە، دڵم خەبەری دا.» نوورەددین گوتی: «خانمەکەم، تازە تووش بووم و هەڵەکەم کرد.

تالاوی ئەو هەڵەیەی، وا ئـــــــــــــــێستا دەیخۆمەوە
بەردەوام هـێـڵـنـج دەدەم، خەریـکە گـیـان دێـنـمەوە

ماوەیەکی زۆر نوورەددین و شـــازادە هەر خەریکی گلە و گازەندە لە ڕۆژگار بوون و هەر یەکەی شــتێکی بۆ ئەوی دیکەیان دەگێڕاوە. شــێعریان بە ســەر یەکدا هەڵگەدەگوت و دەگریان. شـازادە کراسـێکی سـەوزی پەڕاوێز زێڕی لەبەردا بوو. جوانییەکەی چەند هێندە کردبوو. وەک شاعیر دەڵێ:

ڕواڵەتی ئەو شۆڕە ژنە بەهارێـــــــــــــــکی پڕ ئاو بوو

بەژن و ئاتەگی کراسی چـــــــــــــــــیمەنێکی تێراو بوو
هەر گوڵێک بە زەینت گەیبا لە مـــــــــــــێرگ و سەوزایی
لەو دیمەنە خـــــــــــــۆشەدا، ڕیزیان بەستبوو وەکوو شایی
جــــــــــــــوتێک کۆتر لە سەر سینگی هێمن و نەرم و نیان
هەڵکورماو، خرپن و جوان، ســــەریان بردبووە بەر خۆیـان

کە بوو بە شـەو شـازادە ڕووی لە کچەکان کرد و لێی پرسـین: «کچەکان پێتان خۆشـە ئەو شـــەو لێرە بمێننەوە؟» کچەکان تێکڕا گوتیان بەڵێ پێمان خۆش. ئیدی مریەم کچەکانی برد و چوونە پێگەی مریەمی کەچین، بۆ زیارەت و تەواف. کە زیارەت کرا و تەواو بوون، شازادە گوتی: «ئەمن دەمەوێ بە تەنیا لێرە بمێنمەوە و عیبادەت بکەم. لەمێژە لێرە دوورم. دڵم گیراوە. ئێوە هەســـتن بچنە خەوگەکان و بحەســـێنەوە. هەر کاتێکیش پێتان خۆش بوو بخەون.» کچەکان گوتیان باشـە بە سـەر چاو. ئەتۆ بە کەیفی خۆت خەریکی خوداپەرستی خۆت بە. ئیدی کچەکان هەر کەسەی چوو لە شوێنێک خەوت. کە دەوری چۆڵ بوو شازادە هەســتا چوو،گەڕا نوورەددینی لە پەنایەک دیتەوە. چاوەڕێی ئەو بوو. کە شــازادە چوو بۆ لای نوورەددین لەبەری هەستا و دەستی ماچ کرد. شـازادە دانیشـت و ئەوی لە پەنا خۆی دانا. جل و خشڵ و زەنبەری لە خۆی کردەوە و نوورەددینی لە باوەش گرت و بە خۆیەوە گوشی و ماچی کرد و جووت بوون. دەیانگوت: «ماوەی پێکەوە بوون چەند زوو تێدەپەڕێ و کە لە یەک دوور دەبین هەر ناگوزەرێ. شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

کەم تەمەنە دەمـــی پـــێـــکەوە بـــوون
گەر بە درێژایی تەمەنـــــــــــــــــیش بێ
ناخۆش و تاڵە لە یەک دابـــــــــــــــڕان
بێتوو لە بەر چـاو ون بـوونێکیش، بێ

ئەوان خەریکی کەیف و شـــادی و خۆیان بوون، هەتا مجێوری کەنیســـە چوو زەنگی کەنیســـە لێ دا کە هێمای هەســـتان بوو. ئەو مجێورە کوڕێکی جوانچاک بوو وەک شـاعیر دەڵێ:

کوڕێکی ڕێکوپێک و تـــــــــــــــــیژکەڵە بوو
چـاو ڕەش و خـوێـنشـــیرین و ڕەقەڵە بـوو

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە لاوەکە هەستا چوو زەنگەکەی لێ دا. شازادە خێرا هەستا جلوبەرگەکەی کردە بەری و خشڵ و زێڕەکەی بە خۆیدا کرد. نوورەددین زۆری پێ ناخۆش بوو. دیسان خەم و پەژارە دەوریان داوە و گریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

گەر لەگەڵ خۆشەویستەکەت بی، شەوێک پێکەوە
خەوی لێ ناکەوێ بانگبێژی گەردوون وەک شەوە[1]
سەر لە ئێوارە خێرا بانگی بەیانی دەدا
کارێک دەکا، کۆتایی بێتێ بە لەز بەو شەوە

شازادە لە ئامێزی گرت و ماچی کرد. پێی گوت: «نوورەددین، چەند ڕۆژە لەو شارەی؟ هیچ شارەزاییت لە ناو شار هەیە؟» نوورەددین وەلامی داوە: «بەڵێ شارەزام.» شازادە گوتی: «دەی زۆر باشە، ئەگەر نێو شار شارەزای، کاتێک دوو لە سێی شەو ڕۆیشت بچووە سەر سندووقەکە و هەرچی تێیدا بوو، دەری هێنە و لەگەڵ خۆت بیهێنە. بڕۆ بۆ قەارخ دەریا، کەشتییەکی چکۆڵەی لێیە کە دە دانە کەشتیوانی تێدایە. کە چوویە پێشێ سەرۆکەکەیان بانگت دەکا و دەست دەکێشێ، ئەتۆش دەستێ دەیە و سواری کەشتییەکە بە. لەگەڵ ئەوان لە نێو کەشتییەکە دانیشە. هەتا من دێم بۆ لات. بەڵام تکات لێ دەکەم نەچی بخەوی و وەخەبەر نەیەی. دەنا پەشیمان دەبییەوە.

دوای ئەوە ماڵاوایی لە نوورەددین کرد و چووە دەرێ. چوو کچەکانی هەستاند و هاتنە لای دەرگاکە و پیرێژنە هات دەرگای بۆ کردنەوە. کاتێک شازادە لە کەنیسە چووە دەرێ. تەماشای کرد ئەوە خزمەتکار و سوارەکانی لەبەر دەرگا وێستاون. یەستری تایبەتی خۆیان بۆ هێنا و سوار بوو. سەرهەنگێک لغاوی یەسترەکەی گرت و کچەکانیش بە دوایاندا ڕۆیشتن. هەتا گەیشتنەوە کۆشک. ئەو بابچێتەوە کۆشک. ...

نوورەددین لە شوێنەکەی خۆیدا خۆی مەڵاس دا. هەتا تاو هەڵات و خەڵک یەک یەک و دوو دوو ڕوویان لە کەنیسە کرد. کاتێک خەڵکەکە زۆر بوون، ئەویش لە پەنایەکەوە تێکەڵاوی خەڵکەکە بوو. چوو بۆ لای پیرێژنە. پیرێژنە لێی پرسی: «دوێشەو لە کوێ خۆت شاردەوە؟» نوورەددین وەلامی داوە: «هەر وەک فەرمووت چوومە نێو شار لە شوێنێک خۆم مات دا.» پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە گیان کاری چاکت کرد ئەگەر دوێشەو لێرە بای. بە

---

[1]. جندۆکەیەکە گوایە شەوانە دێ و منداڵی ساوا دەرفێنێ.

دەردێکیان دەبردی نەبێتەوە. نوورەددین خەریکی کاری خۆی بوو، هەتا ڕۆژ ئاوا بوو و شەو داهات. کە دوو لە سەر سێی شەو تێپەڕی نوورەددین هەستا چوو بۆ لا سندووقەکە و سـەرەکەی هەڵپچڕی. ئەو زێڕ و جەواهێراتەی بە کێش سـووک بوون و بە نرخە گران، دەری هێنا و بە هێواشی لە دەرکی کەنیسە هاتە دەرێ یەکسەر خۆی گەیاندە قەراخ دەریا. کەشـــتییەکی لێ بوو کە خاوەنەکەی پیاوێکی پیر بوو. ڕدێنێکی ســـپی و درێژی هەبوو. کەشتیوانەکانیش لە دەوری ڕاوەستابوون. هەر وەکوو شازادە پێی گوتبوو. دەستی کێشا و کابرا دەســتی گرت و هەڵیکێشـا ناو کەشـتییەکە. ئینجا کابرا بە کەشـتیوانەکانی گوت کەندرەکان لە لەنگەرگاکان بکەنەوە با پێش ئەوەی ڕۆژ دیاری بدا وەڕێ کەوین.

یەکێک لەو دە کەسـە گوتی: «سـەرۆک، چۆن دەکرێ بڕۆین، قەرارە پاشـا بێ و سـوار بێ لە دەریـادا بســـووڕێینەوە و وە دوای موســـوڵمـانە ڕێگرەکـان بکەوین، نیگەرانی کچەکەیەتی. ئیدی سـەرۆک بە سـەریدا گوڕاند و بە شـیرێک دوو قاشـی کرد. یەکی دیکە گوتی: «ئەوە ئەو هاوڕێیەی منت بۆ لە خۆڕا کوشت؟» سەرۆک لەڕێوە لە سەری ئەویشی دا. ئیدی هەر بەو شـێوەیە هەتا هەر دە کەسـەکەی کوشـت و لە دەریای هاویشـتن. دوای ئەوان بە تووڕەیی بە نوورەددینی گوت بچووە دەرێ ئەو کەنـدرە بکەوە. نوورەددین لە شـــیرەکەی ئەو تۆقی بوو. خێرا هەڵات کەندرەکەی کردەوە و هاتەوە ناو کەشـــتییەکە. سەرۆک پێی گوت: ئاوا و ئاوا بکە و کەشتییەکە ئاوا لێ خوڕە. چاو لە فڵانە ئەستێرە بکە. هەرچی سەرۆک گوتبای نوورەددین بە قسەی دەکرد و خێرا کەشتییەکەی لێ دەخوڕی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کابرای سەرۆک لەگەڵ نوورەددین پاپۆڕیان لێخوڕی و دەڕۆیشتن. نوورەددین هەر لە فکر و خەیاڵاندا بوو. جار جار چاوێکی لە کابرای سەرۆک دەکرد و زۆری لێ دەترسا. بۆخۆشی نەیدەزانی بەرەو کوێی لێ دەخوڕێ. تا وا بوو، بوو بە نیوەڕۆ. سەیری کرد، ئەوە کابرا ڕدێنی گرتووە و دەیکێشێ. هەر کێشای هەتا لێی کردەوە. نوورەددین تەماشای کرد، ئەو ڕدێنە ساختە بوو. بە چەنەیەوە نووساندبوو. کە لێی ورد بووەوە، گراوە گۆرینەکەی خۆی بوو! ئاوای کردبوو، هەتا کەشتیوانەکان نەیناسنەوە و بیانکوژێ. نوورەددین سەری لەو هەموو زیرەکی و وریاییەی سوور ما و لە خۆشیان خەریک بوو، گیانی دەرچێ. ئیدی زانی تازە گراوەکەی خۆی وەگیر کەوتووەتەوە. لە خۆشیان ئەو شێعرەی خوێندەوە:

شوێنی جۆلانەی هەتاو، باوەشـی ئاسمانە
میوانی تـیشکی ئەون ئەو مانگ و ئەستێرانە
ئاسمانی دڵی من جێی تەراتـێنی تۆیە
بێ جۆلانەی خۆت بکە، شەشدانگی مڵکی تۆیە
دڵێک تۆی تێدا نەبێ سـارد و بێ رووحـە گیانە
بۆیە تا ئێستاش زیندووم، جێت نەهێشتووە هێلانە

کاتێک نوورەددین ئەو شێعرەی خوێندەوە، شازادە سەری لەو زمانپاراوییەی سوور ما. نوورەددین گوتی: «خانمەکەم، ئەگەر ئێستێکی دیکە خۆت خۆیا نەکردبا، هێندە نارەحەت بووم فجە[1]م دەکرد. شازادە بە قسەکەی پێکەنی. شازادە زۆر نەترس و ئازا بوو، ڕێ و بوارەکانی دەریای پێ دەزانی. ئیدی دەستی کرد بە لێخوڕینی کەشتییەکە و هەتا بوو بە شەو ڕێگایەکی زۆریان بڕی. ڕاوەستان نانیان خوارد. شازادە ئەو زێڕ و زیو و جەواهێراتەی لە ماڵە بابی هێنابووی پیشانی نوورەددینی دا و نوورەددین کەیفی پێی ساز بوو. دوای ئەوە دیسان پاپۆڕیان ئاژووت و بای خوازراو هەڵی کرد و بەردەوام ڕۆیشتن، هەتا گەیشتنەوە ئەسکەندەرییە و هێماکانی شار دەرکەوتن. دڵیان خۆش بوو، خێراتر لێیان خوڕی هەتا گەیشتنە بەندەری یەمینە. نوورەددین دابەزی و کەندری پاپۆڕەکەی بە بە گاشەبەردێکی گەورەوە بەستەوە. کەمێکی لەو ماڵەی کە شازادە لە ماڵە بابی لەگەڵ خۆی هێنابووی هەڵگرت و بە شازادەی گوت: «خانمەکەم ئەتۆ لێرە دانیشە با ئەمن بەو

---

[1]. فجە: لە کار کەوتنی مێشک یان دڵ.

شێوەیەی پێم خۆشە تۆ بەرمەوە ناو ئەسکەندەرییە.» شازادە گوتی: «هەرچی دەکەی بیکە بەڵام تۆزێک پەلە بکە با تووشــی کارەســاتی نەخوازراو نەبین و دوایە پەشــیمان بینەوە.» نوورەددین گوتی: «شازادە زوو دێمە و زۆرم پێ ناچێ.» شازادە لە کەشتییەکەدا دانیشت و نوورەددین چوو بۆ ماڵی کابرای هەزوێلەفرۆش هەتا چارشێو و ڕووبەندێک و جووتێک کەوش بە ئەمانەت وەرگرێ و بێتەوە. بێ ئەوەی بزانێ چەرخی ڕۆژگار چیان بە ســـەر دێنێ. بەسەرهاتی نوورەددین و شازادە بێرە گەیشت.

کە ڕۆژ بووەوە، باوکی شازادە چاوی بۆ شازادە گێڕا لە هیچ کوێ دیار نەبوو، هەواڵی کچەکەی لە کەنیز و خزمەتکارەکانی پرســی: «گوێتان پاشــای بەڕێز، ئەو شــەو لە کۆشـک هاتە دەرێ و بەرەو کەنیســە چوو.» لەو جەنگەیەدا کە پادشــا لەگەڵ کەنیزەکان قســەی دەکرد؛ گوێیان لە هاوارێکی بەرز بوو. پاشا گوتی: «ئەو چ بووە؟» گوتیان: پاشا، دە کەس لە پاپۆڕوانان لە قەراخ دەریا کوژراون و پاپۆڕەکەی جەنابیشت دیار نییە. دەرگای کەنیسە بۆ سەر دەریاش کرابووەوە. ئەو دیلەش کە تەرخان کرابوو خزمەتی کەنیسە بکا دیار نییە. پاشــــا گوتی: «ئەگەر کەشـــتییەکەی منیش دیار نەبێ ئەگەری زۆرە کچەکەی منیش لەو کەشتییەدا بێت.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پاشا گوتی: «گومانی تێدا نییە کچەکەی منیش لەو کەشتییەدایە.» لەڕێوە پاشا بانگی سەرۆکی بەندەری کرد و پێی گوت: «قەسەم بە گیانی مەسیح، ئەگەر بە لەشکرێکی زۆرەوە، زوو خۆت نەگەیەنیە کەشتییەکەی من و بە سەرنشینەکانییەوە نەیانهێنییەوە لای خۆم بە خراپترین شێوە دەتکوژم. سەرۆکی بەندەر بە شڵەژاوی لە لای پاشا هاتە دەرێ چوو بۆ کەنیسە بۆ لای پیرێژنە و لێی پرسی: «دایە ئەو کوڕە دیلەی لێرە بوو، نەیگوت خەڵکی کوێیە؟ باسی هیچی نەکرد؟» پیرێژنە وەڵامی داوە: «باسی کرد، گوتی کە خەڵکی ئەسکەندرییەیە.» کاتێک سەرۆک ئەو قسەیەی لە پیرێژنە بیست، گەڕاوە بۆ لای بەندەر و بانگی کەشتیوانەکانی کرد و پی گوتن: «چارۆکەکان هەڵدەن.» کەشتیوانەکان بە قسەیان کرد. لەڕێوە سواری کەشتی بوون و بە لەز کەشتیان تاو دا و ڕۆیشتن هەتا ئەو کاتەی کە نوورەددین لە کەشتییەکەی دابەزی ئەوان گەیشتبوونە نیزیک ئەسکەندەرییە. یەکێک لەو کەسانەی کە لە کەشتییەکدا بوو و وە دوای کەوتبوون وەزیرە شەل و کوێرەکە بوو.

کاتێک لە کەشتییەکەی نوورەددین و شازادە نیزیک بوونەوە، ناسیانەوە و کەشتییەکەی خۆیان لەولاترەوە ڕاگرت. بۆخۆیان بە سواری گەمییەک چوون بۆ لای کەشتییەکەی ئەوان. لەو گەمییەدا سەد شەڕکەڕی ئازای تێدا بوو. گەمییەکەیان لێ خوڕی هەتا گەیشتنە لای شازادە. کە لێی نیزیک بوونەوە تەماشایان کرد ئەوە شازادە بە تاقی تەنییە. ئەویان گرت و گەڕانەوە بۆ لای کەشتییەکەی خۆیان و لەوێشەوە بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕانەوە. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە شارەکەی خۆیان. لەوێ دابەزین و شازادەیان برد بۆ لای پاشا. پاشا لە سەر تەختێکی پاشایەتی دانیشتبوو. کە چاوی بە شازادە کەوت، گوتی: «ئەوە گڵاو، بۆ دینی باب و باپیرانی خۆت و مەسیحت بەجێ هێشتووە و کەوتوویتە شوێن دینی ئیسلامێک کە بە زەبری شیر ساخ بووەتەوە؟!» شازادە گوتی: «ئەمن تاوانێکم نییە، شەو چوومە دەرێ دزانی موسوڵمان پەلاماریان دامێ و دەمیان گرتم و پاشان دەستیان شەتەک دام و لە کەشتیان خستم و بردیانم بەرەو شاری شاری خۆیان. ئەمن فریوم دان و وام نواند کە موسوڵمانم. ئیدی دم و دەستیان کردمەوە. ئەمن قەت باوەڕم نەدەکرد ڕزگارم بێ کە پیاوەکانت گەیشتنێ و ڕزگاریان کردم. ئای چەند خۆش بوو ئەگەر هاتن. پاشا گوتی: «قەحبە قەسەم بە پەڕەپەڕەی ئینجیل درۆ دەکەی. تازە دەبێ وەک سەگ بتتۆپێنم. ئەو پەندەی پێشووت پێ کەم بوو، ئەوەشت بە سەر هێناین؟» ئیدی پاشا فەرمانی کوشتنی دەر کرد. لەڕێوە وەزیرە شەلە کوێرەکە، کە هەر لە زووەوە هۆگری شازادە بوو هات و گوتی: «پاشا مەیکوژە و لە منی مارە بکە. کۆشکێکی لە کوچک بۆ چێ دەکەم. هەتا ئیدی

دەستی دزە موسوڵمانانی نەگاتێ. ئەگەر کۆشکەکەشم تەواو کرد، سی موسوڵمانیش لە بەر دەرگا کۆشکەکە دەکەمە قوربانی مەسیحییەکان.» پاشا داواکەی وەزیری قەبووڵ کرد و بانگی قەشە و شتی کرد و شازادەیان لە وەزیر مارە کرد. فەرمانی بە وەزیر کرد کۆشکێکی قایمی لە کوچک بۆ چێ کەن. وەزیر وەستای بەردتاش و دیواری بانگ کرد و خستنییە سەر کار. ئەوانە با لێرە بەجێ بێڵێین.

نوورەددین کاتێک چوو بۆ ماڵە هەزوێلەفرۆشەکە، ڕووبەند و چارشێو و کەوشی لە خێزانی هەزوێلەفرۆشەکە وەرگرت و بەرەو دەریا گەڕاوە. سەیری کرد کەشتی شازادە دیار نییە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و هەشتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک نوورەددین گەڕاوە قەراخ دەریا و شازادە و کەشتییەکەی دیار نەبوو. خەریک بوو دڵی بتۆقێ، ڕۆندکی هاتنە خوارێ و ئەو شێعرەی گوت:

ڕۆژگار بۆ لەگەڵ مندا، ململانە دەکەی
بۆچی هێندە دڵڕەقی هەرچی ناشیاوە دەیکەی
بۆچی هەڵنایە چاوت بەو ئەڤینە بێ خەوشە
ڕەبی وێران بێ ماڵت تێک چێ ئەوە دەرک و حەوشە

دوای ئەوە سەرنجی ئەولا و ئەولای دا، بیستی تاقمێک باسی ئەوە دەکەن کە هیچ حورمەتێک بۆ خەڵک نەماوەتەوە. وای لێ هاتووە فەرەنگیان دێن لێرە کەشتی و سوارەکانییەوە دەبەن و موسوڵمانێک نییە بڵێ با وە دوایان بکەوین. نوورەددین لێی پرسین: «ئەوە چ بووە؟» یەکیان وەڵامی داوە: ڕۆڵە گیان، وەڵا کەشتییەک پڕ لە لەشکری فەرەنگیان هاتن و کەشتییەک کە لەو قەراخە بەسترابووەوە و خەڵکی تێدا بوو. بە خەڵکەکەوە لەگەڵ خۆیان بردیانن و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. کاتێک نوورەددین ئەوەی بیست لەوێ بێ هۆش کەوت. کە وە هۆش هاتەوە خەڵک لێیان پرسی ئەوە چ بووە؟ بۆ وات هات؟ ئەویش بەسەر هاتی خۆی بۆ گێڕانەوە. کە خەڵک زانیان چ بووە یەک کۆڵیان جوێن پێ دا و گوتیان: جاچۆن ئەتۆ شازادەت لە کەشتییەکە دانەبەزاند و ئەو پەندەت بە سەر هێنا. با چارشێو و ڕووبەندی بەسەرەوە نەبا، جارێ چ دەبوو.

کورتی کەینەوە، هەر یەکی بە جۆرێک سەرکۆنەیان دەکرد. تاقمێک دەیان گوت: هەر لێی گەڕێن ئەو بەڵایەی بەسەری هاتووە لێی زیادە. هێند نارەحەت بوو، دیسان بێ هۆش کەوتەوە. لەو جەنگەیەدا کابرای هەزوێلەفرۆش سەیری کرد، ئەوە خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوە. چوو بۆ لایان بزانێ چییە. تەماشای کرد ئەوە نوورەددین لە نێو خەڵکەکەدا بێ هۆش کەوتووە. چوو لە پشت سەری دانیشت و وە هۆشی هێناوە و پێی گوت: «ڕۆڵە گیان ئەوە چیت بە سەر هاتووە؟» نوورەددین گوتی: «گەورەم، ئەو کەنیزەی لێیان ڕفاندم بە هەزار زەحمەت چووم دیتمەوە و هێنامەوە ئێرە. لێرە کەشتییەکەم لەو قەراخە ڕاگرت و چووم لە ماڵی ئێوە چارشێو و ڕووبەند لە خێزانت وەرگرم بیهێنمەوە ناو شار، کەچی دوای من فەرەنگییەکان هاتوون و شازادەیان دیسان بردووەتەوە. بۆ شارەکەی باوکی.»

کاتێک هەزوێلەفرۆش ئەو باسەی بیست دونیای لە بەر چاو تاریک بوو. بە نوورەددینی گوت: «ڕۆڵە تۆ بۆ ئەویشت لەگەڵ خۆت نەدەهێنا ناو شارەوە؟ هەستە با بڕۆینەوە ناو

شار بەشکوو خودا کەنیزێکی لەوت باشتر بە قسمەت کا.» نوورەددین گوتی: «گەورەم من قەتم ئەو لە بیر ناچێتەوە و دەستیشی لێ ناکێشمەوە. ئەگەر گیانیشمی لە سەر دانێم.» هەزوێلەفرۆش گوتی: «ڕۆڵە، ئەی بە تەمای چ بکەی؟» نوورەددین وەڵامی داوە: «دەچمە ئەو شارە یان خۆشم بە کوشت دەدەم یان پێی دەگەم.» هەزوێلەفرۆش گوتی: «ڕۆڵە، [ما کل مرة تسلم الجرة] ئەو جارە ڕزگارت بووە، بەڵام ئەگەری هەیە. ئیدی ئەوجار بتکوژن. بە تایبەت چونکە دەشتناسنەوە.» نوورەددین گوتی: «مامە، لێم گەڕێ با بچمەوە ئەوێ. ئەگەر بشمکوژن باشترە لەوەی لە تاوی ئەو بمرن. بەس نییە دەڵێم هەوڵێکم داوە.

ڕێکەوت وا بوو، کەشتییەک ئامادە بوو بڕوا، خەڵکەکە هەموو کەلوپەل و پێداویستی ناو ڕێیەیان کڕی بوو و سوار ببوون. چارۆکەی کەشتیان هەڵدا بڕوا، نوورەددین سوار بوو لەگەڵیان کەوت. بای خوازراو هەڵی کرد و ڕۆیشتن، هەتا لە دەریادا تووشی کەشتی فەرەنگیان بوون. هەر کەشتییەکی موسوڵمانانیان بدیتبا، خەڵکەکەیان بە دیل دەگرت و دەیان برد بۆ لای پاشاکەیان. ئەوانیشیان گرت و بردیاننە لای پاشا. پاشا فەرمانی دا بیانکوژن. ئەوان سەد کەس بوون. بکوژەکە لێی کوشتن هەتا نۆرەی نوورەددین هات. بکوژەکە پێی حەیف بوو بەزەیی پێیدا هات و ڕایگرت دوایە بیکوژێ. کە پاشا چاوی پێی کەوت زوو ناسییەوە و لێی پرسی: «گەلۆ تۆ نوورەددین نی؟» ئەمن ئیبراهیمم و قەت نەهاتوومە ئێرە. درۆ دەکەی ئەتۆ ڕاست ئەو نوورەددینەی کە ناردمیێ لای پیرێژنەکە هەتا لە خزمە کەنیسەدا بێت.» نوورەددین گوتی: «قوربان من ناوم ئیبراهیمە.» پاشا گوتی: «ئەگەر پیرێژنەکە بانگ کەم و بتناسێتەوە دەکوژرێی.» ئەوان خەریکی ئەو قسانە بوون کە وەزیر ئەعوەر(تەک چاو) پەیدا بوو. کڕنۆشی برد و گوتی:«سەروەرم پاشا، کۆشکەکەم تەواو بووە. بۆخۆت دەزانی من نەزرم کردبوو ئەگەر کۆشکەکەم چێ کرد. سێ کەسی موسوڵمان بکەمە قوربانی و لە بەر دەرگاکە بیانکوژم. ئێستا هاتووم سێ کەسی موسوڵمانم بدەیەی هەتا قسەکەم بەرمە سەرێ. پاشا گوتی: «بە حەزرەتی مەسیح لەو دیلانە جگە لەو گەنجە کەس نەماوەتەوە. جارێ ئەوەی بەرە بیکوژە هەتا ئیدیکەمان بۆ دێ دەتدەمێ بیانکوژە.

لەو جەنگەیەدا کە وەزیرە یەک چاوەکە نوورەددینی برد بۆ کۆشک بیکوژێ، وێنەکێشەکان گوتیان: «وەزیر ئێمە کاری دوو سێ ڕۆژمان ماوە دەست ڕاگرە جارێ مەیکوژە بەشکوو لەو ماوەیەدا ببن بە سێ کەس و ئەوجار هەموویان پێکەوە بکوژە و لە ڕۆژێک دا نەزرەکەت تەواو بکە. ئیدی نوورەددینی نارد بۆ بەنیخانە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی هەشتسەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کاتێک وەزیر فەرمووی نوورەددین بخەنە بەندەوە. خێرا پیاوەکانی گرتیان و غەل و زنجیریان کرد. نوورەددین دەستی لە خۆی شوت و برسی و تینوو خرایە بەندیخانەوە. ڕێکەوت وا بوو کە پاشـــا دوو ئەســـپی هەبوو. یەکیان ناوی یەکەم و ئەوی دیکەیان ناوی دووەم بوو. یەکیان بۆرە بوو، ئەوی دیکەیان ڕەشـــی قەترانی. پاشـــای دورگەکان هەموویان گوتبوویان هەر کەس بتوانێ یەکێک لەو ئەسپانە بدزێ، لە زێڕ و زێو و جەواهێرات ئەوەندەی بیهەوێ دەیدەنێ. بەڵام کەس نەیدەتوانی ئەو ئەســـپانە بدزێ. ڕێکەوت وا بوو، یەکێک لە ئەسپەکان تووشی چاوێشە بوو. پاشا بەیتاری وڵاتی هەموو بۆ بانگ کرد. بەڵام نەیانتوانی چاری بکەن. لەو جەنگەیەدا وەزیر تەکچاو چوو بۆ لای پاشـــا. ســـەیری کرد، پاشـــا نارەحەتە. گوتی: «ئەو ئەســـپە بدە بە من با چاکی بکەمەوە.» پاشـــا ئەسپەکەی دا بەو. وەزیر ئەسپەکەی هێنا تەویلەیەک لە نیزیک ئەو دیوەی نوورەددینی لێ بەند کرابوو. کاتێک ئەو ئەســـــپەیان لە هاوڕێکەی دابڕاند. هاوارێکی وای کرد کە خەڵک هەموو ترســـی ڕێنیشـــت. بەردەوام دەیحیلاند و ســـمکۆڵانی دەکرد. وەزیر زانی ئەو هات و هاوار و حیلاندنە ئی ئەوەیە لە هاوڕێکەیان دابڕاندووە. ئیدی چوو بۆ لای پاشا و شتەکەی بۆ گێڕاوە. کاتێک پاشا ناردی و ڕاستی و دروستی شتەکەی بۆ ڕوون بووەوە. گوتی: «جا ئەوە ئاژەڵێک لە تاوی خۆشـــەویســـت و هاوڕێکەی ئاوا بکا، بڵێی خاون ئەقڵ و هۆشـــێک چۆن دڵی نەتۆقێ و بەرگە بگرێ!؟» دوای ئەوە پاشـــا فەرمانی دا گوتی ئەو ئەســـــپەی دیکەش بەرن بۆ تەویلەی وەزیر تەکچاوی مێردی مریەم. بە خزمەتکارەکانی گوت پێشـــی بڵێن کە ئەو ئەســـــپەی لەبەر مریەی کچی داوە بە تۆ. نوورەددین لە دەلاقەی دیوەکەیوە چاوی لە ئەسپەکان بوو. دیتی یەکیان چاوی ســـاغ نییە. ئەویش زۆر شـــارەزای ئەسپ و نەخۆشییەکانیان بوو. هەر بۆیە لە بەر خۆیەوە گوتی: «دەرفەتی چاک دەڵێم ئەمن دەتوانم چاوی ئەو ئەسپە چاک کەمەوە. ئەودەم کارێک دەکەم ئەسپەکە کوێر بێ، بەشکوو وەزیر بمکوژێ و ڕزگارم بێ.»

کاتێک وەزیر هات بۆ تەویلە. نوورەدین بانگی کرد: «وەزیر ئەگەر ئەمن ئەو ئەســـپەت بۆ چاک کەمەوە چم لەگەڵ دەکەی؟» وەزیر وەڵامی داوە گوتی: «بە گیانی خۆم بێتوو ئەو ئەسپە چاک بکەیەوە ئەمن لە کوشـــتنت خۆش دەبم و ئازادت دەکەم.» نوورەددین گوتی: «فەرمان بدە با دەســـتم بکەنەوە. وەزیر فەرمانی دا دەســـتی بکەنەوە. نوورەددین لە ڕێوە هەستا و نەختێک شیشـــەی نەرمی لەگەڵ قسڵ تێکەڵ کرد و بە ئاوی پیواز گرتییەوە و لە سەر چاوی ئەسپەکەی دانا و بە پەڕۆیەک بۆی بەست. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە ئێستا چاوی دەرێنێ و ئیدی من بکوژن و ئاسوودە بم. نوورەددین ئەو شـــەوە هەتا بە یانی هەر

گریا و فینگەی هات. دەیگوت: «خودایە لەوە ئاگاتری من لەبەرت بپاڕێمەوە.» کە ڕۆژ بووەوە، وەزیر هات بۆ تەویلە پەڕۆکەی لە چاوی ئەسپەکە کردەوە. لە هێزی خوداییەوە چاوی چاک ببووەوە. ئیدی وەزیر گوتی: «گەنجە موسوڵمانەکە، بە حەزرەتی مەسیح من سەرم لەو کارەی تۆ سوورِ ماوە. ئێمە تەواوی بەیتاری ئەو شار و وڵاتەمان هێنا نەیانتوانی چاری بکەن. ئەتۆ چۆنت ئەو کارە کرد؟» وا بوو وەزیر بۆخۆی چووە پێشی و کۆت و زنجیری لێ کردەوە و ئازادی کرد. چوو جلی بەشکۆ و باشی بۆ هێنا و کردی بە سەرمەیتەر خۆی. سەیر لەوەدا بوو کە لەو کۆشکەوە کە وەزیر بۆ مریەمی دروست کردبوو لە چەند شوێنەوە دەیڕوانییە ئەو شوێنەی نوورەددینی لێ بوو. نوورەددین ڕۆژێ چەند جار لەوێ دادەنیشت و خەریکی خواردنەوەی شەراب و عەیش و نۆش دەبوو. فەرمانی بە خزمەتکارەکان دەدا و چاوەدێری خزمەتی ئەسپەکانی دەکرد. وەزیر تەکچاو کچێکی هەبوو مانگ ئاسا کە زیاتر وەک ئاسکی سڵک دەچوو. بە ڕێکەوت ڕۆژێک لە شوێنێک دانیشتبوو دەیڕوانییە شوێنی نوورەددین. گوێی لێ بوو، نوورەددین ئەو شێعرانەی دەخوێندەوە:

وەک شنەی بەهار بە هێمنی هات
پڕ بووماڵم لە، خێر و خۆشی و هات
بە تیشکی گەشی ڕووی، ڕووناک بوو
کۆشکی ڕازاوەی ئامانج و ئاوات
داخی گرانم بۆو کیژە جوانە
کاتێک کە ئەو ڕۆی خۆشیم دوایی هات

کاتێک نوورەددین شێعرەکەی تەواو کرد. کچی وەزیر لە دڵی خۆیدا گوتی: «بە مەسیح ئەو لاوە موسوڵمانە زۆر جوانە، دیارە ئەڤینداریشە و لە خۆشەویستەکەی هەڵبڕاوە. خۆزگە دەمزانی گراوەکەی کێیە. گەلۆ وەک خۆی جوان و لەبەردڵە یان نا؟ ئەگەر بێتوو ئەویش بە قەد خۆی جوان بێ، ئەوە جێی خۆیەتی. ئەگەر ئاوا نەبێ ئەو حەیفە ئەوە ئاوا بکا.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! لەو جەنگەیەدا کە کچی وەزیر گوێی دابووە شێعرەکانی نوورەددین. مریەمی زوننـاریش لەو کۆشـــکەی کە وەزیر بۆ ئەوی چێ کردبوو، بە مـات و مەلوولی دانیشـتبوو دەگریا. کچی وەزیر لەڕێوە هەسـتا چوو بۆ لای مریەم، هەتا خەبەر ئەو کوڕە موسـولْمانەی بۆ بەرێ و باسـی ئەو شـێعرەی بۆ بکا. هەر لەو جەنگەیەدا مریەم خانمیش کەسێکی نارد لە دووی ئەو. کچی وەزیر کە چوو بۆ لای ئەو سـەیری کرد ئەوە فرمێسک بە سەر گۆنایدا دێتە خوارێ و دەگری و ئەو شێعرە دەڵێتەوە:

ماڵێکی چووکەم هەبـــــــــــــوو، هێلانەی بەختەوەری
هەرچی خـــــــــــێر و خۆشی بوو تۆ لەو ماڵەدا دەتدی
ڕەشـــەبـای چەرخی گەردوون هـات و هەمووی بە بـا دا
ئـــــــــــێستا مەگین بنێرم سـڵاوێک بۆی بە با دا
کوڕێـــــــــــــــــکی وا ڕێکوپێک نوقمی دەریای خەم بێ
چـــــــــــــۆن دڵی من لە سوێی ئەو بە جارێ شەیدا نەبێ

کچی وەزیر لێی پرسی: «شازادە بۆ دەگری؟» شازادە کە ئەو قسەی بیست، کەوتەوە یادی کاتی پێکگەیشتنیان و ئەو شێعرەی خوێندە:

لێم گەڕێ با هەڵوەرێنم بە خوڕ بارانی ئەســـــــــــــرینم
کەوا جێم هێشـــــتووە ڕووحم تـازە قەت قەتی نـابینم

کچی وەزیر گوتی: «شـــــازادە، هەســـــتە خۆت نـاڕەحەت مەکە وەرە بـا بچین لە بەرجەوەندی کۆشکەوە کوڕێکت پێشـان دەم کە لە تەویلەی ئێمە کار دەکا. کوڕێکی قیت و قۆزە و شـــێعری وا وا دەڵێ ســـەیر. پێم وا بێ ئەویش ئەڤیندارە و لە خۆشـــەویســـتەی دابڕاوە.» شـــازادە گوتی: «چۆنت زانی ئەڤیندارە؟» کچی وەزیر گوتی: «شـــازادە ئەو شەووڕۆژ شێعری دڵداری دەڵێ.»

شـــازادە لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەگەر بێتوو کچی وەزیر ڕاســـت بکا و ئوا لە کوڵ بێ، دەبێ هەر عەلی نوورەددین بێ. ئیدی لەڕێوە شازادە هەستا و لەگەڵ کچی وەزیر چوو بۆ ئەو شـوێنەی کچی وەزیر گوتی. کاتێک لەوێ ڕا سـەیری کرد، چاوی بە خۆشـەویستەکەی خۆی نوورەددین کەوت. تەماشای کرد ئەوە لە تین و تاوی خۆشەویستیدا ڕەنگی زەرد و

ویشک هەڵگەڕاوە و بەردەوام ئەو شێعرە دەڵێتەوە:

ئازیزەکەم ڕاناوەستێ خوێنی دوو چاوم
خووساندوویەتی بەر پێم گریانی دوو چاوم
ڕەنگ زەرد و بێ کەسوکار و هەڵوەدا ماوم
با ڕۆچم و نوقم بم لە گۆمی دوو چاوم

کاتێک شازادە نوورەددینی دیت و گوێی لەو شێعرانەی بوو. دانی بە خۆیدا گرت و لە لای کچی وەزیر هیچی نەدرکاند. بە کچی وەزیری گوت: «بە مەسیح وەمزانی ئەتۆ فکرێکت بۆ خەم و ناڕەحەتییەکەی من دیوەتەوە. ئەمن دڵم بە وانە ناکرێتەوە. ئیدی هەستا و گەڕاوە شوێنەکەی خۆی و کچی وەزیریش چوو بە لای کاری خۆیەوە.

دوای ئەوە شازادە کەمێک ڕاوەستا و گەڕاوە ڕوانگەکە و سەیری کرد، ئەوە نوورەددین بە دڵێکی پڕەوە دەگری و فرمێسک دەبارێنی و ئەو شێعرە دەڵێتەوە:

سوور دەزانی ئێمە بێ یەک نازین خوایە
بۆچی لێکت هەڵاواردین لە ژین خوایە
ژیان بێ ئەو کەی ژینە ژانە ئەوە
نامەوێ بژیم بێ یاری شیرین خوایە

شازادە کە ئەو شێعرەی لە نوورەددین بیست. فرمێسکی هاتە خوارێ و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

کوێراییم دایە نوورەددین، پەڕەی دڵم
چۆن نەتۆقێ دڵم، کە ئاوا بێ گوڵم
بۆ دەبێ بەشی ئێمە دەرد و کەسەر بێ
ئەو نەختە ژینەمان پڕ لە دەردە سەر بێ

کاتێک نوورەددین گوێی لەو شێعرە بوو. دەستی کرد بە گریانێکی سەیر. لە بەر خۆیەوە گوتی: «بە خودا ئەو دەنگە زۆر لە دەنگی شازادە دەچوو.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! نوورەددین زانی که ئەو شێوە دەنگ و شێعر خوێندنەوەیە. شێوەی دەنگی شازادە دەدا. گوتی: «خۆزگە دەمزانی کە ئەوە یان نا؟» دوای ئەوە ئاخێکی هەڵکێشا و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

دێتە گوێم دەنگێ لە ناخێکی پڕ سـۆزەوە
دەنگی دڵ سووتاوێـــکە دەکورووزێتەوە
دەڵێی ئەو دەنگە چیـرۆکێ بۆ دڵم دەڵێ
چیرۆکی دڵی کۆسـتکەوتوو، کڵۆڵم دەڵێ

کاتێک شێعرەکە تەواو بوو، پێنووس و لێنووسی هێنا و نامەیەکی ئاوای بۆ نووسی، مریەمی کەنیزت سڵاوت لێ دەکا. لە سوێیانت خەریکە گیانی دەرچێ. ئەو نامەیە لە لایەن ئەوەوەیە. کە نامەکەت خوێندەوە هەستە خەریکی کاری خۆت بە هەتا دەبێ بە شەو، کە یەک لەسەر سێی شەو تێپەڕی، کاتێکی زۆر باشە و هەستە بچۆ ئەو دوو ئەسپە زین کە و بیانبە دەرەوەی شار. هەرکەسیش تووشت بوو، گوتی ئەوە چیان لێ دەکەی؟ بڵێ ئەوە دەیانگێرم. ئەگەر وا بڵێی کەس کاری پێت نابێ. چونکە ئەوان وا دەزانن دەروازەکانی شار داخراون. دوای ئەوە کاغەزەکەی لە کوتە پەڕۆیەکی حەریرەوە پێچاو لەوێوە هاویشتی بۆ نوورەددین.

نوورەددین نامەکەی هەڵگرتەوە و خوێندییەوە و ماچی کرد و لە سەر چاوی دانا. ئەو کاتانەی کەوتەوە یاد کە بەیەکەوە بوون. فرمێسکەکانی لیزگەیان بەست و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

لەگەڵ چارەنووس زۆرانی دەگـــرین
بڕیارەکەیشی بە هـــێند ناگرین
یا بۆ یەک دەبین یاکـــوو دەمرین
هەتاکوو نەمرین دەست هەڵناگرین

کە بوو بە شەو و تاریک داهات. نوورەددین ئەسپەکانی زین کرد و ڕاوەستا هەتا یەک لە سەر سێی شەو تێپەڕی. ئینجا هەستا ئەسپەکانی لە تەویلە هێنا دەرێ و دەرکی تەویلەی پێوە داوە. ئەسپەکانی بردە دەروازەی شار و چاوەڕێی شازادە بوو. با ئەو لەوێ

چاوەڕێ بێ.

شـــازادە بەرەو دیوی بووکێنی چوو کە بۆ ئەویان ئامادە کردبوو. ســـەیری کرد ئەوە وەزیر تەکچاو لە ســەر دۆشــەگی تووکی مروشــتر دانیشــتووە و پاڵی وە پاڵپشــتی دیباوە داوە و چاوەڕێی ئەوە. شازادە کە ئەوی دیت، لە بەر خودا پاڕاوە و گوتی: «خودایە دوای ئەو ماوە پاکییەم، بە دەســـت ئەو گڵاوە گڵاوم نەکەی و فریام کەوی. دوای ئەوە چوو بۆ لای لە پەنای دانیشـــت و بە زمانێکی خۆشـــەوە گوتی: «گەورەم ئەوە بۆ دوورەپەرێزی دەکەی و نایەی بۆ لام. قســـەم لەگەڵ ناکەی. ئەگەر تۆش نەیەی من بۆخۆم دێم بۆ لات.» وەزیر گوتی: « شازادە من خزمەتکار و کەمترین نۆکەری تۆم. ئەمن خۆم بە خەجاڵەتی تۆ دەزانم بۆیە قسە ناکەم.» شازادە گوتی: «ئەو قسانە وەلانێ، شەڕاب و بادە بێنە گۆڕێ.» وەزیر لەڕێوە بانگی کەنیز و کۆیلەکانی کرد خواردن بێنن. کەنیزەکان خوانیان ڕاخســت و خۆش و بەتامترین خواردنەکانیان لە سەر ڕیز کرد. شازادە دەستی کێشا هەر پاروویەکی خوارد و پاروویەکی لە دمی وەزیر خســـت و دمی ماچ کرد. کاتێک خواردنەکەیان خوارد. کەنیزەکان سفرەکەیان کۆ کردەوە و شەڕابیان هێنا. شازادە دەستی دا پیاڵەی و شەرابی دایە ئەوەندەی دایە هەتا وەزیر تەواو مەســـت و ســـەرخۆش بوو. شـــازادە بە پەنایەکدا کلۆیەک بەنگی مەغریبی دەرهێنا و لە پیاڵەکەی خســـت و بە شـــەرابەوە دەرخواردی دا. وەزیر هۆشـــی لە لای نەمابوو، پیاڵەی لێ وەرگرت و بە ســـەرییەوە نا. هێشـــتا تەواو لە گەرووی نەچووبووە خوارێ کە وەک مردوو بە لادا هات و کەوت. شازادە ئەوجار هەستا و دوو خورجێنی تۆشـــەی ڕێگا و شـــتی بە کێش ســـووک و بە نرخ گرانی لەگەڵ چەک و چۆڵی شـــەڕیی و جلوبەرگی بـاش و شـــکۆداری بۆ خۆیی و نوورەددین هەرگرت و خوجێنەکانی بە شانیدا دا و چوو بۆ لای نوورەددین.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و نەوەدەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! نوورەددین لە دەروازەی شـــار لغاوی ئەســـپەکانی بە دەســـتەوە چاوەڕێی شازادە بوو کە خەو بە سەریدا زاڵ دەبێ و خەوی لێ دەکەوێ.

لەو جەنگەیەدا پادشـــاکان زێڕ و ماڵێکی زۆریان دیاری کردبوو بۆ جەردە و ڕێگرەکان هەتا هەردووک یان یەکێک لەو ئەســـپانە بدزن و بۆیان بەرن. کۆیلەیەک لەو کۆیلانە کە هاتبوو بۆ دزینی ئەسپەکان لە مێژ بوو بە دواوەیان بوو. بەڵام چونکە تا ئێستا لە تەویلەی پادشـادا بوون نەدەدزران. بەڵام ئێستا کە دابوونی بە وەزیر و بردبوویانە تەویلەی وەزیر خۆی لێ خۆش کردبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی بە حەزرەتی مەسیح ئەوجار دەیاندزم. وا بوو هەر ئەو شەوە چوو بۆ سەر تەویلەکەی وەزیر کەچی سەیری کرد، ئەسپەکان لەوێ نین. هاتە دەرێ و هەر ئاوا دەگەڕا و چاوی دەگێڕا هەتا لە پڕ چاوی بە ئەسپەکان کەوت لە کن دەروازی شـــار بوون. کە چووە پێشـــێ چاوی لێ کرد، ئەوە لغاوەکانیان بە دەســـت کوڕێکەوەیە و ئەویش لەوێ دانیشـتووە و خەوی لێ کەوتووە. کۆیلەکەش ئارام ڕێشـمە و شـتەکەی لە ســەری ئەســپەکان داماڵی و ســواری یەکیان بوو. هەر کە ســوار بوو لەو جەنگەیەدا شـــازادەش گەیشـــتێ وەیزانی ئەوە نوورەددینە خێر توورەکەیەکیانی دا بەو و بۆخۆشـــی ســـواری ئەســـپەکەی دیکە بوو. لە دەروازە چوونە دەرێ و ڕۆیشـــتن. کۆیلەکە متەقی لێ نەهات و شـــازادە هێند بە پەلە بوو، ســـەرنجی نەدایە. لە ڕێگادا لێی پرســـی: «نوورەددین ئەوە بۆ هیچ ناڵێی؟» دزە لێی تووڕە بوو، گوتی: «بێدەنگ بە کەنیزۆک ئەوە دەڵێی چی؟» شازادە کە گوێی لە دەنگی ناخۆشی دزە بوو. دونیای لە بەر چاو تاریک بوو. لێی پرسی: «شێخی وەچەی حام ناوت چییە؟»کابرا وەڵامی داوە: «ئەمن ناوم مەسعوودە و ئەســپ دزم.» ئیدی شــازادە دەنگی نەکرد و هەڵیکێشــا شــیر و لەوێ دوو لەتی کرد و گەڕاوە بۆ لای نوورەددین. سەیری کرد ئەوە نوورەددین لە حەوت سالان ڕاست بووەتەوە و لەوێ خەوی لێ کەوتووە. هەوسار و لغاوەکانیشی بە دەستەوە بوو. شازادە لە ئەسپەکە دابەزی و چوو نوورەددینی هەستاند. نوورەدین کە هەستا حەپەسا و لە شازادەی پرسی: «ئەوە شوکوور بە سلامەت هاتی؟» شازادە گوتی: «هەستە سواری ئەسپەکەت بەو هیچ مەڵێ.» نوورەددین هەستا سواری ئەسپێکیان بوو، شازادەش سواری ئەوی دیکەیان بوو. لە شـــار هاتنە دەرێ و ئەســـپیان تاو دا. ماوەیک ڕۆیشـــتن. لەوێ شـــازادە بە نوورەددینی گوت: «ئاخر پێم نەگوتی نەخەوی هەرکەس بخەوێ قەت بە هیچ کوێ ناگات.» نوورەددین گوتی: «شـازادە کە ئەسپەکانم هێنا ئەوێ، کەمێک دڵم حەساوە و خەوم لێ کەوت. بۆ چی بووە؟» شـــازادە بۆی گێڕاوە چی بووە. نوورەددین شـــوکری خودای کرد. هەر ئاوا تیژ ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە لای تەرمی کابرا کوژراوەکە. شـازادە بە نوورەددینی گوت دابەزە

ئەو شیر و شتەی لێ کەوە. نوورەددین سەیری کرد کۆیلەیەکی وەک دێو لەوێ کەوتبوو. نوورەددین گوتی: «ئەمن ناتوانم دابەزم بچم بۆ لای.» ئیدی شـــازادە بۆخۆی دابەزی و چوو چەک و چۆڵەکەی لێ کردەوە. نوورەددین دەستخۆشی لە شازادە کرد و ئەو شەوە هەتا تاوهەلاتی بەیانی یەک تەکان ڕۆیشتن. گەیشتنە چیمەن و سەوزاییەک وەک شاعیر دەڵێ:

گژوگیای ســـەوزی ئەو ناوە، وەک فەرش و حەریری دیبا
لە سەر تا خوار ڕاخراوە ، کەروێشکەی پێ دەکاتــــــــن با
دارودرەخت ڕیز وێستاون، هەموو سەرسەوز و تـــێراون
لک و پۆپیان خۆی کێشاوە، مـــــــــیوە لە ئاو هەڵمساون
ئاو هەڵدەقوڵێ لە کانی، سەرەوخوار دەکەوێـــــــــتە ڕێ
گەر تاوێ دانیشی لەوێ، چی خەمـــــــــی دڵتە، دەڕەوێ
ســـەر ســـووڕ دەمێنێ. هەر گوڵی، ڕەنگاوڕەنگە خۆ دەنوێنێ
لە ناکاو مەلێک دەخوێنێ، هەر دەڵـــــــــێی دڵ دەڕفێنێ
بەو هەوا خۆشە سیـــــــــیەکان شاگەشکە دەبن، خۆشیانە
پێستی لەش ئۆخژنی دێـــــــــتێ، بەو هەوا نەرم و نیانە

نوورەددین و شازادە لەو چیمەن و سەوزاییە لایان دا کەمێک بحەسێنەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شازادە مریەم و نوورەددین لەو مێرگ و سەوزاییە لایان دا. میوە و شتیان خوارد و لە جۆگەلەکان تێریان ئاو خواردەوە. ئەسپەکانیان بەرەڵا کرد. بلەوەڕێن و بۆخۆشیان دانیشتن و دەستیان کرد بە قسەکردن. هەرکەسەی خەریکی گێڕانەوەی بەسەرهاتی تاڵی خۆی بوو کە لە دوور تەپوتۆزێک هەستا. بەری ئاسمانی گرت. حیلەی ئەسپ و چیرەی رێک خشانی چەکانیان دەگەیشتە نۆ تەبەقەی ئاسمان. ئەوە، شەوی رابردوو کە شەوی زاوایەتی وەزیر بوو، لە ناو ئەواندا باو بوو. کە هەر پادشایەک کچەکەی بە مێرد دابا دەبوو بۆ بەیانی بچێ سەری کچەکەی بدا. پادشاش بەیانی کە دەچێ سەری مریەم بدا سەیر دەکا، ئەوە وەزیر لە دیوەکەی یەکی مەیدان درێژ بووە و بێهۆش کەوتووە. لەڕێوە داوا دەکا، کەمێک سرکە و کندر[1] لێک دەدا و لە لووتی وەزیری دەکا. وەزیر لە رێوە دەپشمێ و هێلنج دەدا و بەنگەکە دێنێتەوە. وەزیر دێتەوە سەر خۆ و هەڵدەستێ دادەنیشێ. پادشا هەواڵی وەزیر و کچەکەی خۆی دەپرسێ. وەزیر وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: «ئەمن بە هەواڵی نازانم. هەر ئەوەندە دەزانم دوێشەو پێکەوە زۆرمان شەراب خواردەوە. دەبێ من بێهۆش بووبم. چونکە تا ئێستا ئاگام لە هیچ نەبووە.» پادشا کە ئەوەی بیست هەرد و ئاسمانی لە بەر چاو تاریک بوو. هەڵی کێشا شیر و وەزیری دوو قاش کرد. دوای ئەوە بە مەیتەر و شتەکەی گوت: «دوو ئەسپەکەم بۆ بێنن.» چوون خزمەتکاری تەویلەیان هێنا. ئەویش گوتی: «پاشام، لە شەوێوە سەرۆکی تەویلە لەگەڵ ئەسپەکان دیار نییە. بەیانی کە چوومە تەویلە دەرگاکە دانەخرابوو.» پاشا گوتی: «بە دینم دزینی ئەو ئەسپانە هەر کاری کچەکەی خۆمە کە لەگەڵ خزمەتکارەکەی کلیسا ڕۆیشتووە. جاری پێشووش هەر ئەو کچەکەی منی بردبوو. ئەمن ناسیمەوە ویستم بیکوژم کەچی ئەو وەزیرە تەکچاوە نەیهێشت. ئەوە ئەویش شوکوور بە سزای خۆی گەیشت.»

دوای ئەوە پاشا بانگی سێ کوڕەکەی خۆی کرد کە هەر یەکەی تاقانەی رۆژگاری خۆیان بوون. هەر یەکەیان بارە تەقای هەزار سەرباز دەبوو، لە شەڕە نێزەدا. پێی گوتن سوار بن و کەوتنە دوای شازادە و نوورەددین و لەو مێرگ و سەوزاییە گرتیاننەوە.

کاتێک شازادە ئەو سوارانەی دیت، دەستی دا شیر و بۆیان سوار بوو. لە نوورەددینی پرسی: «خۆڕاگریت لە شەڕدا چۆنە؟» نوورەددین وەڵامی داوە: «خۆڕاگری من وەک ئەو بزمارەم کە لە هەویری ڕۆ کەی دەنوشتێتەوە. لە ئازا و چەلەنگیشدا وەک ئەو کەسەم کە شاعیر دەڵێ:

[1]. جیوەی دارێکی درکاوییە.

ئەو، پیاوی شەڕ و کـــــــــێشە نییە و ملبادان
پشـــت لە بەدخواز و دوژمن دەکا لە ترســـان
ڕوو بە دوژمن و نەیار، نـــــــــــەرم و نیانە
لە ئاســـت کەنەفت و داماو شـــێری مەیدانە

مریەم کە ئەو شـیعرەی لە نوورەددین بیسـت، بزەیەکی هاتێ و گوتی: «گەورەم ئەتۆ، لە جێی خۆت مەبزوو. ئەمن ناهێڵم کەس بێ بە لاتەوە. ئەگەر بە قەد ئەستێرەی ئاسمانیش بن. لە ڕێوە شـاژن لغاوی بەر دا و بە نوورەددینی گوت: «ئەتۆش سـوار بە و بە دووەمدا وەرە ئەگەر ناچار بووین لە بەریشیان هەڵێین ئەوە خۆت توند بگرە بەر نەبییەوە.»

کاتێک پادشـا کچەکەی خۆی دیت، ناسـییەوە. ڕووی لە کوڕە گەورەکەی کرد و گوتی: «بەرتووت، ئەوە خوشـــکی تۆیە، بەرەنگارمان دەبێتەوە. ئەتۆ بۆی بچووە پێشـــێ. ئەگەر بەزاندت ئەوە چۆنت پێخۆشە بیکوژە. لەڕێوە بەرتووت بۆی چوو. پێی گوت: «مریەم ئەوە پشتت لە دینی باب و باپیرانت کردووە و بووی بە موسوڵمان؟ بە حەزرەتی مەسیح ئەگەر بێتوو پاشـگەز نەبییەوە بە خرابترین شـێوە دەتکوژم.» مریەم بە قسـەی براکەی پێکەنی و گوتی: «قەسەم بە خودا قەت لە دینی محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا پەشیمان نابمەوە، ئەگەر پیاڵەی ژەهریش هەڵدەم.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی هەشتسەد و نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک بەرتووت گوێی لەو قسەیەی مریەم بوو، تووڕە بوو. پەلاماری دایە و ئاوری شەڕ لە نێوانیاندا بلێسەی سەند. هەتا درەنگانێک مریەم بەو شارەزاییەی لە شەڕدا بووی بەرپەرچی هێرشەکانی بەرتووتی دەداوە. هەتا وای لێ هات، بەرتووت تەواو ماندوو و شەکەت بوو. ئەوجار مریەم شیرێکی داهێنایە و لە سەر هەتا خوار دوو قاشی کرد. دوای ئەوە هات و چوو، داوای شەڕکەری کرد.

کاتێک پادشا کوڕە گەورەکەی بە کوژراوی دیت، بە چەپۆک بە سەری خۆیدا دا و دەستی کرد بە شین و گریان. بە کوڕە نێونجییەکەی گوت: «بەرتووس، بۆ خوشکت بڕۆ مەیدان و تۆڵەی براکەت بکەوە. ئەو بە دیل بگرە و بیهێنە بۆ لای خۆم.» بەرتووس چوو بۆ شەڕ. شەڕێکی قورستر لە جارێ پێشوو لە نێوان ئەو و شازادەدا هاتە گۆڕێ. بەرتووس دەیزانی دەرەقەتی نایە بەڵام نەشیدەتوانی لە بەری هەڵێ. وا بوو شازادە شیرێکی لە ملی دا. سەری وەک گۆ فڕکەی کرد. شازادە سمکۆڵانی بە ئەسپەکەی کرد و داوای شەڕکەری کرد. پادشا بە دڵێکی بە ژان و پڕ لە کەسەرەوە بانگی کوڕی سێیەمینی کرد: «فەسیان بڕۆ بۆ جەستەی خوشکت و تۆڵەی براکانتی لێ بکەوە.» فەسیان هێرشی بۆ خوشکی برد. شازادە بۆی چوو و پێی گوت: «ئەی دوژمنی خودا، ئێستا تۆش بنێرم بۆ لای براکانت؟» ئیدی شمشیرێکی داهێنایێ هەردووک باڵی ڕاهێنا و ناردی بۆ لای براکانی.

کاتێک سەرهەنگ و پاڵەوانەکان دیتیان هەر سێک کوڕەکەی پادشا کوژران زراڤیان چوو. لە ترسی شازادە هەموو ڕایان کرد. کاتێک پادشا زانی ئەوە کوڕەکانی کوژران و لەشکرەکەی شکستی خوارد، لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەگەر بۆخۆشم بچمە شەڕی شازادە منیش دەکوژێ. وا چاکە هەر لێی گەڕێم. ئیدی سەری ئەسپەکەی وەرگێڕا و گەڕاوە. چوو لە کۆشکەکەی خۆی دانیشت. گەورەگەورەکانی دەوڵەتی بانگ کرد و باسی کچەکەی بۆ گێڕانەوە. پیاوەکانی دەوڵەت داوایان لێ کرد، نامەیەک بۆ هاروونەڕەشید بنووسێ و لەو بابەتەی ئاگادار کاتەوە. پادشا ڕاوێژەی ئەوانی بە هێند گرت و نامەیەکی ئاوای بۆ هاروونەڕەشید نووسی: «ئێمە کچێکمان هەیە ناوی مریەم زوننارە و یەکێک لە دیلە موسوڵمانەکان بە نێوی نوورەددین میسری هەڵی خەڵەتاندووە و شەو بردوویەتە دەرێ و بردوویە بۆ شارەکەی خۆیان. تکا لە خەلیفە دەکەم کە کچەکەی من بە کەسێکی جێی باوەڕ بسپێری و بۆم بنێرییەوە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی هەشتسەد و نەوەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پاشای فەڕەنگیان داوای مریەمی کچی، لە هاڕوونەڕڕەشید کردەوە و دوای ئەوە نووسی: «ئەگەر کچەکەم بۆ بنێرییەوە منیش لە بەرابەر ئەو چاکەیەی تۆ دا. نیوەی وڵاتی ڕۆمت دەدەمێ و پیتاکەکەیت بۆ دەنێرم هەتا لە وێ مزگەوت و شتی پێ دروست کەی.» پادشا کە نامەکەی تەواو کرد بە وەزیرە تازەکەی کە لە جێگای وەزیر تەکچاوی دانابوو، گوت: «ئەو نامەیە مۆر و واژۆ بکە. با گەورەکانی دەوڵەتیش واژۆی بکەن.» بە وەزیریشی گوت: «ئەگەر بێتوو کچەکەم بۆ بێنییەوە ئەو وڵاتەت بە خەڵات دەدەمێ. دوای ئەوە نامەکەی دا دەست وەزیر. وەزیر لەڕێوە وەڕێ کەوت و بە دەشت و دەر و شاخ و کێودا ڕۆیشت هەتا گەیشتە بەغدا. سێ ڕۆژان لە شوێنێک ماوە تا تەواو حەساوە و پاشان چوو بۆ کۆشکی هاڕوونەڕڕەشید. ڕوخسەتی خواست و چوو بو دیمانەتی و لاشیپانی دەرکی دیوەکەی ماچ کرد. ئینجا نووسراوەکەی پادشای فەڕەنگیانی دایە و دیارییەکانیشی دا خزمەتی. خەلیفە کاتێک نامەکەی خوێندەوە، بانگی وەزیرەکەی کرد و پێی گوت: «نامە بنووسە بۆ تەواوی وڵاتە موسڵمانەکان و ئاگاداریان کەوە کە هەرکەس دوو کەسی بە ناوەکانی مریەم و نوورەددینی دیت بیانگرێ و بیانهێنێ بۆ لا خەلیفە. وریا بن کەس لەوبارەوە کەمترخەمی یان دەغەڵی نەکا دەنا سزا دەدرێ.» ئینج تەواوی نامەکان مۆر کران و ناردرا بۆ هەموو ناوچە و دەڤەرێکی وڵاتانی موسوڵمان و دەست کرا بە گەڕان و سۆراغی مریەم و نوورەددین.

نوورەددین و مریەم زوننناریش دوای کوشتنی کوڕەکانی پادشای فەڕەنگ و تێکشانی پادشا، گەڕانەوە و بەرەو شام ڕۆیشتن. هەتا گەیشتنە دیمشق. ڕاسپادەکانی خەلیفە ڕۆژێک پێش ئەوان چووبوونە ئەوێ و نامە و فەرمانەکەی خەلیفەیان بە میری دیمشق ڕاگەیاندبوو. کاتێک نوورەددین و مریەم چوونە ناو دیمشقەوە، خێرا لە لایەن سیخوڕانی دەوڵەتەوە گیران و بردرانە لای میری دیمشق. میر ئەوانی نارد بۆ شاری بەغدا. کە بردیاننە بەغدا و هەنتەشی خەلیفە. کڕنۆشیان برد و گوتیان: « مەزن خەلیفەی موسوڵمانان، ئەوە مریەمی زوننارە کچی پادشای فەڕەنگ و ئەوەش نوورەددین کوڕی تاجەددینی بازرگانی میسرە کە کاتێک هاتنە ناو دیمشقەوە قۆڵبەستمان کردن و هێنامانە خزمەتتان.» ئینجا مریەم دۆعای سەرکەوتن و ڕاوەستانی بۆ خەلیفە و دەسەڵات و بەختەوەربوونیان کرد و پاڕاوە لە نەهاتی و ڕۆژی ڕەش بە دوور بێ. خەلیفە چاوێکی لی کرد. دیتی کچێکی جوان و دەلال و لەبەردلانە. سەری لە شێوازی ئاخاوتن و جوانوێژییەکەی سووڕ ما. لێی پرسی: «مریەمی زوننارییە کچی پادشای فەڕەنگ تۆی؟» مریەم وەلامی داوە: «بەڵێ ئەی ئیمامی یەکتاپەرستان و بنامۆزای سەروەری پێغەمبەران.»

ئەوجـار خەلیفە ڕووی لە عەلی نوورەددین کرد. ســـەیری کرد خورتێکی جوانچـاک و ڕێکوپێک و لەبەردڵانە. ئەی عەلی نوورەددین کوڕی تاجەددینی بازرگانیش تۆی؟» عەلی وەڵامی داوە: «بەڵێ گەورەم.» خەلیفە لێی پرســـی: «ئەو کچەت بۆ لە پادشـــای فەرەنگ ڕفاندووە و چۆن هەڵاتی؟» عەلی نوورەددین بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ خەلیفە گێڕاوە. کاتێک قسـەکانی تەواو بوو، خەلیفە سـەری سـوورِ ما و گوتی: «پیاوان لە پیناو ژناندا چەندە چەرمەسەی دەبینن.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و نەوەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خەلیفە سەری لە بەسەرهاتی نوورەددین سوور ما و ڕووی لە شازادە کرد و گوتی: «شازادە ئەوە باوکت نامەیکی بۆ ناردووم و داوای تۆی کردووەتەوە. ئەتۆ دەڵێی چی؟» مریەم لە بەرسڤدا گوتی: «ئەی خەلیفەی گۆی زەوی و ئەی پەرەپێدەری ڕێبازی پێغەمبەر، خودا خێر و بێرت زیاد کات و شەڕ و نەهاتیت لێ بە دوور کا. ئەتۆ خەلیفە خودای و منیش هاتوومەتە سەر دینی ئێوە، لێرەدا گوتی: «اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمد رسول الله» جا ئێستا ئەگەر تۆ ڕازی نامەی کافران قەبووڵ بکەی و ئەمن بنێرییەوە بەر دەستی ئەو کافرانە، ئەوە ئەمن لە ڕۆژی قیامەتدا لە لای ئامۆزاکەت شکایەتت لێ دەکەم.» خەلیفە کاتێک گوێی لەو قسانەی شازادە بوو گوتی: «پەنا بە خودا. ئەمن چۆن کاری ئاوا دەکەم. چۆن ئەمن ژنێک کە باوەڕی بە گەورەیی و تاقانەیی خودا هێناوە، دەنێرمەوە بەر دەستی کافران. ئێستا کە تۆ موسوڵمانی پاراستنی تۆ فەرزە و ئەرکی سەرشانی ئێمەیە. ئەگەر لەو ڕێگایەشدا بە قەد گەڵای داران و خیزی بێروون زێر و زێو و جەوهێراتمان بچێ. تۆ نیگەران مەبە و هیچی خراپت بە سەر نایە.» ئینجا لێی پرسی: «گەلۆ تۆ بەوە ڕازی ئەو لاوە میسرییە مێردی تۆ بێ؟» مریەم وڵامی داوە: «چۆن ڕازی نابم ئەو منی بە ماڵی خۆی کڕیوە و لەبەر من دەیان جار خۆی خستووەتە مەترسییەوە.»

ئەوجار خەلیفە قازی و شایەدی بانگ کرد و بۆخۆی مارەییەکەی دایە و مریەمی لە عەلی نوورەددین مارە کرد. پاشان ڕووی لە وەزیری پاشای ڕووم کرد و گوتی: «قسەکانی مریەمت بیست یان نا؟ دەی چۆن دەتوانم موسوڵمانێک بنێرمە بەر دەستی کافران بە تایبەت ئەوە کوڕەکانی ئەوی کوشتووە. هاتوو پادشا خراپەی لەگەڵ بکا و لە ڕۆژی پەسڵان ئەو یەخەی من بگرێتەوە. ئێستا تۆ بگەڕێوە بۆ لای پادشاکەت و پێی بڵێ ئەو فکرە لە سەری بەرێتە دەرێ و بە تەمای شتی وا نەبێ.» وەزیرەکە گەوج و کەرەپیاو و لەخۆبایی بوو، گوتی بە حەزرەتی مەسیح هەتا مریەم نەبەمەوە ناڕۆمەوە. لەڕێوە خەلیفە فەرمانی کوشتنی ئەو گڵاوەی دا. مریەم گوتی: «خەلیفە ئێوە شیری خۆتان بە خوێنی ئەو گڵاو مەکەن.» ئیدی شیرەکەی دەرهێنا و دوو لەتی کرد. خەلیفە کە ئەو هێز و چالاکییەی مریەمی دیت واقی وڕ ما و کەوایەکی شکۆداری بە شانی نوورەددیندا دا و کۆشکێکی جیای بۆ ئەو و شازادە مریەم دروست کرد. فەرش و دەفری گرانبایی دانێ و ئیدی تا ماوەیەکی زۆر لە بەغدا مانەوە و بە خێر و خۆشی ژیان. دوای ئەوە نوورەددین بیری دایک و بابی کرد. ڕوخسەتی لە خەلیفە وەرگرت بچێ بۆ سەفەر. خەلیفە ڕێی دا بچێ و دیارییەکی گەورە و گرانیشی لەگەڵ خست و فەرمانی دا بەڵگەی بەڕێوەبەرایەتی میسر بە

نێوی نوورەددینەوە بنووسن.

کاتێک دایک و باوکی هەواڵی هاتنەوەی نوورەددینیان بۆ میسر بیست، لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوون. بازرگانانی دەوڵەتی بەرەو پیلی چوون و نوورەددینیان بە شکۆیەکی تایبەتەوە هێناوە ناو شار. نوورەددین چاوی بە دایک و باوکی کەوتەوە و زۆر زۆر خۆشحاڵ بوون و خەمیان لە دڵیدا نەما. بازرگان و گەورەگەورەکان دیارییەکی زۆریان بۆ هێنا. ئیدی لەمەودوا بە بەختەوەری و کامەرانی ژیان. هەتا تێکدەری خۆشی و ئارامی، ویرانکەری ئاوەدانی و ئاوەدانکەرەوەی گۆڕستان لێکی هەڵاواردن. هەر خودایە مەرگ بەرببینگی پێ ناگرێ.

## چیرۆکی ئاکامی چاکە و خۆپارێزی

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە میرشوجاعەددین محەممەد، لە دایک بووی قاهیرە گێڕاوییەتەوە کە: ئێمە شەوێک لە شەوان میوانی کابرایەکی خەڵکی سەعید بووین. ئەو کابرایە زۆری ڕێز لێ گرتین و ئەوەندەی لە دەستی هات میوانداری کردین. کابرا پیاوێکی رەشتاڵە بوو. دوو منداڵی بوو، سپیکەڵە. ئێمە بە کابرامان گوت: ئەوە چۆنە بۆخۆت ئاوا رەشی و ئەو منداڵانەت پێستیان سپییە؟ ئەو کابرایە گوتی: «دایکی ئەو منداڵانەم لە شارێکی فەرەنگەوە هێناوە. ئەوەش بەسەرهاتێکی دوورودرێژە.» گوتمان بۆمان بگێڕەوە. ئەو کابرایە گوتی: «ئەمن لێرە هەڵاوەم چاندبوو. وا بوو درووممەوە و چنیم. پێنجسەد دینارم لەو کارەدا خەرج کرد. کاتێک ویستم بیفرۆشم لەو پارەیەی خەرجم کردبوو، زیاتریان نەدەدامێ. یەکێک پێی گوتم، ببیە بۆ شاری عەکا. لەوێ پارەی باشت دەدەنێ و سوودی چاکی لێ دەکەی. شای عەکاش ئەو کات لە دەست فەرەنگیاندا بوو. ئەمن جاوەکەم برد، بۆ شاری عەکا و بەشێکیم بە وادەی شەش مانگ فرۆشت. ئەو جەنگەیەی کە من خەریکی فرۆشی جاوەکەم بووم. ژنێکی ئەو فەرەنگیانە هەر وەک بۆخۆتان دەازنن ئەوان خوویان بەو ڕووبەند و شتەوە نییە. بێ ڕووبەند هاتە بازاڕ و ویستی جاوم لێ بکڕێ. ئەمن کە جوانی و شەنگ و شۆخی ژنەم دیت، هۆشم لە لای خۆم نەما و کەمێکم جاو زۆر بە نرخێکی هەرزان دایە. ژنە جاوەکەی لێ وەرگرتم و ڕۆیشت. دوای چەند ڕۆژی دیکە هاتەوە و کەمێکی جاوی دیکە لە جاری پێشوو هەرزانتر لێ کڕیم. ئیدی ئەو ژنە بەردەوام هات و جاوی لێ کڕیم. هەستی کردبوو کە من خۆشم دەوێ. ژنە هەموو جارێک پیرێژنێکیشی لەگەڵ خۆی دێنا. ڕۆژێک بە پیرێژنەم گوت: «ئەمن گیرۆدەی خۆشەویستی ئەو دڵبەرە بووم. گەلۆ دەتوانی کارێک بکەی پێکمان بگەیەنی؟» پیرێژنە گوتی: «بەڵێ دەتوانم بەڵام نابێ ئەو شتە لە بەینی من و تۆ و ئەو بچێتە دەرێ. لەگەڵ

ئەوەشـــدا ماڵت دەچێ.» ئەمن بە پیرێژنەم گوت: «ئەگەر لە ڕێی ئەودا گیانیش دانێم هەر کەمە.»

ئەڤینم هێندە پەرکـــــــــــــێشە، سەر و گیانم فیدا دەکا
مـاڵ و ســـــامـان هەر هیچ نییە، هەمووی لە ڕێی ئەودا دەدا

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو کابرایە گێڕایەوە کە پەنجا دیناری دا بە پیرێژنە. پیرێژنە زێڕەکانی وەرگرت و پێی گوت: «شوێنێک ببینەوە ئەو شەو گراوەکەت بۆ دێنمە ئەوێ.» ئەو کابرایە گێڕاوییەتەوە کە ئەمن هەستام خواردن و شەراب و شیرینی و شەوزەم کڕی و بردمەوە ماڵێ. ماڵەکەم دەیڕوانییە دەریا. مەمنا وەرزی هاوینیش بوو، ئەمن فەڕش و شتم لە سەربانی ڕاخست. پیرێژنە واشتەکەمی بۆ هێنام. دانیشتین خواردنەکەمان خوار و دەستمان کرد بە شەراب خواردنەوە. کە شەو تاریک داهات. هەر لە سەربانی خەوتین هەتا مانگ هەڵات. ئەمن دیمەنی مانگ و ئەستێرەکانم لە دەریادا دیت. لە دڵی خۆمدا بە خۆم گوت: «مەگەر تۆ شەرم لە خودا ناکەی لەگەڵ نەسرانییەک خەریکی گوناهی و خۆت تووشی ئێش و ئازاری خودا دەکەی.» ئیدی ڕووم لە ئاسمان کرد و گوتم: «خودایە ئەوە تۆ ئاگادار بە کە من ئەوشەو بە حورمەتی تۆ ئەوە کارم بەو نەسرانییە نییە.» دوای ئەوە لێی خەوت.

شەوەکی ئەو ژنە بە تووڕەیی هەستا و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵە خۆیان و ئەمنیش هەستام نوێژی بەیانیم کرد و چووم بۆ بازاڕ و دووکانم هەڵگرت. لە دووکان دانیشتبووم کە ئەو مانگڕوخسارە لەگەڵ پیرێژنە بە لامدا تێپەڕین. لە دڵی خۆمدا بە خۆم گوت: «ئەتۆش شتێکی سەیری وا ئەوەت لە کیس خۆت دا. بڵێ ئەخە تۆ کێی: سەری سەقەتی، بەشەری حافی، جۆنەیدی بەغدادی، فۆزەیلی کوڕی عیازی؟» لەڕێوە هەستام خۆم گەیاندە پیرێژنە و پێم گوت: «ئەو خانمەم بۆ بێنەوە.» پیرێژنە گوتی: «بە حەزرەتی مەسیح هەتا سەد دیناری زێڕی نەدەیەی نایە.» ئەمن سەد دیناری زێڕم بۆ بژارد. ئەو گوڵڕوخسارە جارێکی دیکە هاتەوە لام. ئەمن دیسان لە ترسی ڕۆژی پەسڵان نەموێرا خۆی لێ دەم و هەر وا بە پاکی خەوتم. شەوەکی ئەو ڕۆیشت و منیش چوومەوە شوێنەکەی خۆم. دیسان پیرێژنە و خانمەکە بە قەڵسی بە لامدا تێپەڕین. ئەوجاریش بە پیرێژنەم گوتەوە: ئەوجارەش ئەو خانمەم بۆ بێنەوە. پیرێژنە گوتی: «بە مەسیح هەر چاویشت لێ ناکا. مەگەر پێنسەد دیناری بدەیەی. ئەمن ویستم تەواوی پارەی جاوەکەی بدەمێ کە لەو جەنگەیەدا جاڕچی جاڕی دا کە موسوڵمانەکان ماوەی ئاشتییەکەی نێوانمان خەریکە تەواو دەبێ حەوتوویەکتان مۆڵەتە کارەکانتان تەواو بکەن و بڕۆنەوە بۆ شارەکانی خۆتان. ئیدی پیرێژنە ڕۆیشت و منیش دەستم کرد بە وەرگرتنی پارەی جاوەکەم و کەلوپەلی باشم کڕی و لە عەکا وەدەر کەوتم. بەڵام ئەو ژنە ببووە گرێ لە سەر دڵم. وای ئۆگر ببووم.

کورتی کەینەوە، ئەمن شەووڕۆژ ڕۆیشتم هەتا گەیشتمەوە دیمشق و کەلوپەلەکانم بە

نرخێکی گران فرۆشت و خێری چاکم کرد. بەو پارەیە دەستم کرد بە کڕین و فرۆشتنی کەنیز و کۆیلە. هەتا سێ ساڵان ئەوە کاری من بوو. تا وا بوو خودا هاتە هانای ناسرشا و تەواوی پاشاکانی فەڕەنگیان بە دیل گرت.

ڕێکەوت وا بوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان پیاوێک هات بۆ لام. کەنیزێکی دەویست بۆ ناسرشا. ئەمن کەنیزێکی زۆر جوانم هەبوو. ئەوم بە سەد دینار فرۆشت. پاشا نەوەد دیناری دامێ و خەزێنە دە دینارەکەی دیکەی تێدا نەبوو. چونکە لە شەڕی فەڕەنگیان دا خەزێنە و شت خاڵی ببوو. هەر بۆیە گوتی ئەو پیاوە بەرن دیلەکانی پێشان بدەن با کچە پادشایەک لە جێی ئەو دە دینارە هەڵگرێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی هەشتسەد و نەوەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خزمەتکارەکانی ناسرشا ئەمنیان بردە شوێنی دیلەکان. چاوم پێدا گێران لە پڕدا لە نێو دیلەکاندا چاوم بەو کیژە کەوت کە لە شاری عەکا هۆگری ببووم. ئەو ژنی یەکێک لە سەرهەنگەکانی فەرەنگ بوو. داوای ئەوم کرد و لەگەڵ خۆم بردمەوە ماڵێ. لێم پرسی: «ئەمن دەناسییەوە؟» گوتی: «نا، ناتناسم. ئەو هاوڕێیەی تۆم وا جاوت لێ کرێم و زێڕەکانت لێ ئەستاندم. پاشان پێت گوتم هەتا پێنسەد دینارم نەدەیەی ناهێڵم چاویشم لێ بکەی. ئێستا من تۆم بە دە دینار کڕیوە.» ئەو ژنە گوتی: «ئەوە لە سایەی ئەو دینەوەیە کە تۆ هەتە. ئەمنیش شایەدی دەدەم کە خودا یەکە و محەممەد (د ـ خ) نێردراوەی ئەوە. منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: «قەسەم بە خودا منیش دەستی بۆ نابەم هەتا ئازادی نەکەم و بانگی قازی نەکەم.»

ئیدی چووم بۆ لای قازی و پێم ڕاگەیاند. دوای ئەوە قازی لێی مارە کردم و جا سەر جێییم لەگەڵ کرد. وا بوو لێم دووگیان بوو. چەند ڕۆژێک دوای ئەوە دوو وڵاتەکە ئاشت بوونەوە و هاتن لە دوای دیلەکانیان. هەرکەس دیلی لە لا بوو دایەوە و کەس نەمابوو. جگە لەو ژنەی لە لای من بوو. ڕاسپاردەکان گوتیان ژنی فلانە سەرهەنگ ماوە و دەستیان کرد بە سۆراغی. کە زانیان لە لای منە، داوایان لێ کردمەوە. ئەمن بەوپەڕی پەشیمانی و نیگەرانییە هەستام چووم بۆ لای. ڕەنگم تێک چووبوو. ژنە لێی پرسیم: «ئەوە چ بووە، بۆ تێک چووی؟» گوتم: «پادشای فەرەنگ پیاوی ناردووە بە دوای دیلەکاندا و ئەتۆیان لە من دەوێتەوە.» کەچی گوتی: «مەترسە و ئەمن بەرە لای ناسرشا بۆخۆم جێبەجێی دەکەم.» بردم بۆ لای ناسرشا. ناردەی پاشای فەرەنگیش لە لای دانیشتبوو. گوتم: «پاشا ئەو ژنە لە لای من بوو. ناسرشا لە لای ناردەکە لێی پرسی: «پێت خۆشە بچییەوە وڵاتی خۆتان یان لە لای مێردەکەت دەمێنییەوە؟» ژنە گوتی: «پاشا من موسوڵمان بووم و لە مێردە موسوڵمانەکەشم دوو گیانم.» پاشا گوتی: «تۆ ئەو موسوڵمانەت خۆشتر دەوێ یان مێردەکەی پێشووت فلان سەرهەنگ؟» ژنە قسەکەی پێشووی کردەوە. پاشا بە ناردەکانی گوت: «گەلۆ گوێتان لێ بوو، ئەو ژنە چی گوت.» ناردراوەکان گوتیان: «بەڵێ.» ئینجا گەوەری سەرۆک ڕاسپاردراوەکان بە منی گوت: «ئەتۆ ژنی خۆت بەرە و بڕۆ بە دوای کاری خۆتدا.» ئەمن دەستی ژنەکەم گرت و هاتمە دەرێ. دوای ئەوە کەسێکی نارد لە دوام و منیش چوومەوە لای سەرۆکی ناردراوەکان. کەچی پێی گوتم دایکی ئەو ژنە ئەمانەتێکی بۆ ئەو ژنە ناردووە ها بۆخۆت بۆی بەرە. لەڕێوە سندووقێکی هێنا و دای بە من. ئەمن سندووقەکەم لێ وەرگرت و هێنامەوە ماڵێ. کە سندووقەکەی کردەوە کراسی حەریر و دیبا و دوو توورەکە زێڕیشی تێدا بوو. سپاسی خودام کرد و ئەو منداڵانە لەو ژنەن و

ئێستاش ماوە و ئەو چێشتە دەستاوی ئەوە.» ئێمە زۆرمان بەلاوە سەرنج ڕاکێش بوو. هەر خودا بۆخۆی دەزانێ چی دەکا.

### بەسەرهاتی ئەڤینداری پاک و ڕاستوێژ

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوە بوو کە لە زەمانی زوودا لاوێک لە بەغدا بوو. لە وەچەی گەورەمالان کە باوکی ماڵێکی زۆری بۆ بە جێ هێشتبوو. دڵی چووبووە کەنیزێک و ئەویش حەزی لەو دەکرد. ئەو کوڕە کەنیزەکەی کڕی. بەردەوام لە ڕێی ئەو کەنیزەیدا ماڵەکەی خەرج دەکرد هەتا وا بوو تەواوی ماڵەکەی لە دەست بووە و چی بۆ خواردنیش نەما. ئەو کوڕە کاتێک لە ئێستا گەنجتر بوو، دەچووە کوڕی دەوڵەمەندەکان، کە باسی کار و کاسبی و شتیان دەکرد. ڕێگای دەوڵەمەندبوونیان دەستنیشان دەکرد. هەر بۆیە لە کاسبی و بازرگانی و شتەدا زۆر شارەزا بوو. ڕۆژێک لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی ڕاوێژی کرد. گوتیان ئێمە هیچ ڕێگایەکی وامان پێ شک نایە تۆ و خێزانت بیکەن و بژیوی خۆتانی پێ پەیدا بکەن و دەوڵەمەند بن. ئەو کوڕە و کەنیزەکەی قسەکەی ئەوانیان زۆر پێ ناخۆش بوو. کەنیزەکە بە کابرای گوت: «ئەمن ڕێگەیەکی باشم پێ شک دێ.» کوڕە لێی پرسی: «چ ڕێیەک؟» کەنیزە گوتی: «ئەمن بفرۆشە با لەو سەختییە ڕزگارمان بێ، بەشکوو من بتوانم کارێک بکەم بێمەوە بۆ لای تۆ.» کوڕە بە قسەی کرد و بردی بۆ بازاڕ. یەکەم کەس کە داواکاری بوو، پیاوێکی هۆزی هاشم بوو. ئەو پیاوە وێژەڤان و قسەخۆش و بە دڵ و دەروون بوو. کەنیزەی بە هەزار و پێنسەد دینار کڕی. خاوەن کەنیزە گێڕاوییەتەوە کە هەر کە پارەکەم وەرگرت. هێند ناڕەحەت بووم منیش و کەنیزەکەش دەستمان کرد بە گریان. ئەمن پەشیمان بوومەوە لە بەری پاڕامەوە کەنیزەکەم بداتەوە و سەوداکە هەڵوەشێنێتەوە. کابرا ڕازی نەبوو. ئەمن زێڕەکانم لە توورەکەیەک کرد. نەمدەزانی ڕوو لە کوێ کەم و بچم بۆ کوێ. نەمدەتوانی بچمەوە ماڵێ چونکە ئەوی تێدا نەمابوو. چاوم بەرایی نەدەدا. ناچار چوومە مزگەوتێک و دانیشتم و دەستم کرد بە گریان. تورەکە زێڕەکەم خستە بن سەرمەوە و لێی خەوتم. کەسێک هاتبوو زێڕەکەی لە بن سەرم دەرهێنابوو. وەخەبەر نەهاتبووم. کاتێک خەبەرم بووەوە و هەنبانەکەم نەمابوو ویستم دەرپەڕم سۆراغی بکەم. کەچی تەماشا دەکەم لاقیشم بەستراوە. دیسان هێند ناڕەحەت بووم بە چەپۆک بە سەری خۆمدا دا و دەستم کرد بە گریان.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتسەد و نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! که توورەکەکەم لە دەســت چوو، ئیدی لە ڕادەبەردە تێک چووم و پەرۆش بووم. هەستام چووم خۆم لە دیجلە هاویشت. هەنتەشیان پێیان زانیم و زانیان لە بەر نارەحەتیان خۆم تێ هاویشــتووە. مەلەوانیان ئاگادار کردەوە و هاتن دەریان هێنامەوە. لێیان پرســیم: ئەوە چ بووە و بۆ وات کرد؟ منیش بەســەرهاتی خۆم بۆ گێڕانەوە. زۆریان خەمی من بوو. وا بوو، کابرایەک هاتە پێشــێ و پێی گوتم: «ئەتۆ کە ماڵەکەت چووە چۆن کارێک دەکەی ئەو دونیاشــت بچێ و هەتا هەتا لە دۆزەخدا بمێنییەوە. هەســتە ماڵەکەتم پێشــان بدە. هەســتام لەگەڵی کەوتمە ڕێ و تا گەیشــتینەوە ماڵەکەی من. کابرا ماوەیەک لە لای من دانیشــت و دڵخۆشــی دامەوە و کەمێک ئارام بوومەوە. دوای ئەوە کابرا هەســتا ڕۆیشت.من ویستم خۆم بکوژم، بەڵام بیرم لە ڕۆژی پەسڵان و زیندووبوونەوە کردەوە و بە ســەر خۆمدا زاڵ بووم. ئیدی هەســتام لە ماڵ هاتمەوە دەرێ. چووم بۆ لای یەکێک لە هاورێکانم و ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە. ئەویش زۆری خەم بووم. دەســتی کرد بە گریان و پاشــان پەنجا دیناری دامێ و گوتی: «بەو زێڕانە کەمێک تۆشــە بکڕە و لە بەغدا بچووە دەرێ با کەمێک خەمت لە ســەر ســووک بێ. ئەتۆ ســەوادت هەیە و دەزانی بنووســی و بخوێنییەوە پەنا بۆ پاشــایەک شــتێک بەرە بەشــکوو خودا فریات کەوێ و لە پەنا ئەواندا بتوانی بە کەنیزەکەشــت شــاد بییەوە. بە گوێم کرد و هەڵوێســتم گرت بڕۆم بۆ ناوچەی واست لەوێ خزم و کەسم زۆر بوو.

ئیدی هاتمە قەراغ دەریا. لەوێ پاپۆڕێکی لێ بوو، کەلوپەلی بازرگانانی ڕادەگوێســت. داوام لێ کردن مینش لەگەڵ خۆیان ســوار کەن. ئەوان گوتیان ئەو پاپۆڕە ئی پیاوێکی هاشــمییە و ئێمە ناتوانین ســوارت بکەین. پێم گوتن پارەیان دەدەمێ. گوتیان: «ئەگەر هەر بە تەمای لەگەڵمان بێی نابێ جلوبەرگی شــکۆدارت لەبەردا بێ. دەبێ ئەوانە داکەنی و جلوبەرگی وەک ئێمە لە بەر کەیت و بێی لە لای ئێمە دانیشــی. وا بێ کەس شــکی بۆت نەچێ و هەر وا بزانن مەلەوانی پاپۆڕەکەیت. لەڕێوە گەڕامەوە. چووم جلوبەرگی وەک ئەوانم کڕی و چوومەوە بۆ لای پاپۆڕەکە. ئەو پاپۆڕە بەرەو بەسرە دەچوو. سوار بووم. ئەوەندەی پێ نەچوو، کەنیزەکەی خۆم دیت لەگەڵ دوو کەنیزی پاپۆڕەکە دانیشتبوو. خەمم لە دڵی بڕا. لە دڵی خۆمدا گوتم: «هەتا بەسرە هەر چاوی لێ دەکەم و گوێی لێ ڕادەگرم.» ئەمن لەو فکر و خەیاڵایانەدا بووم، کە کابرای هاشمی لەگەڵ چەند ســوار هات و کۆیلە و خزمەتکار ئەمبەرەوبەریان گرتبوو. کاتێک ئەو کابرایە سواری پاپۆڕەکە بوو. خواردەمەنی هێنابوو لەگەڵ کەنیزەکە خواردیان. خەڵکەکەی دیکەش خواردنیان خوارد. دوای ئەوە هاشمی بە کەنیزەکەی گوت: «ئەوە هەتا کەی قسە ناکەی و ئاوا مات و مەلوول دادەنیشی؟

خۆ تۆ یەکەم کەس نی کە لە خۆشەویستەکەت دادەبڕێی.» ئەمن زانیم ئەو کەنیزە لە تاوی من ئاوا خەمبار و پەشێوە. دوای ئەوە هاشمی لە سووچێکی پاپۆڕەکە پەردەیان کێشا و لەو دیوی پەردەکەوە لەگەڵ چەند کەسی دیکە کە لەگەڵ ئەو هاتبوون، دانیشتن. کوڵەڕەویم کرد و بۆم دەرکەوت کە ئەوانە برای هاشمی بوون. دوای ئەوە شەراب و شیرینیان هێنا و داوایان لە کەنیزەکە کرد شێعریان بە ئاوازە بۆ بڵێ. هەتا ئاخری واداریان کرد. داوای عوودی کرد. تاڵی عوودەکەی توند کردەوە و ئەو دوو بەیتەی بۆ گوتن.

خۆشەویستیت لە مێرگی دڵمدا خێوەتی هەڵداوە
ئەو مێرگە تازە چۆڵ ناکا، چونکە بۆخۆم ڕێم پێ داوە
مەلی ئەڤیندارم هەر دەم، میوانی گوڵی ڕوویەتی
خۆی لە حەوت وڵات تێپەڕێ، ئەو دڵەم هەر لە دوویەتی

دوای ئەوە دڵی پڕ بوو گریان ئەوکی گرت و عوودەکەی دانا و سترانەکەی بڕی. ئەمن لەجێی خۆم بێ هۆش بووم. دەوروبەریانم پێیان وا بوو من فێم لەگەڵە. تاقمێک قورئانیان بە گوێمدا دەخوێند و کابرای هاشمیش بەردەوام داوای لە کەنیزە دەکرد ئی دیکەشیان بۆ بڵێ. تا ناچار دەستی دا عوودەکەی و تاڵەکانی توند کردەوە. ئەو دوو بەیتەی گوت:

تا ڕۆژێ بوو ڕۆژم بە تشکی ڕووت ڕووناک بوو
کە ئاوا بووی، ڕۆژم تاریک و شەوم سامناک بوو
ئێستاش یادت هەروەک و مانگ بە ئاسمانەوە
تاریکیم بۆ دەتارێنێ، بە گریانەوە

دوای ئەوە لە هۆش خۆی چوو. دەنگی شین و گریانی خەڵک بەرز بووەوە. ئەمنیش هاوارێکم کرد و بێهۆش کەوتم. کەشتیڤانانەکان دەستیان کرد بە هات و هاوار. پیاوەکانی هاشمی بە کەشتیڤانەکانیان گوت: ئەو شێتەتان بۆ سوار کردووە؟ هەر کە گەیشتینە ئاواییەک لە کەشتییەکەی دایبەزێنن با لە دەست ئەو فێدارە ڕزگارمان بێ. ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم: «بە خودا تازە دامدەبەزێنن و هیچیشم پێ ناکرێ. وا چاکە خۆم نیشانی خۆشەویستەکەم بدەم. با نەهێڵی دامبەزێنن.» ئیدی هەر وا ڕۆیشتین تا گەیشتنە گوندێک. پاپۆڕڤانان پاپۆڕەکەیان ڕاگرت. خەڵکەکە هەمووی دابەزین شێو بخۆن. ئەمنیش هەستام چوومە پشت پەردەکە و عوودەکەم هەڵگرت و چەند شێوازم لێ دا. دوای ئەوە، ئەو شێوازەم لێ دا کە کەنیزەکە فێری کردبووم. گەڕامە و لە شوێنەکەی خۆم دانیشتم.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەشتسەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو کورە گێڕاوییەتەوە کاتێک گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم. ئەو تاقمە هاتنەوە نێو پاپۆڕەکە. مانگ هەڵات و دەریا و ویشکی ڕووناک کرد. هاشمی بە کەنیزەکەی گوت: «تکات لێ دەکەم خۆشــــییەکەمان لێ تاڵ مەکە. کەنیزە دەســــتی دا عوودەکە و هاوارێکی وای کرد هەموو پێمان وا بوو گیانی دەرچوو. دوای ئەوە گوتی: «قەســــەم بە خودا مامۆستاکەی من لەو کەشتییەدایە. هاشمی گوتی: «سوێند دەخۆم بە گیانی تۆ ئەگەر ئەو لەو کەشــتییەدا بێ ئەوە دەیهێنمە لای خۆمان با لە کوڕەکەماندا بێ بەشــکوو خەم لە دڵی تۆ بڕەوێ. هەرچەند باوەڕیش ناکەم لەو کەشــتییەدا بێ.» ئیدی هاشــمی لە کارگێڕانی پاپۆڕەکەی پرسی: «ئەرێ کەســی غەوارەتان لەگەڵ خۆتان سـوار کردووە یان نا؟» ئەوان گوتیان ناوەڵڵا. ئەمن ترسـام ئیدی باسـی نەکەنەوە. ناچار پێکەنیم و گوتم: «بەڵێ مامۆسـتا منم.» کەنیزە گوتی: «ئەو دەنگە دەنگی خـاوەنەکەی منە.» کۆیلەکـان هـاتن بە لامەوە و منیان بردە لای هاشــمی. هاشــمی کە چاوی پێم کەوت منی ناســییەوە و گوتی: «ئەوە بۆ ئاوای چیت بە سەر هاتووە بۆ ئاوات لێ هاتووە؟» ئەمن بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە و بە خۆم نەبوو گریام. کەنیزەکە لە پشــت پەردەکەوە گوێی لە دەنگی گریانەکەم بوو. هاشــمی لەگەڵ براکانی زۆرم بۆ گریان. دوای ئەوە هاشـــمی گوتی: «بە خودا ئەمن هێشـــتا لەو کەنیزە نیزیک نەبوومەوە. هەتا ئەوڕۆش گوێم لە ئاوازی نەبووە. ئەمن شـــوکری خودا پیاوێکی خودا پێداوم و هاتبووم بۆ دیمانەتی خەلیفە لە بەغدا. کاتێک ویسـتم بگەڕێمەوە بۆ شــار و وڵاتی خۆم. گوتم با لێرە دەنگخۆشـێک بکڕم. هەر بۆیە ئەو کەنیزەم کڕی. نەشــم دەزانی ئێوە ئاوان بۆ یەکتر. ئێستاش هەڵوێستم گرتووە بچمەوە بەسرە ئەو کەنیزە ئازاد دەکەم و لە تۆی مارە دەکەم. مـاڵ و حـاڵێکیش بۆ ئێوە دابین دەکەم. بەڵام بەو مەرجەی هەر کاتێک ویستم ئەو لە پشت پەردەوە گۆرانیم بۆ بڵێ. ئەتۆش وەک برا و کەسی منی.»

من بەو قســانە دڵخۆش بووم. ئەوجار هاشــمی ســەری بردە ئەوبەری پەردەکە و لە کەنیزەکەی پرسی: «بەو مەرجە ڕازی یان نا؟» کەنیزە دۆعای بە خێری بۆ کرد و شوکری خودای کرد. دوای ئەوە هاشــمی یەکێک لە پیاوەکانی بانگ کرد و پێی گوت دەســتی ئەو لاوە بگرە و ببیە جلوبەرگی شــکۆداری لە بەر بکە. بۆنی خۆشــی لێ دە و بیهێنەوە ئێرە. کۆیلەکە لەڕێوە دەســـتی منی گرت و بردمی چۆنی پێ گوتبوو ئاوای لەگەڵ کردم و منی هێناوە لای ئەوان. شــەڕابیان دانا و کەنیزەکە خۆشــترین ئاهەنگەکانی کە دەیزانی ژەنی و ئەو دوو بەیتەی بۆ گوتن:

کەس شـــک نـــابەم جـــگە لە تـــۆ

دڵـــــــــــــــــی من ئەهوەن کاتەوە
گەر فـــــــــــــــریای دڵم نەکەوی
شـــــەوەی خەم دێ و دەیـــبـــاتەوە

ئەو دوو بەیتەی لەگەڵ ئاوازێکی هێندە خۆش چڕی کە دانیشـتوانی تەواو گەشـاندەوە. ئەوجار لاوەکە عوودەکەی لە کەنیزەکە وەرگرت و ئەو بەیتانەی گوت:

گەورەیـی پـیـاوانـی مەزن وەک شـــەرابـی خەســـتە بـۆ ژیـن
گەر گەورەیی ئەوان نەبێ، تاقمێـــــــــــــــــــــک ناتوانن بژین
چۆن دەتوانم ئەمن بژیم بێ ئەو شـــــــــــــــۆخ و نازەنینە
چاوی دەڵێی گەلاوێژە، دمی ڕێواقی هەنگـــــــــــــــــوینە

خەڵکەکە زۆریان پێ خۆش بوو. کەیفیان ســـاز بوو. جارێک من و جارێک کەنیزەکە سـترانمان دەچڕی هەتا گەیشـتینە شـوێنێک و لەوێ کەشـتییەکەیان ڕاگرت. خەڵکەکە لە کەشـتییەکە دابەزینە قەراخ ئاوەکە. ئەمنیش دابەزیم. مەسـتیش بووم. کاری پێشـاوم کرد. دوای ئەوە خەو بە سـەرمدا زاڵ بوو لەولاوە خەوم لێ کەوت. هاوسـەفەرەکانم سـواری پاپۆڕەکە بوون و نەشـیان زانیبوو من سـوار نەبووم. چونکە ئەوانیش هەر مەسـت بوون. تۆشە و شتەکەشم لە لای کەنیزەکە بوو. هەتا تاووبانی نەکەوتبوو، گەرمدا نەهاتم خەبەرم نەبووەوە. کە هەسـتام سـەیرم کرد بە تاقی تەنیا ماومەوە و کەسـم بە دەورەوە نییە. خەریک بوو لە تاوان گیانم دەرچێ. لەوێ مامەوە هەتا پاپۆڕێکی گەورە هات. سـواری ئەو پاپۆڕە بووم و چووم بۆ بەسـرە. لەوێ کەسـم نەدەناسـی. بە ماڵی هاشـمیشـم نەدەزانی. چوومە دووکانێک و کاغەز و پێنووسێکم لێ وەرگرت.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی هەشتسەد و نەوەد و نۆیەم هاتەوتە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو لاوە گێڕاویتەوە دەستم کرد بە نووسین. دووکاندارەکە کە دیتی خەتم خۆشــە و جلەکانم چلکنن، پێی ســەیر بوو. لێی پرســیم ئەوە چۆناوچۆنە. ئەمن پێم گوت کە کەسێکی غەوارە و لاوەکیم و هەژارم. کابرای دووکاندار لێی پرسیم: «لە لای من دەمێنییەوە. ئەمن خواردن و پۆشــاکی تۆ بدەم و ئەتۆش حیســابی دووکانم بۆ ڕاگری؟» گوتم: «بەڵێ. پێم خۆشە.»

ئیدی لە لای ئەو مامەوە و حیســـابی دووکانم بۆ ڕاگرت. کە مانگێک تێپەڕی کابرا سەیری کرد لەو مانگەدا داهاتەکەی زۆری کردووە و دەرچووەکەی کەمتر بووە. کارەکەی منی لا پەسند بوو. ڕۆژێ دینارێکی بۆ بڕیمەوە. ساڵێک بەو شێوە ڕابرد. ئەوجار ویستی کچەکەیم لێ مارە بکا و بمکا بە هاوبەشــی دووکان. ئەمن بە گوێم کرد و کچەکەیم مارە کرد و لە دووکان دانیشـــتم. بەڵام مات و مەلوول بووم. کابرا شـــەرابی دەخواردەوە و فەرمووی منیشــی دەکرد. ئەمن هێندە نارەحەت بووم. خۆم لێ دەبوارد. دوو ســاڵان ئەوە حاڵم بوو. تا وا بوو ڕۆژێک لە دووکان دانیشتبووم، ســەیرم کرد، ئەوە تاقێمک خواردن و شــەرابیان هەڵگرتووە و دەچن بۆ شــوێنێک. لە دووکاندارەکەم پرســی: «ئەوە ئەو خەڵکە خواردن و شـــەرابیــان هەڵگرتووە دەچن بۆ کوێ؟» خەزوورم گوتی: «ئەورۆ جێژنی دەوڵەمەند و ســاماندارانە. ئەوانە دەچن بۆ قەراغ دەریا و لەوێ خەریکی عەیش و نۆش و ڕابواردن دەبن. لەوێ ئامۆلە[1] و شـــەراب دەخۆنەوە. منیش حەزم کرد بچم. گوتم ڕەنگە خۆشەویستەکەشم لەوێ ببینم. بە دووکاندارەکەم گوت: «منیش پێم خۆشە بچم. دووکاندار فەرمانی دا خواردن و شـــەرابیان بۆ ئامادە کردم. ڕۆیشـــتم تا گەیشـــتمە چۆمی ئامۆلە. ماوەیەک لەوێ بووم. تاماشام کرد خەڵک دەیانویست بگەڕێنەوە. منیش ویستم بگەڕێمەوە. لە پڕدا چاوم بە سەرۆکی ئەو کەشتییە کەوت کە هاشمی و کەنیزەکەی تێدا بوو. خەریک بوو دەچوو لە چۆمی ئامۆلەوە. ئەمن قاوم کرد. ئەو و هاوڕێکانی منیان ناســییەوە. دەستیان دە ئەستۆم کردم و هەواڵیان پرسیم. منیش شتەکەم بۆ گێڕانەوە. ئەوان گوتیان کە ئێمە پێمان وا بوو کە تۆ لەبەر مەســـتیان لە ئاوەکە کەوتووی و نغرۆ بووی. هەواڵی کەنیزەکەم پرسی. گوتیان: کاتێک باسی لە ئاو کەوتنی تۆ کرا، جلی لە بەر خۆی دادڕی و عوودی هەڵکرد و بە چەپۆک بە ســەری خۆی دادا و خۆی ڕنی. کاتێک کە هاتینە بەســرە پێمان گوت بەســە دەســت لەو شــین و گریان و ڕۆڕۆیە هەڵگرە. ئەو گوتی: « دەبێ جلی

---

[1]. ئامۆلە: بەری دارێکی هێندی بەرز و بڵاوە وەک دار گوێز. ئامۆلە بە قەد هەڵووچە دەبێ و ئاواش ترش و مزرە.

ڕەش بکەمە بەرم لە ماڵەکەم گڵکۆیەک ساز کەم و هەتا هەتایە لە سەری دانیشم و دەست لە سترانبێژی هەڵگرم.»

دوایەش قسەکەی بردە سەرێ و ئاوای کرد. ئێستا ئەوە هەر لەگەڵ ئەو گڵکۆیە دەژی. ئیدی ئەوان بردیانم بۆ لای کەنیزەکە. کە گەیشـــتینە ئەوێ. ســـەیرم کرد چۆنیان بۆ گێڕابوومەوە ڕاست ئاوا بوو. لە پەنا گڵکۆکە دانیشتبوو. کەنیزەکە کە منی دیت لە پڕدا وای قیژاند گوتمان ڕەنگە گیانی دەرچووبێ. ماوەیەکی زۆر لە ئامێزم گرت. دوای ئەوە هاشـمی گوتی: «ئەو کەنیزە ئی خۆتە.» منیش گوتم: «هەر وەک گفتت پێدام ئازادی کە و لێمی مارە بکە.» هاشـــمی لە ســـەر گفتی خۆی بوو. ئازادی کرد و لە منی مارە کرد. دیاری و خەڵاتی گرانبایی و جلوبەرگ و فەرشێکی زۆری لەگەڵ خست و پێنجسەد دیناری زێڕیشی دا بە من و گوتی: «هەموو مـانگێ ئەوەندەشـــت دەدمێ. بەڵام بەو مەرجەی هـاوڕێ و هاوەدەمی من بی و ڕێش بدەی گوێ لە گۆرانی کەنیزەکەش بگرم.»

دوای ئەوە فەرمانی دا خانوویەکمان بۆ چۆڵ کەن و بۆشـــی پڕ کردین لە کەلوپەل و قاپ و قاچاخ و پێویســـتییەکانی ژیان. کەنیزەکەشـــی ناردە ئەو ماڵە کە من چووم ســـەیرم کرد وەک ماڵی یەکێ لە گەورەکانم هاتە بەرچاو. ئەوجار گەڕامەوە چووم بۆ لای دووکاندار و ئەوەی بۆم هاتبووە پێش هەموویم بۆ گێڕاوە. مارەیی کچەکەیم دا و تەڵاقم دا. داوای لێ بووردنیشـــم لێ کرد وا لە خۆڕا لێی جیا بوومەوە. هەتا دوو ســـاڵ لەلای هاشـــمی بووین. ماڵێکی زۆرم وەسەر یەک نا و ژیانم زۆر لەو کاتە خۆشتر بوو کە لە بەغدا بووم. سپاس بۆ خودا.

### بەسەرهاتی شازادە و شەمماسی وەزیر

یەکی دیکە لەو بەسـەرهاتانە ئەوەیە کە لە وڵاتی هێند، پادشـایەکی لێ بوو، دەسـتودڵباز و دڵاوا و مەزن کە فەقیر و هەژارانی خۆش دەویسـت و ئاگای لە مسـکێنان بوو. حەفتا و دوو پادشـــا لە ژێر فەرمانی ئەودا بوون. لە وڵاتەکەیدا ســـێســـەد و پەنجا قازی و هەفتا وەزیری هەبوو. گەورەترین وزیری کەسـێک بوو بە ناوی شـەمماس. ئەو وەزیرەش وەک پادشـا دڵاوا و بدە و شـایی بە خۆ بوو. لەگەڵ ئەوەشـدا بەڕێوەبەرێکی کارزان و لێهاتوو بوو. پادشـا زۆری خۆش دەویسـت. بەڵام ئەو پادشـایە منداڵی نەبوو. هەر بۆیە پادشـا و خەڵکەکەی مات و خەمبار بوون. ڕێکەوت وا بوو شـەوێک لە شـەوان کە پادشـا هەر وا بیری لە دواڕۆژی خۆی دەکردەوە. خەوی لێ کەوت و خەونی دیت. لە خەونیدا دیتی کە خەریک بوو ئاوی لە بن دارێک دەکرد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: خاوەنشکۆ! پادشای هیند لە خەونیدا دیتی خەریک بوو هەر ئاوی لە بن داریک دەکرد. لە دەوروبەری ئەو دارە دارگەلێکی زۆر لێ بوو. لە پڕدا ئاورێک لەو دارە هەستا و تەواوی دارەکانی دیکەی سووتاند. لەو جەنگەیەدا پادشا بە شڵەژاوی لە خەو ڕاپەڕی. کۆیلەیەک لەوێ بوو، بانگی کرد و پێی گوت: «بە لەز بچووە وەزیرم بۆ بانگ کە.» کۆیلە بە پەلە هەڵات شەمماسی وەزیری بانگ کرد. شەمماس سەیری کرد، پادشا لە سەر جێخەوەکەی دانیشتووە. کڕنۆشی بۆ پادشا برد و دۆعای بۆ بەردەوامی و سەقامگیری پادشا کرد و گوتی: «خودای گەورە، دڵت بە خەم نەکا. ئەو چ بووە بەو شەوە نەخەوتووی و ئاوا دانیشتوو. منت بۆ بانگ کرد؟» پادشا گوتی: «وەرە دانیشە.»

شەمماس دانیشت و پادشا خەونەکەی دیتبووی بۆی گێڕاوە. وەزیر ماوەیەک سەری داخست و ئینجا سەری هەڵێنا و بزەیەکی هاتێ. پادشا گوتی: «ئەوە چیت بۆ دەرکەوتووە ڕاستییەکەیم پێ بڵێ. هیچم لێ مەشارەوە.» شەمماس وەڵامی داوە: «پادشای مەزن، خودای تەعالا بەسەری کردوویەوە و خەونەکەت زۆر خۆشە. ئەویش ئەوەیە کە خودا کوڕێکت دەداتێ جێی تۆ دەگرێتەوە و وڵاتەکەت بۆ دەپارێزێ. ئەو خەونە لێک دانەوەیەکی دیکەشی هەیە کە ئێرە جێگای نییە.»

پادشا بە لێک دانەوەکەی وەزیر کەیفی ساز بوو. نیگەرانی و دڵەڕاوکێی نەما بە وەزیری گوت: «جا ئەگەر لێک دانەوەی خەونەکەی من ئەوەیە تازە هەموویم پێ بڵێ با ئاسوودە بم. شەمماس هەر جۆرێک بوو پادشاشی ڕازی کرد باسی نەکا. پادشا ئەوجار ئەستێرەناس و خواناسانی کۆ کردەوە و خەونەکەی بۆ گێڕانەوە و پێی گوتن دەبێ ئەو خەونەم بۆ لێک دەنەوە. یەکیان هاتە پێش و ڕوخسەتی خواست قسە بکا. پادشا ڕوخسەتی دا. کابرا گوتی: «پادشا ئەوەندە بزانە کە وەزیرەکەی تۆ دەیتوانی خەونکەت لێک داتەوە. بەڵام لەبەر گەورەی جەنابت هەمووی پێ نەگوتووی. ئەگەر ڕێم بدەی ئەمن هەموویت بۆ لێک دەمەوە.» پادشا گوتی: «کاکی شرۆڤەکار مەترسە و چی هەڵدەگرێ پێم بڵێ.» کابرا گوتی: «پادشا، ئەتۆ کوڕێکت دەبێ دوای تەمەنی درێژی جەنابت جێگای تۆ دەگرێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەی ئاکار و هەڵسوکەوتی تۆ لەگەڵ مسکێنانت توند و تیژ دەبێ و خراپ دەجووڵێتەوە و لەتمیان لێ دەکا. دادپەروەری لە بەر چاو ناگرێ. ئاواشی بە سەر دێ کە پشیلە بە سەر مشکی هێنا. پادشا پرسی: «بەسەرهاتی پشیلە و مشک چۆنە؟»

[بەسەرهاتی پشیلە و مشک]

شرۆڤەکار وەڵامی داوە: «پادشای مەزن، شەوێک لە شەوان پشیلەیەک لە کەلاوەکاندا زۆر گەڕا شتێک ببینێتەوە بیخوا و هیچی نەدیتەوە، باران و سەرما و برسێتی برستیان لێ بڕی. کونە مشکێک لە بن دارێک بوو. چوو لە بەر کونە مشکەکە ڕاوەستا، کەمێکی مڵومۆ کرد. ددانەکانی لێک سوو. وا بوو هەستی کرد نێو کونەکە مشکی تێدایە. ویستی بچێتە ژووری و مشکە بگرێ و بیخوا. مشکەکەش هەستی بەو کرد. دەستی کرد بە گڵ وە بەر کون هەڵدان. بۆ ئەوەی ڕێگای لێ بگرێ. ئەوجار پشیلە بە زەلیلییەوە گازی کرد و گوتی: «براکەم وا مەکە، ئەمن پەنام بۆ هێناوی. ئەو شەو جێم بکەوە. پیر و پەککەوتە و برسیم. هێزی جوڵانم نییە و ئەوشەو ڕێم کەوتووەتە ئەو کەلاوەیە. ڕێم هەڵە کردووە. لە خودام دەوێ بمرم و لەو ڕۆژڕەشییە ڕزگارم بێ. تازە ئەوشەو پەنام بۆ هێناوی لە ڕێی خودا سەدەقەسەری خۆت. دەستم بگرە و بمکێشە ژووری. با لە داڵانێکی ماڵەکەتداهەتا بەیانی بکەوم. ئەمن غەوارە و لاوەکیم. دەڵێن هەرکەس پەنای غەریبێک بدا، خودا لە بەهەشت پەنای دەدا. براکەم ئەتۆ شایانی وەها پاداشێکی. ئەوشەو ڕێم بدە با لە پەنای تۆدا بم و بەیانیش دەڕۆم وە دوای کاری خۆم دەکەوم.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک مشکەکە قسەکانی پشیلەی بیست پێی گوت: «ئەمن چۆن رێی تۆ دەدەم بێیە ماڵی منەوە، لە کاتێکدا تۆ دوژمنی قەستەسەری منی و ئەمنیش خۆراکی تۆم. ئەمن دەترسم تۆ فریوم بدەی. چونکە فریودان پیشەی تۆیە. گفت و بەڵێن و قسەکانت جێی بەقا نیین. وەک چۆن دەڵێن پیاو دەبێ وریای ژنەکەی بێ لە ئاست فرت و فێڵی ژنانی خراپەکا. یان دەڵێن: سووتەمەنی ویشک دەبێ لە ئاور دوور بێ. ئەمنیش دەبێ لە تۆ دوور بم. چونکە دوژمنی لە مێژینە نابێ بەکەم بگری. ئەگەر سست و بێ دەسەلاتیش بێ.

ئەتـــــــــۆ دەزانی زاڵی پیر، چی دەگوت بە رۆستەمی گورد
دوژمنت بە کەم مەزانە هەرچەند کەنفتیش بێت و ورد

پشیلەکە بە گریان و پاڕانەوە و لالانەوە گوتی: «وتەکانی تۆ هەمووی راستن. نکوڵی لەوانە ناکەم. بەلام یەک تکام هەیە ئەویش ئەوەیە، ئەتۆ ئەوانە لە بیر بکە و لێم خۆش بە. چونکە دەڵێن: هەرکەس لە گوناحی کەسێک خۆش بێ خوداش لە گوناحی خۆش دەبێ. هەرچەند من لە پێشدا دوژمنی تۆ بووم، بەلام ئێستا حەزم لە هاورێیەتیە. یەکێک لە گەورەپیاوەکان دەڵێ: «ئەگەر دەتهەوێ دوژمن بکەیتە هاورێی خۆت، ئەوە چاکەی لەگەڵ بکە.» برا گیان ئەمن بەڵێنت پێ دەدەم کە زیانت پێ نەگەیەنم. جگە لەوەش تازە ئەمن ئەو هێز و گوڕەی ئەوەم نەماوە لەتم لە تۆ بکەم. ئەتۆ باوەڕم پێ بکە و گەورەیی بنوێنە، ئەو جارە باوەڕم پێ بکە.» ئەوجار مشکەکە گوتی: «ئەمن چۆن باوەڕ بە تۆ بکەم، لەوەتی هەین دوژمنی یەکتر بووین. ئێمە جگە لەوەی بە خوێنی سەری یەکتر تینوو بووین هیچ شتێکی دیکەمان لە نێواندا نەبوو تا بڵێن لانی کەم لەو بارەوە یەکتر دەگرینەوە. دژمنایەتی ئێمە کۆنە و لە نێو رۆحماندایە. لە قەدیمەوە گوتوویانە: «هەرکەس باوەڕ بە دوژمی خۆی بکا، وەک ئەوە وایە دەست لە زاری شێر رۆ بکا.» ئینجا شێرەکە بە تووڕەییەوە گوتی: «براکەم ئەوە من لە بەر دەرکی کونکەی تۆ لە گیاندان دام و ئەوەندەی پێ ناچێ دەمرم. ئەودەم گوناحی من دەکەوێتە ئەستۆی تۆ. چونکە تۆ دەتوانی من لەو دۆخە رزگار بکەی. ئەوە دوایین قسەی من بوو لەگەڵ تۆم کرد. ئیدی مشکە ترسی خودا و رۆژی پەسلانی بە دڵیدا هات و بەزەیی بزووت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەرکەس بیهەوێ خودا بە سەر دوژمنەکەیدا زاڵ بکا دەبێ، چاکە لەگەڵ دوژمنەکەیدا بکا و بەزەیی پێیدا بێ. ئەمن پشت بە خودا دەبەستم و لە رێی خودا دا لەو دۆخەی رزگار دەکەم.

ئیدی هات و پشیلەی لەگەڵ خۆی بردە ژووری لە پەنای راوەستا بوو. کاتێک پشیلە

گەرمدا هات و هاتەوە سەرخۆ. کەمێکی باسی پیری و بێ هێزی خۆی کرد. مشکە کەمێکی دڵخۆشی داوە و بە دەوریدا هات. خەمی بوو. پشیلە کەمێکی خۆ جوولاندەوە هەتا گلەکەی وە بەر دەرکی کونکە هەڵدا. مشکە هەستی کرد ویستی بچێتە دەرێ. پشیلە خێرا پڕی دایە و بە چنگ ڕێکی گوشی بردی بۆ لای دمی. نەیخوارد و هەڵی هێنا و بە عەرزیدا دا. مشکە دەرپەڕی و پشـــیلە ئاوقای بوو گرتی و ڕێکی گوشـــی و ئازاری دا. مشـــکە لە بەر خودا دەپاڕاوە و داوای لێ دەکرد فریای بکەوێ. بە گریانەوە بە پشـــیلەی دەگوت: «ئەی ئەو هەموو گفت و بەڵێنەی بە منت دەدا و ئەو ســـوێندەی دەخوارد کوا. یانی ئەوە جوابی ئەو چاکەیە کە لەگەڵ تۆم کرد. ڕاســـتە کە دەڵێن: «هەرکەس باوەڕ بە دوژمنی بکا، خۆی پێ ڕزگار نابێ و هەرکەس خۆی بە دوژمنەکەی بسپێرێ شیاوی تێداچوونە.» بەڵام من پشت بە خودای خۆم دەبەســتم. ئەو ڕزگارم دەکا. لەو جەنگەیەدا کە پشــیلە ویســتی هەڵیدڕێ. ڕاوچییەک بە تاژییەوە گەیشتێ. تاژییە بە بەر دەرکی کونی مشکەکەدا هات. لەوێ گوێی لە هەراوهوریایەکی ســـــەیر بوو وەزیزانی ئەوە ڕێوییە و نێچیرێکی گرتووە. لە ڕێوە تاژییە دمی درێژ کردە ناو کونەکەوە پشیلە گرت و دەکێشا دەرێ، پشیلە لە تاوی خۆی مشکەی بەر دا. مشکە ڕزگاری بوو. تاژییە پشیلە کێشا دەرێ و ونجڕ ونجڕی کرد و لە کن کونی مشکەکە فڕێی دا.

گەورەم پادشـــــا، کەس نابێ قەول و بەڵێن بشـــکێنێ و فروفێڵ بکا. هەرکەس چاڵ بۆ خەڵک هەڵکەنێ بۆخۆی تێ دەکەوێ. کە وایە چی لە خەڵک بکەی ئاوات لێ دەکرێتەوە. بەڵام پادشـــا تۆ نارەحەت مەبە. کوڕەکەی تۆ دوای ئەو لەتم و ســـتەمەی لە خەڵکی دەکا. پەشیمان دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر ڕێی ڕاست و ئاکاری جوان.

دوای ئەوەی خەون لێکدەرەوەکان خەونەکەیان بۆ لێک داوە. پادشـــا دیاری و خەلاتێکی باشی دانێ و بەڕێی کردن. بۆخۆی هەستا و لە قولینچێک دانیشت و چوو لە فکرەوە. بیری لە کاروبار و دواڕۆژی خۆی دەکردەوە. کە بوو بە شـــەو هەســـتا چوو بۆ لای یەکێک لە ژنەکانی کە لە تەواوی ژنەکانی دیکەی خۆشـــتر دەویســـت. لەگەڵی خەوت. کە چوار مانگ ڕابرد، پز[1] لە ســـکی ژنەکەیدا جوولا. ژنە کەیفی ســـاز بوو، پادشـــای لێ ئاگادار کردەوە. پادشا گوتی: «خەونەکەی من هاتە دی، سپاس بۆ خودا. دوای ئەوە پادشا ئەو ژنەی بردە یەکێک لە باشترین کۆشکەکانی و دیاری و خەلاتێکی باشـی دایە. کۆیلەیەکی نارد لە دوای شـــەمماســـی وەزیر. شـــەمماس هات. پادشـــا بۆی گێڕاوە کە ژنەکەی دوو گیانە و گوتی: «خەونەکەم وەدی هات. هیوادارم ئەو منداڵە نێرینە بێ و ئەو ماڵ و ســـــامانەی پێ بگا. شـــەمماس ئەتۆ چۆنی بۆ دەچی؟» شـــەمماس هیچی نەگوت. پادشـــا گوتی: «ئەوە بۆ دەڵێی پێت خۆش نییە و کەیف و بە خۆشـحاڵییەکەی من ناکەی؟» شـــەمماس لەڕێوە کڕنۆشـی بۆ

---

[1]. تۆل، پیزە.

برد و گوتی: «پادشام، دارێک لە جیاتی سێبەر، گڕ و بڵێسە بدا، شەرابێک کە قوڕگ بگری و ئاوێکی شـــیرین کە لە گەروو نەچێتە خوار و تینوو بخنکێنی قازانجی بۆ کێ دەبێ؟ پادشـــام، دەڵێن مرۆڤی ژیر نابێ قســـە لە ســـێ شـت بکا، پێش ئەوەی کارەکە تەواو بێ. یەکیان مسافیر پێش ئەوەی بگەڕێتەوە. کەسێک چووە بۆ شەڕ، پێش سەرکەوتنی بە سەر دوژمندا. سێیەمین ژنێک کە دووگیانە پێش ئەوەی منداڵەکەی بێ.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی نۆسەد و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! وەزیر شەمماس گوتی: «پادشام، هەر کەسێک پێش تەواوبوونی کارێک لە سەری بدوێ، وەک کابرای نوێژفرۆشی لێ دێ کە ڕۆنی لە سەر سەری دانابوو.» پادشا پرسی: «کابرای نوێژفرۆش چی بە سەر هات، دا بۆم بگێڕەوە؟»

[بەسەرهاتی نوێژفرۆش]

گوتی: «پادشام، پیاوێک کارداری گەورە ماڵێک بوو، ئەو کابرایە هەموو ڕۆژێ جیرەی خۆی سێ نان و کەمێک ڕۆن و هەنگوین بوو. لەو شارەدا ڕۆن زۆر گران بوو. ئەو کابرایە ئەوەندەی ڕۆنیان دابایە لە کووپەیەکی دەکرد. تا وای لێ هات کووپەکە پڕ بوو. کابرا لە ترسی ئەوەی ڕۆنەکەی لە دەست نەچێ هەمیشە لە پشت سەری هەڵیداوەسی. وا بوو شەوێک لە سەر جێوبانەکەی دانیشتبوو. گوچانەکەی لە لا بوو. بیری لە ڕۆن و گرانی نرخی ڕۆن دەکردەوە و لە بەر خۆیەوە گوتی: «وا چاکە ئەو ڕۆنە بەرم بیفرۆشم و بزنێکی لێ بکڕم. لەگەڵ ئاژەڵدارێک ببم بە شەریک. ئەو بزنە ساڵی یەکەم دوو کاریلەی نێر و مێی دەبێ و ساڵی دووەمیش دوانی نێر و مێی دەبێ. هەر ئاوا بەردەوام بێچووی نێر و مێی لێ دەکەوێتەوە. ئەوجار بزنەکان لەگەڵ هاوبەشەکەم بەش دەکەم. بەشەکەی خۆم دەفرۆشم و فڵانە شوێنی پێ دەکڕم و کۆشکێکی گەورەی لێ ساز دەکەم. کۆیلە و کەنیزی لێ دەکڕم و جل و فەرشی جوان و چاک دەکڕم و کچی فڵانە بازرگان مارە دەکەم. جێژنێکی گەورە دەگرم. مەڕ و مانگایەکی زۆر دەکوژمەوە و خواردەمەنی شایان و چێشتی بەتام لێ دەنێم. گۆرانی بێژ و هونەرمەند بانگ دەکەم و لە دارا و نەدار و زانا و گەورەگەورەکان دەگێڕمەوە. بە جارچی دەڵێم جار بدا کێ چ ئاواتێکی هەیە ئاواتی دێنمە دی. دوای ئەوە دەچمە لای بووک و تێر سەیری جوانییەکەی دەکەم و تینوێتی دڵم دەشکێنم. ژیانێکی پڕ لە خێر و خۆشی و کامرانی دەست پێ دەکەم و بە خۆم دەڵێم: «ئەوە بە ئاواتت گەیشتی. لە دەست نوێژ فرۆشی ڕزگارت بوو یان نا؟» دوای ئەوە ژنەکەم دووگیان دەبێ و کوڕێکی دەبێ. ئەمن گوێزەبانەیەکی زۆری بۆ دەکەم و بە باشترین شێوە لە ناز و نیعمەتدا پەروەردەی دەکەم. ئەوەی کاری باشە پێی دەڵێم بیکا و لە خراپەی دەگێڕمەوە. ئامۆژگاری دەکەم، ئاکارجوان بێ و خۆ لە خراپە لادا. دیاری و شتی زۆری بۆ دەکڕم. ئەگەر زانیم کوڕێکی گوێڕایەڵە ئەوە جار لەگەڵ جار لەگەڵی چاکتر دەبم و ئەگەریش بزانم سەرەڕۆ و لاسارە ئەوە بەو گوچانە ئەئاوا لێی... ویستی بڵێ ئاوا لێی دەدەم گوچانەکی لە کووپە ڕۆنەکە درا و ڕۆن بە سەروسەکتیدا هاتە خوارێ.

پادشام، ئەو بەسەرهاتەم بۆیە بۆ گێڕایەوە مەبەستم ئەوە بوو نابێ مرۆڤ پێش ئەوەی ئەسپ بکڕێ ئاخوڕی بۆ هەڵبەستێ. واتە هەتا کارێک نەکرێ قسەی لێ نەکا. پادشا گوتی: «ڕاست دەکەی بەڕاستی وەزیرێکی شیاوی.»

شەمماس کڕنۆشی بۆ پادشا برد و دۆعای بۆ بەردەوامی و تەمەن درێژی کرد و گوتی: «پادشام، پێم خۆشە ئەرخەیان بی کە من هیچ لە تۆ ناشارمەوە. بە دڵخۆشیت دڵخۆشم و بە پەرۆشـــیت پەرۆش دەبم. ئەگەر ئەتۆ لێم ناڕەحەت بی، ئەمن شـــەو خەوم لێ ناکەوێ چونکە هەر ماڵ و پلە و پایەک کە هەمە هەمووی لە گەورەیی جەنابتەوە دەزانم. لە خودا داواکارم ئاگادارت بێ و لە پەنا خۆیت گرێ. پادشـــا کەیفی بەو وتانە کرد. دوای ئەوە شەمماس ڕوخسەتی خواست و هەستا گەڕاوە ماڵێ.

دوای ئەوەی مانگ و ڕۆژی خۆی تەواو بوو شـــاژن کوڕێکی بوو. بە دڵێکی خۆشـــەوە موژدەیان برد بۆ پادشـــا. پادشـــا زۆر زۆری پێ خۆش بوو. کەیفی ســـاز بوو. شـــوکری خودای کرد و گوتی: «ســـپاس و پێزانین بۆ خودا کە دوای هیوابڕان وا کوڕێکی پێ بەخشـــیم.» دوای ئەوە پادشـــا نامەگەلێکی نارد بۆ خەڵکی وڵاتەکەی خۆی و ئەوانی بانگ کرد بێن بۆ کۆشکی شایانە. میر و زانا و خەڵکی تەواوی ئەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتەکەی هاتن و لە تەپڵی شادیان دا و جێژن و ئاهەنگیان وەڕێ خست. دوای ئەوە پادشا بە حەوت وەزیرەکەی خۆی کە شـــەمماس هەرە گەورەکەیان بوو گوت: «هەرکەســـەی لە قەدەر زانستی خۆی لێدوان بدا.»

لە پێشـــدا شـــەمماس دەســـتی کرد بە ئاخاوتن و گوتی: «ســـپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئێمەی لە نەبوونەوە بەدی هێنا و پادشـــاگەلی دادپەروەری بە ئێمە بەخشـــی. بە تایبەت پادشـــای شـــاری ئێمە کە ئێمە هەموو بەوەوە زیندووین و لە ژێر ســـێبەری ســـڵامەتی ئەودا لە کەیف و خۆشـــی داین. کام پادشـــا ئەو کارە دەکا کە پادشـــای ئێمە لەگەڵ ئێمەی دەکا. کەلاوەکانمان بۆ ئاوەدان دەکاتەوە و مافی ســـتەملێکراو لە ســـتەمکار دەســـتێنێتەوە. قەت لە خەمی مســـکێنانی خۆی خافڵ نییە. ئەوە لە دەهەندەیی ئافرێنەرەوەیە کە پادشـــای ئێمە لە بیر ئاســـایشـــی مسـکێنان دایە تا ئەوان تووشـــی گوناە نەبن. شـــوکری خودا کە لە دەورەی پادشـــای ئێمە دا دوژمن پێی نەناوەتە ناو شـــاری ئێمەوە. مســـکێنانمان هیچ گیروگرفتێکیان بۆ نەهاتووەتە ڕێ. ئەوە خێر و فەڕێکی گەورەیە کە وشـــەناســـان ناتوانن پەســـنی ئەو نیعمەتە بکەن. پادشای بێ هاوتا خودا سێبەری بەرەکەتت بە سەرمانەوە ڕاگرێ و تەمەنت درێژ کا. ئەوە ئاوات و خۆزگەی هەمیشـــەی ئێمە بوو کە خودا کوڕێکت پێ ببەخشـــێ و چاوی ئێمەی پێ ڕوون کاتەوە. سپاس و پێزانین بۆ خودا وا ئاواتەکەی هێنایە دی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شەمماس گوتی: «سپاس بۆ خودا کە تکا و ڕەجای ئێمەی قەبوول کرد و ئاواتەکەی هێنایە دی. وەک ئەو ماسییانەی ئاویان گەیاندنێ.» پادشا گوتی: «ماسی چی دا بۆ بگێڕەوە؟»

### [چیرۆکی ماسییەکان]

وەزیر گوتی: «پادشام، گۆلاوێک بوو، کەمێکی ماسی تێدا بوو. ڕێکەوت وا بوو، ئاوی ئەو گۆلاوە هەڵبڕا و وردە وردە ئاوەکەی خەریک بوو، ویشک دەبوو. ماسییەکان لە مەترسیدا بوون. گوتیان: «چ بکەین و بۆ خۆ ڕزگار کردن لەگەڵ کێ ڕاوێژ بکەین. یەکێک لە ماسییەکان کە لەوانی دیکە ژیرتر و دونیا دیتووتر بوو، گوتی: «هیچ ڕێگایەک نییە جگە لەوەی پشت بە خودا ببەستین. بەڵام وا باشە لەگەڵ قرژاڵ ڕاوێژ بکەین. چونکە ئەو گەورەی ئێمە.»

ماسییەکان قسەکەی ئەویان قەبووڵ کرد و هەموو ڕۆیشتن بۆ لای قرژاڵ. سەیریان کرد ئەوە لە شوێنی خۆی مات بووە و ئاگای لە بارودۆخی ماسییەکان نییە. ماسییەکان سڵاویان لێ کرد و گوتیان: «بەڕێز، تۆ سەرۆک و گەورەی ئێمەی و لێشمان ناپرسی.» قرژاڵ وەڵامی سڵاوەکەی دانەوە و پرسی: «بۆ! چیتان بە سەر هاتووە و چیتان دەوێ؟» ماسییەکان شتەکەیان بۆ گێڕاوە و گوتیان کە ئاوەکەیان خەریکە لە کەمی دەدا. گوتیشیان ئەگەر ئاوەکە ویشک بێ ئێمە هەموو قڕمان دێ پەنامان بۆ تۆ هێنا پێمان بڵێی چ بکەین و چ ڕێگەیەکمان بۆ دەکێشی. چونکە تۆ لە ئێمە گەورەتر و زاناتری. قرژاڵ ماوەیەک سەری داخست و پاشان گوتی: «قسەی تێدا نییە کە ئێوە کەم ئاوەزن، ئەوەنییە دەستتان لە ڕەحمەتی خودا شتووە و هیوابڕاو بوون. مەگەر نازانن خودا ڕۆزی لە ڕادەبەدەری بو ئافرێنەرانی داناوە و پێش ئافراندیان ڕۆزی و تۆشەی بۆ تەرخان کردوون و خودا بەشە ڕۆزی و تەمەنێکی دیاریکراوی بۆ هەر کاممان دیاری کردووە؟ ئێوە چۆن لە شتێک بێ هیوا دابن کە لە بارەیەوە هیچ نازانن؟ بیر و ڕای من ئەوەیە ئەوەی دەتانهەوێ لە خوداتان بوێ. هەرکام لە ئێوە بە دڵ و گیان بە جۆرێک پشت بە خودا ببەستن کە لێتان ڕوون بێ بە هاناتانەوە دێ و لەو گرفتە ڕزگارتان دەکا. چونکە ئەوەی پشت بە خودا ببەستی حەتمەن نائومێدی ناکا و بە جۆرێک بە هانایەوە دێ.»

ئەگەر بێتوو ئێوە دڵتان لەگەڵ خودا پاک کەنەوە و بە خۆتاندا بچنەوە، تەواوی

دەرگاکانی خێر و بێرتان بەسەردا دەکاتەوە و کارەکانتان بۆ رادەپەڕێنێ. بە بۆچوونی من راوەستن بزانین خودا بۆخۆی چی دەکا! ئەگەر بمرن ئەوە دەحەسێنەوە و ئەگەریش کرا ئەوە هەڵێن و ڕوو لە جێگەیەک بکەن کە خودا بۆخۆی دەیهەوێ. ماسییەکان هەموو گوتیان: «تۆ ڕاست دەفەرمووی خودای مەزن پاداشی چاکەت داتەوە.» ئیدی هەرکەسەی گەڕاوە شوێنەکەی خۆی. ئەوەندە پێ نەچوو بارانێکی بە خوڕ دای دا و گۆلەکە سەری کرد.

پادشام، ئەوە ڕێک بەسەر ئێمە هاتووە. ئێمە هیوامان لە دەست دابوو. کە تازە تۆ کوڕت بێ. ئێستا کە خودا کوڕەکەی داوە. ئێمەش لە خودا داواکارین کوڕێکی باش و پاک و گوێڕایەڵ بێ و ببێتە مایەی خێر و بەرەکەت بۆ ئێوەش و بۆ مسکێنانیش وڵاتەکەشت. چونکە ڕێکخەری کارەکان هەر بۆخۆیەتی و هەر ئەوە توانا و زانای بێ سنوور.

دوای ئەوە وەزیری دووەم هاتە پێش و کڕنۆشی برد و گوتی: «پادشام، شیاوی پادشایی نییە کەسێک کە دڵێکی گەورە و ئاکارێکی جوانی نەبێ. ڕێگە و ڕەوشتی شەرعی و سوننەت ڕەچاو نەکا. ئاگای لە هەژاران و داماوان نەبێ و ستەمکار و زاڵم دەمکوت نەکا. ئاگای لە ماڵ و نامووسی مسکێنان نەبێ. هەژار و نەدار پشتگوێ بخا و چاوی هەر بەسەر سامانداری و دەوڵەمەندانەوە بێ. کەسێک بۆ پادشایەتی دەبێ کە کارێک بکا چینی هەژار و کەم داهات و کەنەفتی وڵاتەکەی هەمیشە دەستە و دۆعا بۆ بەردەوامی و لەشساغی و تەمەندرێژی ئەو بپارێنەوە و گوێڕایەڵی بن. گومانی تێدا نییە ئەگەر پادشا ئەو تایبەتمەندیانەی تێدا بێ، لە لای خەڵک و خودا خۆشەویست دەبێ و لەم دونیا و لەو دونیا سەربەرز و سەربلیند دەبێ.

پادشام، ئێمە کۆیلەکانی تۆ هەموو دانبەوەدا دەنێین کە تەواوی ئەو تایبەتمەندییە باش و هەڵکەوتانە لە جەنابتدا هەیە. ئێمە بەختەوەرین کە لە ژێر سێبەری دەسەڵاتی تۆدا دەژین. لە قەدیمەوە گوتوویانە کە گەورەترین بەختەوەری بۆ مسکێنان ئەوەیە کە پادشای دادپەروەر و حەکیمی شارەزا و زانای کاریگەریان هەبێ. شوکری خودا ئێمە تەواو ئەوانەمان هەیە. ئێمە لە پێشدا ئەوە ئازاری دەداین کە دەسەڵات و پادشای ئەو وڵات جێگرەوەیەکی نەبێ. وا بوو خودای پایەبەرز و دڵۆڤان داوا و نزای تۆ و ئێمەی بە هێند گرت و هیوابڕاوی نەکردین و وەک قەلەڕەشەکە فریامان کەوت. پادشا پرسیاری کرد: «بەسەرهاتی ئەو قەلەڕەشە چۆنا و چۆن بوو؟»

### [چیرۆکی قەلەڕەشە]

گوتی: «پادشام قەلەڕەشەیەک لەگەڵ مێیەکەی لە سەر دارێک هێلانەیان کردبوو،

بۆخۆیان بە کەیف و خۆشـــی ڕایاندەبوارد. تا کاتی هێلکە کردن و کورک بوونیان هات. وەرزی هاوین بوو. مارێک لە کونەکەی هاتە دەرێ و بە دارەکە هەڵچوو. بە لک و پۆپەکاندا هەڵکشـا. هەتا گەیشــتە°هێلانەی قەلەڕەشــە و چوو لە ناویدا پاپۆپکەی خوارد. ئەو هاوینە ئەوێی چۆڵ نەکرد. قەلەکانیش لەو لاوە هەڵوەدا بوون. وا بوو هاوین تەواو بوو. مارە هاتە خوارێ و چووەوە شـــوێنەکەی خۆی. ئەوجـار قەلە نێرەکە بە مێیەکەی خۆی گوت: «شـــوکری خودا لە دەســـت ئەو بەڵایە ڕزگارمان بوو. ئێمە جگە لە ڕووحمی ئەو هیچ پەنایەکی دیکە شک نابەین. ئەگەر بۆخۆی بیهەوێ ساڵی دادێ لە جێی ئەمساڵ جووچکمان بە قســـمەت دەکا. کە ســـاڵی نوێ هاتەوە و کاتی هێلکە کردن و کورک بوون هاتەوە، هەر ئەو مارە لە کونەکەی هاتە دەرێ و بە دارەکە هەڵگەڕا، گەیشـــتە نیزیک هێلانکە، ویســـتی بچێتە ناوییەوە لەو چەنگەیەدا داڵێک هات و بە چنگ گرتی و بە دندووک لە ســـەر و چاوی بەر بوو. هەتـا کوێر و زەلیلی کرد و لەوێ فڕێی دا. مێرووله تێی ورووژان و خواردیان. جووتە قەلەکە هاتنەوە هێلانەکەیان و بە خێر و خۆشی ژیان و بێچوویەکی زۆریشیان لێ کەوتەوە و شوکر و سپاسی خودایان کرد.

پادشـام، لە ســـەر ئێمەش فەڕزە، دەبێ شــوکری خودا بکەین کە دوای ئەو بێ هیوابیە ئەو دیارییەی خەڵات کردین.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١

# که شەوی نۆسەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە قسەکانی وەزیری دووەم کۆتایی هات، وەزیری سێیەم هەستا و گوتی: «پادشـــای دادەپەروەر، موژدە بێ لە بابەت دونیادا. چونکە هەرکەس خەڵکی ســـەر زەوی لێی ڕازی بێ، خەڵکی ئاســـمانەکانیش خۆشـــیان دەوێ و لێی ڕازی دەبن. شـــوکور خودا خۆشـەویستی تۆی خستووەتە دڵی خەڵکی وڵاتەکەتەوە. دەبێ ئێمەش و جەنابیشت شوکری خودا بکەین تا ڕەحمەتی خۆی بە سـەر ئێمەش و ئێوەشدا برێژێ. بەڵام پادشام، هیچ کەس دەســـەڵاتی هیچ شـتێکی نییە و چی لە دەسـت نایە، مەگەر بە ئیزنی خودا نەبێ. چونکە ئەوەی ئەو نەیدا نابێ. چاکەی کەســـانی دیکەش هەر لەوەوە ســـەرچاوە دەگرێ. خودای تەعالا بە ئەندازەی خۆشـــەویســتییەکەی بۆ ئافرێنەرانی نیعمەت بڵاو کردووەتەوە. نیعمەتی دونیایی داوە بە تاقمێک. هێندێکی سەرقاڵی پەیداکردنی بژێویان کردووە. گەورەیی و دەســـەڵاتی داوە بە تاقمێک. هێندێکی تەرکەدونیا و دیندار ئافراندووە. خێر و شـەڕ و فەڕ و شـــوومی شـــتەکان هەر بۆخۆی دەزانێ و بەس. هەر ئەوە نەخۆشـــت دەخا و چاکت دەکاتەوە. هەژار و دەستەنگت دەکا و هەڵتدەستێنێتەوە. دەتهێنێتە سـەر دونیا و دەتباتەوە. شـوکر و سـپاسـی لە سـەر هەموو گیانلەبەرەکان ئەرک و فەرزە. بەڵام پادشـام، ئەتۆ لە بەختەوەرەکانی. چونکە دەڵێن بەختەوەر ئەو کەسـەیە تۆشـەی ئەم دونیا و ئەودونیای کۆ کردووەتەوە و ڕازییە بە ڕەزای خودا. خودا چی بداتێ پێی ڕازییە. لە هەر بارودۆخێکدا شـــوکری خودا دەکا. پادشـــام هەرکەس بە ویســـتی خودا ڕازی نەبێ، وەک کەرەکێوی و ڕێوییەکەی لێ دێ.» پادشا گوتی: «کەرەکێوی و ڕێوویەکە چیان لێ بەسەرهات؟»

### [چیرۆکی کەرەکێوی و ڕێوی]

وەزیر وەڵامی داوە: ڕێوییەک هەموو ڕۆژێ لە کونەکەی خۆی دەهاتە دەرێ و بە دوای بژێوی خۆیدا دەگەڕا. ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کێوێک هەر وا دەگەڕا و سەرقاڵ بوو، هەتا بوو بە شـەو. ویسـتی بگەڕێتەوە بۆ کونەکەی خۆی. تووشـی ڕێوییەکی دیکە بوو. دوو بە دوو پێکەوە خەریک بوو قســـەیان بۆ یەک دەگێڕاوە کە چیان گرتووە و چی و چی. یەکێان گوتی: «دوێنێ تووشـــی کەرەکێوییەک بووم، ســـێ شـــەو و ڕۆژ بوو هیچم نەخواردبوو. زۆرم برسـی بوو. بە دیتنی کەرەکێوییەکە زۆر خۆشـحاڵ بووم و شـوکری خودام کرد کە ئەوەی بۆ تەرخان کردم. ئیدی کەرەم دڕی و دڵەکەیم دەرهێنا و خواردم و گەڕامەوە بۆ هێلانەکەی خۆم. ئێستا سێ ڕۆژە هیچم وەگیر نەکەوتووە، بیخۆم. بەڵام ئێستاش تێرم. کە ڕێوییەکەی دیکە ئەو قســـەیەی بیســـت. ئێرەیی بە تێری ئەو برد و لە دڵی خۆیدا گوتی:

«ئەمنیش دەبێ دڵی کەرەکێوییەک بخۆم.» تا چەند ڕۆژان هیچی نەخوارد. وای لێ هات هێزی لەبەردا نەما و خەریک بوو بمرێ. جووڵەی لێ بڕا و لە جێی خۆی کەوت. ڕێکەوت وا بوو دوو ڕاوچی وەدەر کەوتن و تووشـــی کەرەکێوییەک بوون. کەرەکێوییەکە ئەوانی دیت ڕای کرد و ڕاوچییەکانیش کەوتنە ســـەری. هەتا بە ڕێکەوت لە لای کونی ڕێوییەکە تیرێکی پەلداریان لێ دا و کەوت. تیرەکە لە دڵی هەڵچەقی و پەلێک لە دڵیدا ماوە. کە بوو بە شـــەو ڕێوی لە برســـان هەرچۆنێک بوو لە کونەکەی هاتە دەرێ. ســـەیری کرد ئەوە کەرەکێوییەک لە نێزیک کونەکەی کەوتووە. ڕێوییە بە دیتنی کەرەکێوی گەشـــاوە و گوتی: «خودایە شوکرت وا بە بێ ماندووبوون بە ئاواتی خۆم گەیشتم. لەڕێوە زگی دڕی و دمی درێژ کرد لە نێو کۆئەندامەکانی ناو سکی کەرەکێوییەکەدا دڵەکەی پچڕی و خواردی. هێشتا لە گەرووی نەچووبووە خوارێ کە پەلی تیرەکە لە قوڕگی چەقی. نەدەیتوانی قوتی دا و نەدەیتوانی دەری داتەوە. لەڕێوە خنکاندی و تۆپی. پادشـــای مەزنم، هۆکاری ئەو کارە ئەوەبوو کە بەو بەشەی خودا پێی دابوو، ڕازی نەبوو. دەبێ بەو بەشە ڕازی بین کە خودا دەماندادێ. شوکر و سپاسی بکەین. پادشام، ئێستا چونکە ئەتۆ ڕازی بووی بە بەشی خۆت و دایمە شـوکری خودات کردووە، ئەوە خودا کوڕیشـی پێ بەخشـی. هیوادارم تەمەندرێژ و بەختەوەر بێ و وەچەی ساڵحی لێ بکەوێتەوە و لە سەر ڕێوشوێنی تۆ بێ.

دوای ئەوە وەزیری چوارەم هەستا و کڕنۆشـی برد و گوتی: «ئەگەر پادشا پسپۆڕ و زانا بێ...

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! وەزیری چوارەم گوتی: «ئەگەر پادشایەک لێزان و زانا بێ و داب و دەستووری بەڕێوەبەرایەتی بزانێ و لەگەڵ مسکێنان باش بێ. ڕێزی کەسانی شیاو بگرێ و لە کاتی بەهێزی و دەســـەلاتداریدا لێ بووردە بێ. حورمەتی پلە و پایە بگرێ و ئاگای لێیان بێ. چاوپۆشـی لە هەڵەکانیان بکا و لە سـەر قەول و بەڵێن بێ. شـیاوی بەختەوەری ئەم دونیـا و ئەو دونیـایە و هەر ئەو ئـاکـار و کردەوانەی دەبێتە هۆی ســـەقـامگیری پادشایەتییەکەی و بە سەر دوژمنانیدا زاڵی دەکا. ئەگەریش بە پێچەوانەی ئەوەوە بێ، ئەوە دایمە بۆخۆشی و ولاتەکەشی تووشی کێشە و چەرمەسەری و مەینەتبەشی دەبن. لەتم و سـتەمی دەگاتە دوور و نیزیکی و هەتا ئاخری تووک و نزای خەڵک ئەو پەندەی بە سـەر دینێ کە شـازادە سـەیاح بە سـەر ئەو پادشـایەی هێنا. پادشـا پرسـی: «ئەو ڕووداوە چۆناوچۆن بووە؟»

**[تووک و دۆعای شازادە سەییاح]**

وەزیر گوتی: «لە ولاتی عەرەب، پادشایەکی لەتمکار و زاڵم هەبوو، کە بە سەر خەڵکەوە نەدەچوو. کەس نەدەهاتە ناو ولاتەکەی. پیاوەکانی چوار لەســـەر پێنج پیتاکیان لە خەڵک دەستاند و یەک لە سەر پێنجی بۆ ئەوان دەماوە. هەر ئەو پادشایە کوڕێکی هەبوو بە ناوی سـەعید. هەرکە ئەو بارودۆخەی ئاوا دیت، دەسـتی لە دونیا بەر دا و ڕووی لە دەشـتودەر کرد و خەریکی خودا پەرسـتی بوو. بەردەوام لەوێ بۆ ئەوێ و لەو شـار بۆ ئەو شـار دەڕۆیشـت. ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕێی کەوتە ناو شـارێک. نۆبەدارانی ئەو شـارە گرتیان و پشـکنیان. جگە لە دوو کراس هیچیان وەگیر نەکەوت. ئەوانیش یەکیان کۆن بوو. ئەوی دیکە تازە. کراسـە تازەکەیان لێ ئەستاند. شـازادە وەک گلەیی و گازندە گوتی: «زاڵمەکان ئەمن پیاوێکی هەژار و گەڕۆکم؛ ئەو کراسەی من بە کاری ئێوە نایە. ئەگەر ئێوە کراسەکەم نەدەنەوە، دەچم لە لای پادشـا شـکایەتتان لێ دەکەم. ئەوان گوتیان ئێمە ئەو کارەمان بە فەرمانی ئەو کردووە. چیت پێ خۆشە بیکە. شـازادە سـەییاح بەرەو کۆشـکی پادشـا چوو. ویسـتی بچێتە لای پادشـا. دەرکەوانەکان نەیانهێشـت. ئیدی گەڕاوە لە بەر خۆیەوە گوتی: «ناچارم لە بەر دەرگا دادەنیشـم هەتا پادشـا دێتە دەرێ و چاوم پێی دەکەوێ و شـکایەتەکەم دەکەم. لەو جەنگەیەدا کە شـازادە لەو فکرەدا بوو. بیسـتی یەکێک لە نۆبەدارەکان هات هەواڵی هێنا کە پادشـا ئێسـتا دێتە دەرێ. ئیدی نەختە نەختە چووە بەرەوە لە نیزیک دەرکی کۆشک ڕاوەستا. پادشا هاتە دەرێ.

شـــازادە دۆعای بە خێری بۆ کرد و ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. گوتیشـــی ئەمن پیاوێکی دەروێشـــم و ســـەری خۆم هەڵگرتووە و وەدوای ڕەزای خودا کەوتووم. چوومە لای هەرکەس زۆر بە باشـــی لەگەڵم جووڵاونەوە. بەڵام کاتێک هاتمە ئەو شـــارەی ئێوە، ئەمن چاوەڕێ بووم خەڵکی ئەو شـارەش و وەکوو خەڵکی دیکە بە ڕێزەوە لەگەڵم هەڵسوکەوت بکەن. بەڵام پیاوەکانی تۆ ئەمنیان گرت و جلکەکانیان لێ ئەستاندم و ئازاریان دام. پادشام چاوێک لە بارودۆخ و ڕواڵەتی من بکە و کراســـەکەمیان لێ بســـتێنەوە. بەڵێن دەدەم لێرە نەمێنمەوە و خێرا لەو شارە دەرۆمە دەرێ.

پادشـــای لەتمکار گوتی: «کێ گوتی بێیە ئێرە و لە کاتێکدا تۆ نەتدەزانی ئێمە چۆنت لەگەڵ دەجووڵێینەوە؟» شـــازادە ســـەیاح گوتی: «دوای ئەوەی کراســـەکەتان دامەوە چیم لەگەڵ دەکەن بیکەن.» پادشا کە ئەو قسەیەی بیست، تووڕە بوو گوتی: «گەوجە، ئێمە بۆیە جلەکانمان لێ ئەستاندووی بۆ ئەوەی بتشکێنەوە. ئێستا کە ئەو قسانەم لێ بیستی دەبێ گیانت بتکوژم. ئینجا پادشـــا فەرمانی دا بیخەنە بەندیخانەوە. کاتێک شـــازادەیان خســـتە بەندەوە. پەشیمان بووەوە لەوەی کە ئاوای وەڵامی پادشا دابووەوە. خۆی سەرکۆنە کرد کە ئەمن چم لەوەی دابوو. گیانی خۆم خستە مەترسییەوە. لە نیوەشەودا هەستا و نوێژێکی دوور درێژی کرد و گوتی: «خودایە تۆ عادڵ و زانای، ئاگات لە حاڵی من هەیە. ئەمن بەندەیەکی زوڵم لێ کراوی تۆم. لە بەر دەرکی ڕەحمەتت دەپاڕێمەوە لە چنگ زوڵمی ئەو ســـتەمکارە ڕزگارم بکە و ئەو زوڵم و ســـتەمەی دەیکا ئاوقای خۆی کەوە. بۆخۆت ئاگات لەو هەموو زوڵمە هەیە کە ئەو دەیکا. جا ئەگەر پێت وایە زوڵمی لێ کردووم ئەوە تووشـی مەینەت و چارەڕەشی بکە. چونکە تۆ پەنای بێ پەنایانی و هەرچی بتەوێ بیکەی لە دەستت دێ.

کاتێک بەندیوانەکە گوێی لە تووک و دۆعای ئەو بەندییە بوو، ترســـا. لەو جەنگەیەدا ئاگرێک لە کۆشک بەربوو. ئەوەی لە کۆشکدا بوو سووتا و جگە لە بەندییەکە و بەندیوانەکە کەس نەماوە. ئەوجار بەندیوانەکە و شازادە سەیاح لە شار چوونە دەرێ و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شارێکی دیکە. شـارەکەی پادشا ستەمکارەکە بە هۆی لەتم و ستەمەکانی ئەوەوە هەمووی سووتا.

پادشـام، ئێستا ئێمە هەموو بەیانی و ئێوارەیەک دۆعای تەمەندرێژی و ڕاوەستاوی بۆ تۆ دەکەین و شوکری خودا دەکەین لەبەر دادپەروەری و ئاکاری باش و جوانی تۆ. لەوەی کە ئەتۆ منداڵی نێرینەت نەبوو جێگات بگرێتەوە نارەحەت و نیگەران بووین. دەترســـاین یەکی دیکە ببێتە پادشـای ئێمە. سپاس بۆ خودا کە لە گەورەیی و دەهەندەیی خۆیەوە ئەوە کوڕی کردە خەڵاتی تۆ. لە خودا داواکارین کوڕێکی ســـاڵح و ئاکارجوان بێت و بتوانێ ڕێبازی تۆ درێژە پێ بدا.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! دوای ئەوە وەزیری پێنجەم هەســـتا و گوتی: «بەرز و مەزنە ئەو خودایەی کە دیـارییە گەورەکـان دەدا. بەڵام ئێمە بە لێکۆڵینەوە بۆمـان دەرکەوتووە کە خودای تەعالا بەو کەسـانەی کە شـوکری ئەو بەجێ دێنن و ئاگایان لە دینەکەیانە، نیعمەتی زیاتر دەدا و ئەتۆش پادشام لەو جۆرە شکۆ و دادپەروەریانە بە بەژنت براوە. بۆیە خودای گەورە پلە و پایەی بەرز کردوویت و ڕۆژگاری پڕ کردوویت لە بەختەوەری. لەو پەڕی بێ هیوایدا ئەو دیارییە، کە کوڕەکەتە بە تۆی بەخشـیوە. بەو جۆرە ئێمەشـــی لەو نیگەرانییە ڕزگار کرد کە نەکا کوڕێکت نەبێ، جێگات بگرێتەوە. ئێمەش لە ناو خۆماندا تووشـــی چەند بەرەکی بین و وەک قەلەڕەشـــەکەمان بە ســەر بێ.» پادشـا گوتی: «بۆ قەلەڕەشــە چی بە سەر هات؟»

## [بەسەرهاتی شەهێن و قەلەڕەشە]

وەزیر وەڵامی داوە: «پادشـــــام، مێرگ و مێرغوزارێکی پان و بەرین بوو کە پڕ بوو لە جۆگەلە ئـاو و داری بەری. مەل و بـاڵنـدەی ئـاوازخوێنی لێ بوو. بۆ وێنە کۆمەلە قەلەڕەشـەیەکی لێ بوو کە لە خێر وخۆشی و کەیف و شـادیدا بوون. سەرۆک و گەورەی ئەوان قەلەڕەشـــەیەک بوو کە لەگەڵیـان زۆر دڵنەرم و بە بەزە و لەســـەرخۆش بوو. قەلەڕەشەکان بە هۆیی نییەت پاکی ئەوەوە ئاسوودە و بێ خەم بوون. هیچ کام لەوان لەتم و ستەمی لەوانی دیکە نەدەکرد.

ڕێکەوت وا بوو، گەورەی قەلەڕەشـــەکان مرد و کۆچی کرد بۆ دونیای ئەولا. قەلەکان دۆش دامان و ماتەمیان گرت و زۆر زۆریان خەم بوو. زۆرتر لەبەر ئەوەش بوو کە کەسی وایان وەگیر نەدەکەوت وەک ئەو دادپەروەر و ئاکار جوان بێ هەتـا بیکەنە ســـەرۆکی خۆیان. ناچار تەواوی قەلەکان کۆ بوونەوە تا لە نێوان خۆیاندا کەســێک وەک ســـەرۆک دیاری بکەن هەتا کار و باریان ڕاپەڕێنێ و کێشـــە و گیروگرفتەکانیان بۆ چارەســـەر بکا. بەشـێکیان قەلێکیان هەڵبژارد و گوتیان ئەوە شـیاوی ئەوەیە ببێ بە ســەرۆک و گەورەی ئێمە. بەشـــێکی دیکەیان ئەویان پێ باش نەبوو. گوتیان دەبێ یەکی دیکە بێ. بەو جۆرە کێشـــە و دوو بەرکەی کەوتە بەینیانەوە. هەموو لە ســـەر ئەوە ڕێکەوتن کە ئەو شـــەوە بخەون و بەیانی کەس نەچێ بە دوای تۆشـــە و بژیوی ڕۆژانەدا. هەر کە ڕۆژ بووەوە، لە شـــوێنێک کۆ ببوونەوە بۆ ڕاوێژ کە لە پڕدا شـــەهێنێک بە وێدا هات. ئەوان گوتیان باوکی خێر و بێر، ئێمە ئەتۆمان بە گەورە و ســـەرۆکی خۆمان قەبووڵ کردووە. هەتا چاوەدێری

کاروبارمان بکەی. شـەهێنەکە قسـەی ئەوانی قەبووڵ کرد و پێی گوتن: «ئەمن چاکەم زۆر بۆ ئێوە دەبێ.» دوای ئەوەی قەلەکان شـــەهێنەکەیان کرد بە ســـەرۆک و میری خۆیان، هەموو ڕۆژێ کاتێک کە قەلەکەکان دەچوون بۆ دانە و ئاو یەکیانی گل دەداوە و مێشـک و چاوی دەردێنان و دەیخوارد و بەشـەکەی دیکەی جەسـتەیانی فڕێ دەدا. ئیدی ئەوە کاری ئەو شـــەهێنە بوو. هەتا قەلەکان بە کاری ئەویان زانی. ســـەیریان کرد زۆربەی گەورە گەورەکانی ئەوانی کوشـتووە. ئەوجار تەواو ترسـیان ڕێ نیشـت و گوتیان: «کاتی ئەوە هاتووە فریای گیانی خۆمان کەوین.» بەیانی زوو هەر کام لە قەلەکان بەرەو لایەک هەڵات و خۆی لە دەست شـەهێنەکە ڕزگار کرد.» پادشـام، ئێمەش لەوە دەترسـان کەسێکی دیکە ببێ بە پادشـــامان. وا بوو خودای تەعالا ڕوحمی پێ کردین و ئەو نیعمەتە گەورەیەی پێ بەخشین. «فەتەبارەکەڵلاهولعەزیم و لە هولحەمد.»

دوای ئەوە وەزیری شەشەم هەستا و گوتی: «پادشام، خودای گەورە لەم دونیا و لەو دونیا بە گەورەیی و ڕێزتەوە زیاد بکا. پێشـینیان گوتوویانە: «هەرکەس نوێژ بکا و ڕۆژوو بگرێ و گوێڕایەڵی دایک و بابی بێ و بە قســـەیان هەسـتێ و دانیشـــێ. لە نێو مســـکێنان دادپەروەر و بە ئینســـاف بێ. لە ڕۆژی پەســـڵاندا بە دیداری خودای خۆی شـــاد دەبێ.» ئەتۆش پادشـــا، لە نێو ئێمەدا دادپەروەر بووی و لەگەڵ مســـکێناندا باش بووی. ئێمەش لە خودامان دەوێ کە لەگەڵت باش بێ و ولام و پاداشی ئەو چاکانەت بداتەوە.

پادشـــام، ئەوەی کە ئەو وەزیرە زانایە گوتی بیسـتت. بۆت دەرکەوت کە نیگەرانی ئێمە ئەوە بوو، کە پادشـــــامان نەمێنێ و کەســـێکی واش نەبێ کە لە ئاکار و دادپەروەری و ئینسـافدا وەک ئەو بێتەوە و جێگای بگرێتەوە. دوای پادشـا کێشـەمان لە نێواندا ساز بێ و بە هۆی ئەو ناکۆکی و ئاژاوەوە بەڵامان بە ســەر بێ و پەرەمپەرەم بین. ئەو دەم لە ســەر شانمان فەرز بێ دەست بکەین بە شین و گریان و داوای کوڕێکی ڕەسەن لە خودا بکەین بۆ پادشـــامان هەتا دوای ئەو ملک و ســـامان و وڵاتەکە بەو ببڕێ. بەڵام ئەوەشـــی هەیە جاری وایە مرۆڤ بە شتێک دڵی خۆشە و بەڵام ناشزانێ کە ئاکامەکەی چۆن دەبێ. کەچی لە خوداشـــی دەوێ. دەبینی تووشـــی زیان و پەشـیمانی دەبێ. کە وایە مرۆڤ نابێ داوای شـــتێک بکا کە خێر و شـــەڕبوونی نازانێ لەبەر ئەوەی ڕەنگە زیان و زەرەری لە قازانجی زیاتر بێ. ئەودەم هەر ئەو شـتەی کە داوای دەکەی دەبێتە هۆی تێدا چوون و ڕۆژڕەشـی خۆت. ئیدی ئاوای بە سەر دێ کە بە سەر کابرای مارگر و ژن و منداڵەکانیدا هات.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و حەوتەم هاتەوە

### [بەسەرهاتی مارگر]

گوتی: خاوەنشکۆ! پادشا پرسی: «بەسەرهاتی مارگر چۆنە؟» وەزیر وەڵامی داوە: «پادشام، کابرایەک بوو ماری ڕا دەگرت و پیشەی مارگرتن بوو. سەوەتەیەکی گەورەی لە ماڵێدا هەبوو ماری تێدەخست. ژن و منداڵەکەشی بەو کارەیان نەدەزانی. کابرا هەموو ڕۆژێ ماری هەڵدەگرت و بە ناو شاردا دەیگێڕا. ئیدی ئەوە پیشەی بوو. بێ ئەوەی کەس لە ماڵێدا بزانێ ئەو سەوەتەیە چی تێدایە.

بە ڕێکەوت، ڕۆژێ هەر وەک ڕۆژان هاتەوە ماڵێ. ژنەکەی لێی پرسی: «ئەرێ پیاوەکە ئەو سەوەتەیە چی تێدایە؟» کابرا گوتی: «چکارت بەوەی داوە، خۆ لە هیچتان کەم نییە؟ بەوە ڕازی بە کە خودا دەتداتێ و لە خۆڕا پرسیاریش مەکە.» ژنە دمی لێک نا و بێدەنگ بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمن هەر دەبێ بزانم ئەو سەوەتەوەیە چی تێدایە.» منداڵی لێ هان دا، پێداگری بکەن تا بزانین چی تێدایە. منداڵەکانیش پێیان وا بوو، ئەو سەوەتەیە شتی خواردنی تێدایە. هەر بۆیە باوکیان هەڵپێچا شتی ناو سەوەتەکەیان پێشان بدا. کابرای مارگریش جوابی منداڵەکانی نەداوە و پێی گوتن لەو بارەوە پرسیار نەکن. ماوەیەکی زۆر ئەو کێشەیە لە نێوانیادا بوو. ژنەش هەر منداڵەکانی دنە دەدا. ئاخری وای لێ هات منداڵەکان لەگەڵ دایکیان ڕێک کەوتن، دم لە خواردن و خواردنەوە نەدەن هەتا کابرا شتی نێو سەوەتەکەیان پێشان نەدا.

شەوێک کابرای مارگر هاتەوە ماڵێ و خواردنێکی زۆری لەگەڵ خۆی هێناوە، منداڵەکانی بانگ کرد بێن و لە لای دانیشن و خواردنەکەیان بخۆن. کەچی ئەوان نەهاتنە لای و دمیان لە خواردنەکە نەدا. لەو لاوە بە لالووتی دانیشتبوون. باوکیان بە زمانی خۆش و سۆزەوە پێی گوتن: «ڕۆڵە گیان، لە خواردن و خواردنەوە و لەبەرکردن چیتان پێویستە پێم بڵێن با بۆتان بێنمەوە.» منداڵەکان گوتیان: «بابە ئێمە هیچمان لە تۆ ناوێ، بەس سەری ئەو سەوەتەیەمان بۆ هەڵپچڕە بزانین چی تێدایە. دەنا خۆمان دەکوژین.» بابیان پێی گوتن: «ڕۆڵەکانم هەڵگرتنی سەری ئەو سەوەتەیە قازانجێکی بۆ ئێوە نییە هیچ، ڕەنگە زەرەریشی هەبێ.» منداڵەکان ئەوەندەی دیش بە قینذا چوون. کابرا کە منداڵەکانی ئاوا دیت. ترساندنی و گوتی: «ئیدی ئاوا بکەن لێتان دەدەم.» بەو قسەی باوکیان ئەوەندەی دیش کوڵەڕەو بوون.

لەو جەنگەیەدا کابرای مارگر دەستی دا گۆچانەکەی لێیان بدا. ئەوان هەڵاتن. سەوەتەکەش لە ماڵێ بوو، کابرا کە لەگەڵ منداڵەکانی خەریکی ئەو مشتومڕە بوون، ژنە

چوو به دزییەوەوە سەری سەوەتەکەی هەڵپچڕی چاوی لێ بکا. لە پڕدا مار بە وڵاتیدا بڵاو بوونەوە. لە ڕێوە بە ژنەیانەوە دا و کوشــتیان. ئەو جار بەولا و لادا خوشــین. تا وای لێ هات، بێجگە لە مارگر ورد و درشـــتی ئەندامانی بنەماڵەکەی کوشـــت. مارگر ماڵی بەجێ هێشت و وەدەر کەوت. خاوەنشکۆ، انسـان نابێ جگە لەوەی خودای تەعالا ویسـتوویەتی داوا بکا. بەڵکوو دەبێ بەوەندەی خودا پێی داوە دڵخۆش و ڕازی بێ. ئێســـتا خودای میری مەزن بە هۆی ئەو کوڕەوە دوای ئەو هەموو بێ هیواییە دڵی تۆی شـــاد کردووە و چاوی تۆی ڕوون کردووەتەوە. تکای ئێمە لە خودا ئەوەیە کە کوڕێکی دادپەروەر بێ.

دوای ئەوە وەزیری حەوتەم گوتی: «پادشـــام، ئەوەی کە برادەران لە پەســـنی تۆدا گوتیان هەموویم پێ ڕاســـتە و وایە. ئەتۆ لە بابەت دادپەروەری و ئینســـاف و ئاکاری جوانەوە، لەگەڵ هەموو پادشاکانی دیکە جیاوازیت هەیە و خوو و خدە و تایبەتمەندییەکانت لە هەموو پادشـاکان لە سەرترە. ئێستا من دەڵێم سپاس بۆ خودا کە وەجاخی تۆی ڕوون کردەوە و بەو جۆرە ئێمەی بەســـەر کردەوە، هەتا ئێمە شـــوکری ئەو بەجێ بێنین. ئەو نیعمەتەش بە قســـمەت نەدەبوو، ئەگەر تۆمان نەبا. مادام کە تۆ لە نێو ئێمە دای، ئێمە لە زوڵم و ســـتەمی کەس ناترســـین و کەس ناتوانێ خۆی لە ســـەر ئێمە پێ شـــتێک بێ. لە قەدیمەوە گوتوویانە، پەســترین و خوێڕیترین مســـکێنان ئەو مســـکێنانەن کە پادشـــاکەیان ستەمکارە. هەر وەها گوتوویانە لە کونی مارێکدا مارانگاز بی، باشترە لەوەی لە وڵاتێک بی پادشـاکەی سـتەمکار بێ. ئێسـتا شـوکری خودا کە تۆی داوە بە ئێمە و دوای بێهیوابییەکی زۆر ئەو کوڕەشی بە تۆ بەخشیوە. بە هۆی نییەت پاکی و لەسەرخۆییت ئەو کارەی لەگەڵ تۆش کرد کە لەگەڵ جاڵجاڵۆکەی کرد.» پادشـــا پرســـی: «جاڵجاڵۆکەی چی؟ دا بۆم بگێڕەوە؟»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و هەشتەم هاتەوە

[بەسەرهاتی جاڵجاڵۆکە]

گوتی: خاوەنشکۆ! وەزیر گوتی: «پادشام، جاڵجاڵۆکەیەک بە دەرگایکی بەرزەوە خۆی هەڵواسی و لەوێ هێلانەیەکی ساز کرد. بێ مەترسی لەو ماڵەیدا دەژیا. لەبەر ئەوەی کە خودا ئەو شوێنەی بە قسمەت کردبوو، لە بەلا و نەهاتی پاراستبووی دایمە شوکری خودای دەکرد و بە ئاسوودەیی دەژیا. هەتا وا بوو، ڕۆژێک خودای میری مەزن ویستی سەبر و خۆڕاگری ئەو تاقی کاتەوە. هەر بۆیە بایەکی توندی بۆ نارد.

با هێلانەکەی برد و خستییە دەریاوە. شەپۆل بردی. بردی هەتا گەیاندییە ڕۆخ دەریا. ئینجا جاڵجاڵۆکەکە سوژدەی برد و شوکری خودای کرد کە بە سلامەتی ڕزگاری بوو. ڕووی لە با کرد و گوتی: «ئەوە چ خۆشییەکت پێ گەیشت ماڵی منت تێکدا و منت هێنا ئێرە؟» با گوتی: «سەرکۆنەم مەکە زوو دەتبەمەوە شوێنەی خۆت.» جاڵجاڵۆکە ئەهوەن بووەوە و هیوای هاتەوە دڵی کە دەگەڕێتەوە جێی خۆی. بای شەماڵ ڕۆیشت. دوای ماوەیک بای زریان هەڵی کرد و جاڵجاڵۆکەی هەڵگرت و بردییەوە شوێنەکەی خۆی. جاڵجاڵۆکە دەرگاکەی دی، ناسییەوە و چووەوە شوێنەکەی خۆی. پادشام، ئەتۆش بە هۆی سەبر و لەسەرخۆیی و سپاسگوزاریت لە تەنیایی ڕزگارت بوو. دوای ماوەیەک بێ هیوایی و پیری، خودا بەسەری کردییەوە و وەجاخی ڕوون و دڵی خۆش کردی.»

پادشا کە قسەکانی ئەوی بیست ڕووی لە خودا کرد و شوکر و سپاسی کرد و گوتی: «شوکر و سپاس بۆ خودا کە دوای هیوابڕان و بێ ئومێدی دیسان تیشکی هیوای گەڕاندەوە ناو دڵەکانمان و ئەو کوڕەی پێ بەخشیم وەجاخم کوێر نەبووەوە و ئەو تاج و تەخت و وڵاتە بێ خاوە نەماوە.» ئیدی دوای ئەوەی پادشا شوکر و سپاسگوزارییەکەی تەواو بوو. حەکیمان و زانایان هەستان و شوکری خودایان کرد و دوعای بە خێریان بۆ پادشا کرد. دەستیان ماچ کرد و هەر کەسەی چووەوە ماڵە خۆی. پادشاش ڕۆیشتەوە ماڵەکەی خۆی. داوای کوڕەکەی کرد، کوڕەیان بۆ هێنا. پادشا بانگی بە گوێیدا دا و ناوی نا، وەرد خان.

کاتێک تەمەنی شەش ساڵی تێپەڕ کرد، پادشا ویستی بینێرێتە بەر خوێندنی زانست. کۆشکێکی لە نێوەڕاستی شار بۆ ساز کرد. سێسەد و شەست دیوی لەو کۆشکەدا چێ کرد. کوڕەکەی بردە ئەوێ و سێ دانە حەکیمی زانای بۆ تەرخان کرد. پێشی گوتن شەو و ڕۆژ لە بیر پەروەردەی ئەودا بن. هەر ڕۆژەی لە دیوێکدا دانیشن و هیچ زانستێک نەمێنێتەوە فێری نەکەن. با لە تەواوی زانستەکاندا شارەزا بێ. لە سەر دەرکی هەرکام لەو

دیوانە ئەو وانەیەی کە لەوێدا فێری دەکەن بنووسن. پێشی گوتن: هەموو حەوتوان بە پادشا ڕاگەیەنن کە چ زانستێک فێر بووە و پادشای لێ ئاگادار کەنەوە. زانایان سەرقاڵی ڕاهێنان و بارهێنانی کوڕە بوون. شەووڕۆژ لە کاری خۆیان خافڵ نەبوون و بەردەوام بوون. تا وای لێ هات بەر لەو کەس لە باری زانایییەوە نەگەیشتبووە ئەو ئاستە. حەکیم و زانایان هەموو حەوتوویەک پادشایان لە ڕادەی فێربوونی ئاگادار دەکردەوە. بە پادشایان دەگوت کە ئێمە کەسمان نەدیوە خودا بە قەد ئەوی زیرەک و بەهۆش‌وگۆش ئافراندبێ. خودا پێت ببڵێ و مایەی خێر و بێر و حەسانەوەت بێ.

کە دوازدە ساڵی تێپەڕ کرد. شازادە هەموو زانستەکان بە جۆرێک فێر بوو کە تا ئەو کات کەس ئەوەندە زانا و شارەزا نەببوو. ئەوجار حەکیم و زانایان ئەویان هێنا لای پادشا و پێیان گوت: «پادشا، چاو و دڵت ڕوون، کە خودا کوڕی ئاوای پێ داوی. ئێمە تەواوی زانستەکانمان فێر کردووە و هێناومانەتەوە لای خۆت. ئەوڕۆ کەس لە پلە و پایەی زانستی ئەو کوڕەی تۆدا نییە.» پادشا بە قسەکانی ئەوان کەیفی ساز بوو. سوژدەی برد و شوکری خودای کرد.

دوای ئەوە شەمماسی وەزیری بانگ کرد و پێی گوت: «وەزیر، حەکیمان و زانایان هاتن و پێیانگوتم کە کوڕەکەم تەواوی زانستەکان فێر بووە و لە تەواوی زانایان زاناترە.» وەزیر کە ئەوەی بیست کڕنۆشی برد و دەستی پادشای ماچ کرد و گوتی: «یاقووت ئەگەر لە ناو دڵی کێوێکی سەختیشدا بێ. مەحاڵە تیشک نەداتەوە. ئەو کوڕەی تۆ توانایی و لێهاتوویێکی کێواسای هەیە. ئەگەر ئەو سەرەڕای ئەو منداڵییەشی حەکیم و زانا بێ، هێشتا شتێکی سەیر نییە. سپاس بۆ ئەو خودایەی ئەوی دا بە ئێمە. سبەینێ زانایان و ئەمیران کۆ دەکەینەوە لە کۆڕەکەدا لە بارەی زانیارییەکانییەوە قسەی لەگەڵ دەکەین.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی نۆسەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــكۆ! پادشــا كاتێك وتەكەی شــەممـاســی وەزیری بیســت، فەرمووی كە زانایان و شـارەزایان و حەكیمانی پایەبەرز ئاگادار كەنەوە كە بەیانی لە كۆشـك كۆ بنەوە. وەزیر ئەو كارەی كرد. كە ڕۆژ بووەوە هەموویان هاتن كۆ بوونەوە. وەزیر هات و دەستی پادشای ماچ كرد. شازادە هەستا و كڕنۆشی بۆ وەزیر برد. شەمماس گوتی: «نابێ بەچكە شێر كڕنۆشی ئاژەڵی كێوی بەرێ.» شازادە گوتی: «بەچكە شێر كە وەزیری پادشا ببینێ دەبێ كڕنۆشی بۆ بەرێ.» ئینجا شەمماسی وەزیر گوتی: «پێم بڵێ، هەمیشەی ڕەها كێیە و دوو جیهانەكە كامانەن و ئەو كەســــە كێیە لە هەردوو جیهانەكەدا بۆ هەتا هەتایە هەر دەمێنێتەوە؟» هەمیشـــــەی ڕەها خودای مەزن و خاوەنشـــــكۆیە. چونكە ئەو یەكەمێكە كە سەرەتای نییە و ئاخرینێكە كە كۆتایی نییە. دوو جیهانەكە ئەم دونیایەیە و ڕۆژی پەسڵان. واتە ئەو دونیای دیكە. ئەوەی كە لە هەردوو جیهانەكەی هەر دەمێنێتەوە نیعمەتی ڕۆژی پەسـڵانە.» شـەمماس گوتی: «ڕاسـتت گوت. بەڵام پێم خۆشـە پێم بڵێی لە كوێوە زانیت كە دوو جیهانەكە یەكیان ئەم دونیایەیە و ئەوی دیكە ڕۆژی قیامەتە؟» شــازادە وەڵامی داوە: «لەوێوەكە دونیا ئافرێندرا لە كاتێكدا هیچ شـتێك نەئافرابوو. بەس زەوییەك بوو كە هەموو شـتێك خێرا تێدا دەچوو. كار و كردەوەی خەڵكیش پێویسـتی بە سـزا و پاداش بوو، ئەوە بەو مانایە بوو كە پێویستە ڕۆژێكی دیكە ببێ بۆ لێپێچینەوە. واتە ڕۆژی دوایی.» شەمماس گوتی: «قسەكەت ڕاستە. بەڵام پێم بڵێ كە لە كوێوە زانیت نیعمەتەكانی ئەو دونیا دایمییە؟» شـازادە گوتی: «لەوێوە كە ڕۆژی دوایی، شـوێنی پاداشـی كارەكانی بەندەكانە. كە خودای نەمر و هەتاهەتایی بۆ بەندەكانی چێ كردووە.»

شەمماس گوتی: «پێم بڵێ، لە دونیادا ڕێز لە كاری كێ دەگیرێ؟» شازادە وەڵامی داوە ئەو كەســــەی كە لە كارەكانی دونیاییدا ڕۆژی دوایی لە بەر چاو دەگرێ و دونیای فیدای ڕۆژی پەسڵان دەكا.» شەمماس گوتی: «كێیە ئەو كەسەی كە دونیای فیدای ڕۆژی دوایی دەكا؟» شازادە گوتی: «ئەو كەسەی كە دەزانێ مزڵەكەی لە خانوویەك دایە كە كاول دەبێ و بۆخۆی دەمرێ و ڕۆژێك دادێ لێ پرســـینەوەی لەگەڵ دەكەن. كەســـێك كە بزانێ لەم دونیایەدا بۆ هەتا هەتا دەمێنێتەوە قەت دونیای فەدای قیامەت نەدەكرد.» شـــەمماس لێی پرســـی: «گەلۆ بەبێ بوونی دونیا دەكرێ پەســـڵانێك هەبێ یا نا؟» شـــازادە وەڵامی داوە: «كەسێك كە ئەم دونیای نییە، ئەو دونیاشی نابێ. ئەمن دونیا و خەڵكەكەی و ڕۆژ قیامەت كە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوێ، وەك خەڵكی ئەو سەفیرەم[1] دێتە بەر چاو. كە میرەكەیان شوێنێكی

[1]. لە فارسییەكەدا ئاوا «صفیر» نووسراوە كە ماناكەی لەگەڵ دەقەكەدا یەك ناگرێتەوە. هەر بۆیە ناچار هەر

تەنگەبەری بۆ ســـاز کردوون و ئەوانی لەوێ کردووە. ڕاشـــی ســـپاردوون کارێک بکەن. ماوەیەکیشی بۆ دیاری کردوون. کەسێکیشی وەک چاوەدێر لە سەر داناون. هەرکەس ئەو کارەی کرد کە پێی گوتراوە ئەوە چاوەدێرەکە لەو شـــوێنە تەنگەبەرەی دێنێتە دەرێ. هەر کەســـیش ماوەکەی تەواو بێ و کارەکەی نەکردبێ ئەوە ســـزا دەدرێ. لەو جەنگەیەدا کە ئەوان خەریکی کـارکردنن لە درزی دیوەکەیـانەوە کەمێـک هەنگوین دەتکێنـدرێتە ژوورەکەیانەوە. ئەوان ئەو هەنگوینە دەخۆن و کەیف بە شیرینییەکەی دەکەن. لە کارەکەیان شـــل دەبنەوە و هەر بە دیوە تەنگەبەرەکەیان ڕازی دەبن. ســـەرەڕای ئەوەی کە دەزانن ئەگەر بێتوو کارەکەیان تەواو نەکەن ســـزا دەدرێن. ئەوان هەر بە نەختە هەنگوینەکەیان ڕازی دەبن. چاوەدێرەکەش کاتێک ماوەکەیان تەواو دەبێ، یەک دانەشیان لەوێدا ناهێڵێتەوە و لەو دیوە دەریان دەکا. ئەمن دونیام ئاوا دێتە بەرچاو کە ماوەیەکی بۆ دیاری کراوە. لە دونیادا هەرکەســـەی خۆی بە نەختە شـــیرینییەکەوە ســـەر قاڵ بکا، ئەوە لەوانە دەبێ کە ڕزگاریـان نـابێ. چونکە ئەو جۆرە کەســـانە دونیایـان لە جیاتی قیامەت هەڵبژاردووە. کەسـێکیش کە قیامەت هەڵبژێری و دونیای فیدای ئەو بکا، ئەوە بەو نەختە شـیرینییە قایل نابێ و خۆی ڕزگار دەکا.»

شـەمماس گوتی: «ئەوەی لە بارەی دونیا و قیامەتەوە گوتت بیسـتم و قەبووڵمە. بەڵام ئەمن وا هەســـت دەکەم کە ئەوان بە ســـەر مرۆڤدا زاڵن و مرۆڤ دەبێ کـارێک بکـا هەردووکیـان بە یەکەوە بگرێ، هەر چەند لە یەک جیاوازن. ئەگەر مرۆڤ خەریکی دابین کردنی بژێو بێ، ئەوە جەســـتەی کز و لەڕ دەبێ و تووشـــی ســـەختی و نارەحەتی دەبێ. هەرچی بێ مرۆڤ نـاتوانێ دوو شـــتی دژ بە یەک بەیەکەوە ڕاگرێ. شـــازادە گوتی: «هەرکەس وە دوای پێداویستی دونیا کەوێ بە کاری ڕۆژی پەسـلانیشـی دێ. ئەمن دونیا و قیامەتم وەک دوو پادشای ستەمکار و دادپەروەر هاتووەتە بەر چاو. کە وڵاتی پادشای ســـتەمکار دار و درەخت و مەزرای ســـەرســـەوز و کانیاوی زۆری هەبوو، بەڵام هیچ بازرگانێک نەبوو کە ماڵ و سامانەکەی لێ نەستاندبێ. کەچی چونکە وڵاتی ئەو پادشایە پڕ بوو لە نیعمەت و بەکەت و ڕزق و ڕۆژی، هەرچی ئەو پادشـــایە بیکردبایە لێیان قەبووڵ دەکرد. پادشـــای دادپەروەر ماڵ و ســـامانێکی زۆر دا بە پیاوێکی وڵاتەکەی و پێی گوت بچووە وڵاتی ئەو پادشـــا لەتمکارە و بەو ماڵە گەوهەرێکی زۆر بکڕە. ئەو پیاوە ماڵەکەی هەڵگرت و ڕۆیشـت. گەیشـتە وڵاتی پادشـا ستەمکارەکە. بە پادشـایان گوت کە بازرگانێک هاتووە و ماڵێکی زۆری پێیە. دەڵێ هاتووم بەو ماڵە زێڕ و گەوهەرێکی زۆر بکڕم. پادشـــا بانگی ئەو بازرگانەی کرد و پێی گوت: «ئەتۆ کێی و لە کوێوە هاتووی و چیت دەوێ لە وڵاتی ئێمە؟» بازرگان وەڵامی داوە کە من خەڵکی فڵانە وڵاتم. پادشـــای ئەو وڵاتە ماڵێکی

---

سەفیرم نووسی.

زۆری داوه بە من و ناردوومی گەوهەرەکانی ئێرە بکڕم. ئەمنیش بە گوێم کردووە و هاتوومە ئێرە. پادشا پێی گوت: «ئەخە تۆ نەتبیستووە ئەمن هەموو ڕۆژێ ماڵ و سامان لە خەڵکەکەی خۆم دەستێنم. ئەی چۆن هاتوویە ئەو وڵاتەی من؟» بازرگانەکە وڵامی داوە: «ئەمن ماڵ و سامانم نییە، ئەو ماڵەش ئەمانەتە لای من هەتا بیگەیەنمە دەست خاوەنەکەی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـکۆ! پادشـا سـتەمکارەکە گوتی: «ئەگەر تەواوی ماڵ و سـامانەکەت تەرخان نەکەیت بۆ کڕینەوەی خۆت، ئەوە ناهێڵم لەو وڵاتەدا بژیوی خۆت پەیدا کەیت هەتا قڕت دێ.» ئەو کابرایە لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمن تووشم بووە بە تووشی دوو پادشاوە، دەشـزانم کە ئەو پادشـایە زوڵم لە تەواوی خەڵکی وڵاتەکەی خۆشـی دەکات. ئەگەر بێت و ڕازی نەکەم ئەوە ماڵەکەشم دەچێ و بۆخۆشـم تێدا دەچم. هیچیشـم وەگیر ناکەوێ. ئەگەر تەواوی ماڵەکەم بدەم بەو پادشـایە ئەوە بە دەسـت پادشـاکەی خۆم گیانم دەکەوێتە مەترسـییەوە. وا چاکە لەو ماڵە بەشـێکی لێ بدەم بەو پادشـا زاڵمە و ڕازی بکەم و ئەو بەڵایە لە کۆڵ خۆم بکەمەوە. پاشـان لێرە دەمێنمەوە و گەوهەرەکان دەکڕم. ئەوجار بە گەوهەرەکـانەوە دەگەڕێمەوە بۆ لای خـاوەن مـاڵەکە و لە گەورەیی و دادپەروەری و دەهەندەیی ئەو ڕادەبینم کە سـزام نەدا. دوای ئەوە، بازرگانەکە بە پادشـا سـتەمکارەکەی گوت: «پادشـام، ئەمن ماڵەکە دەدەم بۆ کڕینەوەی خۆم و کەمێک بۆ خۆم دەگێڕمەوە.» پادشـا زاڵمەکە لێی قەبووڵ کرد و لە کۆڵی بووەوە. کابرا ئەوجار چوو، ئەو نەختە ماڵەی پێی مابوو هەمووی دا بە گەوهەر و گەڕاوە بۆ لای خاوەن ماڵەکە. پادشـای دادپەروەر میناکی ڕۆژی پەسڵانە و ئەو گەوهەرانەی دیکە وڵاتی پادشا ستەمکارەکەیە، میناکی چاکە و کاری باشـە. ئەو کابرایەی ماڵەکەی پێیە، کەسـێکی دونیاخوازە و ئەو ماڵەی پێشـێتی میناکی ژیانی مرۆڤە. ئەمن کە ئەوەم دیت، زانیم بۆ کەسـێک کە لە دونیادا بە دوای پەیداکردنی بژیوی ژیانەوەیە جێی خۆیەتی بۆ ڕۆژێکیش حیسـابی ئەو دونیا لە بیر نەکا. ئەگەر بێت و ئاوا بێ ئەوە دەتوانێ ئەم دونیا و ئەو دونیاش لە خۆی ڕازی بکا.»

شەمماس گوتی: «پێم بڵێ گەلۆ جەستە و ڕووح لە پاداش و سزادا بەشدارن یان سزا تایبەتی خاوەنی حەز و ئیشـتیاکان و بکەری تاوانەکانە؟» شـازادە وەڵامی داوە: «جاری وایە ئیشـتیای چوون بەرەو گونا بە هۆی نزم بوونی ئاسـتی وجوودەوەیە و ئەگەر بێتوو تۆبە بکرێ پاداش دەکرێ. جەسـتە بێ خواردن نابێ. پاکی ڕووح لە دونیادا و خەوشـی نییەت و بەرەو چاکە چوون لە ڕۆژی پەسـڵاندا پاداشـی چاکەی بە دواوە دەبێ.کەوایە جەسـتە و ڕووح وەک ئەسـپی بەسـتراوە و منداڵی پشـت دەرگا وان، لە سـزا و پاداشـدا شـەریکن. ئەوانە وەکوو کوێر و پەککەوتەکەیان لێ هاتوو کە خاوەن باخێک ئەوانی بردە ناو باخەکەوە و پێی گوتن زەرەم لێ نەدەن. کاتێک میوەکانی ئەو باخە گەیشتنێ، بێ قاچە پەککەوتەکە بە کوێرەکە گوت: «ئەو میوانە گەیون و زۆرم ئیشـتیا لێیانە و قاچم نییە دا تۆ کە قاچت هەیە هەستە بچووە بەشی خۆم و خۆشت بێنە.» کوێرە گوتی: «ماڵت نەشێوێ، شـتێکت وە بیر من خسـتەوە کە نە لە بیرم بوو، نە ئیشـتیام لێی بوو. ئێسـتا بۆ ئیشـتات

بزواندم. خۆ ئەمن بۆم لێ نابێتەوە، لێم دیار نیم تا لێیان کەمەوە. ئەوان خەریکی ئەو قسانە بوون کە خاوەن باخەکە پەیدا بوو. ئەو پیاوێکی ژیر و زانا بوو. پەککەوتەکە بە باخەوانەکەی گوت: «ئەمن ئێشتیام چووەتە ئەو میوانە و وەک بۆخۆت دەزانی ئەمن پەککەوتەم و هاوڕێکەشم کوێرە، بە ڕای تۆ چ بکەین؟» باخەوانەکە وڵامی دانەوە: «مەگەر لە بیرت نەماوە خاوەنەکەی چ پەیمانێکی لەگەڵ ئێوە بەست، نەیگوت نابێ دەست بۆ هیشتێک بەرن؟ ئێستا واچاکە دان بە خۆتاندا بگرن.» ئەوان گوتیان: شتی وا نابێ هەرچۆنێک بێ هەر دەخۆین. ئەگەر ڕێگایەکت بە زەین دەگا پێمان بڵێ.» کابرا گوتی: «جا ئەگەر پێشی خۆتان پێ ناگیرێ، چار ئەوەیە ئەو کابرا کوێرە تۆ لە کۆڵ بکا و پێکەوە بچن لێی کەنەوە. لەڕێوە کوێرە هەستا بێ لاقەکەی لە کۆڵ کرد. بێ لاقەکە ڕێنوێنی کرد و هەتا گەیشتنە بن دارەکە. کام میوەی پێ جوان بوو، بێ لاقەکە لێی کردەوە. ئیدی ئەوە ببوو بە پیشەیان هەتا وای لێ هات چی وایان پێوە نەهێشتبوو.

ڕۆژێک خاوەنی باخەکە هات و پێی گوتن: «ئاخ لە دەست ئێوە ئەخە پێم نەگوتبوون ئەو میوە و شتە خەسار و زایە نەکەن؟!» ئەوان گوتیان: «ئەتۆ بۆخۆت دەزانی ئێمە کاری وامان پێ ناکرێ، یەکمان قاچمان نییە و ئەوی دیکەمان چاوی نابینێ، ئێمە بڵێین چی؟» خاوەن باخەکە گوتی: «ئێوە وادەزانن ئەمن نازانم ئێوە چیتان کردووە؟ کوێرە، دەڵێی من لە لای ئێوە بووم کە تۆ هەستای بێ قاچەکەت کردە کۆڵ و ئەویش تۆی ڕێنوێنی کرد. هەتا بەوجۆرە ئەو هەمووە میوەیەتان لێ کردووەتەوە.» ئیدی خاوەن باخەکە زۆری قسە پێ گوتن و لە باخەکە دەری کردن. لێرە کوێرە وەک جەستە وایە کە هەست بە هیچ ناکا چونکە هیچ نابینێ. بێ قاچەکەش وەک نەفسی مرۆڤ وایە. هەرچەند ناتوانێ لە جێی خۆی ببزوێ بەڵام جەستە هاندەدا. میوەکانی باخ وەکوو ئاکاری چاک و جوان وایە. بەڵام کابرای باخەوان وەک عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ وایە کە مرۆڤ هاندەدا بۆ کاری چاکە و لە خراپەی دەپرینگێنێتەوە. بەو پێیە جەستە و ڕووح لە پاداش و سزادا پێکەوە هاوبەشن.» شەمماس گوتی: «وایە، قسەکەت ڕاستە.» ئێستا پێم بڵێ: «کام زانا لە لای خودا بە قەدرترە؟» شازادە گوتی: «ئەو کەسەی کە خوداناس بێ و کارەکانی سوودیان بۆ ئەو دونیای هەبێ.» شەمماس گوتی: «ئەو کەسە کێیە؟» شازادە گوتی: «ئەو کەسەی دەیهەوێ خودا خۆشحاڵ کا و لێی ڕازی بێ و کارێک ناکا خودا پێی ناخۆش بێ.» شەمماس گوتی: «کام زانا دلۆڤانترە؟» شازادە گوتی: «ئەو کەسەی خۆی بۆ مردن ساز کردووە و خۆزگە و ئاواتی زۆر لە سەر دڵی کەڵەکە نەکردووە.» شەمماس پرسی: «لە گەنجەکانی ئاسمان کامیان لە هەموویان چاکترە؟» شازادە وەڵامی داوە: «بە گەورە زانینی خودای تەعالا و سپاس کردنی.» شەمماس پرسی: «لە گەنجەکانی سەر زەوی کامیانت پێ لە هەموویان گەورەترە؟» شازادە وەڵامی داوە: «لەگەڵ خەڵک چاکە کردن.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی نۆسەد و یازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک وەزیر گوێی لە وڵامەکانی شازادە بوو، گوتی: «ڕاستە، ئێستا پێم بڵێ سێ شتی جیاوازی وەک: زانست و بۆچوون و هزر، لە کوێی مرۆڤ دان و چۆناوچۆنن؟» شازادە بەرسڤی داوە: «زانست بە فێربوون بە دەس دێت. بەڵام بۆچوون لە ئەزموونەکانەوە بەرهەم دێت و هزریش بەرهەمی بیرکردنەوەیە. تەواوی ئەوانە لە ئاوەزدا کۆ دەبنەوە. هەرکەسێش ئەو شێ تایبەتمەندییەی تێدا کۆ بێتەوە ئەوە کەسێکی پێگەیشتووە. ئەگەر کەسێک خۆ پارێزی و ترس لە خودای بەوانەوە زیاد کا، ئەو کەسە بە حەق دەگا.» شەمماس گوتی: «ڕاستە، ئێستا پێم بڵێ و زانایان و خاوەن ڕایان و کەسانی ڕووناکبیر دەکەونە ژێر کاریگەری هەوا و هەوەسەوە و گۆڕانیان تێدا دروست بێ یان نا؟» شازادە گوتی: «هەوا و هەوەس زانست و بۆچوونی خەڵک دەگۆڕێ. ئەوە وەک ئەو هەڵۆیە وایە کە لە داو و تەبکە بەدووره و لەبەر زیرەکیان لە بەینی ئاسمان و زەوی لەنگەر دەگرێ بە ڕێکەوت لەوێوە چاوی بە کابرایەکی ڕاوچی بکەوێ کە خەریکە داو و تەبکە دەنێتەوە. کاتێک ڕاوچییەکە داوەکەی ناوە، کوتە گۆشتێک لە سەر تەپکەکە دانێ. هەڵۆکە کە چاوی بەو کوتە گۆشتە بکەوێ هەموو شتێکی لە بیر بچێتەوە و لوول بێ و بەرە و کوتە گۆشتەکە بچێ کەچی بە تەبکەکەوە بێ. کاتێک ڕاوچی دەچێتەوە لای تەبکەکە سەیر بکا ئەوە هەڵۆیەک بە تەبکەکەوە بووە. زۆری پێ سەیر دەبێ و دەڵێ خۆ ئەمن داوم بۆ کۆتر و مەلی بچووک و بێ هێزتر نابووەوە ئەوە چۆناچۆنە ئەو هەڵۆیە پێوە بوو.

دەڵێن هەوا و هەوەس پیاوی ژێر ختوکە بدەن کارێک بکا، ئەو پیاوە بە عەقڵ و ئاوەز کارەکە هەڵدەسەنگێنی و بە سەر هەوا و هەوەسدا زاڵ دەبێ. کە وایە کاتێک هەوا و هەوەس کەسێک هاندەدا کارێک بکا، جێی خۆیەتی ئەو کەسە عەقڵی خۆی وەک کەسێک کە لە سواریدا شارەزایە و دەتوانێ سەرکێشترین ئەسپەکانیش ڕام کا و بۆ هەر لایەک پێی خۆش بێ لێی خوڕێ، دەبێ ئەویش ئاوا لغاوی هەوا و هەوەس بگرێتە دەست و بە سەریدا زاڵ بێ. بەڵام کەسێکی گەوج کە عەقڵ و ئاوەزی کەم بێ، ئەوە هەوا و هەوەس لغاوی ئەو دەگرێتە دەست و بەرەو هەڵدێر و تێداچوونی دەبا. کە ئەو کەسانە چارەڕەشترینی خەڵکن.» شەمماس گوتی: «بژی، ڕاستە. زانست کەی بەرهەمی دەبێ و ئاوەز کەی هەوا و هەوەس دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە؟» شازادە گوتی: «کاتێک خاوەن عەقڵ و زانست، تەواوی توانایی خۆی لە ڕێی خودادا دەکار بکا. جگە لەو بەشەی بۆ پەیداکردنی بژیو پێویستی پێیەتی. ئەوجار دەبێ لە ڕێی دابین کردنی توێشەی قیامەت دەکاری بکا. » دوای ئەوە شەمماس گوتی: «مرۆڤ پێویستە خۆی بە چییەوە سەرقاڵ بکا؟» شازادە گوتی: «بە کاری چاکە.» شەمماس گوتی: «ئەگەر مرۆڤ خۆی بەوەوە خەریک بکا. ئەی بۆ دابینکردنی

بژیوی ڕۆژانە کە مەجبوورە بیکا، دەبێ چ بکا؟» شازادە گوتی: «شەو و ڕۆژ بیست و چوار کاتژمێرە. بەشێکی دەبێ بۆ دابین کردنی بژیو تەرخان بکا و بەشێکی بۆ حەسانەوە و ئەوەی دیکەش خەریکی فێر بوونی زانست بێ. چونکە مرۆڤ ئەگەر ژیریش بێ بەڵام زانا نەبێ، وەک شۆرەکاتێک وایە کە بە کاری کشت و کاڵ نایە و هیچی لێ شین نابێ. دیسان کەسێک کە هیچ زانستێک نازانێ هیچ قازانجێکی نییە.»

شەمماس گوتی: «پێم بڵێ چ زانستێک کاری بە ئەقڵ و ئاوەز نییە؟» شازادە وەڵامی داوە: «ئەو زانستەی وەک زانستی ئاژەڵان وایە کە کاتی خواردن و خواردنەوە و خەوتن و هەستانی خۆیان، فێر بوون و ئاوەزیشیان نییە.» شەمماس گوتی: «پادشا چ مافێکی بە سەر وەزیرەوە هەیە؟» شازادە گوتی: «ڕێنوێنی کردنی لە بەڕێوەبردین دەوڵەت بە نهێنی و ئاشکرا. شاردنەوەی سوڕ و نهێنی پادشا. هیچ شتێک لە پادشا نەشارێتەوە و لە هەموو کارێکدا پرسی پێ بکا و دڵی ڕازی بکا. ئەوەی پادشا پێی ڕازی نییە نەیکا.» شەمماس پرسی: «وەزیر دەبێ چۆن لەگەڵ پادشادا بجووڵێتەوە؟» شازادە گوتی: «ئەگەر وەزیر دەیهەوێ بە دەست پادشاوە لە ئەماندا بێ دەبێ بە قەدەر قەدر و ڕێزێک کە لە لای پادشا هەیەتی دەبێ چاوەڕوانی هەبێ و داوای لێ بکا. بە هیچ جۆرێک نابێ خۆی ئەوەندە لە لا گەورە بێ کە شیاوی ئەو پلەیە نەبێ. ئەوە بۆ وەزیر جۆرە لە خۆ ڕادینێکە. ئەگەر بێتوو لە ئارامی و لەسەرخۆیی پادشا کەڵکاژۆ بکا ئەوە وەک ئەو ڕاوچییەی لێ دێ کە کێوییان ڕاو دەکا و کەوڵیان دەکا و پێستەکەیان دەبا و گۆشتەکەشیان لەوێ فڕێ دەدا. شێرێکیش بەوێدا دێ و کەلاکەکان دەخوا. وردە وردە شێرەکە هاموشۆی بۆ ئەوێ زۆر دەبێ و لەگەڵ ڕاوچییە ئۆگری یەک دەبن و ڕاوچییەکە کەلاکەکانی بۆ داوێ و دەست بە پشتی شێرەکەدا دێنێ. شێرەش کلک ڕادەوەشێنێ. ڕاوچییەکە، کە شێرە دەبینێ ئاوا لەگەڵی ئارامە و کاری پێی نییە لە دڵی خۆیدا دەڵێ: «کەوڵی ئەو شێرەش پارەی چاک دەکا. دەڵێم خۆ بهاوێمە سەر پشتی و کەوڵی کەم.» هەر وا دەڵێ و خۆ داوێتە سەر پشتی شێرە. شێرە گورج چنگێکی دەگەیەنێتێ و دەیکێشێتە پێش خۆی و هەڵی دەدڕێ. هەر بۆیە وەزیر نابێ لە بەرەی خۆی زیاتر پێ ڕابکێشێ و شوێن و پلە و پایەی خۆی لە بیر بچێ هەتا بە دەست پادشاوە لە ئەماندا بێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی نۆسەد و دوازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشكۆ! كاتێك كوڕی جەلیعاد پادشا ئاوا وەڵامی پرسیارەكانی شەمماسی داوە، شەمماس پێی گوت: «پێم بڵێ پلە و پایە و قەدری وەزیر چۆن لە لای پادشا دەچێتە سەرێ؟» شازادە وەڵامی داوە: «بە ئەمانەتداری و بردنەسەری قسە، قەدر و ڕێزی دەچێتە سەرێ.» شەمماس گوتی: «لەوە پێش گوتت كە ئەركی وەزیر لە بەرابەر پادشادا ئەوەیە كە كارێك بكا پادشا لێی ڕازی بێ، ئەو كارانەی پادشا پێی ناخۆشە نەیكا و ئەو كارەی كە پادشا ئەمری پێ كرد، لە سەر خۆی بە فەرز بزانێ و بە گیان و دڵ جێ بە جێی بكا. ئێستا پێم بڵێ ئەگەر پادشا حەزی لە لەتم و زوڵم و زۆر بێ، وەزیریش نەتوانێ پێشی هەوا و هەوەسی پادشا بگرێ. بۆ ئەوەی ئەو گوناه و تاوانانە نەیەنە ئەستۆی و خەڵكی لێ نەبێ بە دوژمن، وەزیر دەبێ چ بكا. شازادە گوتی: «وەزیر، ئەوەی كە گوناه و تاوان بچێتە ئەستۆی وەزیر ئەوە لە كاتێكدایە كە ئاریكار و بەڕێوەبەری فەرمانی پادشا بێ لەو بوارەدا. بەڵام ئەركی سەر شانی وەزیرە كە كاتێك پادشا بۆ ئەو جۆرە كارانە كە ڕاوێژ بە وەزیر دەكا، وەزیر باسی دادپەروەری و ئینسافی بۆ بكا. وەبیری بێنێتەوە كە ئەو كارانە چ ئاكامێكی بۆ ئەم دونیا و ئەو دونیای دەبێ. باسی ڕێگای دروستی هەڵسوكەوت لەگەڵ مسكێنانی بۆ بكا. ئەگەر بە قسەی كرد و هاتە ڕەدایە ئەوە چ باشتر، ئەگەر بێتوو هەر ئەسپی هەوەسی خۆی تین دا، ئەوە وەزیر چاری نییە و دەبێ لێی جوێ بێتەوە. بەو جۆرە هەردووكیان ئاسوودەتر دەبن.»

شەمماس گوتی: «پێم بڵێ، ئەركی پادشا لە بەرابەر مسكێنان و ئەركی مسكێنان لە هەنبەر پادشادا چییە؟» شازادە وەڵامی داوە: «مسكێنان دەبێ بە گیان و دڵ گوێڕایەڵی فەرمانەكانی پادشا بن و پادشاش دەبێ پارێزەی ماڵ و ناموسی مسكێنان بێ.» شەمماس گوتی: «پێم بڵێ گەلۆ، مسكێن مافی دیكەی بە سەر پادشاوە هەیە؟» شازادە گوتی: «بەڵێ، مافی مسكێن بە سەر پادشادا فەرزترە لە مافی پادشا بە سەر مسكێندا. زیانی پێشێلكردنی مافی مسكێن بۆ پادشا لە زیانی پێشێلكرانی مافی پادشا بۆ مسكێن زیاترە. چونكە تێداچوونی پادشا و وڵاتەكەی هۆكارێكی جگە لە تێداچوونی مافی مسكێنەكانی نییە. هەركەس دەستی لە دەسەڵاتدا هەبێ، دەبێ گوێ لە سێ شت نەخەوێنێ: ئۆل و باوەڕی خەڵك، خزمەتكردنی خەڵك و بەڕێوە بردنی وڵات. ئەو سێ شتە دەسەڵات دەپارێزێ.» شەمماس پرسی: «مەبەست لە خزمەتی خەڵك چییە؟» شازادە وڵامی داوە: «داب و نەریتیان بپارێزێ، زانایان بنێری بۆ پەروەردەیان، لە نێوانیاندا دادپەروەر بێ. نەهێڵێ مافیان پێشێل كرێ و چاوت لە ماڵی ئەوان نەبێ.» شەمماس پرسی: «ئەی پادشا لە بەرابەر وەزیردا چ ئەركێكی لە سەرە؟» شازادە وەڵامی داوە: «لە سێ لاوە مافی وەزیر

به سەر پادشادا لە خەڵکی دیکە زیاترە: یەکیان لەبەر ئەوەی وەزیر ڕاوێژکاری پادشایە و لە لارێ بوون دەیپارێزێ. دووەم، خەڵک پلە و پایەی وزیر لە لای پادشا بزانن و بە چاوی مەزن سـەیری بکەن و بەگەورەی بزانن. سـێیەم، کاتێک وەزیر بزانێ کە پادشـا ئاگای لە مسکێنانە و مسکێنانیش گوێڕایەڵی پادشان ئەویش زیاتر لە بەرانبەر مسکێناندا هەست بە بەرپرسـیاری دەکا و خزمەتگوزارێکی باشـتر دەبێ.» شـەمماس گوتی: «ئەوانەی گوتت، هەمووی وایە و دروسـتە. ئێسـتا پێم بڵێ زوبان پێویسـتە چۆن بگەڕێ؟» شـازادە گوتی: «زوبان وا چاکە، بە باشـــی و جوانی بگەڕێ و قەت بە خراپ نەیەتە گۆ، خۆ لە درۆ و دووزمانی و جوێن و کەرەکەر بپارێزێ. چونکە گوتە وەک تیر وایە، هەر کە لە ماڵی کەوان دەرچوو، تازە گەڕانەوەی بۆ نییە. هەر بۆیە نهێنی خۆت بە کەس نەڵێی چاکە.» شـەمماس گوتی: «باسی هەڵسوکەوتی باش لەگەڵ دەوروبەریانم بۆ بکە.» شازادە گوتی: «مرۆڤ بە هەڵسـوکەوتی جوان و سـیلەی ڕەحمەوە دەژی، هەر بۆیە ئەرکە لە سـەر هەموومان کە ڕەچاوی ئەو بابەتە بکەین، بە تایبەت لەگەڵ دایک و باب دەبێ بەوپەڕی لەسـەرخۆیی و نەرم و نیانییەوە هەڵسـوکەوت بکەین و قسـەیان لەگەڵ بکەین. لەگەڵ براکاندا دەبێ ڕێنوێنیان بکرێ و دەستیان بگرێ و بە شادییەکەیان شاد و بە نارەحەتییەکەیان نارەحەت بین. لە هەڵەیان خۆش بین و بۆ کاروباریان کەمترخەم نەبین.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دوای ئەوە شەمماس گوتی: «ئەوانەی باست کرد هەموومان بیست. ڕاستن. ئێستا بڵێ بزانم، گەلۆ هەر ئافرێندراوێک لە لایەن ئافرێنەرەوە بەشێکی بۆ دیاری کراوە یان نا؟ ئەگەر بۆی دیاری کراوە، ئەو هەموو هەڵسووڕان و خۆ ماندووکردنەی بۆ چییە؟ گەلۆ ئەگەر مرۆڤ دەست لە هەوڵ و تێکۆشان هەڵگرێ و بچێ لە سووچێک دانیشێ و پشت بە خودا ببەستێ دەحەسێتەوە؟»

شازادە وەڵامی داوە: «هەرچەند ڕسق و تەمەنی هەر کەسێک دیاری کراوە، بەڵام هەر یەکەی بە شێوەیەکە و هۆکاری خۆی هەیە.» شەمماس پرسی: «بۆ پەیدا کردنی بژیو دەڵێی چی؟» شازادە وەڵامی داوە: «ئەوەی خودای میری مەزن بۆی حەڵاڵ کردووی حەڵاڵە و ئەوەی لێی حەرام کردووی حەرامە.»

کاتێک شازادە وڵامی تەواوی پرسیارەکانی داوە. باسەکەیان تەواو کرد. لەڕێوە شەمماس و هەنتەشیان هەستان و کڕنۆشیان بۆ پادشا برد. پادشاش ئەوی لە ئامێز گرت و تەوێڵی ماچ کرد و لە پەنا خۆیەوە لە سەر تەختەکەی داینا و زۆری سپاسی خودا کرد. دوای ئەوە شازادە بە شەمماس و زاناکانی کە لەوێ بوون گوت: «زانایان و بلیمەتان، ئەمنیش پرسیارێکم هەیە کە نەمتوانیوە لێی تێبگەم و بەلامەوە گران بوو. تکام لە وەزیر شەممماسە کە بۆم شی بکاتەوە و تێم گەیەنێ با دڵم بحەسێتەوە. هەر وەک چۆن: ژیان بە ئاوەوە و هێز لە خواردن و چارەسەری نەخۆش لە دەرمانی نۆژدار دایە، چارەسەری نەزانی لە زانستی زانایان دایە.» شەمماس گوتی: «بلیمەتی ڕۆژگار، هیچ پرسێک نییە کە تۆ لە شرۆڤە و هەڵسەنگاندن و شی کردنەوەیدا لە من شارەزاتر و لێزانتر نەبی. چونکە خودای مەزن ئەوەندەی لە باری زانستەوە داوییە بە جەنابت بە کەسی دیکەی نەداوە. ئێستاش پرسیارەکەت بکە.» شازادە گوتی: «پێم بڵێ خودای بەدیهێنەری بێ هاوتا، ئافرێندراوەکانی لە چی ئافراندووە لە کاتێکدا پێش ئەو هیچ شتێک نەبوو. لە کاتێکدا لە دنیادا هیچ شتێک نییە کە لە شتی دیکە چێ نەکرابێ. وەزیر وەڵامی داوە: «پیشەکارانێکی وەک دیزە و گۆزەکەر کە شتێک ساز دەکەن لە شتێکی دیکەی وەک گڵی ساز دەکەن، چونکە بە هۆی کەمدەسەڵاتی و کەمتواناییانەوە ناتوانن لە نەبوونەوە بیهێننە بوون. بەڵام خودا بەرز و بێ هاوتایە بە هێزی پەرجۆی خۆی کە جیهانی لە نەبوونەوە چێ کردووە دەشتوانێ بێ ئەوەی پێکهاتەی شتێک لە پێشدا بوونیشی هەبووبێ لە نەبووەوە ڕاستەوخۆ بی ئافرێنێ. نموونەی و نیشانەی لەو جۆرە زۆرە کە دیاردەی ئەوەن کە خودای بێ هاوتا خاوەن توانایی و دەسەڵاتێکی ئەوتۆیە کە شتەکانی لە نەبووەوە دێنێتە بوون. هەر وەک

چۆن شەو و ڕۆژ بە دوای یەکدا دێن و جێی یەک دەگرنەوە. شەو دێ و ڕۆژ نەدیو دەبێ بێ ئەوەی ئێمە بزانین دەچێتە کوێ و لە کاتی خۆیدا ڕۆژ دێتەوە شەو بەو جۆرە ون دەبێ و عەقڵی مرۆڤ واقی وڕ دەمێنێ.» شـــازادە گوتی: «هێز و توانایی خودات پێ ناســـاندم. ئێســـتا پێم بڵێ ئافرێندراوان چۆن ئافرێنداروون؟» شـــەمماس وەڵامی داوە کە لە ڕاســـتیدا ئافرێندراوان ئافرێندراون بە یەک وشــە کە ئەو وشــەیە پێشــی بەدیهاتنی شــتکە بووە. هەر بەو وشەیەش هەموو بەدیهاتوویەک بەدی هاتووە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: خاوەنشکۆ! شازادە بە شەمماسی گوت: «بەڕاستی، خودای گەورە و بێ هاوتا پێش ئەوەی ئافرێنەران بافرێنێ هەڵوێست و پلانی بۆ ئەو کارە هەبوو؟» شەمماس وەڵامی داوە: «بەڵێ هەموو، کارێکی لە پێشدا تەواو کردووە و بەس ماوە بە وشەی ببە فەرمانی بە بوونی جهان بدا. ئەگەر ئەو وشەیە نەگوترابا هیچ شتێک نەدەبوو. ئەو وشەیە ئەوە دەگەیەنێ کە خودای مەزن لە زات و سفەتیدا یەکە. بەو مانایە کە ئەو وشەیە هێز نییە. هێزی سفەتی خودای تەعالایە. تا ئەو جێیەی کە وشە و هەر شتێک جگە لە زاتی خۆی بەشێکە لە سفەتی تەواوکەری خودای تەعالا و خودا بە وشەی خۆی هەموو بوونەوەرانی هێنایە بەستێنی بوونەوە. بەبێ ئەو وشەیە هیچی نەخوڵقاند. بەڕاستی ئەو ئێمەی بە وشەی حەق ئافراند و ئێمەش بە بەڕاستی ئافراین.» شازادە گوتی: «ئەتۆ گوتت کە خودای تەعالا ئێمەی بە ڕاستی ئافراند. لە کاتێکدا ناڕاستی دژوازی ڕاستییە. ئەی ناڕاستی لە کوێوە هات و چۆناوچۆن لە ڕاستی وەدەر کەوت؟ تا وای لێ هات لە هێندێک شوێندا تێکەڵ بوون و خەڵک پێویستییان بە هەڵاواردن بوو. گەلۆ خودا ئەو ناڕاستییەی خۆش دەوێ یان ناخۆش؟ ئەگەر بڵێین کە ئافرێنەر ڕاستی خۆش دەوێ بۆیە بەدیهاتوانی لە سەر ڕاستی خوڵقاندووە و ناڕاستی ناخۆش دەوێ، ئەی چۆن شتێکی کە ناخۆشی دەوێ لە بەرابەر ئەو شتەی کە خۆشی دەوێ قوت کردووەتەوە؟» شەمماس وەڵامی داوە: «لە ڕاستیدا کاتێک خودا مرۆڤی ئافراند. مرۆڤ پێویستی بە تۆبە و گەڕانەوە نەبوو، هەتا ناڕەوا بە سەر ڕەودا نەهاتبوو. ئەو ناڕەوایەش دروستکراوی مرۆڤە. ئەویش بە هۆی ئەو نیاز و پێداویستییەی کە خودا لە پێکهاتەی مرۆڤدا خوڵقاندوویەتی کە لە حەز و ئێشتیاوە هاتووە. ئیدی کاتێک ناڕەوا بەو مانایەوە لە بەرابەر ڕەوادا قوت بووەوە. ئینجا ئەو دوانە بە هۆی هەڵوێست و ئیرادەی مرۆڤەوە جێگۆڕکێیان پێ کرا و چوون دە جلی یەکەوە. ئەوجار خودا ڕێگای تۆبە و پەشیمان بوونەوەی خستە پێش مرۆڤەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ ڕێگای پاشگەز بوونەوەی هەبێ و بێتەوە سەر ڕێی ڕاستی و ڕەوابوون.» شازادە گوتی: «پێم بڵێ هۆکاری هەڵکشان و هاتنە مەیدانی ئەو ناڕاستی و ناڕەوایە چ بوو تا ئەو جێیەی نەناسرێنەوە و کار بگاتە جێیەک کە مرۆڤ پێویستی بە تۆبە هەبێ؟» شەمماس وەڵامی داوە: «خودای تەعالا کە مرۆڤی ئافراند ئەوی بۆ خۆشەویستی خۆی دروست کرد و پێویستی بە سزا و پاداش نەبوو. هەتا وابوو خودا نەفسی لە پێکهاتەی ئەودا خوڵقاند. هاتنە ئارای ناڕەوایی لە نەفسەوە سەرچاوەی گرت. ئەوجار مرۆڤ ڕووی لە گوناه کرد و بەرەو ناڕەوایی ڕۆیشت.» شازادە پرسی: «گەلۆ هۆکاری تێکەڵ بوونی ڕاستی و ڕەوا لەگەڵ ناڕەوایی گوناه دژایەتی بووە؟» شەمماس وەڵامی داوە: «بەڵێ وایە، مەمنا خودا

مرۆڤی خۆش دەوێ، ئەوی موحتاج و نیازمەند و چارەڕەش ئافراند. ئەوە کارێکی تەواو بەجێیە. بەڵام جاری وایە مرۆڤ بە هۆی حەز و ئیشتیایەوە، بێ هەڵوێست دەبێ و بەرەو گوناە دەکێشرێ و سەرپێچی ئافرێنەری دەکا. بەو هۆیەوە تووشی سزا دەبێ. بەڵام لە ڕێگای تۆبە و گەڕانەوەی بۆ لای خۆشەویستی حەق، شیاوی پاداش دانەوە دەبێ.» شازادە گوتی: «باسی سەرچاوەی گوناهەکەم بۆ بکە لە کاتێکدا خودا مرۆڤی لە سەر بنەمای ڕاستی خولقاندووە چۆنە بۆخۆیان تێکەڵاوی گوناە دەکەن؟ دواییش چۆن سەرەڕای بوونی حەز و ئیشتیای چوون بەرەو گوناە، تۆبە بکا و شیاوی پاداش دانەوە بێ؟» شەمماس گوتی: «یەکەم هاتنە خوارێی دیاردەی سەرەڕۆیی بۆ مرۆڤ لە پێشدا بۆ ئیبلیس هات. چونکە ئەو لە نێو مەلائیک و ئینس و جیندا ڕێزێکی تایبەتی هەبوو. ئیبلیس لە نێو سروشتدا جگە لە ڕێز و حورمەت هیچ کێشەیەکی نەبوو. بەڵام لەبەر خۆشەویستی زۆر و حەیا و گەورەیی خۆی لەخۆبایی بوو. بێ ئەمری خودای کرد. ڕێگای گوناهی گرتە بەر چونکە دەیزانی خودای تەعالا لە گوناە بێزارە. کاتێک مرۆڤیشی دیت ئەوەندە لە لای خودا بە ڕێز و حورمەتە و ئەویش گوێڕایەڵی فەرمانییەتی. ئێرەیی و بەخیلی کاری کردە دڵی و کارێکی کرد مرۆڤ لە ڕێ لا دا و بیکاتە هاوبەشی گوناهی خۆی. مەمنا خوداش دەیزانی کە مرۆڤ زوو لە خشتە دەچێ و ئالوودەی گوناە دەبێ، ڕێگای تۆبە خستە سەر ڕێی مرۆڤ. هەتا ئەگەر وەخۆ هاتەوە ڕێگای گەڕانەوەی لە ڕێی هەڵە هەبێ و تووشی زەلکاوی دایمی نەبێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و پازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شەمماس کاتێک وەڵامی پرسیارەکانی شازادەی داوە، شازادە پرسی: «خەڵک چۆن دەتوانن دژایەتی خودا بکەن لە کاتێکدا خودای تەعالا لەوپەڕی گەورەیی و دەسەڵات دایە؟» شەمماس گوتی: «خودای گەورە و پایەبەرز عادڵ و بە ئینساف و دلۆڤانە، ڕێگای خێر و ڕزگاری خستووەتە بەر بەندەکانی و ئەو هێز و توانایییەی پێ داون بۆ گەیشتن بە خێر و چاکە کەڵکی لێ وەرگرن. ئەگەر بێت و بە پێچەوانەی ئەوە بجووڵێنەوە ئەوە بەرەو هەڵدێر و نەمان سەر دەنێننەوە.» شازادە پرسی: «کاتێک ئافرێنەر توانایی پێداون کە هەر چییەکیان پێ خۆش بێ بیکەن. کاتێک بەرەو لاڕێ دەچن، خودا بۆچی بەربەندێکیان بۆ دانانێ تا بەندەکانی تووشی هەڵە و لاڕێ نەبن و بەرەو ڕاستی و حەق بڕۆن؟» شەمماس وەڵامی داوە: «ئەوەش لەبەر ڕەحمەتی گەورە و بێ بڕانەوەی ئەوە کە ڕقی لە ئیبلیس هەڵگرت و لێی خۆش نەبوو. هەر وەها بە هۆی تۆبەوە دوای تووڕەییەکەی لە ئادەم خۆش بوو.» شازادە پرسی: «گەلۆ خودا ئەو شتەی خۆشی دەوێ و ئەو شتەی خۆشی ناوێ هەردووکیان ئافراندووە یان هەر ئەو شتەی ئافراندووە کە خۆشی دەوێ؟» شەمماس وڵامی داوە: «خودای تەعالا هەموو شتێکی ئافراندووە، بەڵام هەموویانی بە دڵ نییە جگە لەو شتانەی کە خۆشی دەوێ.» شازادە پرسی: «دوو شت هەن کە خودای تەعالا یەکیانی خۆش دەوێ و خاوەنەکەی خەڵات دەکا و ئەوی دیکەیانی ناخۆش دەوێ خاوەنی سزا دەدا. ئەوە چۆناوچۆنە؟» شەمماس پرسی: «ئەو دوو شتە چین؟» شازادە وەڵامی داوە ئەوانە خێر و شەڕن کە ئاوێتەی ڕۆح و جەستەن.» شەمماس گوتی: «پیاوی ژیر، هەر دەڵێی وات زانیوە کە خێر و شەڕ کارگەلێکن کە بکەرەکەیان جەستەیە. کاری خێر بۆیە خێرە کە خودا بە کردنی خۆشحاڵ دەبێ و شەڕیش بۆیە شەڕە کە خودا پێی ناخۆشە.» شازادە گوتی: «وەک ئەمن بزانم، خێر و شەڕ لە لایەن پێنج هەستی چێژتن و بۆنکردن و وێکەوتن و بینین و بیستنەوە دەکرێ. دەمهەوێ تێمگەیەنی کە ئەو پێنج هەستە بۆ خێر خوڵقاون یان بۆ شەڕ؟» شەمماس گوتی: «ئەوە بزانە کە خودای تەعالا مرۆڤی لە سەر حەق و ڕاستی بەدیهێناوە و خۆشەویستی خۆی خستووەتە دڵییەوە. خودا هەر شتێک بخوڵقێنێ بە هێز و ئیرادەی خۆی دەخوڵقێنێ و لە تەواویشیاندا دادەپەروەری و ئینساف و خێر و چاکە لە بەر چاو گیراوە. لە خۆشەویستی خۆیەوە خەڵکی ئافراند و نەفسیش کە حەزی لە بەرەو هەوا و هەوس چوونە لە مرۆڤدا بەدیهێنا و ئەو پێنج هەستەشی کردە هۆکاری چوونە بەهەشت و جەهەننەم.»

شازادە پرسی: «ئەوە چۆناوچۆنە؟» شەمماس وڵامی داوە: «خودای تەعالا زمان و دەستەکانی بۆ کار و لاقەکانی بۆ ڕۆین و چاوی بۆ بینین و گوێی بۆ بیستن ئافراند و هێز

و لێهاتووی کاری دانێ و فەرمووی کە هیچیان بە بێ پێخۆشـــبوونی ئەو کارێک نەکەن. ئەوەی کە خودا پێی خۆشـــە زمان بیکا، ڕاســـتی گوتن و خۆ لە درۆ پاراســـتنە کە دوژمی ئەوە. ئەوەی بۆ چاو پێی خۆشـــە بیکا: چاو لە شـــتێک کردنە کە خودا پێی خۆشـــە و خۆ پاراستنە لە چاوحیزی کە ئەو پێی ناخۆشە. ئەوەی لە بابەت دەستەوە پێی خۆشە ئەوەیە کە دەستەکان لەو کارانەدا لە کار کرێ کە خودا ئەمری پێ کردووە و لەو کارانە بپارێزرێن کە خودا فەرموویە مەیکەن. قاچەکان بەرەو ئەو کارە هەنگاو بنێن کە خودا دڵخۆش و ڕازی دەکەن و نەچوونیان بەرەو کارێک کە خودا پێی خۆش نییە. بێجگە لەوانە حەز و ئیشـــتیاکانە کە مرۆڤ دەیانکا. ئەویش بە فەرمانی ڕۆح جەســـتە دەیکا. دوای ئەوەش ئەو ئیشتیایەی جەستە دەیکا دوو جۆرە: «ئیشتیای زگ و ئیشتیای بەر زگ. ئەو ئیشتیای بەر زگەی کە خودا لەگەڵییەتی ئەوەیە کە حەڵاڵ بێ و حەرام نەبێ. واتە ڕێ پێدرا و بێ لە لایەن خوداوە. بەڵام ئیشـــتیای زگ خواردن و خواردنەوەی ئەو شـــتانەیە کە خودا حەڵاڵی کردووە و بە کەم و زۆری دەبێ ســـپاسـگوزار بێ.» شـــازادە گوتی: «گەلۆ خودای تەعالا نەیدەزانی کە ئادەم لەو دارە ڕێ پێنەدراوە دەخوات؟» شـــــەمماس وەڵامی داوە: «بەڵێ دەیزانی، هەر ئەوەی کە بە ئـادەمی گوتبوو لەو دارە نەخوا دیـاردەی ئەوەیە کە دەیزانی ئادەم لەو دارە دەخوا. بۆیە ئاگاداری کردەوە کە ئەگەر لەو دارە بخوا ئەوە تووشـــی گوناه دەبێ. ئاگادار کردنەوەی مرۆڤ خۆی هێمای دادپەروەری و ئینســـــافە، بۆ ئەوەی مرۆڤ هیچ بیـانووی نەمێنێ. وابو ئـادەم لاقی خزی و بەرەی مرۆڤ بە بۆنەی ئەوەوە کەوتە هەڵدێری چارەڕەشـــــی و نەهـاتییەوە. ئەوجـار خودا نـاردە و پێغەمبەری بۆ نـارد. ئەوان ڕێوشوێنیان فێر کردین و دابودەستووریان بۆ دانایـن. ڕێگای گەیشتن بە ئامانجیان پێشان داین. ئیدی هەرکەس لەو بـازنەیەدا بێ ئەوە ڕزگـار دەبێ و هەرکەس پێ بنێتە دەرەوەی ئەو بازنەیە بە زیانی خرۆ حیساب دەکرێ. ئەتۆ دەزانی خودا هەموو کارێکی لە دەست دێ و حەز و ئیشـــتیای بۆخۆی لە ئێمە بەدی هێناوە. پێشـــی گوتووین کە بە شـــێوەی حەڵاڵ وەدەستی بێنین. هەتا بۆ ئێمە ببێتە مایەی خێر و بێر. هەر کاتێکیش بە شێوەی حەرام ئەو حەز و ئیشـــیتایەمان دامرکێنین ئەوە دەبێتە مایەس شـــەڕ و نەهامەتی. هەر بۆیە هەر چـاکەیەکمـان پێ دەگـا لە لایەن خوداوەیە. تووشـــی هەر دزێوی و خراپەیەکیش بین هۆکارەکەی خۆمانین، نەک خودای تەعالا. خودا مەزن و سەرترە لەوەی کە شتێکی بخەینە ئەستۆ.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و شازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک شازادە ئەو پرسیارانەی لە شەمماس کرد و شەمماسیش بەرسڤی داوە. لە ڕێوە یەکێک لە حەکیمەکان هەستا و گوتی: «ئەو بابەت و شیکردنەوانەی ئەوڕۆ لە ئێوەم بیست قەتم نەبیستبوو. ئەمن پێم وا بوو دەبێ پرسیارتان لێ بکەم، ئێستاش پێم بڵێن باشترین نیعمەتەکانی دونیا چین؟» شازادە وڵامی داوە: «لەشی ساغ و ڕزقی حەڵاڵ و منداڵی پاک و سالح.» ئینجا پرسی: «چوار شت هەیە کە خەڵک هەموو تێیدا هاوبەشن، ئەو چوار شتە چین؟» شازادە وەڵامی داوە: «خواردن و شەراب، خەو، نیزیکی لەگەڵ ژن، و چێژی مەرگ.» حەکیم پرسی: «کام سێ شتن کە کەس ناتوانێ پاکیان کاتەوە؟» شازادە وەڵامی داوە: «کەرێتی و چاوچنۆکی و درۆیە.» حەکیمەکە گوتی: «کام درۆ باشترە؟» شازادە گوتی: «درۆیەک کە بەژەوەندی گشتی تێدا بێ.» حەکیم پرسی: «کام ڕاستی نەشیاوە و ناحەزە.» شازادە وەڵامی داوە: «ڕاستی ئاژاوەگێڕ.» حەکیم پرسی: «نەشیاوترینی نەشیاوان کامەیە؟» شازادە وەڵامی داوە: «شانازی کردن بە شتێک کە نییە.» حەکیم پرسی: «گەوجترین پیاو کامەیە؟» شازادە ئەو پیاوە کە تەواوی هەوڵی بۆ ئەوە بێ کە سکی تێر بکا. ئەوجار شەمماس گوتی: «گەورەم تۆ پادشای ئێمەی، داوات لێ دەکەین کە کوڕەکەی خۆت بکەیە جێگرەوەی خۆت.» بۆ ئەوەی کە لە دوای ئەو ببێتە پادشای ئەو وڵاتە. وا بوو هەر لەوێ پادشا داوای لە هەنتەشیانی کرد کە دوای ئەو گوێڕایەڵی کوڕەکەی بن و ئەو میراتگری وڵات و دەسەڵاتەکەی دەبێ. ببێ بە پادشایان. بەو جۆرە پادشا بەڵێنی لە تەواوی مسکێنەکانی ئەستاند کە گوێڕایەڵ و فەرمانبەری کوڕەکەی بن و سەرپێچی و دژایەتی نەکەن. کوڕەکەی ببووە هەڤدە ساڵ کە پادشا نەخۆشییەکی زۆر سەختی گرت و لە جێدا کەوت. پادشا زانی نەخۆشییەکەی کارییە. هەر بۆیە بە نیزیکان و دەوروبەریانی گوت: «ئەو نەخۆشییە، نەخۆشی مردنە، خەڵکی وڵات کۆ کەنەوە و کوڕەکەم بانگ کەن. لەڕێوە جارچی جاریان دا و خەڵک ورد و درشت، لە نیزیک و دوورەوە ڕوویان لە کۆشک کرد و کۆ بوونەوە. پادشا گوتی: «لەوە دەچێ هەڵنەستمەوە تیری قەزا و قەدەر وە ئامانجی کەوتووە و شیمانەی ئەوە دەکرێ، ئەوڕۆ ئاخرین ڕۆژی من بێ. دوای ئەوە بە کوڕەکەی گوت: «وەرە پێشێ.» شازادە چووە بەرەوە و دەستی کرد بە گریان. پادشاش چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و خەڵکەکە گریان. دوای ئەوە پادشا بە کوڕەکەی گوت: «ئەتۆ یەکەم کەس نیی کە ئاوات بە سەر دێ. ئەو وشترە لە دەرکی هەموو ماڵێک یخ دەخوا. چونکە هیچ بوونەوەرێک لە دەست مەرگ دەر ناچێ. وەسیێتی من ئەوەیە کە بە پارێز بە و چاکە بکە. ملکەچی هەوای خۆت مەبە و لە ڕابوون و دانیشتن و خەوتن و هەستاندا لە یادی خودا خافڵ مەبە. ئەوە قسەی دوایی منە. ئێتر سڵامەتیت.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و هەفدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک جەلیعاد پادشا وەسیەتەکەی کرد، شازادە گوتی: «باوکە، ئەتۆ دەزانی کە من بەردەوام گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی تۆ بووم و ڕازی کردنی دڵی تۆم بەلاوە گرینگ بووە. ئەتۆ بۆ من باوکێکی باش بووی. دەی چۆن لە دوای تۆ کارێک ناکەم کە تۆ پێت خۆش بێ؟» پادشا گوتی: «ڕۆڵە بۆ ئەوەی خودا پاداشی ئەم دونیا و ئەو دونیات بداتەوە، ئەو دە کارە ڕەچاو بکە. هەر کاتێک تووڕە بووی، بە سەر خۆتدا زاڵ بە. ئەگەر تووشی نەهاتی هاتی ئەهوەن و لەسەرخۆ بە. ئەگەر قسەت کرد درۆ مەکە. ئەگەر گفت و بەڵێنت دا لە سەر بەڵێنت سوور بە. کە فەرمانت دا دادپەروەر بە. کە دەسەڵاتدار بووی لێ بووردەییت هەبێ. ڕێز لە گەورە و مەزنان بگرە و لەگەڵ دوژمنانت بە بزە بە و لەگەڵیان بە جوانی بجووڵێوە و ئازاریان مەدە. کوڕی من، هێندێک ئاکاری دیکەش هەیە ئەگەر ڕەچاوی کەی خەڵکی وڵاتەکەت قازانجیان پێ بگا. ئەویش ئەو ئاکارانەن: دادپەروەری پەرە پێ بدە. کە قەولت دا قەولەکەت ببەسەرێ. پەند و ئامۆژگاری ببیستە. لاسار و پێچەقێن مەبە. مسکێنانت هان بدە بە پێی شەرع و سوننەت بجووڵێنەوە و لەگەڵ یەک بە ئینساف بن. هەتا ورد و درشت تۆیان خۆش بوێ و خراپ و ناپاکان لێت بترسن.

دوای ئەوە بە ئامادەبوانی گوت: «ئاممان نەکا سەرپێچی پادشاکەتان بکەن. نەکا بێ ئەمری گەورەی خۆتان بکەن. چونکە ئەو کارە دەبێتە هۆی لێک دابڕان و پەرەم پەرەم بوونتان و پرش و بڵاو بوونی شارەکەتان. دوژمن دەستتان بە سەردا دەگرێ. لێرەدا زمانی گیرا و مردن ئەوکی گرت کوڕەکەی خۆی بە سەردا کێشا و لە باوەشی گرت و پادشا گیانی دەر چوو. تەواوی ئامادەبوان دەستیان کرد بە شین و گریان. پاشان شۆردیان و کفنیان کرد و بە ڕێزێکی زۆرەوە ناشتیان. پاشان گەڕانەوە کۆشک و جلوبەرگی پادشایەتیان لە بەر کوڕەکەی کرد. تاجی پادشایەتیان کردە سەری. ئەنگوستیلەیان کردە ئەنگوستی و لە سەر تەختیان دانا.

شازادە ماوەیەک بە شێوازی باوکی دادپەروەرانە و بە ئینسافەوە وڵاتی بەڕێوە برد. دوای ئەوە وردە وردە فریوی کارە هیچ و پووچەکانی دونیایی خوارد. وەسیەتەکەی باوکی لە بیر چووەوە و سەرپێچی فەرمانەکانی کرد. گیرۆدەی خۆشەویستی ژنان بوو. ژنێکی جوان نەما کە تاریفیان بۆ کردبێ و ئەو نەیناردبێ بۆی بێنن و لە خۆی مارە نەکردبێ. زیاتر لە حەزرەتی سولەیمانی ژن کۆ کردبووەوە و هەر ڕۆژەی لەگەڵ تاقمێکیان دەبوو. مانگە و مانگ نەدەهاتە دەرێ و هەواڵی وڵاتەکەی نەدەپرسی. گوێی نەدەدا هاواری

لێقەوماوان و لەتم لێ کراوان. ئەگەر شـــکایەتێکیان بۆ نووســـیبا وڵامی نەدەداوە. کاتێک مســـکێنان ئاوایان دیت و دیتیان کە گوێ ناداتە کاروباری خەڵک و گیروگرفتەکانیان و لە کاروباری دەوڵەت و وڵاتدا کەمترخەمە، زانیان لە داهاتوویەکی نیزیکدا تووشـی مەینەتی و چارەڕەشـی دەبن و ژیانیان لێ تاڵ دەبێ. دەسـتیان کرد بە سـەرکۆنەی یەکتر. تاقمێکیان گوتیان بابچینە لای شەمماسی وەزیر و قسەی لەگەڵ بکەین. هەتا ڕێنوێنی پادشا بکا. دەنا تووشی بەڵا و نەهاتی دەبین. چونکە پادشـامان تووشـی کەیف و خۆشـی دونیایی بووە و خۆشـییەکانی دونیایی هەڵیخەڵەتاندووە. ئیدی هەسـتان و چوون بۆ لای شـەمماس و پێیان گوت: «ئەی زانا و بلیمەت. پادشـامان گیرۆدەی هەوا و هەوەسـی دونیایی بووە و خەریکە وەڵاتیش بەرەو هەڵدێر دەبا. هۆیەکەشـی ئەوەیە کە مانگی پێ دەچێ ئێمە نایبینین و نایەتە دەرێ. کار بە کەس نییە و وەڵامی شکایەتی زوڵملێکراوان ناداتەوە. ئێمە هاتووین ئەتۆ لەو ڕاسـتییە ئاگادار کەینەوە. چونکە تۆ گەورەی ئێمەی. شـیاو نییە لە وەڵاتێکدا کە تۆی تێدا دەژی بەڵا و مەینەتی سـەر هەڵدا. چونکە تۆ دەتوانی گیروگرفتەکانی ئەو وڵاتە چارەسـەر بکەی. ئێستا هەستە بچووە بۆ لای، بەشکوو قسەی تۆی بچێتە گوێ.

شـەمماس لەڕێوە هەسـتا چوو بۆ ئەو شـوێنەی کە دەیتوانی کۆیلە منداڵکار و نۆکەرە خەسـاوەکانی ناو ماڵ ببینێ. بە کۆیلەیەکی منداڵکاری گوت: «ڕۆڵە گیان، بچووە عەرزی پادشـا بکە، بزانە ڕێم دەدا بچمە ژوورێ قسـەیەکی لەگەڵ بکەم. دەبێ ڕووبەڕوو پێی بڵێم و وەڵامەکەی لێ وەرگرمەوە؟» کوڕێژگەکە گوتی: «گەورەم، قەسـەم بە خودا یەک مانگی تەواوە ڕێی بە کەس نەداوە بچێتە ژوورێ. ئەمنیش نـاتوانم بچمە ژوورێ. لەو دەمەوە چاوم پێی نەکەوتووە. بەڵام کەسێکم پێ شک دێ، ڕەنگە ئەو بتوانێ کارێکت بۆ بکا. چونکە ئەو خزمەتکارێکی نیزیکێتی و خواردنی بۆ دەبا دایمە لە لایەتی. کاتێک هات بۆ چێشـتخانە بچووە پێی بڵێ. ئەو کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکا.»

شەمماس چوو لە بەر دەرگای چێشتخانە دانیشت. دوای ماوەیەک ئەو خزمەتکارە هات ویسـتی بچێتە چێشـتخانە. شـەمماس پێی گوت: «کوڕی چاک، دەمەوێ چاوم بە پادشـا بکەوێ قسەیەکی تایبەتە دەبێ پێی بڵێم. ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکە، کاتێک پادشا خواردنەکەی خوارد و زانیت خۆشـــحاڵە ئیزنی چوونە ژوورەوەم بۆ وەرگرە.» کوڕێژگەکە گوتی: «بە سەر چاو.»

خزمەتکارە چکۆڵەکە خواردنەکەی بۆ برد. پادشـــا خواردنەکەی خوارد و کەیفی ســـاز بوو. پاڵی داوە. خزمەتکارە گوتی: «پادشـام، شـەمماسـی وەزیر لە بەر دەرگا وێسـتاوە و داوای ڕوخســەتی هاتنە ژوورێ دەکا. هەتا سـەبارەت بە هێندێک کاری پێویسـت قسـەت لەگەڵ بکا. پادشا ترسی ڕێنیشت و کەوتە دڵەڕاوکێ. بە خزمەتکارەکەی فەرموو شەمماس بێننە ژوورێ.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەمشـــــەویش كۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

# کە شەوی نۆسەد و هەژدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کورە چکۆلە گەڕاوە بۆ لای شەمماس و قاوی کردە ژووریَ. کاتێک شەمماس چووە لای پادشا. کڕنۆشی برد و دۆعای بۆ کرد. پادشا پرسی: «شەمماس ئەوە چی بووە وا هاتووی بۆ لای من؟» شەمماس وەڵامی داوە: «لە مێژ بوو، چاوم بە سیمای پیرۆزی پادشا نەکەوتبوو. زۆرم بیر دەکردی. هاتووم بە دیدارت شاد بم و شتێکیشت عەرز کەم.» پادشا گوتی: «قسەکەت بکە.» شەمماس گوتی: «پادشام، هەر وەک دەزانی بەو تەمەنە کەمەتەوە، خودا ئەوەندەی زانایی و تێگەیشتوویی پێداوی کە بە کەسی نەداوە و بە گەیاندی تۆ بە پلەی پادشـایەتی دەهەندەیی خۆی لەگەڵ تۆ دا بە چڵەپۆپە گەیاندووە. ڕەزای خودا لەوە دایە تۆ لە ژێر باری ئەرکی خۆت نەچییە دەریَ و لەو ڕێگایەی کە خودا پێی خۆشە لا نەدەی و لە عیبادەتی خودادا کەمترخەم نەبی. ماوەیەکە دەبینم باوکی خۆت لە بیر چووەتەوە و وەسیَتەکانیت پشت گوێ خستووە. بێ بەڵێنیت کردووە. نیعمەتەکانی خودا بە هێند ناگری و شـوکری خودا ناکەی و مسـکێنان و هەژارانت لە بیر کردووە.» پادشا پرسی: «ئەو قسانە بۆ دەکەی مەبەستت چییە؟» شەمماس گوتی: «مەبەستم ئەوەیە کە تۆ وڵاتت لە بیر کردووە. خزمەتی دین و وڵات و مسکێنان فەرزە و ئەرکی سەر شانی پادشـایە. پادشا ئەمن دەڵێم ئاوڕێک لە کاروبارەکانت بدەوە و جوان بیریان لێ بکەوە. خۆ لە چێژ و تامی کاتیی، کە مرۆڤ بەرەو هەڵدێر و تێداچوون دەبەن بپارێزی. دەنا ئەوەی بە سەر ڕاوچییەکە هات بە سەر تۆش دێ.» پادشا پرسی: «بۆ ڕاوچی چی بە سەر هات؟»

### [چیرۆکی ڕاوچی و ماسی گەورە]

شەمماس وەڵامی داوە: پادشـام، بیسـتوومە ڕاوچییەک بە پێی خووی جارانی چووە قەراخ چۆمێک بۆ ماسی گرت، کە گەیشتە قەراخ چۆمەکە و لە پردەکە پەڕییەوە. ماسییەکی گەورەی دیت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەبێ ئەو ماسـییە بگرم. بۆ ئەوەی هەتا چەند ڕۆژ پێویستیم بە ڕاوەماسی نەبێ. ئینجا جلەکانی داکەند و بۆی چووە ناو ئاوەکەوە. ئاوەکە بە خێرای بردی هەتا گەیشتە ماسییەکە و گرتی. دوایی سەیری کرد لە ڕەخ ئاوەکە زۆر دوور کەوتووەتەوە. هێندەی دڵ چووبووە ماسییەکە بە هەر دووک دەست ماسییەکەی گرت و دەسـتی کرد بە پیمەلە ویسـتی بە هەر زەحمەتێک بێ ماسـییەکە لەگەڵ خۆی بەریَ. ئاوەکەش بەردەوام ڕای دەدا تا گەشـتە گێژاوێک کە کەس نەیدەتوانی لێی ڕزگار بێ. کە وایزانی هاواری کرد: «فریام کەون خنکاام.» تاقمێک مەلەوان گوێیان لێ بوو هاتنە هانای و لێیان پرسی ئەتۆ کێی و بۆ گەیشتوویە ئەو شوێنە پڕمەترسییە؟ ڕاوچی گوتی: «ئەمن

ئەو کەسەم کە ڕێگەی ڕوون و دەراویشم دەزانی بەڵام وەدوای هەوای نەفسم کەوتم و خۆم خستە مەترسییەوە.» گوتیان: باشە بۆ خۆت تووشی ئەو ڕۆژە کرد، لە کاتێکدا دەتزانی کەس لەو گێژاوە ڕزگاری نابێ و شارەزای دەراوەکانیش بووی؟ ئەی باشە بۆ ئەو ماسییەی دەستت بەڕەڵا ناکەی و بێیە دەرێ. خۆت ڕزگار کەی؟ ئێستا هیچ کەس توی لەو گێژاوە پێ ڕزگار نابێ. ڕاوچی دەستی لە ژیان شوت و ماسییەکەی بەر دا و بۆخۆشی خنکا.

پادشام، ئەمن ئەو چیرۆکەم بۆیە بۆ گوتی هەتا دەست لەو ئاکارە کە تۆی لە کاروباری وڵات دوو خستووەتەوە هەڵگری و بگەڕێیەوە سەر بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات. با کەس ئیرادت لێ نەگرێ و باست نەکا. پادشا گوتی: «وەزیر تۆ دەڵێی ئێستا من چ بکەم؟» وەزیر وەڵامی داوە: «هەر سبەینێ، خەڵک کۆ کەوە هەواڵیان بپرسە و داوای لێ بووردنیان لێ بکە و داوایان لێ بکە بەردەوام بن لە سەر ڕێبازی چاکە و چاکەکاری و بە گشتی دڵیان چاک کەوە.» پادشا گوتی: «شەمماس، قسەکانت جوان و بەجێن. سبەینێ تۆ چۆن بڵێی وا دەکەم.»

وەزیر لەڕێوە لە لای پادشا هاتە دەرێ و چووەوە لای خەڵک و ئەوەی کردبووی و گوتبووی و بیستبووی بۆ خەڵکەکەی گێڕاوە. بۆ بەیانییەکەی پادشا هاتە دەرێ و خەڵکیش کۆ بووەوە و پادشا هەواڵی خەڵکی پرسی و بۆ کەمترخەمییەکانی داوای لێ بووردنی لە خەڵک کرد و گفتی دانێ کەمترخەم نەبێ. خەڵکیش خۆشحاڵ بوون و گەڕانەوە سەر کار و ژیانی خۆیان. دوای ئەوە یەکێک لە ژنانی پادشا کە لە هەموویان بەڕێز و بە قدرتر بوو، هاتە لای پادشا. سەیری کرد پادشا گۆڕاوە و خەریکی بیر کردنەوەیە. لێی پرسی: «پادشام ئەوە بیر لە چی دەکەیەوە؟» پادشا وەڵامی داوە: «ئەمن بە هۆی عەیش و نۆش و ڕابواردنەوە لە کار و ژیانم دابڕابووم و کارەکانم وە دوا کەوتوون. چۆن دەبێ من. کاروباری مسکێنان، ئاوا پشتگوێ بخەم؟ ئەگەر من دەست لەو کارانە هەڵنەگرم وڵاتەکەم لە دەست دەر دەچێ.» ژنەکە گوتی: «پادشام، ئەمن پێم وایە ئەو وەزیرانە دەیانهەوێ کڵاوت لە سەر کەن. ئەوان دەیانهەوێ تۆ تام لەو پادشایەتییەت نەزانی و کەڵک لەو هەموو نیعمەتت وەرنەگری. ئەوان بە تەمان کار و ئەرکەکانی خۆیان بخەنە سەر شانی تۆ. ئەی کەوایە وەزیرت بۆچییە ئەتۆ تەمەنی خۆت لەو ڕێگەیدا زایە کەی؟ بووەتە نەقڵی گەنجەکە و ڕێگرەکان.» پادشا گوتی: «بەسەرهاتی ئەوان چۆناوچۆنە؟»

### [بەسەرهاتی لاوێک و چەند دز]

ژنە گوتی: «پادشام، دەگێڕنەوە کە حەوت دز بە پێی کاری ڕۆژانەیان لەماڵ هاتنە

دەرێ بە لای باخێکدا ڕۆیشـتن کە دارگوێزەکانی گوێزێکی زۆری پێوە بوو. لەو جەنگەیەدا تـازەلاوێک بەوێدا هـات، پێیـان گوت کوڕی چاک، دێی بچین بۆ گوێزڕنین لەو نێو بـاخە؟ لاوەکە کە ئەوەی بیست، قەبووڵی کرد و لەگەڵیان چووە ناو باخەکەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نۆسەد و نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کاتێک کوڕەکە و دزەکان چوونە ناو باخەکەوە، دزەکان کوتیان جا کێ لە هەموومان سووک و لەبارترە با بچێتە سـەر دارەکە و گوێزەکان داوەرێنێ. پاشـان چاوێکیان بە نێو خۆیاندا گێڕاوە گوتیان. ئەو کوڕە گەنجە بابەتی ئەو کارەیە. کوڕە کە دەیویست بچێتە سەر دارەکە پێیان گوت ئیدی کارێک مەکە دیار بی و تووشی کێشە بین. لەو سەرە خۆت مات دە و هەر جارەی لکێک ڕاوەشێنە تا تەواوی گوێزەکانی بەر دەبنەوە. ئێمەش لێرە کۆیان دەکەینەوە. کە تەواویش بوو هاتێ خوارێ بەشی دەکەین. هەر کەسەی بەشی خۆی هەڵگرێ.

کوڕە چووە ســـەرێ و لـک بە لکی دارەکەی تەکانـد. دزەکـانیش گوێزەکـانیـان کۆ دەکردەوە. وا بوو لە پڕدا خـاوەن بـاخەکە هـات و تێیـان خوڕی و گوتی: «ئەوە لێرە چ دەکەن؟» دزەکـان گوتیـان: ئێمە هیچمـان لە دارەکە نەکردووەتەوە. بێرەدا هـاتین. ئەو کوڕەمان لەو ســـەر دارە دیت. وامانزانی خاوەنماڵە داوامان لێ کرد نەختێکمان بەش بدا. ئەویش دارەکەی بۆ تەکاندین دەنا ئێمە هیچ گوناهێکمان نەکردووە. کوڕە هاواری لێ پەیدا بوو گوتی: «بە خودا درۆ دەکەن. ئێمە هەموومان پێکەوە هاتینە ئێرە. ئەوانە منیان ناردە ســەرێ و فێریان کردم چۆنی بتەکێنم.» خاوەن باخەکە گوتی: «خۆتان ماڵوێران کرد. پێم بڵێن هیچتان خواردووە یان نا؟» کوڕە وەڵامی داوە: «ناوەڵلا هیچم نەخواردووە.» خاوەن بـاخەکە گوتی: «ئێســـتـا بۆم دەرکەوت کە تۆ گەوجی و بۆ ڕازی کردنی خەڵک خۆت خستووەتە مەترسییەوە. دوای ئەوە بە دزەکانی گوت: «ئەمن کارم بە ئێوە نییە. بڕۆن بە دوای کاری خۆتاندا.» کوڕەی گرت و وەبەر مست و شەپی دا.

پادشـام، وەزیرەکانی تۆش ئاوان. دەیانهەوێ لەبەر بەرژەوەندی خۆیان تۆ ژیانی خۆت فیدا بکەیت. پادشـــا گوتی: «ئەمن قەت بە قســـەی ئەوان دەســـت لەو نیعمەتانەی خۆم هەڵناگرم.» دوای ئەوە هەتا بەیانی لەگەڵ ژنەکانی بە خۆشی ڕایبوارد و خەوت.

کە ڕۆژ بووەوە وەزیر هەسـتا و لەگەڵ گەورەکانی دەوڵەت، بە دڵێکی خۆشـەوە بەرەو کۆشکی پادشا چوون. پادشا دەرگای کۆشکی لێ نەکردنەوە و نەهاتە دەرێ. کاتێک ئەوان بێ هیوا بوون، بە وەزیر شـــەمماســـیان گوت: «وەزیری زانا و بلیمەت ئەوە دیتمان وەک منداڵێکی ساوا قسەکەی نەبردە سەرێ. ئەوە سەرەتای گوناح و سەرپێچییەکانییەتی. بەڵام تکایە با بچین بۆ لای و بزانین بۆ نەهاتە دەرێ. ئیدی شـــەمماس چووە ژوورێ بۆ لای پادشـــا و ســـڵاوی لێ کرد و گوتی: «پادشـــا بۆ بە هۆی چێژی شـــتی هیچ خۆ لە کارە گەورەکانت دەدزییەوە؟ وەک ئەو کابرایەت لێ هاتووە لەبەر شـیری وشـترەکەی پشتی لە

هەموو كاروبارێكی كردبوو. ڕۆژێك ئەوە پیاوەی دەڵێم هەر خەریك شـیری وشـترەكەی بوو، نەچوو بە لای كاروبارییەوە. كاتێك وشترەكە زانی كە ئەو ناچێ بە لای ئەركەكانییەوە. ڕوویشـت ڕێی دەرودەشـتی گرتە بەر. كابرا شـیرەكەی دانا و كەوتە شـوێنی. وشـترەی نەگرتەوە كە گەڕاوە شـیرەكەشـی نەمابوو. بەو جۆرە هەردووكیانی لە دەسـت دەرچوو. پادشـا ئەتۆ سـەرنجی ئەو شـتانە بدە كە بەرژەوەندی خۆشـت و خەڵكەكەشـتی تێدایە. خۆ ناكرێ خەڵك بۆ خواردن هەر لە بەر دەركی چێشـتخانە و هەر لەبەر ئەوەی پێویسـتیان بە نیزیكی ژنـان هەیە دایمە لە پاڵ ئەواندا بن. پیـاو دەبێ دوو كـاتژمێرێك لەگەڵ ژنـان بێ. ئەوەی دیكەی لە بیر كاروبارياندا بن. چونكە لە دوو سـعات زیاتر مانەوە لە پاڵ ژناندا زیان بە ئاوەز و ژیری و سـلامەتی پیاو دەگەیەنێ. چونكە ئەوان بەرەو خێرت نابەن. پیاو نابێ گوێ بداتە قسەی ئەوان. زۆرم بیستووە پیاوێكی زۆر بە دەست ژنانەوە تێدا چوون.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەمشـەویش كۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

# که شەوی نۆسەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شەمماس گوتی: «پادشا، ئەمن ئەو قسانەم بۆیە بۆ کردی، هەر لەبەر ئەوەی تۆ ئەوە بزانی پیاو نابێ بە قسەی ژنان بکا و ملکەچیان بێ. وریا بە دوای ئەو هەموو زانایی و بلیمەتییەت جلی نەزانی نەکەیتە بەرت. کوڕە تووشی پەشیمانی دەبی و تازە هەموو شتێکت لە دەست دەدەی. کاتێک پادشا قسەکانی شەمماسی بیست. گوتی: «ئینشائەڵلا بەیانی دێمە دەرێ.» ئیدی شەمماس هەستا هاتە دەرێ و شتەکەی بۆ گەورەکانی دەوڵەت گێڕاوە. کاتێک گوتەکانی شەمماس بە گوێی خێزانی پادشا گەیشتەوە، هاتە لای پادشا و گوتی: «لەوەتی دونیا هەیە مسکێنان کۆیلەی پادشاکان بوون. کەچی تۆ کۆیلەی مسکێنەکانتی و لێیان دەترسی. ئەوان دەیانهەوێ تۆ تاقی کەنەوە. ئەگەر بزانن بە دەمیانەوە دەدی گوێت نادەنێ و بێ قسەییت دەکەن. بەڵام ئەگەر بزانن بە گوڕ و ئازای لێت دەترسن و چەنەدرێژی ناکەن. وەزیری خائین و خراپ هەمیشە ئەوە کاریانە. چونکە ئەوانە چاوبەست و زۆر زانن. ئەگەر بێتوو بە گوێیان بکەی بە کەیفی خۆیان لە پێناو بەرژەوەندی خۆیان کەڵکت لێ وەر دەگرن. هەتا سەرت تێدا دەبەن. ئەو کێشەی تۆ وەک کێشەی بازرگان و دزەکان وایە.» پادشا گوتی: «کێشە بازرگان و دزەکان چۆناوچۆن بووە.»

### [بەسەرهاتی بازرگان و دزەکان]

ژنە وەڵامی داوە: «بیستوومە کە بازرگانێکی ساماندار بۆ کاری بازرگانی هەڵدەستێ بەرەو چەند شارێک دەکەوێتە ڕێ. کە دەگاتە یەکەم شار مزڵێک بە کرێ دەگرێ. لەوێدا ئاکنجی دەبێ. کۆمەڵێک دزی ئەو شارە کە لە بۆسەی بازرگاناندا بوون تا شتەکانیان لێ بدزن، ئەویان هەڵنا.[1] چوونە سۆراغی بەڵام هیچیان لەگەڵی پێ نەکرا. سەرگەورەی دزەکان گوتی: «ڕاوەستن ئەمن فێڵێکی لێ دەکەم. لەڕێوە هەستا چوو، جلی نۆژدارانی لە بەر کرد و هەنبانەیەکی داو و دەرمان بە شانیدا دا. لە شەقام و کۆڵانەکان دەگەڕا و هاواری دەکرد. کێ پێویستی بە نۆژدار هەیە. تا خۆی گەیاندە بەر مزڵەکەی بازرگان. سەیری کرد بازرگان دانیشتووە و نانی بەیانی دەخوا. لێی پرسی: «کارت بە نۆژدار نییە؟» بازرگان گوتی: «پێویستیم بە نۆژدار نییە، بەڵام وەرە دانیشە نانم لەگەڵ بخۆ.»

دزە لەڕێوە چوو ڕووبەڕووی دانیشت و خواردنەکەی لەگەڵ خوارد. ئینجا دزە لە دڵی

---

[1]. هەڵنان: خستنە ژێر چاوەدێرییەوە.

خۆیدا گوتی: «ئیستا کاتییەتی و دەرفەتی چاکە. ڕووی لە بازرگانەکە کرد و گوتی: «پێویستە ئامۆژگارییەکت بکەم. چونکە تۆ چاکەت لەگەڵ من کرد. ئەویش ئەوەیە کە وەک دەبینم کەمێک زۆر دەخۆی. ئەوەش ئی ئەوەیە کە گەدەت نەخۆشە. ئەگەر زوو لە خەمی خۆتدا نەبی کێشەت بۆ ساز دەکا.» بازرگانەکە گوتی: «ئەمن هیچم نییە و ساغ و تەندروستم و گەدەشم جوان کار دەکا.» دزە گوتی: «جاریَ پێتەوە دیار نییە و بۆخۆت خەبەرت لێی نییە، بەڵام ئەمن دەزانم چیتە. ئەگەر بە قسەی من دەکەی لە فکری خۆتدا بە.» بازرگانەکە گوتی: «جا باشە چ بکەم کێ چارم دەکا؟» دزە وڵامی داوە: «من بۆخۆم چارەت دەکەم و خودای تەعالاش چاکت دەکاتەوە.» بازرگان گوتی: «دەرمانەکانم پێشان بدەم و کەمێکم بدەیە.»

دزە تێکەڵییەکی لە ژەقنەمووت و چەند دەرمان دایە و پێی گوت: «ئەو شەو ئەوە بخۆ بزانە چۆن دەبی.» بازرگانە وەری گرت. کە شەو داهات کەمێکی لێ لە سەر زمانی دانا، سەیری کرد زۆر تاڵە. ئەوجار دەرمانەکەی خوارد. پاش ئیستێک هەستی کرد سووکتر و هەناوێکی ئاسوودەتری هەیە. بۆ شەوی دوایی دزە کەمێکی دیکەی بۆ هێنا. بەڵام ژەقنەمووتەکەی لە شەوی پێشوو زۆرتر بوو. بازرگانەکە کە ئەوەی خوارد تووشی زکچوون بوو. بەڵام وەسەر خۆی نەهێنا و لە کارەکە دڵسارد نەبووەوە. دزە کە زانی بازرگانەکە باوەڕی پێ کردووە و لێی نیگەران نییە. ژەهری کوژەری بۆ هێنا. بازرگانە ئەویشی لێ وەرگرت و خواردی. لە ڕێوە جەرگی بڕی و کوتە کوتە لە دەمی هاتە دەرێ و کوشتی. دزەکان کە لە دوور و نیزیک خۆیان مات دابوو، ڕژانە مزڵەکەیەوە و کاڵا و شتوومەکیان بە تاڵان برد.

پادشا ئەو بەسەرهاتەم هەر لەبەر ئەوە بۆ گێڕایەوە کە بە قسەی ئەو گزیکارانە نەکەی دەنا تێدا دەچی.» پادشا گوتی: «ڕاست دەکەی بە قسەیان ناکەم و ناچمە دەرێ.» کە ڕۆژ بووەوە خەڵک کۆ بوونەوە بەرەو دەرکی کۆشک چوون. لەوێ دانیشتن تا ئەو کاتەی کە دڵنیا بوون نایەتە دەرێ. ئینجا گەڕانەوە بۆ لای شەمماس گوتیان: «بیرمەندی زانا تۆ دەزانی ئەو هەتیوە گەوجە چەند درۆزنە؟ بە ڕاستی جێی خۆیەتی لە دەسەڵاتی بخەین و کەسێکی دیکە لە جێی ئەو دابنێین. بەشکوو کاروبارمان کەمێک جوانتر بەڕێوە بچێ و ڕێکو پێکتر بێ. بەڵام قەیناکا ئەو جارەش بچووەوە بۆ لای و پێی بڵێ، بڵێ ئێمە شەرم لە ڕۆحی باوکی دەکەین، دەنا لە دەسەڵاتی دەخەین و کەسێکی دیکەی لە جێ دادەنێین. ئێمە تا ئیستا بە حورمەتی گفت و بەڵێنی باوکی و ئەو ڕێزەی ئێمە بۆ گەورەیی ئەو قایل بووین هیچمان نەگوتووە دەنا شەوەکی هەموومان خۆمان پۆشتە دەکەین و بە چەکەوە دێین داروديواری کۆشک دێنینە خوارێ. جا ئەودەم یان دێتە دەرێ بە قسەمان دەکا. یان بۆی دەچینە ژوورێ و دەیکوژین و کەسێکی دیکەی لە جێ دادەنێین.»

شەمماسی وەزیر هەستا چوو بۆ لای پادشا و پێی گوت: «ئەوە بۆ ئاوا ملکەچی هەوا و هەوەس بووی؟ ئەو دەردە چییە دەیدەی بە خۆت و بۆ ئاوا لە خۆت دەکەی؟ خۆزگە دەمزانی کێ ئاوا لە خشتەی بردووی؟ پێم سەیرە، ئەی ئەو هەموو زانست و زانیارییەت چی لێ هات. بریا بۆم دەرکەوتبا کێ ئەتۆی لە زانستە و بەرەو گەوجێتی و لە بەڵێندارییەوە بەرەو بێ بەڵێنی و نەرم و نیانییەوە بەرەو توند و تیژی دەبا و هۆکارەکەی چییە؟ قەتت بێ قسەیی من نەدەکرد. ئێستا بە گوێم ناکەی. چۆن ئەمن سێ جاران هاتم و ئامۆژگاریم کردی ئەتۆ بە قسەت نەکردم و ئامۆژگارییەکانی منت پشتگوێ خست. پێم بڵێ بۆ ئاوات لێ هاتووە و کێ فریوی داوی؟ پادشا پێمخۆشە ئەوە بزانی کە خەڵک یەکیان گرتووە و پەیمانیان بەستووە بە تەمان بۆت بێنە ژووری و بتکوژن و کەسێکی دیکە لە جێی تۆ بکەنە پادشا. گەلۆ تۆ دەتوانی بەرەنگاریان بی؟ یان دوای مردنەکەت زیندوو ببیەوە؟ ئەگەر دڵت بە دونیاوەیە و حەز دەکەی بژی، ئەوە وریا بە هەستە جڵەوی دەسەڵات بگرە دەست و داوای لێ بووردن لە خەڵک بکە. چونکە ئەوان بە تەمان دەسەڵاتت لە دەست بستێنن و یەکی دیکە لە جێی تۆ دابنێن و ماندوو بوون و دەیانهەوێ ڕاپەڕن و تۆ لە بەین بەرن.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و بیست و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! وەزیر بە پادشای گوت: «ئەو کارەی تۆ وەک کاری ڕێوی و گورگەکەی لێ هاتووە.» پادشا پرسی: «بۆ گورگ و ڕێوی چیان بە سەر هات؟»

**[بەسەرهاتی گورگ و ڕێوی]**

وەزیر وەڵامی داوە: «دەگێڕنەوە کۆمەڵێک ڕێوی وەدەر کەوتن بژیوێک پەیدا بکەن. زۆر گەڕان، ئەملا و ئەولا ئاخری تووشی کەلاکە وشترێک بوون. گوتیان: ئەوە شتێکمان دیتەوە ماوەیەک سکمانی پێ بێدەنگ بکەین. بەڵام لەوەی دەترسین کە بیکەینە زۆر دار و بێ زۆر و تاقمێک زوڵم لەوانی دی بکەن. ئەو دەم لەڕ و لاوازەکان دەمرن. وا چاکە لە نێو خۆماندا یەکێکمان بکەینە دادوەر و شتێکیشی بۆ لە بەر چاو بگرین. با بەهێزەکان مافی بێهێزەکان پێشێل نەکەن.

لەو جەنگەیەدا کە ئەوان خەریکی ڕاوێژ بوون گورگێک پەیدا بوو. هێندێک لە ڕێوییەکان گوتیان: «ئەگەر ڕاتان لە سەر بێ ئەو گورگە بکەینە دادوەر. چونکە ئەو لە هەمووومان بەهێزترە و باوکیشی پادشای ئێمە بوو. بەشکم ئەو بە ئینسافەوە لە نێوانماندا دابەشی بکا. دوای ئەوە تەواوی ڕێوییەکان چوون بۆ لای گورگەکە و پێیان گوت: «هاتووین بێی و سەرافەتیمان بکەی با هەموو بە قەد یەکمان وەبەر کەوێ و بەهێزەکان لەتم لە بێهێزەکان نەکەن. کەسی ئێمە زیان بەوی دیکە نەگەیەنێ. گورگ بە دەنگیانەوە چوو. ئەو ڕۆژە هەر کەسەی بەشی خۆی دایە. ڕۆژی دوایە،گورگ لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەگەر بێتوو ئەمن ئەو وشترە لەوان بەش کەم ئەمن جگە لەو بەشەی بۆیان دیاری کردووم، هیچی دیکەم وەگیر ناکەوێ. خۆ ئەگەر بە تەنیاش بیخۆم کەس ناتوانێ چم لێ بکا. ئەگەر بێتوو ئەمن ئەو وشترەی بەرمەوە بۆ خۆم و منداڵەکانم کێ دەتوانێ پێشم بگرێ. وا چاکە ئەمن دەستی بە سەردا بگرم و بەشیان نەدەم. ئیدی کاتێک ڕێوییەکان هاتن بۆ لای گورگەکە و گوتیان: گەورەی دڕندان خواردنی ئەوڕۆمان دەیە. گورگە گوتی: «خۆ هیچ نەماوە تا بتاندەمێ.» ڕێوییەکان سەریان داخست و بە زەلیلی ڕۆیشتن و گوتیان: «خودا ئەو گڵاوەی تووش کردین و خەم و پەژارەیەکی زۆری بە سەردا باراندین. چونکە ئەوە نە لە خودا دەترسێ و نە گوێی لە گوناه و شتەیە و نە ئێمەش دەرەقەتی دێین.» دوای ئەوە هێندێک لەوان گوتیان ڕەنگە برسی بێ، با ئەوڕۆ لێی گەڕێین تێر بێ بەیانی دێینەوە بۆ لای.

کە ڕۆژ بووەوە ڕێوییەکان چوونەوە لای گورگە و پێیان گوت کە گەورەی دڕندان

ئەتۆمان کردە گەورەی خۆمان تا هەر کەسەی بەشی خۆی بدەیەی و نەهێڵی بەشی کەس بخوریّ. ئەگەر ئەوەش تەواو بوو بۆمان لە حەولدا بیّ. بەو شێوە ئێمە بەردەوام لە ژێری سێبەری دەسەڵات و گەورەیی تۆدا بژین. ئەوە دوو ڕۆژە ئێمە هیچمان نەخواردووە و لە برسان هیزی هیچمان نەماوە. ئێستا ئەمانەتەکەمان بدەوە و ئەوەی لێشت خواردووە نۆشی گیانت بیّ. گورگە وەڵامی نەدانەوە و ئەوەندەی دیش ڕقی هەستا. هەرچەندی ڕێوییەکان پاڕانەوە و لاڵانەوە بیّ ئاکام بوو. بەزەیی پێیاندا نەهات.

ئەوجار ڕێوییەکان گوتیان ئێمە هیچ چارەیەکمان نەماوە جگە لەوەی پەنا بۆ شێر بەرین و خۆ بەسەر قاچیدا دەین و شتەکەی بۆ بگێڕینەوە. ئەگەر بە قسەی کردین و بە هاوارمانەوە هات ئەوە چ باشتر بە ئامانجمان دەگەین و ئەگەر پێشی نەگەین ئەوە ئەو کەلاکە وشتەرە بۆ ئەو بیّ باشترە. وا بوو، هەستان چوون بۆ لای شێر و ئەوەی گورگە بە سەری هێنابوون بۆ شێرەی گێڕاوە و داوای یارمەتیان لیّ کرد. گوتیان: ئەگەر تۆ لە دەست ئەو گڵاوە ڕزگارمان بکەی ئەوە دەبینە ئاڵقەلەگوێی تۆ. کاتێک شێرە ئەوەی بیست ڕەگی بوێری بزووت و هەستا لەگەڵیان چوو بۆ لای گورگە. کاتێک گورگە دیتی شێرەکە بەرەو لای ئەو دیّ. هەڵات و شێرە کەوتە سەری. گورگەی گرتەوە و هەڵیدڕی و ڕێوییەکانیش بە ئامانجی خۆیان گەیشتن.

پادشام، لێرەدا بۆم دەرکەوت کە هیچ پادشایەک نابیّ گویّ لە ویست و داخوازی مسکێنان بخەوێنیّ. ئێستاش تکایە بە قسەم بکە و بە خۆتدا بچووەوە. بابت لە کاتی گیانەڵلادا چەندی پیّ گوتی لە کاروبارت خافڵ نەبی. ئیدی ئەمن هیچی دیکە ناڵێم.» پادشا گوتی: «باشە بە قسەت دەکەم و لە بەیانییەوە دێمە دەریّ.» ئەوجار شەمماس هەستا چووە دەریّ و شتەکەی بۆ گەورە گەورەکانی دەوڵەت گێڕاوە.

کاتێک شاژن قسەکانی شەمماسی بیستەوە و زانی کە سبەینیّ پادشا دەچێتە دەریّ و گویّ لە هات و هاواری مسکێنان دەگریّ. بە لەز خۆی گەیاندە پادشا و پێی گوت: «ئەمن سەرم لە کاروباری تۆ سووڕ ماوە ئەتۆ چۆن بە قسەی مسکێنانی خۆت دەکەی؟ مەگەر تۆ نازانی ئەو وەزیرانە کۆیلەی تۆن؟ لەبەر چی ئەوەندەیان بۆ دادەنەوێنی و لەسەر خۆتیان دەکەی بە کەڵەگا. کارێک دەکەی وا بزانن ئەوە لە سایەی ئەوانەوە تۆ پادشای و ئەوان تۆیان بە ئێرە گەیاندووە. ئەو هەموو ماڵ و سامان و نیعمەتە ئەوان داویانێ. خو ئەوان لەگەڵ تۆ هیچیان پیّ ناکریّ ئیدی بۆ لە بەریان دادەنەوێنی. دەبیّ ئەوان گویّ لە مستی تۆ بن، نەک تۆ ئی ئەوان. چون تۆ لەوان دەترسێی ئێستا ئەوان دەڵێن ترسنۆکێکی وەک ئەوە شیاوی پادشایەتی نییە. پادشا دەبیّ دڵی وەکوو بەرد وا بیّ، دەنا بۆ پادشایەتی نابیّ. کەچی ئەوان سەریان لەو هەموو نەرم و نیانییەی تۆ سووڕ ماوە. ئەگەر بێتوو هەر ئاوا بە قسەیان بکەی ئەوە ئەوان زیاتری شوو لیّ هەڵدەکێشن و زیاتر بە سەرتدا زاڵ

دەبن. ئەودەم ئەتۆ وەک شوانەکەت لێ دێ.» پادشا پرسی: «شوانی چی، دا بۆم بگێڕەوە؟»

### [بەسەرهاتی شوان و دز]

پادشاژن وەڵامی داوە: «بیستوومە کابرایەکی شوان بوو. شەوێک لە شەوان دزێک چووە سەری. ویستی مەڕی لێ بدزێ. سەیری کرد شوانەکە زۆر وریایە و شەووڕۆژ چاوەدێری مەڕەکانی دەکا. وا بوو ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر بە دەوریدا سووڕاوە نەیتوانی دەرفەتی لێ بێنێ و دزی لێ بکا. ئیدی سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیی. لە دەشتێکدا تووشی شێرێک بوو. دەرفەتی لێ هێنا و ڕاوی کرد. پاشان کەوڵی کرد و پێستەکەی پڕ کرد لە کا و بردی لە سەر شوێنێکی بەرز داینا. تا شوانەکە لێی دیار بێ. دوای ئەوە بۆخۆی چووە لای شوانەکە و پێی گوت، گوتی: «شێر ناردوومی یەکێک لەو مەڕانەی خۆتی بۆ بنێری.» شوانە پرسی: «شێرەکە لە کوێیە؟» دزە گوتی: «چاو لە سەر هۆو تەپکە کە. هەها لە کوێیە.» شوانە سەری هەڵێنا و بۆی ڕوانی شێرەکەی دیت، پێشی وابوو شێری زیندووە. زۆر ترسا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی نۆسەد و بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک شوانە شێرەکەی دیت زۆر ترسا و بە دزەی گوت. کاکە گیان چەند دانەی بۆ دەبەی بۆی بەرە، ئەمن دەســـتت وەبەر ناهێنم. ئینجا دزە ســـەیری کرد شـــوانە زۆر ترســـاوە، هەر بۆیە ئەوەندەی بۆ چوو لەگەڵ خۆی بردی. دوای چەند ڕۆژی دیکە هاتەوە بۆ لای و گوتی: «شـــێرە داوای خۆراکی دەکرد.» بەو جۆرە دزە ماوەیەکی زۆر ئاوای لە شـوانە دەکرد. هەتا زۆربەی زۆری مەڕەکانی لێ ئەسـتاند. پادشـا ئەمن ئەو چیرۆکەم بۆیە بۆ گێڕایەوە کە وریا بی گەورەکانی دەوڵەت ئەو پەندەت بەســـەر نەهێنن و فریوت دەن. بە هۆی نەرم و لەسـەرخۆییتەوە دەرفەتت لێ بێنن. پادشـا گوتی: «بە قسـەت دەکەم و قەت بە قسەی ئەوان لێرە ناچمە دەرەوە و بچم بۆ لای ئەوان.»

کە ڕۆژ بووەوە وەزیر و گەورە گەورەکانی دەوڵەت هەر یەکی دەســـتیان دایە چەکی خۆیان و چوون بۆ ماڵی پادشا تا بیکوژن و وڵات بدەنە دەست یەکی دیکە. کە گەیشتە بە دەرگای ماڵی پادشــــا داوایان لە دەرکەوانەکە کرد، ڕێیان بدا بچنە ژوورێ. دەرکەوان دەرکەی نەکردەوە. ئەوان ئـاوریـان هێنا دەرکەکە بســـــووتێنن و بچنە نـاو کۆشـــــکەوە. دەرکەوانەکە کە ئەوەی دیت خێرا خۆی گەیاندە لای پادشــــا پێی گوت: «کۆمەڵێکی زۆر خەڵک بەر دەرگایان گرتووە و داوام لێ دەکەن بیکەمەوە. بە تەمان کۆشـــک ئاور دەن و تۆش بکوژن. ئەمن دەرگام لێ نەکردنەوە. چ بکەم؟» پادشا لە بەر خۆیە گوتی: «چارەڕەش بووم.» ناردی لە دووی ژنەکەی. ژنەکەی هات. پادشـــا پێی گوت: «ئەوەی شـــەمماس بە منی دەگوت هەمووی ڕاست بوو. ورد و درشت هاتوون بۆ کوشتنی من. ئێستا بە ڕای تۆ چ بکەم.» ژنە گوتی: «ئەتۆ خەمی هیچت نەبێ و لێیان مەترســـە.» پادشـــا پرســـی: «ئەی باشە چ بکەم؟» ژنە گوتی: «دەستماڵێک لە سەرت بەستە و خۆت نەخۆش کە. بە شەمماس بڵێ بێتە ئێرە. ئەودەم پێی بڵێ ئەورۆ دەهاتم لەبەر ئەو شـەرێشـەیەم نەهاتم، نەخۆش بوو. پێی بڵێ ئەتۆ بە خەڵک بڵێ ســـبەینێ دێمە دەرێ و بە کارەکان ڕادەگەم. ئەگەر ئاوا بە شـەمماس بڵێی ئەوە ڕقەکەیان دەنیشـێتەوە و دەڕون. بەڵام بۆ سـبەینێ دەکەسـی چالاک و ئازا بانگ کە لای خۆت. بەو مەرجەی تێیان ڕابیینی و نەهێنی نەدرکێنن. ئینجا پێیان بڵێ لە پێشـــت ڕاوەســـتن. نەهێڵن کەس بێتە ژوورێ مەگین یەک یەک ئەوانیش بەرن لە دیوێک بیانکوژن تا دەگاتە یەکەم کەســـی ئەوان ئەویش بکوژە. کە تۆ ئاوات کرد. ئیدی مســـکێنان کەسی وایان نامێنێ و لە دەستیان دەحەسێیەوە. هیچ فکر و گەلالەیەک بۆ تۆ، لەوە باشتر نییە.» پادشا گوتی: «فکرەکەت فکری چاکە، چۆن دەڵێی وا دەکەم.»

ئینجا داوای دەســتماڵی کرد و ســەری بەســت. پاشـان فەرمانی دا شـەمماسـی بۆ بانگ

کەن. بە شـــەمماســـی گوت: «ئەمن تۆم خۆش دەوێ و گوێ بە فەرمانتم بۆ من لە جێی باوک و برای. ئەوەی کە فەرمووت بێمە دەرێ و بە کاروباری خەڵک و وڵات ڕابگەم ئامۆژگارییەکی باوکانە بوو، بەڵام بە داخەوە ئەو نەخۆشـــییەم بۆ هاتە پێشـــێ و نەمتوانی بێم. ئاگام لێیە خەڵک لە نەهاتنەدەرێم تووڕەن و بە تەمان کاری نەشـــیاو دەرحەق بە من بکەن. ئەوان نازانن من نەخۆشم. ئەتۆ بچووە دەرێ و پێیان بڵێ کە من ناساغم و لە زمان منەوە داوای لێبووردن بکە. پێشیان بڵێ ئەمن تەواوی ویست و داواکارییەکانیان دێنمە دی. ئەتۆ زەمانەت و پشـــتگیریم بکە. هەتا ئیشـــەڵڵا ســـبەینێ دێمە دەرێ. بەشـــکوو ئەوشـــەو نەخۆشییەکەم چاک بێ. ئەوجار شەمماس سووژدەی بۆ خودا برد و دۆعای سلامەتی بۆ پادشـــا کرد و بە دڵێکی خۆشـــەوە هاتە درێ. ئەوەی دیتبووی و بیســـتبووی بۆ خەڵکەکەی گێڕاوە و گوتی کە پادشـــــا داوای لێبووردنی کردووە. خەڵکەکەی ئارام کردەوە و لەو هەڵوێستەی گرتبوویان پەشیمانی کردنەوە و یەکسەر چوونەوە ماڵەکانیان.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـکۆ! کاتێک شـەمماس پێی گوتن: «پادشـا داوای لێ بووردنی دەکرد.» خەڵکەکە هەموو دامرکانەوە و گەڕانەوە.

پادشـا دە کەسـی ئازا و چالاک و دڵڕەقی کە کۆیلەکانی باوکی بوون بانگ کرد. پێی گوتن: «خۆ لە بیرتانە لە لای باوکم چ ڕێز و حورمەتێکتان هەبوو. ئەمن دەمهەوێ ڕێز و پلە و پایەتان لەو دەمیش بەرمە سـەرتر. بەڵام داوایەکتان لێ دەکەم گەلۆ دەتوانن لە لای کەس باسـی نەکەن و ئەو نهێنییەم بۆ بپارێزن؟» هەر دە کەسـەکە یەکدڵ و یەکزوبان گوێتان: پادشا، تۆ هەرچی پێمان بسپێری بە سەر سەر و بە سەر چاو جێبەجێی دەکەین و لە فەرمانیشت دەرناچین. پادشا پێی گوتن: «جا کەوایە با باسی هۆکاری بردنەسەری ڕێز و پلە و پایەی ئێوە بکەم. ئەویش ئەوەیە کە ئێوە دەزانن کە باوکی من چەند بۆ ئەو وڵاتە دڵسۆز بوو، چەندی چاکە لەگەڵ ئەو خەڵکە کرد و چۆن داوای لێ کردن کە هاوکاری من بکەن و لە فەرمانم نەچنە دەرێ و دژایەتیم نەکەن. کەچی دوێنێ دیتان هەموویان لێم کۆ بیوونەوە تا من بکووژن. ئەمن دەمهەوێ دەسـت لەو کارانە هەڵگرن بەڵام دەزانم کە ناکشـێنەوە تا تاقمێکیان لێ نەکوژم. کەوایە بەیانی من لەو دیوەدا دادەنیشـم و دانە دانە ڕێیان دەدەین بێنە ژوورێ و پێیان دەڵێین لەو دیوەی دیکەوە دەچنە دەرێ. ئێوە ئەو دە کەسـە لە لای من دەبن و چاوتان لە من دەبێ هەر کە ئاماژەم کرد دەیبەن دەیکوژن و کەلاکەکەی لەو دیوە دەهاون.» کۆیلەکان گوتیان: «پادشـا، چۆنت بفەرمووی وا دەکەین.» ئیدی پادشـا خەڵاتێکی باشـی کردن و بەڕێی کردنەوە. پادشـا ئەو شـەوەش ڕۆژی لێ بووەوە.

کە ڕۆژ بووەوە، پادشا فەرمانی دا تەختیان هێنا و جلی پادشایەتی لە بەر کرد و کتێبی بەڕێوەبەری وڵاتی بە دەستەوە گرت. دە کۆیلەکە ڕووبەڕووی ڕاوەستا. جارچی جاڕی دا هەرکەس نیاز و پێداویسـتی یان کارێکی هەیە دانە دانە بێتە ژوورێ. بێن بچنە هەنتەشـی پادشا. بە دوای ئەوەدا وەزیر و سەرهەنگ و پەردەدارەکان هاتنە پێشێ. پادشا ئەمری کرد یەک یەک با بێنە ژوورێ. لە پێشـدا شـەمماسـی وەزیر بە پێی جارانی پێشـوو لە پێش هەموویانەوە چووە ژوورێ. ئەو ئاگای لە هیچ شـتێک نەبوو کە لە هەموو لایەکەوە بە دە کەسـان تێی ورووکان و گرتیان و بردیان کوشـتیان. دوای ئەو وەزیرەکانی دیکە و زانا و نۆژدارەکان یەک یەک چوونە لای پادشـا و کۆیلەکان بردیانن کوشـتانن. هەتا تەواویان کوشتن.

دوای ئەوە پادشا بە بکوژەکانی گوت ئەوەی زانیتان تۆزێک زیت و سەربزێوە سـەری

لێ دەن. ئەوەی ئـازا و نەترس بوو کوژرا. جگە لە گێژ و حەپۆل و ملکەچەکـان کەس نەماوە. پادشـا چۆنی فەرمان دابوو ئەوان ئاوایان کرد. دوای ئەوە پادشـا چوو لەگەڵ ژنان دەسـتی کرد بە عەیش و نۆش و ڕابواردن. داب و نەریتی چەوسـاندنەوە و سـەرکوت و زەبر و زەنگی گرتە بەر. لە شـار و وڵاتی ئەو پادشـایە کانگەگەلی زێڕ و زیو و یاقووت و گەوهەری زۆر تێدا بوو. بە جۆرێک کە پادشای شار و وڵاتەکانی دیکە ئیرەییان پێ دەبرد. هەمیشـە چاوەڕێی دەرفەتێک بوون. یەکێک لە پادشـاکان بە خۆی گوت خۆ ئەمن هەمیشـە بە ئاواتی ئەو وڵاتەوە بووم و ئێسـتا ئەو کوڕە گەوجە تەواوی پیاوە گەورە و ئازا و زاناکانی خۆی کوشتووە و ئەو دەرفەتە بۆ من ڕەخساوە بۆ هێرشی نەکەمە سەری. ئێستا نە کەسـی وای هەیە پلان و گەڵاڵەی شـەڕی بۆ داڕێژێ و نە کەسـی وای هەیە شـەڕی بۆ بکا. کاتییەتی دەستی بە سەردا بگرم. بەڵام وا چاکە لە پێشدا نامەیەکی توندی بۆ بنووسم. بزانم چۆنم وەڵام دەداتەوە.

دوای ئەوە پادشا نامەیەکی ئاوای بۆ نووسی: «بیستوومەتەوە چیت لە وەزیر و گەورە گەورەکانی دەوڵەتەکەت کردووە و کەسـت بە زیندووی نەهێشـتووەتەوە تا پارێزگاریت لێ بکا. ئیسـتا کاتی ئەوەیە خودای تەعالا من بە سـەر تۆدا سـەر بخا و دەسـت بە سـەر وڵاتەکەتدا بگرم. ئەتۆ گوێم لێ ڕاگرە و بە قسـەم بکە، لە نێوەڕاسـتی دەریادا کۆشـکێکم بۆ دروسـت بکە. ئەگەر ئەوەت پێ ناکرێ لە شـارەکەت بڕۆ دەرێ و خۆت ڕزگار بکە. دەنا لە لای وڵاتی هێندەوە دوازدە ڕەوە ئەسـپت بۆ دەنێرم کە هەر ڕەوە ئەسـپێک دوازدە هەزار سـواری لە سـەرە و دەیاننێرم بێنە سـەر شـارەکەی تۆ. تا سـامانەکەت بە تاڵان بەرن و پیاوەکانت بکوژن و ژنەکانت بە دیل بگرن. وەزیرە تازەکەشم دەکەمە سەرۆکی لەشکرەکەم و پێی دەڵێم شـارەکەت گەمارۆ بدا. پاشـان بڕژێنە ناو شـەرەکەتەوە. ئەو ڕاسـپاردەیەم دەنێرم سـێ ڕۆژ لە لای ئێوە لەوێ بمێنێتەوە، ئەگەر بە قسـەت کرد و پێمل بووی ئەوە باشە، ڕزگارت دەبێ. ئەگینا ئەو لەشکرەی باسم کرد، دەینێرم.»

دوای ئەوە نامەکەی مۆر کرد و دای بە ڕاسـپاردەکەی. ئەو کەوتە ڕێ. ڕۆیشـت هەتا گەیشـتە ئەو شـارە و لە پادشـا وەژوور کەوت و نامەکەی دایە. کاتێک پادشـا نامەکەی خوێندەوە، دڵی گیرا و سـەری لە کاری خۆی سـوورِ ما کە چی بە خۆی کرد. کوژرانی خۆی هاتە بەر چاو. نە کەسـێکی مابوو تا ڕاوێژی پێ بکا و نە شـەرکەرێکی وای مابوو بەربەرەکانی پێ بکا. لەڕێوە هەسـتا بە نارەحەتی چوو بۆ لای ژنەکەی. ژنە لێی پرسـی: «پادشـا ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟» پادشـا گوتی: «پێم دەڵێی پادشـا لە کاتێکدا من کۆیلەی پادشـایەکی دیکەم.» ئەوجار نامەکەی دەرهێنا و بۆ ژنەکەی خوێندەوە. ژنەکەی کە زانی چ باسە دەستی کرد بە گریان و بە خۆدا دان و شین و ڕۆ کردن. پادشا لێی پرسـی: «ئەتۆ ڕێگایەکت پێ شک دێ لەو گرفتە ڕزگارمان بێ؟» ژنە وەڵامی داوە ژنان لە بارەی شەڕەوە

هیچیان بە مێشــــک ناگا. ئەوە کاری پیاوانە دەبێ بیری لێ بکەنەوە.» کاتێک پادشـــا ئەو قسەیەی بیست. بیری گەورەکانی دەوڵەت کەوتەوە زۆر زۆر پەشیمان بووەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! نەهاتی رووی لە پادشا کردبوو. حەزی دەکرد بمرێ. دوای ئەوە بە ژنەکانی گوت: «ئەوەی ئێوە بەسەر منتان هێنا راست ئەو بەلایە بوو کە کیسەڵەکان بە سەر گەڤرک[1]ێکیان هێنا. ژنەکان گوتیان: «کیسەڵەکان چیان بە سەر گەڤرکەکە هێنا؟»

### [بەسەرهاتی گەڤرک و کیسەڵەکان]

پادشا گوتی: دەگێرنەوە کۆمەڵێک کیسەڵ لە دورگەیەکدا دەژیان. دورگەیەکی سەرسەوزی پڕ لە داری جۆراجۆر و جۆگە و جۆبار. رێکەوت وا بوو گەڤرکێک کە گەرما و ماندوویی رێگا شەکەتی کردبوو، رێی لەوێ کەوت و لای دا شوێنی کیسەڵەکان. ئەو کیسەڵانە بە رۆژدا لە دورگەکەدا دەسووڕانەوە و بە شەویش دەهاتنەوە شوێنەکەی خۆیان. ئەو رۆژە کاتێک چوونەوە شوێنەکەی خۆیان. گەڤرکەکەیان لەوێ دیت. رواڵەتی ئەویان زۆر وەبەر دڵی کەوت و زۆریان خۆش ویست. پێکەوە گوتیان: «قسەی تێدا نییە کە ئەوە جوانترین باڵندەیە. ئیدی هەموویان روویان تێ کرد و زۆریان بە خێرهاتن کرد و لەگەڵی بە سەروروویی خۆشەوە دوان. کاتێک گەڤرکە ئەوانی ئاوا باش و سەروروووخۆش و خۆش مەشرەف هاتە بەر چاو. ئەویش ئۆگری ئەوان بوو خۆشی لێیان هات. بە رۆژدا کوێی پێ خۆش بایە بەرەو ئەوێ دەفڕی و شەویش دەهاتەوتە لای ئەوان. ماوەیەکی زۆر ئاوا تێپەڕی. کاتێک کیسەڵەکان دیتیان بە زۆر رۆیشتنی ئەو نارەحەت دەبن و بۆی نیگەران دەبن و بیری دەکەن. بۆخۆیان لە نێو خۆیاندا گوتیان: «ئێمە ئەو گەڤرکەمان زۆر خۆش دەوێ و بێ ئەو هەڵناکەین. ئاوا هەر شەواوشەو دەیبینین دەبێ کارێک بکەین نەهێڵین بە رۆژدا لێمان دوور کەوێتەوە و هەر لە لای خۆمان رایگرین.» یەکێک لە کیسەڵەکان گوتی: «خۆشکینە، خەمتان نەبێ، ئەمن کارێک دەکەم بستێکمان لێ دوور نەکەوێتەوە. هەموو پێکەوە گوتیان ئەگەر تۆ کاری ئاوامان لەگەڵ بکەی هەموومان دەبینە کۆیلەت.

ئیدی کاتێک گەڤرکە لە گەڕان گەڕاوە و هات لە نێویان هەڵنیشت. کیسەڵە کەڵەکبازەکە لێی چووە پێشێ و پێی گوت: «گەورەم، خودا کارێکی کردووە لەگەڵتۆبوون بووە بە مایەی خێر و بەرەکەت و رزق و رۆزیمان. خۆشەویستی ئێمەش کاری لە دڵی تۆ کردووە و لەگەڵمان بووی بە هاوڕێ و هاودەم. بەڵام هاوڕێکانم نارەحەتن کە تۆ بۆ ماوەیەکی

---

[1]. مێوەی پۆر. ناوی باڵندەیەکی کێوییە لە مریشک گەورەترە.

زۆر بەجێمان دەهێڵی و ئێمەش نیگەرانی تۆ دەبین. تاقەتی ئەو هەموو دوورییەمان نییە. هەر بۆیە نابێ لەمەوبەدوا بە جێمان بهێڵی.» کەڤرکەکە گوتی: «ئەمنیش ئەوەندە ئۆگری ئێوە بووم کە هەتا دێمە بیرتان دەکەم و لە بەرم گرانە کە بەجێتان دەهێڵم. بەڵام چ بکەم چارەیەکم نییە. چونکە من مەلم و ناتوانم یەکسەر لە شوێنێک بمێنمەوە دەبێ هەرکە بوو بە ڕۆژ لەولا بۆ ئەولا بفڕم.» کیسەڵە گوتی: «ڕاستە، مەلگەل قەت ناحەسێنەوە و دایمە ماندوو و شەکەتن. مەبەست لە ژیانیش ئاسوودەیی و حەسانەوەیە. ئێستا کە خودا تۆی کردووەتە خۆشەویستی ئێمە، لەوە دەترسین کە ڕاوت بکەن و لە دیداری تۆ بێبەش بین.» کەڤرک گوتی: «ڕاستە بەڵام تۆ دەڵێی چ بکەم؟» کیسەڵەکە گوتی: «ئەمن پێم باشە کە باڵت بکەی و لە لای ئێمە هەڵنیشی. ئەوەی ئێمە خواردمان بیخۆی و ئەوەی ئێمە خواردمانەوە تۆش بیخۆوە و لێرە بۆخۆمان بە خێر و خۆشی ڕایدەبوێرین. ئینجا گەڤرک بە قسەی کیسەڵەی کرد و هەر بە دندووکی خۆی یەک بە یەکی پەڕەکانی دەرکێشا و لە لای ئەوان هەڵنیشت و دەستی لەو هەموو خۆشی فڕینەی هەڵگرت بۆ ئەو نەختە خۆشییەی لە لای ئەو کیسەڵانە بێ. تا وا بوو ڕۆژێک شەهێنێک بە سەریاندا فڕی و گەڤرکەکەی دیت لەوێ قنە دەکا[1]. سەرنجی دایە زانی باڵی کراوە و ناتوانێ بفڕێ. کە ئاوای زانی کەیفی ساز بوو ڕۆی بوویێ و ڕاوی کرد. گەڤرکە هاواری بۆ کیسەڵەکە برد، بەڵام کیسەڵەکە چی لە دەست نەهات. گوتی: «براگیان ئێمە هێز و تاقەتی بەربەرەکانی لەگەڵ شەهێنمان نییە.»

گەڤرک کە دەستی لە ژیان شوت بە کیسەڵەکانی گوت: «ئێوە تاوانبار نین، هەڵەی خۆم بوو کە بە قسەی ئێوە باڵ و پەڕی خۆم کرد. ژنەکانم، منیش ئێستا سەرکۆنەی ئێوە ناکەم، ئەوە هەمووی هەڵەی خۆم بوو کە لە بیرم چووبووەوە کە هەر ژنان بوونە هۆی لە خشتە بردنی باپیرە گەورەمان واتە ئادەم و هەر بە هۆی ژنانەوە لە بەهەشت دەر کرا و لە بیر چووبوو کە ئێوە سەرچاوەی هەموو ناپاکییەکن. ئەمن لەبەر نەزانی خۆم بە قسەی ئێوەم کرد و وەزیر و گەورە گەورەکانی وڵاتەکەی خۆم کوشت. کە لە ڕۆژە سەختەکاندا ئامۆژگار و ڕێنوێنم و هێزی باسکم بوون. ئێستا کەس جێگای ئەوانم بۆ ناگرێتەوە و لەو زەلکاوەدا نوقم دەبم.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. قنە کردن: جۆرە ڕاوێنێکە تایبەتی مەل و باڵندەیە.

# که شەوی نۆسەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پادشا دوای ئەوە کەمێکی قسە بە خۆی گوت و سەرکۆنەی خۆی کرد و چووەوە خەوگەکەی. لەوێش دەستی کرد بە گریان بۆ وەزیر و زانا و گەورەکانی دەوڵەت و گوتی: «خۆزگە ئەو شێرانەم ئێستا لە لا بایە و جا ئەو دەم پێم دەگوتن دوای ئێوە چیم بەسەر هات و چیم کرد. پێم دەگوتن دوو ڕۆژان لە تاوان لە خەو و خواردن بووم و پیشەم شین و گریان بوو.

کە بوو بە شەو هەستا جلەکانی و ڕواڵەتی خۆی گۆڕی و لە کۆشک چووە دەرێ، تا سەرێکی ناو شار بدا. بەشکوو قسەیەک لە کەسێک ببیستێ تۆزێک دڵی خۆش کا. کە کۆڵانەکان دەگەڕا کە دوو کوڕی دوازدە ساڵای دیت، لە بن دیوارێک بۆخۆیان دانیشتبوون و پێکەوە قسەیان دەکرد. لێیان چووە پێشێ تا ڕادەیەک قسەکانیان ببیستێ. گوێی لێ بوو یەکیان بە ئەوی دیکەیانی دەگوت: «بابم دەیگوت مەزراکەمان بە هۆی نەبارینی باران ویشک بووە.» کوڕەکەی دیکەیان گوتی: «دەزانی بۆ ئاوا بەلامان بەسەر هاتووە؟» کوڕەکەی دیکە گوتی: «ناوەڵڵا نەزانم. بۆ؟» ئەو کوڕە گوتی: «ئەمن لە هاوڕێکانی باوکم بیستووە کە پادشا وەزیر و گەورەکانی دەوڵەتی بە بێ تاوان کوشتووە هەر لەبەر ئەوەی ژنانی خۆش دەویست و دەویست لەگەڵ ئەوان بمێنێتەوە و وەزیریش ئەوی سەرکۆنە دەکرد. ئەویش جوابی ئەوانی نەدەداوە و بە قسەی ژنان ئەوانی کوشت. شەمماس بابی من و وەزیری ئەو بوو. کە لە خۆڕا و بێ گوناه کوشتی. بە چاوی خۆت دەبینی کە چۆن خودا گیان تۆڵەی بابم و ئەوان لە پادشا دەکاتەوە. ئەوی دیکەیان گوتی: «پێم وا نییە تۆڵە لەو بکرێتەوە.» کوڕەکەی شەمماس گوتی: ئەوە دەڵێی چی، پادشای هیند نامەیەکی بۆ پادشای ئێمە نووسیوە پێی گوتووە: «لە نێوەڕاستی دەریادا کۆشکێکم بۆ دروست بکە. ئەگەر بۆم دروست نەکەی ئەوە لە وڵاتی هیندەوە دوازدە ڕەوە ئەسپت بۆ دەنێرم کە هەر ڕەوە ئەسپێک دوازدە هەزار سواری لە سەرە و دەیاننێرێ بێنە سەر پادشاکەی ئێمە و وەزیرەکەی خۆی فەرماندەری ئەو لەشکرە دەبێ تا وڵاتەکەمان بگرن. پیاوەکان دەکوژن و ژنەکان بە دیل دەگرن.» ئێستا کە ڕاسپاردەکەی نامەکەی هێناوە، پادشاکەمان سێ ڕۆژی دەرفەت ویستووە بیری لێ بکاتەوە. بەلام براکەم پادشای هیند پادشایەکی زۆر بە زیپک و زاکووە و لەشکرێکی زۆری هەیە. ئەگەر پادشاکەی ئێمە فکرێکی باش نەکاتەوە و ڕێگایەک نەدۆزێتەوە دەیکوژن و دوای کوشتنی ئەو تەواوی وڵات تاڵان دەکرێ و پیاوەکان دەکوژرێن و ژنەکان بە دیل دەگرن.

پادشا کە ئەو قسانەی بیست زیاتر ترسی ڕێنیشت و لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەڵبەت ئەو

کوڕە زۆر دەزانێ چونکە ئاگای لە شتێکە کە لە منی نەبیستووە و ئەو نامەیە کە لە لایەن پادشـــای هێندەوە هاتووە کەس نەیدیوە و پێی نازانێ. ئەو کوڕە چۆنی زانیوە؟ دەڵێم بچم پەنای بۆ بەرم بەشـــکوو خودا ئەو کوڕە بکا بە هۆی ڕزگاریم.» ئیدی پادشـــا لێی چووە پێشـــێ و بەو کوڕەی گوت: «کوڕی چاک ئەتۆ لە کوێوە دەزانی پادشـــای هێند نامەی بۆ پادشای ئێمە ناردووە و هەڕەشەی لێ کردووە و ئەو قسانەی پێ گوتووە؟» کوڕە وەلامی داوە و گوتی: «بۆ تۆ نەتزانیوە لە نێو خەڵکدا هێندێ پیاوی خودا هەیە ئاگایان لە نهێنی و شاراوەکانی دونیا و خەڵک هەیە؟» پادشا گوتی: «کوڕی چاک، قسەکەت ڕاستە. بەڵام هیچ ڕێگایەکی وا هەیە ئەگەر پادشـــا بیگرێتە بەر بتوانێ ئەو وڵاتە لەو بەڵا و تەنگانەیە ڕزگار بکا؟» ئەو کوڕە گوتی: «بەڵێ، هەیە. ئەگەر پادشـــا بانگی من بکا و پێم بڵێ چۆناوچۆن دەتوانم ئەو وڵاتە ڕزگار بکەم ئەوە بە پشتیوانی خودای گەورە پێی دەڵێم چ بکا.»

پادشا پرسی: «دەبێ کێ بە پادشا ڕاگەیەنێ تا پادشا کەسێک بنێرێ لە دوات؟» ئەو کوڕە وەلامی داوە: «ئەمن بیســتوومە پادشــا بە شــوێن زانایان و پیاو ماقوڵاندا دەگەڕێ ڕاوێژیان لەگەڵ بکا. ئەگەر وا بێ بۆخۆی دەمبینێتەوە. جا ئەگەر چووم بۆ لای، ئەوەی کە لە بەرژەوەندی ئەودا بێ و مایەی ڕزگاری خەڵک لەو نەهامەتییە بێ پێی دەڵێم. ئەگەر ئەو هەروا کەمترخەم بێ و بە دوای ژنانەوە بێ. ئەمنیش لە خۆڕا بچم بۆ لای تا لە بارودۆخی وڵاتی ئاگادار کەمەوە ئەودەم منیش وەک وەزیرەکانی پێشـــوو دەکوژێ و خۆ ناســـاندنی ئـاوا دەبێتە هۆی تێدا چوونی خۆم. ئەودەم خەڵـک دەڵێن دەیجـا خۆی کەر نەکردبـا و نەچووبا بۆ لای. دەڵێن ئەو کەســانەی کە زانست و زانیارییان لە عەقڵ و ئاوەزیان زۆرتر بێ لەبەر بێ عەقڵی خۆیان بە هیلاک دەچن.

کاتێک پادشــا قســەی کوڕەی بیســت، زانی ئەو کوڕە چەندە زانا و ژیر و تێگەیشتووە. لێی ســـوور بوو کە ئەو کوڕە دەبێتە مایەی ڕزگاری ئەویش و خەڵکی وڵاتەکەشـــی. هەر بۆیە ڕووی لە کوڕە کردەوە و گوتی: «ماڵەکەتـان لە کوێیە؟» کوڕە گوتی: «ئەو دیوارە ڕێک دەچێ بۆ ماڵی ئێمە.» پادشا ئەو شوێنەی بە زەینی سپارد و ماڵاوایی لێ کردن و بە دڵێکی خۆشەوە گەڕاوە. کە هاتەوە ماڵێ دانیشت و داوای خواردنی کرد. دەنگی ژنەکانی دا دەوری چۆڵ کەن. نانەکەی خوارد و شـــوکری خودای کرد. لە بەر خودا پاڕاوە لە هەڵە و تـاوانی خۆش بێ. لە دڵەوە تۆبەی کرد. بەڵێنی دا نوێژ و ڕۆژوویەکی زۆر بەجێ بێنێ. ئینجا یەکێک لە پیاوە باشەکانی بانگ کرد و نێونیشانی ئەو شوێنەی دایە. پێی گوت بچووە بۆ لای ئەو کوڕە، زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە بیهێنە بۆ لای من. پیاوەکەی پادشـا چووە لای ئەو کوڕە و پێی گوت: «پادشـا ناردوویە بە دواتدا خەڵاتێکی باشـت دەکا و شـتێکیشـت لێ دەپرسـێ. دوایەش بە دڵێکی خۆشـەوە دیتەوە ماڵەکەی خۆت. ئەو کوڕە وەلامی داوە: «بە دڵ گوێڕایەڵی پادشام و لە خزمەت دام.» لەڕێوە لەگەڵ ڕاسپاردەکەی پادشا کەوتە ڕێ و

ڕۆیشـتن تا گەیشـتنە لای پادشـا سـووژدەی بۆ خودا برد و دۆعای بۆ پادشـا کرد. پادشـا فەرمووی کرد دانیشێ. کوڕە دانیشت.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شـەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پادشا ڕێی دا دانیشێ و لێی پرسی: «دەزانی کێ بوو دوێشەو قسەی لەگەڵ دەکردی؟» کوڕە گوتی: « بەڵێ پادشا دەزانم.» پادشا پرسی: «ئەو لە کوێیە؟» کوڕە وەڵامی داوە: «خەریکە قسەم لەگەڵ دەکا.» دوای ئەوە پادشا فەرمانی دا کورسییەکیان بۆ هێنا و لە پەنا خۆی دانا. کوڕەیان لە سەر کورسییەکە دانا و دەستیان کرد بە قسەکردن. ئینجا پادشا بە کوڕەی گوت: «وەزیر دوێشەو قسەیەکت لەگەڵ من کرد و گوتت کە گەلاڵەیەکت هەیە بۆ ئەوەی مەترسی پادشای هیند لە سەرمان لابەیت. ئێستا پێم بڵێ ئەو گەلاڵەیە چییە. بە منیش بڵێ تا ئەتۆ بکەم بە وەزیری خۆم و لە قسەت دەر نەچم و خەڵاتێکی زۆریشت بکەم.» کوڕە گوتی: «پادشا، ئەو خەڵاتانە هەڵگرە بۆ خۆت، ڕێگا و گەلاڵەی ڕزگاربوون لەو ژنەکانە بپرسە وا بە قسەی ئەوان شەمماسی بابی منت کوشت.»

کاتێک پادشا ئەو قسەیەی لەو بیست تریق بووەوە و ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: «ڕۆڵە بۆ شەمماس باوکی تۆ بوو؟» کوڕە وەڵامی داوە: «ئەمن کوڕی ئەوم.» لەو کاتەدا پادشا چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و لە کارەکەی خۆی پەشیمان بووەوە. گوتی: «ڕۆڵە من لەبەر ناژیری و بێ ئاوەزی خۆم بە قسەی ژنانم کرد. ئەمن تکات لێ دەکەم لێم خۆش بە. من تۆ لە جێی باوکت دادەنێم و پلە و پایەی تۆ لە ئی باوکیشت دەبەمە سەرتر. بێتوو ئێمە لەو گرفتە ڕزگارمان بێ و کێشەی پادشای هیندمان نەمێنێ ئەمن خناکێکی [1] زێڕت بۆ چێ دەکەم و سواری باشترین ئەسپت دەکەم. بە جارچی دەڵێم جاڕ بدا کە ئەو کەسە خاوەنی کورسی دووەمی وڵاتە و لە لای پادشا قەدر و ڕێزی لە هەموو کەس زیاترە. بەڵام بۆ ژنەکانییش هەڵوێستم گرتووە، تۆڵەیان لێ بکەمەوە. لە کاتی خۆیدا، خودا ڕاست بێنێ بە خراپترین شێوە سزایان دەدەم. ئێستا پێم بڵێ چار چییە، دەڵێی چی بکەین؟» ئەو کوڕە وەڵامی داوە و گوتی: «لە پێشدا بەڵێنم پێ بدە بێ قسەییم نەکەی.» پادشا گوتی: «بەڵێنم داوە، لە قسەت دەرنەچم و تۆ بە ڕاوێژکاری خۆم بزانم و تۆ چۆن بڵێی من وا دەکەم ئەوەد خوداش شایەدمان بێ.»

کوڕە کە ئەو قسەیەی بیست دڵی ئاسوودە بوو. گوتی: «پادشا، گەلاڵەکەی من ئەوەیە کە کاتێک ڕاسپاردەکەی پادشای هیند هاتەوە بۆ وەڵامی نامەکەی گرینگییەکی وای مەدەیە و بڵێ ڕۆژێکی دیکە وەرەوە. ئەگەر گوتی پادشا ماوەیەکی بۆ دیاری کردووم. من ناتوانم لەوە درەنگتر بچمەوە. ئەتۆ دەری کە و بڵێ لاچۆ برۆ ڕۆژێکی دیکە وەرەوە. ڕۆژەکەی بۆ

---

[1]. خناک: تۆقی یەکپارچە.

دیاری مەکە. ئەو بە توورەیی دەچێتە دەرێ و لە نێو شار یەک بەخۆی هاوار دەکا و دەڵێ خەڵکینە ئەمن ڕاسپاردەی پادشای هێندم. ئەو پادشایەکی بە زیپک و زاکوونە. نامەیەکی بۆ پادشای ئێوە نووسیوە. پادشاکەتان سێ ڕۆژی دەرفەت ویست وەڵامەکەیم داتەوە. ئەمن دڵسۆزانە و لەبەر دڵی ئەو دەرفەتم دا. ئێستاش ماوەی مۆڵەتەکە تەواو بووە و چووم بۆ وڵامی نامەکە. کەچی دەڵێ برۆ ڕۆژێکی دیکە وەرەوە و ئەمنیش ناتوانم لەوە زیاتر لەسەری ڕاوەستم. ئێستا ئەوە دەچمەوە بۆ لای پادشاکەی خۆم و هەمووی بۆ دەگێڕمەوە. جا چی ڕووی دەدا من نازانم. خەڵکینە ئێوە شـــایەد بن کە تاوان لە منەوە نییە. ئەگەر قســـەکە بە تۆ گەیشـــتەوە. خێرا کەســـێکی بە دوادا بنێرە. ئەوجـار بە نەرمی و سەروروخۆشی لەگەڵی بدوێ. پێی بڵێ: «کاکە گیان ئەتۆ بۆ خۆت تووشی کێشە دەکەی و قســەی نەشـیاو لە نێو خەڵک دەکەی و هەوڵ دەدەی من ســووک کەی؟ بە ڕاســتی تۆ شـیاوی ئەوەی ســزا بدرێی. بەڵام پێشـینیان گوتیانە، لێ بووردەیی پیشـەی گەورانە. ئەوە بزانە کە کار و ســـەرقاڵیمان زۆرە بۆیە وەڵامەکەی تۆمان نەنووســـیوەتەوە و وە درەنگی کەوتووە. نەک بڵێی ئەو نازانین چی بۆ بنووســـینەوە و لێی بترســـین. دوای ئەوە داوای نامەکە بکە و دووبارە بیخوێنەوە و دەســـت بکە بە پێکەنین، چەند جار بە دەنگ پێبکەنە و لێی بپرسـە: بێجگە لەوە نامەی دیکەشـت پێیە تا وەڵامەکەی بۆ بنووسـمەوە؟ دیارە ئەویش دەڵێ: نەخێر هیچی دیکەم پێ نییە و هەر ئەو یەکەیە. ئینجا تۆش پرسـیارەکەت دوو ســێ جار پاتە بکەوە. ئەویش هەر دەڵێ: لەوە زیاترم پێ نییە. ئەوجار تۆ پێی بڵێ ئەو پادشایەی ئێوە تەواو نییە. چونکە لەو نامەیەدا شـــتێکی گوتووە دەبوو ئێمە لەشـــکرێکی لە ئەژمار نەهاتوومان لە ســەر کردبا و دەسـتمان بەسـەر وڵاتەکەیدا گرتبا. بەڵام ئەو ڕایە قەیناکا و ئێمە لێی دەبوورین ئەو بێ ڕەوشـــتییەی لە بەر چاو ناگرین. چونکە دیارە کەم ئاوەزە و تەواو نییە. پێویســـت ناکا هێزی خۆمانی پێشـــان بدەین و بیترســـێنین هەتا جارێکی دیکە قســـەی وا نەپەڕێنێ. ئەگەر بێتوو جارێکی دیکە قســـەی وا بکاتەوە و لەو هەڵەوەڕییانە بکا، ئەوە ئەودەم گوێی با دەدەین.

لێم ڕوونە ئەو پادشـــایەی تۆی ناردووە پیاوێکی ژیر و تێگەیشـــتوو نییە و گەوج و نەفامە، دواڕۆژی کارەکانی بۆ لێک نادرێتەوە. وەزیرێکی زانا و بە مشـــووریشـــی نییە ڕاوێژی لەگەڵ بکا. ئەگەر ئەو پادشایە ئاقڵ بایە پێش ئەوەی تۆ بنێرێ بۆ لای من لە پێشدا لەگەڵ وەزیرەکەی ڕاوێژی دەکرد و قســـەی ئاوای نەدەکرد. پێویســـت ناکا هیچ وەڵامێکی بدەمەوە. بەڵام ئەمن نامەکەی ئەو دەدەم بە منداڵێکی قۆناخی سەرەتایی بە وەڵامی داتەوە. دوای ئەوەی ئەو قسـەیەت پێ گوت، کەسێک بنێرە بە دوامدا. کە من هاتم، پێم بڵێ ڕۆڵە دا ئەو نامەیە بخوێنەوە و وڵامی بدەوە.» پادشا دڵی گەشاوە و گەلاڵەکەی زۆر پێ باش بوو. ســەری لەو هەموو زیرەکییەی ســووڕ ما و دیارییەکی زۆری دایە و لە جێی باوکی کردی

به وەزیر و به دڵخۆشی بەڕێ کردەوە.

کاتێک دەرفەتە دیاری کراوەکە تەواو بوو. ڕاسپاردەکە هاتەوە لای پادشا و داوای کرد وڵامەکەی بداتەوە. پادشـــا گوتی: «ڕۆژێکی دیکە وەرەوە وەڵامت دەدەمەوە. ناردراوەکە لەڕێوە گەڕاوە و هێشـــتا تەواو له کۆشـــک نەچووبووە دەرێ، هەر وەک کوڕەکه گوتی، دەستی کرد به قسەی ناحەز و نەشیاو. دوای ئەوە چوو بۆ بازاڕ و گوتی: «هۆی خەڵکینه ئەمن ڕاسپاردەی پادشای هێندم، له لای پادشاکەمانەوە نامەیەکەم هێناوە بۆ پادشای ئێوە. ئێستا ئەو وەڵامکەیم ناداتەوە و هەر ئەوڕۆوسبەم پێ دەکا. ئەو ماوەیەی که پادشـاکەمان بۆی دیاری کردبووم، تەواو بووە. ئێوه شـایەد بن.» کاتێک پادشـا ئەو قسـەیەی بیسـتەوە ناردی له دووی ڕاسپاردەکەی پادشای هێند.

که هێنایان پادشـــا پێی گوت: «تۆ گیانی خۆت دەخەیه مەترســـییەوە، چونکه تۆ له پادشایەکەوە نامه دەبەی بۆ پادشایەکی دیکه. هاتوو له نێو ئەو پادشایانه نهێنییەک هەبێ ئەتۆ چۆن دەچی له نێو خەڵک باسی نهێنی نێوان پادشاکان دەکەی؟ به ڕاستی تۆ شیاوی کوشـتنی. بەڵام چونکه دەبێ وەڵامەکەی بۆ ئەو پادشـا گەوج و نەفامەت بەرییەوە، قەیناکا لێت خۆش دەبم. هەر چەند هەر دەبێ منداڵێکی قۆناخی سەرەتایی وەڵامی شتی وا بداتەوە. ئەوجار پادشـا ناردی له دووی کوڕەکەی شـەمماس. لەڕێوە ئەو کوڕه وریایه گەیشـتی. پادشا له لای ڕاسپاردەکه نامەکەی بۆ کوڕەکه هاویشت و پێی گوت: «کوڕه دا ئەو نامەیه بخوێنەوە و وڵامی بدەوە.» دوای ئەوە کوڕه نامەکەی کردەوە و خوێندییەوە. پێکەنی و به پادشـــای گوت: «هەر بۆ وڵامدانەوەی ئەو نووســـراوه قۆڕە، منت بانگ کرد؟» لەڕێوە دەستی دا پێنووس و لێنووس و نووسی:

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

## که شەوی نۆسەد و بیست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو کوڕە دەستی دا پێنووس و لێنووس و دوای سپاس و شوکری خودای تەعالا نووسی: «ئەی پادشا، کە بە نێو گەورە و لە داب و نەریتدا پەستی، نووسراوەکەتمان پێ گەیشت. خوێندمانەوە و لە قسە هەڵیت و پڵیت و پڕوپووچەکانت گەیشتین. بۆمان دەرکەوت کە چەندە گەوجی، چونکە دەست دەدەیە بەردێک کە بۆت هەڵنایە. ئەگەر لەبەر بەندەکانی خودا نەبایە و لەبەر ئەوان دڵمان هاتبا. یەک چرکەش ڕانەدەوەستاین و دەگەیشتینە سەرت. با ئەوەشت پێ بڵێم، ڕاسپاردەکەت چووە لە بازاڕ ئەو هەواڵەی بە درشت و ورد گوتووە. جێی خۆی بوو بیکوژین بەڵام بەزەییمان پێیدا هات و نەمان کوشت. ئەوەی کە لە نووسراوەکەتدا گوتبووت کە من وەزیران و زانایان و حەکیمەکانی دەوڵەتەکەی خۆم کوشتووە. ڕاستە. بەڵام ئەویش هۆکاری خۆی بووە. ئەویش بۆخۆم دەزانم. تازە ئەویش زانای وام کوشتووە کە هەزاری لەو بە هەزار قات زاناترم هەیە. لێرە منداڵەکانیشمان سینگ و مێشکیان پڕە لە عیلم و زانست. سوارێکمان لە بەرابەر ڕەوەسوارێکی ئێوەدا بەربەرەکانی دەکا. بۆ ماڵ و سامان، تۆ بۆخۆت دەزانی کە زێڕ و زیوی ئێمە لە ئەژمار نەهاتووە و یاقووت و گەوهەرەکەمان بە قەرا بەردەکانمانە. ئەتۆ چۆنت وێراوە بە من بڵێی کۆشکێکت بۆ لە ناو دەریادا چێ کەم. ئەو قسەیە جێی زندەمان و سۆسرەتە. ڕەنگە تووشی خەرەفان و شێت بووبی. یان پێت وا بووە دەرەقەتم دێی. پەنا بۆ خودا شتی وەک تۆ چۆن دەرەقی من دێ. خودای تەعالا من بەسەر تۆدا فایق دەکا. چونکە تۆ شەڕەنگێز و لەتمکاری. خودا یارمەتی شتی وەک تۆ نادا و بگرە بەڵاشت بە سەر دێنێ. ئەمن لە ترسی خودا بموێرابایە و خەمی مرۆڤ و گیانلەبەرانم نەبایە، تۆڵەی ئەو دمدرێژییانەم لێ دەکردییەوە. ئێستاش بۆ ئەوەی ئەو شتە دووپات نەبێتەوە، زۆر زوو باج و پیتاکەکەم بۆ بنێرە و کارێک مەکە وەک گەڵای دار بە هەزاران هەزار سوارت لە سەر بکەم. وەزیرەکەم بنێرەم هەتا سێ ساڵان وڵاتت گەمارۆ بدا تا وڵاتەکەت لێ دەستێنێ. دڵنیاش بە لە خەڵکی ئەو وڵاتە جگە لە تۆ کەس ناکوژم و لە ژنەکانیش جگە لە دەوربەری تۆ کەس بە دیل ناگرم.

دوای ئەوە کوڕەکەی شەمماس وێنەی خۆی خستە سەر نامەکە و لە پەنای نووسی: «وڵامی ئەو نامەیە لە لایەن منداڵترین منداڵی بنووسەکانەوەیە.» ئەوجار تەواوی کرد و دایە دەست پادشا. پادشاش دایە دەست ڕاسپاردەکە. ڕاسپاردە نامەکەی وەرگرت و دەستی پادشای ماچ کرد و بە دم شوکر و سپاس کردنەوە لە کۆشک وەدەر کەوت. سەری سووڕ ما بەوەی کە بەو کوڕەی شەمماسەوەی دیت.

ڕاسپاردەکە کاتێک گەیشتەوە لای پادشاکەی خۆیان. سێ ڕۆژ لەو ماوەیەی بۆ دیاری کردبوو، تێ پەڕیبوو. لەو جەنگەیەدا بارەگای پادشـــا تژی بوو لە خەڵکی جۆراوجۆر. ڕاسپاردە کڕنۆشی بۆ پادشا برد و نامەکەی دا دەستی. پادشا هۆی درەنگ هاتنەوەکەی لێ پرســی. ئینجا هەواڵی چۆنییەتی وەردخان پادشـــای لێ پرســی. ڕاســپاردەکە هەموو شتێکی بە وردی بۆ گێڕاوە. پادشا تاسێکی بە سەریدا هات و بە کابرای گوت: «ئەرێ تۆ دەزانی دەڵێی چی ئەوە چ هەواڵێکە بۆ منت هێناوەتەوە؟» ڕاســـپاردەکە گوتی: «قوربان ئەوە من لە خزمەتت ڕاوەستاوم و نامەکە بکەوە و بیخوێنەوە. با ڕاست و درۆت بۆ ڕوون بێتەوە. لەو جەنگەیەدا پادشا نامەکەی کردەوە بیخوێنێتەوە، ڕوخساری کوڕەی لەوێدا دیت. پادشـــا دەســـتی لە هەموو شـــتێک شـــوت و نەترەی چوو. ســـەری لێ شـــێوا. ڕووی لە وەزیرەکان کرد و شـــتەکەی بۆ گێڕانەوە و نامەکەی بۆ خوێندەوە. تەواوی نەترەیان چوو. بەڵام لەبەر پادشا وەسەر خۆیان نەدێنا. هەموو کەوتنە دڵەخورپە.

دوای ئەوە بەدیع، کە وەزیری گەورەی بوو، گوتی: «پادشا، ئەوەی ئەو وەزیرانە دەیڵێن بێ ئاکامە. بە بڕوای من نامەیەکی بۆ بنووســـی و داوای لێ بووردنی لێ بکەی. بڵێی کە ئێمە دۆســـتین و من لە پێشـــداش لەگەڵ بابت نێوانمان زۆر خۆش بوو. ئەمن ئەو ڕاســپاردەیەم بۆیە ناردە لای تۆ تا تاقیت کەمەوە. بزانم چەندە بە جەرگ و ئازا و بوێری. داوا لە خودا دەکەم ئەو وڵاتەت پیرۆز بێت و شکۆ و دەسەڵاتت هەر ڕاوەستاو بێ.» پادشا گوتی: «بە خودا زۆر ســـەیرە، ئەو پادشـــایە دوای کوشـــتنی زانایان و خاوەن ڕایان و گەورەکانی لەشـــکرەکەی، چۆن ئاوا ئامادەی شـــەڕ و بەربەرەکانییە. چونە دوای ئەو کارەســـاتە شـــارەکەی بە ئاوەدانی ماوەتەوە. لەوەش ســـەیرتر ئەوەیە کە چکۆلەترین و منداڵترین نووســـەرەکانی ئاوا وڵام بدەنەوە. هەموو هەڵە و تاوانی خۆم بوو. هێند بە تەماع و چاونەزێرم. خەریکە بەو ئاورە خۆم و وڵاتەکەم بسووتێنم. ئێستا نازانم ئەو ئاورە چۆن دامرکێنم. مەگین وەزیری ژیرم فکرێکی بۆ بکاتەوە. ئەوجار دیاری و پێشـــکەشـــییەکی گرانبایی و کۆیلە و ماڵێکی زۆری ساز کرد و لەگەڵ نامەیەک بەو نێوەرۆکە:

«پادشـای ئازیز، برازا خۆشەویستەکەم: نامەکەت بە دەستم گەیشت و خوێندمەوە و تێگەیشـــتم. ناوەرۆکەکەیم زۆر بە دڵ بوو. ڕێک ئەوە بوو، بە ئاواتییەوە بووم. ئەویش ســـەربەرزی و قورس و قایمی و شـــکۆداری تۆ بوو. لە خودا داواکارم پلە و پایەت هەر بەرز و بە قەدر بێ و خۆت و وڵاتەکەت پتە و سەقامگیر بن و بەسەر دوژمنانتدا زاڵ بی. پادشـــا، پێویســـتە بزانی باوکی تۆ برای من بوو. هەتا مابوو پێکەوە گفت و بەڵێنی زۆرمان بوو. ئەمن جگە لە چاکە بۆ ئەوم نەبووە. جگە لە چاکە هیچ خراپەیەکم لەو نەدیوە. کاتێک ئەو کۆچی دوایی کرد و تۆ لە جێی دانیشـــتی، ئەمن زۆرم پێ خۆش بوو. دوای ئەوەی بیستمەوە کە ئاوات لە وەزیر و گەورەکانی دەوڵەت کردووە زۆرم پێ ناخۆش بوو. ترسام

نەکا ئەو هەواڵە بە گوێی پادشـــاکانی دیکە بگاتەوە. ئەوان چاوی تەماع لە وڵاتەکەت بڕن. ئەمن وامزانی کە تۆ لە ئاست ئەرک و کاری بەڕێوەبردنی وڵات کەمترخەمی و پشت گوێت خســتووە. هەر بۆیە ئەو نامەیەم بۆ ناردی. هەتا تۆ لە خەوی غەفڵەت هەستێنم. ئێسـتا کە دیتم ئـاوات وەڵام داومەوە. خەمم لە دڵی بڕا و ئەرخەیـان بووم. خودا تۆ بۆ وڵاتەکەت بپارێزێ و ڕاوەستاوت کا. ئیتر خۆشیت.» دوای ئەوە دیارییەکانی بە سەد سواردا نارد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و بیست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک پادشا دیارییەکانی نارد بۆ وەردخان پادشا. نێردراوەکان هەر ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە لای پادشا و سڵاویان لێ کرد. نامەکەیان بۆ خوێندەوە. کاتێک زانی چ باسە. جێگایەکی شیاوی بۆ سوارەکان تەرخان کرد و دیارییەکانی قەبووڵ کرد. ئەو هەواڵە بە نێو خەڵکدا بڵاو بووەوە. پادشا کەیفی زۆر ساز بوو. ئەوجار بانگی کوڕی شەمماسی کرد و ناردی لە دوای سەرکردەی سەد سوارەکە. ئەو نامەیەی لە لای پادشای هێندەوە هێنابوویان دایە دەست کوڕی شەمماس. ئەو کوڕە نامەکەی کردەوە و خوێندییەوە. پادشا لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو، بە پۆزەوە لەگەڵ سەرکردەی سوارەکان دەدوا و ئەویش دەستی ماچ دەکرد و داوای لێبووردنی دەکرد. دۆعای مانەوە و پایەبەرزی بۆ پادشا دەکرد. هەتا لە کۆتاییدا پادشا ئەوجار ڕێزی گرتن و دیارییەکی باشی دانێ. هەر وەها دیارییەکی شیاویشی بۆ پادشاکەیان دانا. بە کوڕی شەمماسی گوت خۆت وڵامی نامەکەی بۆ بنووسەوە.

ئیدی کوڕی شەمماس هەر لەوێ وڵامی نامەکەی بۆ نووسی و ئەوجار بە زمانێکی خۆش و بە ئەدەبەوە دواندی. باسی ڕەوشت بەرزی نێردراوەکانی کرد. کاتێک نامەکە تەواو بوو، دایە دەست پادشا. پادشاش نامەکەی مۆر کرد و دایە دەست سەرکردەی سوارەکان و تاقمێکی لە سوارەکانی خۆی لەگەڵ نارد. هەتا نیزیک سنووری وڵاتەکەی خویان بەڕێیان کردنەوە. لەوێوە سەرکردە و سوارەکان ڕۆیشتن، هەتا گەیشتنەوە لای پادشاکەی خۆیان. دیارییەکانیان دانا و نامەکەیان دایە و باسی سەفەرەکەیان بۆ گێڕاوە. پادشا دڵی حەساوە و زۆر خۆشحاڵ بوو کە ئەوجارەش بە خێر و خۆشی ڕزگاری بوو. دەستخۆشی لە سەرکردەی سوارەکان کرد. ئەوە ئەوان.

وەردخان پادشاش لە ڕێگەی لاڕێ گەڕاوە و تۆبەی کرد. هەوای ژنانی لە سەری دەرکرد و دەستی کرد بە ئاوەدان کردنەوە و پەرەپێدانی خزمەتگوزاری وڵاتەکەی. کوڕی شەمماسی کردە سەرۆکی وەزیرەکانی. خەڵک گەشانەوە و ترس و دڵەڕاوکێیان نەما و بە دادپەروەری و ئینسافی پادشا خۆشحاڵ بوون. دۆعایان بۆ پادشا و وەزیر دەکرد. دوای ئەوە پادشا بە وەزیری گوت: «بە بڕوای تۆ چۆن کارێک بکەین وڵات وەک ساڵی ساڵانی لێ بێتەوە؟» وەزیر گوتی: «پادشا دەبێ دڵ لە گوناح و ناپاکی بشۆردرێتەوە، لە ژنان دوور کەوییەوە و ڕەگی بێ ئەمری خودا لە دڵت دەرکێشی.» پادشا گوتی: «ڕەگی بێ ئەمری کامەیە؟» وەزیر وەڵامی داوە: «وەدوای ژنان کەوتن و بە قسەکردنیانە. چونکە سۆزی ژنان ئاوەزی پیاو دەشێوێنێ. سروشتی بێخەوش خەوشدار دەکا. من لە خۆڕا وا

نالێم. ئەگەر جوان تێ فکر پێویستیت بە قسەی من نابێ. کەوایە تۆ فکری ژنان لە سەرت دەر بکە و پشت بە خودا ببەستە. خودا بە حەزرەتی مووسا دەفەرموێ کە خۆ لە ژنان بپارێزە. یەکێکی دی لە پادشایان بە کوڕەکەی دەڵێ ڕۆڵە گیان کاتێک دوای من دەسەڵاتت گرتە دەست، زۆر تێکەڵاوی ژنان مەبە چونکە سووک دەبی. بۆ نموونە حەزرەتی سولەیمان داود (د ـ س) کە خودای پایەبەرز زانست و زانیاری و وڵاتێکی بەرینی بۆ ئەو تەرخان کردبوو. شتێک هاتە پێشێ و بە هۆی ژنانەوە لاڕێ بوو. ئی ئاوا زۆرن. بەڵام من بۆیە باسی سولەیمان (د ـ س) دەکەم، چونکە هیچ کەس شوێن و پێگەی ئەوی نەبووە. ئەو کە هەموو پادشاکانی سەر زەوی لە ژێر فەرمانیدا بوون. پادشا سۆزی خۆشەویستی ژنان سەرەتای هەموو لاڕێ بوونێکە. پیاو دەبێ هەر هەتا ئەندازەیەک لە ژنان نیزیک بێتەوە دەنا تووشی ئابڕوچوون و تێدا چوون دەبێ. پادشا ئەگەر تۆ تەواو بە قسەی من بکەی تەواوی کارەکانت ڕێکوپێک دەبێتەوە. جڵەوی دەسەڵات و هێزت دێتەوە دەست و لە نێو خەڵکدا خۆشەویست دەبییەوە. بەڵام ئەگەر بە قسەم نەکەی. ئەوە پەشیمان دەبییەوە و تازە پەشیمانیش دادت نادا. پادشا گوتی: «تازە ئەمن سۆز و ئۆگری بە ژنانم لە دڵی خۆم دەرهاویشتووە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نۆسەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! وەردخان پادشـــا بە وەزیرەکەی گوت: «ئەمن تازە ســـۆز و خۆشـەویستی ژنانم لە دڵ درەهاویشـتووە و ناچم بە لایانەوە. بەڵام نازانم چۆنیان سـزا بدەم وا ئەوان منیان لە خشـتە برد و شـەمماسی باوکی تۆیان پێ کوشـتم. هەر چەند قەت ئەمن بە تەمای ئەوە نەبووم، باوکت و ئەو زانا و گەورە گەورانە بکوژم. ئێســـتاش نازانم چۆنم ئەو کارە کرد. دوای ئەوە ئاخێکی هەڵکێشـا و گوتی: «بە ڕاسـتی حەیف بۆ پیاوێکی ئاوا زانا و ژیر بە زیپک.»

دوای ئەوە وەزیر وەڵامی داوە و گوتی: «تاوانی ژنان نییە، ئەوان وەک کاڵای جوان و چاک وان کە خەڵک تێیان دەئاڵێن و ســـەیریان دەکەن. هەرکەس بیهەوێ بیکڕێ ئەوە پێی دەفرۆشن و کەسێکیش کڕیار نەبێ، کەس زۆریان لێ ناکا. بەڵکوو گوناکار ئەو کەسەیە کە کڕیارە. بە تایبەت کەسـێک کە بە زیانەکانی بزانێ. بابم زۆری ئامۆژگاری کردی و وریای کردییەوە، خۆت لە ژنان نەدەی. کەچی تۆ بە گوێت نەکرد. ئێســـتاش ئەوە من تکات لێ دەکەم دەڵێم تکایە تکایە مەچووە ناویان و گوێ مەدە بە قسـەکانیان. لەو چەنگەیەدا پادشـا گوتی: «وەزیر بەو پێیە من تـاوانبـارم، بەڵام چبکەم چارەنووس وا بوو.» وەزیر وەڵامی داوە: «پادشـــا ئەگەر دەتەوێ ئەو پەڵەیە بە ناوچاوانتەوە نەمێنێ، جلی زوڵم و زۆر داکەنە و جلی دادپەروەری و ئینساف لە بەر بکە. دژ بە هەوای نەفست بجووڵێوە و چاو لە باوکی ڕەحمەتیت عادڵ پادشا بکە. مافی مسکێنان پێشـێل مەکە و بیاندەیە. ئاگات لە ئیمانت بێ و دواڕۆژی کارەکانت لە بەر چاو بێ. لەگەڵ هەژاران و بێ ئەنوایان بە ڕەحم و دڵ بە. ئەگەر تۆ ئاوا بکەی ئەوە خودای تەعالا بە ڕەحمەتی خۆی خێر و خۆشی و گەورەییت بە سەردا دەبارێنێ. ڕێز و قەدرت لە ناو خەڵکدا دەباتە ســەرێ و دوژمنانت بێ هیوا دەکات. پادشـــا گوتی: «وەزیر، دڵی منت گەشاندەوە و دەروونت پڕ کردم لە خۆشی و هیوا. کارێکت کرد، دوای ئەو هەموو کوێرییە چاوەکانم ببینن. ئێســـتا هەڵوێســتم گرت ئەوەی تۆ دەڵێی بیکەم. لەتم و ســـتەم و زەنەکی بخەمە لاوە و تەرکی بکەم. خۆم لەو تەنگ و چەڵەمەیە ڕزگار بکەم. مەترســـی لە ســـەر خۆم لابەم. ئەتۆش خۆشـــحاڵ و ڕازی بکەم. چونکە ئەمن بەو تەمەنەوە بوومە منداڵی تۆ و ئەتۆش بەو منداڵییەوە بوویتە باوکی من. لە سەرمە لە قسەت دەرنەچم. شوکری خودا بکەم کە بە ئامۆژگارییەکانی تۆ هاتمەوە سەر ڕێی ڕاست و خەم و خەفەتم لە دڵیدا نەما. فکر و ڕاوێژی تۆ بووە هۆی ئەوەی خەڵکەکەم لەو مەترســـییە ڕزگاریان بێ. ئێســـتا تۆ ڕاوێژکار و بەڕێوەبەری وڵاتەکەی منی. هەر فەرمانێکت هەبێ بە گیان و دڵ جێبەجێی دەکەم. ئەتۆ هەر دەبێ لە ســـەر کورســـی دانیشـــی و فەرمان بدەی. ڕاســـتە بە تەمەن گچکەی بەڵام بە ئاوەز گەورەی.» وەزیر گوتی: «پادشـــا ئەمن لە چاو

جەنابت هیچ گەورەیی و سەرترییەکم نییە و من پەروەردەی نیعمەتی تۆم. باوکی منیش هەر پەروەردەی چاکەکانی ئێوە بوو. ئێمە هەموومان دان بەوەدا دەنێین. چۆن دانی پێدا نەنێین کە تۆ پارێزەر و پادشای ئێمەی و تۆ لە شەڕی دوژمنانمان دەپارێزی. ئەگەر ئێمە بە پێی فەرمانی تۆ گیانیشمان فیدا بکەین هێشتا سەدی یەکی ئەرکەکانی خۆمان بەڕێوە نەبردووە. بەڵام شوکر و سپاسی خودا دەکەین کە گەورەیەکی بۆ داناوین. بە دڵێکی پاک لە بەر خودا دەپاڕێنەوە و تۆمان بۆ ڕاوەستاو بکا و تەمەنت درێژ بکا. لە تەواوی کارەکانت سەرکەوتووت بکا و بە سەر کەند و کۆسپەکانی ژیاندا زاڵت بکا. قاتی و قڕی لە وڵاتەکەت بە دوور بکا. سەربەرز و خەنی ئەم دونیا و ئەو دنیات کا. خودا خۆی هەموو کارێکی بە دەستە.

کاتێک پادشا ئەو دۆعایەی لەو بیست خۆشحاڵ بوو. تەواو چووە دڵییەوە و پێی گوت: «وەزیر، ئەتۆ بۆمن لە جێی باوک و برا و منداڵمی. تازە جگە لە مردن هیچ شتێک ناتوانێ لێکمان بکا. تۆ دەسەڵاتی تەواو ماڵ و وڵات و سامانی منت هەیە. ئەگەر ئەمن کوڕم نەبوو ئەوە کەس لە تۆ شیاوتر نییە کە جێگەی من بگرێتەوە. ئەمن لە بەر چاوی گەورەکانی دەوڵەت دەتکەمە جێگر و بریکاری خۆم.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و سییەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دوای ئەوە وەردخان پادشا بە بنووسەکەی گوت کە نامە بۆ هەموو گەورەکانی دەوڵەت و بریکار و پاریزەرەکانی دەوڵەت بنووسە هەتا لە بارەگای پادشا کۆ بنەوە. لە شاریشدا جاڕ بدەن تا سەرهەنگ و فەرماندەر و خزمەتکار و زانا و بلیمەتەکان کۆ بنەوە. ئەوجار پادشا شوێنێکی تایبەتی بۆ دیاری کرد و ورد و درشتی خەڵک کە دەهاتنە هەنتەشی پادشا. هەتا یەک مانگ بە عەیش و نۆش و خۆشی ڕایانبوارد. دوای ئەوە دیاری و خەلاتی دا بە خەڵکەکە و شەش کەسی لە زانایان و بلیمەتەکان بە هەڵبژاردەی کوڕی شەمماس کردە وەزیر کە لە بەر دەستی کوڕی وەزیردا بن و جلی وەزارەتی دانێ و پێی گوتن: «ئێوە وەزیری منن بەڵام نابێ لە قسەی کوڕی شەمماس بچنە دەرێ. هەر چەند ئەو بە تەمەن چکۆلەیە بەڵام بە ئاوەز و ژیری گەورەیە.

دوای ئەوە پادشا فەرمووی کردن لە سەر کورسی دانیشن و بژیو و پێویستییەکانی ژیانی بۆ دیاری کردن و بۆی برینەوە. دیاری دا بە ئامادە بوان و دڵخۆشی کردن. فەرمانی بە کاربەدەست و فەرمانبەرەکانی کرد، لەگەڵ خەڵکدا بە ئینساف و دادپەروەر بن. ئینجا وەزیران دۆعای ڕاوەستاوی و بەردەوامیان بۆ پادشا کرد. پادشا شوکر و سپاسی خودای کرد و فەرمانی دا ولات برازێننەوە.

با بچینە سەر باسی ئەو ژنانەی کە بوونە هۆی کوژرانی شەمماس و وەزیرەکانی دیکە. دوای ئەوەی کە ئامادەبوان هەر یەکی گەڕانەوە سەر کاروبار و ژیانی خۆیان و بلاوەیان کرد. پادشا، کوڕی شەمماس و شەشە وەزیری دیکەی بانگ کردە شوێنێکی تایبەت و گوتی: «ئەمن لە ڕێی ڕاست لامدابوو. کەللەڕەقیم دەکرد و بە قسەی کەسم نەدەکرد. هۆیەکەشی هەر ئەوە بوو. گوێلەمستی ژنان بووم و ملکەچی فرۆفێڵی ئەوان بووم. ئەمن پێم وا بوو، ڕێنوێنیم دەکەن و لە سەر قازانج و بەرژەوەندی منن. نەمزانی ژەهرخواردم دەکەن. ئێستا دەزانم ئەوان دەیانویست من تێدا بەرن. هەر بۆیە دەبێ بە توندترین شێوە سزا بدرێن. ئێوە ڕاتان لە سەر کوشتنیان چییە؟» سەرەک وەزیر، کوڕی شەمماس گوتی: «ئەمن لە پێشیشدا پێم گوتی کە ئەوان تاوانبار نین. بەڵکوو ئەو ژن و پیاوانەن کە بە گوێیان دەکەن. دیسانیش ئەو ژنانە هەر دەبێ سزا بدرێن وا قاچیان لە بەڕەی خۆیان درێژتر کردووە و تۆیان لە خشتە بردووە و لاڕێیان کردووی. شیاوی کوشتنن، بەڵام ئەو بەلایەی بە سەریان هاتووە بۆ ئەوان بەسە. ئەتۆ ئەوان بخە پلەی خزمەتکارانەوە و وەک قەرەواشێکیان دانێ. دوای ئەوە هێندێک لە وەزیرەکان پشتی قسەکەی کوڕی شەمماسیان کرد. یەکی دیکە لە وەزیرەکان چووە بەرەوە و کڕنۆشی برد

و گوتی: «پادشا ئەگەر کوشتنیان بە سەلاح دەزانی بیانکوژە.» پادشا لێی پرسی: «رای خۆت چییە؟» گوتی: بە یەکێک لە کەسانی نیزیکت بڵێ ئەو ژنانەی کە تەفرەیان داوی و هەڵیان خەڵەتاندووی، بیانگرێ و بیانبا لەو دیوەیان کا، کە وزیر و گەورەکانی دیکەی تێدا کوژرا. بفەرمووە خوارد و خواردنەوەیان دەنێ وا بێ لە برسان نەمرن. مەهێڵێ قەت لەوێ بێنە دەرێ. ئەگەر یەکێکیشیان لەوێدا مرد. لێی گەرێن با تەرمەکەی هەر لە باڵیاندا بێ. چونکە ئەوان بوونە هۆی ئەو کارەساتە. تەواوی بەڵا و نەهامەتی و بشێوی لە بن سەری ئەوانەدا بووە.

پادشا بیروبۆچوونەکەی ئەوی پێ باش بوو. رێک بە پێی گەڵاڵەکەی ئەوی کرد. ئینجا ناردی چوار کەنیزی دڵرەق و بەخۆوەیان هێنا و ژنەکانی بەوان سپارد و فەرمووی ئەوانە بەرە کوشتنگەی وەزیران و کەمێکیان نان و ئاو بۆ دانێ. ژنەکان لە رادەبەردە نارەحەت و پەشیمان بوونەوە لەو کارەی کردبوویان. خودا لەو دونیایەدا ئاوا پەست و زەلیلی کردن و لەو دونیای دیش سزای خۆیان دەبێ. ئەو ژنانە لەو شوێنە تاریک و سامناکەدا بوون و هەتا لەبەرەوە یەک یەک و دوو دوو مردن هەتا کەسیان نەما. ئەو هەواڵە لە تەواوی شار و ناوچەکاندا دەنگی داوە.

### بەسەرهاتی ئەبووقیر و ئەبووسیر

یەکی دیکە لەو بەسەرهاتانە ئەوەیە کە دەگێرنەوە لە شاری ئەسکەندەرییە دوو پیاوی لێ بوو. یەکیان رەنگرێژ بوو کە ئەبووقیریان پێ دەگوت و ئەوی دیکەیان سەرتاش بوو کە پێیان دەگوت ئەبووسیر. ئەوانە پێکەوە جیران دووکان بوون. رەنگرێژەکە پیاوێکی درۆزن و بێشەرم و شەرانی بوو. لە کارەکەیدا زۆر شارەزا بوو. هەموو رەنگێکی دەردێنا. بەڵام کەس قسەی راستی لێ نەدەبیست. ئەگەر کەسێک شتێکی دێنا بۆی رەنگ بکا. لە پێشدا هەقدەستی خۆی لێ دەستاند و دەیدا بە خواردن و شەراب. خواردن و خواردنەوەکەی شایانە بوو. کاتێکیش خاوە شتەکە دەهاتەوە بۆ شتەکەی، پێی دەگوت: «بەیانی پێش تاوهەڵات وەرەوە شتەکەت دەدەمەوە. کابرا باوەری پێ دەکرد و دەرۆیشت. کابرای رەنگرێژەکە دەیگوت ئەورۆش زۆرە، دەرفەتە. بۆ بەیانییەکەی خاوەنی شتەکە لە کاتی دیاریکراودا دەهاتەوە. رەنگرێژە دەیگوت دوێنێ میوانم بۆ هات کارم نەکردووە برۆوە شەوەکی وەرەوە و شتکەکەت بە رەنگکراوی بەرەوە. بۆ رۆژی سێیەم خاون شتەکە دیسان دەهاتەوە. رەنگرێژ دەیگوت: «ببوورە توخودا، دوێنێ خێزانم منداڵی بوو، ئەوەندەم کار بوو، نەمتوانی شتەکەت بۆ رەنگ بکەم. بەڵام سبەینێ حەتمەن ئامادەیە وەرەوە بیبەوە. کابرا دەرۆیشت و دیسان لە کاتی دیاریکراودا دەهاتەوە. رەنگرێژ درۆیەکی

دیکەی ساز دەکرد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و سی و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! هەر کاتێک خاوەن شتەکە دەهاتەوە، کابرای ڕەنگرێژ دەستی کرد بە سوێند و قورئان و درۆ و دەلەسە. تا وای لێ دەهات، کابرا جاڕس دەبوو دەستی دەکرد بە هەراوهوریا و دەیگوت: تا کەنگی ئەوڕ و سبەیم پێ دەکەی. ئەمن هەر شتەکەم ڕەنگ ناکەم بمدەوە دەیبەمەوە. ئەوجار کابرای ڕەنگرێژ دەیگوت: «کاکە بە خودا لە ڕووم هەڵنەدەهات پێت بڵێم. بەڵام تازە ناچارم ڕاستییەکەت پێ بڵێم: شتەکەم وا بۆ ڕەنگ کردبووی سەیر، هێندە جوان بوو. بە داخەوە لە بەر تاو هەڵم خستبوو ویشک بێتەوە کەچی دزیبوویان. ئەگەر کابرا کابرا پیاوی چاک بایە دەیگوت خودا جێگەکەیم بۆ پڕ دەکاتەوە. ئەگەریش تووڕە و تۆسن بوایە، ئەوە لەگەڵ ڕەنگرێژ لێیان دەبوو بە هەرا و کێشە و بگرەوبەردە. ئیدی ئەوە ببوو بە کار و پیشەی ڕەنگرێژ هەتا وا بوو. ئەو کارەی لە نێو خەڵکدا دەنگی داوە و نێوی کەوتە سەر زاری خەڵک. خەڵک یەکتریان لەو بابەتە ئاگادار دەکردەوە. وا بوو کەس هیچی نەدەبردە لای و نەدەکەوتنە داوییەوە. مەگین کەسێک نەیناسیبایە. ئاواش هێشتا هەر لەگەڵ خەڵک شەڕوکێشەی بوو. هەر بۆیە کارەکەی لە کەمی دا و خەڵک ڕوویان تێ نەدەکرد. چونکە بێ کار وەڕەس دەبوو دەچوو لە دووکانی سەرتاشەکەی جیرانی دادەنیشت. ئەگەر لەوێوە چاوی لێ دەبوو غەوارەیەک شتی دێنا بۆ ڕەنگ، لە ڕێوە هەڵدەستا و لە دووکانی ئەبوسیر دەچووە دەرێ و لە کابرای غەوارەی دەپرسی چ کارێکت هەیە؟ ئەو کابرایەش وەڵامی دەداوە: ئەو شتەم هێناوە بۆم لە خم گری. ڕەنگرێژەکەش شتەکەی لێ وەر دەگرت و پێی دەگوت: «پارەکەیم دەیە و بەیانی وەرە شتەکەت بەرەوە.» کابرای غەوارەش هەقدەستەکەی دەدایە و لێی دەدا و دەڕۆیشت. ڕەنگرێژ ئەو شتەی هەڵدەگرت و دەیبرد بۆ بازاڕ دەیفرۆشت و نان و گۆشت و برینج و شەکری لێ دەکڕی و ئەگەر چاوی بە یەکێک لەو کەسانە دەکەوت کە شتی بۆ هێنابوو بە لەز خۆی لێ ون دەکرد. چەندین ساڵ ئەوە کاری بوو.

ڕێکەوت وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان پیاوێکی شایی بە خۆ و بە حەیا. شتی بۆ هێنا. ئەویش شتەکەی بردبوو فرۆشتبووی و پارەکەشی خەرج کردبوو. ئەو کابرایە هەموو ڕۆژێ دەهات و ئەوی لە دووکان نەدەدی. چونکە ڕەنگرێژ هەر کە سۆسەی ئەوی کردبا خۆی لە دووکانی ئەبوسیر ڕۆ دەکرد. کاتێک ئەو کابرایە هەر هات و ئەوی لە دووکان نەدی، وەڕەس بوو. چوو لە لای قازی شکایەتی کرد. یەکێک لە پیاوەکانی قازی هێنا و دەرودراوسێکانی بانگ کرد و لە هەنتەشی ئەواندا دەرکی دووکانی گاڵە دا. لاک و مۆری کرد. دووکانەکەش جگە لە چند کووپە و سوێنە شکاو هیچی دیکەی لێ نەبوو لە جێاتی شتەکەی لەگەڵ خۆی بیبا.

دوای ئەوە پیاوەکەی قازی کلیلەکەی وەرگرت و بە جیرانەکانی گوت بە ڕەنگرێژ بڵێن پارەکەی ئەو کابرایە بداتەوە و بێت کلیلی دووکانەکەی خۆی وەرگرێتەوە. پاشـــان کابرا لەگەڵ پیاوەکەی قازی لێیاندا ڕۆیشـــتن. کە ئەوان ڕۆیشـــتن، ئەبوســـیری ســـەرتاش بە ڕەنگرێژی گوت: «ئەوە بۆ هەر شـــتێکی لە خەڵکی وەر دەگری ونی دەکەی؟ ڕاســـتی بڵێ شـــتی ئەو کابرایە لەخۆڕازییەت چی لێ کردووە؟» ئەبوقیر گوتی: «کاکە لێیان دزیوم.» ئەبوســـیر گوتی: «ســـەیرە! هەر کەســـێک شـــتی بۆ هێناوی هەموویان لێ دزیوی؟ بۆ ئەو دووکانەی تۆ کانگای دزانە؟ ئەمن باوەڕ ناکەم. ڕاســـتییەکەم پێ بڵێ.» ڕەنگرێژەکە گوتی: «هاوسـێکەم، ڕاسـتت دەوێ کەس هیچی لێ نەدزیوم.» ئەبوسـیر لێی پرسـی: «ئەی چیت لەو هەموو شـــتەی خەڵک کردووە؟» ڕەنگرێژەکە وەڵامی داوە: «ئەمن ئەو کارانە بۆیە دەکەم کە کار و بازاڕم نییە. کەس شتم بۆ ناهێنێ.»

ئیدی باسی کەمکاری و کەم داهاتی کرد و گوتی بژیوم بۆ پەیدا نابێ. سەرتاشیش هەر هاتوهاواری بوو لە دەست بێ بازاڕی و دەستەتەنگی و بێ بژیوی. گوتی ئەمن سەرتاشێکم تـام نییە کەچی چونکە هەژارم کەس نـایە بۆ لام. هەر بۆیە ئەو کارەشـــم لە بەر چـاو کەوتووە. ڕەنگرێژیش گوتی کە منیش لەبەر بێ بـازاڕی ئەو کـارەی خۆم لە بەر چـاو کەوتووە. باشـە ئێمە بۆ لەو شـارە نەڕۆین؟ وا چاکە من و تۆ لێرە بڕۆین و بچینە شـارێکی دیکە خۆ کارەکەمان وایە بچینە هەر جێیەک خەڵک پێویستی پێمان دەبێ. ئەگەر بڕۆین لەو خەم و خەفەتەش ڕزگارمان دەبێ. ڕەنگرێژ بەردەوام لە بن گوێی ســـەرتاش خوێندی هەتا ئەویشی ڕازی کرد، پێکەوە بڕۆین.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەوان ڕێکەوتن پێکەوە سەفەر بکەن، ئەبوقیر کەیفی ساز بوو ئەو شێعرەی گوتەوە:

پیاو سەفەر نەکا چۆن دەبێ بە پیاو
مرۆڤ نەبزوێ دەگنخێ وەک ئاو

کاتێک ویستیان خۆیان بۆ سەفەر ساز کەن، ڕەنگرێژ بە سەرتاشی گوت: «هاوسێکەم تازە ئێمە بووین بە هاوسەفەر و لێک دانابڕێین. وا چاکە پێکەوە پەیمانێک ببەستین، کە هەر کاممان کارمان کرد، هەردووکمان لێی بخۆین و ئەوەی دەشمێنێتەوە لە مجرییەکی دەخەین. کاتێک گەڕاینەوە ئەسکەندەرییە پێکەوە بەشی دەکەین.» سەرتاش گوتی: «زۆر باشە وا دەکەین.»

دوای ئەوە سەرتاش دووکانی داخست و کلیلەکەی داوە بە خاوەن دووکانەکە. کلیلی دووکانی ڕەنگرێژیش کە لە لای پیاوەکانی قازی بوو. پاشان پێکەوە سواری کەشتی بوون و لە دەریای سوێریان دا و کەوتنە ڕێ. لە بەختی سەرتاش لەو کەشتییەدا بێجگە لە کەشتیوان و بەردەستەکانی سەد و بیست کەسی تێدا بوو ئەوە لە کاتێکدا بوو، بێجگە لەو سەرتاشی دیکەشی تێدا نەبوو. کاتێک چارۆکەکانیان هەڵدا، سەرتاش بە ڕەنگرێژی گوت: «کاکە گیان ئێرە دەریایە و ئێمەش پێویستیمان بە خواردن و خواردنەوەیە. ئێمە توێشوویەکی وامان نەهێناوە. ئێستا دەبێ بە نێو ئەو خەڵکەدا بگەڕێم. بەشکوو یەکێک بڵێ سەرتاش. سەرم بۆ بتاشە. منیش نیو درهەم یان نانێک و لیوانێک ئاوی لێ وەر دەگرم و بەری دڵی خۆمانی پێ دەگرین. ڕەنگرێژ وەڵامی داوە: «زۆر باشە. وا بکە.» ئیدی ڕەنگرێژ لێی خەوت و سەرتاشیش هەستا فۆتەی بە شانی دادا و جامی بە دەستەوە گرت و قایشی شتەکانی لە نێوقەدی بەست و دەستی کرد بە سووڕانەوە بە ناو خەڵکەکەدا. دەنگێک بانگی کرد، وەستا سەرم بۆ بتاشە. سەرتاش سەری بۆ تاشی. کابرا نیو درهەمی دایە. ئەگەر نانێکم دەیەی لەو دەریایەدا زیاتر بە کارم دێ. چونکە کەسێکی دیکەشم لەگەڵە و توێشەشمان پێ نییە. کابرا نانێک و کەمێک پەنیری دایە و جامەکەشی پڕ لە ئاوی شیرین کرد. سەرتاش نان و شتەکەی لێ وەرگرت و هاتەوە لای ڕەنگرێژەکە و پێی گوت: «وەرە پێشێ خودا گەیاندی با نان و پەنیرێک بخۆین.» ڕەنگرێژەکە نان و ئاوەکەی لەگەڵ خوارد و لە ژووری درێژ بوو. سەرتاشیش دەستی دا کەرەسەکانی و ڕۆیشتەوە بۆ نێو خەڵکەکە. سەری یەکی بە نانێک تاشی و ئی یەکی دیکەی بە کەمێک پەنیر. تا وای لێ هات کارەکەی

برەوی پەیدا کرد. هەرکەس داوای کردبا سـەری بۆ دەتاشـی هەتا کەمێک نان و نیودرەم نوقرە و پەنیر و زەیتوونێکی زۆری پاشـەکەوت کرد. سـەری قیبتانیشـی تاشـی. لە لای قیبتان باسـی کەمی خواردەمەنی و تویشـەی کرد. قیبتان پێی گوت: «هەموو شـەوێ هاورێکەت بێنە و لەگەڵ ئێمە نانەکەتان بخۆن. هەتا ئێمەتان بێ خەمتان نەبێ.»

سەرتاش گەڕاوە لای ڕەنگرێژەکە. سەیری کرد خەوتووە. هەڵیستاند. کە ڕەنگرێژەکە لە خەو هەسـتا سـەیری کرد پێشـی پڕە لە خواردەمەنی جۆراوجۆ. بە سـەرتاشـی گوت: «ئەوانەت لە کوێ هێناوە؟» سـەرتاش گوتی: «ئەوانە خودا ناردوونی.» ئەوجار ڕەنگرێژ ویستی شتەکان بخوا، کە سەرتاش گوتی: «ئەوانە هەڵگرە بۆ ژەمێکی دیکە. ئەمن سەری قیبتانم دەتاشی باسی کەمی خوردوخۆراکم کرد. کەچی ئەویش گوتی لەگەڵ هاورێکەت بۆ خواردنی شـێو وەرنە لای من. تازە ئێمە جەنگەی ژەمەکە دەچینە لای قیبتان.» ئەبوقیر گوتی: «ئەمن سەرم لە گێژەوە دێ و ناتوانم لە جێی خۆم هەستم لێم گەڕێ با لەوە بخۆم. ئەتۆ بۆخۆت بچووە بۆ لای قیبتـان و خواردنەکەت بخۆ.» ئەبوسـیر گوێتی: «قەینـاکـا، لەمەودوا وا دەکەم ئەمن دەچمە ئەوێ.»

دوای ئەوە ئەبوسـیر دانیشـت و چاوی لەو دەکرد. ئەویش پارووی گەورە گەورەی دەگرت، دەتگوت چەند ڕۆژە هیچی نەخواردووە. پێش ئەوەی پاروویەکی بە تەواوی قووت دا، پاروویەکی دیکەی دەپێچاوە و دە زاری ڕادەکرد. وەک دێو چاوی لە ژێڵلا دەهات و وەک گامێش مشـەمشـی دەهات. لەو جەنگەیەدا یەکێک لە پیاوەکانی قیبتان هات و گوتی: «مامۆستا هاورێکەت بێنە و وەرن لەگەڵ قیبتان نانەکەتان بخۆن. ئەبوسیر گوتی: «ئەبوقیر لەگەڵ من دێی یان نا؟» ئەبوقیر وەڵامی داوە، ئەمن تاقەتم نییە. ناچار سـەرتاش بە تەنیا چوو بۆ لای قیبتان سەیری کرد ئەوە بیست جۆرە خواردنیان لە سەر خوان ڕیز کردووە. قیبتان لەگەڵ تاقمێکی دیکە چاوەڕێی سـەرتاش بوون. کاتێک قیبتان چاوی بە سـەرتاش کەوت هەواڵی هاورێکەی لێ پرسی. ئەبوسیر گوتی: «گەورەم، ئەو بە هەوای دەریا سەری لە گێژەوە دێ.» قیبتان گوتی: «چ نییە چا دەبێ ئەتۆ وەرە نانەکەت بخۆ. ئەمن چاوەڕێی تۆ بووم. ئینجا قیبتان دەفرێکی هێنا ئەوەندەی خواردنی جۆراجۆر تێ کرد کە بەشی بیست کەسیشی دەکرد. دوای ئەوەی سەرتاش نانەکەی خوارد، قیبتان پێی گوت: «ئەو دەفرەش بۆ هاورێکەت بەرە.» ئەبوسیر دەفرەکەی هەڵگرت و هێنایەوە بۆ لای ئەبوقیر و پێی گوت: «پێم نەگوتی هیچ مەخۆ قیبتان پیاوێکی دەسـت و دڵ کراوەیە. چاو لێکە بزانە چی بۆ تۆ ناردووە.» ئەبوقیر گوتی: «بۆم بێنە.» سەرتاش دەفرە پڕ لە خوادەمەنییەکەی دایە دەست. ئەویش دەفرەکەی لێ وەرگرت و وەک گورگی برسی دەستی کرد بە خواردن. وەک ئەوەی سـاڵانێک بێ هیچی نەخواردبێ. ئەبوسیر ئەوی هەر ئاوا بە دم خواردنەوە بەجێ هێشت و بۆخۆی گەڕاوە لای قیبتان و قاوەکەی خواردەوە و گەڕاوە. سـەیری کرد ئەبوقیر ئەوەی

لەو دەفرەدا بوو هەمووی خواردبوو. دەفرەکەی فڕێ دابووە ئەو لاوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نۆسەد و سی و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەبوسیر دەفرەکەی هەڵگرتەوە و شۆردی و دایە بە خزمەتکارەکانی قیبتان. بۆخۆی گەڕاوە لای ئەبوقیر و تا بەیانی خەوت. بۆ سبەینییەکەی دیسان ئەبوسیر ڕۆیشتە دەرێ بۆ سەرتاشینی خەڵک و ئەوەی پەیدای دەکرد، دەیدا بە ئەبوقیر. ئەبوقیریش دەیخوارد و دەیخواردەوە و لە جێی خۆی نەدەبزووت. ئەبوسیر هەموو شەوێ دەفرێکی پڕ لە خواردنی لە هەموو جۆرە خواردەمەنییەک بۆ ئەبوقیر دێناوە. هەتا بیست ڕۆژ بەو جۆرە تێپەڕی. هەتا کەشتی گەیشتە نیزیک شارێکی کەناراو. ئەبوقیر و ئەبوسیر دابەزین و چوونە ناو شارەکەوە. لە کاروانسەرایەک دیوێکیان گرت. ئەبوسیر چوو بۆ بازاڕ و هەموو پێداویستییەکی کڕی. گۆشتی کڕی و برژاندی. ئەبوقیریش لەو کاتەوە کە هاتبووە ئەو مزڵەوە خەوتبو. هەڵنەدەستا. هەتا ئەبوسیر هەڵیستاند و خوانی لە پێش ڕاخست. ئەویش دەستی کرد بە خواردن.

کە تێری خوارد گوتی: «لۆمەم مەکە ئەمن سەرم ئێستاش هەر لە گێژەوە دێ. ئەوەی گوت و خەوتەوە. هەتا چل ڕۆژان ئەوە کاری بوو. سەرتاش دەستی دەدا جام و شتەکەی و بە نێو شاردا دەگەڕاو کاری دەکرد. ئەوەی وەگیری دەکەوت دەیبرد دەیدا بە ئەبوقیر. تەماشای دەکرد، ئەبوسیر خەوتووە. هەڵیدەستاند. کە هەڵدەستا لەڕێوە بەجۆرێکی دەست دەکرد بە خواردن تۆمەز چەند ساڵە هیچی نەخواردووە. دوای ئەوە دەخەوتەوە. چل ڕۆژی دیکەش هەر ئاوا ڕۆیشت. هەر کاتێک ئەبوسیر پێی دەگوت هەستە بچووە دەرێ لە ناو شاردا بگەڕێ ئەو شارە سەیرانگەی زۆر خۆشی هەیە. شاری ئاوام نەدیوە. ئەبوقیری ڕەنگرێژ دەیگوت: «ببوورە ئێستا هەوای دەریا بەری نەداوم. ئەبوسیری سەرتاش پێی خۆش نەبوو دڵی لێی بێشێ. قسەیەکی نەدەکرد لە دڵی گران بێ.

لە هەشتا و یەکەمین ڕۆژدا ئەبوسیر نەخۆش کەوت بە جۆرێک کە نەیدەتوانی بچێتە دەرێ. لە بەر دەرکەوانی کاروانسەراکە دەپاڕاوە خواردن و شتیان بۆ بکڕێ. ئەو دەرکەوانە شتەکانی بۆ دێنان و ئەبوقیریش هەر وا درێژ ببوو. لە جێی خۆی نەدەبزووت. هەتا چوار ڕۆژان دەرکەوانەکە بە ڕوو لێ نان و پاڕانەوەی ئەبوسیر هاتوچۆی دەکردن و شتی بۆ دێنان.

دوای ئەوە ئەبوسیر نەخۆشییەکەی لێی پیس کرد و لەبەر ئازاری زۆر بێهۆش کەوت. برسییەتی زۆری بۆ ئەبوقیر هێنا. ناچار هەستا. نێو جلەکانی ئەبوسیر گەڕا هەمبانەیەکی دیتەوە کە چەند درەمێکی تێدا بوو. درەمەکانی هەڵگرت و دەرکی دیوەکەی لە سەر ئەبوسیر داخستوو و بێ ئەوەی کەس ئاگادار کاتەوە لە کاروانسەرا وەدەر کەوت. چوو لە

بازاڕ دەســـتێک جلوبەرگی جوان و شــکۆدار کڕی و لە بەری کرد. لە نێو شــاردا گەڕا و چاوی گێڕا. ســەیری کرد شــارێکە لە دونیادا هاوتای نییە. بەڵام خەڵکەکەی جگە لە ڕەنگی چەرموو و مۆر ڕەنگی دیکەیان لە بەردا نییە. چوو بۆ دووکانی ڕەنگڕێژێک ســـەیری کرد. ئەوەی لەو دووکانەدا بوو، ڕەنگەکەی مۆر بوو. پشــتێنەکەی کردەوە و دای بە کابرا و پێی گوت مامۆســـتا ئەوەم بۆ ڕەنگ بکە و هەقدەســـتی خۆت وەرگرە. کابرا ڕەنگڕێژەکە بە ئەبوقیری گوت کە هەقدەستەکەی بیست درەمە. ئەبوقیر گوتی: «لە شاری ئێمە ئەوەی بە دوو درەم ڕەنگ دەکەن.» کابرا گوتی: «بڕۆوە لە شاری خۆت ڕەنگی بکە. ئەمن لە بیست درەم کەمتر ڕەنگی ناکەم.» ئەبوقیر گوتی: «چ ڕەنگێکی لێ دەدەی؟» کابرا گوتی: «جگە ڕەنگی مۆر ڕەنگی دیکە نابێ.» ئەبوقیر گوتی: «ئەمن دەمەوێ بۆم سوور کەیت» ڕەنگڕێژ گوتی: «ناتوانم ســووری کەم.» ئەبوقیر داوای ڕەنگی زەردی کرد. ڕەنگڕێژ وەڵامی داوە: «نازانم.» ئەبوقیر دانە دانەی ڕەنگەکانی گوت و ڕەنگڕێژ دەیگوت: «نازانم.»

دوای ئەوە ڕەنگڕێژەکە گوتی: «ئەو شارەی ئێمە چل ڕەنگڕێژی تێدا. بێ ئەوەی زیاد یا کەم بێ. هەرکەس بمرێ کوڕەکەی فێر دەکەین. ئەگەر کوڕی نەبێ ئەوە دەنکێکمـان کوێر دەبێتەوە. پیشـــەکەی ئێمەش بێ خەوشـــە. بەڵام جگە لە ڕەنگی مۆر ڕەنگی دیکە نازانین.» ئەبوقیر گوتی: «دەیباشـــە ئەمن بۆخۆم ڕەنگڕێژم ڕۆژانە جیرەیەکم بۆ ببڕەوە لێرە کار دەکەم و هەموو ڕەنگەکانیشت فێر دەکەم. ئەو دەم لە سەر هەمووی ڕەنگڕێژەکانی دیکەوە دەبی.» ڕەنگڕێژ گوتی: «ئێمە غەوارە ڕاناگرین.» ئەبوقیر گوتی: «ئەمنیش بە تەنێ دووکان دادەنێم.» ڕەنگڕێژ گوتی: «قەت ناتوانی کاری وا بکەی.»

ئەبوقیر کە ئەو قسـەیەی بیسـت ئەوی بەجێ هێشـت و چوو بۆ لای ڕەنگڕێژێکی دیکە. ئەویش هەر وای گوت. ئیدی ئـاوا بەردەوام لە ڕەنگڕێژێکەوە دەچووە لای ڕەنگڕێژێکی دیکە. هەتا وا بوو چووە هەر چل دووکانەکە. هیچ کامیان ڕێیان نەدا لە لای ئەوان کار بکا. ئینجا چووە لای گەورەی ڕەنگڕێژان و قســـەی لەگەڵ کرد. ئەویش گوتی: ئێمە غەوارە ڕاناگرین. ئەبوقیر ڕقی لە ڕەنگڕێژەکان هەســتا و چووە لای پادشــای ئەو شــارە و گوتی: «پادشــا ئەمن غەریبم و پیشــەم ڕەنگڕێژییە، تەواوی ڕەنگەکانیش هەر لە ڕەنگی پەمەیی و شــەرابی و فســتقی و وەنەوشــەیی و نارنجی و لیمۆیی تەواوی ڕەنگەکانی دیکە دەازنم کە ڕەنگڕێژەکانی ئەو شـــارە هیچ کام لەوانە نازانن. جگە لە ڕەنگی مۆر. چووم بۆ لایان و ...چی ببوو هەمووی بۆ پادشـــا گێڕاوە. پادشـــا گوتی: «ئەمن دووکانێکت بۆ دادەنێم و کەلوپەل و پێداویســـتی کارەکەشـــت بۆ دەکڕم. هەرکەس دژایەتیت بکا دەیکوژم. ئینجا ئەندازیار و وەسـتای لەگەڵ خسـت و پێی گوتن: «بچن لە ناو شـار بگەڕێن، ئەو وەسـتایە کوێی پێ چاک بوو، بە پارە کابرای ڕازی کەن و لەوێی دەرکەن. ئەگەر ماڵ، دووکان یا کاروانسەراش بێ. گارگەیەکی ڕەنگڕێژی بەو شێوەیەی بۆخۆی پێی باشە بۆی ساز کەن.

ئەوەی ئەو دەیڵێ بە قسەی بکەن و دژایەتی مەکەن. دوای ئەوە پادشا کەوایەکی گرانبایی و هەزار دیناری زێڕی دا بە ئەبوقیر و گوتی: «ئەو پارەیەی بۆخۆت خەرج بکە. دوو کۆیلەشی بۆ خزمەت کردنی، لەگەڵ ئەسپێک بە زین و لغاوە پێشکەش کرد. ئەبوقیر کەواکەی لە بەر کرد و سواری ئەسپ بوو. شێوەی یەکێک لە میرەکانی دەدا. دوای ئەوە پادشا ماڵێکی بۆ چۆڵ کرد و فەرمانی دا بۆی پڕ فەرش کەن.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەبوقیر چووە ئەو ماڵەوە. ڕۆژی دوایی سواری ئەسپەکەی بوو لە شاردا دەگەڕا و ئەندازیارەکانیش لەگەڵی دەڕۆیشتن. ئەویش چاوی دەگێڕا. لە شوێنێکی شیاو دەگەڕا دەستنیشانی بکا، هەتا بۆی بکەن بە کارگە. وا بوو، شوێنێکی کەوتە بەر دڵ. ئینجا خاون شوێنەکەیان بردە لای پادشا. شوێنەکە چەندی دێنا پادشا زۆر لەوە زیاتری دایە و ڕازی کرد. ئەندازیار و وەستای دیوار و شت دەستبەکار بوون. ئەبوقیر ڕێی بۆ دەکێشان چی بکەن و چی نەکەن. تا وا بوو کارگەیەکیان بۆ چێ کرد لە دونیادا تای نەبوو. کە تەواو بوو بە پادشایان ڕاگەیاند. پادشا چوارهەزار دیناری زێڕی دا بە ئەبوقیر هەتا کەلوپەل و شتەکانی پێ بکڕێ. ئەبوقیر زێڕەکانی وەرگرت و چوو بۆ بازاڕ. پێداویستییەکانی کڕی. پادشا پێنسەد کوت کاڵای نارد بۆی ڕەنگ بکا. ئەبوقیر بە هەموو ڕەنگێک ئەوانی ڕەنگ کرد و لە بەر دەرگای کارگە هەڵی خستن.

کاتێک خەڵک بەوێدا دەهاتن، سەریان سوور دەما چونکە شتی ئەوەندە سەیریان بە تەمەنیان نەدیتبوو. خەڵک دەهاتن لە بەر دەرگای کارگە کۆ دەبەوونەوە و دانە دانە نێوی ڕەنگەکانیان دەپرسی. ئەبوقیریش پێی دەگوتن کە ئەوە سوورە و ئەوە زەردە و ئەوە سەوزە ... ئاوا ناوی هەموو ڕەنگەکانی پێ دەگوتن. خەڵکیش شتیان بۆ دێنا و دەیانگوت لە فلانە ڕەنگ و فیسارە ڕەنگمان بۆ لێ دە. چەندیش دەڵێی دەتدەینێ. کاتێک کاری ڕەنگکردنی شتەکانی پادشا تەواو بوو، ئەوانی هەڵگرت و چوو بۆ بارەگای پادشا. هەرکە پادشا چاوی بەو ڕەنگانە کەوت، لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو دیارییەکی لە ڕادەبەدەری دایە. ئەوجار تەواوی لەشکرەکەی شتەکانیان هێنا بۆیان ڕەنگ بکا. هەر ڕەنگێکیان ویستبا ئەبوقیر ئەو ڕەنگەی بۆ دەردێنان. ئەوانیش زێڕ و زیوێکی زۆریان دەدایە. بەو جۆرە نێوی دەرکرد و کارگەکەیان ناو نابوو کارگەی سوڵتان. ڕەنگڕێژەکانی شار نەیاندەوێرا هیچی پێ بڵێن. هەر کاتێک دەهاتن بۆ لای دەستیان ماچ دەکرد و داوای لێ بووردنیان دەکرد لەبەر ئەوەی ئاوای لەگەڵ جووڵابوونەوە. پێیان دەگوت: «تکایە ئێمە بە شاگردی خۆت قەبووڵ بکە با لە خزمەتتدا بین. ئەویش داواکەی ئەوانی ڕەتدەکردەوە. تا وای لێهات. ماڵ و سامانێکی زۆر و کۆیلە و کەنیزی پێکەوە نا. کاری ئەبوقیری ڕەنگرێژ بێرە گەیشت.

بچینەوە سەر و سۆراغی ئەبوسیری سەرتاش. دوای ئەوە کە ئەبوقیر درەمەکانی هەڵگرت و ئەبوسیری لە ژوورێدا بە تەنیا و بێ سەروزمانی بەجێ هێشت، ئەبوسیر هەتا سێ ڕۆژان لە سەر ڕەقی پشت کەوت. دوای ئەوە دەرکەوانی کاروانسەرا سەیرب کرد دەرکی دیوەکەیان داخراوە و تا شێوانێکی درەنگ نەیدی کەسیان هاتوچۆ بکا. لە دڵی

خۆیدا گوتی ڕەنگە کریکەیان نەدابێ و لێیان دابێ ڕۆیشتبن. یان مردوون. ئیدی هاتە پشت دەرگاکە و گوێی لە نالە نالّی ئەبوسیر بوو. سەیری کرد کلیلەکەی لە بن ڕێسمەی دەرگاکەیە. کلیلەکەی هەڵگرت و درگاکەی کردەوە. تەماشای کرد ئەبوسیر کەوتووە وزۆر ناڕەحەتە. لێی پرسی: «هاوڕێکەت لە کوێیە؟» ئەبوسیر وڵامی داوە: «ئەمن نازانم ئەوڕۆ وەهۆش هاتوومەوە نازانم لە کەیەوە بێهۆش بووم و هاوڕێکەم لە کوێیە. کە وەهۆش هاتمەوە کەسم لە لا نەبوو. کاکە گیان هەنبانەکە لە پشت سەرمدایە دەری هێنە و چەند درەمێک هەڵگرە و شتێکم بۆ بێنە زۆر بێ هێزم با بیخۆم. دەرکەوانەکە دەستی برد هەنبانەکەی دەر هێنا سەیری کرد هیچی تێدا نییە. بە ئەبوسیری گوت: «ئەو هەنبانەیە هیچی تێدا نییە.» ئەبوسیر زانی کە هەرچی لە توورەکەکەدا بووە، ئەبوسیر دەری هێناوە و ڕۆیشتووە. بە دەرکەوانەکەی گوت: «ئەتۆ هاوڕێکەی منت نەدیوە؟» دەرکەوانەکە گوتی: «سێ ڕۆژە من نەمدیوە، ئەمن پێم وا بوو ئێوە پێکەوە ڕۆیشتوون.» ئەبوسیر گوتی: «نەڕۆیشتووین بەڵام ئەو درەمەکانی منی هەڵگرتووە و ڕۆیشتووە.»

دوای ئەوە ئەبوسیر دەستی کرد بە گریان و زاری. دەرکەوانەکە گوتی: «خەمت نەبێ چونکە ئەو بە سزای ئەو کارانەی دەگا. دوای ئەوە هەستا چوو شۆرباوی بۆ هێنا. هەتا دوو مانگ چاوەدێری کرد و ئاگای لە ئەبوسیری بوو. لە گیرفانی خۆی بۆی خەرج دەکرد. تا خودا ڕەحمی پێ کرد و چاک بووەوە. دوای ئەوە ئەبوسیر هەستا و بە دەرکەوانەکەی گوت: «خودا پشتیوان بێ وڵامی ئەو چاکانەت دەدەمەوە، هەر چەند ئەو چاکانەی تۆ بە خودا نەبێ بە کەسیش نادرێتەوە.» دەرکەوانەکە گوتی: «شوکری خودا کە چاک بوویەوە ئەمن ئەو کارەم هەر لە ڕێی خودادا کردووە.»

دوای ئەوە ئەبوسیر لە کاروانسەرا هاتە دەرێ. هەروا لە بازاڕ دەگەڕا تا وابوو دەستی چارەنووسی ئەوی بەرەو کارگەکەی ئەبوقیر برد. سەیری کرد ئەوە شتەکانی بە ڕەنگی جۆراوجۆر ڕەنگاندووە و لە بەر درگا هەڵی خستوون. خەڵکیش تێیان ئاڵاوە و سەیریان دەکەن. ئەبوسیر لە یەکێک لەو کەسانەی پرسی ئەوە چییە ئەو خەڵکە بۆ ئاوا لێرە کۆ بوونەوە؟ کابراکە وڵامی داوە، ئێرە کارگەی سوڵتانە کە کابرایەکی غەوارە بە نێوی ئەبوقیر ئاوەدانی کردووەتەوە. خەڵکیش هاتوون چاو لە کاری ڕەنگرێژییەکەی دەکەن. چونکە لەو شارەدا ڕەنگرێژێک نەبوو بزانێ ئەو ڕەنگانە لێ دا. کابرا کە بە هەمووشتێکی دەزانی بۆی گێڕاوە کە ئەبوقیر چۆناوچۆن چووە لای ڕەنگرێزەکان و ئەوان چییان جواب داوەتەوە، کە دوایە ئەبوقیر چووە بۆ لای پادشا. پادشا چۆن دووکانی بۆ دانا و قەدری گرت و سامانی لە ئیختیار دانا. هەمووی بێ زیاد و کەم بۆ گێڕاوە. ئەبوسیر دڵخۆش بوو، گوتی: «سپاس بۆ خودا کە وا خودا کاروباری خستووەتە ڕێ و ئەوی کردووە بە سەرۆکی ڕەنگرێژەکان و بۆخۆی ئەوەندە سەرقاڵە منی لە بیر چووەتەوە. سەردەمانێک ئەو بێکار بووە، من ئاگام

لێی بووه و ئاورم لێ داوەتەوە. ئەویش حەتمەن ئێستا ئەگەر من ببینێ قەدرم دەگرێ و ئاورم لێ دەداتەوە و چاکەکانی منی لە بەر چاو دەبێ.

پاشان ئەبوسیر چووە بەر درگای کارگەکەی ئەبوقیر. سەیری کرد ئەبوقیر لە کارگەیەکی گەورەدا دانیشتووە و جلی گرانبایی لەبەردا و چوار بەردەست و چوار کۆیلەی حەریر پۆش لە خزمەتیدا ڕاوەستابوون. دە کرێکار خەریکی ڕەنگرێژی بوون. ئەویش وەک وەزیران پاڵی دابووەوە و دانیشتبوو. ئەبوسیر ڕووبەڕووی ڕاوەستا و وەیزانی هەر کە ئەبوقیر چاوی پێی کەوێ لە خۆشیان شاگەشکە دەبێ و سڵاوی لێ دەکا و کارێک دەکا لێی خۆش بێ. بە پێچەوانەوە هەرکە ئەبوقیر چاوی پێی کەوت تێیخوڕی و گوتی: «دزی گڵاو چەند جارم پێ گوتووی لێرە ڕامەوەستە. بە تەمای لە لای خەڵک ئابڕووم بەری؟» بانگی پیاوەکانی کرد و گوتی: «دا بیگرن.» نۆکەرەکانی ئەبوقیر، ئەبوسیریان گرت. بۆخۆشی هەستا و دەستی دا گۆچانێک و گوتی: »وەری سووڕێنن.» سەد دانە گۆچانی لێ دا و پێی گوت: «دزی گڵاو ئەو جار لە دەرک و بەرەی ئەو کارگەیەت ببینم، دەتنێرم بۆ لای پادشا هەتا بت دا بە والی سەرت برێ.» ئیدی ئەبوسیر بە دڵێکی پڕ لە داخەوە لەوێ ڕۆیشت. هەنتەشیان لێیان پرسی: «ئەوە ئەو کابرایە چی کردبوو ئاوات لێ کرد؟» ئەبوقیر گوتی: «ئەوە دزە شتەکانی خەڵک دەدزێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نۆسەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەبوقیر گوتی: «ئەوە دزە و شتی خەڵک دەدزێ، زۆرجار شتی لە من دزیوە. ئەمن لێی خۆش بووم و پارەی شتەکەی خەڵکم داوەتەوە و ئامۆژگاریم کردووە. بەڵام چونکە ئەو بە قسەی منی نەکردووە ئاوام لێ کرد. ئەگەر ئەوجار بێتەوە ئێرە دەینێرمە لای پادشا با بیکوژێ بۆ ئەوەی خەڵکیش پێوەی تەمبێ بێ.»

ئەبوسیر گەڕاوە کاروانسەرا و چوو لە فکرەوە، سەری لەو کارەی ئەبوقیر دەرنەدەچوو. چەند ڕۆژێک دانیشت هەتا ئێشی گیانی ئەهوەن بووەوە. دوای چەند ڕۆژ هەستا چوو بۆ بازار بە دڵیدا هات بچێ بۆ گەرماو. لە کەسێکی پرسی: «کاکە گەرماو لە کوێوەیە؟» کابرا گوتی: «گەرماو چییە؟» ئەبوسیر گوتی: «گەرماو جێگایەکە خۆی لێ دەشۆن و چلک و چەپەری لەشیان خاوێن دەکەنەوە. گەرماو یەکێک لە نیعمەتە هەر باشەکانی دونیایە.» کابرا گوتی: «ئەگەر دەتهەوێ غوسڵ لە خۆت دەرکەی یان خۆت بشۆی بچووە دەریا.» ئەبوسیر وڵامی داوە: «ئەمن دەچمە گەرماو.» کابرا گوتی: «ئێمە نازانین گەرماو چییە، ئەگەر بمانهەوێ خۆمان بشۆین دەچینە دەریا.»

ئەبوسیر کە زانی ئەو شارە گەرماوی نییە و خەڵکەکەی نازانن گەرماو چییە، لە ڕێوە خۆی گەیاندە کۆشک و کڕنۆشی بۆ پادشا برد و دوعای بە خێری بۆ کرد. گوتی: «پادشا ئەمن کەسێکی غەوارەم و کاری گەرماو دەزانم. کە هاتمە ئەو شارەی تۆ ویستم بچم بۆ گەرماو بەڵام گەرماوم نەدیتەوە. ئەمن پێم سەیر بوو، شارێکی ئاوا خۆش و ئاوەدان گەرماوی نەبێ. لە کاتێکدا گەرماو باشترین و خۆشترین نیعمەتی دونیایە.» پادشا پرسی: «گەرماو چییە؟» ئەبوسیر موو بە موو باسی تایبەتمەندییەکانی گەرماوی بۆ کرد و گوتی: «ئەگەر ئەو شارەی تۆ گەرماوی بێ خۆشترین شاری دونیا دەبێ.» پادشا خەلاتی کرد و ئەسپێک و دوو کۆیلە و چوار کەنیزیشی پێشکەش کرد. ماڵێکی بۆ پڕ فەڕش و ئامادە کرد. زۆر لە ڕەنگرێژەکەی زیاتر قەدر گرت. وەستا و ئەندازیاری لەگەڵ خست و گوتی: «کوێی پێ باش بوو لەوێ گەرماوەکەی بۆ دروست کرد.» ئەبووسیر لەگەڵ وەستا و ئەندازیارەکان چوو لە ناو شاردا گەڕا هەتا شوێنێکی دیتەوە. بە ئەندازیار و وەستاکانی گوت لێرە دروستی کەن. ڕێوشوێنەکەی بۆ کێشان و چاوەدێری کردن. بانگی وێنەکێشانی کرد و جوانترین وێنەی لە دار و دیوارەکەی خست. بە جۆرێک خەڵک واقیان وڕ دەما کە چاویان پێی دەکەوت.

دوای ئەوە هاتەوە لای پادشا و گوتی کارەکانی تەواو بووە و هەر کەلوپەلی پێویستی نێو گەرماوەکە ماوە. پادشا دەهەزار دیناری دا بە ئەبوسیر. ئەبوسیر فەڕش و فۆتەی

حەریری بۆ کرێ. هەرکەس بە بەر درگای گەرماوەکەدا تێدەپەڕی و چاوی پێی دەکەوت سەری سووڕ دەما. وای لێ هات تەواوی خەڵک کۆ دەبوونەوە و سەیریان دەکرد و دەیان گوت ئەوە چییە؟ ئەبوسـیر پێی دەگوتن ئەوە گەرماوە. ئەوانیش دەحەبەسـان. دوای ئەوە ئەبوسـیر ئاوی بۆ هێنا و حەوزەکانی پڕ کرد لە ئاو و کوفارەکانی وەکار خسـتن. خەڵکی شـار هەرکەس چاوی پێی دەکەوت، باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد. دە دانە کۆیلەی مێرمنداڵی لە پادشـا وەرگرت و فێری لفکە و کیسـە لێدانی کردن. دوای ئەوە بخووری خسـتە سـەر سـکڵ و بە جارچی گوت: لە شـاردا چاڕ بدا خەڵک بێن بۆ گەرماو. خەڵک دەستە دەستە دەهاتن بۆ گەرما. ئەبوسیر بە کۆیلەکانی دەگوت بیانشوا. دوای ئەوە خەڵک خۆیان لە ئاوە گەرمەکە هەڵدەکێشـا و دەهاتنەوە دەرێ و دەچوون لەولاوە دادەنیشـتن. کۆیلەکان هەر وەک ئەبوسـیر فێری کردبوون دەچوون کیسـە و لفکەیان لێ دەدان. هەتا سێ ڕۆژان خەڵک هەر ئاوا بە بەلاش دەهاتن خۆیان دەشوت و دەڕۆیشتنەوە.

بۆ ڕۆژی چوارەم، ئەبوسـیر پادشـای بانگهێشـت کرد بێتە گەرماو. پادشـا لەگەڵ گەورەکانی دەوڵەت سـوار بوون و چوون بۆ گەرماو. پادشـا جلەکانی داکەند و چوو لە چاوەیەکەوە. ئەبوسـیریش چووە ژوورێ و کیسـە و لفکەی لە پادشـا دا و نەرم دایماڵی. لەشی پادشا پلێتە پلێتە چڵکی بەر دەدا و ئەبوسیریش پێشانی پادشای دەدا. پادشا کەیفی بەو گەرماوە سـاز بوو. ئەبوسـیریش هەر دەسـتی ڕێ دەخسـت و پێسـتی هێندە نەرم و جوان و خاوێن ببووەوە هەر چیرەی لێ دەهات. دوای ئەوەی پادشـای شـوت گوڵاوی لە حەوزی گەرمخانەکە کرد و پادشـای هێنایە ئەوێ. دوای ئەوەی پادشـا لە گەرماوەکە هاتە دەرێ لەشی وەک گوڵی لێ هاتبوو، هەستی بە سووکی و ئاسوودەیی دەکرد. زۆر دڵخۆش بوو. بە ئەبوسـیری گوت: «مامۆسـتا بە گیانی خۆم، ئەو شـارە بەبێ گەرماو هەر شـار نەبوو.» دوای ئەوەش گوتی: «بۆ هەر کەسـێک چەندە وەردەگری؟» ئەبوسـیر گوتی: «تۆ چەندە بفەرمووی ئەوەندە وەردەگرم.» پادشـا گوتی: «هەرکەس لێرە خۆی بشـوا هەزار دیناری لێ بسـتێنە.» ئەبوسـیر گوتی: «پادشا خەڵک هەموو وەک یەک نین. تاقمێک هەیانە و تاقمێک نییانە. ئەگەر هەر کەسـەی هەزار دیناری لێ وەرگرم کەس ڕووی تێ ناکا.» پادشـا گوتی: «ئەی چەندە وەردەگری؟» ئەبوسـیر گوتی: «دەڵێم هەر کەس ئەوەندەی لە توانای دایە، با کەس زۆری بۆ نەیە. ئاوا هەمووکەس دێن بۆ گەرماو بە دارا و نەدارەوە. بەلام هەزار دیاری پادشـایە. کەس ئاوای پێ ناکرێ. گەورەکانی دەوڵەت پشـتی قسـەکەیان گرت و گوتیـان هەمووکەس ئـاوای پێ نـاکرێ. ڕاسـتە بەلام ئەو کابرایە غەریبە و لەو شارەی ئێمە ئەو گەرماوەی چێ کردووە. ئەگەر زۆیشی بدرێتێ بە زایە ناچێ و زیادەڕۆیی نییە. «لااسـراف فی الخیر» واتە لە چاکەدا زیادەڕۆیی نییە. بەلام ئێوە یەکی سـەد دینار و کۆیلەیەک و کەنیزێکی بدەنێ. گەورەکانی دەوڵەت قسـەکەی پادشـایان قەبووڵ کرد و یەکی

سەد دینار و کۆیلەیەک و کەنیزێکیان دا بە ئەبوسیر. گەورەکانی ئەو ڕۆژە کە هاتنە گەرما چوارسەد کەس بوون.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی نۆسەد و سی و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! ئەوەی لە لایەن گەورەکانی دەوڵەتەوە بە ئەبوســـیر گەیشـــت چوارهەزار دینار و چوارسـەد کۆیلە و چوارسـەد کەنیز بوو. بەڵام پادشا بە تەنیا دەهەزار دینار و دە کۆیلە و دە کەنیزی پێشـکەش کرد. ئینجا ئەبوســـیر چوو لە بەرابەر پادشـــادا کڕنۆشـی برد و گوتی: «پادشـای بەخت بەرز، ئەو هەموو کۆیلە و کەنیزە لە کوێ بکەم؟» پادشـا گوتی: «ئەمن بۆیە ئەوەم بە گەورەکانی وڵات گوت، هەتا ئەتۆ ماڵێکی زۆرت بۆ کۆ بێتەوە تا ئەگەر ویستت بچییەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت بە دەستی پڕ بچییەوە و لە شارەکەی خۆت بە خۆشـی و کامەرانی بژی.» ئەبوسـیر گوتی: «پادشـام، ئەگەر بکرێ لە جێی ئەو هەموو کۆیلە و کەنیزە، پارەم دەنێ بۆ من زۆر باشـــتر دەبێ. چونکە ئاوا ئەوەی پەیدای دەکەم دەبێ بیدەم بە خواردەمەنی بۆ ئەوان.» پادشـــا گوتی: «ڕاســـتە ئەوان بۆخۆیان لەشـکرێکن. ئەوانە بە تۆ تێر نابن. دەی کە وایە یەکی بە سـەد دینار بە منیان بفرۆشـە.» ئەبوسـیر گوتی: «زۆر باشـە ئەوە بەوەندە بە تۆم فرۆشـت.» لەڕێوە پادشـا فەرمانی بە خەزێنەدارەکەی دا، پارەکەی بۆ بێنن.

خەزێنەدار پارەکەی هێنا و نرخی تەواوی ئەوانی دا. پادشـــاش ئەوانی بە گەورەکانی خۆی بەخشـــییەوە و گوتی: «هەر کەســـەی کۆیلە و کەنیزی خۆی بەرێتەوە بۆ خۆی. ئەبوسـیر گوتی: «پادشـا، یاخودا هەر حەسـاوە بی. وا منت لە دەسـت ئەوانە ڕزگار کردە. دەنا ئەمن قەتم ئەوانە پێ بەخێو نەدەکرا.» پادشـا بە قسـەکەی پێکەنی. دوای ئەوەن لەگەڵ گەورەگەوەرکانی دەوڵەت لە گەرماو وەدەر کەوتن و بەرەو کۆشـک ڕۆیشـتن. ئەو شـەوە ئەبوســـیر بە دڵێکی خۆشـــەوە زێڕەکانی بژارد و لە هەنبانەی کرد و لاک و مۆری کردن. چوار کۆیلە و چوار کەنیزی لە لا بوو. کە ڕۆژ بووەوە، ئەبوســـیر گەرمـاوی کردەوە و جارچی نارد جاڕی دا هەرکەس دێ بۆ گەرماو بێ و لە قەدەر توانایی خۆی هەقی گەرماو بدا. زۆری لە کەس ناکرێ.

ئەوجار ئەبوسیر لە لای سندووقەکە دانیشت و خەڵک بە لێشاو ڕوویان لە گەرماو کرد. لە چونە دەردا هەرکەس لە قەدەر خۆی پارەی لە سـەر سـندووقەکە دادەنا. هێشـتا نەببوو بە شـەو سـندووقەکە پڕ بوو لە زێو. دوای ئەوە شـاژن ویسـتی بچێ بۆ گەرماو. ڕۆژەکەی لە نێوان ژن و پیاودا دابەش کرد. بەیانیان بۆ پیاوان بوو، دوانیوەڕۆیان تایبەتی ژنان بوو. کاتێک شـاژن هات بۆ گەرماو، ئەبوسـیر کەنیزێکی لە سـەر سندووقەکە دانابوو. چوار دانە کەنیزیشـی فێری کاری لفکە و کیسـە لێدان و کاری تاشـین کردبوو. بۆ کارکردن لە بەشـی ژنان. کاتێک شـــاژن هات بۆ گەرماو. شـــاگەشـــکە بوو هێندەی بە دڵ بوو. کە تەواو بوو

هەزار دیناری لە سەر سندووقەکە دانا. هەواڵی گەرماو لە شاردا دەنگی دابووەوە. هەر کەس لە گەرماو دەهاتە دەرێ، هەژار بایە یا ساماندار، ڕێز و خۆشەویستیان بۆ ئەبوسیر دەردەبڕی و قەدریان دەگرت. خێر و بەرەکەت لە هەموو لایەکەوە ڕووی لە ئەبوسیر کردبوو. پادشا حەوتووی ڕایەک دەهات بۆ گەرماو و هەزار دیناریشی دەدا بە ئەبوسیر. ڕۆژەکانی دیکە گەورەکانی دەوڵەت و دەوڵەمەند و ساماندار و خەڵکی هەژار و ئاسایی دەهاتن. ئەبوسیر لەگەڵ خەڵک زۆر بە نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی هەڵسوکەوتی دەکرد. بە ڕێکەوت قیبتانی پادشا کە لە کەشتییەکەدا چاکەی لەگەڵ ئەبوسیر کردبوو. هات بۆ گەرماو. ئەبوسیر جلەکانی داکەند و لەگەڵی چووە ناو گەرماو و گەرمخانەکەوە. جوان شۆردی و شێلایی و خۆشەویستییەکی زۆری لەگەڵ نواند. کە هاتە دەرێ شەربەت و قاوەی بۆ هێنا. کاتێک قیبتان ویستی شتێک بدا ئەبوسیر سوێندی خوارد هیچی لێ وەرنەگرێ. قیبتان سەری لەو هەموو جوامێری و پیاوەتییەی سووڕ ما. ئەبوسیر ئاوای لێ هات.

با سەرێکی ئەبوقیر بدەینەوە. ئەبوقیر بیستییەوە کە خەڵک هەموو باسی گەرماو دەکا. گەرماو بووەتە وێردی سەر زاری خەڵک. دەڵێن گەرماو باشترین نیعمەتی دونیایە کە تا ئێستا ئەوان نەیانبووە و نەیاندیوە. ئەبوقیر لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمنیش دەبێ بچمە ئەو گەرماوە و چاوێکی لێ بکەم.» ئیدی جلوبەرگی گرانبایی و شکۆداری لە بەر کرد و سواری یەسترێک بوو. چوار کۆیلە لەلای ڕاست و چەپییەوە دەڕۆیشتن. هەتا گەیشتنە گەرماو. لەوێ لە یەسترەکە دابەزی. بۆنی عوودی بۆ هات. سەیری کرد تاقمێک لە گەرماو دێنە دەرێ و تاقمێک دەچنە ژوورێ. کە چووە ناو گرماوەکە سەیری کرد، گەورەکانی دەوڵەت لەوێ لە سەر سەکۆکان دانیشتوون.

ئەبوسیر چاوی پێی کەوت. لەڕێوە لەبەری هەستا و خۆشحاڵ بوو. ئەبوقیر پێی گوت: «جا هاوڕێیەتی و دۆستایەتی ئێمە ئاوا بوو، کە من کارگەم داناوە و بوومە مامۆستای ئەو شارە و ناوبانگم گەیشتووەتەوە لای پادشا و لە گەورەیی و بەختەوەری نیزیک بوومەوە، کەچی تۆ نایەی و هەواڵێکم ناپرسی و ناڵێی ئەرێ هاوڕێیەکم هەبوو چی لێ بەسەر هات؟ ئەمن ئەوەندەت لێ گەڕام جاڕس بووم. هەموو ڕۆژێک کۆیلە و نۆکەرەکانم دەنارد بە دواتدا. کاروانسەراکان دەگەڕان کەچی هەواڵێکی تۆیان گیر نەدەکەوت. ئەبوسیر گوتی: «ئەمن بووم هاتمە لای تۆ و ئەتۆ بە دزت لە قەڵەم دام و لێت دام. لە نێو خەڵکدا ئابڕووت بردم. ئەبوقیر خۆی نارەحەت کرد و گوتی: «ئەو قسانە چییە مەگەر تۆ هەر ئەو کەسە بووی کە لێم دای؟» ئەبوسیر وەڵامی داوە: «بەڵێ من بووم.» ئەبوقیر زۆری سوێند خوارد کە نەمناسیوییەوە. بەڵام کەسێک بوو شێوەی تۆی دەدا و هەموو ڕۆژێ دەهات شتی خەڵکی دەدزی. پێم وا بوو تۆ ئەوی. ئەبوقیر وای پێشان دەدا کە پەشیمانە و هەر بە

دەسـتێکی لە پشـتی دەسـتەکەی دیکەی دەدا و داخم و ڕۆی بوو. دەیگوت: «ئەمن خراپەم لەگەڵ کردی. بەڵام تۆ دەبا خۆت بە من ناساندبا و گوتبات من فلانکەسم. هەڵە لە خۆتەوە بووە خۆت نەناسـاندووە. ئەوەندەش سـەرقاڵی کار بووم، هۆشـم بە لای خۆمەوە نەبوو. ئەبوسـیر گوتی: «خودا لێت خۆش بێ، ئەوە قسـمەتی من بووە. ئێسـتا برۆ ژووری خۆت بشـــووە.» ئەبوقیر گوتی: «ئەوە چۆناوچۆن ئاوا پلەوپایەت چووە ســـەرێ و بەختەوەر بوویت؟» ئەبوسیر گوتی: «ئەو خودایەی ئەتۆی ئاوا لێ کرد، دەرکی ڕەحمەتیشی بە سەر مندا کردەوە. ئەمن چوومە لای پادشا و هانمدا گەرماوێک ساز بکا و بۆخۆشم چاوەدێری دەکەم. پادشاش وەستا ئەندازیاری دامێ و دروستمان کرد.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! ئەبوقیر بە ئەبوســـیری گوت: «هەر وەک چۆن تۆ لای پادشـــا ناســـراوی منیش ناســـراوم. بزانم ئیشـەڵلا کارێک دەکەم قەدر و ڕێزی تۆ لە لای پادشـا بەرمە سەرێ. بەشکوو بە هۆی منەوە تۆشی خۆش بوێ. چونکە تا ئێستا نەیزانیوە کە تۆ هاوڕێی منی. ئەمن ئاگاداری دەکەمەوە کە تۆ هاوڕێی منی و تۆی پێ دەسـپێرم. ئەبوسـیر گوتی: «پێویست بە ڕاسپاردنی تۆ ناکا، نێوانی ئێمە زۆر لەوە خۆشترە کە تۆ ڕامسپێری. پادشـــا و گەورەکانی دەوڵەت منیان زۆر خۆش دەوێ. چاکەی ئاوا و ئاوایان لەگەڵ من کردووە. ئیدی تەواوی بەســـەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕاوە. دوای ئەوە گوتی: «جلەکانت داکەنە و لە سـندووقی خە. بچووە خۆت بشـۆ ئەوە منیش دێم کیسـەت ڕێدەخەم. ئەبوقیر جلەکانی داکەند و چووە گەرماوەکەوە. ئەبوسـیریش بە دوایدا چوو، کیسـەی ڕێخسـت و سـابوونی لێ دا و جوان شـــۆردی هەتا تەواو بوون و هـاتنەدەرێ. ئەوجـار ناردی خواردەمەنی و شەربەتی بۆ هێنا. تەواوی خەڵک پێیان سەیر بوو ئەوەندەی قەدری ئەبوقیر گرت. دوای ئەوە ئەبوقیر ویسـتی شـتێکی بداتێ. ئەبوسـیر سـوێندی خوارد هیچی لێ وەرنەگرێ و گوتی: «تریق بەوە لەکنەخۆی تۆ هاوڕێی منی و من و تۆ چ جیاوازییەکمان نییە.» دوای ئەوە ئەبوقیر گوتی: «کـاکە گیـان ئەو گەرمـاوەی تۆ قـازانجی زۆرە بەڵام کەموکووڕیشـی هەیە.» ئەبوسـیر گوتی: «کاکە گیان کەموکووڕی چی؟» ئەبوقیر وڵامی داوە: «زەڕنیخ و قسڵە، کە مووی لەش دادەماڵێ و بە ئاسـانی خاوێنی دەکاتەوە. ئەتۆ ئەو دەرمانە دروست بکە و ئەگەر پادشا هات بیدەیە و پێی بڵێ کە چۆن مووی لەش دادەماڵێ و خـاوێنی دەکـاتەوە. ئەگەر ئەوەت کرد، ئیـدی زۆری خۆش دەوێی و قەدەرت دەبـاتە سـەرێ.» ئەبوسـیر گوتی: «ڕاسـت دەکەی، زۆر باشـە. ئیشـەڵلا وا دەکەم و دەچم سـازی دەکەم. دوای ئەوە ئەبوو قیر هاتە دەرێ و سـواری یەسـترەکەی بوو ڕاسـت چوو بۆ لای پادشـــا و پێی گوت: «پادشـــا ئەمن تۆم خۆش دەوێ و لە ســـەر قازانجی تۆم. دەمەوێ ئامۆژگارییەکت بکەم.» پادشـا گوتی: «بیڵێ بزانم ئامۆژگارییەکەت چییە؟» ئەبوقیر گوتی: «بیستوومە گەرماوت دروست کردووە.» پادشا گوتی: «وایە، کابرایەک هات و چیم لەگەڵ تۆ کرد لەگەڵ ئەویشـم کرد. ئەویش گەرماوێکی باشـی داناوە و ئێسـتا شـارەکە بە بۆنەی ئەوەوە ڕازاوەتەوە.»

ئەبوقیر گوتی: «چوویە ئەو گەرماوەوە یان نا؟» پادشا گوتی: «ئەرێ چووم.» ئەبوقیر گوتی: «خۆدا شـــوکوور ئەو گڵاوە هیچ بەڵایەکی بە ســـەر نهێناوی، بەڵام ئەگەر ئەوجار بچییەوە دەتکوژرێی.» پادشـــا گوتی: «لەبەر چی دەکوژرێم؟» ئەبوقیر گوتی: «ئەو پیاوە، دوژمنی تۆش و دوژمنی دینیشە. ئەو گەرماوەی بەس لەبەر ئەوە داناوە تۆ دەرمانداو بکا.

ئێستا شتێکی بۆ ساز کردووی کە ئەگەر چووی بۆ گەرماو بۆت دێنێ و دەڵێ ئەو دەرمانە مووی لەش لێ دەکاتەوە. لە ڕاستیدا ئەوە دەرمان نییە بگرە ئەوە ژهرێکی کوشندەیە. ئەو گلاو بەڵێنی بە پادشـــای گاوران داوە کە ئەگەر تۆ بکووژێ، ئەوە ژن و منداڵەکەی کە لە لای ئەوان دیلن، بەر دەدا. ئەمنیش لەوێ دیل بووم بەڵام کارگایەکم دروســـت کرد. ڕەنگی جۆراجۆرم بۆ لە شـتەکانیان دا. پادشـا منی وەبەر دڵی کەوت و لەگەڵم باش بوو. ڕۆژێک لێی پرسیم: «چیت دەوێ بدەمێ؟» منیش گوتم: «پێم خۆشـە ئازادم کەی.» پادشا ئازادی کردم و منیش هاتم بۆ ئێرە. ئێســـتا ئەو گلاوەم لە گەرماو دیت. لێم پرســـی: «ژن و منداڵەکەت چیـان لێ هـاتەوە؟» گوتی: «منیش لەگەڵ ژن و منداڵەکەم بەند کرابووم. تا ڕۆژێک پادشـای گاوران منی بانگ کرد بۆ دیوەخانەکەی. ئەمن لەوێ لەگەڵ هێندێکی دیکە ڕاوەستابووم. گوێم لێ بوو نێوی پادشایانیان دێنا. هەتا وا بوو ناوی پادشای ئەو شارەی هێنا. پادشـای گاوران ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: «لە دونیادا هیچ پادشـایەک بە سـەر مندا زاڵ نەبووە پادشـای ئەو شـارە نەبێ. هەرکەس ئەوم بۆ بکوژێ. ئەمن تەواوی ئاواتەکانی بۆ وەدەی دێنم. ئیدی من چوومە پێشـــێ و پێم گوت کە ئەگەر من ئەو بکوژم تۆ ژن و منداڵەکانی من ئازاد دەکەی؟ پادشـــا وەلامی داوە ئەرێ ئێوە ئازاد دەکەم و هەرچی بشـتانهەوێ دەتاندەمێ. ئیدی لەگەڵ پادشـای گاوران لە سـەر ئەوە ڕێک کەوتین. ئەوجار پادشـا منی سـواری کەشـتییەک کرد کە دەهات بۆ ئێرە. ئەمن چوومە لای ئەو پادشـایە و گەرماوم بۆ سـاز کرد. ئێســتا کارێکم نەماوە جگە لەوەی کە ئەو بکوژم و بگەڕێمەوە بۆ لای پادشـای گاوران و ژن و منداڵەکەم ئازاد بکەم.» منیش لێم پرسـی: «بە تەمای چۆنی بکوژی؟» گوتی: «ڕێگایەکی ئاسـانم بۆ دیوەتەوە. شـتێکی ژەهراویم سـاز کردووە، کاتێک پادشـا هات بۆ گەرماو پێی دەڵێم ئەو دەرمانە لە خۆت هەڵسـوو تا مووی لەشـت خاوێن کاتەوە و ڕایماڵێ. کاتێک پادشا ئەو دەرمانەی لە جەستەی خۆی هەڵسوێ دەیکوژێ. پادشا ئەمن هەر کە ئەو قسـەیەم بیسـت نیگەرانی تۆ بووم. هەر بۆیە هاتم تا جەنابت لەو پیلانە ئاگادار کەمەوە.»

پادشـا کە ئەو قسـەیەی بیسـت، تووڕە بوو. بە ئەبوقیری گوت:«ئەو قسـەی لای کەس نەدرکێنی.» دوای ئەوە چوو بۆ گەرماو تا شـــتەکەی بۆ ڕوون بێتەوە. کاتێک چوو بۆ گەرماو جلەکانی داکەند. ئەبوسـیریش بە پێی عادەتی خۆی لەگەڵ پادشـا چووە ژووری و جوان گیانی شـوت. دوای ئەوە گوتی: «پادشـا، ئەمن دەرمانێکم بۆ خاوێنکردنەوەی تووکی لەش سـاز کردووە. پادشـا گوتی: «کامەیە؟» ئەبوسـیر دەرمانەکەی هێنا. پادشـا کە بۆنی ناخۆشـــی دەرمانەکەی بۆ هـات. لێی ڕوون بووەوە کە ژەهری تێکەڵاو کردووە. لەڕێوە تووڕە بوو، بانگی پیاوەکانی کرد بێن بیگرن و قۆڵبەسـتی کەن. ئەبوسـیریان گرت. پادشـا زۆر بە تووڕەییەوە چووە دەرێ. بەڵام کەس نەیزانی بۆ تووڕەیە. هێنـدە تووڕە بوو،

نەیتوانی هۆکاری تووڕەبوونەکەی بە کەس بڵێ. کەسیش زاتی ئەوەی نەبوو پرسیاری لێ بکا. دوای ئەوە لە دیواندا دانیشت و ئەبوسیریان بە دەست بەستراوی هێنا هەنتەشی. دوای ئەوە پادشا، داوای کرد قیبتانی بۆ بانگ بکەن. کە قیبتان هات پێی گوت: «ئەو گلاوەی بخەنە ناو خێگەیەکەوە و زارکەکەی ببەستن و لە نێو لۆتکەیەکدا دایبنێن. لۆتکەکەی بێننە خوار کۆشکەوەوە. کاتێک منت دیت لە بەرجەوەندی کۆشکەوە ئاگام لێیە پێم بڵێ لە دەریای هاوێم یان نا. ئەمن پێت دەڵێم تێی هاوێ. لەڕێوە بیهاوێ دەریاوە با بۆخۆی بخنکێ.»

قیبتان گوتی: «باشە بە چاوان.» دەسبەجێ ئەبوسیری برد و چوو بۆ دورگەیەک کە لەو سەری کۆشکی پادشا بوو. پێی گوت: «کاکە گیان، ئەمن جارێک لە گەرماو هاتمە لای تۆ . زۆرت قەدر گرتم و میوانداریت کردم. بە دیتنت زۆر خۆشحاڵ بووم. ئەتۆ سوێندت خوارد پارەم لێ وەرنەگری. ئەمن قەرزداری خۆشەویستی تۆم. ئێستا چ شتێک لە نێوان تۆ و پادشادا ڕووی داوە پێم بڵێ. چیت کردووە وا پادشا ئاوا تووڕە بووە و بە منی گوتووە تۆ بەو دەردە بەرم. ئەبوسیر گوتی: «بە خودا من هیچ کارێکی خراپم نەکردووە. هیچ گوناحێک لە خۆمدا شک نابەم. تا ئاوام لێ بکەن.»

لێرەدا کازیوەی بەیانی دیاری دا. شەهرزاد دەستی لە چیرۆکەکە هەڵگرت و پاشماوەکەی هەڵگرت بۆ شەوی دوایی.

## که شەوی نۆسەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! قیبتان بە ئەبووسیری گوت: «ئەتۆ لە لای پادشا، قەدر و ڕێزێکی تایبەتت هەبوو. ڕەنگە کەسێک ئێرەیی پێ بردبێتی و چووبێ قسەی بۆ هەڵبەستبێتی و پادشای لێ تین دابێ. بەڵام نارەحەت مەبە، چونکە ئەتۆ نەدی و نەناسیاو ئەو ڕێزەت لە من گرت، منیش تۆ ڕزگار دەکەم. بەڵام جارێ لێرە بە، هەتا پاپۆڕی وڵاتی خۆت دێتە ئێرە و بەواندا بەڕێت دەکەمەوە. ئەبووسیر دەستی قیبتانی ماچ کرد و شوکری خودای کرد. دوای ئەوە قیبتان بەردێکی چەند مەنی خستە خیگەیەکەوە و گوتی: «بە پشتیوانی خودا.» ئەوجار داو و قولاپی بۆ ئەبووسیر هێنا و پێی گوت: «بۆخۆت ماسی بگرە. ماسی گرتن لە سەر منە، بەڵام ئەورۆ بە هۆی ئەو بەڵایەی بۆ تۆ هاتووەتە پێشێ. ناتوانم ماسی بگرم. ڕەنگە چێشت لێنەر بێ بۆ ماسی. ئەگەر ماسیت گرت بۆ چێشتلێنەرەکەی بنێرە. با ئەمن بچم لە خوار کۆشکەوە ئەو کارە جێبەجێ بکەم و وای نیشاندەم کە تۆ لە دەریا داوێم.» ئەبووسیر گوتی: «ئەتۆ برۆ خەمت نەبێ. ئەمن ئەو ماسیانەی دەیگرم دەینێرم بۆ چێشتلێنەرەکە.» قیبتان خیگەکەی خستە لۆتکەیەک و بردییە خوار کۆشکەوە بە جۆرێک لە بەرجەوەندی شاوە دیار بێ. چاوی لە سەرێ کرد پادشا لەوێ دانیشتبوو. هەرای کرد: «پادشا تێی هاوێم یان نا؟» پادشا بە دەست تێی گەیاند کە تێی هاوێ. لەو جەنگەیەدا شتێک کەوتە دەریاوە، ئەو شتە کلکەوانەکەی پادشا بوو. ئەو کلکەوانەیە تەلیسمێکی لە سەر بوو. کاتێک پادشا ڕقی لە کەسێک هەڵدەستا دەیویست بیکوژێ. بە دەستی ڕاستی کە کلکەوانەکەی تێدا بوو، ئاماژەی بۆ ئەو کەسەکە دەکرد. لە کلکەوانکەوە تیشکێکی ئاورین لەو کەسە دەدرا و دەیسووتاند. لەشکرەکەشی لە ترسی ئەو تیشکە گوێڕایەڵی بوون. ئەو پادشایە بە بۆنەی ئەو ئەنگوستیلەوە بە سەر تەواوی پادشاکانی دەوروبەریدا زاڵ بوو. هەر بۆیە کاتێک کلکەوانەکە لە دەریا کەوت، لای کەس دەنگی نەکرد. لە ترسی لەشکرەکەی نەیوێرا بڵێ شتێکی وام بە سەر هاتووە. لێرەدا پادشا ئاوای لێ بەسەر هات.

ئەبووسیر دوای ڕۆیشتنی قیبتان، تۆڕی لە دەریا هاویشت کە دەری کێشاوە پڕ بوو لە ماسی. دیسان تۆڕی لە دەریا هاویشتەوە. ئەو جارەش کە دەری کێشاوە هەموو جۆرە ماسییەکی تێدا بوو. ئیدی هەر ئاوا بەردەوام تۆڕی تێدەهاویشت و ماسی دەگرت. تا وای لێهات کۆگایەکی ماسی لە پێش خۆی هەڵدابووەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «لە مێژە ماسیم نەخواردووە.» ئیدی ماسییەکی گەورەی لە نێو ماسییەکان هەڵبژارد و گوتی ئەگەر قیبتان بێتەوە پێی دەڵێم: ئەو ماسییەم بۆ سوور کاتەوە. ئیدی بە وێردێک زگی ماسییەکەی دڕی خاوێنی کاتەوە. سەیری کرد ئەنگوستیلەکەی پادشا لە زگی ماسییەکەدا بوو. لە ڕێوە ئەنگوستیلەکەی لە قامکی کرد. خەبەری لە کاریگەریی ئەو ئەنگوستیلەیە نەبوو. لەو

جەنگەیەدا دوو کەس لە بەردەستەکانی چێشتلێنە هاتن بۆ ماسی. بە ئەبووسیریان گوت: «کاکە قیبتان چوو بۆ کوێ؟» ئەبووسیر بە دەستی ڕاستی ئاماژەی بۆ کۆیلەکان کرد و گوتی: «نازانم.» لە ڕێوە بوون بە خەڵووز و لەوێ کەوتن.

ئەبووسیر سەری سووڕ ما و گوتی: «خۆزگە بمزانیبایە ئەوانە کێ کوشتنی؟» لەو فکرەدا بوو. کە قیبتان هاتەوە. سەیری کرد کۆگایەک ماسی لەوێ هەڵدراوەتەوە و تەرمی دوو کەسیش لەوێ کەوتووە. ئەنگوستیلەکەشی لە قامکی ئەبووسیردا دیت. بە ئەبووسیری گوت: «کاکە دەستت مەجووڵێنەوە دەنا منیش دەکوژی.» قیبتان هاتە پێشێ و لە ئەبووسیری پرسی: «ئەوە کێ ئەو دوو کۆیلەیەی کوشت؟» ئەبووسیر گوتی: «من نازانم.» قیبتان لێی پرسی: «ئەو ئەنگوستیلەیە بۆ بە تۆیە؟» ئەبووسیر وڵامی داوە: «ئەوم لە زگی ئەو ماسییەدا دیتەوە.» قیبتان گوتی: «بە ڕاستتە؟ ئەوە پادشا ئەو جەنگەیەی بە دەست فەرمانی بە من دا، خێگەکە لە دەریا هاوێم، شتێکم بە حەواوە دی تروسکاوە و کەوتە دەریاوە. کەوایە ئەوە کلکەوانەکەی پادشا بووە. ئەو ماسییە قوتی داوە و بە قسمەت تۆ بووە. بەڵام تۆ نازانی ئەو کلکەوانەیە چ تایبەتمەندییەکی هەیە.» ئەبووسیر گوتی: «ناوەڵڵا نازانم.» قیبتان گوتی: «ئەو ئەنگوستیلەیە جادووییە. ئەگەر پادشا ڕقی لە هەرکەسێک هەستێ ئەوە بەو دەستەی ئەو ئەنگوستیلەیەی تێدایە ئاماژەیەکی بۆ دەکا لەڕێوە دەیکا بە خەڵووز. ئەوە لەشکر لە ترسی ئەو ئەنگوستیلەیە ناوێری پەل ببزێون و سەرپێچی بکەن.» ئەبووسیر خۆشحاڵ بوو. بە قیبتانی گوت: «ئەمن بەرەوە لای پادشا.» قیبتان گوتی: «زۆر باشە تۆ دەبەمەوە لای پادشا. تازە نیگەرانی ئەوە نیم پادشا شتێکت لێ بکا. چونکە ئەگەر تۆ ئیشتیات لێ بێ بە ئاماژەیەک دەیکوژی. ئەگەر پێشت خۆش بێ دەتوانی تەواوی لەشکرەکەی لە بەین بەری.» دوای ئەوە قیبتان ئەبووسیریشی سواری لۆتکە کرد و گەڕانەوە بۆ نێو شار.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی نۆسەد و سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە قیبتان ئەبووسیری بردەوە نێو شار، ئەبووسیر چووەوە لای پادشا. سەیری کرد پادشا دانیشتووە و ئەمیر و شتی لەشکریش لە دەوری وێستاون. پادشا مات و مەلوولە و ناشوێرێ باسی ئەنگوستیلەکەی بکا. پادشا کە چاوی بە ئەبووسیر کەوت گوتی: «مەگەر تۆمان لە دەریا نەهاویشت. ئەوە چۆن هاتوویەوە دەرێ؟!!» ئەبووسیر وڵامی داوە کاتێک فەرمووت من لە دەریا هاوێن. قیبتان منی برد بۆ دوورگە. لەوێ لێی پرسیم: «پادشا تۆی خۆش دەویست ئەوە چۆناوچۆن بوو ئاوا ڕقی لێت هەستا؟» ئەمنیش گوتم: «ئەمن هیچ گوناحێک لە خۆمدا شک نابەم.» قیبتان گوتی: «ڕەنگە کەسێک ئێرەیی بە تۆ بردبێ و لە لای پادشا بۆ تێ چاندبێت[1] و تۆی لە لای پادشا ڕەش کردبێ وا لێت قەڵس بووە. قیبتان گوتیشی چونکە تۆ لە گەرماو زۆرت قەدری من گرت، منیش پێم خۆشە ڕزگارت کەم. ئیدی منی هێناوە بۆ نێو شار. لە جیاتی من بەردێکی گەورەی خستبووە ناو خیگەکە و لە دەریای هاویشتبوو. جا لەو جەنگەیەدا کە تۆ ئاماژەت پێ کردبوو کە خیگەکە لە دەریا هاوێ، ئەنگوستیلەکەی جەنابت لە قامکت پەڕیبوو کەوتبووە دەریاوە. ماسییەکیش قووتی دابوو. منیش لە دوورگەکە خەریکی ماسی گرتن بووم کە ئەو ماسییە هاتبووە ناو تۆڕەکەمەوە. وابوو دوایە ویستم ماسییەک سوور کەمەوە کەچی لە سەر ئەو هەموو ماسییە ڕاست ئەو ماسییەم وەبەر دەست هات. کاتێک زگیم دڕی خاوێنی کەمەوە کلکەوانەکەی جەنابتم لە نێو زگی ئەو ماسییەدا دیتەوە. منیش لە قامکم کرد. لەو جەنگەیەدا دوو کۆیلەی بەردەستی چێشتلێنەرەکە هاتن. ئەمن خەبەرم لە کاریگەریی ئەو کلکەوانەیە نەبوو. دەستم بۆ لا ڕاداشتن. لەڕێوە هەردووکیان بوون بە خەڵووز. دوای ئەوە قیبتان هات و کلکەوانەکەی ناسییەوە و منیشی لە کاریگەرییەکەی ئاگادار کردەوە. ئێستا ئەوە بۆم هێناوییەوە چونکە زۆرت چاکە بۆ من بووە. جا ئەگەر دەزانی من تاوانبارم پێم بڵێ تاوانەکەم چییە و هەر ئێستا بمکوژە.»

دوای ئەوە ئەبووسیر ئەنگوستیلەکەی لە قامکەی دەر هێنا و دایەوە بە پادشا. پادشا ئەنگوستیلەکەی لێ وەرگرت و لە قامکی کردەوە. لە خۆشیان گیانێکی دیکەی هاتەوە بەر. هەستا ئەبووسیری لە ئامێز گرت و گوتی: «کاکە تۆ ڕەسەنت پاکە. ئەگەر من لەگەڵت خراپ بووم لێم ببوورە.» ئەبووسیر گوتی: «پادشا ئەگەر دەتهەوێ من لە تۆ خۆش بم، ئەوە پێم بڵێ ئەمن چ تاوانێکم کردووە.» پادشا گوتی: «بە خودا ئەتۆ هیچ تاوانێکت نییە. بەڵام ئەوەی پێی کردم، ڕەنگرێژ پێی کرد.» ئیدی ئەوەی کابرای ڕەنگرێژ پێی گوتبوو،

---

[1]. بۆ کەسێک تێ چاندن: واتە بوختان و قسە بۆ هەڵبەستن.

هەمووی بۆ ئەبووسـیر گێڕاوە. ئەبووسـیر سـوێندی بۆ خوارد کە ئەو پادشـای گاوران ناناسێ و لەوەتی هەیە نەچووەتە شاری گاوران و قەتی بیر لە کوشتنی ئەو نەکردووەتەوە. گوتی: «لەگەڵ ئەو ڕەنگڕێژە خەڵکی شـارێکین لەوێ جیران دووکان بووین. کار و شـت کەم بوو گوزەرانمان نەبوو. ناچار هەستاین ڕێی هەندەرانمان گرتەبەر... .»

بەو جۆرە تەواوی ڕووداوەکانی خۆی و ئەبووقیری ڕەنگڕێژی بۆ گێڕاوە. ئینجا گوتی: «پادشـا ئەو دەرمانەش هەر ئەو فێری منی کرد. گوتی ئەو گەرماوەی تۆ لە هەموو بارێکەوە ڕێکوپێک و تەواوە، تەنیا شـتێکی کەمە ئەویش ئەو دەرمانەیە. گوتیشـی ئەو دەرمانە خراپیش نییە و ئێمە لە لای خۆمان هەر لەوە دەکار دەکەین. بەڵام من ئەوەم لە بیر نەبوو. کاتێک ڕەنگڕێژ هات بۆ گەرماو وەبیری هێنامەوە. جا ئێستا پادشـا، دەرکەوانی فڵان کاروانسـەرا بانگ کە ئەوانەی من بۆ تۆم گێڕاوە لەویش بپرسە بزانە وایە یان نا؟» پادشـا ناردی دەرکەوانەکەیان هێنا و بەسـەرهاتی ئەبووسـیر و ئەبووقیری لێ پرسـی. دەرکەوانەکە ئەوەی دیتبووی هەمووی بۆ پادشـا گێڕاوە. پادشـا فەرمانی دا بچن ڕەنگڕێژەکە بە قۆڵبەسـتکراوی و قاچ و سـەری ڕووتەوە بێنن. ڕەنگڕێژە خۆشـحاڵ بەوەی کە ئەوە ئەبووسـیر کوژراوە لە ماڵە خۆی پاڵی دابووەوە کە پیاوەکانی پادشـا بۆی چوونە ژوورێ و قۆڵبەستیان کرد و بردیان بۆ لای پادشـا. سـەیری کرد ئەوە ئەبووسـیر لە لای پادشا دانیشتووە و دەرکەوانی کاروانسەراش لەوێ ڕاوەستاوە. دەرکەوانی کاروانسەرا لە ئەبووقیری پرسی: «مەگەر ئەوە هاوڕێی تۆ نییە وا درەمەکانیت دزی و ئەوت بە نەخۆشی لە دیوێکدا بەجێ هێشـتوو و دەرگەکەشت لە سـەر داخسـتبوو؟» لێرە دا ئاکارە دزێوەکانی ئەبووقیر بۆ پادشا ڕوون بووەوە. پادشا گوتی: «بیبەن ئەتکی کەن و بە کۆڵانەکانی شاردا بیگێڕن و پاشان لە دەریای هاوێن.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و چلەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! لێرەدا ئەبووسیر گوتی: «پادشا ئەگەر بە قسەی من دەکەی ئەوە من لێی خۆش بووم.» پادشـــا گوتی: «ئەتۆش لێی خۆش بی ئەمن لێی خۆش نابم.» ئیدی بردیان بە نێو شاردا گێڕایان و پاشان لە خیگەیەکیان خست و لە دەریایان هاویشت. دوای ئەوە پادشـا بە ئەبووسـیری گوت: «پێم بڵێ چ داوایەکت هەیە.» ئەبووسـیر گوتی: «تکام ئەوەیە بمنێرییەوە بۆ وڵاتەکەی خۆم ئیدی تاقەتم نەماوە لێرە بمێنمەوە.» پادشـــا پاپۆڕێک و دیارییەکی لە ئەژمارنەهاتووی دایە. ئەبووســـیر تەواوی ماڵەکەی لە پاپۆڕەکە دا و بە کۆیلەکانی گوت: «پاپۆڕەکە باژوون.» پاپۆڕیان ئاژووت هەتا گەیشـــتنەوە شــــاری ئەسکەندەرییە.

که گەیشتنەوە قەراغاوەکانی ئەسکەندەرییە، یەکێک لە کۆیلەکانی ئەبووسیر خیگەیەکی گەورەی دیت کە بە ســـەر ئاوەکەوە بوو. بە ئەبووســـیری گوت: «گەورەم لەو قەراغە خیگەیەکی گەورەم دیت، ســـەری گیرابوو. جا نازانم چی تێدا بوو.» ئەبووســـیری ناردی هێنایان ســەریان هەڵپچڕی. ســەیریان کرد ئەبووقیری تێدایە. ئیدی دەریان هێنا و ناشتیان و گومبەزێکیان بۆ چێ کرد و لە سەریان نووسی:

چاوی چـــــــــــــاکەت لە ناچاکان نەبێ چاکە
چـاکەش بـکـا شــتـی خـوێـڕی هــــەر نـاپـاکە
گەر هـــــــــــــاوڕێی ڕەژی بی تۆ بەشت ڕەشییە
شتی ڕەش و پیست کە دی، زوو لـــــــــێی ڕاکە
چـاکەی چـۆن لە دەســـت دێ ئەو کەســـەی نـاپـاکە
بەزەی کــوێــر بــووەتەوە و گــاڵــتەی دێ بە چــاکە

### بەسەرهاتی عەبدوڵڵای ویشکایی و دەریایی

یەکی دیکە لەو بەسەرهاتانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە: ڕاوچییەک بوو بە نێوی عەبدوڵڵا کە نۆ منداڵی هەبوو. ئەو کابرایە هەژار و دەســـتەنگ بوو. جگە لە تۆڕی ماســـیگرتن هیچی دیکەی شک نەدەبرد. هەموو ڕۆژێک دەچوو بۆ قەراخ دەریا و ئەوەی وەگیری دەکەوت بۆ ژن و منـداڵەکـانی خەرج دەکرد و هیچ بۆ نەدەمـاوە. لە بەر خۆیەوە دەیگوت: «بژیوی سـبەینێش، سـبەینێ دەگا.» ئیدی ئەوە پیشـەی ئەو بوو. ژنەکەشـی هەموو سـاڵێ منداڵێکی دەبوو. هەتـا منداڵەکانی بوون بە دە دانە. ژنەکەی پێی گوت: «پیـاوەکە شـــتێک بێنەوە بیخۆین.» کابرا گوتی: «ئەورۆ لە بەختی ئەو ســاوایە دەچم بۆ قەارخ دەریا، با بەختەکەی

تاقی کەمەوە.» ژنەکەی گوتی: «لە سەر خودای.»

کابرا تۆڕەکەی هەڵگرت و بەرەو دەریا چوو. لە بەختی ئەو کوڕیە ســـاوایە تۆڕی لە دەریا هاویشت. دوای ماوەیەک دەری کێشاوە. ماسی تێدا نەبوو. جاری دووەم و سێیەم و چوارەم و... هەر تۆڕی تێ هاویشت و ماسی تێدا نەبوو. شوێنەکەی گوێستەوە و کەمێک پاڕاوە. تا شـــەو ئەوە کاری بوو، ئاخری ئێوارەیەکی درەنگ ماندوو و مردوو بە دەســـتی خاڵی گەڕاوە. زۆری پێ ســـەیر بوو. یانی خودا ئەو منداڵەی داوە و ڕزقی نادا. هەر ئاوا نابێ. ئەوە نییە دەڵێن ئەوەی ددان دەدا بژێویش دەدا. بە دڵێکی خەمبارەوە بەرەو ماڵ بووەوە. لە ڕێیەدا بە دڵیدا هات باشە ئەو شەو چی بۆ منداڵەکانم بەرمەوە. هەر ئاوا لە فکر و خەیاڵاندا بوو، گەیشـــتە بەر دەرکی نانەواخانەکە. ســـەیری کرد خەڵک ڕیز بوون بۆ نان کڕین. ڕێکەوت وا بوو لەو چەنگەیەشدا گرانی بوو، خەڵک زەمهەر و شتیان نەمابوو. زێڕ و زێویان دەدا بە نان. خەڵکەکە وایان هورووژم هێنابوو سەیر. کابرای نانەوا ئاگای لە کەس نەبوو. عەبدوڵڵا لەوێ ڕاوەســـتا بوو. بۆنی نانی گەرمی بە ســـەردا دەهات و ئیشـــتیای چووبووێ. خەریک بوو هەروا بڕوا. وا بوو کابرای نانکەر چاوی پێی کەوت. بانگی کرد: «کاکی ڕاوچی، وەرە.» عەبدوڵڵا گەڕاوە چووە پێشێ. کابرای نانکەر لێی پرســی: «مەگەر نانت ناوێ؟» ڕاوچی مات بوو. ســەری داخســت. نانکەر گوتی: «ئەوە شــەرمی بۆ چییە؟ دەنگ بکە. ئەگەر تۆ درەمێکیشـــت پێ نەبێ ئەمن نانەکەتان دەدەمێ هەر کاتێک بووت بۆم بێنە.» عەبدوڵڵا گوتی: «کاکە بە ڕاســـتی نیمە، ئێســـتا نانەکەم دەیە تا دەســـت و باڵم دەکرێتەوە. با ئەو تۆڕەش بە بارمتە لە لات بێ.» نانکەر گوتی: «کاکە دووکانی خۆتە، جا من ئەو تۆڕەت لێ بســـتێنم، ئەی بەچی شـــتێک پەیدا دەکەی؟ پێم بڵێ چەند نانت دەوێ؟» عەبدوڵڵا گوتی: «بایی پێنج درەمم بەسە.» نانکەرەکە بایی پێنج درەمی دایە و پێنج درەمی زێویشــی دایە گوتی: «بیدە بە گۆشـت بۆ منداڵەکانتی ببرژێنە. سـبەینێش بایی ئەو درەمەم ماســی بۆ بێنە. ئەگەر سـبەینێش هیچت وەگیر نەکەوت، دیسـان وەرە نان و درەمی خۆت وەرگرە هەتا دەست و باڵت دەکرێتەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی نۆسه‌د و چل و یه‌که‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشـــکۆ! ڕاوچی گوتی: «خودا جه‌زای به خێرت بداته‌وه. دوای ئه‌وه نانی برشته‌ی هه‌ڵگرت و به دره‌مه‌کان گۆشتی کڕی و چووه‌وه ماڵێ. سه‌یری کرد منداڵه‌کانی له برســـان ده‌گرین و دایکیان دڵخۆشـــیان ده‌داته‌وه و ده‌ڵێ ئێســـتا باوکتان دێته‌وه و خوارده‌مه‌نیتان بۆ دێنێته‌وه. وا بوو له‌و جه‌نگه‌یه‌دا چووه ژووری و دانیشـــتن نـان و گۆشـته‌که‌یان خوارد. دوای ئه‌وه‌ی که نانه‌که‌یان خوارد، عه‌بدوڵلا ڕووداوه‌که‌ی بۆ ژنه‌که‌ی گێڕاوه. ژنه گوتی: «خودا گه‌وره‌یه و ڕازقی ڕزقه.»

بۆ دواڕۆژ ڕاوچی ده‌ستی دا تۆڕ و له ماڵێ چووه ده‌رێ. ده‌شی گوت: «خودا ئه‌وه‌نده‌م به قسمه‌ت که‌ی له لای نانکه‌ره‌که سه‌ر بڵیند بم. که گه‌یشته ده‌ریا و تۆڕی تێ هاویشت و ده‌ری کێشاوه، هیچی پێوه نه‌هات. هه‌تا بوو به شه‌و هه‌ر تۆڕی تێ هاویشت و ده‌سکه‌وتی نه‌بوو. به دڵێکی پڕ له خه‌مه‌وه به‌ره‌و ماڵ گه‌ڕاوه. ڕێگاکه‌ی به به‌ر ده‌رکی نانه‌واخانه‌که‌دا بوو. له دڵی خۆیدا گوتی به کوێدا بڕۆمه‌وه نانکه‌ره‌که نه‌مبینێ. له پڕدا له دوور نانکه‌ره‌که چاوی پێی که‌وت و گوتی: «کاکی ڕاوچی وه‌ره نان و دره‌مه‌کانت به‌ره‌وه.» ماســـیگره‌که گوتی: «به خودا له ڕووم هه‌ڵنـایه، ئه‌وڕۆش هیچم وه‌گیر نه‌که‌وتووه.» نـانکه‌ره‌که گوتی: «ئاخر ئه‌من پێم نه‌گوتی هه‌تا شتێکت دێته ده‌ست. هه‌موو ڕۆژێ وه‌ره نان و ده‌رمی خۆت به‌ره‌وه.» دوای ئه‌وه چوو پێنج درهه‌م نان و پێنج دره‌می زێو لێ وه‌رگرت و گه‌ڕاوه ماڵێ. ژنه‌که‌شی له‌و شته ئاگادار کرده‌وه. ژنه‌که‌ی گوتی: «خودا گه‌وره‌یه ئیشه‌ڵلا ده‌رکی خێر و ڕه‌حمه‌تمان به ســـه‌ردا ده‌کاته‌وه. ئه‌و ده‌م قه‌رزی نانکه‌ری لێ بده‌وه.» ڕاوچی هه‌تا چل ڕۆژان هیچی بۆ په‌یدا نه‌بوو. به ده‌ســـتی خاڵی ده‌گه‌ڕاوه و نانکه‌ریش نان و دره‌می خۆی ده‌دایه و ده‌یگوت نان و شـــتی خۆت به‌ره‌وه، هه‌تا خودا ده‌رکی ڕه‌حمه‌تت به ســـه‌ردا ده‌کاته‌وه. ڕاوچییش دۆعای به‌خێری بۆ ده‌کرد و به‌ره‌و ماڵ ده‌بووه‌وه.

چـل و یه‌که‌مین ڕۆژ ڕاوچی به خێزانی گوت: «ده‌ڵێم ئه‌و تۆڕه بـدڕێنم و خۆمی له ده‌ســـت ڕزگار بکه‌م.» ژنه‌که‌ی گوتی: «جا بۆ وا ده‌که‌ی؟» مێرده‌که‌ی وڵامی داوه چونکه خودا ڕسقی منی له ده‌ریا هه‌ڵگرتووه‌ته‌وه. هه‌تا که‌ی هه‌ر ئاوا به ده‌ستی خاڵی بێمه‌وه؟ به خودا له خه‌جاڵه‌تی نانکه‌ر سه‌رم هه‌ڵنایه پێم خۆشه بمرم. تازه هه‌ر ناچم بۆ ده‌ریا. چونکه ڕێگه‌که‌شـــم به به‌ر ده‌رکی نانه‌واخانه‌که‌ی ئه‌و دایه. هه‌تا به‌وێدا ده‌ڕۆم بانگم ده‌کا و نان و دره‌مم ده‌داتێ. هه‌تا که‌ی لێی قه‌رز بکه‌م؟» ژنی ڕاوچییه‌که گوتی: «ســـپاس بۆ خودا که دڵی ئه‌وی نه‌رم کردووه، هه‌موو ڕۆژێ له ڕێگای ئه‌وه‌وه بژیوی ڕۆژانه‌مان بۆ ده‌نێرێ. بۆ کاره‌که تێک ده‌ده‌ی؟» کابرای ماســـیگر گوتی: «قه‌رزه‌که‌م زۆر بووه و هه‌ر بینا داوای

کردەوە.» ژنەکەی گوتی: «بۆ شـــتێکی وای گوتووە نارەحەتت بکا؟» مێردەکەی وڵامی داوە: «ناوەڵڵا، ئەو هەموو ڕۆژێ پێم دەڵێ وەرە نان و درەمی خۆت بەرەوە تا دەســـت و باڵت دەکرێتەوە.» ژنەکەی گوتی: «دەی کەوایە، خەم مەخۆ هەســـتە برۆ وەدوای کاری خۆت کەوە لە سەر خودای.» کابرا وڵامی داوە: «ڕاستە، وا دەکەم.»

دوای ئەوە دەســـتی دا تۆڕەکەی و بەرەو دەریا ڕۆیشـــت. لە بەر خۆیەوە هەر لە بەر خودا دەپاڕاوە و دەیگوت: «خودایە شتێکم بە قسمەت بکە. تەنانە ئەگەر یەک دانە ماسیش بێ، با بیبەم بۆ نانکەرەکە.» گەیشـــتە دەریا و تۆڕی تێ هاویشـــت. کاتێک ویســـتی دەرکێشـێتەوە قورس بوو. تا ئەو جێیەی بە زەحمەتێکی زۆر دەری کێشـا. کەچی سـەیری کرد کەلاکە بۆ گەنیوێکە و کەلاکی کەریشـە. زۆر نارەحەت بوو. فرێی دا ئەو لاوە و گوتی: «پەنا بۆ خودا دەبێ مەبەستی چی بێ؟ ئەمن هەرچەند بەو ژنەم گوت خودا بژیوی ئێمەی لە دەریادا هەڵگرتووەتەوە، لە کۆڵم نەبووەوە و هەر گوتی: «خودا گەورەیە و ڕســـقمان دەدا.» ئەوەش ڕســـق و بژیو، کەلاکە کەر! دوای ئەوە بەدم خەم و نـارەحەتییەوە لە شـــوێنەکەی خۆی دوور کەوتە تـا بۆنی کەلاکەکەی بۆ نەیە. لەوێ تۆڕەکەی لە دەریـا هاویشتەوە و ماوەیەک چاوەڕوان بوو. ئەوجار تۆڕەکەی ڕاکێشا. سەیری کرد قورس بوو. وردە وردە کێشـایە دەرێ تا وای لێ هات دەسـتی خوێنی لێ هات. کە تەواو هێنایە دەرێ، چاوی لێ کرد، کەسـێک بە تۆڕەکەوە هاتووە. وەیزانی دێو و جندۆکە و شـتە، هەڵات. هەتا ئەو کەسە بانگی کرد کاکی ڕاوچی ڕا مەکە منیش مرۆڤێکم وەک تۆ. وەرە من لە تۆڕە بێنە دەرێ با پاداشت دەمەوە. کابرای ماسیگر کە گوێ لەو قسەیە بوو، دڵی حەساوە و گەڕاوە لای تۆڕەکەی. لێی پرسـی: «مەگە تۆ دێو نی؟» کەچی وڵامی داوە: «کوڕە منیش مرۆڤێکم وەک تۆ. بـاوەڕم بە خودا و پێغەمبەرەکەی هەیە.» ڕاوچی پرســـی:«کێ تۆی لە دریـا هاویشتووە؟» نێچیرەکە وڵامی داوە: «ئەمن مرۆڤی دەریاییم هەر وا خەریک بوو دەگەڕام، کەوتمە ئەو تۆڕەی تۆوە و گیرم کرد. ئێمە هۆزێکین کە لە فەرمـانی خودا نـاچینە دەرێ. لەگەڵ بەندەکانی خودا دلۆڤانین. لە ترســـی خودا بموێرابایە. تۆڕەکەی تۆم دەدڕاند. بەڵام ڕازی بووم بە ویســـتی خودا و هیچم لێ نەکرد. ئێســـتا ئەگەر تۆ ڕزگارم بکەی. دەبێ بە خاوەنی من و من دەبم بە دیلی تۆ. گەلۆ پێت خۆشـــە لە ڕێی خودادا ڕزگارم بکەی؟ هەتا من و تۆ پێکەوە پەیمـانێک ببەســـتین کە هەموو ڕۆژێ ئەلێرە ئەمن بێمە لای تۆ. ئەتۆ قرتاڵەیەکم میوەی ویشکیی وەک: ترێ و هەنجیر و کاڵەک و سێو و هەنار و شتی وام بۆ بێنی و منیش مەرجان و مروارید و یاقووتی ســـوور و یاقووتی ســـەوز و گەوهەری دەریاییت بۆ بێنم. ئەو قرتاڵەیەی کە میوەکانی تێدا دێنی بۆت پڕ دەکەم لەو شـــتانە؟» کابرای ماسیگر گوتی: «ئەمن ڕازیم.» ئیدی لە تۆڕەکەی هێنا دەرێ و ڕزگاری کرد. پاشان لێی پرسی: «ئەتۆ نێوت چییە؟» گوتی: «ناوی من عەبدوڵڵای دەریاییە. هەر کە هاتییە ئێرە

من دیار نەبووم بانگم بکە و بڵێ عەبدوڵڵای دەریایی لە کوێی، ئیدی من خێرا دێمە لای تۆ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! دوای ئەوە عەبدوڵڵای دەریایی لە ماســیگرەکەی پرســی: «ناوت چییە؟» وڵامی داوە گوتی: «عەبدوڵڵا.» ئەو کابرایە گوتی: «تۆ عەبدوڵڵای ویشکایی و من عەبدوڵڵای دەریاییم. لێرە ڕاوەســـتە با من بچم دیارییەکت بۆ بێنم.» عەبدوڵایی دەریایی ئەوەی گوت و خۆی لە دەریا هاویشت. ئەوجار عەبدوڵڵای ویشکایی لە دڵی خۆیدا هەستی بە پەشــیمانبوونەوە کرد، لەوەی کە ئازادی کردبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی کە تازە قەت نایەتەوە بۆ لام. گاڵتەی پێ کردم و بەجێی هێشتم و خۆی لە دەست من ڕزگار کرد. ئەگەر من ئەوم بردبا بۆ نێو شار خەڵک دەهاتن سەیریان دەکرد و پارەیەکی باشیشیان دەدامێ. پاشـــان دەمبرد بۆ ماڵی گەورەکان. بەو جۆرە عەبدوڵڵای ویشـــکایی دەســـتی کرد بە ســـەرکۆنەی خۆی و زۆر پەشــیمان و ناڕەحەت بوو. لەو جەنگەیەدا عەبدوڵڵای دەریایی گەڕاوە بۆ لای و هەردووک دەســتی پڕ بوو لە مرواری و یاقووت و مەرجان و شــتی وا. دای بە عەبدوڵڵای ویشــکایی و گوتی: «کاکە گیان ببوورە دەفرم پێ نەبوو بۆت پڕ کەم. ئیدی عەبدوڵڵای ویشــکایی دڵخۆش بوو گەوهەر و شــتەکەی لێ وەرگرت و پێی گوت: «هەموو ڕۆژێ تاوهەڵاتی بەیانی وەرە ئێرە.» ئیدی عەبدوڵڵای دەریایی ڕۆیشـــت لە دەریاوە.

کابرای ماســیگر بە دڵێکی خۆشــەوە بەرەو شــار گەڕاوە. ڕۆیشــت هەتا گەیشــتە لای نانەواخانەکە و پێی گوت: «کاکە گیان خودا دەرکی خێر و بەرەکەتی بە ســـەردا کردمەوە. پێم بڵێ چەندت پێ قەرزبارم.» نانەواکە گوتی: «باسـی قەرز مەکە ئەگەر شـتێکت هەیە بم دەیە و ئەگەر نیتە نانەکە و پێنج درەمەکەت وەرگرە و برۆ. تا دەسـت و باڵت دەکرێتەوە.» کابرای ڕاوچی گوتی: «کاکە گیان شـــوکری خودا. لە نەبوونی ڕزگارم بووە و ئێســـتا تۆ ماڵێکی زۆرت لە لای منە، لێم وەرگرەوە.» دەســـتی برد مســـتێکی مرواری و مەرجان و لۆلۆی دایە. پێشـــی گوت: «کەمێکم دینار و درەم دەیە با خەرجی کەم. تا ئەو گەوهەرانە دەفرۆشـــم. نانکەرەکە هەرچی درەمی پێی بوو دایێ و هەرچی نانی لێشــی بوو لە ســـەر مەجۆعمەیەک بۆی دانا و گوتی: «ئەمن نۆکەری تۆم.» ئیدی سوێندی خوارد مەجۆعمەکەی بۆ هەڵگرێ. دەستی دا مەجۆعمەکە و بە دوای کابرای ڕاوچیدا ڕۆیشـت. هەتا گەیشـتنەوە ماڵێ. پاشـــان چوو بۆ بازاڕ و گۆشـت و پێداویشـــتی ماڵێی بۆ کڕین. بە گشـــتی ئەو ڕۆژە دووکانی گاڵە دا و لە خزمەت ڕاوچیدا بوو. ڕاوچی گوتی: «کاکە گیان توخودا لەوە زیاتر خەجاڵەتم مەکەوە بەســـە بچووە بە لای کارەکەی خۆتەوە. دەســـتت خۆش بێ. نانکەرەکە گوتی: «تازە خزمەتی کردنی تۆ ئەرکی منە، تۆ هێندەت چاکە لەگەڵ کردووە. ئەمن نۆکەری تۆم. کابرای ماســـیگرەش پێی گوت لە کاتی تەنگانەدا تۆ خاوەن چاکە و گەورەیی بووی.

ئیدی ئەو شەوە نانکەریش لە ماڵی ئەوان ماوە و بوون بە هاوڕێ و برادەر. ڕاوچی باسی ڕووداوەکەی خۆی و عەبدوڵڵا دەریایی و خێزانی گێڕاوە. ژنەکەی خۆشــحاڵ بوو پێی گوت: «ئەو ڕازە لە کن کەس مەدرکێنە. تا پادشــا و دەســەڵاتداران پێت نەزانن.» کابرای ڕاوچی گوتی: «ئەگەر ئەو ڕازە لە هەموو کەس بشـارمەوە لە نانکەری ناشـارمەوە.» هەر بۆیە شــەوەکی ڕاوچی چوو لە بازاڕ زەمبیلەیەکی میوەی جۆراجۆر کڕی و پێش ئەوەی تاو ســەر لە کەڵ بێنێتە دەرێ خۆی گەیاندە دەریا. کە گەیشــتە قەراخ دەریاکە بانگی کرد: «هۆی عەبدوڵڵای دەریـایی لە کوێی؟» لەڕێوە عەبدوڵڵا دەریـایی بە بەڵێ بەڵێ لە دەریا هاتە دەرێ. عەبدوڵڵای ویشکایی زەمبیلە میوەی دا بە عەبدوڵڵا دەریایی. عەبدوڵڵا دەریایی بە لەز گەڕاوە ناو دەریا. دوای ئیستێک بە زەمبیلێک گەوهەری جۆراجۆرەوە هاتە دەرێ و دایە دەســت عەبدوڵڵای ویشــکایی. عەبدوڵڵا ویشــکایی دەســتی دا زەمبیلە گەوهەرەکە و گەڕاوە بۆ ناو شار.

کاتێک گەیشــــتە بەر دووکانی نانەواخانەکە. نانکەرەکە گوتی: «گەورەم نانی جوان و یەکەم ناردووەتەوە بۆ ماڵێ. ئێســتاش ئەوە خەریکم کولێرە چەورەش دەکەم. ئەگەر تەواو بوو، بۆخۆم بۆت دێنمەوە و دوایە دەچم لە بازاڕ گۆشـت و سـەوزی و شـتت بۆ دەکڕم.» ڕاوچی سێ مستی لەو گەوهەرانە دا بە نانکەرەکە و بەرەو ماڵ بووەوە و گەوهەرەکانی لە ماڵێ دانا. هێندێک لە گەوهەرە گرانبابیەکانی هەڵگرت و چوو بۆ بازاڕی گەوهەرفرۆشــان. لە بەر دەرکی ســـەرۆکی گەوهەرفرۆشــان ڕاوەســـتا و پێی گوت: «ئەو گەوهەرانەم لێ بکڕە.» سـەرۆک گوتی: «دایەی پێشـانم بدە.» عەبدوڵڵا ویشـکایی گەوهەرەکانی پێشـان دا. سـەرۆک لێی پرسـی: «جگە لەوانە ئی دیکەشـت هەیە؟» عەبدوڵڵا وڵامی: «داوە زەمبیلێکی پڕم هەیە.» ســەرۆک لێی پرســی ماڵەکەت لە کوێوەیە؟» عەبدوڵڵا وڵامی داوە: «لە فلانە گەرەک.»

ئەوجار ســەرۆکی گەوهەرفرۆشـان زێڕ و شـتەکەی لێ ئەسـتاند و بە پیاوەکانی گوت: «ئەوەی بگرن دزە. زێڕ و گەوهەرەکانی شـاژنی دزیوە.» ئیدی بە فەرمانی سـەرۆک لێیان دا و قۆبەستیان کرد. خەڵکێکی زۆری تێ ئاڵابوو. دەیانگوت شوکری خودا دزەکەمان گرت. دەنکێک دەیگوت شتەکانی فلانەکەسیش هەر کاری ئەو گلاوەیە. هەر کەسەی بە شێوەیەک قســەی دەکرد و ڕاوچیش مات ڕاوەســتابوو هیچی نەدەگوت و وڵامی کەســی نەدەداوە. ئەویان بردە لای پادشـا. سـەرۆک گوتی: «پادشـا زێڕەکانی شـاژن ئەو گلاوە دزیوییەتی. ئەتۆ کە دزەکەت لە ئێمە ویســـتبوو. ئەمنیش هەوڵمدا دزەکە بگرم. ئیدی ئەو گەوهەرانم لەوە گرت.» پادشا بە خەساوەکانی گوت: «ئەو زێڕانە بەرن بۆ شاژن، چاوی لێ بکا بزانە ئەوانە زێڕەکانی ئەون؟» خەساوەکان گەوهەرەکانیان بردە لای شاژن. شاژن بە دیتنی ئەو گەوهەرانە واقی وڕ ما. بە پادشـــای ڕاگەیاند، گوتی ئەمن گەوهەرەکانم لە مجرییەکەمدا

دیتەوە ئەوانە ئی من نین و زۆر لە ملوانکەکەی من چاکترن. لەتم لەو فەقیرە مەکەن.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شاژن ڕایسپارد ئەو پیاوە نارەحەت مەکەن. بەڵام ئەگەر دەیفرۆشێ، ئەوانە بۆ کچەکەت بکڕە. کاتێک خەساوەکانی دەربار گەڕانەوە و پەیامەکەی شاژنیان بە پادشا گەیاند. پادشا تانەی لە سەرۆکی گەوهەرفرۆشان دا.» ئەویش گوتی: «پادشا ئەمن ئەو کابرایە دەناسم ئەوە ڕاوچییەکی هەژارە. کاتێک ئەو هەموو گەوهەرەم بە دەست ئەوەوە دیت، شکم بۆ چوو دزیبێتی. پادشا گوتی: «گەلاو بۆ لێت نەدەپرسی؟ هاتوو خودای تەعالا لە شوێنێکەوە بۆی ناردبێت، کە هەر فکریشی بۆی نەچوو بێ. چۆن تۆ پێت گوتووە دز و لە نێو خەڵکدا ئابڕووت بردووە؟» بڕۆ دەرێ خودا خێرت بە قسمەت نەکا. سەرۆکی گەوهەرفرۆشان لەڕێوە لەگەڵ پیاوەکانی وەدەر کەوتن. ئەوان ئاوایان لێ بەسەر هات.

پادشا بە ڕاوچی گوت: «کاکە، خودا ئەو نیعمەتانەت لێ پیرۆز کا. کەس کاری بە تۆ نییە. بەڵام ڕاستیم پێ بڵێ ئەو گەوهەرانەت لە کوێ بوو؟ ئەمن کە پادشام گەوهەری ئاوام نییە.» ڕاوچی گوتی: «پادشا ئەمن زەمبیلێکم لەو گەوهەرانە هەیە ڕووداوەکەش ئاوا و ئاوایە. ئیدێ بەسەرهاتی خۆی و عەبدوڵڵای دەریایی ورد بۆ پادشا گێڕاوە و گوتی: «...ئێستاش پەیمانمان بەستووە هەموو ڕۆژێ من بچم زەمبیلێکی پڕ لەو هەوهەرانەی لێ وەرگرم.» پادشا گوتی: «کاکە، ئەو نیعمەتە بە تۆ براوە. بەڵام ماڵ پێویستی بە شکۆ و گەورەیی و دەسەلات هەیە بۆ پاراستنی. ئەگەر ئەمن کارم بە تۆ نییە. یەکی دیکە وا نابێ و لە کۆڵت نابنەوە. ئەگەر ئەمن بمرم و لە سەر کار لاچم. یەکی دیکە ببێ بە پادشا لەبەر تەماعی دونیا دەتکوژێ. ئەمن دەڵێم کچەکەی خۆمت لێ مارە کەم و بتکەم بە وەزیری خۆم با کەس نەوێرێ چاوی بە دووتەوە بێ.»

ئینجا پادشا فەرمانی دا ڕاوچیان بردە گەرماو. کە لە گەرماو هاتە دەرێ جلوبەرگی شکۆداریان لە بەر کرد و هێنایانە لای پادشا. پادشا وەزارەتی پێ سپارد. فەرمانی دا ژنانی گەورەکانی نارد ماڵەکەی و جلوبەرگی شکۆداری لە بەر ژن و منداڵەکانی کرد. بە شکۆیەکی زۆرەوە هێنایانن بۆ کۆشک. زارۆکێکی ساوا کە بە دایکی بوو، لەگەڵ نۆ دانە منداڵی دیکە بردیاننە لای پادشا. پادشا هەموویانی لە لای خۆی دانا. پادشا جگە لەو کچەی کە ناوی ئوموسسعود بوو منداڵی دیکەی نەبوو.

شاژنیش قەدرێکی زۆری ژنی عەبدوڵڵای ویشکایی گرت و ئەوی کرد بە وەزیری خۆی. پادشا فەرمانی دا کچەکەیان لە عەبدوڵڵای ویشکایی مارەکرد و هەرچی زێڕی کانگایی هەبوو هەموویان وەک مارەیی دا بە کچی پادشا و بنەمای خۆشی و بەختەوەریان دامەزراند و شار ڕازێندرایەوە. بۆ شەو عەبدوڵڵا چووە لای کچی پادشا و هەتا بەیانی

پێکەوە بوون. بەیانی پادشـــا لە پەنجەرەوە ســـەیری دەریێ دەکرد. عەبدوڵڵای دیت کە زەمبیلێکی پڕ لە میوەی پێ بوو دەڕۆیشت. پادشا بانگی کرد، زاوا ئەو زەمبیلە چییە و بۆ کوێ دەچی؟» عەبدوڵڵا وڵامی داوە: «دەچم بۆ لای عەبدوڵڵای دەریایی هاوڕێم.» پادشـا گوتی: «عەبدوڵڵا ئێســتا کاتی چوونە لای هاوڕێ نییە.» عەبدوڵڵای ویشــکایی گوتی: «دەترسم زەمان بە درۆزن دەرچم و بڵێ ماڵی دونیا تۆی لە من کرد.» پادشا گوتی: «باشە بچووە.»

ئیدی عەبدوڵڵا بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشت و خەڵکیش بە یەکتریان دەگوت کە ئەوە زاوای پادشایە و دەچێ ئەو میوانە دەکا بە گەوهەر. یەکێک ئەوی نەدەناسی لێی پرسی: «ڕەتلی[1] بە چەندی دەفرۆشی؟ وەرە من لێت دەکڕم.» عەبدوڵڵا دەیگوت: «چاوەڕێ بە تا دێمەوە.» دوای ئەوە عەبدوڵڵا چوو بۆ ڕەخ دەریا و چاوی بە عەبدوڵڵای دەریایی کەوت. میوەکانی دایە و گەوهەرەکانی لێ وەرگرت. ئیدی بەردەوام ئەوە کاری بوو. هەموو ڕۆژێش بە بەر نانفرۆشــییەکەش دا دەڕۆیشـــت و ســـەیری دەکرد داخراوە. دە ڕۆژ ئاوا تێپەڕی و ئەو دووکانە هەر داخرابوو. نانکەریش دیار نەبوو. نیگەرانی بوو لە جیران دووکانەکەی پرسی. ئەو کابرایە گوتی: «کاکە نانکەرەکە نەخۆشــــە و ناتوانێ لە ماڵ بێتە دەرێ. عەبدوڵڵای ویشــکایی پرســی: «ماڵەکەی لە کوێوەیە؟» وڵامی داوە لە فلانە کۆڵانە. عەبدوڵڵا چوو لە درگای دا. نانکەر لە دەلاقەکەوە چاوێکی لە دەرێ کرد. ڕاوچی هاوڕێی دیت، زەمبیلێکی لە ســەر ســەر بوو. ئیدی هاتە خوارێ و درگای لێ کردەوە. ڕاوچی لە ئامێزی گرت و گوتی: «هـاوڕێ گیـان چۆنی، بەینێک بوو هەر بەوێدا دەهـاتم و دووکـانەکەت داخرابوو. زۆر نیگەران بووم لە دراوسێکەتم پرسی گوتی نەخۆشە و ناتوانێ بێتە دەرێ. ئیدی ئادرەسی مـاڵەکەتم لێ وەرگرت و هـاتم بۆ لات. نـانکەر گوتی: «خودا چـاکەت وەرێ بێنێ، وەڵا شــوکور نەخۆش نیم. بەڵام بیســتمەوە خەڵک بە دزیان زانیوی و گرتوویانی و بردوویانی بۆ لای پادشا. پادشاش تۆی بەند کردووە. ئیدی منیش ترسام و دووکانم داخست و خۆم شــاردەوە. عەبدوڵڵا باســی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە کە ســەرۆکی گەوهەرفرۆشــەکان چ پەندێکی بە سەر هێناوە و ئاخرییەکەی بە کوێ گەیشتووە و پادشا چی لەگەڵ کردووە. بە گشـــتی مووبەموو هەمووی بۆ گێڕاوە. بۆی گێڕاوە کە کردوویە بە وەزیری خۆی و کچەکەی لێ مـارە کردووە. دوای ئەوە بە نـانکەری گوت: «هـا ئەو زەمبیلە گەوهەرەش هەڵگرە بۆخۆت ئەوە بەشی تۆیە. لە هیچ شتێکیش مەترسە.»

دوای ئەوە بە قرتاڵەی خاڵییەوە گەڕاوە بۆ کۆشـک و چووە لای پادشـا. پادشا گوتی: «وەزیر بۆ ئەوڕۆ عەبدوڵڵای دەریاییت نەدیت؟» عەبدوڵڵای ویشـــکایی وەزیر گوتی: «چووم بۆ لای هاوڕێکەم. بەڵام ئەوەی ئەو دای بە من ئەمنیش دام بە هاوڕێیەکی نانکەرم

[1]. ڕەتل: پێوانەیەک بوو قەدیم بۆ کێشان کەڵکیان لێ وەر دەگرت.

که ئەویش ناوی عەبدوڵلایە. چونکە ئەو زۆر زۆری چاکە بۆ من بووە.» پادشـــا گوتی: «ئەو نانکەرە کێیە؟» عەبدوڵلا وڵامی داوە: «ئەو پیاوێکی خاوەن چاکە و خەڵکدۆستە. ئەو مـاوەیەی بۆم گێڕایەوە هیچم نەبوو. هەموو ڕۆژێ ئەو کـابرایە بـایی پێنج درەمی نـان دەدامێ و پێنج درەمیشـــی دەدامێ بۆ پێخۆر و شــت.» ئیدی دیســـان هەمووی بۆ گێڕاوە. پادشـــا گوتی: «منیش ناوم عەدوڵلایە و هەموو عەبدوڵلاکان برای یەکن. ئێســـتا بنێرە بە دوایدا با عەبدوڵلای نانکەریش بێننە ئێرە. با ئەویش بکەم بە وەزیری دەســتی چەپی خۆم. عەبدوڵلای ویشکایی کەسێکی نارد لە دوای عەبدوڵلای نانکەر. کە عەبدوڵلای نانەکەر هاتە لای پادشا، پادشا بەرگی نوێی لە بەر کرد و ئەویشی کردە وەزیری دەستە چەپی خۆی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی نۆسەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ، پادشا عەبدوڵڵای ویشکایی کە زاوای خۆی بوو کردی بە وەزیری دەستە ڕاست و عەبدوڵڵای نانکەریشی کرد بە وەزیری دەستە چەپی خۆی. عەبدوڵڵای ویشکایی هەتا ساڵێک ئەوە کاری بوو. میوەی دەبرد و گەوهەری دێناوە. کاتێکیش کە میوە لە باخەکاندا نەما، عەبدوڵڵای ویشکایی کشمیش و مێوژ و گوێز و بادام و هەنجیر و فندقی بۆ دەبرد. ئەویش هەرچی عەبدوڵڵای ویشکایی بۆی دەبرد. قەبووڵی دەکرد و زەمبیلەکەی بۆ پڕ دەکردەوە لە گەوهەری کانی و دەیداوە.

ڕۆژێک لە ڕۆژان بە ڕێکەوت، عەبدوڵڵای ویشکایی زەمبیلەکەی پڕ کرد لە شت و بەرەو دەریا ڕۆیشت. عەبدوڵڵای دەریایی زەمبیلەکەی لێ وەرگرت. عەبدوڵڵای ویشکایی لە ڕەخ ئاوەکە دانیشتبوو، عەبدوڵڵای ویشکاییش لە نێو ئاوەکە لە نیزیک عەبدوڵڵای ویشکایی دانیشتبوو. پێکەوە قسەیەیان دەکرد. لە بارەی زۆر شتەوە دوان. وا بوو، باسی گۆڕستان هاتە گۆڕێ. عەبدوڵڵای ئاوی گوتی: «ئەرێ کاکە دەڵێن حەزرەتی موحەممەد لە ویشکی نێژراوە. تۆ دەزانی گڵکۆکەی لە کوێیە؟» عەبدوڵڵا وڵامی داوە: «بەڵێ دەزانم.» عەبدوڵڵای دەریایی پرسی: «گۆڕەکەی لە کوێیە؟» وڵامی داوە: «لە شارێکە کە پێی دەڵێن مەدینەی تەیبە.» [واتە شاری بێ خەوش] عەبدوڵڵای دەریایی پرسی: «گەلۆ دانیشتوانی ویشکی دەچنە زیارەتی؟» عەبدوڵڵا وڵامی داوە: «بەڵێ.» عەبدوڵڵا دەریاییی گوتی: «خۆزگەم بە دانیشتوانی ویشکی، چونکە هەر کەس ئەو پێغەمبەر مەزنە زیارەت بکا ڕۆژی پەسڵان دەبێتە تکاکاری. براکەم تۆ ئەوت زیارەت کردووە؟» عەبدوڵڵای ویشکایی وڵامی داوە: «بە داخەوە من هەژار بووم بۆم نەلواوە بچمە زیارەتی. لەوەتی لەگەڵ تۆ بوومە ناسیاو و تۆ ئەو چاکانەت لەگەڵ من کردووە، دەست و باڵم کراوەتەوە و ئەوجار حەجم لە سەرە و دەبێ بچمە زیارەتی پێغەمبەر درود و سڵاوی خودای لە سەر بێ. کەچی لەبەر ئەو بەڵێنی دیدارەی لەگەڵ تۆ هەمە نەمتوانیوە بچم. چونکە بە ڕاستی بێ تۆ ناتوانم بژیم.» عەبدوڵڵا بەحری گوتی: «بۆ دەبێ خۆشەویستی من گرینگتر بێ یان زیارەتی حەزرەتی محەممەد کە تۆ دەباتە بەهەشت؟» گوتی: «وەڵا زیارەتی ئەو لە هەموو شتێک بەلامەوە گرینگترە بەڵام داوا لە تۆ دەکەم ڕوخسەتم بدەی، بچم بۆ زیارەت.» عەبدوڵڵا دەریایی گوتی: «ئەوە من ڕوخسەتم دای. لە لایەن منیشەوە سڵاوی لێ بکە و ئەمانەتێکم لە لایە ئەوە لە شارەکەی ئێمەیە لە دەریادا لەگەڵم وەرە ئەویشت دەدەمێ بیبە لە سەر گڵکۆکەی پێغەمبەری دانێ. عەرزیشی بکە یا ڕەسوولەڵڵا عەبدوڵڵای دەریایی سڵاوی لێ دەکردی و ئەو دیارییەشی بۆ ناردی. بە ئاواتەوەیە بە هانایەوە بچێ و تکای بۆ بکەی تا لە ئاوری جەهەننەم ڕزگار بێ.» عەبدوڵڵای ویشکایی گوتی: «کاکە گیان تۆ لە ئاو چێ بووی و

ئاکنجی ئاوی. ئاو چ زیانێکی بۆ تۆ نییە. بەڵام ئەگەر بێتوو بێیە دەرێ و لە ئاو دوور بی هیچت لێ نایە؟» عەبدوڵڵا گوتی: «چۆن هیچم لێ، وەڵا تەواوی گیانم ویشک هەڵدێ و باو گەرما دەمکوژن.» عەبدوڵڵای ویشکایی گوتی: «دیباشە منیش ئاوام بۆ ویشکی ئافراوم و ئەگەر بێتوو بێمە ناو ئاوەوە ئەوە ئاو دەچێتە هەناومەوە و دەمکوژێ.» عەبدوڵڵای دەریایی گوتی: «خەمت نەبێ ئەمن ڕۆنێکم هێنا و تێتی هەڵدەسووم. ئەگەر هەتا لە ئاودا بی هیچت لێ نەیە.» عەبدوڵڵا گوتی: «ئەگەر وابێ، باشە بیهێنە با تاقی کەمەوە بزانم چۆنە.»

عەبدوڵڵا دەریایی چوو لە ئاوەکەوە و ماوەیەکی پێ چوو. کە هاتەوە دەرێ شتێکی وەک پیو کە ڕەنگی زەرد و بۆنێکی میسکی هەبوو لەگەڵ خۆی هێنا. عەبدوڵڵا گوتی: «کاکە ئەوە چییە؟» عەبدوڵڵای دەریایی گوتی: «ئەوە پیوی ماسییەکە بە نێوی دندان، کە لە هەموو ماسییەکانی دیکە زەلامترە و گەورەترین دژمنی ئێمەیە. سەروسەکتی لە سەروسەکتی تەواوی گیانلەبەرانی ویشکی زەڵامترە و ئەگەر بێتوو فیل و شێر و شتی وا ببینێ لەڕێوە قووتیان دەدا.» عەبدوڵڵای ویشکایی گوتی: «کاکە ئەو ماسییە خواردنی چییە؟» عەبدوڵڵای دەریایی وڵامی داوە: «بە چوار پێی ئاوی بەڕێ دەچێ، مەگەر تۆ نەتبیستووە، لە دەریادا بەهێزەکان بێهێزەکان دەخۆن؟» عەبدوڵڵای ویشکایی گوتی: «ئەمن لەوە دەترسم، ئەگەر ئەمن بێمە ناو ئاوەوە تووشی ئەو ماسییانە بم و بمخۆن.» عەبدوڵڵای دەریایی وڵامی داوە: «خەمی ئەوەت نەبێ، هەرکە چاویان بە تۆ بکەوێ دەزانن مرۆڤی و لە ترسان ڕادەکەن. چونکە ئەوان ئەوەندەی لە مرۆڤ دەترسن ئەوەندە لە هیچ شتێک ناترسن. ئەوە سەیرە ئەگەر ئەوانە مرۆڤ بخۆن لەجێوە دەمرن. چونکە پیوی مرۆڤ بۆ ئەوان ژەهرێکی کوژەرە. لە هەر شوێنێک مرۆڤی لێ بێ ئەگەر ئەوان دووسەد سێسەدیش بن بگرە پتریش هەرکە گوێیان لە دەنگی مرۆڤ بێ لەڕێوە هەموویان لە ترسان دڵیان دەتۆقێ و دەمرن.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی نۆسەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! عەبدوڵڵای ویشکایی گوتی: «پەنا بە خودا، ئیدی جلەکانی داکەند و لە قەراخ دەریاکە وە بن گڵی دا. بە ڕۆنەکە تەواوی گیانی لە تۆقی سەرییەوە هەتا بەری پێی چەور کرد و چوو لە ئاوەکەوە. چاوی هەڵێنا. ئاوەکە نارەحەتی نەدەکرد. ئەوجار چاوی لەملا و لەولای خۆی دەکرد. دەچووە خوارێ و دەهاتەوە سەرێ. چۆنی پێ خۆش با وای دەکرد. تەماشای کرد ئاوی دەریا وەک هۆبەیەک وایە. عەبدوڵڵای دەریایی لێی پرسی: «کاکە پێت چۆنە؟» عەبدوڵڵای ویشکایی وڵامی داوە: «قسەکەت ڕاستە هیچم لێ ناکا.» ئەوجار عەبدوڵڵای دەریایی گوتی: «وەرە وە دوای من کەوە.» عەبدوڵڵای ویشکایی بە دوایدا ڕۆیشت و لەوێ بۆ وێ. لەملا بۆ ئەولا دەرۆیشتن و عەبدوڵڵای ویشکایی چاوی لەو ماسیانە دەکرد لە ڕێگادا دەیدیتن و بە لایاندا تێدەپەڕین. ئی وا بوو چکۆڵە بوو ئی وا بوو گەورە بوو. لە دەریادا شتی وای تێدا بوو شێوەی گامێشی دەدا و ئی وا بوو شێوەی مانگا و سەگ و شتی وایان دەدا. شتی واشی دەدی شێوەی مرۆڤی دەدا. هەرکام لەوانە هەرکە عەبدوڵڵای ویشکاییان دەدی ڕایان دەکرد. عەبدوڵڵای ویشکایی لە عەبدوڵڵای دەریایی پرسی: «ئەرێ کاکە ئەوە بۆ تەواوی ئەو ئاژەڵانە هەرکە من دەبینن ڕادەکەن؟» عەبدوڵڵای دەریایی دەیگوت: «کاکە لە تۆ دەترسن هەڵدێن. چونکە ئەوەی خودا ئافراندوویەتی لە مرۆڤی ویشکایی دەترسێ.»

ئیدی هەر وا عەبدوڵڵا چاوی لە شتە سەیرەکانی ناو دەریا دەکرد و دەگەڕان هەتا گەیشتنە کێوێک. بەرەو کێوەکە دەرۆیشتن کە لە پڕدا گوێیان لە نەڕەیەک بوو. تەماشای کرد ئەوە شتێکی ڕەشی گەورە لە وشتریش گەورەتر لە کێوەکەوە بە دەنگە دەنگ بەرەو ئەوان دێتە خوارێ. عەبدوڵڵای ویشکایی: «پرسی کاک ئەوە چییە؟» دەریایی گوتی: «ئەوە دندانە دێ بمانخوا. جا ئێستا پێش ئەوەی ئەو بگاتە لای ئێمە ئەتۆ لێی توورە بە. عەبدوڵڵای ویشکایی لێی توورە بوو. لەجێوە دندان مرد و بە لادا هات. عەبدوڵڵا گوتی: «سوبحانەڵڵا، خۆ من خەنجەرم لێ نەدا. چۆن گیانلەبەرێکی ئاوا بە بەسەردا گوڕانێک دەمرێ.» دوای ئەوە گەیشتنە شارێک. سەیری کرد، تەواوی دانیشتوانی ئەوە شارە هەموو کچن. عەبدوڵڵای دەریایی گوتی: «ئەوە شاری کچانی دەریاییە.» ویشکایی گوتی: «یانی ئەوە پیاویان لەگەڵ نییە؟» دەریایی گوتی: «یەک پیاویشیان لەگەڵ نییە.» ئەی ئەوانە بێ پیاو چۆن دووگیان دەبن و زاووزێ دەکەن؟» دەریای وڵامی داوە: «ئەوە پادشای دەریا ڕقی لێ هەڵگرتوون و ناردوونییە ئێرە تا لە نیزیکی بێبەش بن و زاووزێ نەکەن. ناشتوانن لێرە بچنە دەرێ هەرکە بچنە دەرێ دڕندەی دەریایی دەیانخوا. بە لام لە شارەکانی دیکە ژن و پیاو تێکەڵە.» ویشکایی پرسی: «بۆ لە دەریادا جگە لێرە شاری دیکەشی لێیە؟» دەریایی

وڵامی داوه: «بەڵێ، زۆری لێیه.» ویشــکایی لێی پرســی: «بۆ ئێوه پادشــاشــتان هەیه؟» دەریایی گوتی: «بەڵێ،» ویشــکایی گوتی: «کاکه شــتی ســەیر ســەیرم دی له دەریادا.» دەریایی گوتی: «جا هێشــتا چیت دیوه! مەگەر نەتبیســتووه که جیهانی ناو ئاو له جیهانی دەرەوه سەیر و سەمەرەتره؟» دوای ئەوه سەیری کچەکانی کرد، تەماشای کرد، کچ دەڵێی مانگن دەدرەوشــێنەوه. پرچیان وەک ئی ژنانی ویشــکییه. بەڵام دەســت و قاچیان له ناو سکیان دایه. وەک ماسی کلکیان هەیه.

ئەوجار لەو شاره چوونه دەرێ و هەر رۆیشتن هەتا گەیشتنه شارێکی دیکه. که لەو شارەدا ژن و پیاو تێکەڵ بوون. ئەوانیش کلکیان هەبوو، لەو شارەدا کڕین و فرۆتن نەبوو. جلیـان لەبەردا نەبوو. هەموویـان ڕووت بوون و گیـانیـان به دەرەوه بوو. عەبدوڵڵای ویشــکایی گوتی: «کاکه ئەوه ژنه و پیاو لێره ڕووتوقوتن؟» دەریایی گوتی: «کاکه لێره جلوبەرگ و شته نییه.» ویشکایی پرسی: «ئەوانه چۆن زەماوەند دەکەن؟» دەریایی گوت: «خۆ دەریـایی زەمـاوەنـدیـان نییه. هەرکەس ژنێکی پێ جوان بێ لەگەڵی جووت دەبێ.» ویشــکایی گوتی: «ئەخه ئەوه حەرامه. بۆ به پێی ڕێوشــوێنی ڕەســووڵی خودا زەماوەند ناکەن؟» دەریایی گوتی: «خۆ ئێمه هەموو یەک نەتەوه نین. لێرەدا موســوڵمان و گاور و جووله‌که و دینی دیکەی تێدایه. موسوڵمانەکان به دابودەستووری دینی ئیسلام زەماوەند دەکەن.» ویشکایی گوتی: «ئێوه ڕووتن و له نێو ئێوەدا کڕین و فرۆتن نییه ئەی بۆ مارەیی ژنان چ دەکەن؟ گەلۆ مرواری و لۆلۆیان دەدەنێ؟» دەریایی گوتی: «له لای ئێمه گەوهەر و زێڕ و شــتی وا بەردن و هیچ نرخێک ناکەن. بەڵام کاتێک زەمـاوەند دەکەن. جۆره ماســییەک لەبەر چاو دەگرن. داینێین بڵێین بایی هەزار دیناره، یا دوو هەزار دیناره ڕاو دەکرێ و وەک خواردەمەی ئەو زەماوەنده میوانەکانی پێ بەڕێ دەکرێ.» ویشکایی گوتی: «ئەگەر کەســێک زینا بکا چی لێ دەکەن؟» دەریایی گوتی: «ئەگەر ژن بێ، ئەو له شــار دەردەکەن و دەینێرن بۆ شــاری ژنان. ئەگەر دووگیانیش بێ لێی دەگەڕێن منداڵەکەی بێ. ئەگەر منداڵەکەی کچ بێ، ئەویش لەگەڵ دایکەکەی دەردەکەن. پێی دەڵێن زۆڵەکچ. ئەگەر کوڕیش بێ، دەیبەنه لای پادشای دەریا و پادشا دەیکوژێ.

عەبدوڵڵای ویشکایی ئەو کارانەی زۆر پێ سەیر بوو. پاشان عەبدوڵڵای دەریایی بردی شـار به شـار گێڕای هەتا هەشـتا شـار گەڕان. سـەیر لەوەدا بوو که خەڵکی یەک شـار له خەڵکی شارەکانی دیکه نەدەچوو. ویشکایی پرسی: «کاکه شاری دیکه ماوه نەچوو بین؟» دەریایی گوتی: «هێشتا ئەتۆ کوێت دیوه، خۆ هێشتا هەر شارەکانی وڵاتی خۆمان گەڕاوین. به پێغەمبەری دلۆڤانمان قەسەم ئەگەر هەزار ساڵ بگەڕێین و هەر ڕۆژەی هەزار شاریش بچین هێشتا یەک له سـەر بیسـتی شوێنه سـەیروسـەمەرەکانی دەریا نابینی.» عەبدوڵڵای ویشکایی گوتی: «کەوایه بەسـه من ئەوەندەم ماسی خواردووه ماندوو بووم. ئەوه هەشتا

ڕۆژە من لە دەریادا دەســووڕێمەوە و شــەو و ڕۆژ هەر ماســی کاڵ دەخۆم.» دەریایی گوتی: «ئەی ئێوە چۆنی دەخۆن؟» ویشــکایی وڵامی داوە گوتی: «ئێمە بە ئاور دەیبرژێنین و پاشـــان لەڕۆندا ســـووری دەکەینەوە.» دەریایی گوتی: «جا ئێمە ئاور و ڕۆن لە کوێ بێنین؟» ویشــکایی گوتی: «کاکە منت بردە زۆر شـــار بەڵام هەر نەتبردم بۆ شـــارەکەی خۆت.» دەریایی گوتی: «شـارەکەی خۆمان نیزیکی قەراخ دەریایە. هەر پێم خۆش بوو ئەو شارانەت پێشان بدەم.» عەبدوڵڵای ویشکایی گوتی: «دەستت خۆش بێ ئەوەندەی گەڕاوین بەســە. ئێســتا پێم خۆشــە بمبەی بۆ شـارەکەی خۆتان.» ئیدی عەبدوڵڵای دەریایی ئەوی بردە شـــارەکەی خۆیان. کە چوونە ئەوێ ســـەیری کرد لە شـــارەکانی دیکە لە هەموویان چووکەتر بوو. چوونە ناو شـارەکەوە و ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە ئەشـکەوتێک. عەبدوڵڵای دەریـایی گوتی: «ئەو ئەشـــکەوتە مـاڵی منە. تەواوی مـاڵەکانی ئەو شـــــارە ئاوان. جـا ئەشـکەوتەکان گەورە و چکۆلەیان هەیە. تەواوی شـارەکانی دەریاش ئاوان. لێرە هەرکەس بیهەوێ ماڵی هەبێ دەبێ بچێتە لای پادشـــــای دەریا و داوا بکا بڵێ لە فڵان جێ ماڵێکم دەوێ. پادشــا فەرمان بە ماسـییە بەردبڕەکان دەدا لەگەڵی بچن و لە فڵان کێو خانوویەکی بۆ لە بەرد داببڕن. ئەو مـاســـییـانە بەردی زۆر ســـەختیش دەتوانن ببڕن. بۆ حەقی ماندووبوونەکەشـــیان خاوەن ماڵەکە ماســـیان بۆ دەگرێ و دەیانداتێ. لەوێدا هەموو دانوسانێک هەر بە ماسییە و هیچی دیکە.

دوای ئەوە عەبدوڵڵای ویشـــکایی گوتی: «فەرموو بچووە ژوورە. ئەویش چووە ناو ئەشـــکەوتەکەوە. عەبدوڵڵای دەریایی بانگی کچەکەی خۆی کرد. کیژێکی چاوڕەشـــی، سیماهەتاوی، قەدباریک بە ڕووتی هات. وەک ماسیان کلکی هەبوو. کاتێک کچە عەبدوڵڵای ویشـــکایی دیت، بە باوکی گوت: «ئەوە کێیە لەگەڵ خۆت هێناوتە؟» عەبدوڵڵای دەریایی وڵامی داوە، ئەوە هاوڕێ ویشـــکاییەکەی منە کە میوەی وشـــکایی لێ وەر دەگرم بۆ تۆی دێنمەوە. وەرە سـڵاوی.» کیژەکە هاتە پێشێ و سـڵاوی لێ کرد. باوکی گوتی: «شـتێک بۆ میوانەکەمان بێنە.» کچە چوو دوو ماســـی گەورەی بۆ هێنا یەکی بە قەدەر کاریلەیەک دەبوون. عەبدوڵڵای ویشـکایی لەبەر برسـێتییان بە نابەدڵێ خواردنی. لە خواردنی ماســی بێزرابوو. بەڵام ئەوان جگە لە ماســـی هیچی دیکەیان نەبوو. ئەوەندەی پێ نەچوو خێزانی عەبدوڵڵای دەریاییش هاتەوە. دوو کوڕیشـــی لەگەڵ بوو. یەکی بەچکە ماســـییەکیان بە دەســـتەوە بوو دەیانخوارد. وەک چۆن مرۆڤی ویشـــکیی خەیار دەخوا. دوای ئەوە ژن و منداڵی عەبدوڵڵای دەریایی هاتبوون تەماشـای عەبدوڵڵای ویشـکاییان دەکرد و پێدەکەنین. پێیان ســەیر بوو. عەبدوڵڵا پێی ناخۆش بوو بە دەریایی گوت، ئەوە منت هێناوەتە ئێرە ژن و منداڵەکەت گاڵتەم پێ بکەن.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

هەتا گەیاندییەوە سەر ویشکی. لە ڕێیەدا تووشی بەزم و ئاهەنگێکی زۆر بوون. گوێی لە ئاواز و گۆرانی خۆش بوو. عەبدوڵڵای ویشکایی گوتی: «ئەو خەڵکە بۆ ئاوا دڵخۆشن و جێژنیانە؟ هەر بە ڕاستی جێژنەیانە؟» دەریایی وڵامی داوە: ئەوە کەسێکیان مردووە بۆیە ئاوا کەیفیان سازە و ئاوا دەکەن!» عەبدوڵڵا پرسی: «بۆ ئەگەر ئێوە کەسێکتان بمرێ دڵخۆش دەبن و گۆرانی دەچڕن؟» دەریایی وڵامی داوە: «بەڵێ کاک گیان. بۆ ئەی ئێوە چ دەکەن؟» عەبدوڵڵا گوتی: «وەڵا ئێمە ئەگەر کەسێکمان لێ دەمرێ هەموو خەم دامان دەگرێ و شینگێڕی بۆ دەکەین و ژنان بە چەپۆک لە سەر و سەکوتی خۆیان دەدەن و جلی بەریان دادەدڕن.»

کاتێک عەبدوڵڵای دەریایی ئەو قسەیەی بیست، چاوی زەق بووەوە و تووڕە بوو. بە عەبدوڵڵای ویشکایی گوت: «شتەکانم دەوە، عەبدوڵڵا شتەکانی داوە. دەریایی عەبدوڵڵای هێناوە ویشکی بە عەبدوڵڵای گوت: «ئیدی تازە من نابینییەوە و تۆش من نابینییەوە.» ویشکایی پرسی: «باشە لەبەر چی؟» دەریایی گوتی: «ئاکنجیانی ویشکایی بۆ ئێوە ئەمانەتی خودا نین؟» ویشکایی گوتی: «بەڵێ، ئێمە ئەمانەتی خوداین.» دەریایی گوتی: «ئەی چۆن لەبەرتان گرانە خودا شتی خۆی بەرێتەوە؟ دەی ئەمن چۆن ئەمانەتی پێغەمبەر (د ـــ س) دەدەمە دەست تۆ. ئەتۆیەک بە لە دایک بوو خۆشحاڵ دەبی کە خودا ڕووحی خۆی بە ئەمانەت لە دەخاتە جەستەی ئەوەوە. بەڵام کاتێک دێ بۆ ئەمانەتەکەی ئێوە دەست دەکەن بە شین و ڕۆ و لەبەرتان گرانە. ئەمن پێویستیم بە هاوڕێیەتی تۆ نییە.» ئاوای گوت و ڕۆیشت لە دەریاوە.

دوای ئەوە عەبدوڵڵای ویشکایی جلەکانی لە بەر کردەوە و گەوهەرەکانی هەڵگرت و چووەوە بۆ لای پادشا. پادشا لێی پرسی: «عەبدوڵڵا ئەوە ئەو ماوەیە بۆ دیار نەبووی؟» عەبدوڵڵا تەواوی ئەو ڕووداوانەی بۆی هاتبووە پێش و ئەو شتە سەیروسەمەرانەی لە دەریادا دیتبووی هەمووی بە وردی بۆ پادشا گێڕاوە. پادشا واقی وڕ ما. دوایە عەبدوڵڵای ویشکایی، ئەوەی لە عەبدوڵڵای دەریایی بیستبوو بۆ پادشای گێڕاوە. پادشا گوتی خراپت دانیشتوانی ویشکی پێ ناساندووە. دوای ئەو بابەتە عەبدوڵڵا هەر دەچووەوە ڕەخ دەریا و بانگی عەبدوڵڵای دەریایی دەکرد و هیچ وڵامی نەدەبیستەوە و نەدەهات بۆ لای. ئیدی عەبدوڵڵای ویشکایی دەستی لێ شوت و چووەوە لەگەڵ خەزووری بە خێر و خۆشییەوە ژیان هەتا تێکدەری خۆشی دونیایی ژیانی هەڵتەکاندن و لە یەکی بڵاو کردن. هەر بۆخۆیەتی دەمێنێتەوە و نەمرە.

**بەسەرهاتی ئەبوولحەسەنی عەممانی**

یەکی دیکە لە بەسەرهاتە خۆشەکان، ئەوەیە کە شەوێکیان هاڕوونەڕڕەشید خەوی زڕابوو. مەسرووری خزمەتکاری بانگ کرد و پێی گوت: «خێرا بچووە جەعفەری وەزیر بانگ کە بێتە ئێرە.» مەسروور چوو جەعفەری هێنا هەنتەشی پادشا. خەلیفە گوتی: «جەعفەر ئەوشەو خەوم زڕاوە نازانم چ بکەم خەوم لێ بکەوێ؟» جەعفەر وڵامی داوە، گوتی: «لە زانایانم بیستووە: چاو لە ئاوێنە کردن و چوونە گەرماو و گوێ لە گۆرانی خۆش گرتن، خەم دەڕەوێنێ.» خەلیفە گوتی: «جەعفەر ئەمن تەواوی ئەو کارانەم کردووە، کەچی خەمم سووک نەبووە. بە ڕووحی پاکی باپیرانم ئەگەر کارێک نەکەی خەمم بڕەوێنی دەتکوژم.» جەعفەر وڵامی داوە: «بەو مەرجەی ئەمن چیم پێ گوتی قەبووڵی کەیت.» خەلیفە گوتی: «باشە ئەخە تۆ چیم پێ دەڵێی؟» جەعفەر وڵامی داوە: «سواری لۆتکەیەک بین بچینە بە دیجلەدا بڕۆین و بچین بۆ شوێنێک کە قەڕنولسیراتی پێ دەڵێن، بەشکوو هێندێک شت ببینی کە لە پێشدا نەتدیوە، یان هێندێک کەس ببینێی کە لە پێشدا نەتیدوە. چونکە دەڵێن: سێ شت بۆ مرۆڤ خەمڕەوێنە. یەکیان ئەوەیە شتی نەدیتراو ببینی. دووەمیان ئەوەیە شتی نەبیستراو ببیستی. سێیەم ئەوەیەکە بچییە شوێنێک کە قەت نەچوویت.» لەو جەنگەیەدا خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید لە جێی خۆی هەستا و بۆ تاقی کردنەوەی قسەکەی جەعفەری وەزیر و براکەی، فەزڵی کوڕی یەحیا لەگەڵ ئیسحاقی هاودەمی و ئەبوودۆلف و مەسرووری شیروەشێن بەرەو دیجلە چوون.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی نۆسەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خەلیفە هارووونەڕەشید هەستا جلی بازرگانانی لە بەر کرد و لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکە بەرەو دیجلە کەوتنە ڕێ. لەوێ سـواری لۆتکەیەک بوون و ڕۆیشـتن هەتا گەیشتنە شـوێنی دیاریکراو. لەوێ گوێیان لە دەنگی کەنیزێک بوو کە گۆرانی دەچڕی و ئەو شێعرەی دەگوتەوە:

هەڵی هێنا بەیان چاوی گوڵ بە بدەم بولبول پێکەنی
سـروەی بەیان قاقای کێشا چی خەواڵوو بوو ڕاچەنی
ئەوینداری ماندووی ژوان خەو بەری نادا کە ڕا بێ
وڕێنە دەکا لە خەودا، کەنی ماچێـــکی کەش با بێ
هەر شـەپۆلی خۆشـەویستی خەمان لەگەڵ خۆی ڕا دەدا
خۆ بسـپێرە بەو شـەپۆلە، خەم و دەردت بە با دەدا

خەلیفە کاتێک گوێی لەو ئاوازە بوو، گوتی: «جەعفەر دەزانی ئەو ئاوازە زۆر خۆش بوو.» جەعفەر وڵامی داوە منش شتی ئەوەندە خۆشم نەبیستبوو. خۆش ئەوەیە بچینە ئەو دیوی پەردەکەوە، ئەوە ئێمە هێشتا نیوەی خۆشـییەکەمان پێ گەیشـتووە. خەلیفە گوتی: «جەعفەر داوا لە خاوەنەکەی بکە ڕێمان بدەن بچین بە چاو و لە نیزیکەوە ئەو گۆرانیبێژە ببینین.» لە ڕێوە لە لۆتکەکە دابەزین و چوون لە دەرگایان دا. لە پڕدا کوڕێکی جوانچاک و سـەروروخۆش هات بۆ لایان و گوتی: «سـڵاو گەورەکانم فەرموو گەورەتان کردم بە سـەرتان کردینەوە. فەرموون وەرنە ماڵەوە. چوونە ژوورەوە. ئەو لاوە لە پێشـیاندا بە دالانێکدا دەڕۆیشت، تا گەیشتنە ناو ماڵەکەوە سەیریان کرد دار و دیوار و میچی ئەو ماڵە بە ئاوی زێڕ و ڕەنگی ئاسـمانی لیاوکاری کرابوو. دیوێک لەولاوە بوو بە پەردەیەکی دیبا جیا کرابووەوە کە سـەد دانە کەنیزی مانگ ئاسـای تێدا بوو. ئەو لاوە گازی کەنیزەکانی کرد. لە ڕێوە لە سـەر کورسـییەکان هاتنە خوارێ. ئینجا ڕوو لە جەعفەر کرد و گوتی: «گەورەم، ئەمن نازانم کامتان لەوانی دیکە گەورەترە بەڵام تکایە گەورەکەتان لە لای سەرەوە دانیشێ و ئەوانی دیش هەر کەسەی لە شوێنی خۆی دانیشێ. ئەوان هەرکەسەی چوو لە شوێنی خۆی دانیشت. مەسرووی خزمەتکار ڕووبەڕوویان ڕاوەستا.

دوای ئەوە خاوەن ماڵ گوتی: «میوانەکان، دەسـتوور دەفەرموون خواردەمەنییەک شـتێک بێنمە خزمەتتان؟» گوتیان ئەگەر زەحمەت نابێ بیهێنێ. ئیدی بە کەنیزەکانی گوت خواردن بێنن. چوار کەس لە کەنیزەکان کە بەرهەڵبێنە و قۆڵچاغی خزمەتیان لە خۆیان

دابوو. سـفرەیان ڕاخسـت و لە هەموو چەشـنە خواردنێکیان لە سـەر ڕیز کرد. ئینجا ئەوان خواردنەکەیان خوارد و دەسـتیان شـۆردەوە. ئەوجار لاوەکە گوتی: «بەڕێزان ئەگەر کار یان پێویستییەکتان هەیە بیفەرموون بەشکوو کارێکم لە دەست بێ و پێی بەختەوەر بم؟» گوتیان ئێمە لە دەرێ گوێمان لە ئاوازێکی زۆر خۆش بوو بە دەنگی ئەوەوە هاتووین و پێمان خۆشە خاوەنی ئەو دەنگەش ببینین. ئەگەر لە گەورەیی خۆتەوە ئەو ئاواتەمان وەدی بێنی مەمنوون دەبین. هەر ئەوەیە داوای ئێمە. ئەگەر گوێمان لە ئاوازی ئەو کەنیزە بێ و بیبینین ئەوە لە کوێوە هاتووین دەچینەوە ئەوێ. لە ڕێوە گەنجەکە ڕووی لە کەنیزێکی ڕەش کرد و گوتی: «دا بانگی خانمەکەت بکە.» دوای ئەوە کەنیزە چوو کورسـییەکی هێنا دانا. دیسان گەڕاوە کچێکی وەک خۆری ئاسمانی لەگەڵ خۆی هێنا. کچە شۆخەکە لە سەر کورسـییەکە دانیشـت. دوای ئەوە کەنیزە ڕەشـەکە توورەکەیەکی هێنا دایە دەسـتی. ئەو گوڵڕوخسارە عوودێکی ڕازاوە بە گەوهەری جۆراوجۆری لە توورەکەکە دەرهێنا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو دڵبەرە عوودەکەی دەرهێنا و تارەکانی گشت کردەوە و کەمێکی لێ دا و ئەو بەیتانەی خوێندەوە:

وەرە با ئاشت بینەوە کاتی خـــــــــــــــــۆشەویستییە
بـا لە بیر بکەین ڕق و قین، ئێســـتـا کـاتی مەســـتییە
گەنــجـێـتــی مـیــوانــێکە بە لەز دێــت و تــێ دەپەڕێ
گەر بـێــت و قەدری نەگــریــن دەڕوات و هەڵــدەفــڕێ
بـــــــــــــــێ تۆ ژیان مەحاڵە، هەنگوینم بە زار تاڵە
چـــــــــــــــاوم خێڵی ڕێگەیە، ڕواڵەتم هەزار ساڵە

کاتێک شـــێعرەکەی تەواو کرد، زۆر چاک گریا. ئەوەی لەو ماڵەدا بوو لەگەڵی گریان. ئەوجار خەلیفە گوتی: «بە شـــێعر و گورانییەکەیدا وا دیارە ئەو کچە ئەوڤینداریکی لە یار دابڕاوە. خەلیفە دەنگی زۆر پێ خۆش بوو. کەیفی پێ کرد. بە ئیســـحاقی گوت: بە خودا تا ئێستا کەسم نەدیوە ئاوای بڵێ.» ئیسحاق گوتی: «وەڵا ئەمنیش زۆرم پێ خۆش بوو.»

خەلیفە هاروونەڕەشـــید لەگەڵ ئەوانەشـــدا چاوی لە ڕوخســـاری جوان و ڕێکوپێکی خاوەن ماڵەکە بڕی بوو کە ڕەنگ زەردی لە گۆنایدا دیار بوو. هەسـتی کرد گرفتێکی هەیە. پێی گوت: «کوڕی چـاک دەزانی ئێمە کێین؟» ئەو لاوە گوتی: «نـا وەڵلا.» گوتی: «ئەمن ئەمیرولموئمنین ئـامۆزای گەورەی پێغەمبەران و ئەوەش جەعفەری وەزیر و ...» بەو شـــێوەیە نێوی هاوڕێکانی هەموو دانە دانە پێ گوت. ئەوجار خەلیفە فەرمووی: «کوڕی چاک پێم خۆشـــە پێم بڵێی هۆکاری ئەو ڕەنگزەردییەت چییە؟» ئەو لاوە گوتی: «گەورەم خەلیفە، بەســەرهاتی من لە باس نایە ئەوەندەی شـتی ســەیر و ســەمەرە تێدایە.» خەلیفە گوتی: «پێم بڵێ بەشکم بتوانم یارمەتییەکت بدەم.»

ئەو لاوە گوتی: «خەلیفە، ئەمن کابرایەکی بازرگانم و لە شـــاری عەممانەوە هاتووم. باوکم بازرگانێک بوو، خاوەن ماڵ و سامان. سێ پاپۆڕی لە دەریادا هەبوو. کە ساڵێ سی هەزار دیناریان پارە پەیدا دەکرد. باوکم پیاوێکی دەســـتودڵباز بوو. کاتێک کەوتە ئاویلکە دان، ئەمنی بانگ کردە لای خۆی. وەســـێتی کرد و گیانی دەرچوو. باوکم چەند کەســـی شــەریک بوو کە بە ماڵی ئەو تیجارەتیان دەکرد و لە دەریادا ســەفەریان دەکرد. ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت لەگەڵ کۆمەڵێک بازرگان لە ماڵی خۆمان دانیشـــتبووم کە یەکێک لە کۆیلەکان هاتە ژووری و گوتی: «گەورەم کابرایەک لە بەر دەرگا ویســـتاوە چاوەڕێی فەرمانی تۆیە.

ئەمن گوتم با بێتە ژووری. شتێکی سەر داپۆشراوی لە سەر سەری دانابوو. ئەو شتەی هێنا لە بەر دمی من داینا و سەرەکەی لا برد. سەیرم کرد، دەفرێکە پڕ لە میوە. ئەوە لە کاتێکدا بوو، وەرزی میوەش نەبوو. منیش دەستخۆشیم لێ کرد و سەد دیناریشم دایە. کابرا بەدم سپاسکردنەوە گەڕاوە. دوای ئەو منیش میوەکانم بە سەر هاوڕێکانمدا دابەش کرد و پرسیم: «ئەو میوانە لە کوێوە دێن وا لای ئێمە گیر ناکەوێ؟» بازرگانەکان گوتیان ئەو میوانە لە بەغداوە هێندراون. دوای ئەوە دەست کرا بە پەسن و تاریفی خۆشیی و ئاوەدانی بەغدا و گوتیان: کە لە نێو شارەکاندا هیچ کوێ لە بەغدا خۆشتر نییە و خەڵکەکەشی لە خەڵکی هەموو شوێنێکی دیکە باشترن. هەواکەشی لە هەوای هەموو شارەکانی دیکە دڵگیرترە. بەو قسانە، هەوای چوون بۆ بەغدا و دیتنی ئەوێ لە سەری دام. لەڕێوە هەستام، باخ و مەزرا و ملک و سامان و کەشتی و کۆیلە و کەنیزم هەموو فرۆشت. بێجگە لە گەوهەر و بەردی کانی، بە هەزاران زێڕم کۆ کردەوە. کەشتییەکم بە کرێ گرت و ماڵەکەم لێ دا. شەو و ڕۆژ ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە بەسرە. چەند ڕۆژێک لە بەسرە مامەوە. ئەوجار لە بەسرەوە بەرە و بەغدا وەڕێ کەوتم. چەند ڕۆژێک بەڕێوە بووم هەتا گەیشتمە بەغدا. لە بەغدا پرسیاری گەڕەکی بازرگانان و خۆشترین گەڕەکانی بەغدام کرد. گەڕەکی کەرخەیان پێ گوتم. چووم بۆ ئەو گەڕەکە. لەوێ چوومە کۆڵانێک کە «دەربولزەعفەران»یان پێ دەگوت. خانوویەکم بە کرێ گرت و تەواوی ماڵەکەم ڕاگوێست بۆ ئەوێ. هەتا سێ ڕۆژ لەو ماڵەدا بووم. دوای ئەوە ڕۆژێک کەمێکم پارە هەڵگرت و چووم بۆ گەڕان. ئەو ڕۆژە هەینی بوو. چووم بۆ نوێژگەی مەنسوور و نوێژی هەینیم کرد. لەگەڵ خەڵکەکە چووم بۆ شوێنێک کە قەڕنولسیراتیان پێ دەگوت.

لەوێ کۆشکێکی بەرزم دیت کە دیروانییە دیجلە. ئەمن لەگەڵ خەڵکەکە چوومە ناو ئەو کۆشکەوە. کابرایەکم دیت دانیشتبوو، جلوبەرگێکی کۆک و پۆشتەی لە بەردا بوو. بۆنی خۆشی ڕۆژەڕێیەک دەڕۆیشت. چوار کەنیز و پێنج کۆیلە دەستەونەزەر لە بەر دمی وێستابوون. لە کەسێکم پرسی ئەو کابرایە کێیە و چ کارەیە. ئەو کابرایە گوتی: «ئەوە شێخ تاهیری کوڕی عەلایە. هەرکەس بێتە لای دەتوانێ بخوا و بخواتەوە چاو لەو کەنیزە جوانانە بکا و لەگەڵیان ڕابوێرێ، کە لە لایەتی.» ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم: «بە خودا ئەمن لە مێژە لە یەکی ئاوا دەگەڕێم.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی نۆسه‌د و چل و نۆیه‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشکۆ! ئه‌و لاوه گوتی: «خه‌لیفه، ئه‌من چوومه لای ئه‌و شێخه و سڵاوم لێ کرد و پێم گوت: «گه‌وره‌م پێم خۆشــه ئه‌وشـــه‌و میوانت بم و له‌گه‌ڵ که‌نیزێک بم.» کابرا گوتی: «به خێر بێی ســــه‌ر چـاوم. به‌ڵام کـاکه ئه‌من له هه‌موو جۆره که‌نیزێکم له لایه. که‌نیزه‌م هه‌یه شــه‌وی به ده دینار. هه‌مه شـــه‌وی به چل دینار و هێندێکیشـــم هه‌یه له چل دینار بۆ ســه‌ره‌وه‌یه. ئه‌تۆ کامیانت پێ خۆشـه هه‌ڵبژێره.» ئه‌من گوتم: «ئه‌وه‌ی شــه‌وی به ده دیناره، ئه‌وم ده‌وێ.» ئیدی سێسه‌د دینارم دا به شێخ بۆ مانگێک. شێخ منی به نۆکه‌رێک ســپارد و ئه‌ویش بردمی بۆ گه‌رماو و زۆر به ده‌وردا هات و خزمه‌تی باشــی کردم. دوای ئه‌وه منی برد بۆ دیوێکی چکۆله و له ده‌رگای دا. که‌نیزێک هاته ده‌رێ. نۆکه‌ره پێی گوت: «ها ئه‌وه میوانی تۆی.» کچه به ڕوویه‌کی خۆشــه‌وه ده‌ســتی منی گرت و بردمییه ماڵێکی زۆر خۆش و ڕازاوه‌وه. ئه‌من ســه‌رنجی ئه‌و که‌نیزه‌م دا ده‌تگوت مانگی چارده‌یه. دوو دانه کڵفه‌ت له خزمه‌تی دابوون وه‌ک و گه‌لاوێژ و ئه‌ســـتێره‌ی به‌ربه‌یـان بوون. دوای ئه‌وه که‌نیزه‌که دانیشــــت و منی له په‌نا خۆی دانا و داوای خوارده‌مه‌نی کرد. کڵفه‌ته‌کان له‌ڕێوه سفره‌یه‌کیان ڕاخست و هه‌موو جۆره چێشتێکیان هێنا و دایاننا.

کاکتێک خواردنه‌که‌مان خوارد. سفره‌که‌یان لابرد و شه‌رابیان هێنا. شیرینی و شه‌راب و مه‌زه‌یان دانا. ئه‌من مانگێک ئاوا له‌گه‌ڵ ئه‌و مانگ ڕوخســـاره ژیام. دوای مانگێک چووم بۆ گه‌رما و گه‌ڕامه‌وه بۆ لای شــێخ و گوتم: «که‌نیزێکم ده‌وێ شـــه‌وی به بیســـت دینار بێ.» شـێخ گوتی: «زێڕم بێنه.» ئه‌من چوومه‌وه ماڵێ زێڕم هێنا و شـه‌شـه‌ســه‌د دینارم دایه بۆ مانگێک. ئه‌ویش پاره‌که‌ی لێ وه‌رگرتم و بانگی نۆکه‌رێکی کرد و گوتی ئه‌و به‌ڕێزه به‌ره بۆ گه‌رماو. نۆکه‌ره منی برد بۆ گه‌رماو و پاشـــان بردمی بۆ ماڵێک و له ده‌رگای دا. که‌نیزێک هـات ده‌رگـای کرده‌وه. نۆکه‌ره گوتی: «ئه‌و به‌ڕێزه میوانی تۆیه.» ئینجا که‌نیزه منی به شێوازێکی زۆر جوان برده لای سـه‌ره‌وه‌ی دیوێک دایـنام. ئه‌وجار داوای خوارده‌مه‌نی کرد. خوارده‌مه‌نی جۆراوجۆریان دانا. خواردنه‌که‌مان خوارد و دوای ئه‌وه که‌نیزه ده‌ســــتی دا عوود و ئه‌و دوو شێعره‌ی به ئاواز چڕی.

گه‌ر بێتوو خـــــــــــــــــودا بیدا له سه‌یرانگه و باخێک
یـاری شـــیـریـن بێته لات، بۆت تێ بـکـا په‌رداخـێـک
دانــــــــــــــیشی به کاوه خۆ پرچی بۆ بهۆنییه‌وه
جـارجـار لاجـانـگـی مـاچ که‌ی قـوم قـومه‌ش بـخـۆیه‌وه

مـانگێکی تەواو لە لای ئەو خـانمۆڵە خەریکی کەیف و خۆشـــی بووم. دوای ئەوە چوومەوە لای شـێخ و پێم گوت: «کەنیزێکم دەوێ کە شـەوی بە چل دینارە.» شـێخەکە گوتی: «پارەم بۆ بێنە.» ئەمنیش چووم هەزار و دووســـەد دینـارم بۆ هێنا و دامێ بۆ مانگێک. ئەمنی نارد بۆ لای کەنیزێکی زۆر جوان و مانگێکیش لە لای ئەو مامەوە.

دوای ئەوە چوومەوە لای شــێخ. جەنگەی شــێوخواردن بوو. گوێم لە ئاواز و دەنگە دەنگێک بوو. لە شێخم پرسـی: «ئەوە چ باسـە؟» شێخ پێی گوتم: «ئەو شـەو لە لای ئێمە پیرۆزترین شـەوە و لەو شـەوەدا خەڵک هەموو پێکەوە دەچن بۆ گەڕان و سـەیران. ئەگەر پێت خۆشـە بچووە سـەر بان و تەماشـایان بکە. ئەمن لەڕێوە هەسـتام چوومە سـەر بان. ســەیرم کرد لە ســەر بان پەردەیەک کێشــراوە و لە پشــت پەردەکەوە فەرشــی حەریر ڕاخراوە. کچۆڵەیەکی لێ بوو، چاو لەبەری هەڵنەدەهات و هۆشـی لە خەڵک بڕیبوو. لە پەنا ئەو کوڕێکی لێ بوو قۆز و کەشــخە دەتگوت مانگە. هەردووکیان دەســتیان لە ملی یەک کردبوو و یەکتریان ڕادەمووسی.

خەلیفە، من کە ئەوم دیت، نەمتوانی بە ســەر خۆمدا زاڵ بم. نەمدەزانی هەر لە ســەر زەویشم. هەر کە لە سەربان هاتمە خوارێ. کەنیزێک لە پەنام بوو لێم پرسی ئەرێ کیژێکی ئاوا و ئاوا لە سەر بان بوو ئەوە کێیە. تەواوی تایبەتمەندییەکانیم پێ گوت. ئەو کەنیزە لێی پرسیم: «ئەوت بۆ چییە؟» گوتم: «بە خودا عەقڵ و هۆشی لێ بڕیوم.» کەنیزەکە بزەیەکی هاتێ و گوتی: «ئەبوولحەســەن ئەو کیژەی تۆ دیوتە کچی تاهیری کوڕی عەلایە و خانمی ئێمەیە. ئێمە هەموو کەنیزی ئەوین. جا تۆ دەزانی ئەو شـەو و ڕۆژێکی بە پێنجسـەد دینارە و داخی لە ســـەر دڵی پادشـــایە.» ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم: «بە خودا دەچم و تەواوی ماڵەکەی خۆم دێنم بۆ ئەو کەنیشکە.»

ئیدی ئەو شەوە هەتا بەیانی لە تاوی ئەو کیژە حەجمینم نەبوو. هەتا بەیانی هەر جینگڵم دا. کە ڕۆژ بووەوە هەســتام، چووم بۆ گەرماو و جلی شــکۆدارانەم لە بەر کرد. هاتمەوە لای باوکی ئەو کیژە و پێم گوت: «کچێکم دەوێ شــەوی پێنجســـەد دینار بێ.» گوتی: «پـارەکەت بێنە.» ئەمن پـازدەهەزار دینـاری مـانگی یەکەمم بۆ بژارد و دامێ. ئەویش زێڕەکانی لێ وەرگرتم و بە نۆکەرێکی گوت ئەوەی بەرە لای خانمەکەت. نۆکەرەکەی منی برد بۆ ماڵێک کە ماڵی ئەوەندە خۆش و ڕازاوەم لە ســەر زەوی نەدیتبوو. کاتێک چوومە ئەو ماڵەوە. سـەیرم کرد ڕاسـت ئەو کیژە لەوێ دانیشـتبوو. خەلیفە هەر کە دیتم، هۆش و گۆشم نەما.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی نۆسەد و پەنجایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! ئەو لاوە بە خەلیفە گوت: «خەلیفە، تەماشـــام کرد ئەو کچە وەک مانگی چاردە دەدرەوشێ. وەک شاعیر دەڵێ:

نـــیـیە عەیـــبـــی بەژن و بـــاڵا و ڕەوتـــی ڕۆیـــنـــت
گـــاوریـــش بـــی، تـــازە مـــن دێـــمە ســـــەر دیـــنـــت
دەیـــکەمە قـــوربـــانـــت، ســـــی پـــارەکەی ئـــۆلـــم
دەبـــا پـــێـــم بـــڵـــێـــن، گەوج و گەمـــژە و حەپـــۆلـــم
تـــۆم هەبـــێ بـــۆچـــیـــمە، ئەوەی غەیـــری تـــۆیە
تـــۆم نەبـــێ مـــن بەشـــــم، هەر شـــــیـــن و ڕۆ ڕۆیە

شاعیرێکی دیکەش دەڵێ:

چ نوقڵێ بێنمە ســـــــــــــــــــــــلاوت کە ژیانت حلاوات کا
من بە دیـــــــــــــاری چ گوڵێکت لە یەخەی دەم لە ســیمات کا
شای جـــــــــــــوانانی گوڵەکەم تۆ، کوا بە دەردی من دەزانی
شـــــەیدا بووە و شـــێواوە دڵ، لێی گەڕێ با خۆی فیدات کا

دوای ئەوە چووم سـلاوم لە کچەکە کرد. ئەویش سـلاوەکەی ئەسـتاندمەوە و دەسـتی گرتم و لە پەنای خۆی دانیام. هێندە بە تاســـوەی بووم لە تاوان جەنگەی جیابوونەوەم هاتە بەر چاو و ئازار و ناخۆشییەکانی کاری لە دڵم کرد و ئەو شیعرەم خوێندەوە:

یەک چرکە، چرکەی جـــــــــــــــــــیابوونەوە
بە مـــــــــــــــــــێشکمدا هات لە خۆ بوومەوە
دەروونـــــــــــــــــــــم پڕ بوو، لە ئازار و خەم
ناتوانم شـــــیرنی و خۆشـــــیش هەســـــت بکەم

دوای ئەوە داوای کرد، خواردەمەنی بێنن. چوار کەنیزی مەمک هەناری، ســـــفرەیان لە پێش ڕاخسـتین و هەموو جۆرە خواردەمەنییەکی خۆشـی وەک هەڵوا و شـیرینی و شـەراب و میوەیان لە پێش دانابن. لەو شـتانەی کە شـیاوی شـایانن. ئێمە خواردنەکەمان خوارد و دەســـــتمـان کرد بە خواردنەوە. لەو جەنگەیەدا کیژێک توورەکەیەکی حەریر هێنـا. کچە

تووەکەی کردەوە و عوودێکی لێ دەرهێنا و تاڵەکانی گشــت کردەوە و ئەو دو شــێعرەی خوێندەوە.

تۆ کە دەســـتـت لە قـــــەدی یـار وەرێنی
ماچی شـیرین لە لـــــــــــێوی یار ستێنی
دەزانی خۆ بە قـــــــــــــوربان کردن چییە
گیـانی شـــیرین لە ئـاســـتی ئەو هیچ نییە

خەلیفە، ئەمن ماوەیەکی زۆر ئاوا لە لای ئەو بووم، تا وای لێ هات تەواوی ماڵەکەم دانا. کە زانیم هیچم نەماوە لە پڕدا هەستم کرد، دەبێ لێی جیا بمەوە. دەستم کرد بە گریان. کچە گوتی: «ئەوە بۆ دەگری؟» گوتم: «خـانمەکەم لەوەتی لە لای تۆم بـاوکـت هەموو شەوێ پێنجسەددیناری لێ ئەستاندووم، ئێستا هیچم نەماوە. شاعیر ڕاست دەکا دەڵێ:

لەبەر دڵی، تا زێڕ و دیـــــــــــــــنارت هەبێ
کە نەتمـا زێڕ و دینـار، شـــەقـت دەبـــــێ

کچە گوتی: «باوکم عادەتی وایە ئەگەر کەسـێک لە لای ئەو تووشـی دەسـتکورتی بێ هەتا سێ ڕۆژان میوانداری دەکا و دوای ئەوە دەری دەکا. بەڵام من تۆم زۆر خۆش دەوێ، خۆت ڕاگرە هەتا بزانم فکرێکت بۆ ناکەمەوە. چونکە تەواوی ماڵەکەی بابم لە لای منە و ئەو هیچ ئاگاداری ئەو ماڵەی نییە و نازانێ چەندی هەیە. ئەها فکرێکم بە زەین گەیشـــت. ئەمن هەموو ڕۆژێ توورەکەیەکت دەدەمێ کە پێنجســـەد دینـاری تێدا بێ. ئەتۆ ئەو توورەکەیە بدە بە باوکم. ئەویش دەیداتەوە بە من. ڕۆژێکی دی دیســـان توورەکەیەکت دەدەمێ و تۆش بیدەوە بە باوکم. ئاوا هەتا بزانین چیمان بە سەر دێ.

خەلیفە، ئەمن کە ئەو قسـەیەم بیسـت، سـپاسـم کرد و دەسـتیم ماچ کرد و هەتا سـێ سـالان لە لای مامەوە و لەوپەڕی خۆشـیدا لەگەڵم ڕادەبوارد. هەتا وابوو ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکێک لە کەنیزەکانی زۆر ئازار دا و نارەحەتی کرد. کەنیزە سـوێندی خوار کە ئەو چۆنی ئەو ئازار داوە ئەویش تۆڵەی خۆی بکاتەوە و ئازاری بدا. ئەو کەنیزە بەو کارەی ئێمەشـی دەزانی. هەر بۆیە لەڕێوە هەسـتا چوو بۆ لای باوکی ئەو کیژە گوڵڕوخسـارە و نهێنییەکەی لە لا درکاندبوو. تاهیر کوڕی عەلا هەســـتا و هات بۆ لای من. لەو جەنگەیەدا من لە کن کچەکەی دانیشـــتبووم. پێی گوتم: «فلانی.» گوتم: «بەڵێ.» گوتی: «ئێمە عادەتمان وایە کاتێک بازرگانێک مافنگی دەبێ، هەتا سێ ڕۆژان میوانداری دەکەین و دوایە دەری دەکەین. ئەتۆ ئەوە یەک ساڵە دەخۆی و دەخۆیەوە و ئەوەی دڵت ویستوویە کردووتە. ئێنجا ڕووی

لە کۆیلەکانی کرد و گوتی: «دا ڕووتی کەنەوە.» نۆکەرەکانی جلەکانیان لە بەر داکەندم و جلەکۆنێکی پێنج درەم بـاییـان دامێ لە بەری کەم. دە درەمی نوقرەشـــی دامێ و گوتی: «زۆرم مایە بۆ داناى، لێم نەداوی و قسـەی ناخۆشـم پێ نەگوتووی. ئێسـتا بڕۆ بە لای کاری خۆتەوە. ئەگەر لەو شارەش نەڕۆی خوێنی خۆت لە سەر خۆتە و بە زایە دەچی.

خەلیفە، ئەمن سەڵتوقوڵت و مافنگی بە دڵێکی شکاوەوە هاتمە دەرێ. نەمدەزانی ڕوو لە کوێ کەم. هێندە نارەحەت بووم، خەریک بوو دڵم بتۆقێ. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەخە چۆن دەکرێ بە هەزاران هەزار دیناری زێڕەوە بێمە ئەو شـــارە و تەواوی لە ماڵی ئەو شـــێخە گلاوەدا دانێم و بە گیرفانی خاڵی و مایەپووچی و ڕووتی لە لای ئەو بێمە دەرێ؟»

ســـێ ڕۆژان لە بەغـدا مـامەوە، دمم لە خواردن و خواردنەوە نەدا. ڕۆژی چوارەم پاپۆڕێکم دیت بەرەو بەسرە دەچوو، سوار بووم و چووم بۆ بەسرە. لە بەسرە چوومە ناو بازاڕ. زۆر زۆرم برسـی بوو. تووشـی کابرایەکی بەقاڵ بووم کە ئاشـنای باوکم بوو، لە باوەشـی گرتم و لێی پرسـیم کە بۆ ئاوا شـێواوم؟ ئەمن تەواوی ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە. گوتی: «ئەو کارە کارێکی ژیرانە نییە، دەی ئێسـتا بە تەمای چی بکەی و ڕوو لە کوێ بکەی؟» گوتم: «مامە بە خودا نازانم چی بکەم.» گوتی: «دەتوانی لە لای من دانیشـی و حیسـابی دووکانم بۆ بنووسـی؟ ڕۆژێ دە درەمیشـت دەدەمێ و خورد و خۆراکیشـت لە سەر من بێ.» گوتم: «دەتوانم و دەیکەم.»

خەلیفە، سـاڵێک لە لای ئەو مامەوە. هەتا سـەد دینارم پەیدا کرد. ئەوجار لە قەراغ دەریا دووکانێکم کردەوە بۆ ئەوەی بەشکوو پاپۆڕێک بێ و کاڵای بازرگانی پێ بێ. تا بەو زێڕەی پـاشـەکەوتم کردووە کەمێک کەلوپەل بکڕم و بەرەو بەغـدا بڕۆم. ئیـدی بەردەوام لەو خەیاڵەدا بووم. تا ڕۆژێک کەشـتی هاتن و بازرگانان بۆ کڕینی شـتومەک ڕۆیشـتن بۆ لای کەشـتییەکان. منیش لەگەڵ ئەوان چووم. کاتێک گەیشـتینە لای کەشـتییەکان. خاوەن کەشـتییەکان بە کۆیلەکانیان گوت دا شـتەکان دەرێنن. کۆیلەکان شـتێکیان ڕاخسـت و هەمبانەیەکیان لە خورجێنێک دەرهێنا و لە سەر ڕاخەرەکە هەڵیان ڕشت. خەڵک کە چاویان بەو گەوهەر و مرواری و یاقووت و ئاقیقە کەوت، هێندەیان پێ جوان بوو، هەموو چاویان زەق بووەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نۆسەد و پەنجا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! ئەو لاوە باســـی بازرگانەکانی کرد و دوای ئەوە گوتی: خەلیفە، بازرگانەکان نرخیان لەســـەر دانا و نرخیان بردە ســـەریّ هەتا گەیشـــتە چوارســـەد دینار. خاوەن هەمبانەکە لە زووەوە منی داناســـی و یەکترمان خۆش دەویســـت. لە منی پرســـی: «ئەوە بۆ ئەتۆ هیچ نالّیی و وەک و بازرگانەکان نرخ نابەیە ســـەریّ؟» گوتم: «کاکە بە خودا ئەمن لە مالّی دنیادا لە سەد دینار زیاترم نەماوە. ئاوام گوتم و هێندە ناڕەحەت بووم، فرمێســـکم هاتە خواریّ. ئەو بازرگانە ئاگای لیّ بوو، ناڕەحەتبوونەکەی من کاری تیّ کرد. هەر بۆیە گوتی: «بازرگانەکان ئێوە شـــایەد بن کە ئەو گەوهەر و یاقووت و مرواریی و شـــتەی لەو هەنبانەیە دایە هەمووم بەو گەنجە فرۆشـــت بە ســـەد دینار. هەر چەند دەزانم نرخەکەشـــیان لە چەندین هەزار دیناریش زیاترە. بەلاّم با ئەوانە دیارییەک بن لە منەوە. ئیدی گەوهەرەکانی بە هەمبانە و خورجێنەوە دا بە من. منیش و خەلّکەکەش دەستخۆشیمان لیّ کرد و دۆعای بە خێرمان بۆ کرد.

ئیدی گەوهەرەکانم هەلّگرت و چووم بۆ بازاڕی گەوهەرفرۆشان و دستم کرد بە کڕین و فرۆشتنی گەهەر و مروارای و یاقووت و شتی لەو جۆرە. یەکێک لەو گەوهەرانە بەردێکی ســـوور ســـووری مشـــت و مالّ دراو بوو. کە نیو ڕەتلّ واتە چل و دوو مســـقالّێک بوو کە شوێن پێی مێروولەی لە سەر نەخشابوو. من نرخەکەیم نەدەزانی. ئیدی ئەو بەردەم دا بە دەلّلال. دەلاّلیش ســـــوورێکی پیّ دا و بۆی هێنامەوە و گوتی: «کەس لە دە درەمی زیاتر نەدامیّ.» منیش گوتم: «بم دەوە من بەو قیمەتانەی نادەم.» دەلاّلەکە بۆی هاویشتمەوە نێو کۆشـــم و گەڕاوە. دوای ئەوە ڕۆژێکی دیکە دامەوە بە دەلّلا و نرخەکەی گەیشـــتە پازدە درەم. ئەمن تووڕە بووم و لە دەلاّلەکەم وەرگرتەوە و لە بالّ شـــتەکانم خســـتەوە. هەتا وا بوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان کابرایە هات و ســـلاّوی کرد. گوت:ی«ڕێم دەدەی چاوێک لە شتەکانت بکەم.»

خەلیفە، ئەمن ڕێم دا. چاویان لیّ بکا. بەلاّم من هەر لە بیر ئەو بەردە ســـوورە دا بووم، بلّێی نرخی چەند بیّ و بە چەندی بدەم. ئەو کابرایە دوای ئەوی جوان چاوی لە شـــتەکانی من کرد، جگە لەو بەردە ســـوورە هیچی دیکەی هەلّنەگرت. ئەو بەردەی ســـوورەی هەلّگرت و دەســـتێکی پێدا هێنا و ماچی کرد و شـــوکری خودای کرد. دوای ئەوە گوتی: «کاکە گەلۆ ئەوە دەفرۆشی یان نا؟» ئەمن کەمێک بە ناڕەحتییەوە گوتم: بەلّیّ دەیفرۆشم. نرخەکەی لیّ پرسـیم. ئەمن گوتم: «تۆ بە چەندت دەویّ؟» کابرا گوتی: «بە بیســـت دینار دەیدەی؟» پێم وا بوو، گالّتەم پیّ دەکا. گوتم: «ســـــەر چاوم. بڕۆ بە لای کاری خۆتەوە.» گوتی: «پەنجا

دینارت دەدەمێ.» ئەمن هیچم نەگوت. گوتی: «هەزار دینارت دەدەمێ.»

خەلیفە، ئەوەنـدەی ئەو نرخەکەی دەبردە ســـەرێ ئەمن هیچم نەدەگوت: «ئەو بەو بێدەنگییەی من پێدەکەنی و دەیگوت: «بۆ وڵام نادەیەوە؟» ئەمن دەمگوت: «برۆ بە لای کاری خۆتەوە، ئەوەندەم ڕق هەستابوو. خەریک بوو، وەریگەڕێمێ. ئەو هەزار پێوەی زیاد دەکرد و ئەمن هیچم نەدەگوت و وڵامم نەدەداوە. هەتا گوتی: «بە بیســت هەزار دینار دەیفرۆشـی یان نا؟» ئەمن هەر وامدەزانی گەممەم لەگەڵ دەکا. خەڵک لێمان کۆ ببوونەوە و هانیان دەدام بیفرۆشـــم. ئەوجار منیش گوتم: «گەلۆ تۆ دەیکڕی یان کایەم پێ دەکەی؟» ئەویش گوتی: «ئەی تۆ دەیفرۆشـی یان کایەم پێ دەکەی؟» ئەمن گوتم: «بە خودا قەسـەم دەیفرۆشم.» کابرا گوتی: «سی هەزار دینارم لێ وەرگرە و حەڵاڵمی کە.» ئەمن خەڵکەکەم لێ بە شـایەد گرت و گوتم: «ئەوە پێم فرۆشـت بەو مەرجەی تایبەتمەندییەکانیم پێ بڵێ.» ئنجا من حەڵاڵم کرد و ئەویش زێڕی دەر هێنا و دەســتی کرد بە بژاردن و پارەکەی دامێ و منیش بەردەکەم دایە. لێی وەرگرتم و لە گیرفانی نا. ئەویش خەڵکەکەی بە شــایەد گرت. کە ســـەوداکەمـان تەواو بوو. پاشـــان ڕووی لە من کرد و گوتی: «فەقیر، ئەگەر پێت نەفرۆشتبام و کەمێکی دیکە خۆت ڕاگرتبا بە هەزارهەزار دیناریش دەمکڕی.»

خەلیفە، ئەمن کە ئەو قســەیەم لەو بیســت خوێنم ویشـک بوو. ڕەنگم زەد هەڵگەڕا. ئەو زەردییەی دەیبینی ئی ئەوەیە.

دوای ئەوە بەو کـابرایەم گوت: «ئەوە چییە وا حـازر بووی هەزارهەزار دینـاری پێ بدەی. بۆ چی دەبێ؟» کابرا گوتی: «پادشای هێند کچێکی هەیە، کە جوانییەکەی بێ وێنەیە. ئێســتا شــێت بووە. پادشـــاش تەواوی نۆژدار و کاهین و زایایانی کۆ کردووەتەوە کەس نەیتوانیوە چاری بکا. ئەمن لە کۆڕەکەیاندا بووم، بە پادشام گوت: کە ئەمن پیاوێک دەناسم، نێوی سەعدوڵلا بابلییە و لە دونیادا کەس لەو زاناتر نییە. ئەگەر پادشا بە سـەڵاحی بزانێ، من بنێرێرێ لە دووی ئەو. پادشـــا وڵامی دامەوە گوتی: «بچووە لە دووی.» ئەمن گوتم: «کڵۆیەکم ئاقیق دەنێ. لەڕێوە کڵۆیەکی گەورەیان ئاقیق، لەگەڵ ســـەدهەزار دینار و دیاری گرانبایی بۆ هێنام. ئەوانەم وەرگرت و بەرەو شـــاری بابل کەوتمە ڕێ. کە گەیشـــتمێ پرسیاری ماڵی شێخم کرد. پێشـانیان دام. من هەزار دینار و دیارییەکانم دا بە شێخ. شێخ ئەوانەی لە من وەرگرت و داوای کڵۆ ئـاقیقەکەی کرد. بـانگی بەرد بڕێکی کرد و ئەو دۆعایەی لە ســـەر نووســـی. شـــێخ حەوت مانگان بە نێو ئەســـتێرەکاندا ڕوانی هەتا ئەو هێڵانەی هەڵبژارد بۆ نووسین. دوای ئەوە، ئەو تەلیسـمانەی ئاوێتەی ئەو ئاقیقە کرد. ئەمن هێنامەوە بۆ لای پادشای هێند.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! هەرکە ئەو ئاقیقەیان بە کچەدا کرد، لەڕێوە کچە چاک بووەوە. ئەویان بە چوار زنجیر بەستبووەوە. هەر شەوەی چوار کەنیزە لە لای دەخەوتن. بۆ بەیانی هەر چوار کەنیزەکە کوژرا بوون. دوای ئەوەی ئەو حەمـایەڵەیـان لە ملی کرد، بەرەو چاکبوونە چوو. لە دەست نەخۆشی ڕزگاری بوو. پادشا کەیفی ساز بوو، گەشاوە. خەڵات و دیارییەکی زۆری دا بە من. دوای ئەوە ئیدی ئەو ئاقیقەیان بە ملی کچەدا کرد.

ڕێکەوت وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان، کچی پادشا لەگەڵ کەنیزەکانی هەر بە ئیشتیا چوون بۆ گەڕان بە ناو دەریادا. کچی پادشا لەگەڵ کەنیزەکان خەریکی کایە و دەستبازی دەبێ کە دەســـتی یەکێک لە کەینزەکانی لە ملوانکەکەی دەگیرێ و دەپســـێ. حەمایەڵەکە لە دەریا دەکەوێ. دوای ئەوە کچی پادشـا لە ڕێوە نەخۆش کەوتەوە. پادشـا زۆر پەشـێو و خەمبار بوو. ماڵێکی زۆری دا بە من و گوتی: «بچووە بۆ لای ئەو شـێخە پێی بڵێ با نوشـتەیەکی دیکەی بۆ بنووسێ.» ئەمن چووم بۆ لای شێخەکە. کەچی مردبوو. گەڕامەوە بۆ لای پادشا و پێم گوت مردووە. پادشـا دە کەسـی لە گەورە پیاوان لەگەڵ خسـتم، هەتا بە شـاراندا بگەڕێین بەشـکوو چارەیەکی بۆ ببینینەوە. سـپاس بۆ خودا وا ڕێگە چارەی چابوونەوەی ئەو کچە لە لای تۆ بوو.

خەلیفە، کابرا ئاقیقەکەی هەڵگرت و لێی دا ڕۆیشـــت. جا هۆی ڕەنگ زەردییەکەی من ئەوەیە. دوای ئەوە ماڵەکەم هەڵگرت و هـاتم بۆ بەغدا. هـاتم لەو مـاڵەوە. بۆ بەیانییەکەی جلوبەرگی شـــکۆدارم لە بەر کرد و چووم بۆ ماڵی تاهیری کوڕی عەلا، بەشـــکوو ئەوە گراوەکەی خۆم ببینم. چونکە لەو ماوەیدا زۆرم بیر کردبوو. کە چووم. تەماشـــا دەکەم ماڵەکەیان وێران بووە. لە کۆیلەیەکم پرســـی ئەو شـــێخە چی لێ هاتووە؟ وڵامی دامەوە گوتی: «کاکە گیان، ســاڵێکیان کابرایەکی بازرگان کە ناوی ئەبوولحەســەنی عەممانی بوو. هات بۆ لای شـێخ و چەند ســاڵێک لەگەڵ کچەکەی ئەو بوو. دوای ئەوەی ماڵەکەی تەواو بوو شـێخ ئەوی بە دڵشـکاوی دەرکرد. کچی شـێخیش هێندەی ئەو لاوە بازرگانە خۆش دەویســـت لە تاوانی نەخۆش کەوت و کەوتە گیانەڵڵاوە. بابی هۆکاری نەخۆشـــییەکەی دەزانی. پیاوی بە شـــاراندا بڵاو کردەوە و گوتی: «هەرکەس ئەو لاوە ببینێتەوە ئەمن دەهەزار دیناری دەدەمێ. تا ئێستا کەس سـۆراغی نەکردووە و نەیدیوەتەوە. کچەش ئەوە خەریکە دەمرێ.» گوتم: «بـاوکی کچە چۆنە؟» کۆیلەکە وڵامی دامەوە گوتی: «هەموو کەنیزەکانی فرۆشـتووە.» ئیدی ئەمن بە کۆیلەکەم گوت: «ئەگەر پێت خۆشـە، پێت دەڵێم ئەبوولحەسـەنی عەممانی لە کوێیە.» کۆیلەکە خۆی بەســەر قاچم دادا و لە بەرم پاڕاوە و

گوتی پێم بڵێ. منیش گوتم هەســـتە بچووە بۆ لای بـاوکی کچەکە و بڵێ مزگێنیم دەیە ئەبوولحەســـەن لە بەر دەرگا وێســـتاوە. کۆیلەکە بە لەز دەرچوو. ئەوەندەی پێ نەچوو، لەگەڵ شـێخ تاهیر کوڕی عەلا گەڕاوە. شـێخ کە منی دیت گەڕاوە ژووریێ دەهەزار دیناری هێنا دای بەو کۆیلەیە و بەڕێی کرد. کابراش دۆعای بەخێری بۆمن کرد و ڕۆیشـــت. ئیدی شـێخ هات بۆ لای من و باوەشـی پێدا کردم و دەسـتی کرد بە گریان و گوتی: «ئەوە ئەو ماوەیە لە کوێ بووی کچەکەم ئەوە لە تـاوی تۆ نەخۆش کەوتووە و خەریکە دەمرێ؟» ئیدی منی لەگەڵ خۆی بردە ژووریێ. ئەوجار سووژدەی شوکری برد و گوتی: «سپاس بۆ خودا کە بە هاتنەوەت منت دڵخۆش کرد.» ئەوجار هەســـتا چوو بۆ لای کچەکەی و پێی گوت: «کچی من هەسـتە خودا لە دەسـت خەم و نەخۆشـی ڕزگاری کردی.» کچە گوتی: «بابە هەتا چاوم بە سـیمای ئەبوولحەســـەن نەکەوێ چاک نابمەوە.» شـێخ پێی گوت: «ئەگەر هەسـتی پارووپەک نان بخۆی و بچییە گەرماو منیش ئەوت پێشـان دەدەم.» کچە پرسی: «بابە توخودا بە ڕاستتە؟» شێخ وڵامی داوە کچەکەم بە خودا درۆت لەگەڵ ناکەم و بە ڕاسـتمەوە.» کچە گوتی: «ئەگەر چاوم بەو کەوێ پێویستیم بە شت خواردن نابێ.» ئیدی شـێخ ئاماژەی کرد بچن ئەبوولحەســـەن بێنن. ئەمن لەگەڵ کۆیلەکە وەژوور کەوتم. کچە کە چاوی بە من کەوت بێهۆش بوو. کە وەهۆش هاتەوە ئەو شێعرە خوێندەوە:

هەرچی هیوایە لە بـــــــــــــــــــێ هیوابیدا سەر هەڵدەدا
لە لووتکەی دەســـەڵاتـایە ڕۆژ جێ بە شـــەو لەق دەکـا

دوای ئەوە هەستا سەر قوون و گوتی: «گەورەم بە خودا قەت باوەڕەم نەدەکرد ڕۆژێک بتبینمەوە. ئیدی منی لە ئامێز گرت و دەسـتی کرد بە گریان و گوتی: «ئەبوولحەسـەن ئەو جار تێر دەخۆم و دەخۆمەوە.» لەڕێوە خواردن و شەرابیان ئامادە کرد.

خەلیفە، ئەمن ماوەیەکی زۆر لە لای مامەوە تا تەواو هاتەوە ســـەرخۆی و بووژاوە. ئینجا باوکی قازی و شـــایەدی بانگ کرد و کچەی لێ مارە کردم و خەڵک نان درا.[1] ئەو لاوە هەتا ئێرەی قســـەکانی گێڕاوە هەســـتا لە لای خەلیفە ڕۆیشـــت و چووە ژووریێ. لەو سەری کە هاتەوە کوڕێکی جوانچاک و ڕەزاسووکی لەگەڵ خۆی هێنا و پێی گوت کڕنۆش بۆ خەلیفە بەرە. کوڕە کڕنۆشی برد. خەلیفە سەری لە جوانچاکی و ڕێکوپێکی کوڕە سووڕ مابوو. خەلیفە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لەگەڵی بوون گەڕانەوە بۆ دارولخەلافە و گوتی: «جەعفەر ئەمن شـتی ئەوەندە سـەیرم نەدیتووە و نەبیسـتووە.» ئەوجار بە مەسـرووری گوت: «تەواوی پیتاکی بەســـرە و بەغدا و خوراســـانم، لە ســـەر یەک بۆ کۆ کەوە و

---

[1]. خەڵک نان دان: ئاهەنگ بەڕێوە بردن و ناندانی خەڵک.

پەردەیەکی بە سەردا بکێشن» بە جەعفەری وەزیریشی گوت: «ئەبوولحەسەنیش بانگ کەن بێتە ئێرە.»

کە ئەبوولحەسەنیان هێنا. کڕنۆشی بۆ خەلیفە برد. بەڵام نیگەران لەوەی کە خەلیفە بانگی کردووە. خەلیفە فەرمانی دا پەردەیان لە سەر ڕێز و شتەکە لا دا. ڕووی لە ئەبوولحەسەن کرد و گوتی: «عەممانی!» ئەبوولحەسەن گوتی: «بەڵێ خەلیفە، خودا شکۆ و دەسەڵاتت بپارێزێ.» خەلیفە گوتی: «ئەبوولحەسەن ئەو ماڵە پیتاکی سێ ناوچەیە، پێم بڵێ ئەوە زۆرترە یان ئەو پارەیەی لە ئاقیقەکە لە دەستت دا؟» ئەبوولحەسەن تێدا ما و گوتی: «خەلیفە ئەو ماڵە چەندین بەرابەری ئەو ماڵەیە کە من بە فرۆشتنی بەردە دۆعاکە لە دەستم دا.» خەلیفە گوتی: «خەڵکینە ئێوە شایەد بن ئەو ماڵەم بەو لاوە بەخشی.» ئەبوولحەسەن کڕنۆشی برد و تریق بووەوە. هێندە خۆشحاڵ بوو لە خۆشیان دەستی کرد بە گریان. کە فرمێسک بە کوڵمەیدا هاتە خوارێ، گۆنای سوور بووەوە و ڕەنگی هاتەوە سەرخۆ و وەک مانگی چاردەی لێ هاتەوە. خەلیفە گوتی: «پاکە خودایەک کە نەگۆڕە و ئاڵوگۆڕی بە سەر ڕەنگ و حاڵی مرۆڤەکاندا دێنێ.» ئەوجار فەرمانی دا ئەو ماڵە بەرنە ماڵی ئەبوولحەسەن و بە ئەبوولحەسەنیشی گوت: «پێم لێ مەبڕە.» ئیدی ئەبوولحەسەن هەتا مرد بەردەوام هاتوچۆی خەلیفەی هەر کرد.

### بەسەرهاتی دوو ئەڤینداری هەیڤاسا[1]

یەکی دیکە لەو بەسەرهاتانە، ئەوەیە کە دەگێڕنەوە: خەسیب، پادشای میسر، کوڕێکی هەبوو لە دونیادا کەس لەو کوڕە جوانچاکتر نەبوو. خەسیب پادشا ئەوەندەی ئەو کوڕەی خۆش دەویست بۆ نوێژی هەینی نەبایە قەت نەیدەهێشت بچێتە دەرێ. ڕۆژێک لە نوێژی هەینی دەهاتەوە بە لای کابرایەکدا ڕۆیشت کتێبێکی زۆری پێ بوو. گەڕاوە و لە ئەسپەکەی دابەزی. لە لای کابرا دانیشت و هەروا چاوی لە کتێبەکانی دەکرد. وا بوو لە نێو یەکێک لە کتێبەکاندا وێنەیەکی دیت، ئەو وێنەی لەوانە بوو بێتە گۆ. جوان لەوە جوانتر نەدەبوو.

جوانی ئەو وێنەیە هۆش و گۆشی برد و گوتی: «خاڵە، ئەو وێنەیەم پێ بفرۆشە.» کابرا کڕنۆشی بۆ برد و گوتی: «فرۆشی چی ئەوە هەر وا پێشکەشت بێ.» شازادە سەد دیناری زێڕی دا بە کابرا و کتێبەکەی هەڵگرت. ئیدی شەو و ڕۆژ چاوی لەو وێنەیە دەکرد و دەگریا. لە خەو و خواردن ببوو. ڕۆژێک لە بەر خۆیەوە گوتی: «خۆزگە لە کابرام دەپرسی کێ ئەو وێنەیەی کێشاوەتەوە. بەشکوو کابرای وێنەکێش بە خاوەنی ئەو وێنەی زانیبا و ئەگەر زیندوو با ئەوە کارێکم دەکرد پەیدای کەم و پێی بگەم. ئەگەر هەر لە خۆڕا

[1]. هەیڤاسا: مانگ ئاسا.

کێشابییەتەوە ئەوە لە بیرم دەکرد و لە خۆڕا بۆ شتێک کە نییە خۆم ئازار نەدەدا.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی نۆسەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! کە ڕۆژی هەینی هاتەوە، کوڕەکەی خەســیب چوو بۆ لای کابرای کتێبفرۆش. کابرا لەبەری هەســتا. شــازادە گوتی: «مامە گیان، ئەری وێنەکێشــی ئەو وێنە کێیە؟» کــابرا گوتی: «ئەو وێنەیە کــابرایەکی خەڵکی بەغدا کێشــــاوییەتەوە، کە ناوی ئەبولقاســـم ســـەندەلانییە. ماڵەکەیان لە گەڕەکی کەرخەیە. جا نازانم وێنەکە وێنەی کێیە.» ئیدی کوڕە لەڕێوە لە لای کابرا ڕۆیشــــت چوو نوێژی هەینییەکەی کرد و گەڕاوە ماڵێ. هەمبانەیەکی زێڕ کە بایی سیهەزار دینار دەبوو هەڵگرت و تا بەیانی ڕاوەســتا. شــەوەکی زوو لە ماڵ وە دەر کەوت. نەیهێشــت کەس پێی بزانێ. کە لە شــار چووە دەرێ تووشــی دەشــتەکییەک بوو لێی پرســی: «مامە ئەرێ لێرەوە تا بەغدا ڕێگای چەند ڕۆژە؟» کابرای دەشــــتەکی وڵامی داوە: «جا مامە گیان تۆ لە کوێ و بەغدا لە کوێ! لێرە تا بەغدا دوو مانگەڕێیە.» کوڕە بە کابرای گوت: «مامە ئەگەر تۆ من بگەیەنێ بەغدا ئەوە ســـەد دیناری زێڕ و ئەو ئەســـپە کە بایی هەزار دینارە دەتدەمێ.» ڕەوەندە گوتی: «الله علی ماتقول وکیل» (ئەوە خودا ئاگای لەو قسەیەت هەیە)، بەڵام ئەوشەو لە لای من بە. کوڕە بە قسەی کابرای کرد و شەو لە لای ئەو ماوە.

کازیوەی بیانی، ڕەوەندە کوڕەی ســوار کرد و لە ڕێی لاپەڕەوە تیژ تێپەڕی و گەیاندێ بەغدا. کابرای دەشــتەکی گوتی: «گەورەم، شــوکری خودا خۆ ســـلامەتی، ئەوەش شــاری بەغدا. کوڕە لە ئەسپەکەی دابەزی و ئەسپەکە و سەد دیناری زێڕیشی بۆ بژارد و دای بە کابرا. دوای ئەوە هەنبانەکەی هەڵگرت و بە پرسیار بەرەو گەڕەکی کەرخە ڕۆیشت. هەروا ڕۆیشــــت هەتا قەزا و قەدەر ئەوی بردە کۆڵانێک کە دە دووکانی ڕووبەڕووی یەکی تێدا بوو. لەو ســـەری کۆڵانەکە دەرگایەکی یەکپارچەی تێدا بوو. لەمبەرەوبەری دەرگاکە دوو دانە سەکۆی بەردی ڕوخام و مەرمەڕی لێ بوو. فەرشی باش باشی لەسەر ڕاخرابوو. لە سەر یەکێک لەو سەکۆیانە پیاوێکی جوانچاک و شایی بە خۆ دانیشتبوو. جلی شکۆدار و گرانبایی لە بەردا بوو. پێنج کۆیلەی جوان لە پێشی ڕاوەســتا بوون. کوڕە ئەو نیشــانانەی کە کابرای کتێبفرۆش پێی گوتبوو لە ســـیمای ئەو کابرایەیدا دەدی. ناســـییەوە و چووە ســڵاوی. ئەویش جوابی ســڵاوەکەی ســتاندەوە. چاک و چۆنی لەگەڵ کرد و لە لای خۆی داینــا. کوڕە گوتی: «ئەمن نــامۆم و دەمەوێ گەورەییم لەگەڵ بکەی و لەو کۆڵانەدا خانوویەکم بۆ پەیدا کەی.» ئەو کابرایە لەڕێوە هەرای کرد: «غەزاڵ.» کەنیزێک بە لەز بە بەڵێ بەڵێ هاتە دەرێ. کابرا بەو غەزاڵەی گوت: «خێرا چەند دانە لە خزمەتکارەکان بەرە و فلانە خانوو خاوێن کەنەوە و فەرش و شتی تێدا ڕاخەن. هەموو پێداویستییەکی ناو ماڵێش بەرنە ناوی بۆ ئەو گەنجە جوانچاکە. ئیدی کەنیزە هاتە دەرێ و ڕۆیشــــت. خاوەنی چۆنی

پێ گوتبووی کارەکانی ڕاپەڕاند. دوای ئەوە کابرا کوڕەی هەڵگرت و بردی بۆ ئەو خانووە. کوڕە گوتی: «گەورەم، کرێی ئەو ماڵە چەندەیە؟» کابرا گوتی: «کوڕی جوان، تا تۆ لەو ماڵەدا بی من کرێ لە تۆ وەرناگرم. دوای ئەوە کابرا بە کوڕەی گوت: «گەلۆ تۆ یاریی شەترەنج دەکەی؟» کوڕە گوتی: «بەڵێ.» چەند جارایان پێکەوە شەترەنج کرد. هەر کوڕە لە کابرای دەبردەوە. کابرا گوتی: «ئافەرین، بە ڕاستی تۆ کوڕێکی پێگەیشتووی. قەسەم بە خودا لەو بەغدایەدا کەسی تێدا نییە لە من بەرێتەوە. ئەوە تۆ لە منت بردەوە.» دوای ئەوە کابرا بە کوڕەی گوت: «کاکە گیان پێم خۆشە میوانم بی و بچینەوە ماڵی ئێمە.» کوڕە قەبووڵی کرد و لەگەڵی چووەوە ماڵێ.

کە چووە ژوورێ، سەیری کرد ماڵێکە نەخش و نیگارەکانی بە ئاوی زێڕ نەخشێنراوە و ڕازاوەتەوە. وێنە و فەرش و کاڵای جۆراوجۆری وا لە و ماڵە دا هەیە کە لە پەسن و تاریف نەدەهاتن. دوای دانیشتن کابرا فەرمانی دا خواردەمەنی بێنن. سفرەی، دەستکاری سەنعای یەمەنیان ڕاخست و چل جۆرە خواردەمەنیان لە سەر سفرەکە دانا کە یەک لە یەک خۆشتر و بە تامتر بوون. ئینجا کەمێکی خوارد و دەستی شۆرد. بەڵام ئەو کوڕە چاوێکی هەر لە وێنە و فەرشە جوانەکانی ئەو ماڵە بوو. ئاوڕێکی لە هەمبانەکەی داوە کە لە پەنا خۆی دانابوو. تەماشای کرد لێی نەمابوو! گوتی: «پەنا بە خودا، پارووە نانێکم خوارد بای درەمێک یان دوو درەم بوو، هەمبانەیەکیان لێ هەڵگرتم کە بایی سێ هەزار دیناری زێڕ و گەوهەر تێدا بوو. ئیدی بێدەنگ بوو. قسەی بۆ نەهات.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو کوڕە کە سەیری کرد هەمبانەکەی نەماوە، زۆر ناڕەحەت بوو. کابرا شەترەنجی هێنا و گوتی: «دێی یاری بکەین؟» کوڕە گوتی: «با بیکەین.» کە یارییەکەیان کرد، کابرای لێی بردەوە. کوڕە دەستی لە یاری هەڵگرت و هەستا. کابرا گوتی: «کوڕی چاک ئەوە چ بووە؟» کوڕە وڵامی داوە گوتی: «هەمبانەکەم دەوێتەوە.» کابرا هەستا و هەمبانەکەی بۆ هێنا و گوتی: «ها کاکە گیان ئەوەش هەمبانەکەت، لە لای من بوو. ئەو جار یاری دەکەی؟» کوڕە وڵامی داوە: «بەڵێ دەیکەم.»

ئەو جاریش کردیانەوە کوڕە لە کابرای بردەوە. کابرا گوتی: «چونکە هۆشت لە لای هەمبانەکەت بوو ئەمن لێم بردییەوە. کە هەمبانەکەم بۆ هێنایەوە تۆ لە منت بردەوە.» کابرا لێی پرسی: «جا ئەوجار پێم بڵێ لە کام شارەوە هاتووی؟» ئەو کوڕە وڵامی داوە: «لە میسرەوە.» کابرا گوتی: «چۆنە هاتووی بۆ بەغدا؟» لەڕێوە کوڕە وێنەکەی دەر هێنا و گوتی: «مامە، من کوڕی خەسیب پادشام، پادشای میسر. ئەو وێنەیەم لە لای کتێبفرۆشێک دیت. ئۆگری بووم و پرسیاری وێنەکێشەکەیم کرد. گوتیان، بکێشی ئەو وێنەیە خەڵکی بەغدایە. ماڵەکەیان لە گەڕەکی کەرخە و لە کۆڵانی زەعفەرانە. ئەبولقاسم سەندەلانی پێ دەڵێن. دوای ئەوە من کەمێکم ماڵ لەگەڵ خۆم هێنا و بە تەنیا هاتم بۆ ئێرە و بە کەسیشم نەگوت. ئێستا تکات لێ دەکەم بە گەورەیی خۆت ئەوبولقاسمم پیشان بدە. تا بزانم ئەو وێنەیەی چۆن کێشاوەتەوە. خاوەنی ئەو وێنەیە کێیە؟ هەرچیش بڵێ دەیدەمێ. ئەو کابرایە گوتی: «ئەبولقاسم سەندەلانی منم. بە ڕاستی سەیرە، چارەنووس چۆن ئەتۆی لە میسرەوە هێناوەتە ئێرە؟!»

کوڕە کاتێک گوێی لە قسەی ئەو بوو، لەبەری هەستا و دەستی ماچ کرد و پێی گوت: «تۆ ئەو خودایە پێم بڵێ ئەو وێنەیە کێیە؟» کابرا هەستا و گەنجەیەکی کردەوە و دوو سێ پەرتووکی دەهێنا کە چەند وێنەیان تێدا کێشرابووەوە، یەکێک لەو وێنانە ڕاست ئەو وێنەیە بوو. کابرا گوتی: «ڕۆڵە گیان، خاوەنی ئەو وێنەیە ئامۆزا و کچە مامی منە. خەڵکی بەسرەیە و باوکی پادشای بەسرەیە و ناوی «ئەبوولەیسە» ئەو کچەش ناوی جەمیلەیە. لە دونیادا کەس لەو جوانتر نییە. بەڵام ئەوەی هەیە پیاوی خۆش ناوێ، کەس ناوێرێ لە لای ئەو باسی پیاو بکا. چووم بۆ لای مامم بۆ خوازبێنی. ماڵێکی زۆریشم بە دیاری برد. کەچی وڵامی نەدامەوە. کچەکەی بیستبوویەوە. توورە بوو. چەند جاری پەیام بۆ ناردم. جارێک پێی گوتم: «ئەگەر خۆت بە ئاقڵ دەزانی لەو شارە مەمێنە و بڕۆ با نەکوژرێی. دەنا خوێنی خۆت لە ئەستۆی خۆت دەبێ.» چونکە دەمزانی چەند کچێکی خیلەسەر و ملهوڕە، هەستام

زۆر بە ناڕەحەتی بەسەرەم بەجێ هێشت و هاتمە دەرێ. ئیدی لەو دەمەوە هەر بە یادی ئەو، وێنەکەی لە کتێباندا دەکێشمەوە و بۆ ئەو شارەوشاریان دەنێرم. بەشک و وەدەست کوڕێکی جوانچاکی وەک تۆ بکەوێ و بە هەر شێوەیەک بێ خۆی بگەیەنێتێ.

کاتێک ئیبراهیم خەسیب ئەو قسەیەی بیست. سەری داخست و ماوەیەک چوو لە فکرەوە. سەندەلانی گوتی: «ڕۆڵە گیان، من لە بەسرە و بەغدا کەسی بە قەد تۆ جوانم نەدیوە. ئەمن پێم وایە ئەگەر تۆ ببینێ ئاشقت دەبێ. گەلۆ دەتوانی ئەگەر ڕازیت کرد و پێک گەیشتن بە حاڵ لە شوێنێکەوە پێشانی منی بدەیت؟» ئیبراهیم وڵامی داوە: «ئەی بۆ ناتوانم.» سەندەلانی گوتی: «دەیباشە لە لای من بە تا ئەو ڕۆژەی دەڕۆی.» ئیبراهیم گوتی: «ئەمن ناتوانم بمێنمەوە، گڕی ئەڤین خەریکە دەمسووتێنێ. سەندەلانی گوتی: «سێ ڕۆژان لێرە بمێنەوە، تا کەشتیت بۆ پەیدادەکەم.» برایم سێ ڕۆژان لەوێ ماوە. سەندەلانی کەشتییەکی بۆ جێبەجێ کرد، خواردەمەنی و شەراب و شتی بۆ تێ خست. کە سێ ڕۆژە تەواو بوو، بە ئیبرایمی گوت: «هەستە خۆت ساز کە بڕۆ، کەشتی ئامادەیە، کەشتییەکەش ئی خۆمە، خزمەتکارەکانی ناو کەشتییەکەش هەموو پیاوی خۆمن. ئەوە بە وانیشم ڕاگەیاندووە کە هەتا دەگەڕێیەوە، لە خزمەتت دا بن و کەمترخەمی نەکەن. ئیبراهیم لەڕێوە چوو سواری کەشتییەکە بوو. ماڵاوایی لە سەندەلانی کرد و کەوتە ڕێ. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە بەسرە. ئیبراهیم سەد دیناری زێڕی بۆ دەر هێنان بیانداتێ. کەچی ئەوان گوتیان ئێمە کار بۆ خاوەنمان سەندەلانی دەکەین. ئیبراهیم گوتی: «ئەمن کارم بەو نییە، ئەو پارەیەتان وەک دیاری دەدەمێ و لای ئەویش باسی ناکەم.» خزمەتکارەکانی کەشتییەکە دینارەکانیان لێ وەرگرت و دۆعای بەخێریان بۆ کرد. ئیبراهیم چووە ناو شاری بەسرە و پرسیاری گەڕەکی بازرگانەکانی کرد. گوتیان کە بازرگانەکان لە کاروانسەرای هەمەدانن. ئیبراهیم چوو بۆ ئەو بازاڕەی کە کاروانسەراکەی لێ بوو. خەڵک تەواو چاویان لە جوانی و قۆزی و ڕێکوپێکی ئیبراهیم بڕی بوو. ئیبراهیم چووە کاروانسەرا و پرسیاری دەرکەوانەکەی کرد. ئەویان پێشانی ئیبراهیم دا. ئیبراهیم سەیری کرد دەرکەوانەکە کابرایەکی پیرە کە لەسەر سەکۆیەک لە پشت دەرگای کاروانسەراکە دانیشتبوو. سڵاوی لێ کرد و ئەویش وڵامی سڵاوکەی داوە. ئیبراهیم گوتی: «مامە دیوێکی چاک و خاوێنم دەوێ. دەرکەوانەکە هەستا دەرگای دیوێکی جوان و ڕازاوە بە نەخش و نیگاری زێڕکفتی بۆ کردەوە و گوتی: «کوڕی جوان ئەو دیوە بۆ تۆ باشە.» ئیبراهیم دوو دیناری دەر هێنا و دای بە دەرکەوانەکە. دەرکەوانەکە دینارەکانی وەرگرت و دۆعای بە خێری بۆ کرد.

ئیبراهیم چووە ناو دیوەکە و دەرکەوان و بەردەستەکانی بۆ خزمەتی ڕاوەستان. ئیبراهیم دینارێکی دا بە دەرکەوانەکە و گوتی: «نان و گۆشت و هەڵوا و شەرابم بۆ بێنە.» دەرکەوانەکە چوو بۆ بازاڕ و بە دە درەم ئەو شتانەی ئیبراهیم گوتبووی هەمووی بۆ

کڕی. پاشـــماوەی درەمەکانی بۆ ئیبراهیم بردەوە. ئیبراهیم گوتی: «ئەوانە بۆ خۆت خەرج بکە.» دەرکەوانەکە زۆر خۆشحاڵ بوو. دوای ئەوە ئیبراهیم لەتێک نان و کەمێکی چێشت گل داوە و ئەوەی دیکەی دا بە دەرکەوانەکە و گوتی: «ئەوەی بەرە بە سەر بەردەستەکانتدا دابەشی بکە.» دەرکەوانەکە چێشت و شتەکەی دا بە بەردەستەکانی و گوتی: «باوەڕ ناکەم لەو دونیایەدا کەس لەو کوڕە بە دڵودەروونتر بێ. بێتوو ماوەیەک لێرە بمێنێتەوە خەنیمان دەکا.» دوای ئەوە دەرکەوانەکە هات بۆ لای ئیبراهیم ســـەیری کرد دەگری؟ ئیدی لە لای دانیشـــت و لاقی بۆ داماڵی و ماچی کرد و زوو زوو لێی دەپرســـی بۆ دەگری؟ ئیبراهیم گوتی: «مامە، هەر لێم مەپرســـە، بەڵام ئەوشـــەو پێم خۆشـــە لەگەڵم دانیشـــی شـــەراب بخۆینەوە.» دوای ئەوە پێنج دیناری دا بە دەرکەوان و پێی گوت: «بچوو شەراب و گوڵ و مەزەی پێ بکڕە.» پێنج دیناریشـــی دایە و گوتی: «بەو پێنج دینارەش مراوی و کەو و عوودی پێ بکڕە.» دەرکەوانە کە هاتە دەرێ و چوو ئەوەی کە ئیبراهیم گوتبووی هەمووی کڕی و بردییەوە دای بە خێزانی گوتی: «ئەوشـەو چێشـتێکی خۆشـمان بۆ لێ نێ. کوڕێک ئەوڕۆ هاتووەتە کاروانســـەرا وەک ڕەحمەتێک بەســـەرماندا ڕژاوە.» ژنی دەرکەوانەکە چێشـتێکی خۆشـی سـاز کرد. دوای ئەوە دەرکەوانەکە چێشـت و شـەرابەکەی هەڵگرت و چوو بۆ لای ئیبراهیم.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! کە دەرکەوانەکە خواردەمەنی و شــەرابەکەی برد بۆ لای ئیبراهیم. نانەکەیان خوارد و شــەرابەکەیان خواردەوە و کەیفیان ســاز بوو. ئەوجار ئیبراهیم بەدم مەستییەوە گریا و ئەو بەیتەی خوێندەوە:

قەرارم فڕی، شــادیـــــــــــــــم کۆچی کرد
وێــنەی بــێ وێــنەت دەربەدەرمــی کــرد

دوای ئەوە هاواری کرد و بێهۆش کەوت. دەرکەوانەکە حەبەســـا و پێی ســـەیر بوو. زۆری خەم بوو. ئیســـتێکی پێ چوو، ئیبراهیم وە هۆش هــاتەوە. دەرکەوانەکە گوتی: «گەورەم، ئەوە بۆ دەگری و ئەو شــێعرەی گوتت مەبەســتت کێ بوو. خۆ تەواوی جوانی دونیا بە تۆزی تۆ ڕاناگەن.

دەبێ ئەو شـــۆخە چەنــد جوان بێ، هەراســـی لێ هەڵگرتووە
جوانــان لە ســـوێی ئەو نەمــاون، ئەویش گیرۆدەی ئەو بووە

ئیبراهیم هەستا چوو جوانترین و باشترین جلکی ژنانەی هێنا و دای بە دەرکەوانەکە و گوتی: «ئەوە بەرەوە بۆ خێزانـت. دەرکەوانەکە لێی ورەگرت و بردی بۆ خێزانی. خێزانی لەگەڵی هـات بۆ لای ئیبراهیم. ئیبراهیم یەک بین دەگریـا. ژنی دەرکەوانەکە لێی پرســـی: «ئاخە دڵمان توقی دە پێمان بڵێ ئۆگری کێ بووی و بۆ کێ دەگری؟» ئیبراهیم ڕووی لە دەرکەوانەکە کرد و گوتی: «مامە، من کوڕی خەسـیبی پادشـای میسـرم. ئاشـقی جەمیلەی کچی لەیسـی عەمیدم.» ژنی دەربان گوتی: «برا گیان، توخودا باسـی شتی وا هەر مەکە با کەس لێت نەبیســتێ، دەنا ئەتۆش و ئێمەش ســـەرمان تێدا دەچێ. کچی ئەوەندە دڵڕەق و ملهوڕ لە هیچ کوێ نییە. کەس ناوێرێ باســـی پیاوی لەلا بکا، هێندەی پیاو ناخۆش دەوێ. تکایە قامک لە ســـەر کەسـێکی دیکە دانێ.» کە ئەو قسـەیەی بیسـت، لە قوڵپەی گریانی دا. ئەوجار دەرکەوان گوتی: «ئەمن لە ســـەرێک زیاتر نیمە و ئەویش لە ســـەر کاری تۆ دادنێم بۆ ئەوەی تۆ بە ئاواتت بگەی.» کە ئەو قسەیەی کرد لەگەڵ خێزانی هەستان وەدەر کەوتن.

کە ڕۆژ بووەوە ئیبراهیم چوو بۆ گەرماو، جلی تازە و شـــایانەی لە بەر کرد و گەراوە مزڵەکەی. لەو جەنگەیەدا دەرکەوانەکە لەگەڵ خێزانی پەیـدا بوون. بە ئیبراهیمیـان گوت: «ئێرە کابرایەکی پشت دەرپەڕیوی لێیە درووومانکارە و کارەکانی جەمیلەخانم بەوە. هەستە بچووە بۆ لای بزانە ڕێگایەکت بۆ نابینێتەوە بە ئامانجت بگەی. ئیبراهیم لەڕێوە هەســـتا و

چوو بۆ دووکانی دروومانکارەکە. کە چوو دە دانە کەنیزی مانگئاسـای لە لا بوو. سـڵاوی لێ کردن و ئەوانیش وڵامی سـڵاوەکەیان داوە و فەرموویان کردە لای سـەرەوە دانیشـێ. کۆیلەکان کە ئەو هەموو جوانی و کەشـــخەییەی کوڕەیان دیت واقیان وڕ ما. کاتێک وەسـتاکە چاوی پێی کەوت. هۆش و گۆشـی لێ بڕا، ئەوەندەی پێ سـەیر بوو. ئیبراهیم بە دەسـتی ئەنقەسـت گیرفانی دڕاندبوو. بە وەسـتای دروومانکارەکەی گوت: «گیرفانم دڕاوە بۆم بدرووەوە.» دروومانکارەکە ئاوریشـــمێکی هێنا و گیرفانی بۆ چاک کردەوە. ئیبراهیم پێنج دیناری زێڕی دا بە جلدرووەکە و گەڕاوە مزڵەکەی خۆی. جلدرووەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوە ئەمن چ کارێکم بۆ ئەو کوڕە کرد وا پێنج دیناری دامێ!! ئەو شـەوە وەسـتای دروومانکار هەر لە بیر جوانی و ڕێکوپێکی و کەشـــخەیی دەهەندەیی ئەو کوڕەدا بوو. کە ڕۆژ بووەوە ئیبراهیم هەسـتا و چووەوە بۆ دووکانی کابرا کووڕە و سـڵاوی کرد. کابرای دروومانکار وڵامی سڵاوەکەی ئەستاندەوە و زۆری ڕێز لێ گرت و فەرمووی کرد دانیشێ. ئیبراهیم کە دانیشت، گوتی: «مامۆستا ئەو گیرفانەشم کون بووە زەحمەت نەبێ بۆم چاک بکەوە.» کابرا، کارەکەی بە دەسـتییەوە بوو داینا و هات گیرفانی بۆ درووەوە. ئیبراهیم دە دینـاری زێڕی دایە. دروومـانکـار دە دینـارەکەی لێ وەرگرت و نوقمی جوانی و دڵ گەورەییەکەی بوو. دوای ئەوە گوتی: «کوڕی خۆم دیارە تۆ کارێکی دیکەت هەیە و ئەو گیرفان چاک کردنەویە بیانووە. ڕاستییەکەم پێ بڵێ چ کارێکت هەیە؟» ئەگەر بە تەمای ئەو مندالانەی هێچیان لە تۆ جوانتر نین. بە تۆزی پێی تۆش نابن. ئەگەر قسـەیەکی دیکەشت لە دڵیدا هەیە، ئەوە پێم بڵێ. ئیبراهیم گوتی: «مامە گیان ئێرە جێی ئەوە نییە. چونکە کارەکەی من شـتێکی زۆر سـەیر و تایبەتە.» کابرای دروومانکار گوتی: «کە وایە هەسـتە با بچینە دیوێکی دیکە.»

ئیدی کابرا هەســـتا ئیبراهیمی بردە دیوێکی دیکەی دووکانەکەی و پێی گوت: «جا ئەوجار پێم بڵێ چی بووە. ئیبراهیم کارەکەی لە ســەرەتاوە تا کۆتایی هەمووی بۆ گێڕاوە. جلدرووەکە ویشـک بوو گوتی: «کوڕی من خۆ لەو بابەتە مەدە و ئەو هزرەش لە ســەرت بەرە دەرێ. چونکە ئەو کچە پیاوی خۆش ناوێ. کاکە تکایە ئاگات لە زمانت بێ با ســەرت تێدا نەچێ. ئیبراهیم کە قسـەکەی ئەوی بیست دەسـتی کرد بە گریان و گوتی: «مامۆسـتا پەنام بۆ هێناوی فریام کەوە. دەنا لە تاوانی دڵم دەتۆقێ. ئەمن پادشـــایەتی باب و وڵاتم بەجێ هێشتووە و نامۆ سـەرگەردان بە شـاراندا دەسووڕێمەوە. ناتوانم ئەو پەری پەیکەرە لە بیر بکەم. جلدرووەکە کە ئاوای دیت بەزەیی پێیدا هات و گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئەمن لە گیانێک زیاتر نیمە ئەویش لە ڕێی تۆدا دادنێم بەشـــکوو بە ئاواتت بگەی خۆ تۆ ئاورت لە جەرگی من بەردا. ســـبەینێ فکرێکت بۆ دەکەمەوە دڵی تۆی پێ خۆش دەکەم. ئیبراهیم دۆعای بە خێری بۆ دروومانکارە کرد و گەڕاوە مزڵەکەی خۆی لە کاروانسـەرا. قسـەکەی

درووماانکاره پشت دەرپەڕیوەکەی بۆ دەرکەوانەکە گێڕاوە. ئەو شــەوەش هەر چۆنێک بوو ڕۆژی لێ بووەوە. بەیانی جلی شــکۆداری لە بەر کرد و هەمبانەیەکی زێڕ هەڵگرت و بەرە و دووکانی کابرای جلدروو چوو. ســـڵاوی کرد و دانیشـــت. دوای ئەوە گوتی: «مامە بەڵێنەکەت بەرە ســەری.» کابرا گوتی: «هەر ئێســتا هەســتە ســێ مامری قەڵە و ڕەتلێک[1] شــــەکر بکڕە. دوو گۆزەڵەی جوانیش بکڕە و پڕیان کە لە بادەیەکی بێ خەوش و ڕوون. شەوەکی دوای نوێژی بەیانی سواری لۆتکەیەک بە و بە لۆتکەوانەکە بڵێ. دەمەوێ تا خوار بەســرەم بەری. ئەگەریش گوتی لە فرســەنگێک زیاتر ناتوانم بتبەم. تۆ پێی بڵێ ئیختیار بە خۆتە. کە فرسەنگێک ڕۆیشتن، هەوڵ بدە بە پارە وەتەماعی خەی هەتا باخەکانی بەسرەت بەرێ. یەکەم باخ کە تووشی دەبی باخی جەمیلە خانمە. بچووە نێو ژووری کە چووی دوو ســەکۆی گەورە دەبینی کە فەرشــی دیبایان لە ســەر ڕاخراوە. پیاوێکی پشــت دەرپەڕیوی وەک خۆم دەبینی لەوێ دانیشـــتووە. ئەتۆ شـــتەکەی بۆ بگێڕەوە و دەســـتەوداوێنی بە[2] بەشکوو بەزەیی پێدا بێ و ڕێت بدا لە شوێنێکەوە لە دوور چاوێکت پێی بکەوێ. ئەمن جگە لەوە هیچم بە زەین ناگا و لە دەســتم نایە. بەڵام ئەگەر ئەو باخەوانە بەزەیی بە تۆدا نەیە، ئەوە منیش و تۆ دەکوژرێین. ئیبراهیم گوتی: «پشت بە خودا دەبەستم، چۆنی بوێ هەر وا دەبێ.»

دوای ئەوە ئیبراهیم لە لای جلدروو هەســـتا و چوو ئەوەی ئەو گوتبووی هەمووی جێبەجێ کرد. شــتەکانی بردەوە ماڵێ. بەیانی زوو ڕۆیشــت بۆ قەراخ دیجلە. ســەیری کرد گەمییەوانێک لەوێ لە نێو گەمییەکەیدا خەوتبوو. لە خەو هەڵی ســـتاند و دە دیناری دایە. پێی گوت هەتا خوار بەســـرەم بەرە. گەمییەوانە گوتی: «گەورەم لە فرســـەنگێک زیاترت ناتوانم بەرم. چونکە ئەگەر بە بســـت زیاتر بڕۆین هەردووکمان دەکوژرێین.» ئیبراهیم گوتی: «تۆ چۆنت پێ باشە وا بکە.»

گەمییەوان ئیبراهیمی ســـوار کرد و گەمییەی ئاژووت هەتا گەیشـــتنە نیزیک باخەکان. لەوێ ڕاوەستا و گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئیدی لێر بەولاوە بۆمان نییە هەنگاوێک بچینە پێشێ. دەنا دەکوژرێین.» ئیبراهیم دە دیناری دیکەشـــی دایە و گوتی: «ها ئەوەش بۆ ماڵ و منداڵەکەت خەرج بکە.» گەمییەوان پێی عەیب بوو دایبەزێنێ و گوتی: «خۆمان بە خودا دەسپێرین.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. پێوانەی کێشانی شتی ئاوەکییە، کە بەرابەرە لەگەڵ ٨٤ مسقال.

[2]. دستەوداوێن بوون: پەنا بۆ بردن.

 

## کە شەوی نۆسەد و پەنجا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! گەمییەوان زێڕەکانی وەرگرت و گەمییەکەی لێ خوڕی. کاتێک گەیشـتنە باخەکان، ئیبراهیم لە خۆشـیان هەسـتا خۆی فڕێ دا دەرێ. وەک تیر لە کەوان دەرچێ. شـــتەکانی داگرت. مەلەوان بە لەز گەڕاوە. ئیبراهیم ســـەیری کرد باخەکە ئەو جۆرەی بەرگـدرووەکە پێی گوتبوو ڕێـک ئـاوا بوو. دەرکی بـاخیش کرابووەوە و لە دالانەڕێیەکەدا تەختێکی شفرەیی داندرابوو. کابرایەکی کووڕی ڕووخسار جوان دانیشتبوو، جلی داوێن بە زێڕ نەخشاوی لەبەردا بوو. کۆپاڵێکی زێوینی بە زێڕ لیاوکراوی بە دەستەوە بوو. ئیبراهیم چووە پێش و دەستی ماچ کرد. کابرا کووڕە سەری لە جوانی و قۆزی کوڕە ســـووڕ ما و گوتی: «کوڕی جوان ئەتۆ کێی و کێ تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟» ئیبراهیم گوتی: «مامە ئەمن منداڵێکی گەوج و غەوارەم. ئیدی دەستی کرد بە گریان.»

دەرکەوانەکە زگی پێی سووتا و بردی لە سەر سەکۆیەک داینا. فرمێسکەکانی بۆ سترِی و پێی گوت: «خەمت نەبێ، مەترســـە. ئەگەر قەرزباری خودا یارمەتیت دەکا و ئەگەر لە کەسـێک دەترسـی خودا پەنات دەدا. خودا گەورەیە. ئیبراهیم گوتی: «مامە، نە قەرزبارم و نە هەرەشـەم لەسـەرە. شوکری خودا زۆرم هەیە. باخەوانەکە لێی پرسـی: «باشـە، پێم بڵێ ئەتۆ چ کارێکت هەیە وا دەســـتت لە گیانی خۆت شـــتووە و هاتوویە شــــوێنێکی ئاوا پڕ مەترسییەوە؟» ئیبراهیم هەموو شـتێکی بۆ گێڕاوە. باخەوانە کە قسـەکانی ئیبراهیم بیست ماوەیەک سـەری داخسـت و پاشـان گوتی: «کوڕی من ئەوە وەسـتا پشـتکووڕەکە تۆی ناردووە بۆ لای من؟» ئیبراهیم گوتی: «بەڵێ.» باخەوانەکە گوتی: «ئەو برای منە.» ئینجا گوتی: «ئەگەر تۆم وەبەر دڵ نەکەوتبا و بەزەییم پێتدا نەهاتبا. ئەوە تۆش و بەرگدرووی براشم و دەرکەوانی کاروانسـەرا و ژنەکەشیم دەکوشـت.» دوای ئەوە گوتی: «کوڕی من، باخی وەک ئێرە لە دونیادا نییە. بە باخی لۆلۆ ناسراوە. جگە لە من و پادشا و جەمیلە خانم کەس نەهاتووەتە نێو ئەو باخەوە. ئەوە بیسـت سـاڵە من ئاگام لەو باخەیە هێشـتا کەسـم لێرە نەدیوە. هەر بە چل ڕۆژان جارێک جەمیلە خانم لەگەڵ کەنیزەکانی خۆی دێنە نێو ئەو باخەوە. خۆ من هەر دەمرم و ئەو ڕێگەیەشـــم هەر لەبەر. قەیناکا با ئەویش لە ڕێی تۆدا بێ.» هەر کە قســـەکەی باخەوانەکە تەواو بوو ئیبراهیم، ڕۆ بووە دەســـتی و ماچی کرد. باخەوانەکە پێی گوت: «لێرە دانیشە تا فکرێکت بۆ دەکەمەوە.»

ئینجا باخەوانەکە دەســتی ئیبراهیمی گرت و بردییە ناو باخەکەوە. ئیبراهیم ئەو باخەی وەک بەهەشـت هاتە بەر چاو. سـەیرانگەیەکی زۆر خۆش بوو. کانی و ئەسـتێری لێ بوو ئاوەکەی لە ئاوی سـەلسـەبیل ڕوونتر بوو. لەو باخەدا ئاژەڵی کێوی و کارمامز و هەموو

جۆرە مەل و پەلەوەرێکی دیت کە هەر یەکی بە جۆرێک دەیانخوێند و هۆش و گۆشـــی بیســـەرانیان دەبرد. ئیبراهیم بە دیتنی ئەو باخە تەواو دڵ خۆش و کەیف ســـاز ببوو. باخەوانە لێی پرســـی: «باخەکەمت پێ چۆنە؟» ئیبراهیم وەڵامی داوە: «ئەوە باخ نییە. ئەوە بەهەشـــتی ســـەر زەوییە.» باخەوان پێکەنی. دوای ئەوە ڕۆیشـــت ماوەیەک بزر بوو. کە هاتەوە بە دەستی پڕ هاتەوە. سفرەی ڕاخست و مریشکی برژا و چێشتی خۆش و هەڵوای لە سەر دانا. ئیبراهیم گێڕابوویەوە گوتبووی ئەمن لە قەدەر خۆم خواردنم خوارد. باخەوان کە نان خواردنی منی دیت. خوشحاڵ بوو. گوتی: «بە خودا خواردنی پادشا و پاشازادەکان ئاوایە.» دوای ئەوە ئەو شتانەی کە بە قسەی بەرگدرووەکە کڕیبوونم دەرم هێنا و پێشانم دا. باخەوان گوتی: «ئەوانە ڕاگرە ئەگەر جەمیلە خانم هات بە کارت دێن. ئەو دەم ناتوانم خواردنت بۆ بێنم. ئەوجار باخەوان هەســـتا دەســـتی منی گرت و بردمییە شـــوێنێک کە ڕووبەڕووی هەیوانەکەی جمیلە خانم بوو. لە نێو دارەکاندا جێگایەکی کەپراســـای لە ســـەر چوار کۆڵەکە بۆ چێ کردم و پێی گوتم: «بچووە ســـەرێ.» کاتێک جەمیلە خـانم هـاتە هەیوانەکە تۆ لەو ســـەرەوە ئەوت لێ دیار دەبێ بەڵام ئەو تۆی لێ دیار نابێ. ئەمن لەوە زیاتر چم لە دەست نایە. تۆ دەبێ پشت بە خودا ببەستی.»

ئیبراهیم زۆری ســپاس کرد و دەســـتی ماچ کرد. مەجۆعمەیەک کە کەباب و شـــەرابی لەســەر بوو لە سـەر کەپرەکە دانا. دوای ئەوە باخەوانە پێی گوت: «کوڕی قۆز بۆخۆت بە کەیفی خۆت لە ناو باخدا بگەڕێ و میوە و شت لێکەوە بیخۆ. سبەینێ جەمیلە خانم دێ بۆ گەشت و سەیران. ئیدی ئیبراهیم لە باخدا دەستی کرد بە گەڕان و میوە خواردن هەتا بوو بە شـــەو. ئەو شـــەوە کەس نازانێ چۆنی ڕۆژ کردەوە. کە زەردەی بەیانی دا هەســـتا نوێژەکەی کرد. لە پڕدا بـاخەوان بە هەڵەداوان هـات. ڕەنگی تێـک چووبوو. گوتی: «ڕۆڵە گیان خێرا برۆ سەر کەپرەکە. ئەوە کەنیزەکان هاتن. خانمیش بە دوای ئەواندا دێ.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! باخەوانەکە پێی گوت ئەوە کەنیزەکان هاتن و خانمیش بە دوای ئەواندا دێ. بەڵام تکایە نەچی بپشمی یان بکۆخی. لێت ڕوون بێ منیش و تۆش دەکوژرێین. لەڕێوە ئیبراهیم هەسـتا چووە سـەر کەپرەکە و باخەوانیش ڕۆیشـت. ئەوەندەی پێ نەچوو پێنج دانە کەنیزی جوان وەک مانگ هاتن و چوونە ســـەر هەیوانەکە. هەیوانەکەیان ماڵی و گوڵاپرژێنیان کرد. فەرشـی دیبایان لێ ڕاخسـت و عوود و عەنبەریان خسـتە سـەر ئاور. دوای ئەوە پێنج کەنیزی دیکەی جوان و وەک شـــەوچرا کە یەکی ئامێرێکی مووزیکیان بە دەستەوە بوو، جەمیلە خانمیش لە نێوانیاندا دەڕۆیشت لە نێو کەژاوەیەکی سووری دیبادا دەهاتن و چەند کچۆڵەش داوێنی کەژاوەکەیان بە پەنجەی زێڕین هەڵگرتبوو هەتا گەیشـتنە هەیوانەکە. ئیبراهیم نە خانم و نە جلەکانی هیچ لێ دیار نەبوو. لە دڵە خۆیدا گوتی: «بە خودا ڕەنج بە با بووم. ئەوجار کەنیزەکان خواردنەمەنیان هێنا و دایان نا. جەمیلە خانم کەمێکی شـت خوارد و دەسـتی شـۆردەوە. دوای ئەوە کەتێکیان بۆ جەمیلە خانم هێنا و بۆیان دانا. خانم چووە ســـەر کەتەکە. کەنیزەکان دەســـتیان کرد بە ژەنینی ئامێرەکان و ئاوازی جۆراجۆر و شادیان ژەنی. تا ئەو جێیەی کە پیرێژنێکیان لەگەڵ بوو هەستا دەستی کرد بە سـەما کردن. کەنیزەکان هاتنە بەرەوە و پەردەیان لە سـەر جەمیلە خانم هەڵداوە. وەک ڕۆژ هەڵبێ وا بوو. خانم هاتە دەرێ و چاوی لە پیرێژنە کرد و دەســتی کرد بە پێکەنین. کەنیزەکان هاتنە دەوری کڕنۆشیان بۆ برد. ئیبراهیم چاوی پێی کەوت. ئەو هەموو جوانییەی خانم، لەگەڵ ئەو هەموو خشڵ و جەواهیراتەی پێوەی بوو، جوانییەکەی خانمیان سـەد ئەوەندە کرد و هێندەی کار لە دڵی ئیبراهیم کرد. ئیبراهیم دەڵێ هەر ئەو دیمەنەم دی لەوێ بێ سەر و زمان کەوتم. کە هاتمەوە سەر خۆ ئەو بەیتەم خوێندەوە:

ئەوەنـدەی چـاوت لـێ دەکەم، هـیـچ بە خـۆم نـیـیە گـیـانەکەم
وەک بـی دەلەرزێ گـیـانەکەم، چـۆن خـۆمـت بە قـوربـان نەکەم

ئەوجار پیرێژنە بە کەنیزەکانی گوت: «هەسـتن بە دم سـەماوە گۆرانیش بڵێن. ئیبراهیم کە ئەوانی دیت لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆزگە جەمیلەش هەڵدەسـتا و سـەمای دەکرد.» کە سـەمای کەنیزەکان تەواو بوو. هاتن لە جەمیلە ئاڵان و گوتیان تکات لێ دەکەین، ئەتۆش هەستە سەما بکە. پێمان خۆشە. ئەوڕۆ ڕۆژێکی خۆشە. قەت بە قەد ئەوڕۆ خۆش نەبووە. ئیبراهیم گوتی: «قسـەی تێدا نییە دەرگاکانی ئاسـمان کراوەتەوە و ئەوڕۆ دۆعاکانی من قەبووڵ دەبێ.» ئیدی کەنیزەکان قاچی خانمیان ماچ کرد و لەبەری پاڕانەوە هەتا ئاخری

جەمیلە خانم کراسەکانی سەرەوەی داکەند و تەنیا کراسێکی ناسک کە داوێنەکەی بە زێڕ و گەوهەر ڕازابووەوە لە بەردا ما. مەمکی دەتگوت گارگن هەڵتۆقیون. بە شێوەیەکی ئەوەندە سەیر و تایبەت دەستی کرد بە سەما کرد وەک حەیرانبێژ دەڵێ:

ئەمن دەڵێم ئەوە ڕەوت و ڕۆین نییە ئەوە لەنجەی خاسە کەوە
ئەو دەڵێ ئەوە مامزێکی سرکە پەنجۆلەکانی دەگوێزێتەوە

ئیبراهیم گێڕاوییەتەوە: «لەو جەنگەیەدا کە من نوقمی سەیری ئەو ببووم. نیگای لە سەر من گیرساوە و دیتمی. ڕەنگی تێک چوو بە کەنیزەکانی گوت: «ئێوە خەریکی سەما و گۆرانی خۆتان بن، ئێستا منیش دێمەوە. دوای ئەوە خەنجەرێکی نیوگەزی دەست دایە و بەرەو من هات. هەر کە لێم نیزیک بووەوە ئەمن هێزی ئەژنۆم نەما و کەوتم. کاتێک چاوی بە چاوم کەوت ئەویش دەستی شل بوو، خەنجەرەکەی لە دەست بەربووەوە و گوتی:

بێ یەک نابن چاو و برۆ، جوان بن ناحەز بن ئی یەکەن
زۆرم تاریفی تۆ بیستو، لەگەڵ پەسنەکاندا یەکەن

دوای ئەوە پێی گوتم: «کوڕی چاک لە هیچ مەترسە، ئاسوودە بە.» ئەمن هەر خەریک بووم دەگریام. ئەویش بە دەستی ڕۆندکەکانمی دەستڕی. پرسی: «کوڕەکە تۆ پێم بڵێ تۆ کێی و بۆ هاتوویە ئێرە؟» ئەمن کڕنۆشم بۆ برد و دەستەوداوێنی بووم. دیسان گوتی :«خەمت نەبێ کەس کاری پێت نییە، هەر پێم بڵێ تۆ کێی؟»

ئیبراهیم گێڕاوییەتەوە کە من تەواوی بەسەرهاتی خۆم لە سەرەتاوە بۆ گێڕاوە. زۆری کارەکەی من پێ سەیر بوو. پێی گوتم: «گەورەم، تۆ خودا تۆ ئیبراهیمی کوڕی خەسیبی؟» گوتم: «بەڵێ.» ئیدی خۆی بە سەر مندا دا و گوتی: «گەورەم، ئەمن لەبەر تۆ پیاوانم ناخۆش دەویست. چونکە بیستبووم لە میسر کوڕێکی لێیە لە دونیادا کەس بە قەد ئەو جوان نییە. ئەمن هەر بە پەسن و تاریفەکاندا ئاشقی تۆ بووم و دڵم گیرۆدەی خۆشەویستی تۆ ببوو.

بیستبووم کە تۆ یەکجار جوانی
ئێستا دەزانم کە شای جوانانی
لە خۆڕا بە مانگ هەڵنەگوتراوە
تیشکی بینراوە و پەسنی کراوە

شوکری خودا که منی به دیداری تۆ شاد کرد. به خودا ئەگەر جگە لە تۆ کەسێکی دیکە بایە، ئەوە دەرکەوان و بەرگدروو و باخەوانم لە دار دەدا.» دوای ئەوە لە منی پرسی: «چ بکەم ئەو کەنیزانە پێمان نەزانن و خواردەمەنی بێنم تۆش بخۆی؟» ئەمن گوتم: «سۆمای چاوەکانم، ئەمن خواردەمەنی و شەرابم پێیە.» دوای ئەوە مەجۆعمەکەم لە پێش دانا. ئەو پەریڕوخسارە پارووی لە دمی من دەخست و منیش پارووم لە دمی ئەو دەخست. وەمدەزانی خەون دەبینم. دوای ئەوە شەرابەکەی هێنا پێشێ و خواردمانەوە. لە نیوەڕۆوە هەتا ئێوارە پێکەوە بووین. کەنیزەکانیش لەوێ شەرابیان دەخواردەوە و سەمایان دەکرد و خافڵابوون. دوای ئەوە هەستا و بە منی گوت :«پاپۆڕێک بێنە و وەرە فلان جێ و چاوەڕێی من بە، هەتا دێم بۆ لات. ناتوانم لە تۆ دوور بم. ئەمن گوتم خانمەکەم ئەمن بۆخۆم پاپۆڕێکم هەیە کە ئی خۆمە و خزمەتکارەکانیشی لە ئیختیاری خۆم دان و چاوڕێمن. پەریڕوخسار وڵامی دامەوە کە منیش مەبەستم هەر ئەوە بوو. ئەوجار چووەوە بۆ لای کەنیزەکان.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی نۆسەد و پەنجا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشكۆ! جەمیلە خانم گەڕاوە لای كەنیزەكان و پێی گوتن: «هەستن خۆتان ساز كەن با بڕۆینەوە بۆ كۆشك.» بۆ بگەڕێینەوە خۆ جاران سێ ڕۆژ لێرە دەماینەوە؟» خانم وڵامی داوە: «كەمێك گیانم قورسە لەوە دەچێ نەخۆش بم. دەترسم تووشی نەخۆشییەكی گران بم.» كەنیزەكان بە پیر قسەكەی خانمەوە چوون ڕۆیشتن شتومەك و شتەكەیان كۆ كردەوە و چوون بۆ قەراخ دیجلە و لە گەمییەكەدا دانیشتن.

باخەوان هات بۆ لای ئیبراهیم. ئەو بە هیچی نەزانیبوو. گوتی: «ئیبراهیم شا چاو لەو بەختە ڕەشەی خۆت بكە. قەت وا نەبووە. ئەوە تۆ بە تەما بووی چاوت بە خانم بكەوێ كەچی ئەوە خەریكن بڕۆنەوە. جاران كە دەهاتن سێ ڕۆژ لێرە دەمانەوە. لەوە دەترسم خانم تۆی لێرە دیتبێ.» ئیبراهیم گوتی: «نا نە ئەو منی دیوە و نە منیش ئەوم بینی. خۆ ئەو لە هەیوان نەهاتووەتە دەرێ.» باخەوانەكەش گوتی: «تۆ ڕاست دەكەی ئەگەر ئەو تۆی دیتبا ئەوە ئێمەی دەكوشت. بەڵام قەیناكا تۆ حەوتوویەكی دیكەش لێرە لە لای من بمێنەوە، بەشكوو حەوتوویەكی دیكە خانم بێتەوە ئێرە و تۆ ببیینی و تێر تێی بڕوانی.» ئیبراهیم گوتی: «گەوەرم، ئەمن ماڵێكی زۆرم پێیە و نیگەرانی ماڵەكەمم. دەترسم دزان ببەن.» باخەوان گوتی: «ڕۆڵە گیان زۆرم پێ ناخۆشە دەڕۆی.» ئیدی ئیبراهیم لە باوەشی گرت و ماڵاوایی لێ كرد. ئیبراهیم چووەوە كاروانسەرا. كە چووەوە لای دەركەوانەكە. دەركەوانەكە لێی پرسی: «شێری یا ڕێوی؟» ئیبراهیم گوتی: «كەلوپەلەكەم بۆ بێنە با بڕۆمەوە وا دیارە بە ئامانج گەیشتم خەونە.» دەركەوانەكە كەلوپەلەكانی بۆ هێنا و هەتا قەراخ دیجلە بۆی هەڵگرت و لەوێ خستییە پاپۆڕەوەكەوە. دوای ئەوە ئیبراهیم چووە ئەو شوێنەی كە جەمیلە خانم بۆ دیاری كردبوو لەوێ لە سەری ڕاوەستا.

كە بوو بە شەو خانم بە جلوبەرگی پیاوانەوە پەیدا بوو. بە دەستێكی تیر و كەوان و بە دەستەكەی دیكەی شیرێكی ڕووتی بە دەستەوە بوو. بە ئیبراهیمی گوت: «كوڕی خەسیب تۆ؟ گڵاو ئەوە تۆ وات لێ هاتووە لە دوور وڵاتەوە بێی ڕێ بە كچی شا بگری؟ هەستە با بڕۆین بۆ لای پادشا.» ئیبراهیم بەو قسەیە ئاوی ئەژنۆی چوو كەوتە سەر زەوی. كاردارەكانی پاپۆڕەكەی خەریك بوو لە ترسان گیانیان دەرچێ.

ئیبراهیم گێراوییەتەوە: كە كاتێك خانم دیتی ئاوام لێ هات. ڕدێنە ساختەكەی لە چەنەی كردەوە و شیرەكەی فڕێ دا و قایش و شتی لە قەدی كردەوە. سەیرم كرد ئەو جەمیلە خانمە. پێم گوت: «كچێ بە خودا نێوكت خستم.» ئەوجار بە كاردارەكانی پاپۆڕەكەم گوت: پەلە بكەن با وەڕێ كەوین.» لەڕێوە چارۆكەیان هەڵدا و پاپۆڕ كەوتە ڕێ. دوای چەند ڕۆژ

گەیشتینە بەغدا. لە پڕدا سەیرمان کرد، پاپۆڕێگ لە قەراخ چۆمەکە ڕاوەستاوە. کاردارانی کەشتییەک بانگی کەشتییەکەی ئێمەیان کرد. یەک بە یەکی کاردارەکانی ناو پاپۆڕەکەی ئێمەیان ناودێر کرد، داوای سڵامەتیان بۆ کردن. دوای ئەوە لێمان نیزیک بوونەوە. کە جوان سەرنجمان دانێ. تەماشا دەکەین ئەوە ئەبولقاسم سەندەلانی لە و پاپۆڕە دایە. کە ئێمەی دیت گوتی: «شوکری خودا سڵامەتن. گەلۆ بە ئاواتت گەیشتی؟» گوتم: «بەڵێ.» کە وام گوت، مۆمێکی داگیرساوی لە بەر دم بوو هەڵیگرت و هات بۆ لامان. کە جەمیلە چاوی پێی کەوت تێک چوو. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. ئەبولقاسم چاوی لێ کرد و گوتی: «ئەمن ئەوەم دەویست. ئێستا بڕۆن خودا ئاگادارتان بێ. ئەمنیش دەگەڕێمەوە بۆ بەسرە، پادشا کارێکی پێمە.

دوای ئەوە هەگبەیەکی هەڵوا هاویشتە ناو کەشتییەکەی ئێمەوە. هەڵواکە دەرمانی تێ کرابوو. ئیبراهیم بە خانمی گوت: «چاوەکەم لەو هەڵوایە بخۆ.» خانم گریا و گوتی: «ئیبراهیم دەزانی ئەوە کێیە؟» ئیبراهیم گوتی: «ئەرێ ئەوە فڵان کەسە.» جەمیلە خانم گریا و گوتی: «ئەوە ئامۆزای منە. ئەوە داوای منی کرد. ئەمن مێردم پێ نەکرد. ئەو دەچێ بۆ بەسرە و ئەگەری زۆرە باوکم ئاگادار بکاتەوە. گوتم خاتوون ئەو ناگاتە بەسرە ئێمە دەگەینە موسڵ. ئیدی نەمدەزانی چ داوێکیان بۆ ناوینەوە. من کەمێکم لە هەڵواکە خوارد. هێشتا لە گەرووم نەچووبووە خواری بێهۆش بووم. بەیانی پشمیم و وردە وردە وە هۆش هاتمەوە. سەیرم کرد ئەوە لە کەلاوەیەکم. بە چەپۆک بە سەر خۆمدا دا و ئای لەو فێڵەی سەندەلانی لە منی کرد. جگە لە دەرپێیەک جلوبەرگم لە بەردا نەمابوو.

هەستام بە لۆژە لۆژ هەروا دەڕۆیشتم کە لە پڕدا سەیرم کرد. لە والی لەگەڵ تاقمێکی شیر بە دەست پەیدا بوون. لە ترسان گەرماوە کۆنێک لەوێ بوو چووم لەوێدا خۆم بشارمەوە. هەرکە قاچم خستە ناو گەرماوەکەوە قاچم خزی دەستم بە شتێک گرت. دەستم خوێناوی بوو. نەمزانی خوێنە دەستم بە دەرپێکەم خاوێن کردەوە. دیسان دەستم درێژ کردەوە دەستم وە تەرمێک کەوت. دوای ئەوە چووم لە قوژبنێکی گەرماوەکە خۆم مەڵاس دا.

والی گەیشتە بەر دەرکەی گەرماوەکە و گوتی: «بچن ئەو نێوە جوان بپشکنن. دوو دانە لە پیاوەکانیان بە مەشخەڵێکەوە وەژوور کەوتن. ئەمن لە پشت دیوارێک خۆم مات دابوو. لە بەر تیشکی مەشخەڵەک تەرمەکەم دیت. سەیرم کرد کچێکە وەک مانگ دەدرەشێ. سەری لە لایەک و جەستەی لە لایەکی دیکەیە. جلوبەرگی گرانبایی لە بەر دایە. ئەمن کە ئەوەم دیت لەرزم هاتێ. والی هاتە ژوور و گوتی ئەو کەلێن و قوژبنە جوان بگەڕێن. پیاوەکە بەرەو ئەو شوێنە هاتن کە منی لێ بووم. یەکیان منی دیت و بەرەو ڕووم هات. وێردێکی پێ بوو، نیو گەز درێژ بوو. کە لێم نیزیک بووەوە گوتی: «ئافەرین کوڕی باش،

ئەوەت بۆ کوشـــتووە؟» ئەمن گوتم قەســـەم بە خودا من نەمکوشـــتووە و نازانم کێ کوشتوویە. ئەمن هەر لە ترسی ئێوە هاتمە ئێرەوە. ئیدی بۆم گێڕاوە چیم بەسـەر هاتووە. پێم گوتن بیکەن بۆ خاتری خودا ئازارم مەدەن. بەشی خۆم گیرۆدە و پەرێشانم. ئەو زگی بە من ســـووتا. منی گرت و بردی بۆ لای والی. والی کە چاوی بە دەســـتی خوێناوی من کەوت گوتی ئەوە پێویستی بە شایەد نییە و لە ملی دەن.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی نۆسه‌د و په‌نجا و نۆیه‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشکۆ! والی فه‌رمانی کوشتنی منی دا. ئه‌من که ئاوام دیت ده‌ستم کرد به گریان و ئه‌و دوو به‌یته‌م شیعره‌م گوت:

ئـای لـه مـنـی چـاره‌ڕه‌شـی مـاڵ وێـران
ئـامـانـجـی پـێـکـراوی به‌ر تـیـری که‌وان
لـێـم ڕوونه که وه سـه‌ری مـن ده‌که‌وێ
به‌ڵایه‌ک داکه‌وێ له ته‌شـقـی ئـاسـمـان

دوای ئه‌وه دڵم له بووره‌وه هات و به لادا که‌وتم. بکوژه‌که به‌زه‌یی پێمدا هات و گوتی: «به خودا ئه‌و کوڕه هیچ وه‌ک بکوژ ناچێ. والی فه‌رمانی دا له ملی بکوژه‌که‌یان دا. دوای ئه‌وه چاویان به‌ستم و تووره‌که‌وڵێکیان به سه‌رمدا کرد. بکوژه‌که‌ی دیکه ڕوخسه‌تی له والی خواست له ملم دا. منیش یه‌ک به‌خۆم هاوارم کرد ئای غه‌ریبی. له‌و جه‌نگه‌یه‌دا چه‌ند سوار گه‌یشتن. ده‌نگێکیان هه‌رای ده‌کردن هۆی کاکه ده‌ست ڕاگرن. هاتنه‌که‌یان ڕێکه‌وتێکی سه‌یر بوو. ئه‌ویش ئه‌وه بوو که:

خه‌سیب پادشا، پادشای میسر که‌سێک ده‌نێرێ بۆ لای خه‌لیفه هاروونه‌ڕڕه‌شید. نامه‌یه‌ک و دیاری و پێشکه‌شییه‌کی زۆریشی له‌گه‌ڵ ده‌نێرێ. نێوه‌ڕۆکی نامه‌که ئاوا ده‌بێ: «ساڵێکه کوڕه‌که‌م بێ سه‌ر و شوێنه و ئیستا بیستوومه‌ته‌وه له به‌غدایه، تکا و ڕه‌جام له خه‌لیفه ئه‌وه‌یه که ڕاسپێری بکه‌ونه پێوشوێنی و ئه‌گه‌ر دیتانه‌وه له‌گه‌ڵ ئه‌و ڕاسپارده‌یه‌دا بۆم بنێرێته‌وه.»

که خه‌لیفه نامه‌که‌ی خوێنده‌وه، فه‌رمانی به والی کرد به دوایدا بگه‌ڕێن. والیش به‌رده‌وام به پێوشوێنییه‌وه بوو. هه‌تا پێیان گوت له به‌سره‌یه. به خه‌لیفه‌یان ڕاگه‌یاند. ئه‌وجار خه‌لیفه نامه‌یه‌کی نووسی و دای به ڕاسپێردراوه‌که‌ی میسر و پێی گوت بچووه بۆ به‌سره، نوێنه‌رێکی خۆی و چه‌ند که‌سێکیشی له‌گه‌ڵ نارد. ڕاسپێردراوکه‌ی میسر به له‌ز خۆی گه‌یانده به‌سره. ڕێکه‌وت وابوو که چوونه به‌سره ڕاست ڕێگایان که‌وته لای گه‌رماوه‌ی که داڕۆغه‌ی به‌سره ئیبراهیم لێ ده‌ستبه‌سه‌ر کردبوو. که گه‌یشتنه لایان تووره‌که‌ی چه‌رمیان به سه‌ردا کردبوو، جه‌للاد به شیره‌وه له سه‌ری ڕاوه‌ستابوو. بێ ئه‌وه‌ی بزانن ئه‌وه له دوور هه‌رایان کرد ده‌ست ڕاگرن مه‌یکوژن. ده‌ستیان ڕاگرت هه‌تا هاتنه به‌ره‌وه، که هاتن والی پیاوه‌کانی خه‌لیفه‌ی ناسی و دابه‌زی. نوێنه‌ری خه‌لیفه لێی پرسی ئه‌و کوڕه کێیه و چی کردووه؟ والی شته‌که‌ی بۆ گێڕاوه. ئه‌وان نه‌یانده‌زانی ئه‌وه ئیبراهیمی کوڕی سوڵتانه

یان نا. توورەکەیان لە ســەر لادا. کەچی نوێنەرەکەی ســوڵتان گوتی ئەو کوڕە ڕواڵەتی لە بکوژ ناچێ و ئازادی کەن.

ئازادیان کرد. ئیبراهیم لەو کەلاوە و گەرماوە کۆنەدا ئەوەندە شــپرزە و خۆڵاوی و چڵکن ببوو، نەدەناســراوە. ڕاسـپێردراوەکەی میســر لێی پرســی: «کوڕە، پێمان بڵێ تۆ لە وەچەی کێی و خەڵکی کوێی و بۆ لەگەڵ ئەو کوژراوە لێرەی؟» کاتێک ئیبراهیم ســەری هەڵێنا و چاوی بە ڕاسپێردراوەکەی میسر کەوت ناسییەوە. لێی پرسی: «فلانی ئەوە یانی تۆ من ناناســییەوە؟!! ئەمن ئیبراهیمی کوڕی خەســیبم. ئەوە ناردوویانی لە دووی من؟» پەردەداری خەسیب شا چاوێکی لێ کرد و لێی ورد بووەوە. تەواو ناسییەوە. خۆی خستە بەر پێی.

کاتێک والی دیتی پەردەدار ئاوای کرد لە بەرابەر ئەو کوڕەدا، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. ئەوجار پەردەدار بە والی گوت: «زاڵم ئەوە دەتهەویســت کوڕی خەسـیب شــای میســر بکووژی؟» والی ڕۆ بووە داوێنی پەردەدار و گوتی: «جا ئەمن چۆزانم ئەوە کوڕی شــای میسرە ئەویش لەو کەلاوە کۆنەدا و لە پاڵ ئەو کوژراوەدا؟»

نوێنەری خەلیفە گوتی: «ئەتۆ بۆ والی نابی، یانی تۆ نازانی ئەو کوڕە پازدە ساڵە، لەوە ناچێ تا ئێستا چۆلەکەیەکیشی کوشتبێ. چ بگا بە مرۆڤ. ئەوەندەت دەرفەت نەداوە بڵێ من کێم و چکارەم.»

دوای ئەوە بە والی گوت: «زوو بکوژی ئەو کچە دەبینییە.» والی دیســـان پیاوەکانی ناردوەوە بۆ نێو گەرماوەکە تا وڵاتی بپشکنن. ئەوەندەیان پێ نەچوو هاتنە دەرێ و بکوژی کچەیان هێنا دەرێ و لە پێش والی ڕایان گرت. ئیدی والی فەرمانیدا قۆڵبەســتیان کرد و چوون بۆ دارولخەلیفە. هەموو شــتێکیان بۆ خەلیفە گێڕاوە. هاڕوونەڕرەشــید فەرمانیدا بکوژی کچەیان کوشــتەوە. دوای ئەوە داوای کرد کوڕی خەســیب شــا بەرنە لای. کاتێک ئیبراهیم هاتە هەنتەشــی خەلیفە، خەلیفە پێکەنی و پێی گوت: «دا بۆم بگێڕەوە ئەوە چیت کردووە.» ئیبراهیم تەواوی بەســەرهاتی خۆی لە ســەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە. خەلیفە زۆری پێ ناخۆش بوو. لەڕێوە مەسـرووری بانگ کرد و پێی گوت: «هەر ئێستا بچووە بۆماڵی ئەبولقاســمی ســەندەلانی و ئەویش و کچەکەش بێنە ئێرە. مەســروور بە لەز خۆی گەیاندە ماڵی ئەبولقاسم و دەوری ماڵەکەی دان. چوونە ژووری سەیری کرد ئەوە کچە بە پرچی هەڵواســراوە و خەریکە گیانی دەردەچێ. مەســروور خێرا کچەی هێنا خوارێ و کردییەوە. پاشان کچەش و ئەبولقاسمیشی هێنا بۆ لای خەلیفە.

خەلیفە کە چاوی بە کچە کەوت، ســەری لەو هەموو جوانییەی ســوور ما. ئینجا دەســتووری دا دەســتی ئەبولقاســم کە ئەو کیژەی پێ ئازار داوە ببڕن و پاشــان لە داری

دەن. ماڵەکەشـــی بدەن بە ئیبراهیم. پیاوەکانی خەلیفە بە پێی فەرمانی خەلیفە جووڵانەوە. لەو جەنگەیەدا ئەبوولەیس حاکمی بەســـرە و باوکی جەمیلە خانم، پەیدا بوو. چوو لە لای خەلیفە شـکایەتی لە ئیبراهیمی کوڕی خەسـیب کرد و داوای لە خەلیفە کرد دادی بسـتێنێ. خەلیفە پێی گوت: «ئەگەر ئیبراهیم بێ ئیزنی تۆ کچەکەتی هەڵگرتووە، لە بەرابەردا لە مردنیشـی ڕزگار کردووە. ئینجا خەلیفە فەرمانی دا. ئیبراهیمی کوڕی خەسـیب بانگ بکەن. کە هات. خەلیفە بە ئەبوولەیســی گوت: «یانی ئەتۆ پێت خۆش نییە کوڕێکی ئاوا جوانچاک و ڕێکوپێک کە کوڕی پادشای میسرە ببێ بە زاوات؟» ئەبوولەیس وڵامی داوە، ئەوە ڕازی بووم. ئەوجار خەلیفە قازی و شـــایەدی بانگ کرد و کچەی لە ئیبراهیم مارە کرد. تەواوی ماڵەکەی ســەندەلانی بە ناوی ئەوەوە کرد. پاشـان فەرمانی دا، ماڵ و کەلوپەل و شـتەکەی بۆ پێچاوە و ئامادەی ســەفەری کرد و ناردییەوە بۆ میســر. ئیبراهیم و جەمیلە بە خێر و خۆشییەوە پێکەوە ژیان هەتا تێکدەری خۆشی و شادی بەزمی ژیانی تێک دان

### بەسەرهاتی شەجەرەتوددوڕ

خاوەنشـــکۆ، یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە: خەلیفە مۆعتەزیدوبیللا، پیاوێکی شـایی‌بەخۆ و قورس بوو. لە بەغدا شـەشـسـەد وەزیری هەبوو. تا ئەو جێیەی کە ئاگای لە خشـــەی مار و مێرووی ئەو شـــارە بوو. ڕۆژێک لەگەڵ ئیبنی حەمدوون چوونە دەرێ هەتا ســـەرێکی خەڵک بدا و لە نیزیکە، ئاگاداری بارودۆخیان بێ. گەرما تەوژمی بۆ هێنان و خۆیان بە کۆڵانێکی فێنک و خۆشـــدا کرد. لەو ســـەری کۆڵانەکە چاویان بە باڵاخانەیەکی خۆش کەوت. لەبەر شـــەکەتیان لە بەر دەرکی ئەو باڵاخانەیە دانیشـــتن. دوو خزمەتکاری جوانکیلە لەو ماڵە هاتنە دەرێ. یەکیان بەوی دیکەی دەگوت: «خۆزگە میوانمان بۆ دەهات، خۆ هەتا میوان نەیە خاوەنمان نان ناخوا. بە داخەوە لە بەیانییەوە دەگەڕێین کەسمان وەگیر نەکەوتووە. خەلیفە ئەو قسەیەی ئەوانی پێ سەیر بوو گوتی: «دا با بچینە ژوورێ ئەو خاوەنکەرەمە لە نیزیکەوە ببینین و بەشـــکم خێرێکی لە لایەن ئێمەشـــەوە پێ بگـا.» ئینجـا بە کۆیلە جوانکیلەکەی گوت: «بچووە ڕوخســـەتی هـاتنە ژوورێمـان لە خاوەنەکەت بۆ وەرگرە.» جا خەلیفە هەر کاتێک دەیویست بۆ سەردانی خەڵک بچێتە دەرێ بە جلوبەرگی بـازرگـانـانەوە دەچووە دەرێ. کوڕە گەڕاوە لای خـاوەنمـاڵەکە و پێی گوت. خاوەنماڵ زۆر خۆشـــحاڵ بوو، هەســـتا لەگەڵ خزمەتکارەکانی بە پیریانەوە هات. ئەو کوڕێکی جوانچاک بوو. کراسێکی ئاتەگ درێژی لە بەردا بوو کە داوێنەکەی تاڵی زێڕی تێ هەڵکێشرابوو. بۆنێکی خۆشیشی لێ دەهات. ئەنگوستیلەیەکی یاقووتی لە قامکدا بوو. کاتێک چاوی بە خەلیفە و ئیبنی حەمدوون کەوت، گوتی: «بە خێر بێن، بە خێر بین. بەڕێزان کە بە هـاتنتـان ئێمەمەتـان بەســـەر کردووەتەوە و گەورەتـان کردین. فەرموون، فەرموونە

ژووری. که چوونه ژووری. سه‌یریان کرد ماڵێکه ده‌ڵێی به‌شێکه له به‌هه‌شت...

لێره‌دا بوو، ماوه‌ی چیرۆکی ئه‌مشه‌ویش کۆتایی پێ هات و شه‌هرزاد درێژه‌ی چیرۆکه‌که‌ی هه‌ڵگرت بۆ شه‌وێکی دیکه.

# که شەوی نۆسەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! خەلیفە لەگەڵ ئیبنی حەمدوون کە ئەو ماڵەیان دیت ســەیریان کرد وەک بەهەشــتە. لە ناو ئەو ماڵەدا باخێکی تێدایە کە لە هەموو جۆرە دار و گوڵێکی تێدایە. بە جۆرێک کە هۆش و گۆشی مرۆڤ دەبا. تەواوی دیوەکانی ئەو ماڵە بە فەرشی حەریر و دیبا پڕ فەرش کراوە. ئیدی ئەوان لەوێ دانیشــتن. خەلیفە خەریک بوو لەو ماڵە و فەرش و شتەی ورد دەبووەوە. ئیبنی حەمدوون دەڵێ: «سەرنجی خەلیفەم دا بە ناوچەوانیدا هەستم کرد خەلیفە تێک چووە. لە دڵی خۆمدا گوتم: ' بڵێی چی بوو بێ وا خەلیفە تووڕە بووە؟» دوای ئەوە سوێنە و مەسینەی زێڕیان هێنا دەستمان شۆرد. سفرەی حەریریان ڕاخست و دەفری جۆراجۆریان هێنا دایان نا. کە ســەری دەفرەکانیان لا برد. ســەیرم کرد وەک شــکۆفەی بەهار ڕەنگاوڕەنگ بوو. دوای ئەوە خانەخوێ گوتی: «بەڕێزان، فەرموون. بە خودا لە برســان خەریک بوو بمرم. لەو تەعامانە بخۆن و گەورەم کەن. بۆخۆی مامری برژاوی بۆ لەت و کوت دەکردین و لە پێشــی دادەناین. لە بەرەوە بە ڕوویەکی خۆشــەوە شێعری بۆ دەگوتین و شتی بۆ دەگێڕاینەوە و قسەی بابەتی ئەو مەجلیسەی بۆ دەکردین.

ئیبنی حەمــدوون گێڕاوییەتەوە کە دوای ئەوەی خواردنەکەمــان خوارد. ئێمەی بردە دیوێکی دیکە کە مرۆڤ بە دتینی ســەرســام دەبوو. بۆنی خۆش وڵاتی پڕ کردبوو. لەوێش میوە و هەڵوا و شــیرینی ڕیز کرا. ئێمە ئەوەندەی دیکە کەیفمان کرد و خۆشــحاڵ بووین. بەڵام خەلیفە دڵی نەدەکراوە و بزەیەکی نەدەهاتە سەر لێوی؛ هەرچەند ئەو زۆریشی قسە و جەفەنگ پێ خۆش بوو. پیاوێکی ڕژد و بەرچاوتەنگیش نەبوو. بە خۆم گوت: «خۆزگە بمزانیبایە بۆ نارەحەتە؟» ئەوجار شەرابی خەمرەوێنی هاوڕێیانیان دانا و شەرابی ڕوون و گەشــیان لە دەفری بلووری و زێوین کرد. شــووڵ حەیزەرانێک لەوێ بوو خاوەنماڵ بە حەیزەرانە لە دەرکی دیوێکی پەنا خۆیەوەی دا. درەکە کراوە و سێ کەنیزی کەچینی مەمک هەناری ڕوو هەیڤ وەژوور کەوتن. ئەو کەنیزانە ســەماکەر و مووزیکژەن بوون. دوای ئەوە شیرینی و میوەیان هێنا.

ئیبنی حەمدوون دەڵێ پەردەیەکی دیبا لە نێوان ئێمە و ئەو کەنیزانەدا کێشــرابوو. ئەو پەردە لە تاڵی ئاوریشمی و زێڕین چێ کرابوو. کەچی خەلیفە چاوی لە هیچکام لەو کەنیزانە نەدەکرد. خاوەنماڵ نەیدەزانی میوانەکانی کێن. خەلیفە لە خاوەماڵەکەی پرســی: «گەلۆ تۆ شــەریفی؟» کابرا وڵامی داوە: «نا وەڵڵا، گەورەم. ئەمن کوڕە بازرگانم و لە نێو خەڵکدا بە ئەبوولحەسەنی عەلی کوڕی ئەحمەدی خوراسانی ناسراوم.» خەلیفە لێی پرسی :«گەلۆ من دەناسی؟» گوتی: «گەورەم بە خودا بە خزمەت هیچ کامتان نەگەیشتووم و ناتان ناسم.»

ئیبی حەمدوون گوتی: «کاکە ئەوە، بەڕێز خەلیفە مۆعتەزێدوبیللایە.» ئەو کابرایە لە ڕێوە هەستا کڕنۆشی بۆ خەلیفە برد. لە ترسان دەلەرزی. گوتی: «خەلیفە تکایە بیکە بۆخاتری رووحی پاکی باپیرانت ئەگەر هەڵەیەکم کردووە لێم خۆش بە.» خەلیفە گوتی: «ئەو ڕێزەی تۆ لە ئێمەت گرت ڕادەی نەبوو. بەلام شتێکی تۆم وەبەر دڵی نەهات. جا ئەگەر ڕاستییەکەم پێ بڵێی ئەوە ڕزگارت دەبێ. ئەگەر ڕاستیشم پێ نەڵێی ئەوە بەلایەکت بە سەر دێنم بە سەر کەس نەهاتبێ. لاوکە گوتی: «قەسەم بە خودا درۆم لە زاری نابیستی خەلیفە. بۆ چکارێکی منت لە دڵ گران هات؟» خەلیفە گوتی: «ئەمن لەو کاتەوەی هاتوومە ئەو ماڵەوە و سەرنجی جوانی و چاکییەکانی دەفر و ڕاخەر و شتی ئەو ماڵە دەدەم. سەیر دەکەم ناوی باپیرم «متەوەکێل عەلەڵلایان لە سەر نەخشاوە.» لاوەکە گوتی: «بەڵێ خەلیفە لە توانایی کەسدا نییە لە لای جەنابت جگە لە ڕاستی قسەیەکی دیکەی بە سەر زماندا بێ.» ئەوجار خەلیفە پێی گوت دانیشێ. خاوەن ماڵ دانیشت. خەلیفە گوتی: «باشە بۆم بگێڕەوە، ئەوە چۆناوچۆنە و چ باسە.» کوڕە گوتی: «خەلیفەی مەزن، کاتی خۆی کەس لە بەغدادا لە من و باوکم دەوڵەمەندتر نەبوو. باوکم لە بازاڕی سەڕافان و عەتاران و بەزازان چەندین دووکانی بوو. هەر دووکانەی کەسێکی لە سەر دانابوو. کاڵای جۆراوجۆری تێخستبوو. لە بازاڕی سەڕافانندا دووکانێکی کردبووەوە و خەریکی کڕین و فرۆشتن بوو. باوکم سەرەڕای ئەو هەموو ماڵ و سامانە جگە لە من کوڕی دیکەی نەبوو. کاتێک کەوتە ئاویلکەدان. بانگی منی کرد و دایکمی بە من سپارد و داوای لە من کرد. کوڕێکی لە خوداترس بم. دوای ئەوە ئیدی گیانی دەر چوو. خودا تەمەنی خەلیفە درێژ و پایەی دەسەلاتی پتەوتر کا. ئەوجار من ڕووم کردە کەیف و خۆشی و ڕابواردن. کۆمەڵێک هاوڕێم لە خۆم کۆ کردەوە. دایکیشم بەردەوام سەرکۆنەی دەکردم و دەنگی دەدام. منیش گوێم نەدەدایە. هەتا وای لێ هات تەواوی ماڵەکەم لێ بڵاو بووەوە. دوای ئەوە باخ و مەزرام فرۆشت. وای لێ هات جگە لەو ماڵەی تێیدا بووین هیچمان نەما. ئەو ماڵەش ماڵێکی زۆر خۆش و باش بوو. خەلیفە، ئەمن بە دایکم گوت: بە تەمام ئەو خانووە بفرۆشم. دایکم گوتی: «ئەگەر ئەو خانووە بفرۆشی شوێنێکمان نابێ لێی بحاوێینەوە و لە نێو خەڵکدا ئابڕوومان دەچێ. ئەمن گوتم: «نرخی ئەو خانووە پێنج هەزار دینارە، هەزار دیناری لێ دەدەمەوە بە خانوویەک و بەوی دیکەش خەریکی بازرگانی دەبم. دایکم گوتی: «ئەو خانووەی بەوەندە بە من دەفرۆشی؟» گوتم: «بەڵێ پێت دەفرۆشم.» دایکم لەڕێوە مجرییەکی دەر هێنا و سەرەکەی هەڵگرت. لە نێو ئەو مجرییەدا دەفرێکی ئاسنی چینی هێنا دەر کە پێنج هەزار دیناری تێدا بوو. کە ئەو پارەیەم دیت وەمزانی ئەو ماڵەمان پڕ بووە لە زێڕ. دایکم گوتی: «کوڕم وا بیر مەکەوە کە ئەو ماڵە ئی باوکی تۆیە، بە خودا ئەوە ئی زەمانی باوکمە پاشەکەوتم کردووە بۆ ڕۆژی تەنگانە. خەلیفە، ئەو پارەیەشم لە دایکم وەرگرت و لە ڕێی نەشیاودا خەرجم کرد. لەگەڵ هاوڕێ و دۆستانم بە خواردن و

خواردنەوە و عەیش و نۆش تەواوم کرد و جوابی دایکم نەداوە. دیســـان بە دایکم گوت: «دایە ئەو خانووە دەرۆشـم. دایکم گوتی: «ڕۆڵە من بۆیە نەمهێشت ئەو خانووە بفرۆشـی و پارەکەیم دایەی، دەمزانی کارت پێی دەبێ. ئێستا چۆن دەتوانی بیفرۆشی؟» منیش گوتم: «لێم گەڕێ شتەکە درێژ مەکەوە هەر دەبێ بیفرۆشم.» دایکم گوتی: «ئەتۆ ئەو خانووە بە پازدە هەزار دینار بە من بفرۆشـــە بەڵام بەو مەرجەی منیش لە کارەکانتدا ئاریکار و ڕاوێژکارت بم. ئەمن خانووەکەم بەو مەرجە بە دایکم فرۆشت.

ئەوجار بانگی پارێزەرانی باوکمی کرد و یەکی هەزار دیناری دانێ و ماڵەکەی خســـتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و دەستی کرد بە کڕین و فرۆشتن و دانوسان. بەشێکی لەو ماڵەش دا بە من کاری پێوە بکەم. بە منی گوت کە تۆ لە دووکانەکەی باوکت دانیشـــە. ئەمن بە قسـەی دایکم کرد و چوومە ئەو دووکانەی کە لە بازاڕی سـەڕافانەکان بوو. لەوێ دانیشتم و خەریکی کڕین و فرۆشـــتن بووم. یەک بە دە خێرم دەکرد. تا وای لێ هات. پارەیەکی باشـم هاتە دەســت. دایکم کە زانی کار دەکەم و وەزعم باشـە ڕاسـتی ئەو زێڕ و زێو و ماڵەی پێ گوتم کە لە لایەتی. ئیدی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ بووژامەوە تا وای لێهات باخ و مەزرا و مڵک و شـــتەکەی فرۆشـــتبوومن هەمووم کڕییەوە. وەکوو پێشـــووم لێ هـاتەوە. پارێزەرەکانی باوکم هاتنەوە لام. منش ماڵ و ســـامانم دانێ. دوای ئەوە دووکانێکی دیکەم لەو گەڕەکە دروست کرد.

خەلیفە، هەر وا لە دووکان دانیشـتبووم، کە کەنیزێک لێم وەژوور کەوت کە هەتا ئێسـتا هیچ چاوێک شتی هێندە جوان و دەلالی نەدیوە. لێی پرسیم: «ئێرە دووکانی ئەبوولحەسەنی خوراسـانییە؟» گوتم: «بەڵێ.» بەڵام خەلیفە، جوانییەکەی هۆش و گۆشـی لێ بڕیبووم. کە وام گوت، دانیشت و پێی گوتم: «بە نۆکەرەکانت بڵێ سێسەد دینارم بۆ بێنن.» ئەمنیش بە نۆکەرەکەم گوت سـێسـەد دیناری زێڕی بداتێ. کچە زێڕەکانی وەرگرت و لێیدا ڕۆیشـت. ئەقڵ و ئاوەزی منیش بە دوایدا ڕۆیشـت. نۆکەرەکەم لێی پرسـیم: «گەلۆ تۆ ئەو کەنیشـکە دەناسـی؟» گوتم: «ناوەڵا.» کۆیلەکەم گوتی: «ئەی چۆن نایناسـی و ئەو هەموو زێڕەشت دایە؟» گوتم: «بە خودا هێندەم پێ جوان بوو هۆشـــی ئەوانەم نەما. مێشـــکم لە کار کەوتبوو.»

نۆکەرەکەم کە ئاوای زانی بێ ئەوەی بە من بڵێ هەسـتا کەوتە شـوێنی. دوای ئێسـتێک بە گریانەوە گەڕاوە، لا چاوی ســـوور ببووەوە. لێم پرســـی: «ئەوە چی بووە؟» نۆکەرە گوتی: «ئەمن وە دوای ئەو کچە کەوتم بزانم ماڵەکەیان لە کوێیە، بۆم گەڕاوە زللەیەکی لە لاچاوی دام خەریک بوو کوێریشم بکا.»

خەلیفەی جیهان، ئەمن نیزیک مانگێک دانیشـــتم و چاوەڕێی ئەو کیژە بووم، نەمدیت. لە

تـاوانی خەریـک بوو، گیـانم دەرچێ. وابوو هەر کە بوو بە مـانگی تەواو، لە پڕ کچە وەدەکەوت و هاتە لام سـڵاوی کرد. ئەمن لە خۆشـیان فڕیم. کچە هەواڵی پرسـیم و گوتی: «ڕەنگە لە دڵی خۆتدا گوتبێتت کە ئەو ژنە مەکربازە کێ بوو هات ئەو ماڵەی لێ وەرگرتم و لێی دا ڕۆیشـت؟» گوتم: «نە بە خودا خانم، زێڕ و ماڵ و سـەر و گیان ئی تۆیە خانم.» ئینجا پەچە و ڕووبەندی لە سـەر خۆی داماڵی بحەسێتەوە. یەخە و بەر ئەوکی بە خشـڵ و جەواهێرات ڕازاندبووەوە. دوای ئەوە بە منی گوت: «دا ســـێســـەد دینارم بدەیە.» منیش سـێسـەد دینارم بژارد و دامێ. زێڕەکەی لێ وەرگرتم و هەسـتا ڕۆیشـت. بە نۆکەرەکەم گوت: «هەستە بکەوە شوێنی.» نۆکەرەکەم کەوتە شوێنی و ئەوەندەی پێ نەچوو گەڕاوە. حەپەسا بوو. شوێنی هەڵگرتبوو. ماوەیەکی زۆری پێ چوو کچە هەر نەهاتەوە. دوای ئەوە ڕۆژێک دانیشـتبووم کە کچە پەیدا بوو. زۆرمان قسـە کرد. دوای ئەوە گوتی: «پێنجسـەد دینارم دەیە.» ویسـتم بڵێم: پێنجسـە دینارت بۆ بدەمێ. کەچی هەسـت و خۆشـەویسـتی نەیهێشـت و زمانم نەگەڕا. خەلیفە ئەوەندەی تێی ڕادەمام زیاتر ئۆگری دەبووم. تەواوی گیـانم دەلەرزی، ڕەنگم زەرد هەڵـدەگەڕا و ئەوەی بە تەمـا دەبووم پێی بڵێم لە بیرم دەچووەوە. وەک شاعیر دەڵێ:

با دەی برد ئاوەز و هۆشـــم بە ســـۆزی شـــنەی ئەوینی
دەفڕین هەرچی وشـــەی جوانە لە زەینمـدا بە بینینی

دوای ئەوە پێنجســـەد دینارم بۆ بژارد. زێڕەکانی لێ وەرگرتم و گەڕاوە. ئەمن بۆخۆم هەســـتام وە دوای کەوتم هەتا چووە بازاڕی گەوهەرفرۆشـــان. چووە دووکانی گەوهەر فرۆشـێک و ملوانکەیەکی لێ کڕی. لەوێ چاوی بە من کەوت و گوتی: «پێنجسـەد دینارم دەیە. کە خاوەن دووکانەکە چاوی بە من کەوت لەبەرم هەسـتا. ئەمن گوتم: «ملوانکەیەکی بدەیە من پارەکەی دەدەم.» کچە ملوانکەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کچە ملوانکەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. ئەمن بە دوایدا ڕۆیشتم هەتا کچە گەیشتە دیجلە و سواری لۆتکەیەک بوو. ئەمن ویستم کڕنۆشی بۆ بەرم. کەچی ئەو بزەیەکی هاتێ و ڕۆیشت. ڕاوەستام و چاوم لێ کرد هەتا چوو لە کۆشکێکەوە. کە جوان تێی ڕامام ئەو کۆشکە کۆشکی خەلیفە «متەوەکیل» بوو. ناچار گەڕامەوە، کۆڵێکم خەم لە سەر دڵی وەکۆ ببوو. ئەو کچە سێ هەزار دیناری لە من وەرگرتبوو. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەو کچە ڕووتی کردم، هەم ماڵەکەی بردم و هەم ئاوەزم. هەر بینا لە تاوانی گیانیشم دەرچوو.» دوای ئەوە هاتمەوە ماڵێ و ئەوەی بۆم هاتبووە پێشێ هەموویم بۆ دایکم گێڕاوە. دایکم گوتی: «کوڕە بۆ خاتری خودا ئەوجار خۆی نیشان مەدە، کوڕە سەرت تێدا دەچێ.»

کە چوومەوە دووکان پارێزەرەکەم کە پیاوێکی بەساڵاچوو بوو لە بازاڕی عەتاراندا کاری دەکرد، هاتە لام. پێی گوتم: «کاکە ئەوە چۆنە ئاوا زەرد و لاواز بووی، خەمی چیتە؟» تەواوی ڕووداوەکەم بۆ ئەویش گێڕاوە. ئەو گوتی: «ڕۆڵە گیان ئەو کچە یەکێک لە کەنیزەکانی کوشکی خەلیفەیە و خەلیفە زۆری خۆش دەوێ. تازە لەو ماڵەشت گەڕێ کە داودەتێ و لە بیری بکە. ئەگەر هاتیش بۆ لات خۆتی پێشان مەدە و من ئاگادار کەوە فکرێکت بۆ دەکەمەوە. دەنا سەرت تێدا دەچێ ها.» دوای ئەوە کابرا ڕۆیشت. گڕی خۆشەویستی کچە لە دەروونمدا بلێسەی ستاند. کە سەری مانگ هاتەوە، کچە هاتەوە بۆ لام. ئەمن لە ڕادە بەدەر خۆشحاڵ بووم. کچە گوتی: «بۆ کەوتبوویە شوێنم؟» منیش گوتم: ئەوین و خۆشەویستی لە ڕادەبەدەر پێی کردم. ئیدی دەستم کرد بە گریان. ئەویش بەزەیی پێمدا هات و دەستی کرد بە گریان و پاشان گوتی: «بە خودا ئەوەندەی تۆ منت خۆش دەوێ، خۆشەویستی من بۆ تۆش هەزار بەرابەرە. بەڵام چبکەم لە مانگێ جارێک زیاتر ناتوانم تۆ بێم ببینم. دوای ئەوە کاغەزێکی دامێ و گوتی بچووە بۆ لای فلانی بنی فلانی، پارێزەری منە. بڵێ ئەوەندەی لەو کاغەزە دایە بتداتێ. ئەمن گوتم: «من پێویستیم بە ماڵ نییە. ماڵ و سامان و ڕووح و گیانم قوربانی تۆ بێ.» ئیدی کچە گوتی: «لەو بەینەدا کارێک دەکەم کە پێک بگەین هەرچەند من بکەومە گێرەوکێشەوە.» دوای ئەوە ماڵاوایی کرد و گەڕاوە.

لەڕێوە چووم بۆ لای کابرای عەتتار و شتەکەم بۆ گێڕاوە. ئەو کابرایە منی برد بۆ لای ماڵی متەوەکیل. سەیرم کرد ڕاست ئەو کۆشکەیە کە کچە دەچێتەوە ئەوێ. کابرای عەتتار سەری سووڕ ما. کەوتە بیرکردنەوە. چاوی بە بەرگدروویەک کە شوێنەکەی وابوو

دەیروانییە دیجلە، پێی گوتم: «تۆ لە ڕێی ئەو بەرگدرووەوە دەتوانی بە ئامانجت بگەی. گیرفانت بدڕێنە و بچووە بۆ لای گیرفانت بۆ چاک کاتەوە و دە دیناری زێری بدەیە.»

ئەمن چووم چوار کوتم دیبای ڕۆمی برد بۆ بەرگدرووەکە و گوتم: «لەو قوماشــە دوو کراسـم بۆ بدوورە. کاتێک بەرگدروو کراسـەکانی دروو و تەواو بوو. ئەمن سـێ بەرابەری ئەو پارەیەی دەبوایە بیدەمێ، دامێ. ئەویش دەسـتی کێشـا و کراسـەکانی دامێ. ئەمن گوتم ئەو کراسانەم پێشکەشی تۆ کرد. ئیدی ماوەیەک لەوێ لە لای دانیشتم. هێندێک جلوبەرگی دیکەم لە لای بە دروون دا و گوتم ئەوانەم بۆ بدروو لێرە هەڵیواسـە. هەر کەس ویسـتی ئەوانە بکڕێ پێیان دەبەخشـم. دروومانکار ئەوانی سـاز کرد و هەڵیواسـی. هەرکەس لە کۆشـکەوە دەهات و لەوانەی دەکڕی ئەمن پارەکەیم پێ دەبەخشـی. هەتا وابوو ڕۆژێک لە ڕۆژان جلدروو لێی پرسـیم: «ڕۆڵە گیان، پێم خۆش پێم بڵێی ئەوە چی تێدا وا ئەوە نیزیک سـەد دەسـتت جلوبەرگ دروو و فرۆشـرا و تەواوی پارەکەیت بەخشـی. ئەو ئاکارە لە ئاکاری بازرگانان ناچێ، ئەوان لە درەمێک خۆش نابن؟ مەگەر تۆ چەندت ماڵ و سـامان هەیە، ئەوەندەی لێ دەبەخشی؟ ئەتۆ ڕاستی ئەو شتەم پێ بڵێ بەشکوو بتوانم یارمەتییەکت بکەم.»

دوای ئەوە گوتی: «تۆ ئەو خودایە ڕاسـتیم پێ بڵێ تۆ ئاشق نیی؟» گوتم: «با ئاشـقم.» گوتی: «ئاشقی کێی؟» گوتم: «ئاشقی یەکێک لە کەنیزەکانی کۆشکی خەلیفەم.» دوای ئەوە جلـدرووەکە گوتی: «خودا ڕوویـان ڕەش کـا. ئەوانە هەر پیـاوان هەڵدەفریوێنن.» ئینجـا پرسـی: «ئەتۆ دەزانی نێوی ئەو کەنیزە چییە؟» گوتم: «نا وەڵلا.» گوتی: «نێونیشـانەکانیم پێ بڵێ دەنکێکی چۆنە؟» نێونیشـانەکانیم پێ گوت. گوتی: «کوڕە ماڵوێران ئەوە یەکێک لە گۆرانیبێژەکانی خەلیفەیە. خەلیفە ئەوی زۆر خۆش دەوێ و خزمەتکاری بۆ گرتووە. ئەمن لەگەڵ خزمەتکارەکەی پێکترتان دەناسـێنم. بەشـکوو لە ڕێگای ئەوەوە شـتێکت بۆ بکرێ و پێی بگەی.»

ئەمن لەگەڵ دروومانکارەکە قسـەم دەکرد کە لە پڕدا خزمەتکارەکەی کە وەک مانگی چاردە تیشـکی دەداوە لە کۆشـکی خەلیفە هاتە دەرێ و بەوێدا هات. چاوی بەو کراس و شتە جۆراجۆرانە کەوت کە دروومانکارەکە درووبوونی و لەوێ هەڵواسرابوون. لێیان ورد بووەوە و هاتە پێشێ هەتا لە من نیزیک بووەوە. ئەمن لە بەری هەستام و سڵاوم لێ کرد. لێی پرسـیم: «ئەتۆ کێی؟» گوتم: «ئەمن کابرایەکی بازرگانم. گوتی: «ئەو کراسـانە دەفرۆشـی؟» گوتم: «بەڵێ.» پێنج کراسـی هەڵگرت و گوتی: «نرخی ئەو پێنج کراسـە چەندەیە؟» گوتم: «ئەمن ئەوانە پێشکەشی تۆ دەکەم بۆ ئەوەی ببینە ئاشنا.» خزمەتکارەکە زۆر زۆری پێ خۆش بوو. ئەوجار هاتمەوە ماڵێ و کراسـێک کە بە گەوهەر و یاقووت ڕازابووەوە و بایی سـێ هەزار دینار بوو، بە دیاری بۆم برد و دامێ. دیارییەکەی منی

قەبووڵ کرد. منی بردە ناو کۆشک و چووینە دیوەکەی خۆی. دیسان ناوی منی پرسییەوە. گوتم: «من کابرایەکی بازرگانم. گوتی: «سـەرم لەو کارەی تۆ سـووڕ ماوە.» گوتم: «بۆ سـەرت سـووڕ ماوە؟» وڵامی دامەوە: «لەوەی کە ئەو هەموو ماڵەت بە من بەخشـی. ئەمن وای بۆ دەچم تۆ ئەبوولحەسەنی سەرڕاف بی.»

خەلیفە، کە ئەو قسـەیەم بیسـت، واقم وڕ ما و فرمێسـکم هاتە خوارێ. خزمەتکارەکە بە منی گوت: «مەگری، قەسـەم بە خودا ئەوەی تۆ بۆی دەگری. زۆر لە تۆ زیاتر تینووی ئەوینی تۆیە. هەموو کەنیزەکانی کۆشـک بەو کارەی تۆ و ئەویان زانیوە.» پاشـان گوتی: «ئەتۆ چیت دەوێ.» گوتم: «دەمهەوێ یارمەتیم بدەی.» ئەو بەڵێنی دا سـبەینێ بمبینێتەوە. من گەڕامەوە ماڵە خۆم و ئەو شـەوەم بە خەون و خەیاڵی خۆشـەوە تێپەڕاند. کە ڕۆژ بووەوە، بەرەو کۆشـک ڕۆیشـتم و چوومەوە دیوەکەی ئەو. کیژۆڵە خزمەتکارەکە بە منی گوت: «ئەو شـەو کە خۆشـەویستەکەت لە لای خەلیفە هاتەوە تەواوی ئەو قسانەی دوێنێم بۆ گێڕاوە. ئەو دەیهەوێ چاوی پێت بکەوێ. ئەوڕۆ تۆ لە لای من دانیشـە. ئەمن دانیشـتم هەتا بوو بە شـەو. لە پڕدا دیتم کیژۆڵە خزمەتکارەکە هاتەوە و کراسـێکی ئاتەگ زێڕین و کراسێک لە کراسەکانی خەلیفەی بۆ هێنام و دایمێ لە بەری کەم. گوڵاو و بۆنی خۆشی لێ دام. ڕێک وەک خەلیفە دەچووم. ئەوجار بردمی بۆ شـوێنێک کە ئەمبەرەوبەری دیو بوو. ڕووبەڕووی یەک. پێی گوتم: «ئەو دیوانە شـوێنی کەنیزە تایبەتەکانی خەلیفەن. تۆ کە بە لای دیوەکاندا ڕۆیشـتی، یەکی دەنکە باقلەیەک لە سـەر دەرگاکان دانێ. چونکە خەلیفە هەمیشە وا دەکا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شه‌وی نۆسه‌د و شه‌ست و دووه‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشکۆ! کیژۆڵه خزمه‌تکاره‌که به ئه‌بوولحه‌سه‌نی گوت: «ئه‌تۆش وه‌ک خه‌لیفه بکه. له ده‌ستی ڕاسته‌وه که گه‌یشتییه دیوی دووه‌م، ده‌رگای ئه‌و دیوه له به‌ردی ڕوخام و مه‌ڕمه‌ڕه بچووه ژووریٚ گراوی خۆت له‌ویٚ ده‌بینی. له‌ویٚ به، هه‌تا ئیشـــه‌ڵلا ڕیٚگایه‌ک بۆ هاتنه ده‌ریٚت ده‌دۆزمه‌وه. ئه‌گه‌ر له سندووقیشدا بیٚ. ده‌تهیٚنمه ده‌ریٚ.»

کۆیله منداڵکاره‌که منی برده ئه‌ویٚ و گه‌ڕاوه. ئیدی هه‌ر ڕۆیشتم و ده‌رگاکانم بژارد. که گه‌یشـتمه ئه‌و شـویٚنه، گۆرانی و ئاوازی جۆراجۆرم بیسـت. مۆمگه‌لیٚکم دیت هه‌ڵکرابوو و به‌ره‌وڕووم ده‌هـاتن. که نیزیـک بوومه‌وه و لیی ورد بوومه‌وه، ســـه‌یرم کرد، خه‌لیفه‌یه که‌نیزگه‌لیٚک به مۆمه‌مه‌وه ده‌وریان داوه. ئه‌من گویٚم لیٚ بوو یه‌کیٚک له که‌نیزه‌کان له یه‌کی دیکه‌ی پرسی ئه‌ریٚ ئیٚمه دوو خه‌لیفه‌مان هه‌یه! ئه‌من به چاوی خۆم دیتم که خه‌لیفه به به‌ر ده‌رکی دیوه‌که‌ی منـدا تیٚپه‌ڕی و بۆنیٚکی خۆشـــی لیٚ بڵاو بووه‌وه. وه‌ک جـاران ده‌نکه باقله‌یه‌کیشـی له ســه‌ر ده‌رکی دیوه‌که دانا. که‌چی ئه‌وه ڕووناکایی مۆمه‌کانی خه‌لیفه‌یه دیٚ. که‌نیزه‌که‌ی دیکه گوتی: «وه‌ڵا ســـه‌یره، خۆ هه‌مووکه‌س ناتوانی جلی خه‌لیفه له به‌ر بکا. دوای ئه‌وه مۆمه‌کـان له من نیزیـک بوونه‌وه. گیـانم وه له‌رزین که‌وت. له پڕدا بـانگی خزمه‌تکاریٚکی کرد و گوتی: «بگه‌ڕیٚنه‌وه بۆ ئه‌و لایه. ده‌رگای دیویٚک کرابووه‌وه که‌نیزه‌کان هه‌موو چوونه ئه‌ویٚوه. دوای ئه‌وه له‌ویٚ هاتنه ده‌ریٚ و ڕۆیشـــتن. هه‌تا گه‌یشـــتنه دیوی خۆشه‌ویسـته‌که‌ی من. بۆخۆم گویٚم لیٚ بوو، خه‌لیفه پرسـی: «ئه‌و دیوه ئی کیٚیه؟» گوتیان: ئه‌و دیوه ئی شـــه‌جه‌ره‌تودوڕه. خه‌لیفه گوتی: «بانگی بکه‌ن.» بانگیان کرد. هاته ده‌ریٚ و کڕنۆشـی بۆ خه‌لیفه برد. خه‌لیفه لیی پرسـی: «ئیشـتیات لیٚیه ئه‌و شـه‌و مه‌ی بخۆیه‌وه؟» که‌نیزه گوتی: «ئه‌گه‌ر له به‌ر حوزووری تۆ نه‌بیٚ و چاوم له تیشـکی ڕوخسـاری تۆ نه‌بیٚ، ئه‌وشه‌و حه‌زم له شه‌رابخواردنه‌وه نییه.» خه‌لیفه به خزمه‌تکاره‌که‌ی گوت: «به خه‌زیٚنه‌دار بڵیٚ: فڵان ملوانکه‌ی بداتیٚ.» دوای ئه‌وه خه‌لیفه گوتی: «که وایه بچۆوه دیوه‌که‌ی خۆت.» ئه‌ویش گه‌ڕاوه دیوه‌که‌ی خۆی.

له پڕ که‌نیزیٚک که له پیٚشه‌وه‌ی مۆم به ده‌سته‌کانه‌وه بوو، شۆقی ڕوخساریشی له شۆقی مۆمه‌که‌ی زیاتر بوو. لیٚم هاته پیٚش و گوتی: «ئه‌وه کیٚیه؟» به دوای ئه‌وه‌دا قۆڵی منی گرت و ڕای دام بۆ یه‌کیٚک له دیوه‌کان و لیی پرسـیم: «ئه‌تۆ کیٚی؟» ئه‌من کڕنۆشـم بۆ برد و له به‌ری پاڕامه‌وه به‌زه‌یی پیٚمدا بیٚ له ڕیٚی خودادا یارمه‌تیم بدا. ئه‌من له ترسان گریام. که‌نیزه گوتی: «گومـانم له‌ودا نییه ئه‌تۆ دزیٚ.» گوتم: «نـاوه‌ڵلا من دز نیم.» که‌نیزه‌که گوتی: «ڕاســـتیم پیٚ بڵیٚ من یـارمه‌تیت ده‌که‌م.» گوتم: «من ئه‌ویـنداریٚکی گه‌وج و نه‌فـامم و

خۆشەویستی و نەزانی منی تووشی ئەو مەترسییە کرد.» کەنیزەکە گوتی: «لێرە بە تا من دەگەڕێمەوە.»

لەڕێوە گەڕاوە و کراسێکی لە کراسی کەنیزەکانی خۆی بۆ من هێنا و پێی لە بەر کردم و گوتی: «بە دوای مندا وەرە.» ئەمن بە دوایدا ڕۆیشـــتم هەتا گەیشـــتینە دیوەکەی ئەو. لەوێ پێی گوتم: «وەرە ژوورەوە.» من چوومە ژوورێ. منی لە ســـەر کەتێک کە فەرشـــی دیبای لە ســـەر ڕاخرابوو دانیشـــاند و پێی گوتم: «لە هیچ مەترســـە.» ئینجا پرســـی: «ئەتۆ ئەبوولحەســـەنی سەڕاف نیی؟» گوتم: «بەڵێ هەوم.» ئەگەر ئەو بی دز نەبی ئەوە نەجاتت دەبێ. دەنا تێدا دەچی. ئەگەر ئەبوولحەســـەنی خوراســـانی بی، ئەوە ئەرخەیان بە هیچت لێ نایە. چونکە تۆ دۆســـتی خوشـــکی من شـــەجەرەتوددوڕی و ئەو قەت تۆی لە بیر ناچێتەوە. بۆ ئێمەشی گێڕاوەتەوە کە چۆنی ماڵ لێ وەرگرتووی. سەرەڕای ئەوەش تۆ تێک نەچووی و بە دڵت نەگرتووە. ئاواش هێشتا گڕی خۆشەویستی لە دڵی ئەودا زۆر لە ئی تۆ زیاترە. ئەوجار پێم بڵێ تۆ چۆن هاتوویە ئێرە؟ گەلۆ بە فەرمانی ئەو هاتووی یان بێ ئەوەی ئەو بزانێ گیانی خۆت خستووەتە مەترسییەوە. بۆ دەتهەوێ پێی بگەی؟» گوتم: «خانم، قەسەم بە خودا، ئەمن کە ئاوا گیانی خۆم خســـتووەتە مەترســـییەوە جگە لە بینینی و بیســـتی قسەکانی هیچ مەبەستێکم نییە، خودا شایەدمە کە قەتم خەیانەت پێ نەکردووە.» کیژۆڵەکە وڵامی داوە گوتی: «چونکە تۆ ئەوەندە نییەت پاکی، خودا فریات کەوت و بەزەیی و سۆزی تۆی خستە دڵمەوە و ڕزگاری کردی.»

دوای ئەوە بە کەنیزەکەی خۆی گوت: «بچووە بۆ لای شـــەجەرەتوددوڕ و ســـڵاوی بگەیەنە و پێی بڵێ خوشکت دەیگوت ئەوشەو بێ بۆ لای من. کەنیزە چوو بۆ لای و گەڕاوە وڵامی هێناوە کە گوتوویە: «خودا لە ســـایەی ژیانی تووەوە بە ســـەرم کاتەوە و من بە قوربانی تۆ بکا. ئەگەر جگە لەوشـــەو هەر شـــەوێکی دیکە با بە ســـەرەوە دەهاتم. بەڵام ئەمشـــەو ســـەرئێشـــەمە.» ئەو کچە بە کەنیزەکەی گوت: «بچووەوە پێی بڵێ ئەوشـــەو هەر دەبێ بێ کارێکم پێیەتی.» ئیدی کەنیزە دیسان چووەوە بۆ لای.

پاش ئیســـتێک ئەو پەریڕوخســـارە هات و دوومای وەک مانگی چاردە شـــۆقی دەداوە. خوشـــکی بەڕەوڕووی چوو لە ئامێزی گرت. منیش لە قوژبنێک خۆم مات دابوو. کە هاتنە پێشەوە گوتی: «ئەبوولحەسەن وەرە دەرێ دەستی گراوی خۆت ماچ بکە.»

خەلیفە، من خێرا چوومە دەرێ. ئەو مانگڕوخســـارە هەرکە منی دیت، خۆی لە باوەشـــی هاویشـــتم و توند بە خۆیەوە گوشـــیمی و گوتی: «پێم بڵێ ئەوە چۆناوچۆن هاتی؟» ئیدی منیش ئەوەی بە ســـەرم هات، بە ترس و دڵڕاوکێکانمەوە هەموویم بۆ گێڕاوە. گوتی: «تۆ لەبەر من خۆت ئاوا خستووەتە مەترسییەوە. دیسان شوکری خودا کە بە خێر گوزەراوە.

له هەمووی خۆشـــتر ئەوەی کە هاتوویە دیوی خوشـــکم. دوای ئەوە قۆڵی منی گرت و بردمی بۆ دیوەکەی خۆی. بە خوشـکیشـی گوت: «ئەمن بەڵێنم داوە خۆ لە حەرام بپارێزم. بەڵام چونکە ئەوە ئاوا لەبەر من خۆی خسـتووەتە مەترسـییەوە، منیش کارێک دەکەم ببمە حەڵاڵی ئەو.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی نۆسەد و شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کچە بە خوشکەکەی گوت: «زۆر زوو بۆت دەر دەکەوێ بۆ ئەوەی من بەو بکەم، چی دەکەم. تەنانەت ئەگەر گیانیشم لە سەر دانابێ. ئیدی لەو جەنگەیەدا کە ئێمە قسەمان دەکرد دەنگەدەنگ پەیدا بوو. سەیرمان کرد خەلیفە دێ بۆ دیوەکەی ئەو. دیوێکی چکۆلە بەسەر ئەو دیوەوە بوو خێرا منی لەوێ پەستاوت و دەرگای لە سەر داخستم. بۆخۆی چوو بەپیر خەلیفەوە. خەلیفەی هێنا ژوورێ. کاتێک خەلیفە دانیشت، کچە لە پێشی ڕاوەستا. بە کەنیزەکانی گوت: «شەراب بێنن.» خەلیفە دایکی موعتەزیدوبیللای خۆش دەویست. کەچی ئەو بە هۆی جوانییەکەیەوە لە خۆی دەرچووبوو، دووری لێ دەکرد و تۆرا بوو. شتەکە وا بوو ئەو بە هۆی جوانییەکەیەوە و ئەویش بە هۆی شکۆ و دەسەلاتەکەیەوە لوتبەرزیان دەنواند و پێکەوە نەدەسازان و ئاشت نەدەبوونەوە. بەلام خەلیفە ئاوری لە دلی بەربیوو. لە تاوان دەچوو بۆ دیوی کەنیزەکای و خۆی بە خواردنەوە و بەزم و سەما و ڕابواردنەوە سەرقال دەکرد. چونکە خەلیفە زۆر حەزی لە دەنگی شەجەرەتوددوڕ بوو هاتە دیوەکەی ئەو و داوای لێ کرد کەمێکی گۆرانی بۆ بلێ. شەجەرەتوددوڕ دەستی دا عوودەکەی و تالەکانی توند کردەوە و ئەو چەند بەیتەی بە گۆرانی بۆ گوت:

گەر یارت لەگەل نەبێ، شـــــــــــــــــــــــۆقی مۆمت بۆ چییە
گەر بێت و لەگەلت بێ، شـــــــــــــــــــــــۆقی ئەوت بۆ چییە
ئەو خۆرە بۆ ژیانت، ئەستێرە و مانگ گەشی وین
گەر دەنگی نەرمی ئەو بێ، قاسپەی کەوت بۆ چییە

خەلیفە بە بیستنی ئەو بەیتانە کەیفی ساز بوو، گوتی: « شەجەرەتوددوڕ، داوایەکم لێ بکە.» شەجەرەتوددوڕ گوتی: «داوای ئەوەت لێ دەکەم ئازادم کەیت.» خەلیفە گوتی: «ئەوە لە ڕێی خودادا ئازادم کردی.»

کچە سوژدەی بۆ برد و زەوی ماچ کرد. خەلیفە گوتی: «دەست بدە عوودەکە و شتێک بە خۆشی کەنیزەێک بلێ کە من ئۆگری ئەوم و لە کاتێکدا تەواوی خەلک دلی منیان دەوێ و من دلی ئەوم دەوێ و هەول دەدەم بۆ ڕازیکردنی ئەو. ئیدی کچە عوودەکەی هەلگرت و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

هەلنایە چاوی مانگ، لە ئاست شۆقی ئەو گولە
تیشکاوێژە سیما و دەموچاوی، ئەو گولە

عەودالی جوانیمن، هەموو ئاشقانی ولات
بە دڵ و گیان من پێم نایە داوی ئەو گوڵە

خەلیفە کەیفی ساز بوو بە کیژۆڵەکەی گوت: «دەست دە ئەو عوودە و شیعرێکمان بۆ بڵێ. کە شیاوی من و دوو کەنیزەکەم بێ، وا دەسەڵاتی منیش لە بەر دەستی ئەواندایە و خەویان لە من ستاندووە. کیژە لەڕێوە دەستی دا عوودەکە و بە دەنگێکی بلاوێن ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

بم بەخشە دەبێ دوو کەس سەرخۆش بکەم
جێگای دوو دڵ لە دڵمدا خۆش دەکەم
ڕاستە یەکیان کوڵەکەی ژیانمە
ئەوەی دیکەش ڕێک، ڕوح و ڕەوانمە

خەلیفە پێی سەیر بوو، ئەو شیعرە هێندە لەگەڵ ئەو دەهاتەوە. هەر بۆیە بە زەینیدا هات بچێ لەگەڵ کەنیزەکەی دیکەی ئاشت بێتەوە. دوای ئەوە لە دیوەکە چووە دەرێ و چوو بۆ دیوی ئەو کەنیزەی لێک زیز بیوون. یەکێک لە کەنیزەکان وە پێشیان کەوت و خۆی گەیاندە کەنیزە و هەواڵی چوونی خەلیفەی بۆ برد. ئەویش بە لەز بەرەو پیری خەلیفەوە هات و کڕنۆشی بۆ برد و پێکەوە ئاشت بوونەوە.

شەجەرەتوددوڕ بە خۆشحاڵییەوە گەڕاوە بۆ لای من و گوتی: «ئەوە پێوقەدەمی پیرۆزی تۆ بوو، منیش ئازاد بووم. هیوادارم خودا یارمەتیم بدا و ئەو گەلاڵەی دامڕشتووە بیبەمە سەرێ تا بە تۆ بگەم. ئەمن شوکری خودام کرد و هەر وا خەریک بووین قسەمان دەکرد، خزمەتکارەکەی کە ببووە دیوناسی من، وەژوور کەوت. ڕووداوەکەمان بۆ گێڕاوە و ئەویش شوکری خودای کرد. گوتیشی هیوادارم بێ کێشە لێرە بچییە دەرێ. لەو جەنگەیەدا خوشکی شەجەرەتوددوڕ پەیدا بوو، کە نێوی فاتێن بووم. کەنیزەکە گوتی: «ئەرێ خوشکێ، ئەبوولحەسەن چۆن بە سلامەتی لە کۆشک بەرینە دەرێ. فکرێکمان بۆ بکەوە. وا شوکور لە سای پێوقەدەمی ئەو، خودا ئازادی بە قسمەت من کرد.» خوشکی گوتی: «من هیچ ڕێیەکم پێ شک نایە، مەگین جلی ژنانی لە بەر بکەین.»

ئیدی بوخچەیەکیان جلی ژنانە هێنا. ئەمن ئەو جلانەم کردە بەر و هاتمە دەرێ. کە گەیشتە نێوەڕاستی کۆشک چاوم بە خەلیفە کەوت، لەوێ دانیشتبوو. خزمەتکار و شتەکەش دەوریان دابوو. خەلیفە چاوێکی لێ کردم. زانی غەوارەم. فەرمانی دا و گوتی: «دا خێرا ئەو کەنیزە بێننە لای خۆم.» خزمەتکارەکان منیان بردە لای ئەو. ڕووبەندەکەی لە سەر لابردم.

خەلیفە کە چاوی بە من کەوت، لێی پرسی: «لێرە چ دەکەی؟» ئەمن بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە و هیچم لێ نەشاردەوە. خەلیفە کە بەسەرهاتی منی بیست چوو لە فکرە. ئیستێک بیری کردەوە و پاشا بە لەز هەستا چوو بۆ دیوەکەی شەجەرەتوددوڕ و پێی گوت: «ئەوە چۆنە بە سەر مندا دڵت دەچێتە سەر بازرگانزادەیەک؟» شەجەرەتوددوڕ تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕاوە. خەلیفە کە زانی لە دڵەوە ئاشقی بووە زگی پێی سووتا و لێی خۆش بوو. ئیدی لەوێ هاتەوە و بانگی منی کرد. لێی پرسیم: «چ شتێک تۆی هاندا، بوێری بێیە کۆشکەوە و گیانت بخەیتە مەترسییە؟» گوتم: «خەلیفە، گەوجێتی خۆشەویستی و گەورەیی و دڵاوایی تۆ منی هاندا. دوای ئەوە دەستم کرد بە گریان و کڕنۆشم برد.

ئەوجار خەلیفە گوتی: «لێت خۆش بووم. دوای ئەوە ڕێی دا دانیشم و قازی ئەحمەدی بانگ کرد و کەنیزەکەی لێ مارە کردم. فەرمووی تەواوی ئەو ماڵەی لە لای ئەو کەنیزەیە بیبا بۆ ماڵی ئەو کوڕە. ڕێشی دام هەتا سێ ڕۆژان لە دیوی شەجەرەتوددوڕ ڕامبوارد. کە سێ ڕۆژە تەواو بوو. ئەوجار لە کۆشک هاتمە دەرێ و هەرچی لە دیوەکەی ئەودا بوو هێنامە ماڵی خۆم. خەلیفە تەواوی ئەو شتانەی لەو ماڵەدا دەیبینی و نێوی خەلیفەی بەسەرەوەیە جیازی شەجەرەتوددوڕە.»

دوای ئەوە ڕۆژێک شەجەرەتوددوڕ پێی گوتم: «مەتەوەکێل زۆر پیاوی چاک و دەست و دڵکراوەیە. بەڵام لەوە دەترسم کەسانی بەرچاوتەنگ بچنە بنییەوە[1] و منی بخەنەوە یاد و هانی بدەین بە بۆنەی ئاهەنگ و گۆرانی گوتنەوە بانگم بکاتەوە. دەبێ چارەیەک بۆ ئەوە بدۆزینەوە. بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێ. فکرم لەو بارەوە بحەسێتەوە. گوتم: «جا چێت بە زەین دەگا؟» وڵامی دامەوە: «دەمهەوێ بچم ئیجازەی چوون بۆ مەککە وەرگرم و تۆبە لە گۆرانی گوتن وەرگرم.» گوتم: «وەڵا فکرەکەت زۆر فکری چاکە.»

وا بوو لەو کاتەدا کە ئەوان خەریکی ئەو قسانە بوون ناردەیەکی خەلیفە هات لە دوای. چونکە خەلیفە دەنگی ئەوی زۆر پێ خۆش بوو. لەڕێوە هەستا و چووە خزمەت خەلیفە و ئەرکەکەی بەجێ گەیاند. خەلیفە پێی گوت: «سەرم بدە و لە بیرم مەکە.» ئەویش وڵامی داوە: «باشە بە سەر سەر و بە سەر چاو.» ڕێکەوت وا بوو، ڕۆژێکیان خەلیفە بە پێی عادەتی خۆی ناردی لە دوای، ئەویش چوو بۆ لای. کە لە لای خەلیفە گەڕاوە، سەیرم کرد، ئەوە یەخە و بەرۆکی هەمووی دادڕاوە و فرمێسکی دێتە خوارێ سەیر! ئەمن زۆر ترسام. پێم وا بوو، دەستووریان داوە ئێمە بگرن. بە کەنیزەکەم گوت: «ئەوە چ بووە، خەلیفە لێمان بە ڕقدا چووە؟» بە گریانەوە گوتی: «تازە مەتەوەکێلی چی، مەتەوەکێل نەماوە.» ئەمن گوتم: «باشە پێم بڵێ چی بووە؟» گوتی: «خەلیفە لە پشت پەردە لەگەڵ فەتحی بنی خاقان

[1]. بچنە بنییەوە: هانی بدەن، دنەی بدەن.

و ســـەدەقەتی بنی ســـەدەقە دانیشـتبوو شـەرابی دەخواردەوە کە مونتەســەری کوڕی و تاقمێکی تورک هێرشـــیان کردە ســـەری کوشـــتیان. ئیدی شـــادیمان لێ بوو بە شـــین و خۆشـــیمان لێ تاڵ بوو. ئیدی منیش لەگەڵ کەنیزەکەم ڕامان کرد و بە ســـلامەتی هاتینە دەرێ. خەلیفە ئەمن کە ئەو قسـەیەم لەو بیسـت لەڕێوە هەسـتام بەرەو بەسـرە ڕۆیشـتم. دوایە بیستمانەوە کە لە نێوان مونتەسەر و موستەعین شەڕوهەلا ڕووی داوە. ئیدی بەغدام لەبەر چاو کەوت و ژن و ماڵەکەم هێنا بۆ بەسرە. ئەوە بوو، بەسـەرهاتی ئێمە، ئێستا ئەو شتانەی دەیبینی کە ناوی باپیری تۆی بەسەرەوەیە ئەوە کاتی خۆی ئەو بۆخۆی داوین بە ئێمە.»

خەلیفە بەســـەرهاتەکەی ئێمەی پێ ســـەیر بوو. زۆریش خۆش حاڵ بوو. دوای ئەوە کەنیزەکەم و منداڵەکانیم هێنا هەنتەشی خەلیفە و دەستیان ماچ کرد. خەلیفە داوای پێنووس و لێنووسی کرد و بۆی نووسین هەتا بیست ساڵ پیتاک لە ئێمە نەستێنن. ئەمنیشی کردە هاوڕێ و هاودەمی خۆی و بەردەوام لە خزمەتیدا بووم. هەتا مردن لێکی هەڵبڕین. نەمری هەر بۆ خودایە.

### بەسەرهاتی قەمەروززەمان و کابرای زێڕینگەر

یەکی دیکە لە بەســـەرهاتەکان ئەوەیە کە دەگێڕنەوە زەمانی زوو کابرایەکی بازرگان کوڕێک و کچێکی بوو، کچە لەبەر جوانیان ناویان نابوو «کەوکەبولسەباح» واتە گڕی چرا. کوڕەشـــیان لەبەر چاکی و جوانی زۆر ناو نابوو «قەمەروززەمان» واتە مانگی ڕۆژگار. کابرای بازرگان کە زانی ئەو منداڵانەی هێند جوان و لە بەر دڵانن. ترسی ڕێنیشت. لە چاو و زمانی چاوپیسان و لە خودا نەترسان ترسا. هەتا چاردە ساڵان ئەوانی لە ماڵدا ڕاگرت و نەیهێشـــت بکەونە بە چاوی خەڵک. جگە لە دایک و باب و کەنیزەکەی کەس نەیدتبوون. دایک و باوکیان هەردووکیان قورئانیان دەزانی. دایکە قورئانی فێری کچە و باوکیشـــیان فێری کوڕەکەی دەکرد. هەتا هەردووکیان قورئانیان لە بەر کرد. خەت و حیسـاب و داب و نەریت و لێزانی و شـــارەزاییەکانی دیکە لە دایک و باوکیان فێر بوون و پێویســـتیان بە مامۆستا نەبوو.

کاتێک کوڕە تەمەنی گەیشـــتە شـازدە سـاڵان، دایکی بە مێردەکەی گوت: «ئەرێ ئەوە هەتا کەنگێ ناهێڵی قەمەروززەمان بچێتە ناو خەڵک و هەر ئاوا لە ژووریدا دەســـت بە ســـەری دەکەی؟ ئەخە ئەو کوڕە یان کچ؟ ئەگەر ئەو کوڕە بۆ نایبەی بۆ ناو دووکان و بازاڕ و هەتا بۆخۆی لە سەر دووکان دانیشێ و خەڵک بناسێ و خەڵکیش بیناسن و فێری کڕین و فرۆشتن و دانوسان بێ. ئەوە هاتوو ئەتۆ شتێکت بە سەر هات. خەڵک چۆن بزانن

که ئەو کوڕی تۆیە تا قەرز و قۆڵەی بدەنەوە یان لێی بسـتێننەوە. کاتێک کەس نەیزانیوە و نەیدیوە کێ باوەڕ دەکا ئەو دووکان و سامانە ئی ئەو کوڕە بێ. هەر بۆیە ماڵەکەت لێ بڵاو دەبێتەوە و منداڵەکانیشـت دەم لە پووش دەبن و کەس گوو بە کڵاویان ناپێوێ. دەنا ئەمن بە تەمام کچەکە بەرمە نێو خەڵک با ببینن و بزانن کچمان هەیە، بەشـکوو ئەوە هاوتایەکی بۆ پەیدا بێ و بێتە خوازبێنی و بە مێردی بدەم. ئاهەنگێکی خۆشـیشـی بۆ سـاز بکەم.»
کابرای بازرگان بە ژنەکەی گوت: «ئەمن لە چاوی پیس دەترسم.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و شەست و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بازرگانە بە ژنەکەی گوت: «ئەمن لە چاوی پیس دەترسم، دەنا کێ پێی خۆش نییە کوڕێکی ئاوای بێ و لەگەڵ خۆی بیبا بۆ نێو بازاڕ و شانازی پێوە بکا. خۆت دەزانی من لە چاوم خۆشتر دەوێ و لە تاوان نایبەم. شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

چاوی چەپی خۆم دەردێنم
تا نەتبینێ جگە لە ڕاست

ژنی بازرگانەکە وڵامی داوە: «پشت بە خودا ببەستە، ئەوەی خودا نەیکا نابێ. ئەوڕۆ کوڕەکەت بەرە و بڕۆ بۆ دووکان.» ئینجا ژنە هەستا و کراسێکی دیبای سووری لە بەر کوڕەکەی کرد. کوڕە بوو بە مایەی ئاژاوە لە نێو بینەرانی و هەژێنەری دڵی ئاشقان. باوکی بردی بۆ بازاڕ. هەرکەس چاوی پێی دەکەوت هۆش و گۆشی نەدەما و دەهاتە سڵاوی و دەستی ماچ دەکرد. لە دەوری ئاپۆرەیان دابوو. باوکی جنێوی بە خەڵکەکە دەدا بۆ ئەوەی بڵاوەی کەن. کەچی خەڵک دەیانگوت:

هەرکەس هەنگوین بفرۆشێ
خەڵک لە دەوری دەخرۆشێ
یا دەبێ باڵی مێش بکا
یا سەری هەنگوین داپۆشێ

باوکی بە قسەکانی خەڵک تریق دەبووەوە و نەیدەتوانی بێ دەنگیان بکا. هەر بۆیە قسەی بە خێزانی دەگوت و ئەوی بە هۆکاری هێنانە ناو خەڵکی، کوڕەکەی دەزانی. کە گەیشتنە دووکان، باوکی دووکانی هەڵگرت و کوڕەکەی لە پەنا خۆی دانا. تەماشا کرد تەماشاچیان ڕێگەی هاتوچووەی خەڵکیان گرتووە و هەرکەس بەوێدا دەهات، ڕادەوەستا و ئیستێک چاوی لە کوڕەکەی ئەو دەبڕی. کەس چاوی لەسەر هەڵنەدەبڕی. کابرا زۆری پێ ناخۆش بوو، شەرمی دەکرد کە لە پڕدا دەروێشێک لە نێو بازاڕ پەیدا بوو. هات بۆ لای قەمەروززەمان. لە بەر خۆیەوە هەر شێعریشی دەخوێندەوە. کە لە قەمەروززەمان نیزیک بووەوە، فرمێسکی سەری کرد و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئەمڕۆکە دڵڕفێنەکەم بە سەرخۆشی کەوتە ناو شار
هەستا بۆ چرووک لە دڵی ئەڤینداری ژاری هەژار

سـەدان چاولەدوو لە تاوان، ڕۆژیان پڕ بوو لە ئەسـتێرە
سـەدانی هەڵوەدا و شـەیدا، سـەریان هەڵکشا بۆ سـەر دار

دوای ئەوە هاتە پێشـێ و ڕووبەڕووی قەمەروززەمان ڕاوەسـتا. چاوی تێ بڕی و بە گریانەوە ئەو شیعرەی گوت:

دیـتـم مـن سـەروێـک دەڕوا بە پەنـجە
هەر ناز بوو دەتـکا لەو لار و لەنجە
ئەگـریـجەی لەسـەر گـوێـی لالەئـاسـای
دڵی ئاشـقانی دەکرد ئەشکەنجە
هەزاران شـەیـدا هـاواریـان دەکـرد
شـیـن و ڕۆیـان بـوو لە سـوێـی ئەو گەنـجە

دوای ئەوە دەروێشـەکە چلە ڕیحانەیەکی دا بە کوڕە. باوکی کوڕە دەسـتی لە گیرفانی ڕاکرد و چەند درەمێکی لە گیرفانی دەرهێنا و دای بە دەروێشـەکە و گوتی ها دەروێش ڕسـقی خۆت وەرگرە و بڕۆ بە دوای کاری خۆتدا. دەروێش درەمەکانی وەرگرت و هەر لەوێ لەسـەر سـەکۆکە لە پەنا کوڕە دانیشـت. دەسـتی کرد بە گریان و لێکدا لێکدا هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا. خەڵکە چاویان لێ دەکردن و دەیان گوت دەروێش هەر وا گلاو و پیسـن. تاقمێکی دیکە دەیانگوت: ئەو دەروێشـە سـەیر ئاشـقی ئەو کوڕە بووە، هەر ئاوری گرتووە بۆی.

باوکی کوڕە کە ئاوای دیت هەسـتا بە کوڕەکەی گوت، بێ فایدەیە ئەوڕۆ بازاڕمان نییە. هەستە با دووکان داخەین و بڕۆینەوە. خودا جەزای دایکت بداتەوە، تەواوی ئەو کێشانە لە بن سەری ئەودان. ئەوجار بازرگانەکە بە دەروێشەکەی گوت دەروێش هەستە بڕۆ دووکان دادەخەم. دەروێش هەسـتا و کابرا دووکانی داخسـت و لەگەڵ کوڕەکەی کەوتنە ڕێ. دەروێش و تاقمێک لە خەڵکەکەی ناو بازاڕ وە دوایان کەوتن. هەتا گەیشـتنەوە ماڵێ. قەمەروززەمان پێکەنی. بازرگانەکە بە دەروێشی گوت: «دەروێش چیت دەوێ و بۆ دەگری و وە دوامان کەوتووی؟» دەروێش وڵامی داوە: «گەورەم، دەمهەوێ ئەوشـەو میوانی تۆ بم.» بازرگان گوتی: «وەرە ژووری دەروێش.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بازرگانە بە دەروێشی گوت: «وەرە ژووری.» دوای ئەوە بازرگان لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەگەر ئەو دەروێشە ئاشقی کوڕەکەم بووبێ و بیهەوێ کارێک بکا، دەیکوژم و لاشەکەشی دەشارمەوە. ئەگەریش مەبەستێکی خراپی نەبێ، ئەوە میوانە و قسەمەتی لێرە کەوتووە. ئەوجار بردییە ژووری و هەردووکیانی بەڕێکردە دیوێک. بە دزی بە کوڕکەی گوت: «لە پەنا ئەو دەروێشە دانیشە و دوای ئەوە من چوومە دەرێ گاڵتەی لەگەڵ بکە و لێی بچووە پێشێ و خۆی تێهەڵسوو. ئەمن ئەوە لە کەلێنێکەوە چاوتان لێ دەکەم. ئەگەر زانیمان، مەبەستێکی خراپی هەیە و دەست و شتت بۆ دێنێ و داوای کاری نەشیاوت لێ دەکا، دێم دەیکوژم.»

کاتێک قەمەروززەمان لەگەڵ ئەو دەروێشە پێکەوە لە دیوێکدا مانەوە، چوو لە پەنا دەروێشە دانیشت و ڕانی بە ڕانییەوە دا. دەروێشە چاوی لێ دەکرد و فرمێسکی دەهاتە خوار. کاتێک کوڕە قسەی لەگەڵ دەکرد، گیانی دەلەرزی. بەردەوام دەگریا و دەکڕووزاوە. وابوو خواردنیان هێنا. دەروێش دمی لە هیچ نەدا. هەر چاوی لە کوڕە دەکرد و فرمێسکی دەهاتنە خوارێ. هەتا شەو درەنگ بوو. کاتی خەوتن هات. بازرگانەکە بە کوڕەکەی گوت: «ڕۆڵە گیان ئەتۆ لە خزمەت مامە دەروێشدا بەو بێ قسەیی نەکەی.» بازرگانەکە ویستی بچێتە دەرێ. دەروێشەکە گوتی: «گەورەم، ئەمن کارم بەو کوڕەت نییە و لەگەڵ خۆت بیبە. دەنا تۆش لێرە بخەوە.» بازرگانەکە گوتی: «دەبێ ئەو کوڕەم لە لای تۆ بخەوێ، هاتوو کارێکت بوو. دەبێ لە خزمەتتدا بێ.

ئیدی بازرگانەکە ئەوانی بەجێ هێشت و ڕۆیشتە دەرێ، چوو لە پەنایەکەوە خۆی مات دا کە ئەوانی لێ دیار بوو. [با بازرگان لەوێ لە بۆسەدا بێ.]

کوڕی بازرگانەکە لە دەروێش چووە پێشێ و هێندێکی دەستبازی لەگەڵ کرد و خۆی تێ هەڵسوو. هێندێک قسەی لێرەولەوێ دا. دەروێش تووڕە بوو، پێی گوت: «ڕۆڵە ئەو قسانە چییە؟ ئەو قسە نەشیاوانە مەکە خودا قارمان لێ دەگرێ. بڕۆ ئەولاوە دوور کەوە بزانم. کوڕە بە گوێی نەکرد و ناچار دەروێش هەستا لە کوڕە دوور کەوتەوە. کوڕە هەستا چووە پەنای دانیشت و پێی گوت: «دەروێش بۆ ئەو خۆشییە لە دەست خۆت دەدەی؟» دەروێش ئەوەندەی دیش تووڕە بوو گوتی: «ئەگەر دوور نەکەوییەوە بانگی باوکت دەکەم و پێی دەڵێم. دوای ئەوە ئەو دوو بەیتە شێعرەی گوت:

ڕێــڕەوی ڕێــی پــیــرۆزی مســـــتەفـام
جـــــــــێی شـــانـازییە من لەو ڕێیە دام

تـــا ســــەرم شــــــیــــاوی بەردەبـــازی بـــێ
دەبـــێ بە دوور لە هەوەســـــبـــازی بـــێ

کە شـــێعرەکەی تەواو بوو دەســـــتی کرد بە گریان و بە کوڕەی گوت: «هەســـتە ئەو دەرگایەم بۆ بکەوە با وەدوای دەردی خۆم کەوم ئێرە بۆ نوســـتن نابێ.» کوڕە کە جوابی نەداوە، دەروێش هەســـتا و دەســـتی کرد بە نوێژ کردن. قەمەروززەمان کە زانی نوێژ دەکا لە کوڵی بووەوە. دوو ڕەکاتی نوێژ کرد و ســـڵاوی داوە. هەر قەمەروززەمان ویســـتی لێی نیزیک بێتەوە، خێرا نوێژێکی دیکەی دابەست. دوو ڕەکاتی دیکەی کرد. هەر سڵاوی داوە و هەستی کرد، قەمەروززەمان لێی دێتە پێشێ دیسان نوێژەکەی دابەستەوە. هەر بەو جۆرە هەتا پێنج شەشە جار لە ترسی قەمەروززەمان خێرا نوێژی دادەبەستەوە. کوڕە لێی پرسی: «ئەرێ ئەو هەموو نوێژەت بۆ چییە خۆ بە تەما نیت بچی بۆ ئاســـــمان، ژیانت لە من تاڵ کردووە.؟»

بـاوکی قەمەروززەمـان ئـاگـای لە تەواوی ئەو کـار و بەزمـانە هەیە، تـا ئـاخری بۆی دەرکەوت کە دەروێش تەمـای کـاری خراپی نییە. لە دڵی خۆیـدا گوتی: «ئەگەر دەروێش تەمای کاری خراپی با ئەوەندە بە ســـــەر خۆیدا زاڵ نەدەبوو، نەیدەتوانی ئەوەندە خۆی بخواتەوە. دەروێش لە نوێژ بەردەوانم بوو، هەتا کوڕە دەستی لە ملی کرد و داوای لێ کرد تەواوی بکـا. دەروێش لە ڕادەبەدەر توورە بوو لە کوڕەی دا و قســــەی پێ گوت. کوڕە دەستی کرد بە گریان. باوکی لەڕێوە گەیشتێ و فرمێسکەکانی بۆ سڕی و دڵخۆشی داوە. بە دەروێشـی گوت: «ئەتۆ کە ئەوەندە پاکی ئەی ئەو شـین و گریانەت لە چییە؟» دەروێش ئاخێکی هەڵکێشـــا و گوتی: «لێم گەڕێ برینم مەکلوێنەوە، » بازرگانەکە گوتی: «وەڵا هەر دەبێ پێم بڵێی بۆ دەگری.» دەروێش وڵامی داوە: «ئەمن گەڕۆکم و بە شـــاراندا دەگەڕێم. بە ڕێکەوت نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی ڕێم کەوتە بەسەرە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و شەست و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دەرویش گوتی: «نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی چوومە بەسرەوە. سەیرم کرد دووکانەکان هەموو کراونەوە و کەلوپەل هەروا بەڕەڵا کراوە. کەچی نەپیاو و نەژن تەنانەت منداڵێکم نەدی. لە کۆڵان و بازاڕدا تەنانەت سەگ و پشیلەیەکیشم وەبەر چاو نەکەوت. ئەمن ئەو دۆخەم زۆر پێ سەیر بوو. گوتم خۆزگە دەمزانی خەڵکی ئەو شارە چوون بۆ کوێ و سەگ و ئاژەل و شت چیان لێ هاتووە. مەمنا من زۆرم برسی بوو. لە نانەواخانەیەک نانم هەڵگرت و چووم لە دووکانێک بە هەنگوین و ڕۆن خواردم. شتی خواردنەوە چیم پێ خۆش بوو، خواردمەوە. پاشان چووم لە قاوەخانەیەک قاوەی تازە لە سەر ئاور بوو. قاوەیەکیشم تێ کرد و خواردمەوە. کەسی لێ نەبوو. لە بەر خۆمەوە گوتم: «دەبێ خەڵکی ئەو شارە لە پڕدا هەموو مردبن یان دەبێ لە شتێک ترسا بن و هەموویان ڕایان کردبێ؟!»

لەو جەنگەیەدا من هەر بە حەبەساوی لە وڵاتم دەڕوانی و بیرم لە هۆکاری دەکردەوە، لە پڕ گوێم لە دەنگی دەهۆڵ بوو. لەو دەنگە ترسام و هەڵاتم لە پەنایەکدا خۆم شاردەوە. لە درز و کەلێنەکانەوە سەیری وڵاتم دەکرد. چاوم لێ کرد. هەشتا کەنیزی جوان و شۆخ و شەنگ بە بێ چارشێو و ڕووبەند دوودوو دەڕۆیشتن. کچێکی منداڵکارەی ڕووپاکی دەلالیشم دیت بە سەری ڕووت، بێ پەچە و ڕووبەند سواری ئەسپێک ببوو. جلوبەرگی شکۆدار لە بەردا و ملوانکە و تۆقی گرانبایی لە دەوری مل و سەر سنگی خۆی دەنواند و وەک خۆر دەدرەوشانەوە. کەنیزگەلێک لەم شانەوشانییەوە دەڕۆیشتن. کەنیزێکیش لە پێشی بە شیری ڕووتەوە کە دەسکەکەی لە زمرووت و دمەکەی لە زێڕی سوور و شوێنەکانی دیکەی لە گەوهەری جۆراجۆر چێ کرابوو دەڕۆیشت. کاتێک کچە گەیشتە ڕاستی ئەو دووکانەی منی تێدابوو، هەوساری ئەسپەکەی کێشا و گوتی: «کچەکان گوێم لە دەنگێک بوو لەو دووکانەدا. دا بیگەڕێن نەکا یەکێک لەوێدا خۆی مات دابێ و سەیرمان بکا. کچەکان خۆیان بە دووکانەکەی پەنا ئەو قاوەخانەیەدا کرد کە من خۆم تێدا شاردبووەوە. ئەمن لە ترسان حەجمینم نەبوو کە لە پڕدا دیتم پیاوێکیان هێنا دەرێ و گوتیان: خانم ئەو پیاوەمان لەوێدا دیتەوە. کیژۆڵەکە بەو کەنیزەی کە شیرەکەی بە دەستەوە بوو گوتی: «لە ملی دە.» کەنیزە لێی چووە پێش و ملی پەڕاند. تەرمەکەیان لەوێ بەجێ هێشت و ڕۆیشتن. ئەمن هەرچەند زۆر زۆر ترسام بەڵام گیرۆدەی خۆشەویستی ئەو کیژۆڵەیە بووم. پاش ماوەیەک خەڵک هەموو پەیدا بوونەوە و هەر کەسەی چووە سەر دووکانی خۆی. خەڵکەکە لە دەوری تەرمی کوژراوەکە کۆ بوونەوە و چاویان لێ دەکرد. ئەمن لە قوژبنەکە هاتمە دەرێ. بە جۆرێک کە کەس نەیدیتم. بەڵام کەوتبوومە ژێر

کارتێکەری ئەڤینی ئەو کچە. نەشم توانی بکەومە پێوشوێنی و هەر بە دڵشکاوی لە بەسرە هاتمە دەرێ. کاتێک دیتم ئەو کوڕەی تۆ ئەوەندە وەک ئەو دەچێ، ئەو کیژەم بیر کەوتەوە و ئاگری خۆشەویستی لە دڵمدا بڵێسەی ستاند. هۆکاری گریانەکەم ئەوە بوو. ئێستا ئەو دەرگایەم بۆ بکەنەوە با من وەدوای دەردی خۆم بکەوم. بازرگانە دەرگای بۆ کردەوە و دەرویش سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت. [دەرویش با بڕوا.]

بەڵام قەمەروززەمان کاتێک قسەی دەروێشەی بیست دڵی بۆ کچە وە قرتوفرت کەوت. فکر و خەیاڵ حەجمینیان لێ هەڵگرت و هەتا بەیانی خەوی لێ نەکەوت. کە ڕۆژ بووەوە بە باوکی گوت: «بابە هەموو کوڕە بازرگانەکان دەچن بۆ ئەو شـــارە و شـــار و خەریکی بازرگانین. هەمووشـــیان هەر بابیان کاڵا و شـــتومەکی بازرگانیان بۆ دەکڕێ. دەچن و خێرێکی زۆر دەکەن. بۆ ئەتۆش شتم بۆ ناکڕی تا منیش سەفەر بکەم و شانس و بەختی خۆم تاقی بکەمەوە؟» عەبدوڕڕەحمانی بازرگان گوتی: «کوڕم، ئەو بازرگانانە ماڵ و ســـامانیان کەمە بۆیە کوڕەکانیان دەنێرن بۆ ئەملاوئەولا، شـــوکری خودا ئێمە ماڵ و سامانمان زۆرە و پێویستیمان بەوە نییە. ئەمن چۆن دەڵم دێ تۆ بنێرم بۆ هەندەران. ئەتۆ ئێســـتێک لێم دوور کەوییەوە شـــێتیش دەبم. ئەویش ئەتۆ بەو هەموو جوانی و قۆزییە بێ هاوتاییەتەوە، قەت دڵم ناحەسێتەوە لێم دوور کەوییەوە.» کوڕە گوتی: «بابە بە خودا هەر دەبێ ماڵ و ســـامانم لە ئیختیار نێی دەنا ســـەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم. ئەگەر تۆ منت خۆش دەوێ و دەتهەوێ دڵخۆش بم، ئەوە بەڕێم بکە بۆ ســـەفەر و با بچم بە شـــاراندا بۆخۆم بگەڕێم.» کاتێک باوکی قەمەروززەمان زانی حەزی لە سەفەرە و هەر دەڕوا، چوو بابەتەکەی لەگەڵ خێزانی باس کرد. خێزانی گوتی: «پیاوەکە تۆ لەوە مەترســـە، هیچ نابێ، ئەویش وەک ئەو کوڕە بازرگانانەی دیکە با چاو و گوێی بکرێتەوە و فێری دانوســـان بێ. بازرگانان هەموو شـــانازی بە ســـەفەر و دانوســـانەوە دەکەن.» پیاوەکە گوتی: «ئەخر بازرگانەکانی دی دەســـتیان ناڕوا بۆیە. ئەمن خۆ شـــوکری خودا زۆرم هەیە.» ژنە وڵامی داوە: «خۆ بەردی زیادی سەری کەسی نەشکاندووە با زیاترت بێ چییە؟ ئەگەر تۆ کاڵا و شـــتومەکی بازرگانی بۆ ناکڕی من مەجبوورم لە ماڵی خۆم بۆی بکڕم. بازرگانەکە وڵامی داوە: «من خەمی ئەوەمە بەرگەی چەرمەسەرییەکانی سەفەر نەگرێ.» ژنە گوتی: «ئەمن خەمی نامۆیی و سەختییەکانی سەفەرم نییە، تازە پیاوێکە دەبێ لە کڵ بێتە دەر. ئەمن لەوە دەترسم بێ پرسی ئێمە سەری خۆی هەڵگرێ و زیز بێ بڕوا. ئەودەم کوڕەکەشمان دەچێ و لە نێو خەڵکیشدا ئابڕوومان دەچێ.»

بازرگانە چووە سەر قسەی ژنە و بایی نەوەدهەزار دیناری کاڵا و شمەکی بازرگانی بۆ پێچاوە، دایکیشـــی هەمبانەیەکی دایە کە چل نەقیمی گرانبایی تێدا بوو، داییێ و پێی گوت: «کوڕەم ئەو نەقیمان جوان ڕاگرە کە زۆرت بە کار دێت و قازانجی بۆ تۆ زۆر زۆر دەبێ.

قەمەروززەمان تەواوی ئەوانەی هەڵگرت و بەرەو بەسـرە کەوتە ڕێ. ئەوەندە ڕۆیشـت تا ئەو جێیەی ڕۆژێکی تەواوی نەمابوو بگاتە بەسرە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! قەمەروززەمان گەیشتبووە نیزیک بەسرە کە دزانی عەرەب هەڵیان کوتایە سەری و پیاوەکانیان کوشت و ماڵەکەیان بە تاڵان برد. قەمەروززەمان لە نێو خوێندا تلاوە و وەک کوژراوەکان خۆی مراند. دزەکان چاویان پێدا گێڕان وایان زانی کە هەموویان مردوون. ئیدی هەر لەوێ بە جێیان هێشتن. ماڵەکەیان برد و ڕۆیشتن. کە دڵنیا بوو تەواو دوور کەوتوونەوە، لە نێو کوژراوەکاندا قیت بووەوە. سەیری کرد هیچیان بۆ نەهێشتووەتەوە. جگە لەو هەمبانە نەقمەیەی دایکی دابوویێ. هەستاوە و بەرەو بەسر کەوتە ڕێ.

ڕێکەوت وا بوو، ئەو کە گەیشتە بەسرە ڕۆژی هەینی بوو، ناو شار وەک دەروێش باسی بۆ کردبوو، کەسی تێدا نەبوو. سەیری کرد نە پیاو و نە ژن و نە منداڵ لەو بازاڕەدا نەبوو. دووکان و بازاڕ هەموو کرابوونەوە. زۆر گەڕا هیچی نەدی. هەتا لە پڕدا گوێی لە دەنگی دەهۆڵ بوو. لە دووکانێکدا مات بوو، هەتا کەنیزەکان گەیشتنێ. قەمەروززەمان چاوی پێدا گێڕان هەتا کچۆڵە سوارەکە گەیشتێ. تیری خۆشەویستی وای کار لە دڵی کرد نەیتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. دوای ماوەیەک خەڵک هاتنەوە سەر دووکان و بازاڕی خۆیان. قەمەروززەمان لە پەناکە هاتە دەرێ و چوو بۆ لای گەوهەرفرۆشێک، یەکێک لە چل نقیمەکانی کە بایی هەزار دینار بوو، دەر هێنا و بە گەوهەرفرۆشی فرۆشت. چووەوە مزڵەکەی خۆی و هەتا بەیانی نەهاتە دەرێ.

کە ڕۆژ بووەوە هەستا چوو بۆ گەرما و جلوبەرگی گرانبایی لە بەر کرد. وەک مانگی چاردەی لێ هات. چوار دانە لە ئەنگوستیلەکانی بە چوارهەزار دینار فرۆشت و ئینجا چوو لە بازاڕ گەڕا هەتا تووشی دەللاکێک بوو. لە لای دەللاک سەری تاشی. لە هەموو لایەکەوە قسەیان لەگەڵ دەکرد. دوای ئەوە بە دەللاکەکەی گوت: «مامە من لەو شارەدا نامۆ و لاوەکیم. دوێنێ هاتوومە ئەو شارەوە و سەیرم کرد، کەسی تێدانییە. دوای ئەوە چاوم بە کۆمەڵە کیژێک کەوت کە کیژۆڵەیەکی مانگ ئاسای ئەسپ سواریان لەگەڵ بوو.» دوای ئەوە کابرا گوتی: «ڕۆڵە خۆ ئەوەت جگە لە من لە لای کەس باس نەکردووە؟» قەمەروززەمان وڵامی داوە: «نا وەڵڵا.» کابرای دەللاک گوتی: «نەچی ئەو قسەیە لە لای کەس باس بکەی، خەڵک هەموو جێی باوەڕ نین و زۆرکەس قسەی تێدا ڕانەوەستێ، ئەتۆش کوڕێکی منداڵکاری. دەترسم ئەو قسەیە زارە و زار بڕوا و ببیستنەوە و بکوژرێی. ڕۆڵە ئەوەی تۆ دیوتە جگە لە تۆ کەسی دیکە نەیدیوە. هەموو ڕۆژێکی هەینی جەنگەی نیوەڕۆ خەڵک سەگ و پشیلەش بەند دەکەن و تەواوی خەڵکی شار، دەچنەوە ماڵەکانیان و

دەرگا لە سەر خۆیان دادەخەن. کەس ناوێرێ خۆ لە ناو بازاڕ بدا. کەس ناتوانێ لە دەلاقە و شتەوە چاو لە دەرێ بکا. کەسیش هۆکاری ئەو ڕۆژڕەشییە نازانێ. بەڵام ڕۆڵە گیان ئەوشەو من هۆکار ئەو شتە لە خێزانم دەپرسم. چونکە هاتوچۆی ماڵی گەورەگەورەکان دەکا، ئەو جۆرە خەبەرانە لە من باشتر دەزانێ. ئەتۆ سبەینێ وەرە ئێرە پێت دەڵێم.

قەمەروززەمان مستیکی زێڕ دەر هێنا و دای بە کابرا و گوتی: «ئەوانە بدە بە خێزانت، ئەو لە جێگای دایکمە» مستێکی دیکەشی دایە و گوتی: «ئەوەش بۆ خۆت هەڵگرە.» دەللاک گوتی: «کوڕم تۆ لێرە دانیشە هەتا لای خێزانم دەچم و لێی دەپرسم و وڵامەکەیت بۆ دێنمەوە.» ئیدی دەللاک ئەوی لە دووکان بەجێ هێشت و بۆخۆی چووەوە بۆ لای خێزانی و بەسەرهاتی کوڕەی بۆ گێڕاوە. پێی گوت: «ئەتۆ پێم بڵێ ئەو کچە کێیە و ڕۆژانی هەینی بۆ ئەو خەڵکە بازاڕ چۆڵ دەکەن و خەڵک بۆی نییە بچێتە دەرێ. تا من بچم بۆ ئەو کوڕە بازرگانەی بگێڕمەوە. پێم وایە ئەڤینداریشە، گەنجێکی تا بڵێی دەستودڵبازە. ئەگەر بێتوو هاوکاری بکەین ڕەنگە قازانجێکی زۆرمان پێ بگەیەنێ.» ژنە گوتی: «بڕۆ ئەو گەنجە بێنە بۆ لای من.» دەللاک گەڕاوە بۆ لای کوڕە. سەیری کرد، قەمەروززەمان لەوێ دانیشتووە و چاوەڕییەتی. پێی گوت: «ڕۆڵە گیان هەستە وەرە بۆ لای دایکی خۆت. سڵاوی لێ دەکردی و دەیگوت بێتە لای خۆم ئاواتەکەی وەدی دێنم.»

لەگەڵ دەللاک هەستا چوو بۆ لای ژنی دەللاکەکە و سڵاوی لێ کرد. فەرمووی کرد دانیشێ. قەمەروززەمان سەد دیناری زێڕی دەر هێنا و داییێ. لێشی پرسی: «دایە پێم بڵێ ئەو کچە کێیە؟» ژنی دەللاکەکە گوتی: «ڕۆڵە، پادشای هێند گەوهەرێکی گرانبایی هێنابوو، بۆ پادشای بەسرە، پادشا دەیویست ئەو گەوهەرەی بۆ بسمن[1]. تەواوی گەوهەرفرۆشانی کۆ کردەوە و پێی گوتن: «دەمهەوێ یەکتان ئەو گەوهەرەم بۆ بسمن. هەرکەس بتوانێ ئەو کارە بکا، ئەمن داواکانی وەدەی دێنم. هەرکەسیش بیشکێنێ، دەیکوژم. گەوهەرفرۆشەکان ترسان و گوتیان: «پادشا کەمکەس هەیە بتوانێ گەوهەر بسوێ و نەشی شکێنێ. تکایە داوای کارێکمان لێ مەکە کە نەتوانین بەجێی بێنین. سەرۆکی ئێمەش لە ئێمە شارەزاترە.» پادشا گوتی: «سەرۆکی ئێوە کێیە؟» ئەوان گوتیان سەرۆکی ئێمە مامۆستا عوبەیدە. پادشا ناردی لە دوای و ڕایسپارد گەوهەرەکە بسمێ. پێشی گوت: «هەرچیت بوێ دەتدەمێ. ئەگەر بێتوو گەوهەرەکەش بشکێنی ئەوە دەتکوژم. سەرۆکی گەوهەرفرۆشان گەوهەرەکەی لێ وەرگرت و چۆنی دەویست بۆی ئاوا لێ کرد. پادشا گوتی: «بڵێ چیت دەوێ؟» سەرۆک گوتی: «پادشا هەتا سبەینێم دەرفەت بدەیە.» دەرفەتەکەش لەبەر ئەوە بووکە ئەو دەیویست لەگەڵ خزانی ڕاوێژ بکا. ژنەکەشی هەر ئەو کچە بوو کە تۆ لە بازاڕ دیوتە. سەرۆکی گەوهەرفرۆشان ئەوی زۆر زۆر خۆش دەوێ. هێندەی خۆش دەوێ بێ ڕاوێژی

[1]. سمین یا سماندن: کون کردن. کە بۆ یاقووت و زمڕوود و شتی وا دەکار دەکرێ.

ئەو قامک لە ئاو ڕۆ ناکا. هەر بۆیە داوای لە پادشا کرد دەرفەتی بدا بچێتەوە لەگەڵی ڕاوێژ بکا. کاتێک سەرۆکی گەوهەرفرۆشان هاتەوە لای ژنەکەی، پێی گوت: «گەوهەرێکم بۆ پادشا سمیوە، ئەویش بەڵێنی داومێ کە ئاواتێکی پێ بڵێم بۆم وەدی بێنێ. ئەمنیش داوام لێ کرد دەرفەتم داتێ تا بێمەوە لەگەڵ تۆ ڕاوێژ بکەم، بڵێم چیمان بۆ بکا.» ژنە وڵامی داوە گوتی: «ئێمە پێویستیمان بە ماڵ نییە. ئەگەر تۆ منت خۆش دەوێ، بە پادشا بڵێ لە ناو شار جاڕ بدا نێوەڕۆیانی هەینی بۆ ماوەی دوو کاتژمێر خەڵک دووکان و شتەکەیان بە کراوەیی بەجێ بهێڵن و بڕونەوە ماڵەکانیان یا بچنە مزگەوتەکان و دەرگا لە سەر خۆیان داخەن. ئەوجار من سوار بم و لەگەڵ کەنیزەکانم بە نێو شاردا بگەڕێم. بەو مەرجەی کەسیش بە دزیشەوە لە دەلاقە و دەربیجەشەوە چاوم لێ نەکا. ئەگەر ببینم کەسێک چاوم لێ دەکا دەیکوژم. سەرۆکی گەوهەرفرۆشان چووەوە بۆ لای پادشا و ئەو داوایەی هێنا گۆڕێ. پادشا داواکەی قەبووڵ کرد و فەرمانی دا لە بەسرە جاڕ بدەن و خەڵک لەو شتە ئاگادار کەنەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: خاوەنشکۆ! پادشا فەرمووی لە ناو شار جاڕ بدەن. خەڵکی شار گوتیان کە ئێمە لەبەر سـەگ و پشـیلە نیگەرانی شـتەکانمانین. پادشـا فەرمانی دا ئەو ڕۆژە سـەگ و پشـیلەکانتان دا کەن. لەو ڕۆژە ئەو کچە هەموو ڕۆژێکی هەینی دوو کاتژمێر پێش نوێژ لەگەڵ کەنیزەکانی بە ناو کۆڵان و بازاڕدا دەگەڕێ و کەسـیس ناوێرێ بێتە ناو بازاڕەوە یان لە شـوێنێکەوە چاوی لێ بکا. کوڕم ئەوەیە هۆکارەکەی جا ئەتۆ هەر پێت خۆش بوو ئەوە بزانی، یـا دەتهەوێ بەو کیژە بگەی؟» قەمەروززەمـان گوتی: «دایە، دەمهەوێ بەو بگەم.» ژنی دەللاکەکە گوتی: «ڕۆڵە پاشـکەوت چیت لە لایە؟» وڵامی داوە: «لە شـتی کانگایی چوار جۆرم هەیە: هەمە، نرخەکەی پێنجسـە دینارە و هەمە حەوسـەد دینار و جۆرێکی کە هەشـتسـەد دینار و جۆرێکی تریش هەزار دینارە.» ژنی دەللاکەکە پرسـی: «گەلۆ تۆ دەتوانی لە هەر چواریـانم بۆ دانێی؟» قەمەروززەمـان گوتی: «لە هەموویـان دەتوانم.» ژنە گوتی: «جا ڕۆڵە یەکێک لەو نقیمە پێنجسـەد دیناریانە بەرە و بچووە بۆ دووکانی وەستا عوبەید سەرۆکی گەوهەرفرۆشان. لەوێ دەیبینی لە دووکان دانیشتووە و جلوبەرگێکی گرانبایی لە بەر دایە. سڵاو لێ بکە و بچووە ژووری لە دووکانەکەی دانیشە. نقیمەکەی دەرهێنە و پێی بڵێ مامۆسـتا لەو نقیمە ئەنگوسـتیلەیەکم بۆ چێ بکە. بەڵام با لە مسـقاڵێک زیاتر نەبێ و جوان بیڕەنگێنە. ئینجا بیسـت دیناری بدەیە. بە هەر کام لە شاگردەکانیشی یەکی دیناریکیان بدەیە. ماوەیەک لەوێ دانیشە و قسەی لەگەڵ بکە. ئەگەر خوازەڵۆکێک هات دیناریکیش بدە بەو. دلاوایی و دەسـتودڵبازی خۆت دەرخە تا تەواو دڵی بە دەست دێنی. پاشان هەستە بچووەوە ماڵەکەی خۆت، هەتا بەیانی. کە ڕۆژ بووەوە سەد دینار لەگەڵ خۆت بێنە و بیدە بە دەللاکەکە چونکە پیاوێکی هەژارە.» قەمەروززەمان گوتی: «زۆر باشە وا دەکەم.»

قەمەروززەمـان هەسـتا مـاڵاوایی لە ژنی دەللاکەکە کرد و چووەوە مزڵەکەی خۆی. نقیمێک کە بـایی پێنجسـەد دینـار بوو دەسـتی دایە و بردی بۆ بـازاڕی زێڕینگەر و گەوهەرفرۆشـان. بە پرسـیار دووکانی سـەرۆکی گەوهەرفرۆشـانی دیتەوە. قەمەروززەمان چووە دووکانی سەرۆک. سەیری کرد سەرۆک پیاوێکی بە خۆوە بە جلوبەرگی شکۆدارەوە لەوێ دانیشتووە و چوار کەسی لێزان و شارەزا لە بەر دەستیدا کار دەکەن. قەمەروززەمان سڵاوی لە گەوهەرفرۆش کرد. سەرۆک سڵاوەکەی ئەستاندەوە و فەرمووی کرد دانیشێ. دوای ئەوە قەمەروززەمان نقیمەکەی دەرهێنا و گوتی: «مامۆسـتا دەمهەوێ ئەو نقیمەم بۆ بڕەنگێنی و ئەنگوسـتیلەیەکی زێڕم بۆ چێ بکەی، بەڵام ئەنگوسـتیلەکەم لە مسـقاڵێک زیاتر نەبێ.» ئینجا بیست دیناری دەرهێنا بە سەرۆکی گوت: «ئەوە حەقدەستی ئەو نەخشەیە کە

لە نقیمەکەی دەخەی. حەقی چێ کردنەکەشـیت دەدەمێ. بە هەرکام لە وەسـتاکارەکانیش یەکی دیناریکی دانێ. ئەوان قەمەروززەمانیان کەوتە بەر دڵ و خۆشـیان ویسـت. هەر خوازەڵۆکێکیش هات دیناریکی دایە. ئەوان سـەریان لەو هەموو دڵاوایییەی قەمەروززەمان سـووڕ مابوو. کابرای زێڕینگەر ئەو ئامراز و کەرەسـانەی لە دووکان کاری پێ دەکرد. لە ماڵێش هەیبوو، کاتێک دەیویسـت کاریکی زۆر کەسـانە و تایبەت دروسـت بکا، دیبردەوە ماڵێ هەتا کابرای مشـتەری کارەکەی لێی فێر نەبێ. ئەوە کچە جوانەی کە گوترا ژنی ئەو بوو، لە ماڵێ دەهات لە لای دادەنیشـت و چاوی لێ دەکرد. ئەویش خەریکی کار دەبوو، لە کۆتاییدا شتێکی ساز دەکرد بێ هاوتا.

سـەرۆکی گەوهەرفرۆشـان هەستا چووەوە ماڵێ و دەستی کرد بە ڕەنگڕێژی نقیمەکە. ژنەکەی کە زانی خەریکی کارە لێی پرسـی: «ئەوە چی لێ سـاز دەکەی؟» وەسـتا وڵامی داوە: «ئەوە بە تەمام ئەنگوستیلەیەکی لێ ساز بکەم. ئەو نقیمە بایی پێنجسەد دینارە.» ژنە گوتی: «ئەوە ئی کێیە؟» وڵامی داوە: «ئەوە ئی کوڕێکی بازرگانە، ئەو کوڕە ئەوەندە قۆز و ڕێکوپێکە سـەیر، برۆکانی وێک کەوتوونەوە، سـەر و کاکۆڵێکی جوان، دمێکی هەیە دەڵێی نوقڵە، ڕوخسـاری وەک مانگ و ئەسـتێرە دەدرەوشـێتەوە. کوڕێکی نەرم و نیان و لەسـەرخۆیە. جارێک تاریفی جوانی و کەشـخەییەکەی دەکرد و جارێک پەسـنی ڕەوشـت بەرزی و دڵاوایییەکەی دەکرد. تا وای لێهات ژنە بێ ئەوەی بیبینێ ئاشقی بوو. لە مێردەکەی پرسـی: «ئەوەندەی پێدا هەڵدەڵێی هیچ شـتێکی باشـی وەک من دەچێ؟» کابرا گوتی: «تەواوی تایبەتمەندییە باشەکانی تۆ لەویشدا هەیە، زۆر شێوەی تۆ دەدا. بە تەمەنیش هەر وەک تۆ دەبێ. ئەگەر لە ترسی تۆ بموێرابایە دەمگوت هەزار بەرابەر بە سەر تووەی هەیە. ژنەکەی بێدەنگ بوو، بەڵام ئاوری خۆشـەویسـتی کوڕە لە دڵیدا هەڵ بوو. کابرای وەسـتا بەردەوام هەر تاریفی کوڕەی دەکرد و خەریک بوو تا کاری ئەنگوستیلەکە تەواو بوو. دای بە خێزانی چاوی لێ بکا. ئەویش لە قامکی کرد. پڕ بە قامکی بوو. بە مێردەکەی گوت: «پڕ بە قامکمە و زۆریش لە دەسـتم دەکاڵێتەوە، ئەگەر دەکرێ تازە دەری ناهێنمەوە، بۆ من.» مێردەکەی گوتی: «ڕاوەسـتە، بزانم دەڵێ چی، زۆر کوڕی چـاکە داوای لێ دەکەم پێم بفرۆشـێ. ئەگەر پێی فرۆشـتم ئەوە بۆت دەکڕم و بۆت دێنمەوە، ئەگەریش پێی نەفرۆشـتم و نقیمی دیکەی پێ بوو، دەنکێکی دیکەی وەک ئەوە بۆ تۆ دروست دەکەم.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! گەوهەرفرۆش ئەو گفتەی بە ژنەکەی دا.

قەمەروززەمانیش ئەو شەوە چووەوە مزڵەکەی خۆی. بەیانی زوو سەد دیناری هەڵگرت و چوو بۆ لای ژنی دەللاکەکە و پێی گوت: «ها ئەو سەد دینارە بۆ خۆت.» ژنی دەللاکەکە گوتی: «ئەو زێڕانە بدە بە باوکی خۆت. قەمەروززەمان دینارە زێڕەکانی برد دای بە دەللاک. دوای ئەوە ژنە لێی پرسی: «ئەوەی پێم گوتی، کردت؟» قەمەروززەمان گوتی: «بەڵێ.» پیرێژنە گوتی: «جا ئێستا هەستە برۆ لای زێڕینگەرەکە، کە ئەنگوستیلەکەی دایەوە، لە سەری قامکتی بکە و زوو دەری هێنەوە و بڵێ مامۆستا تەنگە، بۆ قامکم نابێ. ئەگەر پێی گوتی: «کە دەیشکێنم و دیسان سازی دەکەمەوە، بڵێ پێویست بەو زەحمەتە ناکا. ئەوەی بدە بە یەکێک لە کەنیزەکانت. ئەوجار ئەو نقیمەی بدەیە کە بایی حەوسەد دینارە. پێی بڵێ کە ئەوەم بۆ ڕەنگرێژی بکەو نەخشی تێخە. ئاگاداریشی بکەوە کە ئەوە زۆر گرانباییترە. سێ دیناری زێڕی بدەیە و بە هەرکام لە وەستاکارەکانیش یەکی دوو دیناریان بدەیە. دوای ئەوە بگەڕێوە ماڵێ و دوو سەد دینار لەگەڵ خۆت بێنە با پێت بڵێم دوایە دەبێ چ بکەی.

قەمەروززەمان هەستا یەکسەر چوو بۆ لای سەرۆکی زێڕینگەران. سەرۆک سڵاوی لێ کرد و فەرمووی کرد دانیشێ. قەمەروززەمان گوتی: «کارەکەی منت تەواو کردووە؟» کابرا ئەنگوستیلەکەی دەرهێنا و داێ. قەمەروززەمان ئەنگوستیلەکەی لە سەری قامکی کرد و خێرا دایکەندە و دایەوە بە گەوهەرفرۆشەکە و گوتی: «ئەوە بۆ قامکم نابێ.» کابرا پرسی: «گەلۆ بیشکێنم و سەرلەنوێ سازی کەمەوە؟» قەمەروززەمان وڵامی داوە: «پێویست ناکا بیشکێنییەوە. ئەوە شتێک نییە بایی پێنجسەد دینارە بیدە بە یەکێک لە کەنیزەکانت. ئەوەندە ناهێنێ بیشکێنییەوە.» دوای ئەوە، دەستی برد نقیمێکی دیکەی دا بە گەوهەرفرۆش و سێ دیناریشی لەگەڵ دایە. بە هەرکام لە وەستا کارەکانیش یەکی دوو دیناری دانێ. پاشان گوتی: «مامۆستا ئەگەر تەواوت کرد حەقدەستەکەشیت دەدەمێ. ئەوە حەقی ئەو نەخشەیە کە دەیخەیە نقیمەکەوە.» دوای ئەوە قەمەروززەمان هەستا ماڵاوایی کرد و ڕۆیشت.

گەوهەرفرۆش واقی وڕ مابوو لە دلاوایی و دەستودڵبازی قەمەروززەمان. لەڕێوە هەستا چووەوە لای خێزانی و پێی گوت: «فلانی، من تا ئێستا کەسم لەو لاوە بە دڵ و دەروونتر نەدیتووە. شانسێکی گەورەت هەیە، ئەنگوستیلەکەت هەر بە خۆرایی وەگیر کەوت. ئەو گەنجە گوتی: «ئەو ئەنگوستیلەیەی هەر ئاوا بدە بە یەکێک لە کەنیزەکانت.»

دوای ئەوە بە خێزانی گوت: «لە شک دام ئەوە، کوڕە بازرگان بێ، وەک شازادە و شت دەچێ.» ئیدی هەرچەندی گەوهەرفرۆش پەسن و تاریفی ئەو کوڕەی دەکرد. ژنە زیاتر گیرۆدە و ئۆگری کوڕە دەبوو.

دوای ئەوە پەریڕووەکە ئەنگوستیلەکەی لە قامکی کرد و ڕووبەڕووی مێردەکەی دانیشت. گەوهەر فرۆش ئەنگوستیلەیەکی کەمێک لەوەی دیکەی گەورەتر دروست کرد. کە کارەکەی تەواو بوو ژنە ئەویشی لە قامکی کرد و گوتی: «گەورەم، چاو ئەو ئەنگوستیلە لە قامکی مندا چەند جوانە. خۆزگە ئەوەش بۆ من بێ.» گەوهەرفرۆش گوتی: «ڕاوەستە بزانم بۆت ناکرم.» ئەو شەوەش ڕۆژیان کردەوە. بەیانی ئەنگوستیلەکەی هەڵگرت و چوو بۆ دووکان.

قەمەروززەمان بەیانی زوو هەستا چوو بۆ لای خێزانی دەللاک و دووسەد دیناری دایە. پیرێژنە گوتی: «ئێستا هەستە بڕۆ بۆ لای کابرای زێڕینگەر. ئەگەر کابرا ئەنگوستیلەکەی دایەی لە قامکتی کە و خێرا دەری هێنەوە بڵێ، مامۆستا هەراوە ئەوە ئەتۆ چ وەستایەکی؟ ئەوە هەرکەس کارت بۆ بێنێ دەبێ ئەندازەی بگری. ئەگەر هەر لە سەرەتاوە ئەندازەی قامکی منت گرتبا، ئاوات لێ نەدەهات. ئەوجار ئەو نقیمەی دەیە کە بایی هەزار دینارە. بڵێ ها ئەوەم بۆ ساز بکە و ئەوەی دیکەش هەر بۆخۆت، بیدە بە یەکێک لە کەنیزەکانت. دوای ئەوە چل دینار بدە بە سەرۆکی زێڕینگەران و یەکی سێ دیناریش بدە بە وەستا کارەکانی. پێشی بڵێ ئەوە هەر حەقی ئەو نەخشەیە کە تێیدەکەن دەنا حەقدەستەکەتان دوایە دەدەمێ. بزانە دەڵێ چی. دوای ئەوە سێسەد دینار بێنە بیدە باوکی خۆت، پیاوێکی هەژار و نەدارە.

قەمەروززەمان لەڕێوە چوو بۆ لای سەرۆکی گەوهەرفرۆشان و سڵاوی لێ کرد. کابرا وڵامی سڵاوەکەی داوە و فەرمووی کرد دانیشێ و ئەنگوستیلەکەی دایێ. قەمەروززەمان ئەنگوستیلەی لە قامک کرد و خێرا دایکەندەوە و گوتی: « مامۆستا ئەوە هەراوە، ئەوە تۆ چ وەستایەکی؟ هەرکەس کارت بۆ بێنێ دەبێ ئەندازەی بگری. ئەگەر هەر لە سەرەتاوە ئەندازەی قامکی منت گرتبا ئاوات لێ نەدەهات. تازە ئەوەی هەڵگرە بۆخۆت. بیدە بە یەکێک لە کەنیزەکانت و ئەوەم بۆ ساز کە.» ئیدی نقیمە هەزار دینار باییەکەی دایە و گوتی ئەوەی دروست بە ئەندازەی قامکی من ساز کە. کابرا لێی وەرگرت و گوتی: «تۆ ڕاست دەکەی، حەق بە جەنابتە دەبێ ئەندازەی قامکت بگرم.» ئیدی ئەندازەی قامکی گرت. قەمەروززەمان چل دیناری دیکەشی دایە و گوتی: «ئەوە حەقی ئەو نەخشەیە کە لە نقیمەکەی دەکەی دەنا دوایە حەقدەستەکەت دەدەمێ.»

دوای ئەوە قەمەروززەمان هەستا ڕۆیشت. کابرای زێڕینگەر گەڕاوە ماڵێ و بە ژنەکەی گوت: «ئەمن کەسم لەو کوڕە دڵاواتر و بەخەشەندەتر و جوانچاکتر و ڕەزاسووکتر

نەدیوە. ئیدی بەردەوام تاریفی دەکرد و هەڵیدەکێشــا. ژنەکەی گوتی: «ئەخە گێژە دەزانی ئەو ئەوەندە باشــە و تا ئێســتا دوو ئەنگوســتیلەی گرانبایی بە خۆڕایی پێ داوی، بۆ بانگهێشــتێکی ناکەی و خۆی لێ نیزیک ناکەیەوە بەشـکوو قازانجێکی زۆرمان پێ بگەیەنێ. ئەگەر دڵیشت نایە میوانداری بکەی، ئەوە من لە ماڵی خۆم میوانداری دەکەم.» کابرا گوتی: «بۆ منت بەرچاوتەنگ هاتووەتە بەرچاو وا ئاوا دەڵێی؟» خانم گوتی: «ئەتۆ بەرچاوتەنگ نی بەڵام لێی نازانی. ئەوشەو بانگهێشتی بکە. بێ ئەوە نەیەوە. ئەگەر گوتی نایەم زۆری لێ بکە و ســوێندی بدە.» کابرای گەوهەرفرۆش گوتی: «بە چاوان دەیهێنمەوە.» دوای ئەوە ئەنگوســتیلەکەی تەواو کرد و خەوت. کەڕەی بەیانی هەســتا چوو بۆ دووکان و لەوێ دانیشت.

قەمەروززەمانیش سێسەد دیناری زێڕی هەڵگرت و چوو بۆ ماڵی دەللاکەکە و زێڕەکانی دا بە کابرا. ژنە دەللاکەکە گوتی: «شــیمانەی ئەوە دەکرێ ئەوڕۆ گەوهەرفرۆشــەکە بانگهێشــتت بکا. ئەگەر هات و چوویە ماڵیان و شــەو لەوێ مایەوە، بەیانی وەرە پێم بڵێ و چوارسەد دیناریش بۆ دەللاک بێنە. پیاوێکی دەستەنگە.» قەمەروززەمان گوتی: «باشە بە چاوان.» قەمەروززەمان، هەر کاتێک پارەی لێ دەبڕا لە نقیمەکانی دەفرۆشــت. لە ماڵی کابرای دەللاک هاتە دەرێ و چوو بۆ لای گەوهەرفرۆش. گەوهەرفرۆش لە بەری هەستا و ســڵاوی لێ کرد و لە ئامێزی گرت. دوای ئەوە ئەنگوســتیلەکەی دایە. قەمەروززەمان ئەنگوســتیلەکەی لێ وەرگرت و لە قامکی کرد. پاشــان گوتی: «دەست خۆش مامۆســتای مامۆستایان، زۆر تەواوە و پڕ بە قامکە، بەڵام زۆرم بە دڵ نییە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتایی پێ هات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نۆسەد و حەفتایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! قەمەروززەمان گوتی: «وەبەر دڵم نایە، ئەو ئەنگوستیلەیەش بدە بە یەکی دیکە لە کەنیزەکانت.» ئەوجار نقیمێکی دیکەی دەر هێنا و سەد دیناری زێریشی دایە و گوتی: «ها حەقدەستی خۆت بگێڕەوە، بمبەخشە زەحمەتیشم دای. گەوهەرفرۆش گوتی: «جا ئەگەر زەحمەتم کێشاوە، دە ئەوەندەشم حەقدەست وەرگرتووە. خۆشەویستی و گەورەیی تۆ ئەوەندەی کار تێ کردووم، پێم خۆش نییە بڕۆی. دەبێ بە خودا ئەو شەو هەرچۆنێک بێ، ئەو شانازییەم پێ ببەخشی و میوانم بی.» قەمەروززەمان گوتی: «لە خزمەتت دام، بەڵام دەبێ بچمەوە خزمەتکار و شتەکەم ئاگادار کەمەوە تا چاوەڕێی من نەبن.» سەرۆک گوتی: «مزڵەکەت لە کام کاروانسەرایە؟» وڵامی داوە: «لە فلان کاروانسەرام.» سەرۆکی گەوهەرفرۆشان گوتی: «منیش لەگەڵت دێم.» قەمەروززەمان گوتی: «لە خزمەتت دام.» کاتێک ڕۆژ ئاوا بوو. گەوهەرفرۆش چوو بۆ ئەو کاروانسەرایە. چونکە لە ترسی ژنەکەی نەیدەوێرا بێ قەمەروززەمان بچێتەوە ماڵێ. هەر بۆیە چوو لە دووی قەمەروززەمان و لەگەڵ ئەو چوونەوە ماڵێ و لە دیوێکدا کە کێچی دیوی ژنانی لێ بوو خەوتن. ژنی سەرۆکی زێڕینگەران لە کاتی هاتنیاندا چاوی بە قەمەروززەمان کەوت و شەیدای بوو. دوای ئەوە گەوهەرفرۆش و قەمەروززەمان خەریکی قسەکردن بوون تا خواردنیان هێنا و دایان نا. شۆرباویان هەبوو، نانەکەیان خۆارد. پاشان قاوە و شەربەتیان خواردەوە. ئینجا خەریکی قسەکردن بوون هەتا نوێژی خەوتنانیان کرد. کە نوێژیان کرد، کەنیزێک هات و دوو پەرداخی شەراب بۆ هێنان.

کاتێک گەوهەرفرۆش و قەمەروززەمان ئەو دوو پەرداخە شەرابەیان خواردەوە. خەو بەری دڵی گرتن و هەتا بەیانی لێی خەوتن. دوای ئەوە پەریڕوو هاتە دیوەکەیان سەیری کرد خەوتوون. چاوی لە سیمای جوانی قەمەروززەمان کرد. بە جارێک هۆش و گۆشی لێ بڕا و گوتی: سوبحانەڵڵا، ئەگەر ئەویینداری ئەی چۆن ئاوا خەوت لێ کەوتووە، دوای ئەوە قەمەروززەمانی خستە سەر پشت و چووە سەر سینگی، هێندەی خۆش ویست و حەزی چوویێ، دەستی کرد بە ماچ کردنی کوڵمەکانی هەتا وای لێ کرد سووری هەڵگەڕاند. ئەوجار لێوەکانی هەڵمژی تا لە خوێنی هێنا. سەرەڕای ئەوەش کوڵوکۆی دانەدەمرکا و لە سەیرکردنی تێر نەدەبوو. هەر بۆیە هەتا بەیانی دەستەملانی بوو و بە دەوریدا هات. ئەوجار چوار جگی خستە گیرفانییەوە و ڕۆیشت. کەنیزەکەی خۆی نارد لە خەویان هەستێنێ.

کەنیزەکە چوو، قاوی کردن و لە خەوی هەستاندن، پێی گوتن: «هەستن نوێژی بەیانی

بکەن. سۆنە و مەسینەی بۆ هێنان. قەمەروززەمان پرسی: «گەورەم لە مێژە خەوتووین خەریکە نوێژەکەمان بچێ.» گەوهەرفرۆش گوتی: «هاورێم خەوی ئەو دیوە زۆر قورسە، منیش هەتا لێرە دەنووم، ئاوام لێ دێ. دوای ئەوە قەمەروززەمان دەسنوێژی گرت. کە ئاوی بە دەموچاویدا کرد سەیری کرد دەکزێتەوە. پرسی: «گەورەم قورسیی خەوەکە ئی ئەو دیوە بوو، نازانم ئەو ڕوومەت و لێو و شتەم بۆ دەکزێتەوە؟» کابرا گوتی: «ئەوەیان ئی کێک و مێشوولە و شتە، پێیانەوە داوی. قەمەروززەمان گوتی: «ئی تۆش وایە؟» ئەمن وەک تۆ نیم. بەڵام هەر میوانێک بێت و وەک تۆ بێ تووک بێ، بۆ بەیانی بە دەست کێچ و مێشوولەوە دەناڵێنێ. بەڵام ئەو میوانانەی ڕدێنیان هەبێ مەنزووریشیان نابێ. ئەمنیش چونکە ڕدێنم هەیە کاریان پێم نەبووە. دوای ئەوە کەنیز قاوە و شەربەتیان بۆ هێنان. خواردیانەوە و وەدەر کەوتن. قەمەروززەمان گەڕاوە لای پیرێژنەکە.

پیرێژنە کە ئەوی دیت، پرسی: «بە سیماتدا وا دیارە باشت بۆ گوزەراوە. بۆم بگێڕەوە چیت کردووە. قەمەروززەمان وڵامی داوە: «هیچم نەدیتووە، هەر لەگەڵ خاوەنماڵ چوومەوە شاممان خوارد. خەوتین. بەیانیش هەستاین.» پیرێژنە پێکەنی و گوتی: «ئەوە بۆ، سەر کوڵمەکانت و لێوت شین بوونەتەوە؟» قەمەروززەمان وڵامی داوە: «کێچ و مێشوولە پێیانەوە داوم.» پیرێژنە گوتی: «خاوەنماڵەکەش وای لێ هاتبوو؟» وڵامی داوە: «نەوەڵا، خاوەنماڵ دەیگوت: «کێچ و مێشوولەی ئەو ماڵە، بە بێتووکانەوە نەبێ بە کەسەوە نادا. پیرێژنە گوتی: «دەی چی دیکەت دی؟» قەمەروززەمان وڵامی داوە: «هیچی دی، بەیانی کە هەستام. چوار جگێش لە گیرفانمدا بوو.»

پیرێژنە پێکەنی و گوتی: «ئەوە خۆشەویستەکەت لە گیرفانی خستووی. مەبەستی ئەوە بووە کە ئەگەر ئاشق بای نەدەخەوتی. هێشتا تۆ منداڵی و پێویستیت بە یاری کردنە، چکارت بە دڵداری داوە. هەر ئەویش سەر کوڵم و لێوەکانتی مژیوە و ئاوای لێ کردووی، بەڵام دڵنیا بە هەر بەوەندە لە کۆڵت نابێتەوە. ئەو شەویش مێردەکەی دەنێرێ لە شوێنت و بانگهێشتت دەکا. بەڵام ئەمشەو زوو مەخەوە. بەیانیش پێنجسەد دینار بێنە و وەرە بۆم بگێڕەوە چیت کردووە. با پێت بڵێم چی بکەی. قەمەروززەمان گوتی: «بە سەر چاو.» دوای ئەوە هەستا و ڕۆیشتەوە بۆ مزڵەکەی خۆی.

ژنی سەرۆکی زێرینگەران بە مێردەکەی گوت: «میوانەکە ڕۆیشت؟» ئەویش وڵامی داوە: «بەڵێ ڕۆیشت بەڵام ئەمشەو کێچ و مێشوولە دەردێکیان دابووێ تەواوی سەروچاویان بریندار کردبوو. ئەمن بۆخۆم تریق بوومەوە.» ژنە گوتی: «ئەو مێشوولانەی ماڵی ئێمە ئەوە کاریانە. ئەوشەویش بیهێنەوە. ئێوارە دیسان چووەوە مزڵەکەی قەمەروززەمان و بانگهێشتی کردەوە بۆ شام. قەمەروززەمان دیسان دڵی نەشکاند و بە قسەی کرد. لەگەڵی ڕۆیشتەوە. شێویان خوارد و نوێژی خەوتنانیان کرد. ئەوجار کەنیزە

هات و دوو پەرداخی شەراب بۆ هێنان.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە پەرداخە شەرابەکانی دانێ، خواردیانەوە و لە ڕێوە خەوتن. ئینجا ژنی گەوهەرفرۆش هاتە لایان و لە دڵی خۆیدا بە قەمەروززەمانی گوت: «ئەخە کوڕێژگە جوانەکە، چۆن دەڵێی ئەویندارم و ئاواش دەخەوی؟» دوای ئەوە خۆی بە سەردا کێشا و هەتا بەیانی تێری ماچ کرد و هەڵیمژی. ئەوجار خەنجەرێکی لە گیرفانی خست و چووەوە جێگەکەی خۆی و کەنیزەکەی نارد خەبەریان کاتەوە. کەنیزە وەخەبەری هێنان. ڕوومەت و لێوەکانی قەمەروززەمان وەک دندووکی کەویان لێ هاتبوو. گەوهەرفرۆش گوتی: «وادیار دوێشەو دیسان مێشوولەکان پێیانەوە داوی؟» قەمەروززەمان چونکە دەیزانی چ باسە زاڵەی نەهات و گوتی: «دوێشەو ئازاریان نەدام. لەو جەنگەیەدا دەستی لە گیرفانی ڕا کرد، سەیری کرد خەنجەرێکی لە گیرفانی دایە. کە شەربەت و قاوەیان خواردەوە، قەمەروززەمان لە ماڵی گەوهەرفرۆش هاتە دەرێ و یەکڕاست چووەوە مزڵەکەی خۆی پێنجسەد دیناری هێنا و چووەوە ماڵی دەللاک. ئەوەی دیبووی بۆ پیرێژنەی گێڕاوە و گوتی: «دوێشەو بۆخۆشم نازانم چۆن هەتا بەیانی خەوم لێ کەوت و بەیانی کە هەستا خەنجەرێک لە گیرفانمدا بوو. خودا ڕەحمت پێ بکا، بۆ شەوی دادێ هیچت بە سەر نەهێنێ. ئەوە بە ئاماژە پێی گوتووی ئەگەر ئەوجار بخەوی دەتکوژم. وادیارە ئەوشەویش لە ماڵی ئەوان میوان دەبی. ئەگەر بێتوو بخەوی لێەم ڕوونە دەتکوژێ. قەمەروززەمان پرسی: «ئەی دەبێ چ بکەم؟» پیرێژنە گوتی: «باشە تۆ کە لەگەڵ زێڕینگەرەکە چوونە ماڵی ئەوان چ دەکەن وا خەوتان لێ دەکەوێ؟» کوڕە گوتی: «هەر وەک خەڵکی دی، لە پێشدا شێو دەکەین و پاشان نوێژی خەوتنان دەکەین و ئینجا کەنیزێک یەکەی پەرداخێکمان شەراب بۆ دێنێ. کە شەرابەکەم خواردەوە ئیدی هەتا بەیانی وەخەبەر نایەم.» پیرێژنە گوتی: «هەرچی هەیە، ئی ئەو پەرداخە شەرابەیە. ئەوشەو کە شەرابەکەیان بۆ هێنان، ئەتۆ دەست ڕاگرە مەیخۆوە هەتا گەوهەرفرۆش دەیخواتەوە و بە لادا دەکەوێ و دەخەوێ، دوایە بڵێ زەحمەت نەبێ پەرداخێکیشم ئاو بۆ بێنە. هەتا کەنیزە دەچێ بۆ ئاوەکە ئەتۆ پەرداخە شەرابەکە لە قولینچێک برێژە و خۆت لە خەو کە. هەتا ئەو گۆزەڵە ئاوەکەت بۆ دێنێ و دێتەوە، دەبینێ تۆ خەوتووی وا دەزانێ ئەوە پەرداخە شەرابەکەت خواردووەتەوە و خەوت لێ کەوتووە. ئیدی ئەو دەچێ بە لای کاری خۆیەوە. ئەو دەم هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە. بەڵام نەکا بێ قسەییم بکەی.» قەمەروززەمان گوتی: «بە سەر چاو.» دوای ئەوە هەستا چووەوە بۆ مزڵەکەی خۆی.

ژنی زێڕینگەرەکە بە مێردەکەی گوت: «دەبێ میوان هەتا سێ شەوان میوانداری لێ بکەی. ئەتۆش ئەوشەویش بانگی بکەوە. ئیدی کابرای زێڕینگەر هەستا چوو لە دوای

قەمەروززەمان و لەگەڵ خۆی هێنایەوە. کە شێویان کرد و نوێژی خەوتنانیان کرد، کەنیزە هات و یەکی پەرداخێکی شەراب دانێ. خاوەنماڵ پەرداخە شەرابی هەڵدا و خەوی لێ کەوت. قەمەروززەمان نەیخواردەوە و داوای ئاوی کرد. کاتێک کچە چوو بۆ ئاو. قەمەروززەمان پەرداخە شەرابی لە سووچێک قلپ کردەوە و خۆی لە خەو کرد. کاتێک کەنیزە گەڕاوە، دیتی خەوی لێ کەوتووە، چوو بۆ خانمەکەی گێڕاوە. خانم لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوە وا باشە هەر بمرێ.» ئینجا دەستی دا خەنجەرێکی تیژ و هاتە دیوەکەیان و لە دڵی خۆیدا گوتی: «گەمژە تۆ لە ئاماژەکەی من تێ نەگەیشتی. هەر بۆ کوشتن باشی.»

قەمەروززەمان ئاگای لێ بوو کە خانم ئەوە وەک مانگی چاردە، خەنجەرێکی پێیە و دێ بۆ لای ئەوان. ئیدی بە بزەوە چاوی هەڵێنا و هەستا. پەریرۆخسار گوتی: «ئەتۆ بە زێرەکی خۆت لە ئاماژەکەی من تێنەگەیشتووی. چ جادووبازێک تێی گەیاندووی؟ پێم بڵێ چۆناچۆنت زانی؟» قەمەروززەمان گوتی: «پیرێژنێک ڕێنوێنی کردم.» ئیدی تەواوی شتەکانی بۆ گێڕاوە. ژنە گوتی: «ئەگەر سبەینێ لێرە ڕۆیشتی دەرێ بچووە بۆ لای و لێی پرسە بڵێ ئەتۆ ڕێوشوێنی دیکە دەزانی، ئەگەر گوتی، ئا. ئەوە پێی بڵێ ئەمن پێم خۆشە ڕێگایەکم بۆ بکێشی بە ئاشکرا بچمە لای ژنی گەوهەرفرۆشەکە. ئەویش دەڵێ کە من ناتوانم کاری وا بکەم. ئەتۆ بڕۆ و بەجێی بێڵە. بۆ شەو دیسان مێردەکەم دێتەوە لە دوات، لەگەڵی وەرەوە ئێرە، بۆخۆم فکرێکت بۆ دەکەمەوە.»

قەمەروززەمان وڵامی داوە گوتی: «باشە وا دەکەم.» دوای ئەوە هەتا بەیانی هەر خەریکی ماچ و موچ و کەیف و خۆشی خۆیان بوون. بەیانی ژنە بە قەمەروززەمانی گوت: «ئەمن بە ڕۆژێک و شەو و مانگ و ساڵێک لە تۆ تێر نابم. پێم خۆشە تازە لەمەودوا لەگەڵ تۆدا بژیم. بەڵام ڕاوەستە با کارێک لەگەڵ ئەو مێردەی خۆم بکەم. وای لێ بێ تووشی دوودڵی و گومانی بکەم. تا وای لێ بێ ئەوەندە لێم دڕدۆنگ بێ تەڵاقم بدا. ئینجا لەگەڵ تۆدا بێم بۆ شارەکەی تۆ و هەموو ماڵ و سامانەکەی ئەویش بێنم بۆ تۆ. بەڵام تۆ بە قسەم بکە و چۆنت پێ دەڵێم ئاوا بکە.» قەمەروززەمان گوتی: «بێ قسەبیت ناکەم.» کچە گوتی: «ئەتۆ بچووەوە مزڵەکەی خۆت. ئەگەر مێردەکەم بانگهێشتی کردی. ئەتۆ بڵێ کاکە گیان مرۆڤ قورساییەکی هەیە، ئەگەر بێتوو زۆر هاموشۆی شوێنێک بکا، لە بەر چاو دەکەوێ. چۆن ئەمن هەموو شەوێ بێمەوە ماڵی تۆ و پێکەوە لە دیوێک بخەوین. با ئەتۆش هیچ نەڵێی ژنەکەت لێت دەڕەنجێ، چونکە من دەبمە هۆی جیابوونەوەتان. ئەگەر زۆرت پێ خۆشە لێت نیزیک بم. لە پەنا ماڵی خۆتان خانوویەکم بۆ بکڕە. ئەودەم شەوێک تۆ هەتا کاتی خەوتن لە لای من بە و شەوێک من دێم هەتا کاتی خەوتن لە لای تۆ دەبم و دوایە دەچمەوە ماڵەکەی خۆم و تۆش لەگەڵ ژنی خۆت بخەوە. ئەوە باشترە لەوەی کە ئەتۆ هەموو شەوێ لە خێزانت دوور کەوییەوە. چاوەکەم کە تۆ ئاوات پێ گوت: «دێ لەگەڵ من

ڕاوێژ دەکا، منیش هانی دەدەم ئەو کارە بکا. ئەودەم کارەکان جوان دەچنە پێش.»
قەمەروززەمان گوتی: «بە چاوان.»

دوای ئەوە ژنی زێڕینگەرەکە هەستا قەمەروززەمانی بەجێ هێشت. قەمەروززەمانیش خۆی لە خەو کرد. ئەوەندەی پێ نەچوو کە کەنیزەی خانم هات و هەڵی ستاندن. زێڕینگەرە پرسی: «کاکی بازرگان دەڵێی مێشوولە ئازاریان داوی؟» قەمەروززەمان وڵامی داوە: «خووم پێ گرتوون پێیان نارەحەت نیم.» زێڕینگەرە گوتی: «وایە خوویان پێ دەگری.» دوای ئەوە قاوە و شەربەتیان خواردەوە و چوونە دەرێ. قەمەروززەمان چوو بۆ لای پیرێژنە و هەموو شتێکی بۆ گێڕاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! قەمەروززەمان لە پیرێژنەی پرسی: «تۆ دەتوانی کارێک بکەیت من بە ئاشکرا بچمە لای ئەو ژنە؟» ژنە دەللاک گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئەمن تا ئێرەم لە دەست دەهات. ئیدی من هیچم پێ ناکرێ.» قەمەروززەمان پیرێژنەی بەجێ هێشت و چووەوە مزڵەکەی خۆی. ئێوارە دیسان زێڕینگەرە چووەوە لە دوای و گوتی هەستە با بچین بۆ ماڵی ئێمە. قەمەروززەمان گوتی: «ئیدی جوان نییە لەوە زیاتر من بێم بۆ ماڵی ئێوە.» زێڕینگەرە گوتی: «ئەو قسانە چییە، من بۆخۆم تۆم خۆشدەوێ و پێم خۆشە لێم دانەبڕێی. تۆ ئەو خودایە لەگەڵم وەرەوە.» قەمەروززەمان گوتی: «ئەگەر تۆ هاوڕێیەتی منت پێ خۆشە و پێت خۆشە لێت دوور نەکەومەوە، ئەوە لە لای ماڵەکەی خۆت خانوویەکم بۆ بکرە. شەوێک تۆ لە لای من بە تا کاتی خەوتن و شەوێک من لە لای تۆ دەبم تا کاتی خەوتن. ئەودەم من دێمەوە ماڵەکەی خۆم و تۆش لەگەڵ خێزانی خۆت بخەوە.» زێڕینگەر گوتی: «لە پەنا ماڵەکەی من خانوویەکی لێیە کە ئەویش هەر ئی منە. ئەوشەو لەگەڵم وەرەوە سبەی شەو ئەوێت بۆ چۆڵ دەکەم.» قەمەروززەمان هەستا لەگەڵی چووەوە ماڵی زێڕینگەرە. کاتێک نانیان خوارد و نوێژیان کرد. زێڕینگەر پەرداخە شەرابەکەی کە کەنیزەکە هێنابووی خواردییەوە و خەوت. بەڵام قەمەروززەمان پەرداخێکی دیکەی خواردەوە کە هیچی تێ نەکرابوو. هەر بۆیە دانیشت و چاوەڕێی پەریڕوو بوو. پەریڕوو هات و هەتا بەیانی لە پاڵ قەمەروززەمان خزی و مێردەکەشی وەک کەلاک لەوێ کەوتبوو. بەیانی کە پەریڕوو ڕۆیشت ئەوەندەی پێ نەچوو کەنیزە هات و قەمەروززەمان و زێڕینگەری لە خەو هەستاند بۆ نوێژ.

کە ڕۆژ بووەوە کابرای زێڕینگە بانگی کرێنشینەکەی کرد و پێی گوت: «ئەو خانووەم بۆ چۆڵ بکە، کارم پێیەتی. کابرای کرێنشین خانووەکەی بۆ چۆڵ کرد و قەمەروززەمان هاتە نێوی. یەکەم شەو زێڕینگەر لە لای قەمەروززەمان بوو. بۆ ڕۆژی دووەم ژنە چوو ڕەهۆلکەنێکی هێنا و بە پارە ڕازی کرد، لە ماڵی زێڕینگەرەکەوە ڕەهۆلێک لێدا بۆ ماڵی قەمەروززەمان. ڕۆژێک قەمەروززەمان دانیشتبوو، ئاگای لە هیچ نەبوو لە پڕدا، ژنە زێڕینگەر لێی وەژوور کەوت. دوو توورەکە زێڕیشی لەگەڵ خۆی بردبوو. قەمەروززەمان لێی پرسی: «ئەوە لە کوێوە هاتی؟» ژنە ڕەهۆڵەکی پێشان دا و گوتی: «ئەو دوو توورەکە زێرە بگرە لە ماڵی مێردەکەمەوە بۆم هێناوی. ئیدی هەتا بەیانی بە کەیف و خۆشی و ماچ و ڕاموسین ڕایان بوارد. ئەوجار گوتی: «ئەتۆ دانیشە چاوەڕێم بە تا دەچم ئەو هەڵدەستێنم و بەڕێی دەکەم بۆ دووکان و دێمەوە لات.»

قەمەروززەمان لەوێ چاوەڕێی بوو هەتا چوو، مێردەکەی هەستاند. دەستنوێژی شوت و نوێژەکەی کرد و چوو بۆ دووکان. ئینجا چوار توورەکەی زێڕ هەڵگرت و چووەوە بۆ لای قەمەروززەمان. گوتی: «ها ئەوانەش هەڵگرە..» ماوەیەکی دیکەشی لە لا بوو، ڕۆیشتەوە و قەمەروززەمانیش چوو بۆ بازاڕ.

ئێوارە ڕۆژپەڕان، کە گەڕاوە ماڵێ سەیری کرد، دە دانە توورەکە زێڕ و گەوهەری گرانبایی لە ماڵەکەی ئەوە. دوای ئەوە زێڕینگەرە هات لە دوای قەمەروززەمان و بردی بۆ ماڵەکەی خۆی. شامیان خوارد و نوێژی خەوتنانیان کرد. بە پێی شەوان کەنیزە دوو پەرداخی شەراب هێنا. گەوهەرفرۆش یەکیانی خواردەوە و لەڕێوە خەوی لێ کەوت. بەڵام مەمنا شەرابەکەی قەمەروززەمان هیچی تێ نەکرابوو. خەوی لێ نەکەوت و دانیشت. دوای ئەوە ژنە هاتە لای قەمەروززەمان و دەستیان کرد کەیف و خۆشی و دەستبازی. پاشان ژنە، هەتا بەیانی هەر کێشەوەی کرد و زۆربەی شتەکانی ئەو ماڵەی بە ڕەهۆڵەکەدا بردە ماڵی قەمەروززەمان. ئینجا هاتەوە ماڵێ. کەنیزەکە خاوەنەکەی هەستاند. زێڕینگەر نوێژی کرد و قاوە و شەربەتی خواردەوە و هەر کەسەی چوو بە لای کاری خۆیەوە.

بۆ ڕۆژی سێیەم، ژنە، خەنجەرێکی مێردەکەی کە بەتایبەتی بۆ خۆی دروست کردبوو، دەسکەکەی لە بەردی گرانبایی و نرخەکەی بایی پێنجسەد دینار بوو، بردی بۆ قەمەرووزەمان و پێی گوت: «ئەو خەنجەرە هەڵگرە و بچووە بۆ دووکانی مێردەکەم. بڵێ مامۆستا ئەمڕۆ ئەو خەنجەرەم کڕیوە، چاوێکی لێ بکە. ئەو، خەنجەرەکە دەناسێتەوە، بەڵام لە ڕووی هەڵنایە بڵێ ئەوە ئی منە. ئەگەر گوتیشی لە کوێ و بە چەندت کڕیوە، بڵێ کە دوێنشەو تووشی دوو بەڕەڵا بووم، پێکەوە قسەیان دەکرد. یەکیان لەوی دیکەی پرسی: «لە کوێ بووی؟» ئەویش وڵامی داوە: «لە لای واشتاکەم بووم، هەتا دەچم بۆلای دینار و شتم دەتاتێ، ئەوجار وا دیار بوو، ئەوانەی نەمابوو. ئەو خەنجەرەی مێردەکەی دامێ. بزانم نایفرۆشم پارەی چاک دەکا.» ئەمن کە چاوم پێی کەوت زۆرم پێ جوان بوو، دڵم گرتی. پێم گوت: «بە منی بفرۆشە.» وابوو ڕازیم کرد و بە سێسەد دیناری زێڕ لێم کڕی. دا چاوێکی لێ بکە بزانە گرانم کڕیوە یان هەرزان. دوای ئەوە ماوەیەک لە لای دانیشە بزانە دەڵێ چی. ئەوجار هەستە وەرەوە بۆ لای خۆم. ئەوە چاوەڕێتم.» قەمەروززەمان گوتی: «بە چاوان.»

قەمەروززەمان خەنجەرەکەی وەرگرت و هەستا چوو بۆ دووکانی زێڕینگەرەکە و سڵاوی لێ کرد. زێڕینگەرەکە وڵامی سڵاوەکەی داوە و داینیشاند. چاوی بە خەنجەرەکەی لا قەدی کەوت. زۆری پێ سەیر بوو لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوە خەنجەرەکەی منە!» بۆ بەو بازرگانەیە! هەر وا لە گژ فکراندا ڕۆ چوو بوو، لە بەر خۆیەوە دەیگوت خۆزگە بم زانیبا ئەو هەر ئەوەی منە یان وەک ئەو دەچێ؟! لەو جەنگەیەدا قەمەروززەمان

خەنجەرەکەی لە بەر پشـــتێوێن دەر هێنا و گوتی: «مامۆســـتا چاوێک لەو خەنجەرە بکە. سەرۆکی گەهەرفرۆشان کە چاوی لێ کرد، ناسییەوە و گومانی نەما کە ئەوە خەنجەرەکەی خۆیەتی. بەلاّم لە ڕووی هەڵنەهات بڵێ ئەوە ئی منە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نۆسەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـکۆ! زێڕینگەر کاتێک خەنجەرەکەی ناسـییەوە لێی پرسـی: «لە کوێت کڕیوە؟» کچە، چی بە قەمەروززەمـان گوتبوو، چۆنی ڕێوشـوێنەکە بۆ کێشـا بوو، قەمەروززەمان ئاوای گێڕاوە. زێڕینگەر گوتی: «ئەو خەنجەرە بایی پێنجسـەد دینارە زۆر هەرزانت کڕیوە.» زێڕینگەر ئاوری خەم و زەندەمانی کەوتە هەناوەوە. قسـەی بۆ نەدەهات و دەستی بۆ کار نەدەچوو. قەمەروززەمان قسـەی لەگەڵ دەکرد و ئەویش لە دەریای فکر و خەیاڵدا نوقم ببوو. لە پەنجا قسە یەکیانی نەدەبیست و وڵامی نەدەداوە. مات و مەلوول بوو، لە بەر خۆیەوە ئەو بەیتەی گوت:

نـازانم ڕوو لە کوێ بکەم، تەواو سـەرم لێ شـێواوە
دڵـم ئۆقرەی لـێ هەڵـگرتـووم، بـاوەڕم بە کەس نەمـاوە

کاتێک قەمەروززەمان زانی زۆر شڵەژاوە، گوتی: « وا دیارە زۆر سەرقاڵی جارێ ئەمن دەڕۆم.» لەڕێوە هەسـتا ڕۆیشـتە دەرێ و یەکسـەر چووەوە ماڵێ. کە گەیشـتەوە سـەیری کرد، ئەوە ژنە لە بەر دەرکی ڕەهۆڵەکە چاوەڕێی ئەوە. ژنە خێرا لێی پرسـی: «چیت کرد؟ چۆنم پێ گوتبوی، وات کرد؟» قەمەروززەمان وڵامی داوە: «بەڵێ.» پرسـی: «ئەی ئەو گوتی چی؟» قەمەروززەمان گوتی: «هیچی نەگوت ئەوەندە نەبێ گوتی: «ئەو خەنجەرە بە سێسەد هەزار دینار هەرزانە و بایی پێنجسەد دینارە.» بەڵام زۆر تێک چوو. ئەمن هەستام هـاتمە دەرێ. جـا نـازانم ئیدی چی لێ بەسـەر هـات. ژنە گوتی: «خەنجەرەکەم دەیە.» خەنجەرەکەی لێ وەرگرتمەوە و لە سندووقەکەی خستەوە.»

دوای ڕۆیشـتنی قەمەروززەمان کابرای زێڕینگەر، زیاتر وە شـک کەوت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەچمەوە بزانم خەنجەرەکە ماوە. لەڕێوە هەسـتا بە ڕوویەکی گرژەوە چووەوە ماڵێ. ژنە لە بەری هەستا و گوتی: «ئەیڕۆ ئەوە چی بووە؟ بۆ وا نارەحەتی؟» کابرا گوتی: «کوا خەنجەرەکەم؟» ژنە لە وڵامدا گوتی: «ئەوە لە سندووقەکە دایە.» ئیدی ژنە بە قەستی بە سـەر خۆی دادا و دەستی کرد بە هات و هاوار گوتی: «ئەیڕۆ ئەوە شـەڕت کردووە و بە تەمای بە خەنجەر لە خەڵک دەی؟» زێڕینگەرە گوتی: «هەسـتە خەنجەرەکەم بۆ بێنە.» ژنە گوتی: «هەتا سـوێندم بۆ نەخۆی شـەڕی پێ ناکەی بۆت ناهێنم.» زێڕینگەرە سـوێندی خوارد. ئەوجار ژنە هەسـتا چوو سـەری سـندووقەکەی هەڵگرت و خەنجەرەکەی بۆ هێنا. زێڕینگەرە چاوی لەمبەرەوبەری خەنجەرەکەی دەکرد و دەیگوت: «بە ڕاسـتی شـتێکی سەیرە.»

دوای ئەوە خەنجەرەکەی دا بە ژنەکەی و گوتی: «ها ئەوەی لە سـندووقەکە بنێوەوە.» ژنە گوتی: «پێم بڵێ ئەوە چی بوو، وا شڵەژابووی؟» زێڕینگەرەکە گوتی: «ئەو هاوڕێیەمان خەنجەرێکی دروسـت لەوەی پێ بوو. ئیدی تەواو ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. ئەو جار گوتی: «ئێستا کە چاوم بەوە کەوت ئەرخەیان بووم.» ژنە گوتی: «کەوایە خراپت لە بارەی منەوە بیر کردووەتەوە و وات زانیوە من هـاودەمی خوێڕی و بەڕەڵایـانم و خەنجەرەکەی تۆم داوە بەوان!» زێڕینگەڕ گوتی: «بەڵێ دڕدۆنگ بووم، بەڵام ئێستا کە خەنجەرەکەم دیت دڵم حەسـاوە. ژنە گوتی: «پیاوەکە وا دیارە تێکەڵت کردووە و لەمە و بە دوا نـابێ زۆرم چاوەڕوانی باش لێت بێ.» زێڕینگەر پاکانەی دێناوە و داوای لێ بووردنی دەکرد. تا لە کۆتاییدا چووەوە بۆ دووکان.

ڕۆژێکی دیکە ژنی زێڕینگەرەکە دەمژمێری مێردەکەی کە بۆ خۆی دروسـتی کرد بوو، دای بە قەمەروززەمان و گوتی: «ها ئەوەی بەرە بۆ دووکانی مێردەکەم و پێی بڵێ، ئەو کەسـەی ئەو ڕۆژە خەنجەرەکەم لێ کڕی ئەوڕۆ تووشـی بووم ئەو دەمژمێرەی پێ بوو. پێی گوتم، ئەو دەمژمێرەم لێ بکڕە. ئەمن لێم پرسـی: "ئەوەت لە کوێ بوو؟" گوتی: "لە لای خۆشەویستەکەم بووم، دایمێ." من کە ئەوەم بیست، لێم کڕی بە هەشتسەد دینار. چاوێکی لێ بکە بزانە هەرزانم کڕیوە یان گران. هەر کە چاوی لە دەمژمێرەکە کرد، زوو هەسـتە ورەوە و دەمژمێرەکەم بۆ بێنەوە.»

قەمەروززەمان هەسـتا و چوو بۆ دووکانی زێڕینگەرەکە. ژنە چی پێ گوتبوو وای کرد. زێڕینگەرە کە کاتژمێرەکەی دیت، هیچی نەگوت. بەڵام کەوتە فکر و خەیاڵەوە. دوای ئەوە قەمەروززەمان هەسـتا بە لەز خۆی گەیاندەوە ژنە و کاتژمێرەکەی داوە. مێردی ژنە وەک ماری بریندار بە پەڕتاو خۆی گەیاندەوە ماڵێ و گوتی: «ژنەکە، کوا کاتژمێرەکەم.» ژنە وڵامی داوە: «ئەوەتا لەو مجرییەکە دایە، لەڕێوە هەسـتا کاتژمێرەکەی بۆ هێنا.» زێڕینگەرە گوتی: «سـوبحانەڵلا.» ژنەکەی گوتی: «ئەرێ پیاوەکە ئەوە بۆ وا دەکەی خۆ تۆ زۆرت هەیە و هەژار نی. بوا لە خەمی ئەوانەدای.» زێڕینگەر گوتی: «وەڵلاهی ژنەکە نازانم بڵێم چی! سەرم سووڕ ماوە، ئەو ڕۆژە خەنجەرەکەم بە دەست ئەو هاوڕێیەمەوە دیت ناسیمەوە کاری خۆم بوو. خۆم ڕەنگێژیم کردبوو. خەنجەری دیکە لەو شـێوەیە نییە. ئەو بازرگانە هێندێک شـتی گوت زۆری پێ تێک چووم. کە هاتیشـمەوە خەنجەرەکەم لە ماڵێ دیت، خاو بوومەوە. ئەوڕۆ دیسـان ئەو کاتژمێرەی کە بۆخۆم دروسـتم کردووە و زەحمەتی دونیام پێوە کێشاوە و بەسرە یەکی دیکەی ئاوای تێدا نییە بە دەست ئەو بازرگانەوە دیتم. دیسان هێندێک شـتی گوت کە زۆری کار تێکردم. سـەرم سـووڕ ما و حەبەسـام. کاس بووم نەمدەزانی بڵێم چی.» ژنە گوتی: «قسـەکانی تۆ ئەوە دەردەخا کە من دۆسـتی ئەو هاوڕێ بازرگانەت بم و ئەوم خۆش بوێ و شـتەکانت دەدەم بەو. وەک ئەوەی بڵێی خەیانەتەکانی

منت بۆ دەر کەوتووە. هەر بۆیە هاتوویەوە بە پێ و شـــوێنی ئەو بابەتە. ئەگەر کاتێک هاتبایەوە ماڵێ و خەنجەر و کاتژمێرەکە لە ماڵێ نەما با، ئەوە بۆ دەسەلما کە من خەیانەتم پێ کردووی. ئێســـتا کە تۆ ئاوا دڵت لە من پیس بوو و لێم دڕدۆنگ بووی، تازە من نان و ئاوت لەگەڵ ناخۆم. ئیدی زێڕینگەرە ئەوەندەی دڵخۆشـــی داوە، هەتا دڵی ئەهوەن کردەوە. دوای ئەوە هاتە دەرێ. زۆر پەشـــیمان بوو لەوەی کە ئاوا بە شـــکەوە لەگەڵ خێزانی جوڵابووەوە. ڕۆیشتەوە بۆ دووکان.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی نۆسەد و حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! زێڕینگەرەکە هەستا چوو بۆ دووکان. دڵێکی سوار و نیگەرانی بوو. جارێک باوەڕی دەکرد و جارێک نا. کە بوو بە شـــەو بە تەنیا هاتەوە و قەمەروززەمانی لەگەڵ خۆی نەهێناوە. ژنەکەی پرسـی: «ئەی ئەوە بازرگانەکە لە کوێیە؟» وڵامی داوە: «لە ماڵی خۆیەتی.» ژنە گوتی: «بۆ نێوانتان تێک چووە؟» وڵامی داوە: «بە خودا لەبەر ئەو بابەتە لە بەر چاو کەوتووە.» ژنە گوتی: «هەستە لەبەر دڵی منیش بێ بچووە بیهێنە.»

زێڕینگەرە لەڕێوە هەستا چوو، بۆ ماڵی قەمەروززەمان. سەیری کرد، زۆربەی کەلوپەلە گرانبایەکانی ماڵەکەی لەوێیە. گڕی لە هەناوییەوە ســـەری کرد. قەمەروززەمان پرســـی: «چییە ئەوە بۆ ئـاوا چووی لە فکرەوە؟» زێڕینگەرە لە ڕووی هەڵنەهـات پێی بڵێ، بڵێ: «کەلوپەلەکانم لێرەن.» هەر بۆیە پێی گوت: «نازانم بۆ دڵم ســـوارە. هەســـتە با بچین بۆ ماڵی ئێمە بەشـــکوو کەمێک قســـە بکەین، دڵم ئارام بێتەوە.» قەمەروززەمان گوتی: «ئەو شـــەو لێم گەڕێ با نەیەم. زێڕینگەر ســـوێندی لێ خوارد، دەبێ لەگەڵی بچێ. کە چوونەوە نوێژیان کرد و شامیان خوارد قەمەروززەمان دەستی کرد بە قسە کردن. بەڵام زێڕینگەرە چووبوو لە گژ فکر و خەیاڵانەوە. قەمەروززەمان سـەد قسـەی دەکرد ئەو گوێی لە یەکیان نەدەبوو. دوای ئەوە کەنیزەکە بە پێی عادەت دوو پەرداخی شـەراب هێنا. زێڕینگەرە هەڵیدا و خەوی لێ کەوت بەڵام قەمەروززەمـان نـا. چونکە پەرداخەکەی ئەو چی تێ نەکرابوو. دوای ئەوە ژنە هاتە لای قەمەروززەمان و گوتی: «ئەو گێژەت پێ چۆنە. هەر کە سەرخۆش بوو خەوی لێ دەکەوێ و هیچ لە فڕوفێڵی ژنان ناگا. دەبێ ئەوەندەی دڕدۆنگ بکەم هەتا لەبەر چاوی دەکەوم و تەڵاقم دەدا. ســـبەینێ پەچەیەکی کەنیزان بە ســـەر خۆمدا دەکەم. لەگەڵت دێم بۆ دووکانەکەی، پێی بڵێ، بڵێ: "چووم بۆ کاروانســـەرای کەنیزفرۆشـان و ئەو کەنیزەم بە هەزار دینـار کڕیوە، پێـت چۆنە؟ گرانە یـان هەرزا؟" دوای ئەوە پەچە و ڕووبەندەکەم لە سەر لادە و زوو بمهێنەوە ماڵێ. بزانین کارەکەمان بە کوێ دەگا.»

دوای ئەوە ژنە لەگەڵ قەمەروززەمـان دەســـتیـان کرد بە مـاچ و مووچ و خۆ تێک هەڵســـوون هەتا بوولێڵەی بەیانی. ئەوجار چووەوە جێگاکەی خۆی و کەنیزەکەی نارد لە خەویان هەستێنێ. زێڕینگەر و قەمەروززەمان لە خەو هەستان و نوێژیان کرد و شەربەت و قاوەیان خواردەوە و چوونە دەرێ. گەوهەرفرۆش چووەوە بۆ دووکان و قەمەروززەمان هاتەوە ماڵەکەی خۆی. لای قاوەڵتی ژنە پەچەیەکی کەنیزانی بە سەر سەریدا دا و وە دوای قەمەروززەمان کەوت. ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە دووکانی مێردەکەی. کە گەیشـتنە دووکانی زێڕینگەرەکە، قەمەروززەمان سـڵاوی لێ کرد و دانیشـت. پاشـان گوتی: «مامۆسـتا ئەمڕۆ

هەر بە ئیشـــتیا چووم بۆ بازاڕی کەنیزفرۆشـــان. ئەو کەنیزەم بە دەســـت دەلالێکەوە دی، زۆرم بە دڵ بوو. بە هەزار دینار لێم کڕی. ویســـتم لێت پرســـم بزانم گرانم نەکڕیوە؟» ئەوجار دەستی برد سەریشی هەڵداوە.

زێڕینگەر چاوی لێ کرد! ئەو ژنەکەیەتی و جلی گرابایی و زێڕ و گەوهەر و خشـــڵی پێوەیە و چاوی ڕشـــتووە و دەســـتی بە خەنەیە. جوان ناســـییەوە. ئەو جلانەی کە بۆخۆی بۆی کڕیبوو. زێڕ و جەواهێراتەکەی کە بۆخۆی بۆی دروســـت کردبوو لە دەســـت و ملیدا بوو. ئەو ئەنگوستیلانەی کە بۆ قەمەروززەمانی دروست کردبوو لە قامکیدا بوو. ئەوەندەی تێی دەفکری زیاتری بۆ ڕوون دەبووەوە کە ئەوە ژنەکەی خۆیەتی. ئنیجا لێی پرســـی: «کەنیزەکە نێوت چییە؟» ژنە وڵامی داوە: «حەلیمە.» نێوی خێزانی زێڕینگەرەکەش هەر حەلیمە بوو. زێڕینگەرە ســـەری لەو کارە دەرنەدەچوو. بە قەمەروززەمانی گوت: «ئەو کەنیزەت بە خۆڕایی وەگیر کەوتووە خۆ پارەت پێ نەداوە. دە هەزار دینـار هەر نرخی زێڕەکانی نییە.» دوای ئەوە قەمەروززەمان کەنیزەی هەڵگرت و بردییەوە ماڵی خۆی. ئەو ژنەتیوە سیحر بازە بە ڕەهۆڵەکەدا چووەوە ماڵەکەی خۆی.

زێڕینگەر هێند نـاڕەحەت بوو، خەریک بوو ئـاوری دەگرت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «با بچمەوە ماڵێ ئەگەر ژنەکەی من لە ماڵ بێ، ئەوە دیارە هەر شـــێوەی ئەوی داوە، ئەگەر بێت و لە ماڵ نەبێ ئەوە قســـەی تێدا نییە و ڕاســـت ئەو کەنیزە، ژنەکەی من بوو.» ئیدی هەســـتا و بە لەز خۆی گەیاندەوە ماڵێ. ســـەیری کرد ئەوە ژنەکەی هەر بەو جلوبەرگ و زێڕ و زیو و خشـــڵەی کە لە دووکـان دیبووی لە مـاڵێیە. دەســـتی لێک دا و گوتی: «سوبحانەڵلا.» ژنەکەی گوتی: «پیاوەکە ئەرێ ئەوە چی بووە، شێت بووی یان کێشەیەکت بۆ ساز بووە؟ جاران خۆ وا نەبووی.» پیاوە گوتی: «ئەگەر پێت خۆشە بزانی دەبێ بەڵێنم پێ بدەی ناڕەحەت و زیز نەبی.» ژنە گوتی: «نا، دەی بۆم بگێڕەوە چی بووە؟» زێڕینگەرە گوتی: «ئەو بازرگانەی لەگەڵم هاوڕێیە کەنیزێکی کڕیبوو، ڕێک بە قەد تۆ، ناوی حەلیمە و جلوبەرگ و زێڕ و زیو و خشـــڵەکانی تۆی هەموو پێوە بوو، ئەو ئەنگوســـتیلانەشـــی لە قامکیدا بوو. کە پیشـانی منی دا، وەمزانی تۆی، تێدا مام بڵێم چی. حەپەسـام. لە دڵی خۆمدا گوتم: "خۆزگە ئەو بازرگانەم هەر نەدیبایە و لەگەڵی ئاشـــنا نەبووبام. ژیانی لێ تـاڵ کردووین." ئیدی زۆر ناڕەحەت بووم. کەوتمە شک و گومانەوە.» ژنە گوتی: «جوان چاوم لێ کە نەکا من هەر ئەو ژنە بم کە لەگەڵ ئەو بازرگانە بوو. بووبمە واشتـای ئەو و لەگەڵی ڕێک کەوتبێتم. چارشێوی کەنیزانە بە سەر خۆم دادابێت و لەگەڵی هاتبم هەتا پێشانی تۆم بدا. زێڕینگەرە گوتی: «خودا نەکا باسـی شـتی وا مەکە. ئەمن قسـەی وا بە تۆ ناڵێم.» ئەو زێڕینگەرە فەقیرحاڵە لە مەکری ژنان نەگەیشتبوو. وەک شاعیر دەڵێ:

وریـــای داو و فـــڕوفـــێـــڵـــی ژنـــان بە

تا دەکـــــــــــــــری لە فیلبازان نەبان بە
بە بـــزە و غەمـــزەیەک نەدۆڕێ دلـــت
لە ئـاســـــت حیزان، تۆ یۆســـفی دەوران بە
زوولەیـــخـــا زۆرە ئەوڕۆکە لە بـــازاڕ
تۆ موتیعی ئەمــــــــــــــر و نەهی یەزدان بە

دوای ئەوە ژنی گەوهەرفرۆشــەکە گوتی: «ئێســتا من لێرە لەو دیوەی خۆم دادەنیشــم، ئەتۆ هەســـتە بچووە بۆ لای قەمەروززەمـان و لە درەگـا بـدە، بە بیـانوویەکەوە بچووە ژووری. بزانە ئەو کەنیزەی دەڵێی شـێوەی منی دەدا لەوێیە یان نا؟ ئەگەر کەنیزەکە لەوێ نەبوو، ئەوە ئەو فکرە خراپەی لە بارەی منەوە کردووتەوە ڕاسـتە.» کابرا گوتی: «ڕاسـتە فکرێکی باشە.»

کابرا لەڕێوە چووە درێ و ژنە بە ڕەهۆڵەکەدا چووە ئەو دیو و قەمەروززەمانی ئاگادار کردەوە کە ئێسـتا دێ، دەرگای لێ بکەوە با من ببینێ. ئەوان خەریک بوون قسـەیان دەکرد لە دەرگـای دا. قەمەروززەمـان پرســـی: «کێیە؟» زێڕینگەرە وڵامی داوە: «زێڕینگەری هاوڕێتم. ئەوڕۆ لە بازاڕ ئەو کەنیزەت کڕی بوو. ئەمن زۆرم پێ خۆش بوو. ویســـتم ئەو جـاریش ببینم.» قەمەروززەمـان گوتی: «فەرموو، ئیختیـارت هەیە کێشــــەیەک نییە.» دەرگاکەی کردەوە. زێڕینگەرەکە سـەیری کرد ئەوە ژنەکەی لە لای دانیشـتوو. ژنە لەڕێوە هەسـتا و دەسـتی زێڕینگەرەی ماچ کرد. زێڕینگەرە زۆری تێ ڕاما و قسـەی لەگەڵ کرد. تەماشای کرد لەگەڵ ژنەکەی خۆی لێک ناکرێتەوە. گوتی: «سوبحانەڵڵا، پاکە ئەو خودایەی کە کەس وەک ئەو ناچێ. دوای ئەوە بە شـــک و گومان و دڵەڕاوکێوە گەڕاوە ماڵەکەی خۆی. دیتی ژنەکەی خۆی لەوێ دانیشتبوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و حەفتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! زێڕینگەرە چووەوە ماڵەکەی خۆی. ژنەکەی لێی پرســی: «بوو بە چی؟» وڵامی داوە: «کەنیزەکەم دیت لە لای خـاوەنی دانیشــتبوو، لەگەڵ توش لێک نەدەکرانەوە.» ژنە گوتی: «ئێســتا بچووەوە بۆ دووکان و فکری خراپیش لە بارەی منەوە مەکەوە. زێڕینگەرە گوتی: «ڕاســـت دەکەی لێم خۆش بە.» دوای ئەوە گەوهەرفرۆش دەســـتی ژنەکەی ماچ کرد و چوو بۆ دووکان. ژنەش بە ڕەهۆڵەکەدا چوو بۆ لای کوڕە بازرگان و چوار توورەکەشی زێڕ لەگەڵ خۆی بۆ برد و پێی گوت: «خۆت ساز کە و ماڵ و کەلوپەلت بپێچەوە و با پیلانەکەم تەواو کەم.»

قەمەروززەمان هاتە دەرێ و چەند یەســـتر و کۆیلە و خزمەتکاری کڕی و بارو بنەی پێچاوە و لە شاری بردنە دەرێ. بۆخۆشی گەڕاوە لای ژنی زێڕینگەر و پێی گوت: «ئەمن کارەکانی خۆم کرد.» ژنە گوتی: «منیش کارم نەماوە، ئەوە تەواوی ماڵ و پاشـــەکەوتی مێردەکەم بۆ هێناوی و هیچم بۆ ئەو نەهێشتووەتەوە. بەڵام وا جوانە بچییە لای و ماڵاوایی لێ بکەی و پێی بڵێی کە ســێ ڕۆژی دیکە ئەمن ماڵەکەم دەڕوا. ئێســـتا هاتووم بۆ گەردن ئازادی و کرێ ماڵەکەم لێ وەرگری با هیچت بە لامەوە نەیە. ئەتۆ ئەو قســـانەی پێ بڵێ و بزانە دەڵێ چی. دوایە خێرا وەرەوە لای خۆم. من دەمهەوێ بەو قســـانە تووڕەی بکەم و تەلاقم بدا. چونکە دەزانم زۆری خۆش دەوێم و لە کۆڵم نابێتەوە، ئێستا جگە لەوەی لەگەڵ تۆ بێم بۆ شارەکەی خۆتان هیچی دیکەم لە دەست نایە.

قەمەروززەمان هەســـتا چوو بۆ دووکانی زێڕفرۆش و لە لای دانیشـــت و پێی گوت: «مامۆستا سێ ڕۆژی دیکە من دەڕۆم. هاتووم بۆ ماڵاوایی و حیسابی خانووەکەشم لەگەڵ بکەی با هیچی تۆ نەیە بە لای منەوە.

زێڕینگەرەکە گوتی: «ئەو قســـانە چین، ئەتۆ زۆرت لەوە زیاتر چاکە بۆ من بووە. بە خودا زۆرم پێ ناخۆشە دەڕۆی و لەبەرم گرانە. دوای ئەوە ماڵاواییان لێک کرد و دەستیان کرد بە گریان. زێڕینگەر لەڕێوە دووکانی داخست و لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەبێ هاوڕێکەم بەڕێ بکەم. ئیدی قەمەروززەمان هەرچی دەیکڕی و دەچوو بۆ هەرلایەک لەگەڵی دەچوو.

کاتێک دەچووەوە ماڵی قەمەروززەمان، ژنەکەی خۆی دەدی لەوێ لە جێی کەنیز لە بەرابەریان ڕادەوەســـتا و خزمەتی دەکرد. کە دەچووەوە ماڵەکەی خۆی، دەیدی ئەوە خێزانی لەوێ دانیشتووە. هەتا سێ ڕۆژان ئەوە کاری بوو. کە دەچووە ماڵی قەمەروززەمان ژنەی دەدی ئەوە لەوێیە و کە دەشـــهاتەوە ماڵەکەی خۆی ئەوە لەوێیە. دوای ئەوە ژنە بە قەمەروززەمانی گوت: «هەرچی فەڕش و کەلوپەلی زیادی و ماڵێک کە زێڕینگەر هەیبوو

هەموویم هێناوە بۆ تۆ. جگە لەو کەنیزەی کە خزمەتی تۆی دەکرد هیچی دیکەی نەماوەتەوە. منیش بێ ئەو هەڵناکەم و چونکە خزمی خۆشمانە زۆرم خۆش دەوێ. نهێنییەکانم بۆ دەشارێتەوە. دەڵێم لێی دەم و لێی تووڕە بم. ئەگەر مێردەکەم هاتەوە گوتی: «ئەوە چی بووە؟» دەڵێم: «یان ئەو لەو ماڵەدا دەبێ یان من. دەبێ هەر ئێستا بچی بیفرۆشی.» ئەگەر ئەو کەنیزەکەی برد بۆ بازاڕ بیفرۆشێ، ئەتۆ زوو خۆی بگەیەنێ و لێی بکڕە. با لەگەڵ خۆمان بیبەین.

دوای ئەوە زنی زێڕینگەرەکە پێش ئەوەی مێردەکەی بێتەوە، چوو لەگەڵ کەنیزەکەی کردی بە شەڕ و لێی دا. کەنیزە دەستی کرد بە گریان. لەو جەنگەیەدا کابرای زێڕنگەر هاتەوە و پرسی: «ئەوە چی بووە، ئەو گلاوە چی کردووە وا لێت داوە؟» ژنەکەی گوتی: «پیاوەکە، با یەک قسەت پێ بڵێم، لە ئێستاوە یا من لەو ماڵەدا دەبم یان ئەو. ئەگەر ئەو ڕادەگری ئەوە من تەلاق دە. دەنا هەر ئێستا دەبێ بیبەی بیفرۆشی.» گەوهەرفرۆش گوتی باشە بە سەرچاو، تۆ چۆن دەڵێی من وا دەکەم. دەیبەم دەیفرۆشم.

ئیدی زێڕینگەر کەنیزەی لەگەڵ خۆی برد بۆ دووکان، ژنە خێرا بە ڕەهۆڵەکەدا چوو بۆ لای قەمەروززەمان. قەمەروززەمان، خێرا بردی سواری کەژاوەکەی کرد. لەو جەنگەیەدا کابرای زێڕینگەر گەیشتی. قەمەروززەمان کە کەنیزەکەی لەگەڵ دیت لێی پرسی: «ئەو کەنیزەت بۆ هێناوە؟» زێڕینگەر وڵامی داوە: «خانمەکەم لێی تووڕە بووە دەڵێ دەبێ بیفرۆشی.» قەمەروززەمان گوتی: «جا ئەگەر تۆ هەر دەیفرۆشی بە منی بفرۆشە با بە بینی یادی ئێوە قەت لە دڵ دەنەچێ. دەیکەم بە خزمەتکاری حەلیمەی خێزانم.» زێڕینگەر گوتی: «زۆر باشە، هەر بە دیاری دەیدەی بە تۆ. ئەتۆ زۆرت چاکە بۆمان بووە. بازرگان کەنیزەکەی لێ قەبووڵ کرد و بە ژنەی گوت: «دەستی مامۆستا ماچ

کە. ژنی زێڕینگەرەکە سەری لە کەژاوەکە هێنا دەرێ و دەستی ژێڕینگەرەکەی ماچ کرد. دوای ئەوە بازرگان گوتی: «مامۆستا بە خودات دەسپێرم. گەرنم ئازاد کە.» گەوهەرفرۆش گوتی: «ئازادی لای خودا بێ، بڕۆ خودا ئاگادارتان بێ و سڵاوی خزم و کەس بگەیەنە. زێڕینگەر کە ئەوانی بەڕێ کرد گەڕاوە بۆ دووکان و زۆری خەمی قەمەروززەمان بوو، زۆری بۆ گریا.[با گەوهەرفرۆش لەوێ بگری.]

دوای ئەوەی لە زێڕینگەرەکە هەڵبڕان و ئەو گەڕاوە دووکان. ژنە بە قەمەروززەمانی گوت: «ئەگەر دەتهەوێ بە سلامی بگەیەوە بە لاڕێدا بڕۆ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ژنە گوتی: «با بە ڕێی لاپەڕدا بڕۆین.» قەمەروززەمان قسەکەی بە سەلاح زانی و بە لاڕێدا ڕۆیشتن. لەو شار بۆ ئەو شار ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ناوچەی میسر. دوای ئەوە، نامەیەکی نووسی و کەسێکی نارد بۆ لای باوکی. باوکی لە بازاڕ دانیشتبوو. چۆکی خەمی لە باوەش گرتبوو کە ناردەکەی قەمەروززەمان گەیشتە لای و لە بازرگانەکانی پرسی: «کامتان عەبدوڕەحمانن؟» لێیان پرسی: بۆ چیتە؟ وڵامی داوە: «نامەیەکم لە قەمەروززەمانی کوڕییەوە بۆ هێناوە.»

عەبدوڕڕەحمان کەیفی ساز بوو، وەک گوڵ گەشاوە. بازرگانەکان پیرۆزباییان لێ کرد. نامەکەی لێ وەرگرت و خوێندییەوە. نووسیبووی ئەو نامەیە لە لایەن قەمەروززەمانەوە بۆ عەبدوڕڕەحمانی بازرگان کە ئەگەر هەواڵم دەپرسی شوکری خودا باشم و خەریکی دانوسانم و خێر و قازانجێکی زۆرم وەگیر کەوتووە بە ساغ و سلامەتی گەڕاومەوە.

باوکی دڵی خۆش بوو، خەڵکی نان دا. لەبەر ئەوەی بە سلامەتی گەڕاوەتەوە. عەبدڕڕەحمان لەگەڵ بازرگانەکان بە پیرییەوە چوون. عەبدوڕڕەحمان کوڕەکەی لە باوەش گرت و گریا هەتا بێ هۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە سپاسی خودای کرد و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

چاوەڕوانی کۆتایی هات، گەڕاوەتەوە
مەزرای دڕک و داڵی خەفەت دڕواوەتەوە
ڕووحم لە سەری دەگەڕا لەو سەفەرەدا
شەوی دەیجووری بێ خەویم بڕاوەتەوە

دوای ئەوە هێندە خۆشحاڵ بوو، فرمێسکەکانی هاتنە خوارێ و ئەو بەیتەشی خوێندەوە:

لەمەودوا تازە قەت ناکەم، من سەرکۆنەیی کۆچ
کۆتایی کۆچ هێند شیرینە، ژینی پێ بکە گۆچ

دوای ئەوە بازرگانەکان چوون سلاویان لێ کرد. دیتیان ماڵ و سامانێکی زۆری لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە. کاتێک ژنە لە کەژاوەکەی هاتە دەرێ. باوکی قەمەروززەمان سەیری کرد، کچێکی لەگەڵە ئاوی چاوی بینەرانی دەبا. دیوێکی جیای بۆ تەرخان کرد. کە دایکی قەمەروززەمان چاوی پێی کەوت، خۆشحاڵ بوو. وەیزانی یەکێک لە شاژنەکانە. هەواڵی

پرسی: «مانگ‌ڕوخسار وڵامی داوه من ژنی کوڕەکەی تۆم. دایکی قەمەروززەمان گوتی: «جا ئێستا کە ئەو تۆی مارە کردووە، دەبێ جێژنێکی گەورەت بۆ وەڕێ خەین.»

عەبدوڕڕەحمان دوای ئەوەی بازرگانەکان بڵاوەیان کرد، لەگەڵ کوڕەکەی خۆی دانیشت و گوتی: «ڕۆڵەگیان، ئەو کەنیزەت لە کوێ بوو بە چەندت کڕیوە؟» قەمەروززەمان گوتی: «باوکە، ئەوە کەنیز نییە. ئەوە هەر ئەو کەسەیە کە من لە تاوانی سەری خۆم هەڵگرت و لە وڵات دوور کەوتمەوە.» باوکی گوتی: «بۆم بگێڕەوە، چۆناوچۆن بوو. کەوتییە شوێنی و چۆنت وەگیر خست.» قەمەروززەمان گوتی: «ئەوە هەر ئەو کەسەیە کە دەروێشەکە تاریفی کرد. ئیدی ئەمن هەر لەبەر ئەوە ڕۆیشتم بۆ سەفەر.»

ئیدی بەسەرهاتەکەی لە ئەووەڵەوە تا کۆتایی بۆ بابی گێڕاوە. باوکی لێی پرسی: «ڕۆڵە ئەوت مارە کردووە یان نا؟» گوتی: «مارەم نەکردووە بەڵام بەڵێنم پێ داوە مارەی کەم.» باوکی لێی پرسی باشە بە تەمای مارەی بکەی؟» قەمەروززەمان گوتی: «ئەگەر ئیزنت لە سەر بێ بەڵێ دەنا مارەی ناکەم.» عەبدوڕڕەحمان گوتی: «ئەگەر تۆ ئەوەی مارە بکەی من لەم دونیا و لەو دونیا گەردنت ئازاد ناکەم. ئەتۆ چۆن کەسێک مارە دەکەی کە لەگەڵ مێردەکەی خۆی ئاوای کردووە؟! بۆ یەکی دیکەش ئاوا لە تۆ دەکا ئەوە جێی باوەڕ نییە. ئەگەر تۆ بە قسەم نەکەی ئەوە بێ بەریت دەکەم. ئەگەر بە قسەم بکەی ئەوە کچێکی لەوە جوانترت بۆ پەیدا دەکەم و لێتی مارە دەکەم. ئەگەر تەواوی ماڵەکەشمت بۆ خەرج کەم وەبەر چاوم نایە. بەس نییە دەڵێن قەمەروززەمان کچی فلانە بازرگانی مارە کردووە و ناڵێن کەنیزێکی بێ ناو نیشانی هێناوە. »

بەوجۆرە بەردەوام عەبدوڕڕەحمان کوڕەکەی هان دەدا مارەی نەکا. شێر و ڕێوی دونیایەی بۆ دێناوە کە بە سەلاح نییە لەگەڵ ئەوەدا زەماوەند بکا. هەتا ئاخری قەمەروززەمان ڕازی بوو، گوتی: «زەماوەندی لەگەڵ ناکەم.» لەڕێوە عەبدوڕڕەحمان ناوچاوانی ماچ کرد و گوتی: «بە ڕاستی کوڕی خۆمی، ڕۆڵە گیان. بە گیانی تۆ دەبێ کچێکت لێ مارە کەم، کە هاوتای نەبێ. دوای ئەوە عەبدوڕڕەحمان دیوێکی بۆ خێزانی عوبەیدی زێڕنگەر و کەنیزەکەی تەرخان کرد و کەنیزێکی ڕەشیشی دیاری کرد نان و ئاویان بۆ بەرێ. پێشی گوتن ئێوە دەبێ لەو دیوەدا بەند بن چونکە ئێوە خائینن و چاوەڕوانی چاکەتان لێ ناکرێ. دوای ئەوە دەرکی دیوەکەی لێ داخستن و بە ژنەکەی خۆی گوت: «ڕێ نەدەی کەس بچێتە لایان و قسەیان لەگەڵ نەکا جگە لەو کەنیزە ڕەشە.

ئیدی ژنی گەوهەرفرۆشەکە لەگەڵ کەنیزەکە لەو دیوەدا دانیشتن و شەو و ڕۆژ دەگریان و پەشیمان ببوونەوە لەوەی کە خەیانەتیان بە زێڕینگەرەکە کردبوو.

عەبدوڕڕەحمان ناردی بۆ خوازبێنی کچێکی جوان و خانومان و لە بەر دڵان و ڕەسەن.

ئیزنیان وەرگرت و چوونە ماڵی شێخولئیسلام، بۆ دیتنی کچەکە. سەیریان کرد کچێکی دەلال و ڕەزاسووک، هەزار بەرابەری بە سەر ژنەکەی عوبەیدی زێڕینگەرەوە بوو. هەر ئەو شەوە خوازبێنی کرا و لێکیان مارە کردن. جێژنێکی گەورەیان بۆ ساز کردن. هەتا چل ڕۆژان عەبدوڕڕەحمان لەگەڵ کوڕەکەی لە کۆڕەکان دادەنشتن و خەڵکەکەیان بەخێرهاتن دەکرد. هەتا وا بوو ڕۆژێک لە کۆڕی میوانداریییەکەدا دانیشتبوون کە کابرای گەوهەرفرۆشی مێردی ئەو ژنە بە جل و بەرگێکی هەژارانەوە، ڕووت وەژوور کەوت. تۆزوخۆڵی سەفەری لە سەر نیشتبوو. قەمەروززەمان کە چاوی پێی کەوت ناسییەوە و بە باوکی گوتی: «چاوێک لەو کابرا هەژارە بکە هاتە ژووری. عەبدوڕڕەحمان چاوێکی لێ کرد. سەیری کرد، کابرایەکی فەقیرە و جلوبەرگێکی شڕۆڵی لە بەر دایە و تۆزوخۆڵی لە سەر سیمای نیشتووە. وەک لێ قەوماوان دەپاڕاوە و دەلالاوە. هەژاری و نەداری لە سیمای دەباری. وەک شاعیر لە سەرکۆنەی هەژاریدا دەڵێ.

هەژار دارێکی ویشکەڵە، بێ بەر و سێبەر و گەلا
قەلافەتی تێک شکاوە، وێستاوە وەک چۆڵەقەلا
بۆتە زبڵدانی مێژوو، دەفتەری کۆنە چیرۆکان
شەمەندەفەرێکی کۆنە، باری پڕ لە خەونی تەلا

شاعیرێکی دیکە لەو بارەوە جوانی گوتووە:

گەر بێت و پارەت لە باخەڵدابێ
قەیناکا مێشکت لە سەردا نەبێ
پێاوی بێ پارە قسەی بۆ نایە
گەر بێت و مێشکی ئەفلاتوونی بێ

شاعیرێکی دیکەش دەڵێ:

کورتە دەستم بۆیە بە تۆ ڕاناگا
هەناوم خاڵییە دەنگم پێت ناگا

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی نۆسەد و حەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە چاوی لە زێڕینگەرەکە کرد، بە کوڕەکەی گوت: «ئەو پیاوە کێیە؟» قەمەروززەمان گوتی: «ئەوە کابرای گەوهەرفرۆشە مێردی ئەو ژنە هێناومە.» زێڕینگەرە لەبەر ئەوە هاتبوو، کاتێک قەمەروززەمان و ئەوانی بەڕێکردبوو، چووبوو بۆ دووکان و هەتا ئێوارە لە دووکان کاری کردبوو. ئێوارەیەکی دەرنگ دووکان گاڵە دەدا و دەچێتەوە ماڵێ. دەست بە دەرگاکەوە دەنێ سەیر دەکا دەرگا کراوەتەوە. زێڕینگەرە دەچێتە ژوورێ سەیر دەکا، ژن و کەنیزەکەی لە ماڵ نین وەک شاعیر دەڵێ:

ئاسمانم بێ مانگ و ئەستێرەیە ئەمشەو<br>
شیرینی بە زارم، وەک کەکرەیە ئەمشەو

زێڕینگەرە کە دیتی کەس لە ماڵ نییە، وەک شێتی لێ هات. چاوی بەملا و لادا دەگێڕا و کەسی نەدەدی. چوو دەرکی خەزێنەکەی کردەوە ئەویش خاڵی بوو. تازە وەخۆ هاتەوە زانی ئەو هەموو فڕوفێڵە تەواوی لە ژێر سەری ژنەکەیدا بووە. لە جێی خۆی دانیشت و دەستی کرد بە گریان. بەڵام لە بەر قسەی نەیار و بەدکاران وەسەر خۆی نەهێنا و لای کەس نەیدرکاند. زانی درکاندنی جگە لە ئابڕووچوون و سەرکۆنەی خەڵک هیچ ئاکامێکی دیکەی نابێ. دوای ئەوە دەرکی ماڵەکەی داخست و چوو بۆ دووکان. دووکانەکەی بە یەکێک لە وەستاکارەکانی سپارد و پێی گوت: «ئەو هاوڕێ بازرگانەم دەچێتەوە بۆ میسر و دەڵێ هەتا ئەتۆ و خێزانیشت نەیەن سەرێکی میسر نەدەن ئەمن ناڕۆم. کوڕی من ئەتۆ ئەوە پارێزەری منی. ئەگەر حاکمیش پرسیاری منی کرد بڵێ لەگەڵ خێزانی چوون بۆ بەیتوڵلاهەلحەرام. دوای ئەوە زێڕینگەر بەو بڕە ماڵەی کە لە دووکاندا بووی یەستر و وشتر و شتی کڕی و کەنیزێکی مابوو ئەویشی سواری کەژاوە کرد و لە بەسرە وەدەر کەوتن. خەڵک پێیان وا بوو ئەوە خێزانییەتی لەگەڵ خۆی دەیبا بۆ کەعبە. خەڵک خۆشحاڵ بووم کە خودا ئەوانی لە بەندیبوونی ڕۆژانی هەینی ڕزگار کردووە. دەیانگوت: «ڕۆیندیان بێ و هاتنەوەیان نەبێ، تا خەڵک مەجبوور نەبن ڕۆژانی هەینی لە ماڵ و مزگەوتەکاندا زیندانی بن.»

کە ڕۆژی هەینی هات، جارچی جاڕیان دا کە خەڵک دوو کاتژمێر پێش نوێژی هەینی لە ماڵ و مزگەوتەکاندا خۆیان حەشار بدەن و نەیەنە دەرێ. لە بیریان نەچێ سەگ و پشیلەکانیش داکەن. خەڵکی بەسرە پێیان ناخۆش بوو. هەستان چوون بۆ لای پادشا و پێیان گوت: «پادشا، خۆ زێڕینگەر و ژنەکەی چوون بۆ کەعبە بۆ حەج، ئەوجار لەبەر چی

ڕۆژی هەینی لە ژوورێدا بەندمان دەکەن؟» پادشا گوتی: «خۆ ئەو خائینە بە منی نەگوتووە با بێتەوە دەبێ سزای بدەم. ئێوە بڕۆنەوە سەر کار و کاسبی خۆتان و تاز لە ماڵ و مزگەوتەکاندا بەند ناکرێن و ئەو دابە لە سەرتان لا دەچێ. خەڵکی بەسرە و پادشا ئاوا پێک هاتن.

مامۆستا عوبەیدی زێڕینگەر، کاتێک دە مزڵ دوور کەوتەوە چەتە و ڕێگر ڕێیان پێ گرت و تالانیان کرد. بۆخۆی بە سەڵتی ڕزگاری بوو. ئەویش ڕۆیشت، ڕۆیشت هەتا گەیشتە شارێک. لەو شارە خەڵک زگیان پێی سووتا و لە ڕێی خودادا جلە کۆنێکیان دایە خۆی پێ داپۆشێ. بەو جۆرە شارە و شار ڕۆیشت هەتا گەیشتە میسر. لە برسان بڕستی لێ بڕابوو. لە ناو بازاڕ لە شتێک دەگەڕا بیخوا. کابرایەکی میسری پێی گوت: «مامە بچووە بۆ فلانە ماڵ، سفرەیان بۆ هەژار و غەواران ڕاخستووە. زێڕینگەرەکە گوتی: «لە کام لایە من شارەزا نیم.» کابرا ڕێی ماڵی عەبدوڕڕەحمانی پیشان دا و گوتی: «شەرم و نیگەرانی ناوێ یەکسەر بڕۆ ژوورێ.» کە زێڕینگەرە چووە ماڵی عەبدوڕڕەحمان و قەمەروززەمان ئەوی بە باوکی ناساند. باوکی گوتی: «ڕەنگە برسی بێ، لێی گەڕێ جارێ با نانەکەی بخوا و بحەسێتەوە. دوای ئەوە بانگی دەکەم.» ئیدی دوای ئەوەی زێڕینگەرە نانەکەی خوارد و دەستی شوت، قاوە و شەربەتی خواردەوە و ویستی هەستێ بڕوا. باوکی قەمەروززەمان کەسێکی نارد بە دوایدا. ناردەکە چوو پێی گوت: «کاکە، گەورەم عەبدوڕڕەحمان گازت دەکا.» زێڕینگەر پرسی: «گەورەت کێیە؟» ناردەکە وڵامی داوە: «خاوەن خوانەکە.» زێڕینگەرەکە لەڕێوە گەڕاوە، پێی وا بوو، دەیهەوێ دەستی بگرێ. کە چووە پێشێ دیتی ئەوە هاوڕێکەی: قەمەروززەمان لە لای دانیشتووە. هێندە شکاوە خەریک بوو گیانی دەرچێ. قەمەروززەمان لە بەری هەستا لە ئامێزی گرت. هەردووکیان وایان نواند کە دەگرین. دوای ئەوە قەمەروززەمان ئەوی هێنا لە پەنا خۆی داینا. باوکی قەمەروززەمان بە قەمەروززەمانی گوت: «گەوجە، خۆ پێشوازی لە هاوڕێ ئاوا نابێ. لە پێشدا بینێرە بۆ گەرماو و جلوبەرگێکی شیاوی لە بەر بکە. دوای ئەوە پێکەوە دانیشن قسە بکەن. قەمەروززەمان لەڕێوە بە خزمەتکارەکانی گوت بیبەن بۆ گەرما. جلوبەرگێک کە بایی هەزار دینار بوو بۆی نارد. کابرای گەوهەرفرۆش جوان خۆی شۆرد و جلەکانی لە بەر کرد. تومەز شابەندەری بازرگانانە.

ئامادەبوان بە دزی لە قەمەروززەمانیان پرسیبوو: ئەو کابرایە کێیە؟ ئەویش گوتبووی: «ئەوە هاوڕێمە و منی لە ماڵەکەی خۆی داڵدە داوە و زۆری خزمەت پێ کردووم بازرگانێکی گەورەیە و لە لای پادشای بەسرە ڕێز و حورمەتێکی زۆر و پلە و پایەی باشی هەیە.»

کورتی کەینەوە، قەمەروززەمان ئەوەندەی پەسن و تاریف کرد هەتا لە لای خەڵک زۆر

به قەدر و حورمەت بوو. وا بوو هەموویان گوتیان: ڕێزی لە ســـەر هەموومان فەڕزە و دەبێ ئاگامان لێی بێ بزانین بۆ هاتووە و چ کارێکی هەیە وا هاتووە بۆ میســـر و بۆ ئاوای لێ هاتووە و ڕووت و ڕەجاڵ بووە؟ قەمەروززەمان گوتی: «خەڵکینە ئەوەتان لە بیر نەچێ ئێمە لە ژێر حوکمی قەزا و قەدەر داین و هەتـا لەو دونیـایەدا بژین دەبێ چـاوەڕوانی ڕووداوی چاوەڕوان نەکراو بین. هەر وەک لەو دوو بەیتەدا ئاماژەی پێ کراوە.

ئێـمە تـۆپـێـکـیـن بە دەم زەربەی شـــەقـان
دێین و دەچین، بێ وچـان لە نێو مەیـدان
کـوا دەزانـین لە کـوێین ئیســـتێکی دیکە
گیری ناو زێـــــــــراوین یان چوینە سەربان

ئەوەندە بزانن کاتێک من چووم بۆ بەســـرە زۆر لەو لێ قەوماوتر بووم. ئەو باش بوو گیانی داپۆشـــرابوو، ئەمن ئەوێشـــم بە دەرەوە بوو. ئەو کابرایە بە پیرمەوە هات و جل و بەرگی دامێ و منی بردەوە ماڵەکەی خۆی. چاکەیەکی زۆری لەگەڵ کردم ئەوەی ئەمن هێنابووم هەمووی لە ســـایە گەورەیی ئەوەوە بوو. کاتێک من هاتمەوە ئێرە ئەو ماڵێکی زۆری دا بە من. ئیدی ئەمن بە دڵێکی خۆش و دەســـتی پڕەوە هاتمەوە ئێرە. ئەویشـــم لەو پەڕی گەورەیی و پیاوەتیدا بە جێ هێشت. دوای ئەوە ڕۆژگار بەو ڕۆژەی گەیاندووە و لە خزم و کەسی دابڕاندووە. ئەو کارانە سەیر نین. بەڵام ئەوەندەیە دەبێ من چاکەی ئەوم لە چاویدا بێ و وڵامی چاکەکانی بدەمەوە. وەک شاعیر دەڵێ:

گەورەیـی مـرۆڤ لە ســـپـڵە نەبـوون دایە
چـاکە لەگەڵ ئـی ســـپـڵە دەچـێ بە زایە
گەر بـکەی چـاکە لەگەڵ مـرۆڤـی پـێـزان
لەگەڵەت دەکـاتەوە چـاکە بە ســـەدان

ئەوان لەو قسـانەدا بوون کە وەسـتا عوبەیدی زێڕینگەر وەک شـابەندەرێک پەیدا بوو. ئامادەبوان لەبەری هەســتان و فەرموویان کردە لای ســـەرەوە. قەمەروززەمان پێی گوت: «هاوڕێم خەمت نەبێ، هەر وەک چۆن چەتە و جەردە منیان ڕووت کردبوو تۆ پەنات دام، منیش ئاوا لە خزمەتت دام و وڵامی چاکەکانت دەبێ بدەمەوە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و حەفتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــــکۆ! قەمەروززەمان بە کابرای گەوهەرفرۆشـــی گوت: «ئەو کارەی تۆ لەگەڵ منت کرد، منیش بە زیادەوە لەگەڵتی دەکەم و لە خزمەتت دام. خەمت نەبێ و نیگەرانی هیچ مەبە.» قەمەروززەمان بەردەوام دڵخۆشـــی دەداوە و نورەی قســـەی نەدەدا. نەکا کابرای زێڕینگەر باسی ژنەکەی و ئەو ڕووداوەی بۆی هاتووەتە پێشێ بکا. هەر بۆیە درێژەی دا بە پەسن و تاریفی گەورەیی و پیاوەتی گەوهەرفرۆشەکە. کابرای گەوهەرفرۆش تێگەیشـــت مەبەســـتی چییە، بۆیە ئەویش دانی بە خۆیدا گرت و خۆی لە درکاندنی بوارد. وەک شاعیر دەڵێ:

زارکـــی هەگـــبەی دەروونـــم وا بـــاشـــــە نەکەمەوە
نـــهـێـنـــیـم نەدرکـێـنـــم و، ئـــابـــڕووی خـــۆم بـکـــڕمەوە

دوای ئەوە قەمەروززەمان و عەبدوڕڕەحمان کاک عوبەیدوڵڵای گەوهەرفرۆشـیان بردە دیوێک کە هەر بۆخۆیـان بن. عەبـدوڕڕەحمـانی بـازرگـان پێی گوت: «ئێمە بۆیە بواری قســـەمان بە تۆ نەدا هەتا ئابڕووی تۆش و ئێمەش نەچێ. بەڵام ئێســـتا بەیەکەوەین، بۆ بگێڕەوە بزانم چی لە نێوان تۆ و ژنەکەت و ئەو کوڕەی مندا ڕووی داوە. تکایە ڕاســـتی شـتەکەم موو بە موو پێ بڵێ. زێڕینگەرە تەواوی بەسـەرهاتەکەی لە سـەرڕاوە بۆ گێڕاوە. عەبدوڕڕەحمانی بازرگان لێی پرســـی: «ڕاســـتی بڵێ تاوانکار ئەو کوڕەی من بوو یان ژنەکەی تۆ؟» زێڕینگەر ســـوێندی خوارد گوتی: «بە خودا هەر تاوانی ژنەکەی خۆم بوو، چونکە پیاوان دڵیان بۆ ژنان هەر لێ دەدا، ئەوە ژنانن دەبێ بوار نەدەن بە پیاوان. هەمووی تاوانی ژنەکەی خۆم بوو خەیانەتی لێ کردم و ئەو پەندەی بە ســـەر من هێنا و بەوڕۆی گەیاندم.

ئەوجار بازرگان هەســـتا و بانگی کوڕەکەی خۆی کرد و پێی گوت: «ڕۆڵە ئێمە ئەو ژنەمان تاقی کردەوە و بۆمان دەرکەوت کە خەیانەتکارە. ئێستا دەمهەوێ ئەو کابرایە تاقی کەمەوە بزانم هەر خوێڕییە پیاو و ســـەرگرە یان پیاوێکی ئازا و بە زیپک و زاکوونە. قەمەروززەمان پرســـی: «چۆنی تاقی دەکەیەوە؟» باوکی گوتی: «بە تەمام لەگەڵ ژنەکەی ئاشتی کەمەوە، ئەگەر ئەو پیاوە لە ژنەکەی خۆش بوو، چاوپۆشی لێ کرد. ئەوە بە شیرێک دوو قاشـی دەکەم و ژنەکەشـی و کەنیزەکەشـی دەکوژم. چون ژن و پیاوی حیز شـیاوی ژیان نین. ئەگەر بێتوو لەگەڵم ئاشـــت نەبێتەوە و نەیهەوێ خۆی لێ دا و لێی خۆش نەبێ. ئەوە خوشـــکەکەتی لێ مارە دەکەم و دوو بەرابەری ئەو ماڵەی هێناوتە دەیدەمەوە.»

قەمەروززەمان گوتی: «چۆنت پێ باشە وا بکە.»

ئەوجار عەبدوڕڕەحمان چووەوە بۆ لای کابرای گەوهەرفرۆش و پێی گوت: «مامۆستا، هەڵکردن لەگەڵ ژنان، دڵێکی گەورە و لێبووردەی دەوێ. هەر کەس ئاشقی ژنان بێ، دەبێ بە سنگێکی فرەوانەوە لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکا و لەگەڵیان دلۆڤان بێ و زۆر شت بە دڵ نەگرێ. چونکە ئەوان بە هۆی جوانی و دەلالییەکەیانەوە پیاوان ئازار دەدەن و زوڵمیان لێ دەکەن. دەیانهەوێ خۆیان گەورە و سەروەر پیشان بدەن و پیاوان بە کەم بگرن. بە تایبەت ئەگەر بزانن پیاوان زۆر مردوو و پاپایانن. لەو کاتانەدا بە ناز و غەمزەتر دەبن و کاری نەشیاو دەکەن. ئەگەر بێت و پیاو بە زۆر شت نارەحەت بێ ئەوە پێکەوە ناسازێن و کێشەیان لە نێواندا دروست دەبێ. واتە هیچ پیاوێک ناتوانێ لەگەڵ ئەو جۆرە ژنانە هەڵبکا مەگین زۆر بە سەبر و لێبووردە بێ و حازر بێ دان بە خۆیدا بگرێ. ئەگەر پیاوەش لە ژنە قەبووڵ نەکا و لە کارە نەشیاوەکانی خۆش نەبێ، کارەکەی تۆزێک قورستر دەبێ. چونکە لێ بووردن لە لوتکەی دەسەلاتدا کاری جوامێرانە. ئەوە ژنی تۆیە و چەند ساڵە لەگەڵی دەژی. جێی خۆیەتی لێی خۆش بی. چونکە ژنان لە عەقڵ و دیندا کەمیان هەیە. ئەگەر هەڵەیەکی کردبێ ئێستا تۆبەی کردووە و پەشیمانە و تازە قەتی ناکاتەوە. ئەمن پێم باشە لەگەڵی ئاشت بییەوە. ئەمن ماڵ و سامانی دوو بەرابەری ئەوەی خۆتت دەدەمێ. ئەگەر لێرە بژی، لە خۆشەویستی و مێهرەبانی زیاتر هیچ نابینی. ئەگەریش بشتهەوێ بڕۆی ئەوە هێندەت دەدەمێ ڕازی بی. چەندین کەژاوەت بۆ ساز دەکەم. ژنەکەت لە کەژاوە خەو برۆوە.»

زێڕینگەر پرسی: «گەورەم، ژنەکەم لەکوێیە؟» بازرگان وڵامی داوە: «ئەوە لە دیوێک دایە. ئێستا بچووە بۆ لای. هیچ دڕدۆنگیش مەبە کاتێک کوڕەکەم ئەوی هێناوە ئێرە نەمهێشت زەماوەندی لەگەڵ بکا و لەو دیوەم کرد و دەرگام لە سەر داخست. لە دڵی خۆمدا گوتم: «حەتمەن مێردەکەی وە دووی دەکەوێ و دێ. من دەبێ بیدەمەوە بە مێردکەی خۆی. چونکە ئەو ژنە زۆر جوانە مێردەکەی قەت ناتوانێ دەستی لێ هەڵگرێ. وا بوو شوکری خودا قسەکەم هاتە دی و ئەوە پێک گەیشتنەوە. کچێکی دیکەشم لە کوڕەکەم مارە کرد و هەر ئەو میوانداریيە بە بۆنەی ئەوەوە بوو. ئەوشەو قەرارە بچنە پەردەوە. ئەوەش کلیلی ئەو دیوەیە کە ژنەکەی تۆی لێیە. بە ڕوویەکی خۆشەوە بچووە ژوورێ و بە خۆشەویستییەوە لەگەڵی بدوێ و هەتا لێی تێر نەبی لەو دیوە مەیە دەرێ.» گەوهەرفرۆشەکە گوتی: «ماڵت ئاوەدان بێ و خودا پاداشی باشەت بداتەوە.»

ئیدی کلیلەکەی وەرگرت و بە کەیف سازییەوە چوو بۆ دیوی ژنەکەی. بازرگان وایزانی ئەوە بە قسەکانی ئەو لێی خۆش بووە. هەر بۆیە بازرگانیش دەستی دا شیرەکەی و بە دوایدا ڕۆیشت و لە پەنایەکدا خۆی مات دا. تا بزانێ چی دەکەن. [بازرگان با لەوێ بێ.]

زێڕینگەرەکە چووە بەر دەرکی دیوەکەی ویستی قفڵی دەرگاکە بکاتەوە، گوێی لە دەنگی گریانی ژنەکەی بوو کە لەبەر زەماوەندی قەمەروززەمان نارەحەت بوو دەگریا. گوێی لە دەنگی کەنیزەکەی بوو کە دەیگوت: «ئاخە خانم چەندم پێ گوتی ئەو کوڕە بۆ تۆ نابێ دەستی لێ هەڵگرە. بە قسەت نەکردم. هەتا تەواوی ماڵی مێردەکەشت بە با دا و بۆخۆشت هەڵوەدای ئەو شـــارە و شـــار بووی. گیرۆدەی ئەوینی ئەو کوڕە بووی بە دوایدا هاتی. ئێســـتاش کوڕە، ئەوە لەگەڵ یەکی دیکە زەماوەندی کرد و تۆی لێرەدا زیندانی کرووە و هەر لە بیریشی نی.» گوێی لێ بوو، ژنەکەی لە کەنیزەکەی تووڕە بوو پێی گوت: «بێدەنگ بە گلاو، هەرچەند لەگەڵ یەکی دیکەدا زەماوەندی کردووە بەڵام ڕۆژێک هەر منی وەبیر دێتەوە، هەر بۆیە ئەمن قەتی لە بیر ناکەم.

هەرچەنـد ئەو بـڕوا و مـن بـکـا لە بـیـر
دەیـان کـیـژی دی بـکـاتە نـێـچـیـر
لـێـی زویـر نـابـم و لە بـیـری نـاکەم
گەر بـێـتـوو سـیـنـگـم بـداتە بەر تـیـر

ئەو ئاخری منی وەبیر دێتەوە و لێم دەپرسێ. قەت لە خۆشەویستی ئەو پەشیمان نیم و دەست لە ئەڤینی هەڵناگرم. ئەگەر لە زینداندا بشمرم.

کاتێک زێڕینگەرەکە ئەو قسانەی بیست بۆی چووە ژوورێ و پێی گوت: «ئەی خائینی سـوزانی، ئەتۆ هەموو عەیب و ئیرادێکت بووە و من نەمزانیوە. ئەگەر بمزانیبا تۆ یەک دانە ئیرادەت هەیە قەتم ڕانەدەگرتی. ئێســتا کە دەزانم تاوانباری ســەرەکی تۆی، کوشــتنت لە ســەرم فەرزە، هەر چەند لە ســەر تۆ بشــم کوژنەوە. ئینجا هەڕای کردێ و بە هەردووک دەست ئەوکی ژنەکەی گرت و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

پـیـاو وەکـوو هەیـڤە و ژن هەوری تـارە
لێڵ و تاری مانـــــــــــــــگ لە ژنەوەیە
پـیـاو بەفـری ســـپـی، ژن دووکەڵـی ڕەش
چـی ڕەشـــی و پـیـســـیـیە هەر لەوەوەیە

دوای ئەوە ملی گرت و تێکی شکاند. کەنیزەکە هاواری کرد: گەورەم، گەورەم. زێڕینگەر ڕووی لەویش کرد و گوتی: «قەحبە گوناهی تەواوی ئەوانە لە ئەستۆی تۆیە، چونکە تۆ بە هەموو شتێکت دەزانی و بە منت نەگوتووە. ئینجا قورقڕۆچکەی ئەویشی گرت و خنکاندی. زێڕینگەرە خەریکی کوشتنی ئەوان بوو، عەبدوڕڕەحمانیش بە شیرەوە لە پشت دەرگاکە

راوەستابوو بزانێ بە کوێ دەگا. گەوهەرفرۆشەکە کە ئەوانی لە یەکێک لە دیوەکانی ماڵی بازرگاندا کوشت، ترسی ڕێنیشت و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەگەر بازرگان بزانێ ئەوانەم کوشتووە دەمکوژێتەوە. هەر ئاوا لە گژ فکراندا ڕۆ چووبوو، کە لە پڕدا عەبدوڕڕەحمان لێی هاتە ژوورێ و پێی گوت: «مەترسە، چونکە تۆ شیاوی ڕێز لێ گرتنی. ئەمن بڕیارم دابوو ئەگەر بێتوو تۆ لەگەڵ ئەو ژنەت ئاشت بووبایەتەوە تۆش و ئەویشم دەکوشت. ئێستا کە خۆت ئەو کارەت کرد و کوشت، منیش دەستخۆشانە کچەکەی خۆمت لێ مارە دەکەم.

عەبدوڕڕەحمان، شێخولئیسلام و گەورەکانی شاری کۆ کردەوە و گوتی: «شێخولئیسلام، کەوکەبولسەباحی کچم لە عوبەیدی زێڕینگەر مارە بکە و تەواوی مارەییەکەشم پێ گەیوە. شێخولئیسلام لێی مارە کرد و شەربەت خوراوە و هەر دوو زەماوەندەکەیان بە یەکەوە جێژن گرت. لە یەک شەودا کچی شێخولئیسلامیان بۆ قەمەروززەمان و کچی عەبدوڕڕەحمانیشیان بۆ عوبەیدی زێڕینگەر گوێستەوە.

کاتێک زێڕینگەر چووە پەردەی کەوکەبولسەباح، دیتی هەزار بەرابەری ژنەکەی خۆی جوانتر و دڵگیرترە. کردی بە ژن و بەیانی زوو لەگەڵ قەمەروززەمان چوون بۆ گەرماو. ئیدی هەتا ماوەیەکی زۆر بە خێر و خۆشی لەگەڵ ئەوان ژیا. ئەوجار بە عەبدوڕڕەحمانی گوت: «گەورەم لە شاری خۆمان باغ و مەزرایەکی زۆرم هەیە و دووکانم بە سەر وەستاکاردا بەجێ هێشتووە. ئەگەر ڕێم بدەی پێمخۆشە بچمەوە باغ و مەزرا و ماڵ و شتەکەم بفرۆشم و ئەوجار بێمەوە خزمەتت. جا نازانم ڕێم دەدەی یان نا؟» بازرگان گوتی: «چۆنت پێ خۆشە وا بکە و کەس بۆی نییە ڕێت لێ بگرێ. «خۆشەویستی وڵان بەشێکە لە ئیمان» بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە کە چوویەوە بۆ شارەکەی خۆت تێدا بمێنی[1] بێیەوە یا لەوێ بمێنییەوە. وا باشە ژنەکەشت لەگەڵ خۆتدا بەری. دوای ئەوە ئەگەر ویستت بێیەوە ئێرە لەگەڵ ژنەکەت وەرەوە. چونکە ئێمە تەڵاق و شتە نازانین و هیچ ژنێکیش دوو جار مارە ناکرێ. زێڕینگەر گوتی: «مامە دەترسم، کچەکەت پێی خۆش نەبێ کۆچ بکا.» عەبدوڕڕەحمان گوتی: «ڕۆڵە گیان، ژنانی ئێمە دژایەتی ویستی مێردەکانیان ناکەن.» زێڕینگەرە گوتی: «خودای تەعالا بەرەکەت بخاتە خۆتان و ژنەکانتان.»

دوای ئەوە گەوهەرفرۆش چووەوە لای ژنەکەی و پێی گوت: «ئەمن بە تەمام بچمەوە شارەکەی خۆم.» ژنە وڵامی داوە: «تا من کەچین بووم، لە ژێر فەرمانی باوکمدا بووم و ئێستاش کە مێردم کردووە لە ژێر فەرمانی تۆ دام و قەتیش ناتوانم دژایەتیت بکەم.» ئیدی کاکی گەوهەرفرۆش خەریکی خۆ تەیارکردن بوو بۆ سەفەر. عەبدوڕڕەحمان ماڵێکی زۆری دایە و ماڵاوایی لێ کرد. گەوهەرفرۆش لەگەڵ ژنەکەی کەوتە ڕێ. شەووڕۆژ ڕۆیشتن هەتا

---

[1]. تێدا مان: دوو دڵ بوون، لە شکدا بوون.

گەیشتنە ناو شاری بەسرە. خزم و کەس و ناسیاو دەهاتن بۆ دیمانەتیان وایان دەزانی لە سـەفەری حەج هاتوونەوە. تاقمێک بە هاتنەوەیان خۆشـحاڵ و تاقمێک نارەحەت بوون. بە یەکتریان دەگوت: «ئیدی دەبینی هەر وەک جاران ڕۆژانی هەینی ژیانمان لێ تاڵ دەکا و لە ماڵ و مزگەوتەکاندا حەبسمان دەکا. [ئەوەش بەسەرهاتی کابرای گەوهەرفرۆش.]

بەڵام پادشـای بەسـرە کە لە پێشـدا ڕقی لێ هەڵگرتبوو، بیستییەوە هاتەووەتەوە. بانگی کرد و لێی پرسـی: «ئەوە بۆ چووی بۆ سـەفەر و بە منت نەگوت؟» زێڕینگەڕ وڵامی داوە: «ببوورە بە خودا نەچووم بۆ حەج و ئەمن شتێکی ئاوام بۆ هاتە پێشێ. ئیدی بەسـەرهاتی خۆی لە سـەرەتاوە تا دوماییی بۆ گێڕاوە. کاتێک پادشـا بیسـتی ڕەوشـتی کچی عەبدوڕڕەحمانی بازرگان چۆنە، گوتی: «ئەگەر لە ترسـی خودا بم وێرا بایە، تۆم دەکوشت و ئەو کچە جوان و نەجیبەم لە خۆم مارە دەکرد. ماڵ و خەزێنەیەکی زۆرم لە ڕێیدا خەرج دەکرد. چونکە کچی ئاوا جگە لە پادشـا شـیاوی کەس نییە. بەڵام خودا لێتی مەبارەک کا. ئیدی پادشـا دیاری و خەڵاتێکی زۆری دا بە زێڕینگەر و بەڕێی کرد. زێڕینگەر هەتا پێنج سـاڵان لەگەڵ ئەو کیژە جوانەدا ژیا و پاشـان کۆچی دوایی کرد. ئەوجار پادشـا ناردییە خوازبێنی کەوکەبولسـەباح. کەوکەبولسـەباح قەبووڵی نەکرد و گوتی: «لە هۆزی ئێمەدا کەسم نەدیوە دوای مردنی مێردەکەی مێردی کردبێتەوە. ئەمنیش دوای ئەو مێرد ناکەمەوە ئەگەر بشم کوژن. پادشای بەسرە کەسێکی نارد بۆ لای کەوکەبولسەباح و پێی گوت ئەگەر پێت خۆش بێ دەتنێرمەوە بۆ شـارەکەی باوکت. ژنی زێڕینگەر وڵامی بۆ ناردەوە ئەگەر گەورەیی بفەرموون پاداشەکەی دەبیننەوە.

ئینجا پادشا ماڵ و سامانەکەی زێڕینگەری پێچاوە و بۆخۆشی ماڵێکی زۆری پێشکەش کرد. شەشسەد سواری لەگەڵ خست و هەتا گەیاندیانەوە لای باوکی بەڕێیان کرد. لە دوای ئەوە ئەو فریشتەئاکارە هەتا مرد بە تەنیا ژیا.

جا پادشـا، کاتێک ئەو ژنە ڕازی نەبوو دوای مێردەکەی مێرد بە پادشـایەک بکا. چۆن ڕازی دەبێ لە کاتێکدا مێردی هەیە کۆیلەیەک بە خۆی فێر بکا؟ هەر کەس وا بیر بکاتەوە کە ژنان هەموو وەک یەکن، بزانە تەواو نییە و قەت لە دونیا نەگەیشـتووە و قەتیش تێ ناگا. هەر خودا بۆخۆی باشتر دەزانێ.

### بەسەرهاتی عەبدوڵڵا فازل

خاوەنشـکۆ، یەکێکی دیکە لە بەسـەرهاتەکان ئەوەیە کە دەگێڕنەوە: ڕۆژێک لە ڕۆژان خەلیفە هاروونەڕڕەشـید خەریک بوو چاوی لە پیتاکی شـارەکان دەکرد و بە سـەری دەکردنەوە، دیتی پیتاکی تەواوی شـار و گوندی دوور و نیزیک کۆ کراوەتەوە جگە لە

بەسرە، کە لەوێوە هیچ نەگەیشتووە. جەعفەر گوتی: «خەلیفە ڕەنگە بریکاری بەسرە کارێکی بۆ هاتبێتە پێشێ و لەبەر سەرقاڵیان پیتاکی بەسرەی نەناردبێ. دەفەرمووی کەسێکی لێ ڕاسپێرم.» خەلیفە فەرمووی: «ئەبووئسحاقی نەدیمی موسڵی بنێرە. جەعفەر گەڕاوە ماڵێ و چوو ئەبووئیسحاقی هێنا و نووسراوەیەکی بۆ نووسی و دایە دەستی و پێی گوت: «بچووە بۆ لای عەبدوڵڵا قازل، بریکاری بەسرە و بزانە بۆ ئەو پیتاکەی نەناردووە؟ خێرا لێی وەرگرە و بیهێنە. ئەگەر پیتاکەکەی نەنارد و بڕوبیانووی هێناوە ئەوە عەبدوڵڵای لەگەڵ خۆت بێنە. با هۆکاری نەناردنەکەی بە خەلیفە بڵێ.»

ئەبوو ئیسحاق فەرمانی خەلیفەی بەجێ هێنا و لەشکرێکی پێنج هەزار کەسی لەگەڵ خۆی برد و بەرەو بەسرە کەوتە ڕێ. کە گەیشتە بەسرە عەبدوڵڵا فازل بە هاتنی ئەوانی زانی و لەگەڵ هێندێک لە گەورە گەورەکانی بەرەو پیریان چوو. بە ڕێز و شکۆیەکی زۆرەوە هێنایاننە ناو شاری بەسرە و بردنییە کۆشکەکەی خۆیەوە و میوانداری کردن. کاتێک ئەبوو ئیسحاق هاتە دیوانەوە لە سەر کورسی دەسەڵات دانیشت. عەبدوڵڵا قازلی لە پەنای خۆی دانا و گەورەکانیش هەر کەسەی لە شوێن و پێگەی خۆی دانیشت. دوای ئەوە عەبدوڵڵا قازل بە ئەبووئیسحاقی گوت: «گەورەم خێرە تەشریفتان هێناوە؟» ئەبووئیسحاق گوتی: «لەبەر پیتاک هاتووین، خەلیفە پیتاکەکانی بەسەر کردووەتەوە و دیوییە پیتاکی بەسرە نەهاتووە و وەدەرنگی کەوتووە.» عەبدوڵڵا گوتی: «گەورەم خۆزگە خۆتان هیلاک نەدەکرد و ئەو هەموو زەحمەتەتان وەبەر خۆتان نەدەدا. تەواوی پیتاکەکەم ئامادە کردووە بە تەما بووم سبەینێ بینێرم. بەڵام ئێستا کە تەشریفتان هێناوە سێ ڕۆژان میوانی خۆم دەبن و پاشا پیتاکەکەتان تەحویل دەدەم. ئێستا ئەو دیارییانەی کە خەلیفە بۆی ناردووم پێشانتی دەدەم.» ئەبووئیسحاق گوتی: «چیت پێ خۆشە بیکە. دوای ماوەیەک هەستا لە دیوان چوونە دەرێ و چوونە کۆشکێکی زۆر خۆش. عەبدوڵڵا فەرمانی دا خوانیان بۆ ئەبووئیسحاق و هاوڕێکانی ڕاخست. خواردنەکەیان خوارد و دەستیان شوت. قاوە و شەربەتیان خواردەوە و دەستیان کرد بە قسە کردن. هەتا یەک لەسەر سێی شەو تێپەڕی. دوای ئەوە لە سەر کەتێکی شفرەیی جێیان ڕاخست. ئەبووئیسحاق لەوێ خەوت. بریکاری بەسرەش کەمێک لەولاترەوە لە سەر کەتێکی دیکە خەوت. ئەبووئیسحاق خەوی زڕا و بە بیر کردنەوە لە شێعر و قسەی نەستەق و شتی وا بەشی دووەمی سێبەشی شەوی تێپەڕ کرد. کە عەبدوڵڵا فازل ئارام لە جێیەکەی هاتە دەرێ و پشتێندی بەست و دەرکی گەنجەیەکی کردەوە و قامچییەکی دەرهێنا و مۆمێکی هەڵکراوی هەڵگرت و لە کۆشک چووە دەرێ. لاشی وا بوو کە ئەبووئیسحاق خەوی لێ کەوتووە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی نۆسەد و حەفتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک عەبدوڵلا فازل لە کۆشک چووە دەرێ، ئەبووئیسحاق پێی سەیر بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «عەبدوڵلا بۆ دەستی دا ئەو قامچییە و چوو بۆ کوێ؟ ڕەنگ بێ، بە تەما بێ لە کەسێک بدا. وەڵلاهی دەبێ، وە دوای کەوم، بزانم چی دەکا.» لەڕێوە ئەبووئیسحاق هەستا و بە هێواشی کەوتە شوێنی، بە جۆرێک کە عەبدوڵلا هەستی بەو نەدەکرد. سەیری کرد عەبدوڵلا چوو دەرکی دیوێکی کردەوە و مەجۆعمەیەکی هێنا کە چەند دەفەر خواردەمەنی و نان و گۆزەڵەیەکی ئاو لە سەر بوو. بردی هەتا چوو لە حەوشەیەکەوە. ئەبووئیسحاق لە پشت دەرکەکە ڕاوەستا و لە کەلێنێکەوە تەماشای ژوورێی کرد. دیتی ئەوە خانوویەکی گەورەیە و فەرشی گرانبایی تێدا ڕاخراوە و دوو تەختی شفرەیی لە نێوە ڕاستی حەوشەکە داندراوە. دوو دانە سەگ بە زنجیری زێڕین بە پێچکەی تەختەکانەوە بەستراونەوە. دوای ئەوە ئەبووئیسحاق چاوی لێ بوو کە عەبدوڵلا مەجۆعمەکەی لەولا دانا و چوو یەکێک لە گەماڵەکانی کردەوە. ئەو گەماڵە بە دەوریدا مڵومۆی دەکرد و کلەکە سووتەی لە بەر دەکرد. بۆنی بە دەست و قاچی و عەرزەکەوە دەکرد، وەک ئەوەی پێ و قەدەمی ماچ کا. بە دەنگێکی نزم نووزە نووزی لە بەر دەکرد. دوای ئەوە عەبدوڵلا دەست و پێی بەست و لە سەر زەوی درێژی کرد و بە قامچی ئەوەندەی لێ دا هەتا سەگەکە بێ هۆش بوو. ئەوی برد لە جێی خۆی بەستییەوە و چوو گەماڵەکەی دیکەشی هێنا و ئەویشی ئاوا لێ کرد. وەک ئەوەی لەوەی ئەووەڵێی کرد. دوای ئەوە پەڕۆیەکی دەر هێنا و فرمێسکی لە سەروچاویان سترِی و دڵخۆشی دانەوە و گوتی: «لێم ببوورن بە خودا خۆ من ئەو کارەم پێ خۆش نییە و زۆریشم لەبەر گرانە ئاواتان دەبینم. هیوادارم خودا خۆی فریاتان کەوێ و لەو مەینەتبەشییە ڕزگارتان کا. ئەبووئیسحاق کە ئاوای دیت و ئەو قسەیەی بیست، سەری سووڕ ما. دوای ئەوە عەبدوڵلا بۆخۆی مەجۆعمەی لە پێش دانان و بە دەستی خۆی پارووی بۆ لە زاری دەخستن هەتا تێریان خوارد. ئەوجار دمی بۆ سترِین و دەستی دا گۆزەڵەکە و ئاویشی دان. دوای ئەوە گۆزەڵە و مەجۆعمە و مۆمەکەی هەڵگرت و ویستی بێتە دەرێ. ئەبووئیسحاق گورج خۆی دەرباز کرد و لە پێش ئەودا هاتەوە لە سەر تەختەکەی خۆی و خەوت. عەبدوڵلا فازل نەیزانی کە ئەبووئیسحاق وەدوای ئەو کەوتووە و بە کارەکەی زانیوە. دوای ئەوە عەبدوڵلا فازل مەجۆعمە و گۆزەڵەکەی بردەوە شوێنەکەی خۆی و پاشان هاتەوە ژوورێ و قامچییەکەی خستەوە ناو گەنجەکە و جلەکانی داکەند و خەوت.

ئەبووئیسحاق ئەو شەوە هەر خەوی لێ نەکەوتوو هەتا بەیانی هەر بیری لەو کارە سەیرە کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە هەستا نوێژەکەی کرد و قاوە و شەربەتیان خواردەوە و

چوون بۆ دیوان. ئەو ڕۆژە ئەبووئیســـحاق هەر فکری بەو کارەوە خەریک بوو. بەڵام هیچ پرســـیارێکی لەو بارەوە لە عەبدوڵڵا نەکرد و لە هۆکارەکەی نەپرســـی. شـــەوی دووەم و سێیەمیش عەبدوڵڵا ئەو کارەی کردەوە. ئەبووئیســحاقیش هەموو شــەوێ بە دوایدا دەچوو ســـەیری دەکرد. کە ســـێ ڕۆژە تەواو بوو، پیتاکیـان بۆ ئەبووئیســـــحاق ئامادە کرد. ئەبووئیســـــحاق پیتاکەکەی وەرگرت و بەرەو بەغدا کەوتنە ڕێ. لە لای عەبدوڵڵا هیچی نەدرکاند. هەتا گەیشـــتنەوە بەغدا و پیتاکەکەیان تەحویلی خەلیفە دا. خەلیفە پرســـیاری لە هۆکاری درەنگ ناردنی پیتاکەکە کرد. ئەبووئیســـــحاق گوتی: «خەلیفەی بەڕێز، بریکاری بەسرە پیتاکەکەی ساز کردبوو بە تەما بوو بینێرێ کە ئێمە گەیشتینێ. ئەگەر ئێمە ڕۆژێک درەنگتر گەیشــتباین لە ڕێگادا تووشـــی یەکتر دەبووین. بەڵام شـــێتکم بە عەبدوڵڵای بنی فازلەوە دیت زۆرم پێ ســەیر بوو. لە تەواوی ژیانمدا شــتی ئاوام نەدیوە.» خەلیفە پرســی: «ئەبووئیســحاق چیت پێوە دیوە؟» گوتی: «ئەو ســێ شــەوەی لەوێ بووم هەموو شــەوێ ئەو کابرایە، دەچوو خواردمەنی و شـــتی دەبرد بۆ دوو دانە گەماڵ کە لە حەوشـــــەیەکدا بەســتبوونییەوە. لە پێشــدا بە قامچی تێری لێ دەدان و پاشــان خواردەمەنی و شــتەکەی دەدانێ و دڵخۆشـــی دەدانەوە. ئەمنیش ئەوە لە شــوێنێکە کە ئەو منی لێ دیار نەبوو. ئاگام لێی بوو.» خەلیفە پرســی: «لێت پرســی ئەوە چ باســە؟» ئەبووئیســـحاق گوتی: «ناوەڵڵا، نەمپرسی.» خەلیفە گوتی: «ئەبووئیسحاق، دەبێ بۆخۆت بگەڕێیەوە بۆ بەسرە و عەبدوڵڵا و ئەو دوو گەمـاڵە بێنییە ئێرە.» ئەبووئیســـــحاق وڵامی داوە: «خەلیفە بە قوربـانت بم، عەبدوڵڵا لە ڕێز و حورمەتدا هیچی تێدا نەهێشـــتەوە ئابڕووم دەچێ دەڵێ، ســـیخوڕی بە سەرەوە کردووم. توخودا یەکی دیکە بنێرە. ئەمن هەر بە ڕێکەوت بەو شتەم زانی. چۆن لە ڕووم هەڵێ بگەڕێمەوە پێی بڵێم بەو کارەی تۆم زانیوە بۆ خەلیفەم گێڕاوەتەوە. وا جوانە نامەیەکی بۆ بنووســـی و بە یەکی دیکەدا بۆی بنێری. هەتا عەبدوڵڵا و دوو ســـەگەکەی بێنێ.» خەلیفە گوتی: «شیمانەی ئەوە دەکرێ ئەگەر کەسێکی دیکە بنێرم، نکۆڵی لێ بکا و بڵێ ئەمن ســەگ و شــتم نییە و نازانم باسی چی دەکا. بەڵام ئەگەر تۆ بنێرم و بڵێی کە لە فڵان جێ بە چاوی خۆم دیتمی، ناتوانێ نکۆڵی لێ بکا. هەر بۆیە دەبێ بۆخۆت بچی دەنا دەکوژرێی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شه‌وی نۆسه‌د و هه‌شتایه‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشکۆ! ئه‌بووئیسحاق که فه‌رمانی خه‌لیفه‌ی بیست، گوتی: «به چاوان، ڕاسته ده‌ڵێن ئه‌گه‌ر زمان لێ گه‌ڕێ سه‌ر سلامه‌ته. تازه ده‌بێ هه‌ر بچم ئه‌وه له‌تمێکه و بۆخۆم له خۆم کردووه. له ئه‌ووه‌ڵه‌وه نه‌ده‌بوو بیگێڕمه‌وه. تازه که وای لێ هات، نامه‌یه‌کی بۆ بنووسه با بڕۆم.» خه‌لیفه نامه‌یه‌کی بۆ نووسی و ئه‌بووئیسحاق به‌ره‌و به‌سره که‌وته ڕێ. که گه‌یشته‌وه لای بریکاری به‌سره، عه‌بدوڵلا فازل گوتی: «ئه‌بووئیسحاق خودا له شه‌ڕی گه‌ڕانه‌وه‌تم بپارێزێ. ئه‌وه چۆنه وا زوو گه‌ڕایه‌وه؟ پیتاکه‌که‌ی پێ که‌م بوو، خه‌لیفه قه‌بووڵی نه‌کرد چی؟» ئه‌بووئیسحاق گوتی: «ئه‌میر، هۆی گه‌ڕانه‌وه‌م که‌می پیتاک نه‌بوو، ته‌واو بوو. خه‌لیفه‌ش قه‌بووڵی کرد. به‌ڵام تکایه‌کم لێت هه‌یه، ئه‌گه‌ر هه‌ڵه‌یه‌کم له حه‌قی تۆدا کردبێ لێم خۆش به و ئه‌وه‌ش بزانه که قه‌زا و قه‌ده‌ر بووه.» عه‌بدوڵلا پرسی: «چیت کردووه بیڵێ؟ تۆ هاوڕێی منی و من قه‌ت لێت ناپرسمه‌وه بۆ وات کردووه.» ئه‌بووئیسحاق گوتی: «ئه‌و چه‌ند شه‌وه‌ی له لای تۆ بووم. کاتێک ده‌چووی بۆ لای ئه‌و سه‌گانه به دواتدا هاتم. پێم سه‌یر بوو، بۆم جێی پرسیار بوو. له ڕووم هه‌ڵنه‌هات لێت پرسم. دوای ئه‌وه‌ی چوومه‌وه به‌غدا هه‌ر وا به‌سه‌ردا که‌وتم و له لای خه‌لیفه باسم کرد. خه‌لیفه فه‌رمانی پێ کردم بێمه‌وه ئێره و ئه‌وه‌ش نامه‌ی خه‌لیفه. ئه‌گه‌ر بشم زانیبا ئاوای لێ دێ قه‌تم نه‌ده‌گێڕاوه. به‌ڵام تازه وای لێ هات.»

کورتی که‌ینه‌وه، ئه‌بووئیسحاق داوای لێبووردنی له عه‌بدوڵلا کرد، عه‌بدوڵلا گوتی: «ئێستا که له لای خه‌لیفه گێڕاوته‌ته‌وه منیش پشتی قسه‌که‌ی تۆ ده‌گرم و ڕاستییه‌که‌ی ده‌ڵێم. ئه‌گه‌ر جگه له تۆ هه‌رکه‌سی دیکه ئه‌و قسه‌یه‌ی گێڕاباوه ئه‌وه حاشام لێ ده‌کرد. به‌ڵام هه‌ر ئێستا له‌گه‌ڵت دێم و سه‌گه‌کانیش له‌گه‌ڵ خۆم دێنم. ئه‌گه‌ر له سه‌ر ئه‌وه بشکوژرێم. ئه‌بووئیسحاق گوتی: «خودا فریات که‌وێ وا تۆ له لای خه‌لیفه منت وه‌درۆ نه‌خسته‌وه.» دوای ئه‌وه دیاری شیاوی پێچاوه و سه‌گه‌کانیشی به زنجیری زێڕینه‌وه له وشتران دا و به‌ره و به‌غدا که‌وتنه ڕێ. که‌یشتنه لای خه‌لیفه سڵاوی کرد کڕنۆشی برد. خه‌لیفه فه‌رمووی کرد دانیشی. عه‌بدوڵلا دانیشت و سه‌گه‌کانیشیان هێنا. خه‌لیفه پرسی: «ئه‌و سه‌گانه چین؟» سه‌گه‌کان له پێش خه‌لیفه ناوچاوانیان به عه‌رزه‌وه نا و ماچیان کرد. ده‌ستیان کرد به ملومۆ و کلکه‌سووته و گریان. وه‌ک ئه‌وه‌ی هانایان بۆ خه‌لیفه هێنابێ. خه‌لیفه سه‌ری له کاری ئه‌و سه‌گانه سووڕ ما. به عه‌بدوڵلای گوت: «پێم بڵێ ئه‌و سه‌گانه بۆ ئازار ده‌ده‌ی و دوایه‌ش نازیان ده‌کێشی و دڵخۆشیان ده‌ده‌یه‌وه؟» عه‌بدوڵلا گوتی: «خه‌لیفه، ئه‌وان سه‌گ نین و به‌ڵکوو ئه‌وانه دوو لاوی قۆزی باڵا عه‌رعه‌ڕن. که برای دایک و بابی منن.» خه‌لیفه پرسی: «ئه‌ی چۆن مرۆڤن و بوون به سه‌گ؟!» عه‌بدوڵلا گوتی:

«ئەگەر ئیزنتان لە ســەر بێ بۆتان دەگێڕمەوە.» خەلیفە گوتی: «باشــە ڕاســتییەکەی بڵێ، چونکە هەر ڕاستی ڕزگاری لە دووە.» عەبدوڵڵا گوتی: «خەلیفە جا ئەوە بۆخۆشیان لێرەن ئەگەر من لە ڕاســتی لادەم.» خەلیفە گوتی: «جا ئەو ســەگانە چووزانن تۆ شــتەکەی بە ڕاست دەگێڕییەوە یان نا. ئەوانە چۆن دەتوانن بڵێن وا نییە؟» ئیدی عەبدوڵڵا بە سەگەکانی گوت: «براکانم ئەوە من بەســەرهاتی ئێوە دەگێڕمەوە ئەگەر ڕاســت بوو، ئەوە چاوتان لە سەر یەک دانێن و کەمێک سەر داخەن. ئەگەر زانیتان درۆ دەکەم ئەوە چاوتان بکەنەوە و چاو لەملا و لەولا بکەن.»

عەبدوڵڵا گوتی: «خەلیفە ئێمە ســێ برا بووین لە دایک و بابێک. بابمان ناوی فازل بوو. دایکم لە پێشدا ئەو برایەمی بوو ناوی نا مەنسوور. دوای ئەو بەو برایەی دیکەم دووگیان بوو. کە ئەوی بوو ناوی نا ناســـر. ئەوجار دووگیان بوو، منی بوو. ناوی منیشـــی نا عەبدوڵڵا. ئێمەیان پەروەردە کرد تا گەورە بووین. وا بوو باوکم مرد. دووکانێکی پڕ لە کەلوپەلی گرانبایی و ماڵێکی گەورە و شەست هەزار دیناری زێڕی بۆ بەجێ هێشتین. ئێمە بابمان کفن و کرد و بە خاکمان سپارد. گومبەزێکمان لە ســەر گڵکۆکەی ســاز کرد و هەتا چل ڕۆژان تــازیەمــان بۆ ڕاگرت. فەقیر و هەژارانمــان نــان دا. ئینجــا بــازرگــان و پیــاو مــاقوڵانمــان بــانــگ کرد و میوانــدارییەکی بــاشـــــمــان کردن. دوای ئەوە گوتمــان: «میوانە بەڕێزەکان، ئەم دونیایە کۆتایی دێت و ئەو دونیا هەتا هەتاییە، گەلۆ دەزانن بۆ ئێوەمان بانگهێشـــت کردووەتە ئێرە؟» گوتیان کە هەر خودا ئاگای لە دەروونەکان هەیە. گوتم: «باوکم، ماڵێکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەمن نیگەرانی ئەوە بووم کە کەسێک حەقێکی بە لای بابمەوە بێ، ئەگەر کەســێکی وا هەیە با بێ دەنگ بکا و حەقەکەی بدەینەوە.» بازرگانەکان گوتیان کە ئێمە هەموومان دەزانین کە ماڵی دونیا لەو لا فریای کەس ناکەوێ و حەڵاڵ و حەرام لێک دەکەینەوە. باوکی تۆش خوا لێی خۆش بێ هەمیشــە ماڵی لە لای خەڵک بووە و ماڵی کەســی گل نەداوەتەوە. ئێمە هەمیشــە لێمان دەبیســت. کە دەیگوت: «الهی انت ثقتی و رجائی فلاتمتنی و علی دین»(خودایە تۆ پەنا و پاڵپشـــتی منی، بە قەرزباری مەممرێنە.) یەکێک لە خووەکانی ئەو ئەوە بوو. ئەگەر زانیبــای شـــتێکی کەســـێکی دێ بە لایەوە نەیدەویســـت و ئەگەر زانیبای شـــتێکی دەکەوێتە لای کەســێک ئەوە لێی دەگوزەرا. ئەگەر کەســـێک قەرزباری با و نەیبا بیداباوە یا مردبا، دەیگوت: «ئەمن ئەوە لێی خۆش بووم، خودا لێی خۆش بێ.» ئێمە هەموومان شایەدین کە حەقی هیچ کەسێکی لە ئەستۆ نییە.

دوای ئەوە ڕووم لە براکانم کرد و گوتم: «براکانم، بابمان قەرزباری کەس نییە و ماڵ و دووکانی بۆ بەجێ هێشتووین. هەر یەکەی بەشمان بە یەک لە سەر سێی ئەو ماڵەوەیە. گەلۆ ئێوە ڕازین کە مــاڵەکە لێــک بڵاو نەکەین و پێکەوە هــاوبەش بین و خۆراک و پۆشاکیشمان یەک بێ یان بەشی کەین و هەر کەسەی بەشی خۆی هەڵگرێ؟» گوتیان بەشی

دەکەین و هەرکەسەی بەشی خۆمان هەڵدەگەرین. لێرەدا ڕووی لە گەماڵەکان کرد و گوتی: «برایینە، ئەوەی هەتا ئێرە گێڕاومەتەوە وا بوو یان نا؟» سـەگەکان چاویان قوچاند و سەریان داخست. وەک ئەوەی بڵێن، بەڵێ. عەبدوڵڵا گوتی: «ئەوجار قازی و کەیخودا هاتن و ماڵیان لێ بەش کردین. خانوو و دووکانەکە وەبەر من کەوت. براکانم زێڕ و کاڵا و کەلوپەلیان هەڵگرت. دوای ئەوە من دووکانم دانا و دەسـتم کرد بە کڕین و فرۆشـتن تا دووکانم پڕ کرد لە شتومەکی گرانبایی. هەر ئاوا بەردەوام خەریکی کڕین و فرۆشتن بووم.

براکانیشم، چوون شتومەکی بازرگانیان کڕی و لە کەشتیان دا و چوون بۆ شارەکانی دیکە. ئەمن پێم گوتن: «خوداتان لەگەڵ بێ، من ئاسـوودەیی وڵات بە ڕەنجی سـەفەر ناگۆڕمەوە. خودا ڕزقی منیش دەدا.» سـاڵێک درێژەم بەو کارە دا. خودا دەرکی ڕزق و ڕۆزی بە سـەرمدا کردەوە و قازانجێکی زۆری بە قسمەت کردم. هەتا وای لێ هات ماڵ و سامانەکەم بە قەد ئەو ماڵەی لێ هات کە باوکم بۆی بەجێ هێشتین.

ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت دانیشـتبووم و دوو دانە پەسـتەک لە کەوڵی بانبانک و کەوڵی سمۆرەم بە شانمدا دابوو. ئەودەم وەرزی زستان بوو. لە پڕدا براکانم پەیدا بوون. یەکی کراسـێکی کۆنیان لە بەردا بوو. لە سـەرمان لێویان سـپی سـپی هەڵگەڕابوو. وەک بێ دەلەرزین. من کە چاوم پێیان کەوت زۆر ناڕەحەت بووم. زۆرم خەم بوون.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی نۆسەد و هەشتاد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! عەبدوڵلا گوتی: زۆر زۆرم خەم بوون و بۆیان نارەحەت بووم. لە ڕێوە هەستام لە باوەشم گرتن و لە تاوان دەستم کرد بە گریان.کەڵپۆسە بانبانکەکەم دا بە یەکیان و ئەوی سـمۆرەکەشـم دا بە براکەی دیکەم. ناردمن بۆ گەرماو و یەکی دەسـتێک جلوبەرگی شیاوی بازرگانانم بۆ کڕین. کاتێک خۆیان شـوت و جلەکانیان لە بەر کرد و لە گەرماو هاتنە دەرێ. بردمنەوە ماڵی خۆم. سـەیرم کرد هێندە برسـی بوون سـەیر. سـفرەم بۆ ڕاخستن و ناردم خواردەمەنی باشیان هێنا و بۆخۆشم لەگەڵیان دانیشتم و خواردنەکەم لەگەڵ خواردن. لەگەڵیان زۆر ســـەروروو خۆش و دلۆڤان بووم. لەو جەنگەیەدا ڕووی لە سـەگەکان کرد و گوتی: «براکانم وا بوو یان نا؟» سـەگەکان چاویان قووچاند و سـەریان داخست.

ئەوجار عەبدوڵلا گوتی: «خەلیفە، کە سـفرەکەیان لا برد، من لێم پرسـین: «ئەوە چیتان لێ بەسـەر هاتووە بۆ ئاوا ڕووت و ڕەجاڵ بوون؟» گوتیان: «بە دەریادا ڕۆیشـتین، هەتا گەیشـتینە شارێک کە پێیان دەگوت کووفە. لەو شـارە کاڵایەک کە بە نیو دینارمان کڕیبوو، فرۆشـــتمانەوە بە دە دینار و یەک بە بیســـت قازانجمان کرد. لەوێش کاڵا و کەلوپەلی ناعەرەبمان یەکی بە دە دینار کڕی. هەر ئەوە لە بەســـرە بە چل دینار بوو. دوای ئەوە چووینە ناو شـار. لەوێش شـتمان کڕی و شـتمان فرۆشـت قازانجی باشمان کرد و ماڵێکی زۆرمان پێکەوە نا.»

کورتی کەینەوە، ئەوان یەک بە یەک باسـی شـارەکانیان دەکرد و دەیانگوت کە چەندیان خێر و قازانج بە قسـمەت بووە. ئیدی ئەمنیش لێم پرسـین: «باشـە ئەگەر ئێوە ئەوەندەتان قازانج کردووە ئەی بۆ ئاوا ڕووت و قووتن؟» ئاخێکیان هەڵکێشـــا و گوتیان: برا گیان، دونیا جێی بەقا نییە، ئێمە دوای ئەوەی ئەو هەموو ماڵەمـان کۆ کردبووەوە، ماڵمـان لە کەشـتی دا و بەرە بەسرە کەوتینە ڕێ. سـێ ڕۆژ لە دەریادا ڕۆیشـتین. بۆ ڕۆژی چوارەم. دەریا کەوتە جموجۆڵ و خرۆشا. شەپۆلی دەدا وەک کێو. بای دژبەر هەڵی کرد. کۆنترۆڵی کەشـتیمان لە دەسـت دەرچوو، خۆی بە کێوێک دادا و کەشـتی شـکا. خۆمان و ماڵەکەمان کەوتینە دەریاوە. شـەووڕۆژێک بە سـەر ئاوەوە ماینەوە. وا بوو خودای تەعالا کەشـتییەکی بۆ ناردین. دانیشـتوانی ناو کەشـتییەکە ئێمەیان گرتەوە و سـواری کەشـتییەکەیان کردین. شـار بە شـار پرسـیارمان دەکرد. زۆر نارەحەت بووین هەتا وا بوو گەیشتینە بەسرە. ئەو ماڵەی پاشـەکەوتمان کردبوو. بە قەد خەزێنەی پادشـایەک دەبوو. بەڵام چی لەگەڵ قەزا و قەدەر دەکرێ. مینش دڵخۆشـیم دانەوە و گوتم براکانم، هەر ئەوەی بۆخۆتان بە سـلامەت

ڕزگارتان بووە، جێی شوکرە. سڵامەتی گەورەترین سامانە. فەقیری و دەوڵەمەندی وەک خەون و خەیاڵ وایە. شاعیر دەڵێ:

مـاڵ و ســـامـانی دونیـایە ســـڵامەتی نـاهێنێ
ســـڵامەتی هەر بە تەنیـا هەمـوو دونیـایە دێنـێ

دوای ئەوە گوتم: «کاکە گیان، وای دادەنێین، ئەورۆ بابمان مردووە و ئەو ماڵەی بۆ بەجێ هێشتووین، دێنین ماڵەکەی من دەکەینە سێ بەشی بەرابەر. ئیدی ناردمانە لای قازی کەسێکی نارد و ماڵەکەی بۆ کردین بە سێ بەش. یەکەی بەشێکمان هەڵگرت و من پێم گوتن: «مرۆڤی بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لە شارەکەی خۆی کاسبی دەکا، سەفەر مایەی کوێرەوەری و مەترسییە. یەکی دووکانێک بکەنەوە و لە سەری دانیشن و کاسبی خۆتان بکەن. ئیدی هەر یەکەی دووکانێکیان کردەوە و کەلوپەلی گرانباییان تێ خست. ئەوجار پێم گوت بۆخۆتان دانیشن و دووکانی خۆتان بگێڕن و خورد و خۆراک و پۆشاکیشتان لە سەر من بێ. بە ڕێز و حورمەتەوە لەگەڵیان جووڵامەوە و شەوانە لە ماڵە من دەخەوتن. نەمدەهێشت لە پارەکەی خۆیان خەرج کەن. هەر کاتێک دادەنیشتین یادی غەریبایەتیان دەکرد و باسی خۆشییەکانی سەفەریان دەکرد و ئەو قازانجانەی کردبوویان یەکە یەکە باسیان دەکرد. منیان هان دەدا بچم بۆ سەفەر. لەو جەنگەیەدا چاوێکی لە سەگەکان کرد و لێی پرسی: «براکانم وا بوو یان نا؟» سەگەکان چاویان لە سەر یەک دانا و سەریان داخست. یانیها وایە.

دوای ئەوە گوتی: «خەلیفە ئەوان هەر ئاوا بەردەوام منیان دنە دا لەگەڵیان بچم بۆ سەفەر، هەتا لەبەر دڵی ئەوان ڕازی بووم. لەگەڵیان بوومە هاوبەش و کاڵا و شتومەکێکی زۆری گرانباییمان لە کەشتی دا و لە بەسرەوە بەرەو شارەکانی دیکە کەوتینە ڕێ. تا گەیشتینە شارێکی دیکە لەوێ هێندێکمان شت دەفرۆشت و هێندێکمان دەکڕی و خێر و قازانجێکی زۆرمان وەگیر دەکەوت. لەوێشەوە بەرە و شارێکی دیکە دەڕۆیشتین. بەو جۆرە ماڵێکی زۆرمان وەسەر یەک نا. دوای ئەوە گەیشتینە کێوێک. کەشتیوانەکە کەشتییەکەی دا قەراغ و لەنگەری گرت. کەشتیوانەکە بە خەڵکی ناو کەشتییەکەی گوت: «دابەزن بزانن کانیاوێکی شیرین نابیننەوە. لەڕێوە خەڵکەکە دابەزین. منیش لەگەڵیان دابەزیم. هەر یەکەی بە لایەکدا وە دوای ئاوی شیرین کەوتین. ئەمن چوومە سەر کێوەکە. سەیرم کرد، مارێکی سپی هەڵدەهات و ئەژدیهایەکی ڕەشیش کەوتبووە سەری. وا بوو ئەژدیهاکە مارەکەی گرتەوە. قەپاڵی بە سەریدا کردبوو. کلکیشی لە کلی ئاڵاندبوو. مارە دەیقیژاند. ئەمن زانیم ئەژدیهاکە زوڵم لەو مارە دەکا، ئیدی بەزەییم پێیدا هات و بەردێکی گەورەی کیلۆ و نیوی لەوێ بوو دەستم دایە و لە سەری ئەژدیهاکەم ڕاکێشا. لەڕێوە ئەو

ماره هاته بیچمی کچێکی جوانەوە و خۆی بە ســـەر دەســـت و قاچی من دادا و گوتی: «مرۆڤەکە تۆ نامووسی منت پاراست و فریام کەوتی. من قەرزباری تۆم، ئیدی ئاماژەیەکی بە زەوی کرد و لە زەوی چووە خوارێ. ئەمن زانیم ئەو لە ڕەگەزی جندۆکە بوو. بەلام ئەژدیهاکە بووە لوێچێک خۆلەمێش. ئەمن سەرم لەو کارە سووڕ ما. پاشان گەڕامەوە لای هاوڕێکانم و شـــتەکەم بۆ گێڕانەوە. ئەو شـــەوە لە داوێنی ئەو کێوە مانەوە. شـــەوەکی پاپۆڕڤان چارۆکەی هەڵدا و پاپۆڕی ئاژووت. هەتا بیســـت ڕۆژان هەر ئاوا ڕۆیشـــتین. تا ئاوی شـــیرینەکەمان تەواو بوو. پاپۆڕڤان گوتی: «خەڵکینە ئاوی شـــیرینمان پێ نەماوە و منیش ڕێم لێ تێک چووە. نازانم لادەمەوە قەراخاو. ئێمە ئەو شـــەوە زۆر ناڕەحەت بووین و کەس نازانێ چۆنمان ڕۆژ کردەوە. وەک شاعیر دەڵێ:

درێژ و تاریک و ســـارد، شـــەوێک وەک ژینی تەنیایی
درێـژتـر لە چـاوەڕوانـی و تـاڵـتـر لە بـێ هـیـوایـی

کە ڕۆژ بووەوە کێوێکی بەرزمان لێ وەدیار کەوت، بە دیتنی شـــاگەشـــکە بووین و پاپۆڕمان بەرەو ئەوێ ڕادا. کە گەیشـــتینە کێوەکە هەموومان دابەزین و بە شـــوێن ئاودا هەڵســـووڕاین. تەواوی ئەو کێوەمان کرد، ئاومان وەگیر نەکەوت. ئیدی ئەمن چوومە ســـەر لوتکەی کێوەکە. لەوێڕا شـــارێکی گەورەم لێ وەدیار کەوت. بانگی هاوڕێکانم کرد و گوتم: «وەرن چاو لەو شارە گەورەیە کەن. بێ گومان ئاوی شیرین و خۆشی زۆر لێیە. وەرن با بچینە ئەوێ و لەوێ ئاو و توێشـــووی ڕێیە بێنین. هاوڕێکانم گوتیان ئێمە لەوە دەترســـین ئەوانە دوژمنی دینیمان بن و هەموومان بە دیل بگرن یان بمان کوژن. ئەو دەم دەســـتمان لە هیچ کوێ ڕاناگا و وەک خۆمان لێ نایەتەوە. وەک شاعیر دەڵێ:

گەر شـــارەزای ڕێیەک نەبووی ســـڵ بکە پێیدا مەڕۆ
کەنـد و کۆســـپـی زۆرە ژیـان جـارێکە پێـیـدا مەڕۆ

ئەمن گوتم: «خەڵکینە کارم بە ئێوە نییە من لەگەڵ براکانم دەچم.» براکانیشـــم گوتیان: «ئێمەش ناوێرین لەگەڵت بێین.» ئیدی من گوتم: «ئەگەر ئێوەش لەگەڵم نەیەن من با تاقی تنێ پشـــت بە خودا دەبەســـتم و دەچم، خودا چۆنی پێ خۆش بێ با ئاوا بێ. ئێوە لێرە دانیشن تا من دێمەوە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی نۆسەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! عەبدوڵلا گوتی: «خەلیفە، من بە براکانم گوت، ئێوە لێرە چاوەڕێم بن تا دێمەوە. ئیدی ئەوانم لەوێ بەجێ هێشت و ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە دەروازەی شارەکە. سەیرم کرد شارێکی گەورەیە کە کۆشک و سەرسەرای سەیر سەیر و بورجی پتە و قایمی هەیە. دەرگاکانی هەموویان لە ئاسنی چینی و نەخشی زێڕینیان لە سەرە. کە لە دەروازەکە چوومە ژوورێ، دیوێکم دیت لە بەرد داتاشرابوو. پیاوێک لەوێدا دانیشتبوو. زنجیرێکی مسی زەردی لە قوڵی دابوو کە چاردە کلیلی پێوە هەڵواسرابوو. ئەمن زانیم ئەو کابرایە دەرکەوانی شارە و ئەو شارەش چاردە دەروازەی هەیە. لێی چوومە پێشێ و سڵاوم لێ کرد. وەلامی سڵاوەکەی نەدامەوە. دیسان سڵاوم کردەوە هەر جوابێک نەبوو. بۆ سێیەمین سڵاو لێ کرد، هیچ. وا دیار بوو وەڵامێک نەبوو. دەستێکم لە سەر شانی دانا و گوتم: «کاکە ئەوە بۆ وڵام نادەیتەوە، خەوتووی یان باوڕەت بە سڵاو و شت نییە؟!» کە جوان سەرنجم دایە. دیتم بەردە. گوتم: «وەڵا سەیرە ڕێک دەڵێی مرۆڤە هەر ئەوەندەیە قسە ناکا.» ناچار بە جێم هێشت و چوومە ناو شارەکەوە. کەسێکی دیکەم دیت لە نێوەڕاستی ڕێیەکەدا ڕاوەستا بوو کە لێی چوومە پێشێ و چاوم لێ کرد ئەویش هەر بەرد بوو. دوای ئەوە بە کۆلانەکاندا دەڕۆیشتم. هەتا تووشی پیرێژنێک بووم. تەماشام کرد ئەوە سوێنەیەکی شیووکوڵ لە پێشە و خۆی و جل و شتەکەی بەر دەستی هەر هەمووی بوون بە بەرد. ئەوجار چوومە ناو بازاڕ سەیرم کرد ئەوە بەقاڵ تەرازووی دانا و شتەکانی هەمووی بە ڕیز داناوە بەڵام هەموو شتێک هەر بەرد. دووکانەکانی دیکەم دیت یەک دانیشتبوو یەک بە پێوە بوو ژن و منداڵ و شت لە کاتی ڕۆیشتندا ببوون بە بەرد. دوای ئەوە چوومە بازاڕی بازرگانان ئەوانیش هەموو شتێکیان لە پێش و ببوون بە بەرد. کەل و پەلەکانیان دەتگوت داوی جاڵجاڵۆکەیە. دەستم لە هەر شتێک لە شتەکانیان دەدا دەبوو بە تەپ و تۆز. قاسە و شتی لێ بوو کە دەرکەکەیم دەکردە و دەستم لە زێڕ و شتەکەیان دەدا زێڕەکان لە دەستمدا سوور سوور دەتروسکانەوە. ئەوەندەی بۆم دەکرا هەڵم گرت و لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر براکانیشم هاتبان ئێستا لەو زێڕانەیان هەڵدەگرت و بۆ خۆیان پاشەکەوتیان دەکرد. دوای ئەوە چوومە دووکانێکی دیکە، لەوێش زێڕ و زیوێکی زۆرم دیت لەوەی پێش زۆرتر و جوانتر. بەڵام ئیدی بۆم هەڵنەدەگیران. لەوێڕا چوومە بازاڕێکی دیکە. ئەوە لە بەرەوە هەر چاویشم لەو خەڵک جۆراوجۆرەش دەکرد کە هەمووی ببوون بە بەرد. سەگ و پشیلەکانیش ببوون بە برد. دوای ئەوێ چوومە بازاڕی زێڕینگەران، خەڵکم دەدیت کە زێڕ و شتی گرانباییان بە دەستەوە، یەک خەریک بوو دەیکێشا، یەک لە قاسەی دەخست یەک، ڕێک و پێکی دەکرد.

خەلیفە، ئەگەر ئەو شـــتانەم دیت لە تاوان زێڕ و شـــتەکەی پێم بوو، هەموویم حەوا دا. لەو زێڕانەی ئەوێم هەڵگرت. ئەوجار لەوێڕا چووم بۆ بازاڕی گەوهەرفرۆشـــان ئەوانیشـــم دیت لە دووکانەکانی خۆیان دانیشـــتبوون و هەر یەکەی زەمبیلێکیان گەوهەر و نقیمی گرانبایی وەک ئاڵماس و زمرڕود لال و شـــت لە پێش بوو. بۆخۆشـــیان ببوون بە بەرد. ئەوجار زێڕەکانم فڕێ دا و ئەوەندەی بۆ هەڵگیرا گەوهەر و نقیمی گرانباییم هەڵگرت. زۆریش ناڕەحەت بووم کە بۆچی براکانیشـــم لەگەڵ خۆم نەهێنا لەو گەوهەرانە ئەوەندەی توانیبایان هەڵیان گرتبا. پاشـا لەو بازاڕە چوومە دەرێ گەیشـتمە دەرگایەک کە بە هەموو خشڵێکی جوان ڕازا بووەوە و لەمبەر و بەری دەرگاکە سەکۆگەلێکی لێ بوو کە خزمەتکار و نۆبەدار و ئەمیر و سەرهەنگ دانیشبوون و جلی شکۆداریان لە بەردا و هەمووش ببوون بە بەرد. دەســتم لە یەکیان دا جلەکانی بەری هەمووی هەڵوەرین. کە لەوێ چوومە ژووری کۆشکێکم دیت کە هەتا ئێستا شتی ئەوەندە خۆشم نەدیبوو. لە نێو ئەو کۆشکەدا دیوانێکم دیت کە لەوێدا ئەمیر و وەزیز و گەورەکانی دەوڵەت لە ســـەر کورســـی دانیشـــتبوون و هەمووش ببوون بە بەرد. کورســـی لێ بوو لە زێڕی ســـوور. کە بە دوڕ و گەوهەر ڕازاندرابووەوە و کەسێک بە جلی شایانەوە لە سەری دانیشتبوو. تاجێکی لە سەردا بوو بە هەموو لال و دوڕێکی درەوشـــاوە ڕازا بووەوە. بەڵام بۆخۆی ببوو بە بەرد. ئینجا لە دیوانەوە چووم بۆ دیوی ژنەکانی. ژنی جوان جوان و مانگ ئاسام دیت لە سـەر کورسـی دانیشـتبوون و کورسـی بە زێڕ و زێو و گەوهەری جۆراجۆر ڕازا بووەوە. شـاژنم دیت تاجێکی شـاژنانەی لە ســەر نابوو، بە گەوهەری گرانبایی ڕازابووە و پیاوە خەسـاوەکان دەســـتەونەزەری ڕاوەســـتابوون. وەک ئەوەی چاوەڕێی فەرمان بن. لەو دیوەدا نەخش و وێنەی زێڕین و فەرشـــی ڕەنگین و دەفری بلوورین ئەوەندە زۆر بوو هۆش و گۆشـــی مرۆڤیان دەبرد. خەلیفە، من بە خۆم نەبوو ئەو زێڕ و گەوهەرەی پێم بوو، هەموویم فڕێ دا و لەو دوڕ و گەوهەرانەی ئەوێم هەڵگرت کە هەر یەکەی بە قەد گەنجی خسـرەو دەبوو. نەمدەزانی کـامیـان هەڵگرم و کـامیـان دانێمەوە. دوای ئەوە درگـایەکی چکۆڵەم دیـت کرابووەوە. لەو دیوی دەرگـاکە پەیژەیەکی[1] لێ بوو. لە دەرگـاکە چوومە ژووری و چل نێودەڵە بە نێردیوانەکەدا چوومە سەرێ. گوێم لە دەنگی کەسێک بوو، قورئانی دەخوێندەوە. بەرەو دەنگەکە چووم هەتا گەیشتمە دەرگای دیوێک کە پەردەیەکی حەریری پێوە بوو، تار و پۆکانی زێڕین و مووڕووی لۆلۆ و مەرجان و یاقووتی پێوە کرابوو. لە پەردەکە چوومە پێشـــێ و لام دا چوومە دیوەکەوە. وەک بڵێی ئەو دیوە یەکێک لە خەزێنەکانی ســـەر گۆی زەوی بێ. چاوم بە کچێک کەوت وەک خۆر دەدرەوشـــێ و کراسـێکی شـکۆداری لە بەردا بوو. بە گەوهەر و خشـڵی گرانبایی ڕازێندرابووەوە. جوانی و بەژن و باڵا و ڕێکوپێکی ئەو

---

[1]. پەیژە: نێردیوان.

کچە زیاتر وەک حۆری دەچوو. بەلەکێکی وەک کافوور و سەروبسکێک لوول و عەنبەرینی بوو. وەک شاعیر دەڵێ:

پێڵی بســـکی ئاوریشـــمی دەریایەک بوو لە جوانی
پێـڵ لەگەڵ خۆی دەیبردی بۆخۆشـــت نەتـدەزانی
قـاچـت بە جۆرێـک گیری داوی کەمەنـدی دەبوو
لە خۆشـــی ئەو داوە تۆ ئـازادیـت لە بیر دەچوو

عەبدوڵلا گوتی: «خەلیفە، کاتێک من ئەو کچە روومانگەم بینی، شـــەیدای جوانییەکەی بووم. کە چوومە پێشـــێ ســـەیرم کرد ئەوە چوارمەشـــقی دانیشـــتووە و قورئانی لە بەر دەخوێنێتەوە و لەو لێوە لالانەی دوڕ و گەهەر دەداتە دەرێ، جوانی و دەلالییەکەشـــی بە جۆرێکە وەک شاعیر دەڵێ:

هـاوتـای کیژی ئـاوا دەلال نە لە عەرز و نە ئاســـمـان
باوەڕ ناکەم هەتا ئێســـتا کەس دیبێتی شـــتی وا جوان

کـاتێـک گوێم لەو دەنگە خۆشـــەی بوو کە قورئـانی پێ دەخوێنـدەوە، زمـانم گیرا و نەمتوانی سڵاوەکەم بە جوانی بکەم. هۆش و گۆشم لای خۆم نەما و وەک شاعیر دەڵێ:

زمـانی چی و ســـڵاوی چی فەقیرە وا تێـک هەڵگلا
وەک ئەوەی قەتی نەدیبێ ســـین و ئەلیف و میم و لا

دوای ئەوە تۆزێک هێزم داوە بەر خۆم و سـڵاوم کرد. گوتی: «سـڵاو لە تۆش بێ ئەی عەبدوڵلای بنی فازل چۆنی باشـــی، بەخێر بێی.» ئەمن گوتم: «خانم نێوی من لە کوێوە دەزانی و گوناحی خەڵکی ئەو شـــارە چی بووە وا بوون بە بەرد؟ ئەی ئەوە چۆنە ئەتۆ بە تاقی تەنێ لەو شـــارە دای؟» کیژی مانگرِوخســـار وڵامی دامەوە: «عەبدوڵلا، دانیشـــە هەتا باســـی ئەو شـــارەت بۆ بگێڕمەوە.» ئیدی من لە پەنای دانیشـــتم. گوتی: «عەبدوڵلا، ئەمن کچی پادشـــای ئەو شـــارەم و بابی من ئەو پادشـــایە بوو کە تۆ لە ســـەر تەختەکە دیتت. ئەوانەی لە دەوری ڕاوەســـتاون کاربەدەســـتانی دەوڵەت و گەورەگەورەکانی ئەو شـــارن. باوکی من پادشـایەکی دەسـت ڕۆیشـتوو و بە دەسـەڵات و خاوەنی لەشـکرێکی بێ ئەژمار بوو. بیســـت و چوارهەزار حاکم لە ژێر فەرمانیدا بوو، هەزاران شـــاری هەبوو، بێجگە لە گوند و قەڵا و دەشـــت و مەزرا. هەزار فەرماندەری عەرەب بە فەرمانی ئەو دەجووڵان کە هەر ئەمیرێک بیست هەزار سـواری لە بەر دەسـتدا بوو. ئەوەندەی خەزێنە و ماڵ و زێڕ و

گەوهەر و نقیمی گرانبایی هەبوو کە هیچ چاوێک نەیدیتووە و هیچ گوێیەک نەیبستووە.

لێرەدا بوو کە زەردەی ڕۆژ لووتکەی چیـای ئەنگـاوت و شـەهرزاد کۆتـایی بە بەشەچیرۆکی ئەوشەویش هێنا.

# که شەوی نۆسەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کچی پادشـــای مەدینەتولئەحجار گوتی: «عەبدوڵلا، باوکی من پادشـاکانی دینا ژێر چۆکی خۆیەوە، کامە پاڵەوان ئازاو و نەترس بوو لە مەیداندا شکستی دەدا. پادشـــا بە هێز و دەســـەڵاتەکان لە ترســـانی حەجمینیان نەبوو. بەڵام کافر بوو، بوتی دەپەرست. تەواوی سپاکەشی بوتپەرست بوو.

ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت لە سەر کورسی دەسەڵات دانیشتبوو. تەواوی گەورەگەورەکانی وڵات لە دەوری دەســـتەونەزەر ڕاوەســـتابوون. لە پڕدا کەســـێک هاتە ژووری دیوەکە بە شـــۆقی ڕوخســـاری ڕووناک بوو. باوکم چاوێکی لێ کرد. ســـەیری کرد، ئەو کابرایە جلی ســـەوزی لە بەر کردووە و تیشـــکێک لە دەوری ســـەری خرمانەی داوە. پیاوێکی قورس و شـــکۆدار. بە باوکمی گوت: "گلاو ئەوە هەتا کەی لە خۆباییانە بوت دەپەرســـتی و باوەڕ بە خودای بێ هاوتا ناهێنی؟ بڵێ لااله الاالله و اشهد ان محمداً رسول الله." باوکم گوتی: «ئەتۆ کێی ئەو قسانە دەکەی؟ مەگەر ناترسی لەوەی ئەو بوتانە ڕقت لێ هەڵگرن و لێت تووڕە بن؟» کابرا گوتی: «ئەو بوتانە بەردن، نە لە بەریان هەڵخوێنی چیان لە دەســـت دێ و نە لە دژیان بوەستی هیچیان پێ دەکرێ. ئێوە تەواوی بوتەکانتان بێنن پێیان بڵێن با شتێک لە من بکەن، بەڵایەکم بەســـەر بێنن. بزانن چیان لە دەســـت دێ؟ ئەگەر هیچیان لە دەســـت نەهات، ئەوە ئێوە وەرنە سەر دینی من و باوڕە بە خودای من بێنن. دەنا من داوا لە خودای خۆم دەکەم بەڵاتان بە سەر بێ نێ. کار نییە، خودای من لە دەستی نەیە. ئەودەم بۆتان دەردەکەوێ کە کامیان ئافرێنەرە و کامیان ئافراوە. ئەو بوتانەی ئێوە، ئێوە بۆخۆتان دروستتان کردوون و شەیتان دەچێ لە جلی ئەوانەوە و قسەتان لەگەڵ دەکا. خودای من ئافرێنەر و خودای ئێوە ئافراوە. خودای من بە دوورە لە هەموو دەســـتەوەســـتانی و بێ دەســـەڵاتییەک. ئێســـتا خوداکانتان بانگ کەن.

ئینجا پادشـــا فەرمانی دا هەر کەســـەی بوتەکەی خۆی بێنێ. تەواوی گەورە گەورەکانی دەوڵەت و ســـپا و دەســـت و پێوەندانی پادشـــا ئەو بوتانەیان هێنا کە دەیانپەرســـت. [ئەوان ئاویان کرد.]

ئەمنیش لە پشـــت پەردەیەکەوە، ئەو دیوەی باوکم لێ دیار بوو. ئاگام لە وتووێژەکەیان بوو. بوتێکی زمڕوودم بوو. بـاوکم فەرمـانیدا ئەویش بەرن. ئەمن بوتەکە نـارد بۆ بـاوکم. ئەویان لە پەنا بوتەکەی باوکم دانا. بوتی باوکم لە یاقووت و ئی وەزیر لە ڕووژە بوو. ئی هێندێکیان لە مرواری و ئی هێندێکی دیکە لە عوودی قوماری. ئی دەستەیەکی ئاونووسی و ئی دەســـتەیەکی دیکە زێوین و زێڕی ســـوور و ئی تاقمێک لە دار و ســـواڵەت بوو. هەر

کەسەی بە پێی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی خۆی بوتێکی هەڵبژاردبوو دەیپەرست.

دوای ئەوە کابرا بە باوکمی گوت: «دا داوا لە بوتەکانتان بکەن قار لە من بگرن.» بوتەکانیان ڕیز کرد. بوتەکەی پادشایان لە لەگەڵ بوتەکەی من لە سەر کورسییەکی زێڕی ڕازاوە بە خشڵ و جەواهیرات دانا. باوکم هەستا و سووژدەی بۆ برد و داوای لێ کرد: «خودای من، لە نێو بوتەکان، لە تۆمان گەورەتر و بە هێز و دەسەڵاتتر نییە، بۆخۆت دەزانی ئەو کابرایە لە بەر ئەوەی من تۆ دەپرستم و تۆ بە خودای خۆم دەزانم سەرکۆنەم دەکا و تەوسم پێدا دەدا. گاڵتەم پێ دەکا. دەڵێ من خودایەکم هەیە لەو خودایەی تۆ گەورەتر و بە دەسەڵاتترە. پێم دەڵێ کرنۆشت بۆ نەبەم و لە بەرت نەپاڕێمەوە. باوەڕ بە خوداکەی ئەو بێنم. تکایە قاری لێ بگرە و تەفروتووناى بکە. باوکم هەر ئاوا لە بەر ئەو بوتە پاڕاوە. بەڵام بوتەکە متەقی لێوە نەدەهات. وەڵامی نەدەداوە. باوکم لە بەری دەپاڕاوە و دەیگوت: خودای من خۆ قەت وا نەبووە ئاوا وەڵامی من نەدەیەوە. بۆ وەڵامم نادیەوە؟ گەر هۆشت لێرە نییە، وەرەوە سەر هۆش و گوێم دەیە. ئەگەر نوستووی هەستە و یارمەتیم بدە. فریام کەوە.» ئەوجار بە دەست بزاوتی. هیچی نەگوت و دەنگی لێوە نەهات. ئەو کابرایە بە باوکمی گوت: «ئەوە بۆ هیچ ناڵێ و وەڵامت ناداتەوە؟» باوکم گوتی: «ڕەنگە خەوتبێ یان جارێ هۆشی لێرە نییە و بێ تاقەتە.» ئەوجار کابرا گوتی: «دوژمنی خودا! چۆن خودایەک بپەرستم کە قسە ناکا و هیچی لە دەست نایە. خودایەک نەپەرستم کە خەو و خەون و خەیاڵ و بێ دەسەڵاتی لە زاتیدا نییە و کار نییە لە دەستی نەیە؟ لە کاتێک خودای تۆ ناتوانێ پارێزگاری لە خۆشی بکا، چ بگا بێ فریای تۆ کەوێ و ئاگای لە تۆ بێ. جا چاو لێ کە بزانە دەتوانێ بەرگری لە خۆشی بکا.» کابرا وای گوت چووە پێشێ نووکە شەقێکی لە بوتەکە دا. بوتە بە لادا کەوت. پادشا تووڕ بوو. بە دەست و پێوەندەکانی گوت ئەو کابرایە بێ ڕێزی بە بوتەکەی من کرد خێرا بیکوژن. هەنتەشیان ویستیان بۆی هەستن، کەچی کەس نەیتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. کابرا داوای لێ کردن ئیمان بێنن و موسوڵمان بن. ئەوان ئیمانیان نەهێنا و موسوڵمان نەبوون. کابرا گوتی: «جا ئەوجار من پەنا بۆ خودای خۆم دەبەم. ئیدی دەستی هەڵێنا و پاڕاوە و گوتی: «الهی و سیّدی انت ثقتی و رجائی فاستجب دعائی.» خودایە، ئەو کافران کە لە سەر خوانی خێر و بێری تۆن و یەکی دیکە دەپرستن بکە بە بەرد. چونکە کار نییە لە دەست تۆ حاسییە بێ.» لەڕێوە هەموویانی کرد بە بەرد.

ئەمن کە ئەوەم دیت موسوڵمان بووم. لەو بەڵایە بە سلامەتی ڕزگارم بوو. کابراکە هات بۆ لای من و گوتی: «خودا ڕەحمی پێ کردی و بەختەوەر بووی. ئەوجار داب و دەستووری ئیسلامەتی فێر کردم. ئەوکات من حەوت ساڵانە بووم و ئێستا سی ساڵم تەمەنە. ئەمن بە کابرام گوت: «کاکە نێوت چییە؟ یارمەتیم بدە تا من بتوانم بە هێزەوە

بژیم.» گوتی: «نێوم، ئەبووعەبباس خزرە.» دوای ئەوە بە دەستی خۆی دارێکی بۆ ڕواندم. دار، لەڕێوە لک و پۆپ و بەری دەر کرد. پێی گوتم: «لەو هەنارانە بخۆ و خودای بێ هاوتا بپەرستە. دوای ئەوە فێری قورئان خوێندنی کردم. ئێستا بیست و سێ ساڵە من قورئان دەخوێنم و بەو دارەش بەڕێ دەچم. خزر هەموو ڕۆژانێ هەینی دێتە لام. ئەو نێوی تۆی پێ گوتم و موژدەی هاتنی تۆی پێ دام. پێشی گوتم: هەر کاتێک تۆ هاتی و ڕێز و حورمەتت بگرم و بە پێی فەرمانی تۆ بجووڵێمەوە و لە قسەت دەرنەچم. مێردت پێ بکەم و بچی بۆ کوێ لەگەڵت بێم. من هەر کە چاوم پێت کەوت تۆم ناسی. ئەوە بوو بەسەر هاتی ئەو شارە.

دوای ئەوە کچە هەستا و دار هەنارەکەی پێشان دام. هەنارێکی پێوە بوو. نیوەی خوارد و نیوەکەی دیکەی دا بە من. قەتم شتی هێندە خۆش نەخواردبوو. دوای ئەوە لێم پرسی: «ئەرێ بە قسەی ئەو کابرایە دەکەی مێردم پێ بکەی و لەگەڵم بێی بۆ وڵاتی ئێمە؟» ئەویش وەڵامی داوە: «بەڵێ، لە خزمەتت دام و گوێ بە فەرمانتم.» لەوێرا چووینەوە ماڵی بابی و ئەوەندەی شتمان بۆ هەڵگیرا لەگەڵ خۆمان بردمان. لە شار وەدەر کەوتین ڕۆیشتن هەتا گەیشتینە لای براکانم کە لە من دەگەڕان. وا بوو لە دوورەوە لێیان پرسیم ئەوە لە کوێ بووی ئەوەندەت پێ چوو؟ نیگەرانت بووین. بەڵام سەرۆکی کەشتییەکە گوتی: «عەبدوڵڵا ماوەیەکە بای خوازرا و دێ ئەتۆش لە هیچ کوێ دیار نی. وە درەنگیت خستین. گوتم: «قەیناکا، قازانجم کردووە، ماڵێکی زۆرم لەگەڵ خۆم هێناوە و بە ئاواتی خۆشم گەیشتووم. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

هەگبەم پڕ لە بەختەوەری، تاجی شایەتیم لە سەرە
ماڵ و سامان بێ ژمار و شای جوانانم هاوسەفەرە

دوای ئەوە پێم گوتن: «چاو لێکەن ئەو ماوەیەی من دیار نەبووم چ دەستکەوتێکم بوو. ئیدی کچەکەم پێشان دان و بۆم گێڕانەوە و پێم گوتن کە ئەگەر ئێوەش هاتبان قازانجێکی زۆرتان دەکرد.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نۆسەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! بە براکانم گوت: «خەمتان نەبێ ئەوەی هێناومە بەشــی هەموومان دەکا. ئیدی ئەو ماڵەی هێنابووم لە نێوان خۆم و براکانم و ســەرۆکی کەشــتییەکە دابەشــم کرد. خزمەتکارەکانی کەشتییەکەشم بێ بەش نەکرد. هەموویان خۆشحاڵ بوون و دۆعای خێریان بۆ کردم و بە بەشـــی خۆیان زۆر ڕازی بوون. براکانم نەبێ لالووت بوون. ئەمن تێیان گەیشتم. پێم گوتن دەڵێی بە بەشەکەتان قایل نین. خۆ ئێمە لێک جودا نین. بەشەکەی منیش هەر ئی ئێوەیە. ئەگەر بشمرم جگە لە ئێوە خوێنگر و خوێنەستێنم نییە و ماڵەکەشم هەر بۆ ئێوە دەبێ. ئیدی بەو جۆرە دڵخۆشیم دانەوە. کچەم بردە خەزێنەی کەشتییەکەوە. خواردنم بۆ برد و بۆخۆم هاتمەوە لای براکانم و دەســــتمان کرد بە وتوویژ. ئەوان لێیان پرسیم: «برا ئەی چی لەو کیژە جوانە دەکەی؟» گوتم: «لە خۆمی مارە دەکەم.» یەکێکیان گوتی: «ئەو کیژە زۆر جوانە، ئەمن ئاشـــقی بووم. دەبێ بیدەی بە من. ئەوی دیکە گوتی: «ئەمنیش ئـاوام بۆی. دەبێ لە منی مـارە بکەی.» ئەمن پێم گوتن: «ئەو بەڵێنی لێ ئەســــتاندووم کە مارەی بکەم. ئەگەر بیدەم بە ئێوە بێ بەڵێن دەردەچم. ئەویش دڵی لێم دێشــێ. ئەوەی کە دەڵێن ئاشـقی بووین و خۆشـمان دەوێ؛ ئەو منی خۆش دەوێ و منیش زۆر لە ئێوەم خۆشتر دەوێ و ئاشقتریشیم. قەتی نادەم بە ئێوە. بەڵام کە گەیشتینە بەسرە. دوو دانە کچی خانەدان و نەجیبزادەتان بۆ دەخوازم و لێتان مارە دەکەم. مارەییەکەشـــی لە گیرفانی خۆم دەدەم. شاییەکی وا ساز دەکەین، کەوچکی تێ نەگەڕێ. کارێک دەکەم هەر سێکما لە شەوێکدا بچینە پەردەوە و هەرکەسەی بچێتە پاڵ بووکی خۆیەوە. تازە بە تەمای ئەو کیژەش مەبن چونکە ئەوە ئی خۆمە. ئیدی ئەوان متەقیان لێ نەهـات. ئەمنیش پێم وا بوو، بە بڕیارەکەی من قایل بوون. ئیدی بەرەو بەســـرە کەوتینە ڕێ. جەنگەی ژەمەکانیش خواردەمەنیم بۆ کچە دەنارده. کچە لە خەزێنەکە نەدەهاتە دەرێ. منیش لە لای براکانم لە ســـەر تەختەبانی کەشــتییەکە دەخەوتم. هەتا چل ڕۆژان بەو جۆرە بوو. تا وا بوو شــاری بەسـرەمان لێ وەدیار کەوت. خۆشـیمان کەوتە دڵەوە. ئیدی من لە براکانم ئەرخەیان بووم و هەر خوداش ئاگای لە پێواران هەیە. ئەو شــــەوەش خەوتم. لە شـــیرین خەودا بووم، تەماشــــام کرد، ئەو دوو برایەم یەکی دەســـــت و لاقێکیان گرتووم و بە تەمان لە دەریام هاوێن. خۆم ڕاسـکاند و هاوارم کرد: ئەوە بوام لێ دەکەن؟ کەچی بەریان نەدام و گوتیان، ئەوە فێر دەبێ ئەو کچەمـان نـادەیەی؟ ئێمەش ئەو دەردەت دەدەینێ. وایـان گوت و لە دەریایان هاویشتم. لەو جەنگەیەدا عەبدوڵلا چاوێکی لە دوو سەگەکە کرد و گوتی: «وا بوو یان نا؟» ئەوان چاویان قوچاند و سەریان داخست. واتە قسەکەی ڕاستە. خەلیفە پێی سەیر بوو.

دوای ئەوە عەبدوڵلا گوتی: «خەلیفە، کە منیان لە دەریا هاویشت، هەتا بنی دەریا ڕۆچووم و دوای ئەوە ئاوەکە دامییەوە دەرێ. بە تەما نەبووم تازە بژیم. وا بوو باڵندەیەک لە پڕدا هات و هەڵی گرتم و بردمی بۆ ئاسمان. لە ترسان هەر بە حەواوە بێهۆش بووم. کە وە هۆش هاتمەوە و چاوم هەڵێنا تەماشا دەکەم، ئەوە لە کۆشک و قەڵایەکم سەیر، ڕازاوە بە هەموو جۆرە خشڵ و جەواهێراتێک. کەنیز دەستەونەزەر ڕاوەستابوون و ژنێکیش لە نێوەڕاستیان لە سەر کورسییەکی زێڕین دانیشتبوو. جلوبەرگێکی شکۆداری لە بەردا بوو. لەبەر تروسکەی زێڕ و گەوهەران چاو بە شەوارە دەکەوت. ژنە پشتوێنەیەکی زێڕین و تاجێکی زێڕینی ڕازاوە بە یاقووت و جەواهێراتی لە سەر نابوو کە خەزێنەی پاشایەتیش نرخەکەیانی دەر نەدێنا. لە عەقڵی مرۆڤ بە دەر بوو. دوای ئەوە ئەو باڵندەیەی منی ڕفاند باڵ و پەڕی وەراند. بوو بە کچێک، هەتا و تای نەدەکرد. کە جوان تێی ڕامام هەر ئەو مارە بوو کە لە کێوەکە، ئەژدیهاکە کەوتبووە سەری و من ئەژدیهاکەم کوشت.

ژنەکەی لە سەر کورسییەکە دانیشتبوو لێی پرسی: «ئەوە بۆ ئەو مرۆڤەت هێناوەتە ئێرە؟» وەڵامی داوە: «ئەوە هەر ئەو مرۆڤەیە کە ئابڕوو و حەیای منی کڕییەوە و نەیهێشت لە نێو کچە ئەجندەکان ترۆ بم.»

دوای ئەوە لە منی پرسی: «من دەناسی؟» من هەر ئەو مارە سپییەم کە ئەژدیها ڕەشەکە لە کۆڵم نەدەبووەوە و ئەتۆش کوشتت و منت ڕزگار کرد. من کچی ئەحمەڕشای جندۆکانم و نێوم سەعیدەیە. ئەو ژنەی لە سەر ئەو کورسییە دانیشتووە، دایکمە و نێوی موبارەکەیە. ئەو ئەژدیهایەی وە دوام کەوتبوو بە تەما بوو ئابڕووم بەرێ، وەزیری ئەسوەدپاشا و نێوی دەرفیل بوو. ئاشقی من ببوو. هاتە خوازبێنیم. باوکم تووڕە بوو، پێی گوت: «گلاو ئەتۆ کێی تا داوای کچی من بکەی؟» ئەویش تووڕە بوو، ڕقی لێ هەڵگرتم و سوێندی خواردبوو لە هەر کوێ تووشم بێ، پەلامارم داتێ و کچێنیم ببا. بۆ هەر کوێ دەچووم، هەر بە دوامەوە بوو. تا وای لێ هات شەڕێکی زۆر کەوتە نێوان ئەو و باوکمەوە. ئەو دەرفیلە زۆر ئازا و فێڵەزان بوو. باوکم دەروەستی نەدەهات. من چوو بامە هەر وڵاتێکیش بۆنی منی دەکرد و دەگەیشتە سەرم. زۆرم ئازار بە دەستییەوە دیت. لە تاوان بووم بە مارێک و ڕووم لەو کێوە کرد. کەچی ئەویش بوو بە ئەژدیهایەک و خۆی گەیاندمێ، زۆرم خۆ لە دەستی ڕاپسکاند و پەلەقاژەم کرد. قەوەم پێی نەدەشکا وا بوو ئاخری سوارم بوو. خەریک بوو، کار لە کار دەترازا کە تۆ گەیشتێی و ئەو بەردەت لێ دا و کوشتت. منیش هاتمەوە قالبی خۆم و پێم گوتی: «ئەو چاکەیەی تۆم لە بیر ناچێ، ئەگەر کچی دایک و باوکی خۆم بم لە چاومدا دەبێ. ئیدی بەردەوام لە بیر ئەوەدا بووم، چۆن وەڵامی ئەو چاکەیەی تۆ بدەمەوە. هەتا وا بوو دیتم، براکانت ئەو کارە ناڕەوایەیان لەگەڵ تۆ کرد و لە دەریایان هاویشتی. ئیتر بە لەز خۆی گەیاندێ و ڕزگارم کردی. ئێستا قەدر

و ڕێزی تۆ ئەرکی سەر شانی من و دایک و بابمە. دوای ئەوە گوتی: «دایە قەدری بگرە.» ئیدی دایکی گوتی: «زۆر باشــە، ئەو کە ئەو چاکەیەی لەگەڵ ئێمە کردبێ، شــیاوی ئەوەیە ئێمەش لە خزمەتیدا بین.» ناردی کراســێکی گرانبایی و دوڕ و گەوهەرێکی زۆریان بۆ هێنام و دایانمێ. بە خزمەتکارەکانی گوت: «ئەو مرۆیەی بەرنە لای پادشـــا.» منیان بردە لای پادشا. سەیرم کرد، لە سەر کورسی دانیشتووە و دێوێکی زۆر دەستەونەزەر لە بەر دمی وێستاون. ئەوەندەی زێڕ و جەواهێرات پێوە بوو چاوم لەبەر ترووسکە ترووسکیان هەڵنەدەهات. کە منی دیت لەبەرم هەســتا و ڕێزێکی زۆری لێ گرتم. ماڵێکی زۆری دامێ و گوتی: «بیبەنەوە لای ســەعیدەی کچم. با بیباتەوە شــوێنەکەی خۆی.» ئیدی منیان بردەوە لای کچەکە. ئەویش منی هەڵگرت و بەو ماڵەوەی کە دابوویانمێ وە حەوای خستم.

براکانم کە منیان لە دەریا هاویشت، بۆخۆیان دەستیان کردبوو بە شین و گریان و لە خۆ دان. ســــەرۆکی کەشـــتییەکە گوتبووی: «ئەو چ بوو، کەوتە دەریاوە؟» گوتبوویان براکەمان کاری ئاودەســـتی بوو، چووە لێواری کەشـــتییەکە کەچی لە دەریا کەوت. دوای ئەوە ماڵەکەی منیان لە بەینی خۆیان دابەش کرد و لە سەر کچەکە کێشەیان لێ پەیدا بوو. هەر کام لەوان دەیانگوت دەبێ ئەو کچە بۆ من بێ. براکەیان لە بیر چووبووە و خەریکی کێشە و مشتومڕ بوون کە لەو جەنگەیەدا منی لە سەر کەشتییەکە دانا.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! براکانم کە منیان دیت، لە باوەشیان گرتم و گوتیان: برا گیان ئەوە هاتییەوە دەرێ، چۆنی، خەریک بوو دڵمان بۆت بتۆقێ؟ سەعیدە گوتی: «ئەگەر ئەوتان خۆش ویستبا لە دەریاتان نەدەهاویشت. ئیدی ویستی بیانکوژێ، کەچی هانایان بۆ هێنام و دەستیان کرد بە گریان و پاڕانەوە و گوتیان ئێمە خراپەمان لەگەڵ کردی تۆ نەیکەی و لێمان خۆش بە. من بەزەییم پێیاندا هات و گوتم: «ئەوجارەش لێیان خۆش بە.» سەعیدە گوتی: «ئەوانە بۆ لێ خۆش بوون نابن و

هەر دەبێ بکوژرێن. ناپاکیان کردووە.» ئیدی ناچار دەستم کرد بە تکا و ڕەجا هەتا لێی قەبووڵ کردم و گوتی: «باشە لەبەر خاتری تۆ نایانکوژم. بەڵام بە جاوو دەیانکەم بە سەگ. قاپێکی هێنا دەرێ. پڕی کرد لە ئاو و دۆعایەکی بە سەردا خوێند و بە سەر براکانمیدا هەڵپرژاند. لەڕێوە لە بیچمی مرۆ هاتنە دەرێ و بوون بە سەگ و ئاوایان لێ هات. ئەوجار ڕووی لە سەگەکان کرد و لێی پرسین وا بوو یان نا. ئەوان چاویان قووچاند و سەریان داخست و وەک ئەوەی بڵێن وایە.

دوای ئەوە عەبدوڵڵا گوتی: «خەلیفە، سەعیدە کە ئەوانی کرد بە سەگ بە خەڵکەکەی ناو کەشتییەکەی گوت: «ئەوە بزانن کە عەبدووڵای کوڕی فازڵ برای منە. من ڕۆژێ جارێک دووجار دێم سەری دەدەم، خودا نەکا بزانم کەسێک بێ قسەیی بکا یان ئازاری بدا، دەنا وەک براکانی دەیکەم بە سەگ. بە منیشی گوت: «هەر کە گەیشتییە بەسرە چاو لە ماڵەکەت بکە. ئەگەر زانیت شتێکی کەمە پێم بڵێ. لە بن ددانیان دەردێنمەوە و دەیانکەم بە سەگ. ئێستا تۆ ئەو دوو سەگە بە تەختەکەتەوە ببەستەوە. هەموو نیوەشەوان هەڵدەستی بە قامچی ئەوەندەیان لێ دەدەی تا بێهۆش دەبن. ئەگەر شەوێک لێیان نەدەی دێم و لەوان دەدەم هیچ تا بێهۆش دەبی وەک ئەوان لە تۆش دەدەم.» ئەمن گوتم بە چاوان. تۆ چۆن بڵێی وا دەکەم. ئیدی من ئەوانم بەستەوە و کچە چوو بە لای کاری خۆیەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر ئێمە گەیشتینە بەسرە. بازرگانەکان بە پێشوازی منەوە هاتن و سڵاویان کرد. کەس هەواڵی براکانمی نەپرسی. چاوێکیان لە سەگەکان دەکرد و دەیان گوت: «ئەی ئەو سەگانت بۆ هێناوە چیان لێ دەکەی؟» منیش وەڵامم دەدانەوە و دەمگوت: ئەو سەگانە بۆخۆم گەورەم کردوون و هێناومنەوە. خەڵک پێیان پێدەکەنین و نەیان دەزانی ئەوانە براکانی خۆمن. پاشان ئەوانم بەستەوە و بۆخۆم چووم بە لای بارەکانمەوە. بازرگانەکان لە دەورم بوون و خافڵابووم. ئەو شەوە هێند ماندوو بووم، لە بیرم چوو لێیان دەم. خەوم لێ کەوتبوو کە لە پڕدا سەعیدەی کچی ئەحمەرپاشا پەیدا بوو. هاتە لام

و گوتی: «من پێم نەگوتی زنجیر لە ملی ئەو سەگانە کە و بە قامچی لێیان دە.» ئیدی دەستی منی گرت و بردمی دەرێ ئەوەندەی لێ دام تا بێهۆش بووم. پاشان چووە جەستەی براکانم. ئەوەندەشی لەوان دا، چی وای نەمابوو بمرن. ڕووی لە من کردوو گوتی: «هەموو شەوێ ئاوایان لێ دەکەی. ئەگەر شەوێک ئەو کارە نەکەی بۆخۆم دێمەوە، ئەمشەو چیم لێ کردی ئاوات لێ دەکەم.» منیش گوتم باشە خانم بە چاوان هەموو شەوێ ئاوایان لێ دەکەم. نەمتوانی زنجیری ئاسنیان لە مل کەم. هەستام چووم بۆ لای زێڕینگەر و زنجیری زێڕم بۆ بە دروستکردن دان. زنجیرەکانم هێناوە و لە ملم کردن. شەویش وەک چۆن سەعیدە ڕایسپاردبووم. ئاوام لێ دان. ئەو چیرۆکە لە زەمانی خەلافەتی مێهدیدا بوو. من دیارییەکی شیاو و زۆرم نار بۆ خەلیفە. خەلیفە منی کردە بریکاری بەسرە. ئیدی یەک شەویش لە لێدانی ئەوان خافڵ نەبووم. تا وا بوو، شەوێک لە دڵی خۆمدا گوتم: «ڕەنگە سەعیدە ڕقەکەی نیشتبێتەوە.» ئەو شەوە لێم نەدان. تەماشام کرد سەعیدە هات و ئەوەندەی لێ دام هەتا هەتایە ئێشەکەی لە دڵم ناچێتە دەرێ. دوای ئەوە ئیدی یەک شەویش نەبووە لێیان نەدەم. دوازدە ساڵە ئەوە کاری منەوە و هەموو شەوێک ئەو دەردەیان دەدەمێ و دوایە فرمێسکەکانیان دەسترم و دڵخۆشیان دەدەمەوە. داوای لێ بووردنیان لێ دەکەم و خواردمەنی و شەرابیان دەدەمێ. ئیدی کەس ئاگای لەو بابەتە نەبوو، هەتا جەنابت ئەبولحەسەنی دەمڕاستت نارد بۆ پێتاک و ئەویش بەو شتەی زانی و جەنابتی لێ ئاگادار کردەوە. کە جەنابت داوات کرد بێمە خزمەتت، ئەوە هاتمە خزمەتت و سەگەکانیشم لەگەڵ خۆمدا هێنا. ئەوە بوو بەسەرهاتی من کە عەرزم کردی.»

خەلیفە سەری لەو بەسەرهاتە سووڕ ما و لە عەبدوڵڵای پرسی: «گەلۆ تۆ لەو هەڵەیەی براکانت خۆش بووی؟» عەبدوڵڵا گوتی: «خودا لێیان خۆش بێ و لە دونیا و ئاخرەت گەردنیان ئازاد بێ. ئێستا من پێویستیم بە لێ خۆش بوونی ئەوان هەیە وا دوا دوازدە ساڵە هەموو شەوێ ئاوا ئازاریان دەدەم.» خەلیفە گوتی: «عەبدوڵڵا ئەمن کارێک دەکەم ڕزگاریان بێ و بێنەوە سەر بیچمی مرۆڤ و ئێوەش پێکەوە ئاشت کەمەوە. ئەتۆ لەوان خۆش بی و ئەوانیش لە تۆ خۆش بن. ئێستا هەستە ئەوانە هەڵگرە و بیانبەوە ماڵێ و ئەمشەو لێیان مەدە، تا سبەینێ هەموو شتێک جێبەجێ دەبێ.» عەبدوڵڵا گوتی: «خەلیفە بە خودا ئەگەر شەوێک لێیان نەدەم، سەعیدە دێت لە جێی ئەوان لە من دەدا و جەستەی منیش تاقەتی ئەو قامچییانەی ئەوی نییە.» خەلیفە گوتی: «تۆ خەمت نەبێ نامەیەک بە خەتی خۆم دەنووسم. ئەگەر سەعیدە هات، تۆ نووسراوەکەی منی پێشان بدە. ئەگەر ئەو نووسراوەکەی منی خوێندەوە لێت خۆش دەبێ. ئەگەریش بە قسەی نەکردم. ئەوە تۆ خۆت بە خودا بسپێرە و وای پێشان دە لە بیرت چووە ئەوشەو لێیان بدەی. دوای ئەوە نامەیەکی کورتی بۆ سەعیدە نووسی و دای بە عەبدوڵڵا و گوتی: «ئەگەر سەعیدە هات بڵێ، خەلیفەی

مرۆڤان فەرمانی پێ داوم لەوانە نەدەم. ئەو کاغەزەشی بۆ تۆ نارد و سڵاویشی دەگەیاندی.

عەبدوڵلا سەگەکانی هەڵگرت و ڕۆیشتەوە ماڵە خۆی. لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆزگە بم زانیبا ئەگەر کچی ئەحمەرپاشا بێقسەیی خەلیفە بکا دەتوانێ چی بکا. هەرچی بێ ئەو شەو لە براکانم نادەم بزانم چی دەبێ.» دوای ئەوە چوو لە فکرەوە و دڵی بەوە خۆش کرد کە ئەگەر خەلیفە بە شـوێنێک پشـتگەرم نەبایە قسـەی وای نەدەکرد و بە منی نەدەگوت لێیان مەدە. ئەوجار کە هێنانییەوە ماڵێ زنجیری لە ملی کردنەوە و دەسـتی کرد بە دڵخۆشـی دانەوەیان و پێی گوتن: «خەمتان نەبێ خەلیفەی سـەر زەوی ڕزگاری ئێوەی مسـۆگەر کردووە و منیش لێتان خۆش دەبم. لەو شـەوە مەبارەکەدا ڕزگارتان دەبێ. ئەوان کە ئەو قسەیەیان بیست وەکوو سەگان دەسیتان کرد بە کلەسووتە و ملۆمۆ کردن بە دەوریدا.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و هەشتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! عەبدوڵلا زۆری خەم بوون دەســـتی بە پشـــیتاندا دێنا. کاتی شـێوخواردن، ســـفرەیان هێنا پێش عەبدوڵلا. عەبدوڵلا ڕێی دان براکانیشـــی بێن لە قەراخ ســـفرەکە بکەون. ئەوان لە قەراغ ســـفرەکە هەڵتووتەکان و دەســـتیان کرد بە خواردن. خزمەتکارەکانی عەبدوڵلا ئەو کارەیان زۆر پێ ســـەیر بوو کە عەبدوڵلا لەگەڵ ســـەگەکانی نان دەخوا. دەیان گوت بڵێی شـــێت نەبووبێ؟! چۆن بریکاری بەســـرە لەگەڵ ســـەگ نان دەخوا؟! خۆ پلە و پایەی ئەو لە وەزیریش ســـەرترە. بۆ نازانێ ســـەگ گلاوە؟! بە دزییەوە چاویان لە شـت خواردنی ســـەگەکان دەکرد. تەماشـایان کرد وەک ســـەگی دیکە شـتیان نەدەخوارد. ئەوان زۆر ماقووڵانە نانیان دەخوارد. خۆ خزمەتکارەکان نەیان دەزانی ئەوانە برای عەبدوڵلان. هەر ئاوا سەیری شت خواردنی گەماڵەکانیان دەکرد هەتا تەواو بوون. کە نانەکەیان خوارد، عەبدوڵلا هەســـتا دەســـتی شـــوت و گەماڵەکانیش دەســـتیان شـــوت. خزمەتکارەکان واقیان وڕ ما و دەســـتیان کرد بە پێکەنین و گوتیان: «لەوەتی هەین شـــتی وامان نەدەیوە، ســـەگ لە ســـەر ســـفرە ئاوا نان بخوا و دوایەش دەســـتی بشـوات.» دوای دەست شـوتن هاتن لە پەنا عەبدوڵلا لە ســـەر کورســـی دانیشـتن کەسیش بۆی نەبوو لەو بارەوە پرسیار بکا. هەتا نیوەشەو دانیشتن. خزمەتکارەکان هەرکەسەی چووەوە ماڵە خۆی و خەوت. سەگەکانیش لە سەر تەخت وەرکەوتن.

عەبدوڵلا دانیشـــتبوو، لە گژ فکران ڕۆچوو بوو کە ســـەعیدوە لە زەوی هاتە دەرێ و گوتی: «عەبدوڵلا ئەوە بۆ ئەو شەو لە براکانت نەداوە و زنجیرەکانت لە ملی کردووەنەوە؟! بۆ دژایەتی من ئەو کارەت کردووە یان هەر ماندوو بووی لە ســـزادانیان؟! ئیســـتا تۆش دەکەم بە ســـەگ بـا فێر نەبی بێئەمریم بکەی.» عەبـدوڵلا گوتی: «بیکە بۆ خـاتری ئەنگوســـتیلەکەی حەزرەتی ســـولەیمان، دەســـت ڕاگرە با شـــتێکت پێ بڵێم. دوایە چیت پێ خۆشـــە لێم بکە.» ســـەعیدە گوتی: «باشـــە پێم بڵێ هۆیەکەی چی بوو؟» عەبدوڵلا گوتی: «لەبەر ئەوە پادشای مرۆڤان، خەلیفە هاروونەڕەشید دەستووری پێ دام، ئەمشەو لێیان نەدەم. منیش بەڵێنم پێ دا. نامەیەکیشـی بۆ تۆ نووسـی و دای بە من بتدەمێ. سـڵاویشـی دەگەیاند. ئەمنیش بە قســـەم کرد، چونکە ناتوانین بە قســـەی نەکەین. ئەوەش نامەکەی.» سـەعیدە نامەکەی لێ وەر گرت و خوێندییەوە. تەماشـای کرد نووسـیوییەتی: «بسم اللّٰه الرحمن الرحیم، ئەوە نووسـراوەیەکە لە لایەن خەلیفە هاروونەڕەشـیدەوە بۆ ســـەعیدەی کچی ئەحمەرپاشـا. ســـەعیدە، ئەو پیاوە لە براکانی خۆش بووە و من ئاشـتم کردوونەوە. کاتێک لێ بووردەیی هاتە ئاراوە لێدان و ئازار مانای نامێنێ. ئەگەر ئێوە گوێ نەدەنە داب و دەســـتووری ئێمە؟ ئێمەش گوێ نادەینە داب و دەســـتووری ئێوە و یاســـاکانتان تێک

دەدەین. ئەگەر ئێوە بە گوێمان بکەن. ئێمەش ڕێز لە بڕیارەکانی ئێوە دەگرین. ئێستا داوات لێ دەکەم. کارت بەو پیاوە نەبێ. ئەگەر ئیمانت بە خودا و پێغەمبەرەکەی هێناوە، دەبێ لە قسەی خەلیفەکەی دەرنەچی. ئەگەر لێیان خۆش بی ئەوە منیش خەڵاتت دەکەم. نیشانەی بەگوێ کردنەکەش ئەوەیە کە تلیسمەکەیان بە تاڵ کەیەوە. وا بێ بەیانی بێنە لای من. ئەگەریش ڕزگاریان نەکەی لەو دۆخە ئەوە من بە زۆر ئەو کارە دەکەم.»

سەعیدە کە نامەکەی خەلیفەی خوێندەوە، گوتی: «عەبدوڵلا، جارێ کارم بە تۆ نییە هەتا ئەو نامەیە نەبەمە لای باوکم. زووش وەڵامی نامەکەت بۆ دێنمەوە.» ئیدی بە دەست ئاماژەیەکی بۆ عەرزەکە کرد. عەرزیەکە زاری کردەوە و سەعیدە ڕۆچوو. عەبدوڵلا لە خۆشیان خەریک بوو، باڵ بگرێ. گوتی: «خودا ڕاوەستاوت کا، خەلیفە.»

سەعیدەش چووەوە بۆ لای باوکی و نامەکەی خەلیفەی دایە. ئەحمەرپاشا نامەکەی ماچ کرد و لە سەر سەری دانا و ئەوجار خوێندییەوە. کە زانی چ باسە بە کچەکەی گوت: «کچی من، ئێمە لە ژێر حوکمی خەلیفەی مرۆڤانداین و دەبێ گوێڕایەڵی بین. ئێمە ناتوانین دژایەتییان بکەین. ئێستا بگەڕێوە و ئەو سەگانەش بکەوە بە مرۆڤ و پێیان بڵێ ئێوە لە ژێر دەسەڵاتی خەلیفە دان و جارێ ئەو لێتان خۆش بووە. ئەگەر ئاوا نەکەی خەلیفە لە دەستی دێ هەموومان لە ناو بەرێ.» سەعیدە گوتی: «باوکە، ئەگەر پادشای مرۆڤان ڕقمان لێ هەڵگرێ دەتوانێ چمان لێ بکا؟» پادشا گوتی: «کچم ئەوان لە چەند سەرەوە لە سەر ئێمەوەن: یەکەم ئەوەی ئەوان مرۆڤن و مرۆڤ لە ئێمە گەورەترن. دووەم ئەوەی کە ئەو جێنشینی خودایە. سێیەم، ئەو قەت نوێژی بەیانی ناچێ و ئەگەر تەواوی هۆزی جندۆکان لێی کۆوە بن ناتوانن قامکی بۆ بەرن و شتێکی لێ بکەن. ئێمە ناتوانین دژایەتی بکەنی. بێتوو کاری وا بکەین هەموومان دەسووتێنێ و ئێمە هیچمان لە دەست نایە. ئەتۆ لەبەر ئەو دوو پیاوە بە هیلاکمان مەدە. پێش ئەوەی خەلیفە لێمان بە ڕقدا بچێ بچووە ئەو جادوویەت بەتاڵ کەوە.»

ئەوجار سەعیدە گەڕاوە بۆ لای عەبدوڵلا فازڵ و پێی گوت: «باوکم سڵاوی دەگەیاندن و گوتی لە جێی ئێمە دەستی خەلیفە ماچ کە و داوای لێبووردنی لێ بکە.» دوای ئەوە قاپێکی ئاو هێنا و ورتە ورتێکی بەسەردا کرد و فوویەکی لە ئاوەکە کرد. ئاوەکەی بە سەر گەماڵەکاندا هەڵپرژاند. لەڕێوە لەو حاڵە هاتنە ئەو حاڵە و بوونەوە بە مرۆڤ. شادەوئیمانیان هێنا و خۆیان بە سەر لاقی براکەیاندا خست و داوای لێ بووردنیان کرد. عەبدوڵلا گوتی: «خودا بتانبەخشێ ئێوە دەبێ بمبەخشن زۆرم ئازار داون. بەوجۆرە تۆبەی نسووحیان کرد و گوتیان: «شەیتان فریوی داین و وە تەماعی خستین. بەڵام بەخشین و لێ خۆش بوون کاری گەورانە.» دوای ئەوە عەبدوڵلا گوتی: «ئەی چیتان لەو کچە کرد کە لەوە شارە بەردینەوەکەوە هێنا بووم؟» گوتیان: کاتێک شەیتان فریوی داین و تۆمان لە دەریا

هاویشت. له سەر ئەوەی ئەو کچە بۆ کاممان بێ، لێمان بوو هەرا. کە دیتی ئێمە هەموومان لە سـەر ئەو کێشـەمانە و لێمان بووە بە مشـتومڕ، هاتە دەرێ و گوتی: «لە سـەر من بە شەڕ مەیەن ئەمن ئی ئێوە نیم. ئیدی خۆی لە دەریا هاویشت و نوقم بوو.»

عەبدوڵڵا هێندەی خەم بوو لە تاوانی دەسـتی کرد بە گریان و بە براکانی گوت: «ئێوە نەدەبوو کارێکی وا بکەن ژنەکەی من خۆی بکوژێ.» ئەوان گوتیان: کاکە ئێمە کە ئەو کارە نەشـیاوەمان کرد، ئەوە ئاکامەکەشـیمان دیتەوە. ئەتۆش لێمان خۆش بە. عەبدوڵڵا سـەری داخسـت. سـەعیدە گوتی: «تۆ کە ئەو هەمووە بێ ڕەوشـتی و ناپاکییەت بە وانەوە دیوە چۆن توانیت لێیان خۆش بی؟» عەبدوڵڵا وەڵامی داوە، هەر کەس لە کاتی دەسـتڕۆیشـتندا لە کەسێک خۆش بێ، خودا پاداشـی دەداتەوە.» سـەعیدە گوتی: «بەڵام تۆ دووری لەوانە بکە. ئەوانە جێی باوەڕ نین و ناپاکن.» ئیدی ماڵاوایی لە عەبدوڵڵا کرد و ڕۆیشتەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دوای ئەوە سەعیدە مالاوایی لە عەبدوڵلا کرد و ڕۆیشت. عەبدوڵلا لەگەڵ براکانی هەتا بەیانی هەر خەریکی قسە و باس و پێکەنین بوون. کە ڕۆژ بووەوە بردنی بۆ گەرما و جلی شکۆدار و گرانبایی لە بەر کردن و گەڕانەوە ماڵێ. داوای نانیان کرد و سفرە ڕاخرا. کە خزمەتکارەکان چاویان بە براکانی عەبدوڵلا کەوت ئەوانیان ناسییەوە و سلاویان لێ کردن و چاو و دڵ ڕوونیان لە عەبدوڵلا کرد. دوای نان خواردن، عەبدوڵلا بردنی بۆ خزمەت خەلیفە و ڕێسمەی دەرکی کۆشکی خەلیفەیان ماچ کرد و داوای تەمەن درێژی و ڕاوەستاوییان بۆ شکۆی خەلیفە کرد. خەلیفە گوتی: «عەبدوڵلا پێم بڵێ بزانم چیتان کرد.» عەبدوڵلا گوتی: «خەلیفە، خودا دەست بە گەورەیی و پلە و پایەتەوە بگرێ. کە لێرە چوومەوە بە پشتگەرمی تۆ زنجیرم لە ملی کردنەوە و سفرەم بۆ ڕاخستن و خواردنی باشم دانێ، ئاگام لێ بوو خزمەتکارەکانم، سەریان لەو کارە سووڕ مابوو. بە شێتیان دەزانیم. بەرماوەکانیان نەخوارد. ئاگام لێ بوو، دوو دوو، سێ سێ هەر ورتەیان دەهات و باسی منیان دەکرد. جار جار لێشیان حاڵی دەبووم. بەلام هیچم وە سەر خۆم نەهێنا. چونکە دەمزانی ئەوان نازانن ئەوانە برای منن و ناحەقیان نەبوو. ئیدی لێشم نەدان. کارەکەرەکانم ناردەوە ماڵی خۆیان. ویستم بۆخۆشم بخەوم کە سەعیدەی ئەحمەرپاشا بە تووڕەیییەوە لە عەرزی هەڵقولا. بەو جۆرە عەبدوڵلا باسی سەعیدە و چوونەوەی بۆ لای ئەحمەرپاشای باوکی و وەلامەکەی ئەو و بەگشتی تەواوی ئەوانەی بۆ خەلیفە گێڕاوە و پاشان گوتی: ئێستا ئەوە براکانی منن لە بیچمی سەگێتی هاتوونە دەرێ و بوونەوە بە مرۆڤ. خەلیفە چاوێکی لێ کردن، تەماشای کردن دوو گەنجی یەک لە یەک جوانتر دەتگوت مانگن.

ئەوجار خەلیفە بە عەبدوڵلای گوت: «خودا جەزای بە خێرت بداتەوە تۆ منت لە شتێک ئاگادار کردەوە کە نەمدەزانی. بەڵێن بێ قەت نوێژی بەیانیم نەچوێنم. دوای ئەوە خەلیفە کەمێکی سەرکۆنەی براکانی عەبدوڵلا کرد بۆ ئەو کارە نەشیاوەی لەگەڵ عەبدوڵلایان کردبوو. ئەوانیش داوای لێبووردنیان کرد. خەلیفە فەرمووی: «دەستوموشتاق بکەن و لە هەڵەی یەک ببوورن. بە عەبدوڵلاشی گوت: «لە پەنا خۆتیان گرە و ئاگات لێیان بێ.» بە ئەوانیشی گوت: «لە قسەی براکەتان مەچنە دەرێ.» ئەوجار یەکی ماڵێکی زۆری بە دیاری و یارمەتی دانێ و پێی گوتن بڕۆنەوە بۆ ولاتی خۆتان.

ئەوان بە دڵێکی خۆشەوە لە لای خەلیفە هاتنە دەرێ و بەرەو بەسرە گەڕانەوە. کە گەیشتنە نیزیک بەسرە گەورەگەورەکانی شار هەموویان بە پیرییانەوە هاتن. شاریان

ڕازاندەوە و بە شـــکۆیەکی زۆرەوە بردیاننە ناو شـــار. خەڵکی شـــار دۆعای بە خێریان بۆ عەبدوڵلا دەکرد. ئەویش زێڕ و زیوی بە ســـەر خەڵکدا هەڵدەخســـتەوە. کەس براکانی ئەوی بە هێند نەدەگرت و چاویشیان لێ نەدەکردن. ئێرەیی و بەخیلی ئەوان هەر دەهات و سەری دەکرد. هەرچەند عەبدوڵلا لەگەڵیان بە ســـۆز و خۆشـــەویســـتییەوە دەجووڵاوە ئەوان زیاتر لێی بە ڕقدا دەچوون. دوای چەند ڕۆژ یەکی کەنیزێکی خـانومـانی بۆ هێنـان و کەنیز و کۆیلەی لە ئیختیار نان. یەکی پەنجا ئەسپیشی دانێ. پاشان هەر کەسەی پلە و پایەی خۆی بۆ دیاری کرد و پێی گوت: «برایان ئێمە هەر یەکین و چ جاوازییەکمان لە نێواندا نییە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی نۆسەد و هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خـاوەنشـــکۆ! عەبـدوڵڵا بە براکـانی گوت: ئێمە هیچ جیـاوازییەکمـان نییە. بەڕێوبەرایەتی بەســـرە بە ئێمەیە و ئەگەر هاتوو من لە هەوێڵدا نەبووم. ئەوە ئێوە شـــار بەڕێوە دەبەن. بەڵام دەبێ وریا بن لە بڕیارداندا. خۆ لە زوڵم و زۆر بپارێزن و چاوتان لە ماڵی خەڵک نەبێ. ئەوەندەی بتان هەوێ من لە ماڵی خۆم دەتاندەمێ. خەمی ماڵ و نەبێ لەگەڵ خەڵکدا بە ئینساف بن. چونکە خەڵک هیچیان لە بیر ناچێ وەک شاعیر دەڵێ:

مـــلـــهـــوڕی مەکەن لەگەڵ هەژاران
خـــوێـــڕی گەریـیە، هەژار بـــێ پەنـــان
بێ ئەنوا و دەســـتکورت مەترســـی نییە
چەوســـــاندنەوەیان بـلێ ئینســــافییە

بە کورتی، عەبدوڵڵا هەر ئاوا ئامۆژگاری دەکردن. تا وای بۆ چوو کە قســـەکانی جێیان گرتووە و بە گوێی دەکەن. هەر بۆیە باوڕی پێ کردن و زیادە لەوە شایانی بوون گەورەی کردنەوە. ئەوانیش ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ چاکتر لێی بە ڕقدا دەچوون. ڕۆژێک ناسر و مەنسوور پێکەوە دانیشتن. ناسر بە مەنسووری گوت: «ئەرێ برام، هەتا کەی عەبدوڵڵا ئاوا پایەبەرز و دەســـەڵاتدار بێ و ئێمەش لە ژێر فەرمانی ئەوادا بین. ئەو ئێمەی بێ قەدر و قیمەت کردووە و کردوونی بە بەردەست و بریکاری خۆی. بۆ ئێمە نۆکەر و تیزەجاڕی ئەوین؟!» مەنسووریش گوتی: «دەنا هەتا ئەو ئاوا زەق و زیندوو و لە سەر پێ بێ. ئێمە هەر وا ژێر چەپۆکە و بێ نرخ دەبین و بە هیچ کوێ ناگەین. مەگەر بیکوژین و دەســـت بە ســـەر ماڵەکەیدا بگرین. ماڵ و ســامان و خەزێنەکەی لە نێوان خۆماندا دابەش کەین. دیارییەکیش بۆ خەلیفە بنێرین و داوای بریکاری بەســـرە و کووفەی لێ بکەین. جا ئەمن ببمە بریکاری بەسرە و تۆش ببە بە بریکاری کووفە. تۆ دەڵێی چی؟» ناسر گوتی: «ڕاست دەکەی بەڵام چۆنی بکووژین؟» مەنســـوور گوتی: «لە ماڵی یەکمان شـــێوێکی بۆ ســـاز دەکەین و بانگهێشـــتی دەکەین. ئەوەندەی بکرێ ڕێزی دەگرین و میوانداری دەکەین. دوای ئەوە بە هەقایەت و قسەی خۆش دەیخافڵێنین هەتا تەواو شەو دەرنگ دەبێ کە زانیمان شل و بووە جێگای بۆ ڕادەخەین با بخەوێ کە خەوت لە خەودا دەیکوژین و جەســـتەکەی لە دەریا دەهاوێین. کە ڕۆژیش بووەوە دەڵێین خوشـــکە جندۆکەکەی هات و لێی تووڕە بوو گوتی: «ئەوە گڵاو وات لێ هاتووە دەچی لە لای خەلیفە شکایەتمان لێ دەکەی؟ بۆ پێت وایە ئێمە لە خەلیفە دەترســـین؟ ئەگەر ئەو پادشـــایە ئێمەش پادشـــاین. ئەگەر بێت و پێ لە بەرەکەی

زیاتر ڕاکێشی ئەوە بە خراپترین شێوە دەیکووژین. ئێستاش من تۆ دەکووژم، بزانم خەلیفە چی لە دەســـت دێ. ئیدی عەبدوڵلای برد و چوو لە زەوییەوە. ئێمە کە ئەوەمان دیت زمانمان شـــکا و لەوێ کەوتین. کە وەهۆش هاتینەوە شــوێنەواری نەمابوو. دوای ئەوە کەسێک ڕادەسپێرینە لای خەلیفە و لە ڕووداوەکەی ئاگادار دەکەینەوە. کە ماوەیەکیشی پێ چوو، شــتەکە کەمێک لە بیر چووەوە، دیاری و شــتی شـیاو دەنێرین بۆ خەلیفە و داوای بەڕێوەبەرایەتی کووفە و بەسـره دەکەین. ئەوجار بە خێر و خۆشـــی بێ ترس دەژین.» ناسر گوتی: «براکەم فکرێکی جوان و بەجێیە.»

ناسـر و مەنسـوور لە سـەر کوشـتنی براکەیان ڕێک کەوتن. ناسـر چوو بە عەبدوڵلای برای گوت: «دەبێ ســبەینێ بۆ فراوین بێیە ماڵی ئێمە، دڵم کەمێک نارەحەتە پێم خۆشــە ژەمێک پێکەوە نان بخۆین و کەمێک دانیشــین.» عەبدوڵلا وەڵامی داوە و گوتی: «دڵم نایە دڵت بشــکێنم، ماڵی من و ئێوە تۆفیری نییە.» ئینجا ڕووی لە مەنســوور کرد و گوتی: «مەنســوور تۆش دەبێ لەگەڵم بێی. کەمێک دادەنیشــین.» مەنســوور گوتی: «بە گیانی تۆ لەگەڵت نایەم، هەتا ســوێندم بۆ نەخۆی دوای ئەوێ بێی بۆ ماڵی منیش. چونکە منیش خۆم بە برا دەزانم. دەتەوێ ئەو دڵی نەهێشـــێ دەبێ ئاگات لە دڵی منیش بێ.» عەبدوڵلا گوتی: «باشە بە سەر چاو، دێم بۆ ماڵی ئێوەش جا فەرقی چییە؟ هەر دووکتان هەر بران.»

ناســر دەســتی عەبدوڵلای برای ماچ کرد و هاتە دەرێ چووەوە ماڵێ و فەرمانی دا بۆ فراوینی سـبەینێ نان و چێشـتێکی خۆش سـاز کەن. بۆ ڕۆژی دوایە، عەبدوڵلا سـوار بوو لەگەڵ تاقمێک لە باڵبازەکانی و مەنسووری برای چوون بۆ ماڵی ناسر.

عەبدوڵلا چووە ژوورێ و لەگەڵ براکانی دانیشــتن. ســـفرە ڕاخرا و خواردن داندرا. هەموو جۆرە خواردنێکیان لە ســـەر ســفرە دانا. نانەکەیان خوارد و دەســتیان شــوتەوە. ئەوڕۆژە هەتا شەو هەر بە قسەی خۆش و گاڵتە و جەفەنگ ڕایان بوارد. نوێژی شێوانیان کرد و نانیان خوارد. دوای شێویش هەر ناسر شتێکی دەگێڕاوە و مەنسوور شتێکی دیکەی دەگێڕاوە. عەبدوڵلاش گوێی لێ ڕاگرتبوون. هەر ئەو سێ کەسـە لە کۆشـک بوون. باڵباز و پیاوەکانی دیکە لە دەرەوە جێ و ڕێی خۆیان هەبوو. ئیدی بەردەوام ناســر و مەنســوور هەواڵی جۆراجۆر و نەقڵ و نزیلە و چیرۆکی جۆراجۆریان بۆ دەگێڕاوە. تا وای لێ هات. عەبدوڵلا ئەوەندە شـەکەت و ماندوو ببوو، لەبەر باوێشـک و خەونووچکە چییان لێ حاڵی نەدەبوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک عەبدوڵڵا تاقەتی نەما و خەو برستی لێ بڕی. براکانی جێگایان بۆ ڕاخســـت. عەبدوڵڵا جلەکانی داکەند و چوو لە جێوە و خەوت. براکانی لەو لاوە خۆیان مات دا هەتا جوان خەوی لێ کەوت. ئەوجار هەستان سواری سەری بوون. عەبدوڵڵا خێرا وەخەبەر هات ســـەیری کرد براکانین. گوتی: «ئەوە چ بووە، براگیان بوا دەکەن؟» گوتیان ئێمە برای تۆ نین و ناتناسین. بێ ڕەوشت تۆ بۆ مردن باشی. ئیدی دەستیان لە ئەوکی توند کرد، هەتا جووڵەیان لێ بڕی. کە هەســـتیان کرد مردووە هەڵیان گرت و لە خوار کۆشـــکەوە لە دەریایان هاویشـــت. لەو جەنگەیەدا بای دەهات و پێل لە گوڕ بوون. وا بوو ئەوەندەی پێ نەچوو شەپۆل ڕایدا و بردی هەتا گەیاندییە و ئەوبەر و خستییە لاوە. کەوتە قەراغ ئاوەکە. شـــانســـی خۆی، ئەوبەری دەریا ســـەر ڕێی کاروان بوو. لەو جەنگەیەشـــدا کاروان هات و دیتیان تەرمێک لەوێ کەوتووە.

کابرایەکی ژیر و زانا و دونیا دیتوو، شارەزا لە زۆر کاروباران لەگەڵ ئەو کاروانە بوو. کە ســـەیری کرد تاقمێک لە پێشـــەوەی کاروان لە شـــوێنێک کۆ بوونەوە. چووە پێشـــێ و پرســـی: «ئەوە چی بووە؟» گوتیان دەریا کەسێکی خنکاوی خستووەتە لاوە. ئەوەتا لێرە کەوتووە. کابرا چووە پێشـــێ و کەمێکی تێ ڕاما و لێی ورد بووەوە. پاشـــان ڕووی لە خەڵکەکە کرد و گوتی: «خەڵکینە ئەو پیاوە هێشـــتا ماوە! ئەو لاوە کوڕی خانەدان و هەڵکەوتانە. ڕەنگیشە بێتەوە سەرخۆ. ئیدی کابرا هەڵی گرتەوە و لەگەڵ خۆی بردی، هەتا سێ وێستگە دەرمانی کرد. عەبدوڵڵا وردەوردە جووڵە و بزووتی زیاتر دەبوو، بەڵام زۆر کەنەفت و کەلەلا بوو. کابرا شـەربەتی جۆراوجۆر و خواردەمەنی وزەبەخشـی دەدایە. هەر ئاوا ڕۆیشـتن هەتا دوای مانگێک گەیشـتنە شـارێک بە نێوی «عەوج». لەو شـارە لایان دا کاروانســـەرایەک. لەو کاروانســـەرایە لە دیوێکدا جێ و بانی بۆ ڕاخســـت و درێژی کرد و دایپۆشـی. ئەو شـەوە هەتا بەیانی هەر ناڵاندی. کە ڕۆژ بووەوە، دەرکەوانی کاروانسـەراکە هات و گوتی: «ئەو نەخۆشـــە کێیە ئەوشـــەو خەوی لە ئێمەش حەرام کرد؟» کابرا گوتی: «ئەوەم بە نیوە خنکاوی لە قەراغ دەریـا دیتەوە. لەمێژە ئاوا بە دەوریدا دێم و دەرمانی دەکەم. هێشتا چا نەبووەتەوە.» دەرکەوانەکە گوتی: «پێشانی ڕاجیحەی بدە.» کابرا گوتی: «ڕاجیحە کێیە و چ کارەیە؟» دەرکەوان گوتی: «ئێرە کچێکی جوانی کەچینی لێیە ناوی ڕاجیحەیە. هەرکەس هەر دەردێکی هەبێ، دەیبەنە لای ئەو. شـــەوێک لە لای ئەو کچە دەمێنێتەوە و بەیانی ســـاغ و ســـەلیم دەبێتەوە.» کابرا گوتی: «ماڵەکەیانم پیشـــان بدە.» درەکەوانەکە گوتی: «نەخۆشەکەت هەڵگرە با بڕۆین.»

کابرا نەخۆشی هەڵگرت و ڕۆیشتن. گەیشتنە سووچی کۆڵانێک. سەیری کرد، پۆلێک بە پێکەنین و کەیفسازییەوە دێنە دەرێ و تاقمێکیش بە ئەڵلا و وەڵلا دەچنە ژوورێ. دوای ئەو تاقمە دەرکەوان لە بەر دەرگاوە بانگی کرد، ڕاجیحە خانم چاوێکمان بۆ لەو نەخۆشـــە دەکەی؟ ڕاجیحە لە پشــت پەردەیەکەوە گوتی بیهێننە ژوورێ. ئەوان نەخۆشــەکەیان بردە پشت پەردە و هاتنەوە دەرێ. عەبدوڵلا بە حاڵ چاوی هەڵێنا خێرا ناسییەوە. سەیری کرد، ڕاجیحە هەر ئەو کچەیە کە لە شـــارە بەبەردبووەکەوە هێنابووی. ئەویش عەبدوڵلای ناسییەوە و سڵاویان لەیەک کرد. عەبدوڵلا گوتی: «ئەوە کێ تۆی هێنا ئێرە؟» کچە وەڵامی داوە گوتی: «کاتێک دیتم براکانت تۆیان لە دەریا هاویشت و لەسەر من کردیان بە شەڕ و هەرا، ئەمنیش خۆم لە دەریا هاویشت. لەڕێوە ئەبوولعەباسی خزر، منی گرتەوە و بردمیێ قەراخ ئاوەکە، ئێزنی چاک کردنەوەی نەخۆشـــانی دامێ. لە نێو شـــار جاڕی دا: هەرکەس نەخۆشـــی هەیە، بیباتە لای ڕاجیحە خانم. بە منیشـــی گوت لەو شـــارە ئاکنجی بم. هەتا خۆشـــەویســتەکەت دێتە لات. بەوجۆرە هەر نەخۆشـێکیان هێنا لام دۆعام بۆ کرد و چاک بووەوە و نێوم دەرکرد و ناســـرام. خەڵک نەدر و قوربانییان بۆ دێنام. ئێســـتا ماڵ و سامانێکی زۆرم وەسەر یەک ناوە و قەدر و ڕێزێکی باشیشم لە نێو خەڵکدا هەیە. ئەوجار کچە دۆعای بۆ کرد و دەستێکی بە سەریدا هێنا و بە هێز و ڕوحمی خودای گەورە لەڕێوە چاک بووەوە و وەک ئەوەی قەتقەت نەخۆشیش نەبووبێ. حەزرەتی خزر هەموو شەوێکی هەینی دەهات میوانی دەبوو، لەگەڵی دادەنیشــت و قســـەی لەگەڵ دەکرد . ڕێکەوت وا بوو ئەو شەوەش هەینی بوو. هەر بۆیە عەبدوڵلا و کچە بە چێشتی خۆش و بەتامەوە چاوەڕێی حەزرەتی خزر بوون و خەریک بوون قســەیان دەکرد کە لە پڕدا حەزرەتی خزر [ســڵاوی لێ بێ] پەیدا بوو. ئەوانی لەو دیوە هەڵگرت و بردنی لە کۆشـــکەکەی عەبدوڵلای بنی فازڵ دای نان.

کە ڕۆژ بووەوە، عەبدوولا سەیری کرد لە کۆشکەکەی خۆیەتی. لەو جەنگەیەدا گوێی لە هەرا و قرمەقرمێک بوو کە سەری کێشا دەرێ، سەیری کرد براکانی لە دار دراون. ئەویش لەبەر ئەوە بوو، دوای ئەوەی عەبدوڵلا دەخەنە دەریاوە، بەیانییەکەی دەســـت دەکەن بە شـــین و گریان و لە لای خەڵک دەڵێن براکەمان جندۆکە بردوویەتی. پاشـــان ماڵ و سامانەکەی بەش دەکەن. ماوەیەکی پێ دەچێ ئەوجار دیارییەکی زۆر شایانەی و شیاوی خەلیفە دەنێرنە بەغدا بۆ خەلیفە و ئەو ڕووداوەی بۆ دەگێڕنەوە و داوای دەســـەڵاتی بەڕێوبەری بەســـرە و کووفە دەکەن. خەلیفە پیاویان لە دوو دەنێرێ. ئەوان دەچنە لای خەلیفە. خەلیفە لێیان دەپرســـێ ئەوە چی بووە دا بۆم بگێڕنەوە. ئەوان چۆنیان ڕووداوەکە ڕێک خســتبوو بۆیان گێڕاوە. خەلیفە زۆری ڕق هەســتا. ڕاوەســتا هەتا بوو بە شــەو. لای بەیانی هەســـتا دوو ڕەکاتی نوێژ کرد. داوای لە هۆزی جندۆکان کرد، کۆ بنەوە. تەواو

ســەرۆک هۆزی جندۆکان کۆ بوونەوە. خەلیفە لێی پرسـین: «پێم بڵێن چیتان لە عەبدوڵڵا کردووە؟» هەموویان سوێندیان خوار کە ئەوان هیچیان لێ نەکردووە و بە هەواڵی نازانن. ئەوجار سەعیدەی کچی ئەحمەرپاشا هاتە پێشێ و کورنۆشی برد. بەسەرهاتی عەبدوڵڵای بۆ خەلیفە گێراوە. خەلیفە ئیزنی دان بچنەوە. کە رۆژ بووەوە ئەوەندەیان لە ناسـر و مەنسـوور دا و جەزرەبەیان دان هەتا دانیان پێدا نا کە چیان کردووە. خەلیفە فەرمووی لە بەر کۆشکەکەی عەبدوڵڵا لە داریان دەن. [ئەوان ئاوایان بە سەر هات.]

عەبدوڵڵاش کە سەری کێشا دەرێ و دیتی براکانی لە دار دراون، لە کۆشک هاتە دەرێ، فەرمانی دا لە داریان کەنەوە و بیان نێژن. دوای ئەوە سوار بوو بەرەو بەغدا کەوتە رێ و تەواوی ئەو شـتانەی بە سـەری هاتبوو، هەمووی بۆ خەلیفە گێراوە. پێی گوت کە براکانی چیان لێ کردووە. خەلیفە سەری لەو رووداوانە سوور مابوو. بانگی قازی و شایەدی کرد و ئەو کچەی عەبدوڵڵا لە شـارە بەبەردبووەکەوە هێنابووی لێی مارە کرد. ئیدی بوو بە حەلاڵی و هەتا ئاخری تەمەنیان ژیانیان لە عەیش و نۆش دابوو.

### هەقایەتی مارفی پینەچی

دەگێرنەوە لە وڵاتی میسـر کابرایەکی پینەچی هەبوو نێوی «مارف» بوو. مارف ژنێکی بێ شەرم و حەیا و روو لێ هەڵماڵراوی هەبوو، بە نێوی فاتمە. فاتمە بە هۆی ئەو هەڵشەیی و دمهەراشییەی پێیان دەگوت: «سازندە[1]». ئەو ژنە قسەی سووکی بە مێردەکەی دەگوت و فەرمانی پێ دەدا. مێردەکەی دەترسـا لێی دا. نەیدەوێرا هیچی پێ بڵێ. پیاوێکی بە شـەرم و حەیا بوو. دەسـتەنگیش بوو. هیچی شـک نەدەبرد. ئەگەر شـتێکیشـی پەیدا کردبا بۆ ئەو ژنەی خەرج دەکرد. ئەگەر هیچیشـی پەیدا نەکردبا، شـەو دەردێکی دەدایە ژیانی لێ تاڵ دەکرد. ئەو ژنە کەسێکی وا بوو، وەک شاعیر دەڵێ:

لەتـمـکـار و دمـەهـراش و بـێ چـاوورِوو
نەحەواوە، دووزمـان، دڵـپـیـس و دووروو

جارێکیان ژنە بە کابرای گوت، گوتی: «مارف، ئەورۆ دەبێ برینج و شـەکر و هەنگوین و زولووبیام بۆ بێنییەوە.» مارف گوتی: «ئەگەر خودا بە قسـمەتی کا دەیهێنمەوە، دەنا بە خودا یەک درەمم نییە.» ژنە گوتی: «ئەمن ئەو قسانەم بە گوێدا ناچێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. شرودر، بێ حەیا.

## که شەوی نۆسەد و نەوەدەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ژنە گوتی: «من ئەو قسانەم بە گوێدا ناچێ» خودا بە قسمەتی بکا یان نەکا، بێ زولوولبیا و هەنگوین مەیەوە. چونکە ئەگەر بێیەوە شەوەکەت لە بەختت ڕەشتر دەکەم.» پیاوە گوتی: «خودا کەریمە دەی.» دوای ئەوە مارف بە کۆڵێک خەمەوە نوێژی بەیانی کرد و وە دەر کەوت. چوو دووکانی هەڵگرت و لەبەر خودا پاڕاوە و گوتی: «خودایە تکایە ئەوڕۆ پارەی زولوولیا و هەنگوینەکەم بە قسمت بکەی و لە زمان و شەڕی ئەو قەحبەی گلاوەم بپارێزی.» تا نیوەڕۆ دانیشت هیچی پەیدا نەکرد. لە ترسی ژنەکەی حەجمینی نەبوو. سەری لێ قورس ببوو، چووبوو لە فکری کڕینی هەنگوین و زولوولیاوە. ئەوە لە کاتێکدا پارەی نانەکەی پێ نەبوو. بەدم فکرەوە گەیشتە بەر دەرکی دووکانی زولووبیا فرۆشی. لەوێ ڕاوەستا و ملی لار کردەوە و چاوی پڕ کرد لە ئاو. کابرای زولوولیا فرۆش چاوێکی لێ کرد و گوتی: «وەستا مارف، ئەوە بۆ دەگری؟ پێم بڵێ چی بووە.» مارفی پینەچی دۆخی خۆی بۆ باس کرد و گوتی: «ژنەکەم زۆر مارِز و دڵڕەقە، پێی چەقاندووە بۆ زولووبیا و هەنگوین و منیش لە بەیانییەوە لە دووکانم و هیچ کارێکیان بۆ نەهێناوم و هیچم نەهاتووەتە دەست. بەشی نانەکەشم پەیدا نەکردووە. ئەمن لەو ژنەم دەترسم. کابرا بە قسەی پینەچییەکە پێکەنی و گوتی: «مەترسە، ئیدی پێنج ڕیتڵی زولووبیا بۆ کێشا و بە مارفی گوت: «هەنگوینی ئەسڵم لە لایە بەڵام ئی من نییە. هەنگوینەکەی خۆم، شەکری لەگەڵە، ئەگەر لەگەڵ ئەو هەنگوینە بێ قەی دەکا؟» مارفی پینەچی بە شەرمەوە گوتی: «نا هەر لەوەی بەسەر دا بکە.»

دوای ئەوە کابرا زولووبیاکەی لە ڕۆندا سوور کردەوە و لەو هەنگوینەی بە سەردا کرد. ئەوەندە جوان دەرهات شایانی ئەوە بوو بە دیاری بیبەی بۆ شاژن. ئەوجار لە مارفی پرسی نان و پەنیریشت دەوێ؟» مارف گوتی: «بەڵێ،» کابرا بایی چوار درەمیشی نان و پەنیر بۆ کڕی. لەگەڵ دە درەمی نرخی زولووبیا و هەنگوینەکە لێکی دا و پێی گوت، گوتی: «مامۆستا، لە بیرت نەچێ ئەوە پازدە دەرمی منت دەکەوێتە لا. ئێستا بچۆوە لەگەڵ ژنەکەت کەیف و خۆشی خۆت بکە و ڕایبوێرە. ئەوەش درەمێک بچووە بۆ گەرما. ئەمن دوو سێ ڕۆژیشت لە سەر ڕادەوەستم بەشکم خودا دەرکی ڕەحمەتت بە سەردا بکاتەوە.

مارفی پینەچی ئەوجار زولووبیا و هەنگوین و نان و پەنیری هەڵگرت و بە دڵێکی خۆشەوە بەرە و ماڵ بووەوە. زۆریشی دۆعا بۆ کابرای زولووبیا فرۆش کرد. هەرکە گەیشتەوە ماڵێ ژنە پرسی: «زولووبیا و هەنگوینت هێناوە یان نا؟» ماریف گوتی: «ئەرێ. هێناومە.» ئینجا ئەوەی هێنابووی لە بەر دمی ژنە دانا. ژنە چاوێکی لێ کردن، تەماشای

کرد، زولووبیاکە لەگەڵ هەنگوینی ڕەسەن تێکەڵ نەکراوە. بە مێردەکەی گوت: «مەگە پێم نەگوتی، زولوبیاکە دەبێ ڕێواقی هەنگوینی بەسەردا کرابێ، ئەو شیلەشەکرە چییە بۆ منت هێناوە؟» مارف گوتی: «ئەوانەشم بە قەرز هێناوە، خۆ پارەم پێ نەبوو.» ژنەکەی هەڵیدایە: «قسەی قۆڕم بۆ مەکە.» من ئەو زولوولبیایە ناخۆم هەتا ڕێواقی هەنگوینی بە سەردا نەکرابێ.» ئیدی ڕقی هەستا و شتەکانی هەڵگرت و بە سەر سەریدا دا و گوتی: «گڵاو، هەستە برۆ ئیدیکەم بۆ بێنە.» بە زللە و چەپۆک وەری گەڕایە. ددانێکی شکا و خوێن بە لالغاوە و چەنەیدا هاتە خوارێ و هیچ سینگ و بەرۆکی نەما. کابراش ڕقی هەستا، زللەیەکی لە ژنە دا. ئیدی ژنە ڕدێنی گرت. ئەویش دەستی کرد بە هات و هاوار کە ئەی خەڵکینە، موسوڵمانان. جیرانەکان لێیان وەژوور کەوتن و ڕدێنیان لە دەستی ژنە دەر هێنا و دڵخۆشیان داوە و گوتیان: خۆ ئێمەش زولووبیا هەر بە شیلەی شەکرەوە دەخۆین. تۆ بۆ ئاوا لەو کابرا فەقیرە دەکەی؟ دەروجیران هەر ئاوا قسەیان بۆ کردن و دڵخۆشیان دانەوە، هەتا ئەهوەن بوونەوە و کێشەکەیان تەواو بوو. کە ئەوان ڕۆیشتن ژنە گوتی: «بە خودا من دم لەو زولووبیایە نادەم. کابرا لە برسان برستی لێ بڕابوو. گوتی: «وەڵا دەنا من دەیخۆم هێزم لە بەردا نەماوە لە برسان. ئینجا دەستی کێشا و دەستی کرد بە نان خواردن. ژنە گوتی: «بخۆ، حەک بە قوزەڵقوررت بێ و لە عەرزت بدا و ئیدی هەڵنەستیوە.» پیاوەکە گوتی: «باشە تۆ بۆ ئاوا دەکەی، بزانم شەوێکی دیکە بە هەنگوینەوە بۆ تۆ ناهێنمەوە. دانیشە بە تاقی تەنێ هەمووی بخۆ.» بەوجۆرە هەر کابرا بە لەسەرخۆیی و ژنەش بە شاتوشووت و شەڕەوە تووک و دۆعای لێ کرد و هەتا بەیانی قسە و جنێوی پێ دا. کە ڕۆژ بووەوە وەر گەڕایە مێردەکەی و قۆڵی لێ هەڵماڵی. کابرای داما و هەر دەیگوت ئەتۆ لێم گەڕێ ئەورۆ زولووبیا و هەنگوینت بۆ دێنمەوە.

دوای ئەوە کابرای پینەچی لە ماڵ هاتە دەرێ. چوو لە مزگەوت نوێژەکەی کرد و بەرەو دووکان بووەوە. دووکانی هەڵگرت و دانیشت. هێشتا ئاڵقەڕێزی دەرگاکە دەلەراوە، دوو پیاوی قازی هاتن و گوتیان هەستە وە پێشمان کەوە با بچین بۆ لای قازی، ژنەکەت شکایەتی لێ کردووی. لەڕێوە هەستا لەگەڵیان چوو بۆ ماڵی قازی. سەیری کرد ئەوە ژنەکەی دەستی هەڵبەستووە و پەچە و شتەکەی هەمووی خوێنە و لەوێ ڕاوەستاوە و دەگری. قازی ڕووی لە مێردەکەی کرد و گوتی: «کاکە ئەوە تۆ لە خودا ناترسی ئەو دەردەت داوە بەو ژنەت، دەست و ددانیت شکاندووە؟» کابرا وەڵامی داوە و گوتی: «جەنابی قازی ئەگەر من ئاوام لەو ژنە کردبێ حازرم تۆ چیم لێ دەکەی لێم بکە. کێشەکەی ئێمە ئاوا بوو، ئەوە جیرانەکانیش شایەدن، ئەوانیش هاتن لێکیان کردینەوە.»

ئیدی تەواوی بەسەرهات و کێشەی خۆیانی بۆ قازی گێڕاوە. قازییەکە زۆر پیاوی چاک بوو. چارەگە دینارێکی دایە و گوتی: «ها ئەو پارەیە بگرە و بچووە زولووبیا و هەنگوینی

بۆ بکرە و ئاشت بنەوە. مارفی پینەچی گوتی: «قازی ئەو پارەیە بدە بە خۆی. ئیدی قازی پارەکەی دا بە ژنە و ئاشتی کردنەوە. بە ژنەکەی گوت: «بە قسەی بکەی و لەگەڵی هەڵکە» بە مێردەکەشی گوت: «بسازێن و لەگەڵ یەک بحاوێنەوە.» بەوجۆرە ژن و پیاوە لە لای قازی ئاشت بوونەوە و هاتنە دەرێ. ژنە بە لایەکدا ڕۆیشت و کابراش بە لایەکی دیدا چووەوە بۆ دووکان و لە دووکان دانیشت. لە پڕدا پیاوەکانی قازی هاتنەوە لای و داوای ڕاسپاردانەیان کرد. مارف گوتی: «قازی بۆخۆی چی لێ وەر نەگرتم هیچ چارەگە دینارێکیشی دامێ. ئەوان گوتیان ئێمە کارمان بە قازی نەداوە لێت وەردەگرێ یان پێت دەبەخشێ، ئێمە ڕاسپاردانەی خۆمان دەوێ. ئەویش کە هیچی پێ نەبوو، ناچار چوو کەمێکی لە شتەکانی پینەچێتییەکەی فرۆشت. نیوەی پارەکەی دا بە ڕاسپاردەکانی قازی و ئەوانی ناردەوە و بۆخۆی بێکار دانیشت و دەستی لە سەر دەستی دانا. لە ناکاو دوو پیاوی زلی ناحەز لێی وەژوور کەوتن و گوتیان، هەستە وە پێشمان کەوە بۆ لای قازی ژنەکەت شکایەتی لێ کردووی. پینەچی گوتی: «خۆ قازی ئێمەی ئاشت کردەوە.» ئەوان گوتیان، ئێمە لە لای قازییەکی دیکەوە هاتووین. پینەچی هەستا لەگەڵیان چوو. کە چاوی بە ژنەکەی کەوت، گوتی: «ئەخە، لە قەحبە بوو، مەگەر ئێمە تازە ئاشت نەبووینەوە؟» ژنە وەڵامی داوە و گوتی: «ئەمن قەت لەگەڵ تۆ ئاشت نابمەوە.»

ئەوجار پینەچی چووە پێشێ و هەرچی ببوو بۆ قازی گێڕاوە و پێی گوت: «فلانە قازی ئێستێک لەوە پێش ئێمەی ئاشت کردەوە.» قازی ڕووی لە ژنە کرد و گوتی: «گلاو، ئەگەر ئاشت بوونەوە بۆ هاتوویەوە ئێرە و شکایەتت کردووە؟» ژنە گوتی: «قازی، دوای ئەوەی ئاشت بووینەوە دیسان لێی دامەوە.» قازی گوتی: «دیسان ئاشت بنەوە. کاکە ئیدی لێی مەدە، خانم ئەتۆش بێ قسەیی مەکە.» بەو جۆرە دیسان ئاشتی کردنەوە. قازی بە مارفی گوت: «ڕاسپاردانەی ئەو پیاوانە بدە.» مارف ئەویشی دا و گەڕانەوە. کە چووەوە دووکان سەیری کرد دووکان هەڵگیراوە! زەندەقی چوو. تاسێکی بە سەریدا هات. لە پڕدا پیاوێک هات و گوتی: «مارف هەڵێ لە جێیەک خۆت بشارەوە. ژنەکەت چووە لە لای والی شکایەتی کردووە. ئەوە پیاوەکانی والی لە تۆ دەگەڕێن. مارف هەستا لەڕێوە چوو دەرکی دووکانی گاڵە دا و بەرەو بابوننەسر هەڵات. لەو پارەیەی کە شتەکانی فرۆشت، پێنج درەمێکی پێ مابوو. چوار دەرمی دا کەمێکی نان و پەنیر کڕی و لە دەست ژنەکەی هەڵات. کە لە دەروازەی شار چووە دەرێ، زستان بوو. ئێوارە بوو هەورێک بەری ئاسمانی گرتبوو. ماوەیەک ڕۆیی دایدا بارانە. لە ترسی تەڕبوونی جلوبەرگەکەی، لای دا کەلاوەیەک. زۆر ناڕەحەت بوو. فرمێسکی دەهاتنە خوارێ و دەیگوت من لە دەست ئەو قەحبەیە ڕوو لە کوێ کەم؟ خودایە کەسێکم لێ پەیدا بێ بمبا بۆ شارێکی دوور دوور وابێ هەتا نەمبینێتەوە.

لەو جەنگەیەدا کە ئەو دانیشتبوو ئاوا بە ناڕەحەتی دەگریا و دەپاڕاوە، دیواری کەلاوەکە قەڵەشا و کەسێکی زەبەلاحی ناشیرین پەیدا بوو گوتی: «کاکە تۆ کێی بەو شەوە منت لە هەراسان ناوە؟ دووسەد ساڵە من لێرەم تا ئێستا کەس ڕێی لێرە نەکەوتووە و وەک تۆ بکا؛ زۆرم زگ پێت سووتا. پێم بڵێ بزانم چم لە دەست دێ. یارمەتیت بدەم.» مارفی پینەچی گوتی: «ئەتو کێی و چ کارەی؟» وەڵامی داوە گوتی: «من خاوەنی ئەم شوێنەم. ئیدی پینەچی تەواوی بەسەرهاتی خۆی و ژنەکەی بۆ گێڕاوە. ئەو کەسە گوتی: «پێت خۆشە بتبەمە شارێک قەت نەتبینێتەوە؟» مارف گوتی: «ئەرێوەڵلا ئەمن ئەوەم دەوێ.» ئەو دێوە، خێرا مارفی گرت و لە سەر شانی دانا و بردی هەتا کازیوەی بەیانی بە حەوایدا بردی و لەوێ لە سەر کێوێک داینا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک ئەو دێوە مارفی برد لە سەر ئەو کێوە داینا، پێی گوت: «کاکی مرۆ، لەو کێوە برۆ خوارێ دەگەیە شارێک. بچۆ ناو ئەو شارەوە تازە چاوت بە چاوی ئەو ژنەت ناکەوێتەوە و قەت ناتبینێتەوە.»

دێوەکە ئەوی لەوێ دانا و بۆخۆی ڕۆیشت. مارف گێژ و کاس بە حەبەساوی لەو سەر کێوە بوو، هەتا تاو هەڵات. دوایە هەستا داگەڕا و لە کێوەکە چووە خوارێ. گەیشتە شارێک، ئەو شارە شوورە و دەروازەی بڵیندی بوو، چووە ژوورێ. سەیری کرد دڵی ماندووی لێ دەحەساوە. شارێکی خۆش و لە بەر دڵان. چووە نێو بازاڕەوە. خەڵک چاویان تێ دەبڕی و جلوبەرگەکەیان پێ ســــەیر بوو، وەک جلوبەرگی ئەوان نەدەچوو. کابرایەک لێی پرســـــی: «کــاکە تۆ غەوارەی؟» مــارف وەڵامی داوە و گوتی: «بەڵێ غەوارەم.» گوتی: «لە کــام شارەوە هاتووی.» مارف گوتی: «لە میسرەوە.» پرسی: «کەی وەڕێ کەوتووی؟» وەڵامی داوە: «دوێنێ ئێوارە.» کابرا پێکەنی و گوتی: «خەڵکینە وەرن شــتێکی ســەیر، ئەو کابرایە دەڵێ خەڵکی میســـرم و دوێنێ دوانیوەڕۆ لە میســـرەوە کەوتوومە ڕێ.» خەڵکەکە هەموو پێکەنین و لە دەوری کۆ بوونەوە. لێیان پرســــی کاکە مەگەر تۆ شـــێت بووی، قســـەی وا دەکەی. هەر بە ڕاسـت پێت وایە دوێنێ لە میسر بووی ئەمڕۆ گەیشتوویە ئێرە؟ کاکە ئێرە و میسر یەک ساڵەڕێیە ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ مارف وەڵامی دانەوە: «ئەمن درۆ ناکەم، ئێوە شـێتن باوەڕم پێ ناکەن من ئێسـتا نانی تازەی میسـرم هەر پێ ماوە. نانەکەی پێشـان دان. نانەکەیان دی هیچ کوێی وەک نانی ئەوان نەدەچوو. سـەریان ئەوەندەی دیکەش سـووڕ ما. هەر هات و خەڵکی زیاتر لێ کۆ بووەوە. پێکەوە قســـەیان دەکرد و دەیان گوت بە ڕاســـت ئەوە نانی میسرە. هاتنی مارف بە شەوێک لە میسرەوە لە ناو شاردا دەنگی داوە. بەشێ لە خەڵک باوەڕیان دەکرد و دەیانگوت ڕەنگە پیاوی خودا بێ. تاقمێکیش باوەڕیان پێ نەدەکرد و گاڵتەیان پێ دەکرد.

وا بوو لەو جەنگەیەدا کە ئەو باسـە لە گۆڕێ بوو، بازرگانێک بە سـواری یەسـترێکەوە هات و دوو کۆیلەش بە دوایەوە بوون. خەڵکەکەی لێ دوور خستەوە و گوتی: «ئەوە پێتان عەیب نییە، ئاوا دەوری ئەو کابرا فەقیرەتان داوە و گاڵتەی پێ دەکەن؟ چ کارتان پێی داوە؟ لاچن برۆن.» باش بوو کابرا خەڵکەکەی دەنگ دا و بڵاوەی پێ کردن و کەســـیش نەیوێرا وەدەنگ بێ. ئیدی کابرا قۆڵی مارفی گرت و لەگەڵ خۆی بردی هەتا گەیشـــتنە ماڵێکی گەورە و ڕازاوە. بردییە ژوورێ و لە شـــوێنێکی بەرز داینـا. بە خزمەتکـارەکـانی گوت جلوبەرگی بـازرگـانـانەی بۆ بێنن با لە بەری بکا. مـارف پیـاوێکی کەشـــخە بوو کە ئەو

جلوبەرگەشی لە بەر کرد. دەتگوت شابەندەرە. دوای ئەوە گوتی سفرە ڕاخەن. سفرەیان ڕاخست و پڕپڕیان کرد لە خواردەمەنی جۆراوجۆر. نانیان خوارد. بازرگان لێی پرسی: «ناوت چییە و لە کوێوە هاتووی؟» وەڵامی داوە: «ناوم مارفە، پینەچیم و لە وڵاتی میسرەوە هاتووم.» بازرگان پرسی لە کوێی میسرەوە؟» مارف گوتی: «بۆ تۆ شارەزای ناوچەکانی میسری؟» بازرگان گوتی: «من بۆخۆم میسریم.» مارف گوتی: «من خەڵکی گەڕەکی «دەربولئەحمەڕ»م. بازرگانە پرسی: «لە دەربولئەحمەڕ کێ دەناسی؟» مارف گوتی: «فلانی و فلانی و فلان دەناسم.» بازرگان پرسی: «گەلۆ شێخ ئەحمەد دەناسی؟» مارف گوتی: «لەگەڵ شێخ ئەحمەد دیوار بە دیوارین.» بازرگان گوتی: «خۆ شوکور ساغ و سلامەتە؟» مارف گوتی: «شوکور زۆر باشە.» بازرگانەکە پرسی: «چەند منداڵی هەیە؟» مارف گوتی: «شێخ ئەحمەد سێ منداڵی هەبوو: مستەفا و محەممەد و عەلی.» بازرگان پرسی: «کوڕەکان خەرکی چین؟» مارف وەڵامی: «کوڕە گەورەکەی واتە مستەفا مامۆستایە و دەرس دەڵێتەوە. محەممەد باوکی ژنی بۆ هێنا و منداڵێکیان بوو ناوی نا حەسەن، بۆخۆشی ئێستا لە پەنا دووکانەکەی باوکی دووکانێکی داناوە و کردوویە بە دەرمانخانە. عەلی کە دەبووە کوڕە چکۆڵەی هەڤاڵی من بوو، ئێمە چکۆڵە بووین هەمیشە پێکەوە کایەمان دەکرد. خۆمان دەکرد بە کوڕە گاور و دەچووینە کەنیسەکانیان؛ لەوێ کتێبی ئۆلیمان دەدزی و دەمان برد دەمان فرۆشتەوە. پارەکەشیمان پێکەوە خەرج دەکرد. جارێکیان بە ڕێکەوت پێیان زانین و گرتیانین. بردیانینە لای باوکمان پێیان گوت ئەگەر بۆخۆتان پێشیان نەگرن و دەنگیان نەدەن ئەوە لە لای پادشا شکایەتتان لێ دەکەین. باوکی عەلی داوای لێ بوردنی لێ کردن و یەک دوو داریشی لە عەلی دا. ئیدی هەر ئەو دوو دارە بوو، عەلی ڕایکرد و ئێستاش کە ئێستایە ئەوە بیست ساڵە کەس چاوی پێی نەکەوتەوە و هەواڵی نازانێ. بازرگانەکە گوتی: «من ئەو عەلی کوڕی شێخ ئەحمەدەم و ئەتۆش مارفی هەڤاڵمی.» ئیدی دووبارە سلاویان لە یەک کردەوە.

دوای من خۆش و تۆ خۆش، بازرگانەکە گوتی: «مارف جا ئەوجار پێم بڵێ، ئەتۆ چی و ئێرە چی؟ بۆ هاتی و چۆن هاتی؟ بۆم بگێڕەوە.» مارف باسی ژنەکەی و ئەو پەندانەی کرد کە بەسەری هێنابوو. هەمووی بۆ گێڕاوە. پاشان گوتی: «...کاتێک زانیم زۆری بۆ هێناوم و ئیدی بەرگە ناگرم ڕام کرد لە دەستی و لە دەروازەی بابوننەسروەوە هاتمە دەرێ. لە ڕێیە دایدا باران و منیش لە عادلییە[1] ڕووم لە کەلاوەیەک کرد. تا تەڕ نەبم. لەوێ دێوێک لە بەرەی جندۆکان کە خاوەنی ئەو کاولاشە بوو، لێم پەیدا بوو. لێی پرسی ئەوە بۆ ئاوا نارەحەتی و لێرە چی دەکەی و چی و چی؟ منیش بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە. ئیدی دێوە منی لە سەر شانی دانا و هەر سەر لە ئێوارەوە منی بە حەوادا هێنا هەتا بەری بەیان.

---

[1].دەبێ نێوی باغ یا ناوچەیەکی نیزیک میسر بووبێ.(وەرگێر)

بەری بەیانی لە سەر کێوێک دایانام و پێی گوتم لە داوێنی ئەو کێوە شارێکی لێیە داگەڕێ بچووە ئەوێ. کە تاو هەڵات هاتمە خوارێ و هاتمە نێو شار. خەڵک تێم ئالان بوون کە تێ گەیشتیی. ئەوە بوو هۆکاری هاتنی من لە میسرەوە بۆ ئێرە. ئەتۆ بۆم بگێڕەوە چۆناوچۆن تۆش ڕێت کەوتە ئێرە؟» عەلی بازرگان گوتی: «کە باوکم دارەکانی لێ دام، ئەگەر لە بیرت بێ ئەمن حەوت ساڵان بووم. کە هەڵاتم، شار بە شار هاتم، هەتا گەیشتمە ئێرە. ئەو شارە نێوی «خوتانولخوتەنە» سەیرم کرد خەڵکی ئەو شارە زۆر بەخشەندە و دلۆڤانن. ڕێزی هەژارانیان زۆر لە بەرە. ئەگەر هەژارێک قسەیەکی کرد، پشتی دەگرن. ئەمن پێم گوتن، من بازرگانم و کەوتوومە پێش کاروانەکەم. هاتووم جێوڕێیەکی بۆ بارەکان پەیدا بکەم. ئەوان باوڕەیان پێ کردم و شوێنێکیان بۆ چۆڵ کردم. بە کابرایەکم گوت، ئەگەر کەسێک بێ هەزار دینارم بداتێ تا کاروانەکەم دێ ئەودەم پارەکەی دەدەمەوە. ئەو کابرایە هەزار دیناری دامێ. ئیدی چوومە نێو بازاڕ و بەو هەزار دینارە کەمێکم شت کڕی و فرۆشتمەوە. پەنجا دینارێکم قازانج وەگیر کەوت. دیسان هێندێکم کاڵا و کەڵوپەل و شت کڕی. لەگەڵ خەڵک هەڵسوکەوتم دەکرد و خەڵک خۆشیان دەویستم. ماڵ و سامانەکەم زۆر بوو. کاکە گیان، قەدیمیان دەڵێن دونیا هەمووی فروفێڵە. لەو شار و شوێنانەی ناتناسن، چیت پێ خۆشە بیکە. بەڵام کاکە گیان ئەگەر بە خەڵک بڵێی پیشەم پینەچییەتییە و هەژارم و لە دەست ژنەکەم ڕام کردووە. دوێنێ دوانیوەڕۆ لە میسر وەدەر کەوتووم، کەس باوەڕت پێ ناکا. هەتا لەو شارەشدا بی هەر تیزەجاڕی خەڵک دەبی. ئەگەر بشڵێی دێو منی لە سەر شانی داناوە و هێناومی، ئەوجار خەڵک لێت دەترسن و ناوێرن لێت نیزیک بنەوە دەڵێن فلانکەس جندۆکەیە خۆی لێ مەدەن. ئیدی هەتا هەتایە ئەو نێوەمان بە سەردا دەبڕن و لە بەر چاوی خەڵک دەکەوین. چونکە دەزانن منیش میسریم.

مارف گوتی: «ئەی چ بکەین؟» بازرگانەکە گوتی: «ئەمن فێرت دەکەم چی بکەیت. بەیانی هەزار دیناری زێڕت دەدەمێ و سواری یەسترێکت دەکەم. کۆیلەیەکت لەگەڵ دەخەم هەتا نێو بازاڕت بەرێ. ئەودەم وەرە نێو بازرگانەکان و بۆخۆشم لەوێ دەبم. کە تۆ هاتی من لە بەرت هەڵدەستم و لە باوەشت دەگرم و ماچت دەکەم. ڕێزت دەگرم و پلە و پایەت لە لای ئەوان دەبەمە سەرێ. لە بابەت هەر شتێکەوە لێم پرسی و گوتم هێناوتە. ئەتۆ بڵێ زۆرم لێ هێناوە. ئەگەر لە بارەی تۆوە پرسیاریان لە من کردە منیش هەڵت دەکێشم و دەتبەمە سەرێ. تاریفی دەستڕۆیشتوویی و دەستودڵبازیت دەکەم. ئەگەر سواڵکەرێک هات ئەوەندەی لە دەستت هات بیدەیە. ئیدی بازرگانەکان باوەڕ بە قسەکەی من دەکەن و بە چاوێکی دیکە سەیرت دەکەن و خۆشیان دەوێی. دوای ئەوە من بانگهێشتت دەکەم و بازرگانەکانی دیکەش لەبەر تۆ بانگ دەکەم. هەتا هەموویان باشت بناسن و تۆ ئەوان بناسی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! عەلی بازرگان بە مارفی گوت: «ئەمن تۆ بە هەموو بازرگانەکان دەناســـنیم. تا بۆخۆت ســـات و ســـەودایان لەگەڵ بکەی. خەمت نەبێ ئەوەندەی پێ ناچێ دەوڵەمەند دەبی و سامانێکی باس وەسەر یەک دەنێی.»

کە ڕۆژ بووەوە، عەلی بازرگان هەزار دینار و یەســـترێک و کۆیلەیەکی دا بە مارف. ســەرپۆشـێکی شـایانی بازرگانانیشـی دایە و گوتی: «ئەوانە هەر وا بۆخۆت. ڕێز و قەدری تۆ لە ســـەر من واجبە. خەمیشـــت نەبێ و ئاکاری ناحەزی خێزانت لە بیر بەرەوە و تازە قەتیش لە لای کەس باســـی مەکە و نێوی مەهێنە.» مارف گوتی: «خودا جەزای بە خێرت بداتەوە.» عەلی بازرگان ڕۆیشـت. تاوێک دوای عەلی، مارفیش خۆی سـاز کرد و سـواری یەســـترەکە بوو. کۆیلەکە کەوتە پێشـــی و بەرەو بازاڕ ڕۆیشـــتن. بردییە ناو بازرگانەکان. هەموو بازرگان لەوێ دانیشتبوون. عەلیش لە نێو ئەوان بوو. عەلی هەر کە چاوی بە مارف کەوت، دەهات بۆ لای ئەوان، لە نێو بازرگانەکان هەسـتا و بە پیرییەوە چوو. باوەشـی پێدا کرد و دەســـتی ماچ کرد. ســـڵاوی لێ کرد و گوتی: «ئەی ســـەرۆکی بازرگانان و خاوەن کەرەم. گەورەت کردین تەشـــریف هێنا.» دوای ئەوە ڕووی لە بازرگانەکان کرد و گوتی: «بازرگانەکان، ئەو بەڕێزە ناوی مارفە و پیاوێکی تا بڵێی مەزن و دەســـتودڵباز و دڵاوا و خاوەن چاکەیە. جێی ڕێز و حورمەتە. ئەوجار عەلی میســـری یارمەتی دا لە یەســـترەکە دابەزێ. بازرگانەکان تێکڕا ســـڵاویان لێ کرد. دوای ئەوە عەلی لە لای دانە دانەیان باســـی پیاوچاکی و دەوڵەمەندی و تایبەتمەندییە باشـــەکانی کرد. تا وای لێ هات بردیانە لای سـەرەوە دایان نیشـاند و لە دەوری خڕ بوونەوە. میوە و شـەربەتیان بۆ هێنا. شـابەندەری بـازرگـانـانیش هـات بۆ دیتنی و ســـڵاوی لێ کرد. عەلی میســـری بـازرگـانیش لە لای بازرگانەکان هەر جارناجارێک لێی پرســـی: «لە فڵانە شـــت هیچت لەگەڵ خۆت هێناوە؟» مارف وەڵامی دەدا زۆرم هێناوە. [ڕۆژی پێشـــوو هەموو جۆرە کاڵایەکی پێ ناســـاند بوو. نرخەکانی پێ گوتبوو. چی وا نەما بوو نەیناســـێ و نرخەکەی نەزانێ.] هەر بۆیە کاتێک یەکێک لە بازرگانەکان لێی پرســـی: «جووخی ئەســـغەرت[1] هێناوە؟» وەڵامی داوە زۆرم هێناوە. ئەوجار پرسـی: «سـۆرخ غایی» چی؟ دیسـان گوتی: «زۆر.» ئیدی هەر شـتێکیان پرسی، گوتی: «زۆرم هێناوە.» دوای ئەوە یەکێک لە بازرگانەکان لە عەلی میسری پرسی: «ئەگەر کەســـێک هەزار خەرواری شـــتی گرانبایی بوێ، ئەوەندەی هەیە بیداتێ؟» عەلی گوتی: «هەر لە یەکێک لە عەمبارەکانی دەتوانێ بۆ ســـاز بکا.» لەو جەنگەیەدا ســـواڵکەرێک

[1]. جۆرە قوماشێکی زەردە.

هات و داوای ســـوالی کرد. یەکێک لە بازرگانەکان نیو درەمی دایە و ئەوی دیکە یەک لە ســەر ســێ و یەک لە ســەر چواری درەمیان دایە. زۆرکەســیش هەر هیچی نەدایە. هەتا گەیشــتە لای مارف، مارف دەســتی لە گیرفانی ڕاکرد و چنگێکی زێڕ دایە. ســۆاڵکەرەکە زۆری دۆعای بە خێر بۆ کرد و ڕۆیشت. بازرگانەکان زۆریان پێ سەیر بوو. گوتیان: ئەو جۆرە خێر کردنە شــایانەیە، بە چنگ زێڕ بدەی بە خەڵک. ئەوە دەبێ زۆری بێ، دەنا چۆن کاری ئاوای پێ دەکرێ. ئەوەندەی پێ نەچوو ژنێکی هەژار هات. چنگێکی زێڕ دا بە ئەویش. ژنەش بەدم دۆعای بەخێر کردنەوە ڕۆیشت و چوو لە لای سواڵکەرەکانی دیکە باسی کرد کە بـازرگانێکی ئـاوا هـاتووە. ئەوانیش یەک یەک و دوو هـاتن و یەکی مســـتێکیـان زێڕ وەرگرت و ڕۆیشــتن. هەتا ئەو هەزار دینارە تەواو بوو، هەر بە چنگ زێڕی دا بە هەژار و بێ ئەنوایان.

دوای ئەوە بەری دەست ڕێک خست و گوتی: «حسبنااللە و نعم‌الوکیل». شـابەندەری بازرگانان گوتی: «چی بوو، کاک مارف؟» مارف وەڵامی داوە: «ئەو شـــارە هەژار و بێ ئەنوای زۆرە. ئەگەر بمزانیبایە ئاوایە، کەمێکم زێر لە خورجێنەکەم دەکرد و بە ســـەرمدا دابەش دەکردن. ئەمن دەترســـم، کـاروانەکەم درەنـگ بگـاتێ و ڕووزەردی ئەو فەقیر و هەژارانە بم، هیچم پێ نەماوە ئێســـتا پارســـەکێک بێ ئەمن چی پێ بڵێم. چونکە من قەت ناتوانم بە دەســـتی بەتاڵ بەڕێیان کەم. بۆیە نارەحەتم. ئەگەر ئێســـتا هەزار دینارێکم بێتە دەست تا کاروانەکە دێ ئەوانەی پێ بەڕێ بکەم، زۆر باشە دەبێ. ئیدی شابەندەر کە گوێی لەو قســـەیە بوو، گوتی: «خەمت نەبێ.» ئیدی کۆیلەیەکی خۆی ناردەوە هەزار دیناری بۆ بێنێ. کە کۆیلەکە زێڕەکانی هێنا، شـــابەندەری بازرگانان پارەکانی دا بە مارف. ئیدی هەر پـارســـەکێـک دەهـات کەمێکی زێڕ دەدایە. هەتـا بوو بە نیوەڕۆ و بـانگی نیوەڕۆی دا. بازرگانەکان هەســـتان چوون بە جەماعەت نوێژیان کرد. ئەوەی لە هەزار دینارەکە بۆی مابووەوە، مارف هەمووی بە ســـەر نوێژکەرەکاندا هەڵ خســـتەوە. خەڵک بەو کارەیان زانییەوە و دۆعایان بۆ کرد. بازرگانەکان جار لەگەڵ جار زیاتر سەریان سووڕ دەما. دوای ئەوە مارف هەزار دیناری دیکەی لە بازرگانەکان وەرگرت و دیســـان بە ســـەر خەڵکەدا هەڵگی خســـتەوە. عەلی میســـری بازرگانیش ئەوە چاوی لێ بوو. نەشـــی دەوێرا هیچ بڵێ. دوا نیوەڕۆ کە بانگی ئێوارەی دا. دیســـان مارف چووەوە مزگەوت و نوێژی ئێوارەی کرد. ئەو زێڕانەی پێی مابوو، لەگەڵ هێندێکی دیکە هەمووی بە ســـەر خەڵکدا هەڵاویشـــت و داروبەخشـــی کرد. هێشـــتا لە بازاڕ نەهاتبووە دەرێ کە پێنج هەزار دیناری لەم و لەو وەرگرت و بڵاوی کردەوە. زێڕیشـی لە هەرکەس وەر دەگرت، دەیگوت ئەگەر بارەکە هات، زێڕت ویست، زێڕت دەدەمەوە شتت ویست شتت دەدەمێ. چونکە هەموو شتێکم زۆر پێیە. بۆ شـێو عەلی میســری بازرگان مارف و بازرگانەکانی بانگهێشـت کرد و مارفی وە لای

سەرەوە خست. ئەو شەوە مارف باسی زێڕ و زیو و گەوهەری جۆراوجۆری کرد. باسی هەر شتێکیشی دەکرد، دەیگوت، من پێمە. بۆ سبەینێش هەر ئەو کارەی کردەوە هەتا وای لێ هات لە ماوەی بیست ڕۆژدا شەست هەزار دیناری لە بازرگانەکان وەرگرت و بارەکەی هەر نەگەیشتێ.

بازرگانەکان نیگەرانی ماڵەکەیان بوون و دەیان گوت: ئەو بارەی مارف هەر نەهات و هەر زێڕیش لە خەڵک وەردەگرێ و بە سەر خەڵکدا داروبەخشی دەکاتەوە. ئەوە تاکەی بە تەمایە ئاوا بکات. یەکێک لە بازرگانەکان گوتی: «وا چاکە لەگەڵ عەلی میسـری بازرگان قسە بکەین.» هەستان چوون بۆ لای عەلی میسری گوتیان: بارەکانی مارف نەهات. عەلی گوتی: «پەلە مەکەن لەو ڕۆژانەدا دێ. ئەوجار مارف بانگ کردە پەنایەک و پێی گوت: «ئەمن گوتم نانەکە با برشـتە بێ، نەک بسـووتێ. ئێسـتا ئەوە بازرگانەکان نیگەرانی ماڵەکەیانن. ئەوان دەڵێن کە شەست هەزار دیناریان لە لاتە کە لێت وەرگرتوون و بەسەر خەڵکی هەژار و کەمداهاتدا بڵاوت کردووەتەوە. تۆ چۆن پارەی ئەو خەڵکە دەدەیەوە لە کاتێکدا نە پارەیەکت هەیە سـەودای پێ بکەی و نە هیچ.» مارف گوتی: «شـەسـت هەزار دینار هیچ نییە، با بارەکەم بگاتێ هەرچیان بوێ دەیاندەمێ. یان زێڕ و شـتیان دەدەمێ. عەلی میسری گوتی: «سوبحانەڵڵا، بۆ تۆ بارت هەیە؟» مارف گوتی: «بارێکی زۆر.» عەلی گوتی: «ئەو قسـەیە بۆخۆم فێرم کردووی و من تۆم بە خەڵک ناسـاند. ئەو قسـەیەم فێر نەکردی بە خۆمی بڵێیەوە؟» مارف گوتی: «زۆری لە سـەر مەڕۆ، هەسـتە بڕۆ. بۆ من لێقەوماوم. هەر بە ڕاستی من زۆر دەوڵەمەندم. با ماڵەکەم بێ، هەر کەسەی دوو بەرابەری ماڵەکەی خۆی دەدمێ. خۆ من چاوم لە ماڵی ئەوان نییە.»

عەلی بازرگان بەو قسـانە ڕقی هەسـتا و تووڕە بوو، گوتی: «بێ ڕەوشـت، هیچ پێت عەیب نییە درۆ لەگەڵ منیش دەکەی، بە شـێتم دەزانی؟ بزانە چیت لێ دەکەم.» مارف وەڵامی داوە: «چیت لە دەست دێ بیکە. دەبێ ئەو بازرگانانە ڕاوەستن تا بارەکانم دەگاتێ. ئەودەم با ماڵەکەیان بە زیادەوە وەرگرن.» ئیدی عەلی میسـری هەسـتا ڕۆیشـت. لە بەر خۆیەوە گوتی: «جا ئەوە چی بکەم، ئەمن لە پێشـدا ئەو هەمووەم تاریف کردووە، ئێسـتا بچم بڵێم وەڵا هیچی نییە. درۆ دەکا. بۆخۆم وە درۆ دەکەومەوە. وەک دەڵێن ئەوجار دەبێتە دوو درۆ.

نوقمی ئەو بیرانە بوو کە بازرگانەکان هاتن و گوتیان: ئەرێ عەلی قسەت لەگەڵ مارف کرد؟ عەلی گوتی: «بە خودا هەرچەند دەکەم لە ڕووم هەڵنایە، چونکە هەزار دیناری منیشی لە لایە. ئەمن ناتوانم پێی بڵێم. بێ بەلا بن، ئێوەش بێ ئەوەی ڕاوێژێک لەگەڵ من بکەن پارەتان دایە. دەی ئێسـتا من بڵێم چی. خۆ پرسـتان بە من نەکردووە. بۆخۆتان قسـەی لەگەڵ بکەن. یان بچن شـکایەتی لێ بکەن و بڵێن ئەو کابرایە بە درۆ و فڕوفێڵ کڵاوی لە

سەر ئێمە ناوە و ماڵێکی زۆری لێ ئەستاندووین و داوێن بە فەقیر و هەژاران. سەریشمان لەو کارە سووڕ ماوە چونکە ئەگەر ئەو کابرایە فەقیریش بایە قەت ئاوا چنگ چنگ زێڕی بە سەر خەڵکی بێ ئەنوا و هەژاردا بڵاو نەدەکردەوە. ئەگەر درۆش ناکا ئەو ماڵەی چ بوو بۆ هەر نەگەیشتێ. ئێمە چی بکەین؟ ئەو دەڵێ من ماڵێکی زۆرم هێناوە و بۆخۆم لە پێشەوە هاتووم. نێوی هەر شتێکیشمان هێنا گوتی پێمە و زۆریشم پێیە و هەمووشیانی دەناسی. بەڵام ئەوە ماوەیەکی زۆرە هیچ خەبەرێکیش لە بار و شت نییە. ئێمەش شەست هەزار دینارمان لە لایەتی. تەواوی ئەو پارەیەشی داوە بە فەقیر و هەژاران و دەستودڵبازییەکەی سنووری نییە. ڕێیەکمان بۆ ببینەوە.

ڕێکەوت وا دەبێ پادشای ئەو شارەش تەماعەکەی لە ئەشعەسیش پتر دەبێ. باسی دەستودڵبازی ماریف دەبیستێتەوە. تەماع دەیگرێ و بە وەزیرەکەی دەڵێ: «ئەگەر ئەو بازرگانە زۆر زۆر دەوڵەمەند نەبێ ئەو کارەی ئاوا پێ ناکرێ، ئاخری بارەکانی دێ و دەزانم پارەیەکی زۆر لە ماڵەکەی خۆیان زیاتر دەداتەوە بەوان. جا ئەو ماڵە بۆ بۆ ئەوان بێ. وەڵا بۆ من باشترە. جا ئەمن بە تەمام بانگی کەم و خۆمی لێ نیزیک کەمەوە تا بارەکانی دێ. ئەو دەم ئەوەی قەرارە بیدا بەو بازرگانانە بۆخۆم لێی وەر دەگرم و کچەکەمی لێ مارە دەکەم. پاشان ماڵەکەی لەگەڵ ماڵەکەی خۆم تێکەڵ دەکەم.» وەزیر گوتی: «پادشا ئەمن لێی زەنینم و باوەڕ ناکەم ڕاست بکا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و نەوەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! وەزیر گوتی: «پاشا من هەرچەند دەکەم ناتوان باوەڕ بەو کابرایە بکەم.» پادشا گوتی: «وەزیر من تاقی دەکەمەوە بزانم پیاوێکی درۆزن و هۆقبازە یان بە ڕاستییەتی و پیاوێکی دەستپاکی دەسترۆیشتوو و دەستودڵبازە.» وەزیر گوتی: «چۆنی تاقی دەکەیەوە؟» پادشا گوتی: «مووروویەکم هەیە، نەقیمی ئەنگوستیلەیە. ئەو کابرایە بانگ دەکەمە لای خۆم و ڕێزێکی زۆری بۆ دادەنێم. پاشان ئەو نەقیمەی پیشان دەدەم و نرخەکەی لێ دەپرسم. ئەگەر ناسی و نرخەکەی زانی ئەوە قسەی تێدا نییە کە هەر وا دەوڵەمەندە و پیاوێکی دڵ گەورەیە. ئەگەر تێنشی نەگەیشت و نرخەکەی نەزانی ئەوە دیارە کەڵەباز و هۆقەبازە و چۆن خرابە ئاوای سزا دەدەم.» دوای ئەوە پاشا کەسێکی نارد لە دوای مارف. کە مارف هاتە لای پادشا سڵاوی کرد. پادشا سڵاوەکەی ئەستاندەوە و لە پەنا خۆی دانا و لێی پرسی: «مارفی بازرگان تۆی؟» وەڵامی داوە: «بەڵێ.» پادشا پرسی: «بازرگانەکان دەڵێن شەست هەزار دینارمان لە لایەتی. ڕاستە؟» مارف گوتی: «بەڵێ ڕاستە.» پادشا گوتی: «بۆ نایاندەیەوە؟» مارف وڵامی داوە گوتی: «دەبێ ڕاوەستن بارەکانم بێ. ئەودەم لە جێی دینارێک دوو دیناریان دەدەمەوە. زێڕیان بوێ یان زێو من دەیاندەمەوە. ئەگەر شتیشیان بوێ ئەوە چ زۆرە شت. دەیاندەمێ هەرچی بێ ئەمن قەرزداریانم چونکە ئەوان نەیانهێشت شەرمەندەی خەڵکی هەژار و بێ ئەنوا بم.» پادشا ئەوجار گوتی: «کاکی بازرگان دا زەحمەت نەبێ چاوێکم بۆ لەو نقیمە بکە بزانە نرخەکەی چەندەیە؟» نقیمێکی دەر هێنا بە قەد دەنکە ترێیەکی گەورە دەبوو. بێجگە لەوە نقیمی دیکەی نەبوو. زۆری دڵ پێوەی بوو. دایە دەست مارف. مارفیش چاوێکی لێ کرد و بە قامکی ئەسپێکوژە و دۆشاو مژەی بە حاڵ گوشی تا ڕادەی سەختی و نەرمییەکەی تاقی کاتەوە، نەقیم لەبەر ناسکیانی شکا. پادشا گوتی: «ئێستا ئەوە بۆ شکاندت؟» مارف پێکەنی و گوتی: «پادشا ئەوە گەوهەر نییە و هەر بەردێکی ناسک و جوانە. ڕەنگە هەزار دینارێک بکا. چۆن بەوە دەڵێی گەوهەر؟ گەوهەرێک گەوهەرە کە حەفتا هەزار دینار نرخەکەیەتی و بە قەد گوێزێک دەبێ. ئەوانە قەت لە لای من گەوهەر نین و پێشیان ناڵێم گەوهەر. تۆ چۆن پادشایەکی کە بەو کوتە بەردانە دەڵێی گەوهەر. بەڵام دەڵێی چی فەقیری هەموو شتێک بە ئینسان دەکا و ئەتۆش خەزێنەی جەواهیراتت نییە بڵێی چی.» پادشا گوتی: «بۆ بازرگان تۆ لەو گەوهەرانەت هێناوە؟» مارفی بازرگان وڵامی داوە: «بەڵێ زۆریش.» پادشا تەماع گرتی و گوتی: «لەو گەوهەرانە دەدەی بە منیش؟» مارف گوتی: «با بارەکانم بێ زۆر زیاترت دەدەمێ. چونکە من گەوهەری زۆر جۆراجۆرم پێیە. خەمت نەبێ پارەشت لێ وەر ناگرم.» پادشا شاگەشکە بوو. لە خۆشیان بە بازرگانەکانی گوت: «بڕۆن بەلای کاری

خۆتانەوە تا بارەکانی دەێ. دوای ئەوە وەرنە ئێرە من ماڵەکەتان دەدەمەوە. کێشەی مارف و بازرگانەکان با لەوێ ڕاوەستێ.

پادشا بە وزیری گوت: «وەزیر ئاگات لە مارف بێ و نێوی کچەکەمی لە لا بێنە و بیخە بەر دڵی با لێی مارەکەم. زۆر دەوڵەمەندە و لەو خزمایەتییە قازانجێکی زۆر دەکەین. وەزیر گوتی: «پادشـــا ئەو کابرایەم نەکەوتە بەر دڵی. وا هەســـت دەکەم لێی نایە دەوڵەمەند بێ درۆزنە. ئەو قسـەیە مەکە و لەخۆڕا کچەکەشت چارەڕەش مەکە.» [وەزیر لە پێشدا داوای کچەی کردبوو، مێردی پێ نەکردبوو.] ئیدی پادشـــا بە وەزیری گوت: «خائین، تۆ چاکە و بەختەوەری خۆم و کچەکەمـت نـاوێ چونکە لە پێشــــدا داوات کردووە و مێردی پێ نەکردووی. ئێســـتا دەتهەوێ بە فێڵ و کەڵک، کارێک بکەی ئەو بە پلە و پایەی باش نەگا و بشکێتەوە جا ئەودەم چاری نەبێ، شوو بە تۆ بکا. دا تۆ پێم بڵێ ئەگەر ئەو درۆزنە و هەر بە ڕواڵەت خۆی ئاوا دەوڵەمەند پێشان دەدا، چۆناوچۆن ئەو نەقیمی ئەنگوستیلەکەی ناسی و زانیشـی بە چەندم کڕیوە. بە دڵی نەبوو شـکاندیشـی. دڵنیام نەقیمی زۆر لەوە باشـتری هەیە. ئەگەر بێت و بچێتە لای کچەکەم دڵنیام ئەوی بە دڵ دەبێ و بەشێکی زۆر لەو زێڕ و گەوهەر و دوڕ و مروارییانە پێشـکەشـی ئەو دەکا. تۆ دەتهەوێ کچەکەم لەو هەموو خێر و بەرەکەتە بێبەش بکەی. وەزیر بێ دەنگ بوو، ترسا، پادشا تووڕە بێ. ئەوجار چوو بۆ لای مارف و گوتی: «پادشـا تۆی وەبەر دڵی هاتووە و دەیهەوێ کچەکەیت بداتێ. کچێکی هەیە لە سەر چاوی کوێری دانێی چاکی دەکاتەوە، دەڵێی چی؟» زۆر باشە بەڵام دەبێ ڕاوەستن تا بارەکانم بگاتێ چونکە دەزانم مارەیی کچی پادشـــا زۆرە. کچە پادشـــا شـــانوشـکۆیەکی هەیە. دەبێ مارەییەکەیان بدرێتێ. ئێســـتا جارێ من چیم بە دەســـتەوە نییە. چار نییە دەبێ پادشـــا لە ســـەرم ڕاوەســـتێ تا بارەکان دەگەن. ئەودەم من پێنج هەزار توورەکەی زێڕی ســـوور دەدەمێ و هەزار دیناریش شـــەوی گوێسـتنەوەکەی بە ســـەر فەقیر و هەژاراندا دەبەخشـــمەوە. هەزار دیناریش بەدەم بەو کەســانەی لە میوانییەکەدا زەحمەت دەکێشـــن. هەزار دیناریش بۆ نانداني سپا و خەڵک خەرج دەکەم. سەد دانە گەوهەری گرانباییم دەوێ کە ڕۆژی شـــاییەکە پێشـــکەشـــی بووکی بکەم. ســـەد گەوهەرم دەوێ بە ســـەر کەنیز و خزمەتکارەکاندا بڵاوی کەمەوە و دابەشـی کەم. یەکی گەوهەرێکیان دەدەمێ تا پلە و پایەی بووکی پێ بچێتە سەرێ. دەمەوێ هەزار کەسی ڕووت و ڕەجاڵ پۆشتە بکەم. دەبێ خێر و خێراتێکی زۆر بکەم. ئەوانەش بە دەســـتی خاڵی جێبەجێ نابێ هەتا بارەکان نەگەن. خەمی ئەو خەرجی و شتەشم نییە، بەڵام ئێستا بە دەستمەوە نییە.

وەزیر چووەوە لای پادشـا و تەواوی ئەو قسـانەی مووبەموو بۆ پادشـا گێڕاوە. پادشـا گوتی: «ئاگات لێیە، دەی تۆ، چۆن دەتوانی بە کەســێکی ئاوا بڵێی جێی باوەڕ نییە و لێی لە شک دای؟» وەزیر گوتی: «من ئێستاش لە سەر ئەو قسەی خۆم سوورم. تا ماویشم هەر

وا دەڵێم. دڵم لێی ناحەسێتەوە و لە خزمەتیشت دام چی بفەرمووی وا دەکەم.» پادشا گوتی: «بە خودا تۆ ئاخری لە سەر ئەو قسەیە سەری خۆت بە با دەدەی. بێ دەنگ بە، هەستە بڕۆ مارفم بۆ بانگ کە ئێرە.» وەزیر چوو لە دوای مارف و هێنای بۆ لای پادشا. پادشا بە مارفی گوت: «ئەو بیانوانە بنێ لاوە و ئەوە کلیلی خەزێنە و چەندت دەوێ و دەزانی پێویستیت پێیەتی هەڵگرە، خەزێنە پڕە لە زێڕ و زێو. چیت پێ خۆشە بیکە. ئاوڕ لە هەژار و بەلەنگازان بدەوە. بەڵام لە کچ و کەنیز و شت گەرێ جارێ ئەوان پەکیان نەکەوتووە. ئەگەر بارەکەت هات، چی دەدەی بە خێزانت و کەنیز و خزمەتکاران بیان دەیە. مارەییەکەش هەڵگرە بۆ دوایە. ئێمە ئەو قسانەمان نییە. دوای ئەوە پادشا بە مەلایەکی موسوڵمانی گوت: «لێکیان مارە بکە.» مەلا کچی پادشای لە مارف مارە کرد. پادشا فەرمانی دا بەزم و شاییان ساز کرد. شار ڕازاوە. تەپڵی شادی لێ درا و سفرەی گەورە گەورە ڕاخرا. مووزیکژەن و گۆرانی بێژ کۆ بوونەوە.

مارف لە سەر کورسی دانیشبوو. سەماکەر و مووزیکژەن و شت لە پێشی خەریکی بەزم گێڕان بوون و ئەویش بە خەزێنەداری دەگوت: «زێڕ و زێو بێنە.» هەر خەزێنەدار زێڕ و زێوی دێنا و ئەویش چنگ چنگ دەیدا بە مووزیکژەن، سەماکار و خەڵکی فەقیر و هەژار. وەزیر لە داخان خەریک بوو دڵی بتۆقێ و نەشی دەتوانی هیچ بڵێ. عەلی میسریش سەری لەو کارە سوور مابوو. چووە پێشێ و گوتی: «مارف ئەو هەمووماڵەی بازرگانەکات بڵاو کردەوە بەوەشەوە ڕاناوەستی ماڵی پادشاش ئاوا لێ دەکەی؟!» مارف گوتی: «بۆ تۆ جوان نییە قسەی وا دەکەی با بارەکانم بێن، ماڵەکەی پادشاش و خەڵکیش بە چەند بەرابەرەوە دەدەمەوە.»

بە کورتی، مارف دەستی کرد بە تەخشان و پەخشانی خەزێنەی پادشا. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەوەی قەرارە جێبەجێ بێ هەر جێبەجێ دەبێ. لەگەڵ قەزاوقەدەر هیچ ناکرێ. هەتا چل ڕۆژان شایی و شادی و بەزم و هەڵپەڕین بوو. ڕۆژی چل و یەکەم کە بووک بەرەو پەردە دەچوو. ئەمیرانی لەشکر ڕیز ڕیز لە پێشیدا دەڕۆیشتن. کە بووک گەیشتە بەر دەرکی ئەو کۆشکەی بۆ مارف و بووک ئامادە کرابوو. مارف بڕێکی زۆری زێڕی سوور کردە شاباش و بە سەر خەڵکەکە و باڵبازەکاندا هەڵی خستەوە. دوای ئەوە چووە لای شازادە. پەردەدار پەردەکانیان داداوە و دەرگایان لە سەر پێوە دان. مارفیان لە لای بووک بەجێ هەشت و هاتنە دەرێ. مارف ماوەیک دەستەوئەژنۆ دانیشت و چوو لە فکرەوە. شازادە لێی پرسی: «ئەوە بیر لە چی دەکەیەوە بۆ ئاوا ماتی؟» مارف وەڵامی داوە: «چۆن ناڕەحەت نەبم بابت نیگەرانی کردووم. کارەکەی ئەو وەک ئەوە وایە پێش ئەوەی حاسڵێک بگا بی سووتێنی.» شازادە پرسی: «بۆ باوکم چی لە تۆ کردووە؟» وەڵامی داوە: «پێش ئەوەی بارەکانم بێ تۆی لە من مارە کرد. ئەمن بە تەما بووم سەد دانە گەوهەری گرانباییت

بدەمێ بیدەی بە کەنیز و خزمەتکارەکانت. پێم خۆش بوو کەنیز و شتەکەت بڵێن زاوا فڵانە شەو ئەوەندەی دوڕ و گەوهەر دا بە ئێمە هەتا پلە و پایەی تۆی پێ بچێتە سەرێ. چونکە من لە جێی ئاوادا چاوم لە ماڵی دونیا نییە. چونکە لەو جۆرە گەوهەرانەشم زۆرە.» شازادە گوتی: «خەمی ئەوانەت نەبێ و خۆت ناڕەحەت مەکە، من ڕادەوەستم تا بارەکانت دەگاتێ و کەنیز و شتەکەش هیچ مافێکیان بە سەر تۆوە نییە. هەستە خۆت ڕووت کەوە وەختی ئەو قسانە نییە. با بارەکە بێ، ئەوانەش دەبێ.» ئەوجار مارف هەستا خۆی ڕووت کردەوە و چوو لە جێوە و شازادەی لە باوەش کرد و دمی بە دمییەوە نا. هەموو شتێکی لە بیر چووەوە. جا مرۆڤ لەو جەنگانەدا دایک و بابی خۆشی لە بیر نامێنێ. بەو جۆرە بەویش گەیشت.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نۆسەد و نەوەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مارف ئەو دورە نایابەشی سمی و هەتا بەیانی خەریکی کەیف و خۆشی و ماچ و مووچ و هەڵگۆفین و گوشین بوو. کە ڕۆژ بووەوە مارف هەستا چوو بۆ گەرما و سەرپۆشی شایانەی بە شانیدا دا و لە گەرما و هاتە دەرێ و چوو دیوانی شا دانیشت. گەورەگەورەکان دەهاتن و پیرۆزباییان لێ دەکرد. ئەویش کە لە پەنا پادشا دانیشتبوو، بانگی خەزێنەداری کرد و گوتی: «دا یەکی کەوایەک بۆ وەزیر و ئەمیر و کاربەدەستان بێنە.» خەزێنەدار چوو ئەوەی مارف داوای کرد بووی هێنای. مارف هەرکەسەی بە پێی پلە و پایەی خۆی زێڕ و کەوای دەدایە و خەڵاتی دەکرد. هەتا بیست ڕۆژان ئاوای کرد و هیچ هەواڵێک لە بار و شت نەبوو. وا بوو خەزێنەدار چاوی لێ کرد خەزێنە چی تێدا نەماوە. هەستا چوو بۆ لای پادشا. جگە لە وەزیر کەس لە لای پادشا نەبوو. خەزێنەدار کڕنۆشی برد و گوتی: «پادشا هاتووم شتێکت عەرز بکەم. ڕەنگە پێت خۆش نەبێ. بەڵام ئەگەر پێشت نەڵێم دوایە دەترسم سزام بدەی. هاتووم پێت بڵێم کە خەزێنە هیچی وای تێدا نەماوە و ئەگەر دە ڕۆژی دیکە ئاوا بچێتە پێشێ تەواو خاڵی دەبێ. پادشا گوتی: «وەزیر بارەکانی زاواکەم نەهاتووە؟» وەزیر پێکەنی و گوتی: «تەمەندرێژ بی، بە ڕاستی دڵێکی باشت هەیە. یانی ئێستاش باوەڕت بەو کەڵەکباز و درۆزنە هەیە. قەسەم بە نیعمەتی تۆ ئەو کابرایە نە باری هەیە و نە شتومەکی پێیە و نە دەشمرێ تا ئێمە لە دەستی ڕزگارمان بێ. ئەوە ئەو داوەشی بۆ تۆش ناوە و ئەو هەمووماڵەی تۆشی بە فیڕۆ دا و هەر بە فێڵ کچەکەشی لێ ئەستاندی. تۆ هەتا کەی باوەڕ بەو هۆقەبازە دەکەی؟» پادشا گوتی: «وەزیر جا باشە ئەوە وابێ ئێمە دەبێ چی بکەین و چار چییە؟» وەزیر وەڵامی داوە: «پادشا، هەر ژنان دەتوانن شت لە بن زمانی پیاوان دەر بێنن. جگە لەوان بە کەس ناکرێ. کەسێک بنێرە لە دوای کچەکەت با بێتە ئێرە، لە پشت پەردە داینێ با من هێندێک پرسیاری سەبارەت بەو پیاوە لێ بکەم و کەسایەتی ڕاستی ئەو پیاوەت بۆ ڕوون کەمەوە. پادشا گوتی: «فکری چاکە بەڵام بە گیانی خۆم بێت و دەرکەوێ کە پیاوێکی درۆزن و کەڵەکبازە و تا ئێستا فریوی داوین. بە خراپترین شێوە دەیکوژم.»

ئەوجار ناردی لە دوای کچەکەی. کچەیان هێنا و لە پشت پەردە داینا. کچە گوتی: «بابە لە خزمەتت دام؟»پادشا گوتی: «لەگەڵ وەزیر قسە بکە.» شازادە گوتی: «وەزیر فەرموو چیت دەوێ.» وەزیر گوتی: «خانمەکەم، تۆ دەزانی مێردەکەت ماڵەکەی باوکتی هەموو بە فیڕۆ داوە و ئەتۆشی بێ مارەیی مارە کردووە. بەردەوام تەفرەمان دەدا کە بارەکانم دێن. قسەکانی هەموو بە درۆ دەرچەن و هیچ هەواڵێک لە بارومار نییە. تۆ پێمان بڵێ شتەکە چۆناوچۆنە و ڕاستی بابەتەکە چییە؟» شازادە گوتی: «هەڵدەستێ و دادەنیشێ هەر دەڵێ

ماڵێکی ئاوا و ئاوام هەیە. تا دێتە لای منیش هەر باسی گەوهەر و کاڵا و شتومەک و شتی وا دەکا. بەڵام من چیم لێ نەدیوە.» وەزیر گوتی: «خانمەکەم دەتوانی ئەمشەو کەمێکی لێ نیزیک ببیەوە و خۆی لە بەر شـیرین کەی و بە زمانی خۆش پێی بڵێی: ئێمە ژن و مێردین و دەبێ بە سـورِ نهێنی یەک بزانین. ئەگەر گرفتێک شـتێک بێتە پێشـێ بۆخۆم جێبەجێی دەکەم. خەمت نەێ. جا دوایە لێی پرسـی بزانی بە ڕاسـتی چکارەیە و چی هەیە و چی نییەوە. ڕاسـتی هەموو شـتێکی پێ وەدەر خەی؟ پێشـی بڵێ لە هیچ مەترسـە ئێمە ژن و مێردین و من بەختەوەری تۆم دەوێ. جا ئەگەر ئەو ڕاسـتییەکانی لای تۆ درکاند، ئەتۆ ئێمەی لێ ئاگادار کەوە.» شـازادە گوتی: «بابە ئەمن بۆخۆم، باشـتر دەزانم چۆنی تاقی کەمەوە،» ئەوەی گوت و شـازادە گەڕاوە کۆشـکەکەی خۆی. کاتی شـام مارف وەکوو شـەوان هاتەوە لای. شـازادە هەستا و قوڵی لە قوڵی کرد و مەکر و نازی لە تام بردە دەر. دەڵێن خودا لە مەکری ژنـانـت بە دوور کـا. ئەگەر کـارێکیـان بە پیـاو بێ تەواو بۆی دەتلیسێنەوە.

کورتی کەینەوە، شازادە ناز و نووزێکی زۆری بۆ مێردەکەی کرد و بە قسەی خۆش و خۆ تێ هەڵسـوون کارێکی کرد. عەقڵی کابرا فڕی و ئاگای لە خۆی بڕا. کە زانی مێردەکەی هۆشـی لە لای خۆی نەماوە پێی گوت: «خۆشـەویستەکەم، بینایی چاوم. بێتوو لێت دوور کەومەوە دڵیشـم دەتۆقێ. ئەڤینت کارێکی کردووە خرمانی وجوودمی سـووتاندووە. قەت قەت ناتوانم بێ تۆ هەڵکەم. هێندێک شـت هەیە نیگەرانم دەکا. چونکە دەزانم بە چرای درۆ ماڵی کەس ڕووناک نابێ. پێم بڵێ هەتا کەی درۆ لەگەڵ بابم دەکەی و فریوی دەدەی؟ من لەوە دەترسم ئەو درۆیانەت لای باوکم ئاشکرا بن و ئابڕووت بچێ. بابم ڕقت لێ هەڵگرێ. بۆیە پێم خۆشە هەرچی هەیە لە پێشدا بە منی بڵێی بەشکوو بتوانم فکرێکت بۆ بکەمەوە و لە مەترسیت ڕزگار بکەم. ئێستا مەترسە و ڕاستی هەموو شتێکم پێ بڵێ. هەتا کەنگێ بە تەمای بە درۆ و دەلەسـە جێبەجێی کەی و بڵێی من بازرگانم و زێڕم ئاوا گەوهەرم ئاوا. ئەوە ئێسـتا لەو دەمەوە هەر دەڵێ بار و کاڵاو ماڵام هەیە و هیچیش دیار نییە. بۆخۆشـت دیارە ماندوو بووی و بەو شـتەوە نارەحەتی. ئەگەر قسـەکانت وا نییە لانیکەم لە لای من بیڵێ بەشکوو ڕێگایەکت بۆ ببینمەوە لەو گوشارە ڕووحییە، ڕزگارت بێ. بە گشتی ڕاستی ڕزگاری لە دووە.« مارف گوتی: «خانمەکەم من ڕاسـتییەکە بە تۆ دەڵێم، ئەتۆش چیت پێ خۆشە بیکە.» شازادە گوتی: «ڕاستی کەشتی پەڕینەوەیە و درۆ ڕووڕەشی دێنێ.» وەک شاعیر دەڵێ:

ئەو کەسـەی پـیشـەی درۆ و کەلەکە
خـۆشـی نـابـینـێ، ژیـنـی بـێ کەڵـکە
ئـاخـرێـکەی ڕۆژێـک ئـاشـکـرا دەبـێ

مارف دەستی پێ کرد: «خانمەکەم ڕاستی من بازرگان نیم، کابرایەکی پینەچی بووم لە شارەکەی خۆم، پارووە نانێکم پەیدا دەکرد. ژنێکم بوو «فاتمە سازندە»یان پێ دەگوت کە لەگەڵ ئەو ژنە ئاوا و ئاوام بە سەر هات. تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆی لە ئەووەڵەوە هەتا ئاخر، بۆ گێڕاوە. شازادە پێکەنی و گوتی: «وا دیارە تۆ زۆریش سەگ و زیرەکی.» مارف گوتی: «خانم، نەهێنی من وەشێرە چونکە خودا نەهێنی وەشێرانی خۆش دەوێ.» شازادە گوتی: «تۆ داوت بۆ باوکم ناوەتەوە و وە تەماعت خستووە، تا ئەو جێیەی لەبەر تەماعی خۆی منیشی داوە بە تۆ. ماڵەکەشیت بەو دەردە بردووە. وەزیر باوەڕی پێ نەدەکردی و هەموو جارێ دەیگوت ئەوە درۆ دەکا و هیچی بە دەستەوە نییە، کەڵەکبازە. بەلام باوکم بە قسەی نەدەکرد. کاتێک ئەو هەمووەی پێ چوو هەر خەبەرێک لە بار و شت نەبوو. باوکم وە شک کەوت. دڕدۆنگ بوو. دڵ تەنگ بوو. بانگی منی کرد و پێی گوتم: ڕاستی لە بن زمانی تۆ دەرکێشم. ئێستاش ئەوە هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوە. باوکم لەمەودوا لێت بە ڕقدا دەچێ و شتێکت بە سەر دێنێ. وەزیریش لێت لەپێکوڵە و لە بیانوویەک دەگەڕێ شتێکت بە سەر بێنێ. چونکە لە پێشدا داوای منی کرد و من شووم پێ نەکرد. قایل نەبووم ئەو مێردی من بێ. ئێستاش تۆ مێردی منی. قەت بەوە ڕازی نیم تۆ شتێکت بە سەر بێ. باوکم بانگم دەکا و لێم دەپرسێتەوە. ئەگەر پێی بڵێم ئەو قسانەی تۆ هەمووی درۆ بووە و کلاوت لە سەر پادشا ناوە و کچەکەیت بە درۆ لێ ئەستاندووە و ئەو هەمووە ماڵەییت تەخشان و پەخشان بلاو کردووەتەوە. سەر بەرێ ئاسمان ڕزگارت نابێ و هەر دەتکوژێ. لە نێو خەڵکیشدا بلاو دەبێتەوە کە من مێردم بە پیاوێکی درۆزن و هۆقەباز کردووە. ئەوەش بۆ من خۆش نییە و لە لای خەڵک سووک دەبم. ئەگەر باوکم تۆش بکووژێ دوایە دەبێ من مێرد بە یەکی دیکە بکەمەوە. ئەگەر بشمرم شتی وام پێ قەبووڵ ناکرێ. تازە ئەگەر هەر وای لێ هاتووە هەستە پەنجا هەزار دینار لەگەڵ خۆت بەرە و برۆ بۆ شارێک کە لە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی باوکمدا نەبێ. لەوێ بۆخۆت خەریکی بازرگانی بە. نامەیەکیشم بۆ بنووسە کە من لە فلانە شارم. ئەگەر منیش شتێکم هاتە دەست ئەوە بۆت دەنێرم با زیاترت ماڵ بە دەستەوە بێ. ئەگەر باوکیشم مرد، ئەوە پیاوت لە دوو دەنێرم تا بە ڕێز و حورمەتێکی زۆر بتهێننەوە ئێرە. ئەگەر من یان تۆ مردین ئەوە لەو دونیا یەکتر دەبینینەوە. ئەوە باشترین فکرە. هەتا زیندووش بین دەست لە نامە ناردن بۆ یەک هەڵناگرین و ماڵیشت هەر بۆ بەرێ دەکەم. پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە هەستە برۆ. ئیدی دەستیان لە ملی یەک کرد و تێر تێریان یەکتر هەڵگوشی و هەڵمژی. ئینجا مارف هەستا ئاوێکی بە خۆیدا کرد و جلوبەرگی شایانەی لە بەر کرد. بە سەرمەیتەری گوت ئەسپێکی

بۆ زین کەن. مەیتەر ئەسپێکی زین کرد و دەستەجڵەوی دا دەست مارف. مارف ماڵاوایی لە شازادە کرد و بەری بەیانی وەدەر کەوت. هەرکەس دەیدی وای دەزانی بریکاری پادشایە و بەرەو شوێنێک دەڕوا بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری وڵات.

کە ڕۆژ بووەوە و پادشا چووە دیوان، وەزیری بانگ کردە دیوێک و کەسێکیشی نارد بە دوای شازادەدا. شازادە هاتە پشت پەردەوە. باوکی گوتی: «کچم، چیت کرد؟» کچە وڵامی داوە: «خودا ڕووی وەزیر ڕەش کا، هەر دەیویست من لە لای مێردەکەم سووک و ڕسوا بکا.» پادشا پرسی: «بۆ وا دەڵێی؟» شازادە گوتی: «دوێنێ مێردەکەم هاتەوە ماڵێ پێش ئەوەی من هیچ بڵێم، یەکێک لەو خەساوانە کە ناوی فەرەجە هاتە ژوورێ و نامەیەکی بە دەستەوە بوو، گوتی: «دە دانە پیاو لە خوار کۆشکەوە ڕاوەستاون و ئەو نامەیان دا بە من و گوتیان: لە جیاتی ئێمە دەستی سەروەرمان «مارف» ماچ بکە و ئەو نامەیەی بدەیە، ئێمە پیاوی ئەوین و لەگەڵ بارەکانی ئەو بووین. بیستمانەوە کە کچی پادشای هێناوە. ئێمە هاتووین پێی ڕاگەیەنین کە چیمان بە سەر هاتووە. ئەمن نامەکەم وەرگرت و خوێندمەوە. تەماشام کرد ئەو نامەیە لە لایەن پێنسەد کۆیلەوە نووسراوە بۆ سەروەریان «حەزرەتی مارف»ی بازرگان کە ئاگادار بێ دوای ئەوەی ئەو بەجێی هێشتووین عەرەبێکی زۆر، نیزیک دوو هەزار کەس پێشیان پێ گرتوون و شەڕێکی قورس لە نێوانیاندا هاتووەتە ئاراوە و نەیان هێشتووە بێین. سێ ڕۆژانیش لەگەڵیان بەربەرەکانیان کردووە و بەڵام ئەوان هێند زۆر بوون باشاریان نەکردوون. ئەوە هۆی نەهاتنەکەمانە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! نووسیبوویان عەرەب پێشیان پێ گرتوون بۆیە نەهاتوون. دوو سەد باریان لێ گرتووین و پەنجا کەس لە کۆیلەکان کوژراون. کاتێک مێردەکەم ئەوەی بیست گوتی: «ڕووی ئەو کوێخا و بەر پرسانە ڕەش بێ وا بۆ دوو سەد بار لەگەڵ ئەوانە تێ کەوتوون. ئەوە شەڕی خۆ ترێنە. هەر وا دەمدانێ و ئەها. دوو سەد بار چییە تا شەڕی بۆ بکەی.» پاشان گوتی: «دەبێ بچم، بیانهێنم. خۆ من گوێ نادەمە قسەی عەرەبان. دەنا وا دەزانن من لێیان ترساوم.» دوای ئەوە بە پێکەنینەوە وەک ئەوەی هەر نە بای پێدا هاتبێ و نە بۆران لێیدا ڕۆیشت. لە بەر هەیوانی کۆشکەوە چاوم لێ بوو، ئەو دە کەسەی هاتبوون هەموو خورتی جوانچاک و لەبار دەتگوت مانگن. یەکی کراسێکی دووهەزاردیناریان لە بەردا بوو. کە پیاوەکانی باوکم لە بەریاندا نەبوو. مێردەکەم لەگەڵ ئەوان ڕۆیی وە دوای ماڵەکەی کەوت. باش بوو شوکری خودا فریا نەکەوتم هیچ بڵێم ئەو کورە هات دەنا ئابڕووم دەچوو. دەبووینە تیزەجاڕیش، وا ڕەش دەبووم، لە بەر چاویشی دەکەوتم. ئەوە فکری ئەو وەزیرە خاوێنەیە. عەجەب وەزیرێکە هەر مابوو. لە بەر چاوی خەڵک حەیا شمان بەرێ. دیتە بۆخۆی ڕقی لێیەتی بۆیە ئاوا قسەی نەشیاو لە پشت سەری مێردەکەم دەکا.»

پادشا گوتی: «کچم، ئەو مێردەی تۆ زۆری هەیە و دووسەد بار بۆ ئەو هەر هیچ نییە و پێی شلوێ نابێ. لەو ڕۆژەوەی هاتووەتە ئێرە یارمەتییەکی زۆر هەژاران و نەدارانی داوە. ئیشەڵڵا زوو بارەکانی دێنێ و یارمەتی ئێمەش دەدا. بەو قسانە پادشا دڵخۆشی کچەکەی دەداوە و وەزیری سەرکۆنە دەکرد. [با ئەوان لێرە چاوەڕێی بن.]

مارفی بازرگان سواری ئەسپ بوو، بە بێروونێکی ویشک و برینگ و کاکی بە کاکیدا، وە ڕێ کەوت. سەری لێ شێوا بوو. نەیدەزانی ڕوو لە کام لا بکا و بچێ بۆ کام شار. لە تاوی شازادە خانم حەجمینی نەبوو. لە بەر خۆیەوە دەگریا و ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

گوڵی جوانم، گەزیزەی دوای شەختەی ژینم
لێت هەڵبڕام، پێش ئەوەی تێرتێر بتبینم
هەرچی جوانییە، هەموویم لە تۆدا بینی
زۆر دەترسم، بمرم و دیسان نەتبینم

کە شێعرەکە تەواو دەبوو، دیسان دەستی دەکردەوە بە گریان. لای ئێوارە« کاتێک لە هەموو شتێک بێ هیوا ببوو، دەستی لە هەموو شتێک شوتبوو. پێی وا بوو هەموو دەرگا و ڕێگاکانی بە سەردا داخراوە، گێژ و کاس بە سەر ئەسپەکەوە لەقەی دەهات، لە دوور

شارێکی لێ وەدیار کەوت. پێش ئەوەی بگاتە ناو شار تووشی کابرایەک بوو بە گا جووتی دەکرد. مارف کە زۆری برسی بوو، لایدا و چوو بۆ لای. سڵاو و ماندوونەبوونی لێ کرد. کابرای جووتیار سڵاوەکەی ئەستاندەوە. لێی پرسی: «ئەتۆ نوێنەری پادشای؟» مارف وڵامی داوە: «بەڵێ نوێنەری پادشام.» جووتیار گوتی: «دەبێ لە لای من بمێنییەوە و میوانم بی.» مارف گوتی: «بە چی میواندارییم دەکەی خۆ هیچ شتێک دیار نییە.» جووتیار گوتی: «ئەتۆ دابەزە شار نیزیکە دەچم نان و چێشت بۆ خۆمان و ئالیکیش بۆ ئەسپەکە دێنم. مارف گوتی: «جا ئەگەر شار ئەوەندە نیزیکە ئەمن بۆخۆم و زووتریش دەگەمێ و لەوێ نانەکەم دەخۆم. جووتیار گوتی: «ئێرە شارۆچکەیە و هێند بچووکە بازاڕ و خواردنەگەی لێ نییە و بۆت پەیدا نابێ. تکات لێ دەکەم لێرە لادە و میوانی من بە. با دڵم خاترجەم بێ ئێستا دەچم و دێمەوە.» مارف دابەزی.

جووتیارە مارفی لەوێ بەجێ هێشت و ڕۆیشت. مارف لەوێ دانیشت و چاوەڕێی بوو. دوای ئێستێک لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو کابرا فەقیرەم لە کاریش کرد. ئەرێ بۆ هەڵنەستم لە جیاتی ئەو جووت بکەم، تا دێتەوە؟ ئیدی هەستا دەنگی گایەکانی دا. دەستی بە دەستەکەوشەکەوە گرت و گایەکانی لێ خوڕی. هێشتا چی وای نەکێڵابوو گاسنەکە لە شتێک گیری کرد و گایەکان ڕاوەستان. مارف چاوێکی لە گاسنەکە کرد. دیتی لە ئاڵقەیەک گیراوە. دەوری ئاڵقەکەی داوە سەیری کرد ئەو ئاڵقەیە بە دەرخۆنەیەکی بەردینەوەیە. جوان دەوری دەرخۆنەکەی داوە و گایەکانی دەنگ دا. دەرخۆنە لە جێی خۆی بزووت و لاچوو. ڕیزێک پێپلیکانی بەرد چنی دیت. چووە خوارێ. دیوێکی دیت وەک گەرماو هەر چوار لای سەکۆ بوو. سەر سەکۆیەکیان هەتا میچی زێڕ و سەر سەکۆی دووەم هەتا میچ زمڕوود و مرواری و سەکۆی سێیەمیش یاقووت و پیرۆزە و لال و چوارەمیش ڕووژە و بەردی گرانبایی هەڵچنرابوو. لە لای سەرەوەش یەغدانێکی لێ بوو، پڕ لە مرواری و گەوهەری دەگمەن و بێ هاوتا. هەر دەنکێکیشیان بە قەد گوێزێک گەورە بوو. لە سەر یەغدانەکەش قوتوویەکی زێڕی لێ بوو. کە چاوی پێی کەوت سەری سووڕ ما و لە خۆشیان خەریک بوو بفڕێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: «دا با بزانم چی تێدایە، کە دەستی برد و سەرەکەی هەڵگرت، کلکەوانەیەکی تێدا بوو کە چەند تەلیسمێکیان لە سەر نووسی بوو. دەستێکی پێدا هێنا. دەنگێک بە بەڵێ بەڵێ وەدەنگ هات و گوتی: «گەورەم، چیت دەوێ؟ ئەگەر دەتهەوێ شارێک ئاوەدان کەمەوە یان ئاوەدانییەک وێران بکەم. ئێستا دەیکەم. گەر دەتهەوێ پادشایەک بکووژم هەر ئێستا دەیکوژم.» مارف پرسی: «ئەتۆ کێی؟» دەنگەکە گوتی: «من خزمەتکاری ئەو کلکەوانەیەم. هەرکەس خاوەنی ئەو کلکەوانەیە بێ، ئەرکی منە لە خزمەتیدا بم. هەر کارێکی هەبێ بۆی جێبەجێ بکەم و خاوە خاو لە کاری مندا نییە. ئەمن پادشای جندۆکانم و لەشکرەکەم لە حەفتا هۆز پێک هاتووە کە هەر هۆزەی

حەفتاهەزار باڵباز و هەزار دێو و درنجیان هەیە و هەر دێوەی هەزار شـــەیتانی لە بەر دەست دایە کە هەر شەیتانەی هەزار جندۆکەی هەیە و هەمووشیان لە ژێر دەسەڵاتی خۆم دان و ناتوانن نافەرمانی بکەن. ئەمنیش بە هۆی ئەو دەسـتوور و یاسـایەی لە سـەر ئەو ئەنگوسـتیلەیە نووسـراوە، ناتوانم لە فەرمانی خاوەنی ئەو ئەنگوسـتیلەیە دەرچم. ئێسـتا تۆ خاوەنی ئەو ئەنگوسـتیلەیەی و من گوێڕایەڵی تۆم. هەرچیت دەوێ پێم بڵێ. خێرا جێبەجێی دەکەم. لە هەر جێیەکیش بی و کارت پێم بوو، دەسـتێک بە نەخشـی ئەو نەقیمەدا بێنە. لەجێوە دێمە خزمەتت. بەڵام وریا بە، قەت دوو جاری دەسـت پێدا نەهێنی. چونکە من بەرگەی ئاوری ئەو نێوانە ناگرم و دەسووتێم. ئەودەم پەشیمان دەبییەوە. ئەوە تایبەتمەندی من و ئەو کلکەوانەیە پێم گوتی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی نۆسەد و نەوەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کاتێک خزمەتکاری ئەنگوســـتیلەکە ئەرک و توانابیەکانی خۆی و ئەنگوســـتیلەکەی بە مارف ناســـاند. مارف لێی پرســـی: «ناوی تۆ چییە؟» وەڵامی داوە: «ئەبوسسـەعادات» واتە باوکی بەختەوەرییەکان.» مارف گوتی: « ئەبوسسـەعادات، ئێرە کوێیە؟» ئەبوســـــەعادات وەڵامی داوە: «ئێرە خەزێنەی شـــەددادی کوڕی عادە. ئەگەر مابوو من نۆکەری ئەو بووم و ئەو ئەنگوســـتیلەیەش ئی ئەوە، لێرەی دانابوو. ئەوە بە قســـمەت تۆ بوو.» مارف گوتی: «دەتوانی ئەو گەنجەی لێرە دایە بیبەیە ســـەر زەوی؟» ئەبوســـــەعادات گوتی: «ئەیچۆن زۆر بە ئاســـانی.» مارف گوتی: «ئەوەی لێرەدا هەیە هەمووی بەرە دەرێ و هیچی لێ مەهێڵەوە.»

ئەبوســـــەعادات بە دەســـت ئاماژەیەکی کرد و کۆمەڵێک کوڕیژگە مەجۆعمە لە ســـەر سەر پەیدا بوو تەواوی ئەو زێڕ و جەواهێرات و دوڕ و گەوهەر و رووژەیەیان بردە دەرێ و هیچیان تێدا نەهێشـت. مارف لە ئەبوســـەعاداتی پرســـی: «ئەو کوڕانە کێن؟» وەڵامی داوە ئەوانە منداڵی خۆمن. ئەو ئەرکە پێویســـتی بەوە بوو، هێزێکی بۆ کۆ کەمەوە. ئێســـتا هەر کـارێکت هەیە دەنـگ بکە. مـارف گوتی: «دەتوانی یەغـدانێکی زۆرم بۆ بێنی ئەو گەنجەیان تێ کەی و لە یەک سمیان بدەی و بۆم بارکەی؟» ئەبوسسەعادات گوتی: «حەح جا ئەوە چییە؟ زۆر ئاسـانە، هەر ئێستا.» هەرای کرد، منداڵەکانی کۆ بوونەوە. هەشتسـەد کەس بوون. پێی گوتن: «تـاقمێکتـان ببنە یەســـتر و تـاقمێک ببنە کـاروانچی جوانچاک و تاقمێکیشـــتان ببنە کۆیلە و خزمەتکار. ئەوان لەڕێوە بوون بەوانەی ڕایســـپاردن. بانگی دێوانی کرد لە بەردەمیان حازر بوون ئێوەش ببن بە ئەســـپی زینکراو. ئەوانیش بوون بە ئەسپی زینکراوی بە زێڕ و زێو ڕازاوە.

مارف کە ئەوانەی دیت گوتی: «یەغدانەکان لە کوێن؟» لەڕێوە یەغدانیان هێنا. مارف گوتی: «ئەو زێڕ و گەوهەرانە لە یەغدانەکان کەن. ئەوان تەواوی زێڕ و جەواهێراتەکەیان لە یەغدانان کرد و لە یەســـترانیان دا. مارف گوتی: « ئەبوســـــەعادات، دەتوانی کاڵای بازرگانی بێنی؟» ئەبوسسەعادات

وەڵامی داوە: «کاڵا و شـــتومەکی شـــامی و میســـری و عەجەمی و ڕۆمی و هێندیت دەوێ؟» مارف گوتی: «ئەیچی لە کاڵا و شـــتومەکی هەر شـــارەی ســـەد بارم بۆ بێنە.» ئەبوســـــەعادات وەڵامی داوە: «گەورەم دەبێ مۆڵەتم بدەی هەتا کۆیلە و پیاوەکانم ڕادەسپێرمە ئەو شارانە و کاڵا و شتومەکەکان بار دەکەن و دەیهێنن.» مارف پرسی: «ئەو ماوەیە چەندە دەخایەنێ؟» ئەبوســـــەعادات وڵامی داوە لە ئێســـتاوە تا لای بەیانی پێش

تاوهەڵاتی بەیانی دەگاتێ.» مارف گوتی: «زۆر باشە. بیاننێرە.»

دوای ئەوە فەرمانی دا هۆبەیەک بۆ ئەو چێ کەن. لەرێوە هۆبە ئامادە بوو. لە هۆبەکەدا دانیشت و سفرە لە پێشی ڕازاوە. ئەبوسسەعادات گوتی: «گەورەم بۆخۆت بە ئاسوودەیی لێرە دانیشە و ئەوانە منداڵی خۆمن لە خزمەتت دان. بۆخۆم دەچم کارەکان جێبەجێ دەکەم و ویستەکەی تۆ دابین دەکەم.»

ئەبوسسەعادات ڕۆیشت و مارف لە ژێر خێوەتەکەدا دانیشتبوو. سفرەی لە پێش داندرابوو. کوڕانی ئەبوسسەعادات دەستەونەزەر لە دەوری وێستابوون کە کابرای جووتیار هاتەوە. قاپێکی دارینی نیسکێنە و توورەکەیەکی جۆ هێنابوو. کە گەیشتێ و چاوی بە خێوەتەکە کەوت، ئەو نۆکەرانەشی دیت لەوێ دەستەونەزەر ڕاوەستاون، پێی وا بوو پادشا هاتووە و لەوێدا دانیشتووە. واقی وڕ ما و نەیدەزانی چ بکا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆزگە دوو فرووجم کوشتباوە بە دیاری هێنابام. ویستی بگەڕێتەوە و بچێ مامرەکان بێنێ بۆ پادشا کە مارف چاوی پێی کەوت. بە پیاوەکانی گوت: «دا بچن ئەو پیاوە بێننە ئێرە. پیاوەکانی چوون دەوریان دا و بە قاپە نیسکێنە و توورەکە جۆوە هێنایانە لای مارف. مارف لێی پرسی: «ئەو قاپە چی تێدایە؟» جووتیار گوتی: «ئەو قاپە نیسکێنەیە و ئەو توورەکەیەش جۆیە بۆ ئەسپەکەی تۆم هێناوە. تۆخودا لێم بە ئیراد مەگرە من نەمزانی پادشا تەشریف دێنێ، دەنا دوو دانە مامرم بۆ دەکوشتەوە و بۆم دێنا.» مارف گوتی: «کێشە نییە. پادشا نەهاتووە، ئەمن زاوای پادشام و لێی تۆرابووم. ئەو پیاوانەی ناردووە لە دووم بچمەوە. دەمهەوێ بچمەوە بۆ ناو شار. ئێستا چونکە تۆ بێ ئەوەی بم ناسی میوانداریت کردووم. هەر بە نیسکێنەکەی تۆ قایلم و ئەو دەخۆم و دم لە هیچی دیکە نادەم.» قاپە نیسکێنەکەی لێ وەرگرت و گوتی دانیشە با نانەکەمان بخۆین. ئیدی پێکەوە نانەکەیان خوارد. مارف نیسکێنەی خوارد و کابرای جوتیاریش بە کەیفی خۆی لە خواردنە شایانەکەی خوارد.

دوای ئەوە مارف دەستی شوت و قاپەکەی پڕ کرد لە زێڕ و دایەوە بە کابرای جووتیار و پێشی گوت ئەو زێڕانە بەرەوە بۆ ماڵێ و لە شاریش وەرە بۆ لام زەرەر ناکەی. جووتیار جامە پڕ لە زێڕەکەی وەر گرت و گایەکانی وە پێش خۆی دا و بەرەو شار گەڕاوە . پێشی وا بوو ئەو زاوای شایە.

مارف بۆ شەوێ لەوێ ماوە. شەو کیژگەلێکیان لە هۆزە جیاجیاکانی جندۆکان بۆ هێنا، هەموو دەتگوت زێڕن هێندە جوان بوو. ئەو کیژانە هەتا بەری بەیان مووزیکیان بۆ ژەنی و گۆرانیان بۆ چڕی و سەمایان بۆ کرد. لە کازیوەی بەیانیدا دەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵبێک پەیدا بوو. کە دەنگەکە نیزیک بووەوە و وە دەر کەوتن. سەیریان کرد ئەوە حەوسەد بارە

کاڵا و شتومەکە گرانباییەکان لەگەڵ کەردار و باربەندەکان گەیشتنێ و ئەبوسسەعادات وەک سەرقافڵەی کاروان بە سواری یەسترێکەوە دەهات و تەختێکی ڕەوانی لە ژێڕ کراویش کە پەردەی بە دەوریدا کێشرابوو، لە پێشەوە دەڕۆیشت. ئەبوسسەعادات کاتێک گەیشتە بە دەرکی خێوەتەکە لە یەسترەکە دابەزی و کوڕنۆشی برد و گوتی: «گەورەم تەواوی شتەکانمان وەگیر کەوت. لە نێو ئەو تەختەدا کراس و جلوبەرگی شایانەی تێدایە، بۆخۆت کامەیانت پێ جوانە لە بەری بکە و لە سەر ئەو تەختە دانیشە و هەر چییەکت ویست فەرمان بدە.» مارف گوتی: « ئەبوسسەعادات دەمەوێ نامەیەک بنووسم. تۆ ئەو نامەیەم بۆ بەری بۆ شاری «خوتانولخوتەن» و بیدەیە دەست مامم کە پادشای ئەوێیە. ئەبوسسەعادات گوتی: «هەر ئەمرێک بفەرمووی لە سەر چاومی دادەنێم.»

مارف نامەکەی نووسی و دای بە ئەبوسسەعادات. ئەبوسسەعادات نامەکەی برد و دایە دەست پادشا. کە گەیشتە لای پادشا گوێی لێ بوو، پادشا بە وەزیری دەگوت: «وەزیر ئەمن نیگەرانی زاواکەمم. دەترسم عەرەبان بیکوژن. خۆزگە دەمزانی چووە بۆ کامە لا، هەتا بە لەشکرێکەوە وەدوای کەوتبام. خۆزگە بە ئێمەی دەگوت بە تەمایە بڕوا.» وەزیریش گوتی: «خودا تەمەنی پادشامان درێژ کا، چاک کەوتوویە ناو گێژاوی خەون و خەیاڵانەوە. پادشا بە گیانی تۆ ئەو کابرایە زانی کە ئێمە پێمان زانیوە درۆزن و حۆقەبازە لە ترسی ئەوەی ئابڕووی نەچێ هەڵاتووە. ئەو پیاوە درۆزن و خۆهەڵکێشە و هیچی دیکە...» لەو قسانەدا بوون کە ڕاسپاردەکەی مارف لێیان وە ژوور کەوت. کوڕنۆشی بۆ پادشا برد و داوای تەمەندرێژی و بەردەوامی تاج و تەختی بۆ کرد. پادشا سڵاوەکەی ئەستاندەوە و پرسی: «ئەتۆ کێی و چ کارێکت هەیە؟» ئەبوسسەعادات وەڵامی داوە: «ئەمن نێردەی زاواکەی جەنابتم و ئەویش ئەوە بە بارەوە دەگاتێ. ئەو نامەیەشم بۆ هێناوی.» پادشا نامەکی لێ وەر گرت و خوێندییەوە. دوای سڵاو و چاک و چۆنی، نووسیبووی ئەمن ئەوە دەگەمێ ئێوەش بە لەشکرەوە بەرەو ڕوومان وەرن. پادشا ڕووی لە وەزیر کرد و گوتی: «خودا ڕووت ڕەش کا. وا هەمیشە هەر لە سەروسەکوتی ئەو زاوایەی من دەدەی و خراپەی دەڵێی. ئەوە بە بارەوە گەیشتێ.» ئیدی وەزیر لە خەجاڵەتیان سەری داخست و گوتی: «پادشا ئەمن ئەو قسەیەم هەر لەبەر ئەوە کرد. زۆری خایاند بارەکانی هەر نەهات و منیش خەمی ماڵەکەی تۆم بوو.» پادشا گوتی: «خائین بۆ ماڵەکەی من چەند بوو ئاوات دەکرد. خۆ ئەگەر ماڵەکەی هاتبا چەند بەرابەری دەدا.

پادشا ئەوجار فەرمانی دا شار برازێننەوە. بۆخۆشی چوو بۆ لای کچەکەی و مزگێنی دایە کە ئەوە مێردەکەت بە بارەوە گەیشتەوە. شازادەی کچی پادشا بە بیستی ئەو قسەیە ویشک بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: «باری چی و شتی چی. دیسان دەستە گوڵێکی دیکەی بە ئاودا نەدابێ؟ یان بابم بە تەشەرەوە وام پێ دەڵێ و گاڵتەم پێ دەکا. ڕەنگیشە بیهەوێ

تاقیم کاتەوە؟ خۆ ئەمن هیچ تاوانێکم نییە.» ئەو لەوێ لەو فکرانەدا بوو.

عەلی میسریش کە دیتی شار ڕازاوەتەوە، پرسی: «ئەوە چ باسە؟» گوتیان ئەوە مارفی بازرگان، زاوای پادشــــا خەریکە بە خۆی بە بارەوە دەگاتێ. عەلی میســـری گوتی: «ســوبحانەڵلا، ئەوە چی دەبیســتم؟ مارف کە لە دەســت خێزانی هەڵات و هاتە ئێرە نانی شــەوی نەبوو. ئەوە چۆناوچۆنە؟ باری چی و شــتی چی؟ ئەوانەی لە کوێوە هێناوە. ڕەنگە کچی پادشا بۆ ئەوەی ئابڕووی نەچێ پشتی گرتبێ و ماڵ و سامانی لە بەر دەستی نابێ! پادشایان ئەو کارانەیان لە دەست دێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی نۆسەد و نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! عەلی میسری کە زانی شار بۆ ڕازاوەتەوە، بۆ مارف پاڕاوە و گوتی: «خودایە ئابڕووی بپارێزی و ڕاســـتییەکانی لێ وە دەر نەکەوێ.» بازرگانەکانی دیکە خۆشـــحاڵ بوون و گوتیان: ئەوە شـــوکور بارەکانی مارف هات، پارەکەمان وەگیر دەکەوێتەوە.

پادشا بە لەشکرەوە لە شار چووە دەرێ. ئەبوسسەعادات گەڕاوە بۆ لای مارف. پێی گوت کە کارەکەی جێبەجێ کردووە. ئەوجار مارف فەرمانی دا یەغدان و شـــتەکەیان لە یەستران دا. بۆخۆی عەبای شایانەی بە شانیدا دا و لە نێو تەختی ڕەواندا دانیشت. شکۆ و گەورەیی ئەو لە ئی پادشا زیاتر بوو. گەیشتبوونە نیوەی ڕێگایە کە پادشا بە لەشکرەوە گەیشـــتێ. تەماشـــای کرد، مارف عەبای شـــایانی بە شـــانیدا داوە و لە نێو تەختی ڕەواندا دانیشـــتووە. لە ئەســـپەکە هاتە خوارێ و ســـڵاوی لە مارف کرد. تەواوی گەورەگەورەکان کوڕنۆشیان برد. بۆ هەموو کەس وەڕاست گەڕا کە مارف ڕاستگۆیە.

مارف بە شـــکۆیەکی زۆرەوە گەڕاوە ناو شـــار. بازرگانەکان چوونە ســـڵاوی و بە خێر هاتنەوەیان کرد. ئەوجار عەلی میســـری بازرگان چووە پێشـــێ و پێکەنی بە ســـرتە گوتی: «مامۆســـتای فێڵبازان ئەوە بە چی وات لێ هاتووە؟» مارف بزیەکی هاتێ و گوتی: «خودا گەورەیە.» ئیدی چووە کۆشکەوە. لە سەر کورسی دانیشت و گوتی: «زێڕەکان هەڵڕێژنە خەزێنەی مامەوە و بارە شـــتەکان بێننە لای خۆم. ئیدی کۆیلەکان یەکە یەکەی بارەکانیان هێنا لای مارف و بە ڕیز دایان نان و سەریان هەڵپچڕین. هەتا حەوسەد بارەکە تەواو بوو. مارف باشترینیانی هەڵبژارد و ناردی بۆ شازادە گوتی با بە سەر کەنیز و خزمەتکارەکانیدا دابەشـــی بکا. قەرزەکانی بە زیادەوە داوە بە بازرگانەکان. ئەوەی هەزار دیناری لە ســـەری بوو، دوو هەزار دیناری دەدایە. دوای ئەوە ئاوڕی لە فەقیر و هەژار و بەلەنگازان داوە و یارمەتییەکی باشـــی کردن. پادشـــا ئەو کارانەی دەدیت و نەشـــی دەزانی بڵێ چی؟ واقی وڕ مابوو. مارف هەر دای بەم و بەو و ماڵی دابەش کرد، تا وای لێ هات ئەو حەوســـەد بارە تەواو بوو.

ئەوجار بانگی باڵبازەکانی کرد و هەر بە چنگ زمڕوود و یاقووت و مراوری و لۆلۆی دەدانێ. پادشـــا گوتی: «کوڕەم ئەو ماڵە ئاوا بڵاو مەکەوە بارەکانت ئەوەندەیان نەماوە. مارف گوتی: «ئەمن لەو جۆرە شـــتانەم زۆرە.» ئیدی ڕاســـتوێژی مارف دەنگی داوە و ئەوەی دەیگوت کەس نەیدەتوانی بڵێ وا نییە. بەردەوام دەســـتی خەڵکی دەگرت و ئەم و ئەوی بە ســـەر دەکردەوە. چونکە هەرچی ویســـتبای خزمەتکاری ئەنگوستیلەکە بۆی دێنا.

ڕۆژێک خەزێنەدار هاتە لای پادشا و گوتی: «خەزێنە پڕ بووە لە زێڕ و گەوهەر. پاشماوەی ئەو بارانە لە کوێ دانێین؟» پادشا شوێنێکی دیکەی بۆ دیاری کردن.

ژنەکەی مارف کە ئاوای دیت زۆر زۆر خۆشحاڵ بوو. سەریشی سووڕ مابوو. هەر دەیگوت خۆزگە دەمزانی ئەو هەموو شتەی لە کوێ و چۆناوچۆن وەگیر کەوتووە؟ بازرگانەکانیش بە هۆی ئەو هەموو یارمەتییەی کە مارف پێی کردبوون لە ڕادە بەدەر خۆشحاڵ بوون و دۆعایان بۆ دەکرد.

عەلی بازرگانیش کە چەند ڕۆژ بوو ئەو دەستودڵبازی و تەخشان و پەخشانەی مارفی دیتبوو؛ لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «خۆزگە بمزانیبایە بە چ فێڵ و کەڵەکێک ئەو هەموو ماڵ و سامانەی وەگیر کەوتووە؟ وا بێخەم لێی دەبەخشێتەوە. ئەگەر ئەو ماڵە ئی شازادەی خێزانی بایە قەت نەیدەتوانی ئاوا بە سەر هەژاران و بێ ئەنوایانی دابەشی بکا.؟» عەلی بەردەوام لەو فکر و لێکدانەوانەدا بوو.

دوای ئەو دانوپەخش کردنە، مارف هەستا چوو بۆ لای خێزانی. شازادە بە بزە و پێکەنینەوە بەرە و پیری هات و دەستی ماچ کرد و لێی پرسی: «ئەوە گاڵتەت بە من دەکرد یان تاقیت دەکردمەوە، دەتگوت: «من فەقیرم و لە دەست ژنەکەم هەڵاتووم و چی و چی؟ خۆ ئەمن تووشی هەڵە و بێ ئەدەبی نەبووم لە خزمەتتدا. تۆ خۆشەویستی منی و کەس بە قەت تۆ لە لام ئازیز نییە. جا چ دەستەنگ بی و چ دەستڕۆیشتوو، تێروتەسەل بی یان برسی. بەڵام پێم بڵێ بۆ وات دەگوت؟» مارف گوتی: «هەر ویستم تاقیت کەمەوە بزانم تۆ لە دڵەوە منت خۆش دەوێ یان هەر لەبەر ماڵ و سامانە؟» شازادە خانم گوتی: «کە وا بوو شوکر بۆت دەرکەوت کە خۆشەویستییەکەم بێ خەوشە و لەبەر ماڵی دونیا نییە.» مارف گوتی: «جا ئێستا کە خۆشەویستیی تۆ بێ خەوشە منیش ئەوەم لە چاویدا دەبێ.»

دوای ئەوە چوو لە پەنایەکدا دەستێکی بە ئەنگوستیلەکەدا هێنا. ئەبوسسەعادات لەڕێوە بە بەڵێ بەڵێ پەیدا بوو. گوتی: «گەورەم چیت دەوێ؟» مارف گوتی:«ملوانکەیەکم دەوێ چل گەوهەری بێ وێنەی تێدا بێ. لەگەڵ کراسێکی شایانەی ژنان. بۆ خێزانم.» ئەبوسسەعادات گوتی: «بە سەر چاو.» ئیدی ون بوو. ئەوەندەی پێ نەچوو، شتەکانی هێنا. مارف کراس و ملوانکەی لێ وەر گرت و بردی دای بە شازادە و گوتی: «دا هەستە ئەوانە لە بەر بکە. شازادە کە چاوی بەو کراس و ملوانکەیە کەوت لە خۆشیان هۆشی نەما و ماچی کردن. دوای ئەوەی لە بەری کردن گوتی: «گەورەم، ئەوانە حەیفن. دەڵێم دایان کەنمەوە، هەر بۆ جێژنە و میوانی لە بەریان بکەم.» مارف گوتی: «نا ئەوانە دامەکەنەوە ئەمن شتی ئاوانم زۆرە.» شازادە بەو قسەیە خۆشحاڵ بوو.

کەنیزەکان کە شازادەیان لە جلوبەرگانەوە دیت خۆشحاڵ بوون. مارف چووە دەرێ و

لە پەنایەک دەستێکی بە ئەنگوستیلەکەدا هێنا و داوای لە ئەبوسسەعادات کرد بچێ سەد کراسی جوان و سەد جووت گوارە و کرمەکی زێڕ بێنێ. ئەبوسسەعادات لەڕێوە بۆی هێنا. مارف لێی وەر گرت و بانگی کەنیزەکانی کرد. کەنیزەکان هاتن دەوریان دا. یەکی کراسێک و دەستێکی گوارە و کرمەکی زێڕ دانێ. کەنیزەکان کراسەکانیان لە بەر کرد و گوارە و کرمەکەکانیان وە خۆیان خست. وەک حۆری بەهەشتیان لێ هاتبوو. هێشتا شازادە لە چاو ئەوان وەک مانگ بوو لە نێو ئەستێراندا.

لەو جەنگەیەدا پادشا هات سەری کچەکەی بدا. کە کچەکەی و کەنیزەکانی ئاوا دیت. واقی وڕ ما و چاوی تێ برین. دوای ئەوە لەوێ هاتە دەرێ و ئەوەی دیتبووی بۆ وەزیرەکەی گێڕاوە و گوتی: «وەزیر ئەوە بڵێی چۆناوچۆن بێ ئەو هەموو ماڵە؟» وەزیر گوتی: «پادشا، بازرگانی ئاوا نییە و ناتوانێ ئاوا بکا. بازرگا شتەکەیان ڕادەگرن تا خێر دەکا و دوایە دەیفرۆشنەوە. خێر نەکا نایفرۆشنەوە. بازرگان ناتوانێ ماڵەکەی ئاوا تەخشان و پەخشان بکا. دیسان بازرگان ماڵ و گەوهەر و شتی ئاوا دەگمەنی وەگیر ناکەوێ. ئەو کابرایە گەوهەری پێیە لە لای هیچ پادشایەک وەگیر ناکەوێ. دەی چۆن دەکرێ بازرگانێک بە لێشاو لەوانەی بێ. وا هەر نییە. ئەو ماستە بێ موو نییە. ئەگەر تۆ ڕێم بدەی پێی لە بنی کوولەکە دەدەم. پادشا گوتی: «ئەمن ئەوە ڕێم دای. برۆ بزانەم چ دەکەی.» وەزیر گوتی: «پادشا لەگەڵی لە شوێنێک دانیشە و دڵسۆزانە قسەی لەگەڵ بکە و پێی بڵێ: بڵێ پێم خۆشە من و تۆ و وەزیر بچین بۆ نێو باخ کەمێک بگەڕێین. ئەگەر قەبووڵی کرد هەر سێکمان پێکەوە دەچین بۆ باخ. لەوێ بەزمی شەرابخواردنەوە دانێم و ئەوەندەی شەراب دەدەمێ تا لە سەر خۆی دەبەم و هۆشی لای خۆی ناهێڵم. جا ئەوجار پرسیاری لێ دەکەم و ڕاستی کارەکانی لێ دەر دەکێشم. وەک شاعیر دەڵێ:

شەڕاب ئەی شادی هێنی ئابڕوو بەرە
بتخۆمەوە هەڵدەدەیەوە بەرە
هەر بۆیە ناوێرم قەت خۆمت لێ دەم
هەست و نەستم دەدەیە دەرێ هەر دەم

کاتێک بەرەمان پێ لەسەر هەتیوان هەڵداوە. ئەودەم چۆنت پێ خۆش بێ لەگەڵی دەکەین. ئەمن نیگەرانی دواڕۆژی تۆم. هاتوو تەماعی لە وڵاتەکەت کرد. ئەوە بە دیاری و خەڵات سەرنجی تەواوی لەشکرەکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. هەر بینا ڕۆژێک ئەتۆی خستە لاوە و دەسەڵاتی لە دەست دەر هێنای.» پادشا گوتی: «وەزیر ڕاست دەکەی.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆسەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! قسەکەی وەزیر پادشای دوو دڵ کرد و ئەو شەوە ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی مارف بەرنە دەرێ بیدۆزن. بەیانی پادشـا هاتە دەرێ و چوو لە دیوان دانیشـت. لە پڕدا مەیتەرەکان مات و مەلوول هاتنە لای. پادشـا گوتی: «ئەوە چبووە بۆ وا پەشـێون؟» گوتیان: پادشا شەو پێش خەوتن چووین ئالێکمان دا بەو ئەسپ و یەسترانەی کە بارەکانی زاواکەی جەنابتیان هێنابوو. سـۆزی سـەیرمان کرد، هەموویان دزراون و نەشـمان زانی دزەکان بۆ کام لا چوون. پادشـا زۆری پێ سـەیر بوو. پێی وا بوو دەبێ ئەوانە هەر دێو و درنج بووبن. بوون بە یەستر و بارگین. ئیدی بانگی خزمەتکارەکانی کرد و گوتی: «گلاوینە چۆن هەزار سـەر یەسـتر و بارگین لە بەر چاوی ئەو هەموو خەڵک دەدزرێ و کەسـیش پێیان نازانێ.» مەیتەرەکان گوتیان ئێمە ئاگامان لە هیچ نەبووە. باشـە بچنەوە با خاوەنتان لە دیوەکەی بێتە دەرێ. ئەوان گەڕانەوە و هەموو کاس و داماو دانیشـتبوون کە مارف لە دیوەکەی هاتە دەرێ. تەماشـای کرد هەموویان مات و مەلوول دانیشـتوون. پرسـی: «ئەوە چی بووە؟» ئەوان ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە. مـارف گوتی: «بۆ ئەوان بـایی چەندە دەبن ئەوەندەیان بۆ نارەحەتن؟» ئەو قسەیان بۆ پادشا گێڕاوە. پادشا گوتی: «ئەی ماشەڵڵا ئەو کابرایە چەندە دەوڵەمەندە و چەندیش دەستودڵبازە.»

مارف دوای ئەوە چوو بۆ لای پادشـا و دەسـتی کرد بە قسـە کردن. پادشـا پێی گوت: «مارف پێم خۆشـــە من و تۆ و وەزیر ســـبەینێ بچینە دەرێ و ماوەیەک لە ناو باخدا بگەڕێین و پشوویەک بدەین.» مارف گوتی: «فەرمان فەرمانی پادشایە. وا بوو بۆ سبەینێ پادشا و وەزیر و مارف هەستان چوون بۆ نێو باخ. باخ، باخێکی سەرسەوز و خۆش پڕ لە دار و درەخت و چۆم و ڕووبار و مەلی خۆشـخوێن. کە لە ناو بەخەکەدا دانیشـتن. وەزیر دەستی کرد بە گێڕانەوەی شتی سەیر و سەمەرە و قسەی قوڕ و پێکەنینی و خوێندنەوەی شـیعری خۆش خۆش. هەتا کاتی خواردنی خواردەمەنی هات. دوای تێر خواردن شـەرابیان هێنا. وەزیر پیاڵەیەکی تێ کرد و دای بە پادشـا و پیاڵەیەکیشـی بۆ مارف تێ کرد و گوتی: «ئەو پیاڵە شەرابە بخۆوە.» مارف گوتی: «ئەوە چییە؟» وەزیر وەڵامی داوە ئەوە شەرابی ترێیە و دڵی مرۆڤ شاد دەکا. وەک شاعیر دەڵێ:

گـڕی خەمـم بە مەی نەبـێ دانـامـرکـێ
ڕازی دڵ سـەرخـۆش نەبـێ قەت نـادرکـێ
بـۆم تـێکە لەو شـەرابە بە جـام و پـیـاڵە
بـا تۆزێ سـەرخۆشـم کـا چش لەوەی تـاڵە

شاعیرێکی دیکە لەو بارەوە دەڵێ:

ڕێی لە گەرووی یەعقووب کەوێ سـەمای پێ دەکا
دیارنەمـــــانی هەزار یۆسف قرووشێک ناکا

یەکی دیکە دەڵێ:

بێ گرێوگۆڵی دەکا وەک ئاوی کانی
کەسێـــــک هێند بخواتەوە سڕ بێ زمانی
پەشـیمانە مەسـت بۆی ناوێسـتێ گریانی
وەختە لە سـوێی مەزلوومان دەربچێ گیانی

شاعیرێکی دیکە لە بارەی شەرابەوە دەڵێ:

خۆشـی شـەراب کوا بە زمان باسـی دەکرێ
نازانی چێ تا لێی تێر نەبی و نەتگرێ
تۆ دەزانی دونیا ئەوەندە ناهـــــــێنێ
دڵۆپێک مەی خۆشـی دنیایەت بۆ دێنێ

بەو جۆرە وەزیر چوو لە بنییەوە و هانی دا زۆر بخواتەوە. تا وای لێ کرد. ئەوجار مارف پیاڵەکەی ماچ دەکرد. وەزیریش جار لەگەڵ جار خێراتری بۆ تێ دەکردوە. تا مارف وای لێ هات دەستی چەپ و ڕاستی خۆی لێک نەدەکردەوە. وەزیر کە زانی مارف تەواو مەست و کەلەلا بووە و ئاگای لە خۆی نییە، وردەوردە دواندی: «ئەرێ مارف دەزانی من هەمیشە بیر لە تۆ دەکەمە و سەرم سووڕ ماوە تۆ ئەو هەموو ماڵ و سامانەت لە کوێ بوو فێڵەزان؟ خۆ ئەو گەوهەرانەی تۆ هەتە هیچ پادشـایەک نییەتی. قەت قەت بازرگانێک ئەوەندەی پێ پەیدا نابێ و ناتوانێ ئەوەندە ببەخشێتەوە. ئەوەی تۆ دەیکەی کارێکی شایانەیە لە بازرگان ناوەشێتەوە. دا توخودا پێم بڵێ بزانم تۆ چۆنت پەیدا کردووە؟ ماڵتە ئێمە هاوپیاڵەین ئەگەر بە من نەڵێی بە کێ دەڵێی؟» وەزیر بەردەوام دەیدواند. چووبوو لە بنییەوە. هەتا ئاخری مارف گوتی: «وەزیر من نە بازرگانم نە لە وەچەی پادشایانم.»

ئیدی بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ وەزیر گێڕاوە. ئینجا وەزیر گوتی: «دا توخودا مارف ئەو ئەنگوستیلەیەم دەیە بزانم چۆن دروست کراوە و نەخش و نیگارەکەی چۆنە. مەمنا مارف زۆر سەرخۆش بوو. بێ ئەوەی بیر لە ئەنجامی کارەکەی

بکاتەوە، گورج کلکەوانەکەی دا بە وەزیر. وەزیر چاوێکی لێ کرد و گوتی: «ئەوە ئەگەر منیش دەستی پێدا بێنم ئەو شتە وە دەر دەکەوێ؟» مارف گوتی: «ئەی چۆن دەستێکی پێدا بێنە زوو دەتگاتە لات و لە بەر دمت قوت دەبێتەوە.» وەزیر دەستێکی ڕێخست. لەڕێوە دەنگێک بە بەڵێ بەڵێوە پەیدا بوو. گوتی: «چی دەفەرمووی لە خزمەتت دام.»

وەزیر دەستی بۆ مارف ڕاداشت و بە خزمەتکاری ئەنگوستیلەکەی گوت: «ئەو گڵاوەم بۆ بەرە بۆ دەشتێکی کاکی بە کاکی بێ ئاو و ڕووتەن. دوور لە ئاواوەدانی با لە برسان و لە توونیان لەوێ قڕی بێ. خزمەتکاری ئەنگوستیلە لەڕێوە مارفی هەڵگرت و وە حەوا کەوت. مارف کە زانی چ بووە. دەستی لە خۆی شوت و دەستی کرد بە گریان و گوتی: «ئەبوسەعادات، بۆ کوێم دەبەی؟» وەڵامی داوە: «دەچم تۆ لە دەشتێک فڕێ دەدەم. ئاخە بێ ڕەوشت کەسێک شتێکی ئاوای وەگیر کەوێ هەر وا بە ئاسانی لە دەستی دەدا؟! دەیدا بە کەسێکی دیکە؟ ئەتۆ دەبێ لەوەش خراپترت لێ بەسەر بێ. بە خودا ئەگەر لە ترسی خودا بموێرابایە لێرەوە بەرم دەدایەوە با لەتوکوت بیت.» مارف کە ئەوەی بیست بێدەنگ بوو. هەتا ئەبوسەعادات ئەوی لە قاقڕستانێکی ویشک و برینگ حەوا دا و بۆخۆی گەڕاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی نۆسەد و نەوەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! وەزیر کاتێک بوو بە خاوەنی کلکەوانەکە بە پادشـــای گوت: «پێت چۆن بوو، نەمگوت ئەو ماســـتە بێ موو نییە و شـــتێکی لە بن ســـەر دایە؟ نەمگوت هەموو گیانی درۆیە. خۆش هەڵکێش و فشـــەکەرە.» پادشـــا گوتی: «وەزیر قســـەی تۆ ڕاســـت بوو. جوانی تێ گەیشتبووی. دایەی ئەو ئەنگوستیلەیە با چاوێکی لێ بکەم، بزانم چییە؟» وەزیر بە تووڕەییەوە چـاوێکی لێ کرد و تفێکی لە ڕیشـــی کرد و گوتی: «گەوجە، چۆن ئەوە کلکەوانەیە دەدەم بە تۆ و بە دەســـتی خۆم، خۆم ماڵوێران و بێ دەســـەڵات دەکەم. ئێســـتا تۆش لە هەڵدەدێرم. وای گوت و دەســـــتێکی بە نەقیمی ئەنگوســـــتیلەکەدا هێنا. لەجێوە خزمەتکاری کلکەوانەکە پەیدا بوو. وەزیر گوتی: «پادشـــــای جندۆکان ئەو بێ ڕەوشـــتەش هەڵگرە و بیبە لە لای ئەو بەرەڵایەی زاوای فڕێی دە. ئەبوسسەعادات پادشاشی هەڵگرت و وە حەوای خســـت. پادشـــا پرســـی: «پادشـــای جندۆکان ئەمن چ گوناحێکم کردووە؟» ئەبوســـــــــەعادات گوتی: «نازانم ئەتۆ چ گوناحێکت کردووە. بەڵام خاوەنم ئەمری بە من کردووە و منیش ناتوانم بێ ئەمری ئەو بکەم.» جندۆکەکە پادشـــاشـــی بردە ئەو دەشـــتە قاقڕەی مارفی لێ فڕێ دابوو. ئەویشـــی لەوێ فڕێ دا و گەڕاوە. پادشـــا گوێی لە شـــین و گریانی مارف بوو، هەســـتا چوو بۆ لای. پێکەوە دەســـتیان کرد بە گریان. [ئەوان با لەوێ بگرین.]

وەزیر لە باخ گەڕاوە و چوو لە دیوان دانیشت. بانگی بەرپرسانی لەشکری کرد بێن کۆ بنەوە. ئەوەی بە ســـەر پادشـــا و مارفی هێنابوو بۆ ئەوانی گێڕاوە. باســـی تواناییەکانی کلکەوانەکەی بۆ کردن و گوتیشـــی ئێســـتا ئەو ئەنگوســـتیلەیە لە ژێر دەســـەڵاتی من دایە و هەموو کارێکم لە دەســـت دێ. ئەگەر ئێوە من وەک پادشـــای خۆتان قەبووڵ دەکەن ئەوە باشە دەنا چێم بەسەر ئەوان هێنا، ئاواش بە سەر ئێوە دێنم و بە پادشای جندۆکان دەڵێم هەمووتان هەڵگرێ و بتان با بۆ ئەوێ با هەمووتان لەوێ لە برســـــان و لە تووونیان قڕتان بێ. بەرپرسانی لەشکر گوتیان ئێمە بە گەورەیی و سەروەری تۆ ڕازین و قەبووڵی دەکەین تۆ پادشای ئێمە بی. تاقمان لە قسەت دەرناچین. بەوجۆرە ئەوان لە ترسان بە دەسەڵاتداری وەزیر ڕازی بوون.

وەزیر هەموویانی خەڵات کرد. هەر شـتێکی لە ئەبوسـسـەعادات دەویسـت، لەڕێوە بۆی دێنا. دوای ئەوە، وەزیر چوو لە ســـەر تەختی پاشـایەتی دانیشـت و کەسـێکی نارد بۆ لای شازادەی کچی پادشا و خێزانی مارف، پێی ڕاگەیاند کە خۆی ساز بکا، شەو دەچم بۆ لای. چونکە لە مێژە تامەزرۆی ئەوم. کاتێک نێردەی وەزیر چوو بۆ لای شازادە و ئەو هەواڵەی

دایە. کچە لە تاوی باوکی و مێردەکەی دەستی کرد بە گریان. پاشان کەسێکی نارد بۆ لای وەزیر و لێی ڕاسپار کە جارێ لە سووڕی مانگانە دایە و جگە لەوە دەبێ ئاقێر[1]ەکەشی تەواو بێ، هەر بۆیە دەبێ جارێ دەستی لێ ڕاگرێ. وەزیر وڵامی بۆ ناردەوە: «من سووڕ و مووڕی مانگانە و ئاقێر و شت نازانم و کارم بە نووسراوەی ناو کتێبان نییە و ئەو شەو حەتمەن دەیم.» کچە کە زانی دەست هەڵناگرێ بە دەهۆ وەڵامی بۆ ناردەوە و لێی ڕاسپارد: «...جا ئەگەر ئەتۆ ئەوەندە تامەزرۆی منی کێشە نییە و تەشریف بێنە چی دەکەی بیکە.»

وەزیر کە ئەو جوابەی بیستەوە، لە خۆشیان شاگەشکە بوو. فەرمانی دا، خەڵک نان بدرێ و شایی بگرن. چونکە ئەو شەو دەچمە لای شازادە خانم. مەلا ئەوەی بیستەوە و چوو بە وەزیری گوت: «هەتا ئاقێرەکەی تەواو نەبێ بۆ تۆ حەڵاڵ نییە.» وەزیر پێی گوت: «زۆری لە سەر مەڕۆ ئەمن ئاقێر و شت نازانم چییە و ناشم هەوێ بزانم.» مەلا لێی ترسا و بێ دەنگ بوو. کە بوو بە شەو وەزیر هەستا چوو بۆ لای شازادە. شازادە جوانترین و ڕێکوپێکترین کراسی لە بەر کردبوو، خشڵی جۆراجۆری وە خۆی خستبوو بۆنی خۆشی لە خۆی دابوو. کە وەزیر چووە ناو کۆشکەکەیەوە بە بزە و پێکەنینەوە بەرەوپیری چوو. پێی گوت: «دیارە ئەو شەو، بە ڕاستی شەوێکی خۆشمان دەبێ. بەڵام ئەگەر باوکم و مێردەکەمت کوشتبا لەوە باشتر بوو، بە زیندووی مابانەوە.» وەزیر گوتی: «گوڵی جوانم، مەجبوور دەبم بیان کوژم.» شازادە وەزیری بردە ژوورێ و داینا. بە دەوریدا هات و خۆی تێ هەڵسوو. بە ڕووی خۆش و پێکەنینەوە دواندی و شۆخی و گەمەی لەگەڵ کرد. کارێکی کرد وەزیر خەریک بوو گیانی دەرچێ هێندەی ناز و کرێشمە بۆ کرد و خۆی لە بەر دەستیدا مراند و تریقاوە. وەزیر جڵەوەی عەقڵی لە دەست دەرچوو. [هەرچی شازادە بوو مەبەستی ئەوە بوو، دەستی بە ئەنگوستیلەکەی ڕابگا و خۆشییەکەی لێ بکا بە شین. دەنا قەتی کاری وا لەگەڵ وەزیر نەدەکرد.] بەڵام بە قەولی شاعیر:

شیر و خەنجەر کول دەبێ و دەنوشتێتەوە
ئایەی نازی ژنیان بۆ بخوێندرێتەوە

کچە ئاخری کارێکی کرد وەزیر وەک مۆم نەرم بوو. لە بەر دەستیدا تلیساوە و ئیشتیای وەها بزووت عەقڵی لای خۆی نەما. هەر باوەشی پێدا دەکرد و تەمای نیزیکی بوو. شازادەش بۆ ئەوەی ئەوەندەی دیکە تامەزرۆی کا، خۆی لە دەستی ڕادەپسکاند. تا وا بوو لە پڕدا خۆی کۆ کردەوە و دەستی کرد بە گریان و چۆکی لە باوەش گرت. گوتی:

---

[1]. ئاقێر: دەرفەتێکی سێ مانگەیە بۆ ئەو ژنانەی کە مێردیان بووە و جیا بوونەوە و ئێستا بە تەمان مێرد بکەنەوە.

«ئەی ڕۆ گەورەم وا مەکە شــــوورەییە، چاو ئەو پیاوە هەر چاومان لێ دەکا. توخودا لای بە. دەنا من ناتوانم.» وەزیر ڕقی هەستا و گوتی: «کوا پیاو؟ پیاوی چی؟» شازادە نازێکی کرد و گوتی: «پیاوێک لەو ئەنگوســتیلەوە ســەر دێنێتە دەرێ و چاومان لێ دەکا. بە خودا ئەمن لە ڕوو هەڵنایە هەتا لای نەبەی. بیبە لەولاوە داینێ تا تەواو دەبین. دوایە بیکەوە قامکت.»

وەزیر ئەوەندەی ئیشــیتا هەســـتا بوو. عەقڵی لە دەســـت دابوو. خێرا هەســـتا چوو ئەنگوستیلەکەی لەولاوە دانا و بە لاترە لاتر هاتەوە بە لای شازادەوە. شازادە پێلەقەیەکی لە سینگی دا و بە پشتەوەیدا خست و یەک بە خۆی هاواری کرد وەرن ئەو گلاوە قۆڵبەست کەن. چل کەس لە کەنیزەکان کە لە پێشـــدا خۆیان بۆ ئەو کارە ئامادە کردبوو، لە پشـــت دەرگاکە چاوەڕێی فەرمان بوون، بە لەز خۆیان بە ژوویدا کرد و قۆڵبەســـتیان کرد. شـــاژنیش خۆی گەیاندە ئەنگوســـتیلەکە. دەســـتێکی بە نەقیمەکەدا کێشـــا. لەڕێوە ئەبوســـەعادات لە بەر دەمی حازر بوو. گوتی: «ئەمر بکە.» شازادە گوتی: «ئەو کافرە بخە بەندەوە و کۆت و زنجیری کە.» ئەبوســـــەعادات خێرا بردی بەندی کرد و کۆت و زنجیری لە مل و قاچی کرد و بۆخۆی گەڕاوە لای شازادە. شازادە لێی پرسی: «باوکم و مێردەکەمت بۆ کوێ بردووە؟» ئەبوسـەعادات وەڵامی داوە: «ئەوانم لە دەشتێکی کاکی بەکاکی فڕێ داوە.» شازادە گوتی: «هەر ئێستا بیانهێنەوە ئێرە.» لەڕێوە ئەبوسسەعادات فڕی چووەوە ئەو بێروونە بەرەهووتە، سەیری کرد، پادشا و مارف ئەوە پێکەوە دەگرین سـەیر. ئەبوسـسـەعادات پێی گوتن: «هەسـتن نارەحەت مەبن خودا دەرگای ڕەحمەتی بە سـەردا کردنەوە.» ئیدی بۆی گێڕانەوە کە وەزیر چی کردووە و چی بە سـەر هاتووە. پێی گوتن ئێســـتا ئەوە لە بەند دایە. ئەوان وەک گوڵ گەشـــانەوە و کەیفیان ســـاز بوو. ئەبوسسەعادات ئەوانی هەڵگرت و ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو هێنانییەوە لای شازادە خانم. شازادە خانم سـڵاوی لە بابی و مێردەکەی کرد و هەستا نانی بۆ هێنان و تێری کردنەوە. ئەو شەوەیان بە خێر و خۆشی ڕابوارد.

کە ڕۆژ بووەوە شـــازادە هەســـتا جلوبەرگی جوان و ڕازاوەی لە بەر کرد. جلوبەرگی جوان و شـکۆداریشــی لە بەر باوکی و مێردکەی کرد. بە باوکی گوت: «بابە تۆ هەر وەک جاران لە ســەر تەختی دەســەڵات دانیشــە و مێردکەشــم با وەزیری دەســتە ڕاســتت بێ. لەشـــکریش لەو گۆڕانە ئاگادار بکەوە. وەزیر لە بەند بێنە دەرێ و بیکوژە و پاشـــان بیسـووتێنە چونکە ئەو کافرە. دیویسـت بێ ئەوەی مارەم بکا و بێ ئەوەی وادەم تەواو بێ، بمکا بە ژنی خۆی. دانی بە بێ دینی خۆی دانا.» پادشا گوتی: «باشـە تۆ چۆن بڵێی من وا دەکەم بەڵام تۆ ئەو ئەنگوســـتیلەیە بدە بە من یان بیدە بە مێردەکەت. کچە گوتی: «ئێوە هیچتان شیاوی ئەوە نین ئەو ئەنگوستیلەیەتان پێ بێ. ئەو ئەنگوستیلەیە دەبێ لە لای من

بێ، بـاشــــترم ئـاگـا لێی دەبێ. ئێوەش هەر چییەکتـان دەوێ بە من بڵێن. منیش بە ئەبوسـســەعادات دەڵێم. نیگەرانی هیچ شـتێک مەبن. هەتا من زیندووی سـەر ئەو خاکە بم ناهێڵم هیچ زیانێک بە ئێوە بگا. پادشـا گوتی: «کچەکەم، ئەوە باشـترین فکرە.» دوای ئەوە باوکی و مێردەکەی هەسـتان چوون بۆ دیوان. ئەو شـەوە تەواوی لەشـکر نارەحەت بوون لەوەی کە وەزیر ئەو شـەو ئابڕووی و شکۆی ئیسـلام دەشـکێنێ و بە ئاشکرا دەچێتە لای شـازادە خانم کە ژنی یەکی دیکەیە. هەر بۆیە بەرپرسـانی لەشـکر مات و مەلوول لە بەر دەرکی دیوان ڕیز ببوون، بێ خەبەر لەوەی کە شەوی ڕابردوو چی ڕووی داوە، کە پادشا و مارفی زاوای پەیدا بوون.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوى هەزارەم هاتەوە

گوتى: خاوەنشكۆ: كاتێك بەرپرسانى لەشكرى چاويان بە شا كەوت، لە خۆشيان سووژدەيان برد. دواى ئەوە پادشا لە سەر تەخت دانيشت و شتەكەى بۆ گێرانەوە. ئەوانيش خەميان لە دڵيدا نەما و گەشانەوە. پادشا دەستوورى دا شاريان ڕازاندەوە و ناردى وەزيريان لە بەند هێنا دەرێ. كە وەزير بە دەست باڵبازەكانەوە وە دەر كەوت، تێكڕا لەشكر تفيان لێ كرد و جنێو و قسەى سووكيان پێ گوت. وەزيريان هێنا لە پێش پادشا خستيانە سەر چۆك. پادشا فەرمانى دا بە پيسترين شێوە بيكوژن و دواى ئەوە ئاگرى دەن. بەو شێوەيە بە ڕوويەكى ڕەشەوە مرد. وەك شاعير دەڵێ:

كۆچى ئاخريت هەر بۆ لاى خوايە
بزانە تۆ چيت لە جانتا دايە
سەربەرز و ڕووسوور، پەلەتە بۆ لاى
يان شەرمەندەيت و سەرت هەڵنايە

دواى ئەوە پادشا زاواكەى كرد بە وەزيرى دەستە ڕاستى خۆى و كاروبار زۆر جوان چووە پێش. وڵات پڕ بوو لە خۆشى و شادى. هەتا پێنج ساڵان ئاوا بوو، لە ساڵى شەشەمدا پادشا مرد. شازادە خانم مێردەكەى لە جێى باوكى دانا بەڵام ئەنگوستيلەكەى نەدايە. شازادە خانم دووگيان بوو. لە مانگ و ڕۆژى خۆيدا كوڕێكى بوو لە جوانيدا بێ وێنە. هەتا پێنج ساڵان كوڕەكەى دا بە دايەن بۆى گەورە بكا. ڕۆژێك شازادە نەخۆش كەوت. بانگى مارفى كرد و گوتى: «ئەمن نەخۆشم و پێم وا نييە تازە هەستمەوە. پێويست ناكا بڵێم ئاگات لە كوڕەكەمان بێ، بەڵام تكات لێ دەكەم ئاگات لە ئەنگوستيلەكە بێ. ئەوجار ئەنگوستيلەكەى لە ئەنگوستى دەرهێنا و داى بە مارف و بۆ ڕۆژى دوايە كۆچى دوايى كرد. مارف زۆرى خەم بوو، ماتەمى بۆ گرت. دواى چەند ڕۆژ، ڕۆژێك چووەوە سەر تەختى دەسەڵات و هەتا شەو لە ديوان بوو. كە بوو بە شەو و تاريكى باڵى بە سەر وڵاتدا كێشا. هەر وەك جاران هێندێك لە نيزيكان و هاودەمانى هاتنە لاى دانيشتن و هەتا درەنگانێك قسە و باس و گاڵتە و جەفەنگيان كرد. كە ئەوان ڕۆيشتن كەنيزێك هات جێگاوبانى بۆ مارفپادشا ئامادە كرد. مارف جلى پادشايەتى داكەند و جلى خەوى لە بەر كرد و چوو لە جێوە و خەوت. كەنيزەكە قاچى بۆ دەشێلا تا خەوى لێ كەوت. كەنيزە لە ديوى خەوەكەى هاتە دەرێ و چووەوە ماڵە خۆى. با ئەو بڕواتەوە.

دواى ئەوەى ئەو ڕۆيشتەوە، ئەوەندەى پێ نەچوو مارف پاشا هەستى كرد كەسێك

لەگەڵی لە جێگاکە دایە. ترسـا، کە چاوی هەڵێنا سـەیری کرد ژنێکی ناحەز هاتووەتە پاڵی. ڕاسـتەوە بوو گوتی: «ئەتۆ کێی و بۆ هاتوویە پاڵ منەوە؟!» ژنە گوتی: «مەترسـە من ژنەکەی خۆتم. فاتمە سـازندە.» پادشـا کە جوان لێی ورد بووەوە بە شـێوەی دموچاو و ددانە درێژەکانیدا ناسییەوە، سـەری سـووڕ ما. لێی پرسـی: «ئەوە چۆنت ئێرە دۆزییەوە و کێ هێناوتی بۆ ئێرە؟» ژنە گوتی: «هەر ئێسـتا لە میسـرەوە هاتم!» مارف گوتی: «ئەی چۆناوچۆن هاتی پێم بڵێ.» ژنە وەڵامی داوە:

ئەودەم لەگەڵ تۆ ئاوا بەدفەڕیم دەکرد و تۆم ئازار دەدا شـەیتان فریوی دابووم. کە تۆ ڕۆیشـتی هەسـتام چووم بۆ لای پادشـا و گوتم مێردەکەم دیار نییە. تەواوی وڵاتت لێ گەڕاین نەمـانـدیتییەوە. دووای دوو ڕۆژ بە برینی خۆم زانی کە چیم لە خۆم کردووە و چەندە تاوانبارم. تا بەینێکی زۆر لە تاوی تۆ هەر دەگریام و شـین و ڕۆم بوو. هەرچی بوومان هەمووم خەرج کرد و پاشەکەوتم تەواو بڕا و هیچم نەما. دەستم کرد بە سواڵ. بە ناو کۆڵان و گەڕەکەکاندا دەسـووڕامەوە، سـواڵم دەکرد و بە پێوشـوێنی تۆشـەوە بووم. هەرکەسـم دیبا لە ژن و پیاو سـۆراغی تۆم دەکرد. ژیانم ببوو بە شـین و گریان و سووڕانەوە. ئەوانەی دەشیان ناسیم هیچیان نەدەدامێ. کە داوای پارووە نانێکم لێ دەکردن جنێویان پێ دەدام. زۆر شـەوی وا بوو، پارووە نانێکم وەگیر نەدەکەوت و بە زگی برسـی سـەرم دەناوە. لە برسـان خەوم لێ نەدەکەوت. هەڵدەسـتام دادەنیشـتم. هەر ئەو ئێوارەیەی ڕابرد وام لێ هات. دوو ڕۆژ بوو، هیچم وەگیر نەکەوتبوو. ئێوارە کە ماندوو و مردوو لە کۆڵانان گەڕامەوە، بێ ئەوەی هیچم وەگیر کەوێ چوومەوەماڵەکەی خۆمان، باش بوو ئەو پەنایەشـم هەبوو شـەوان تێیدا وەردەکەوتم. بێ ئەوەی شـتێک بخۆم درێژ بووم. لە دڵی خۆمدا گوتم حەتمەن دەمرم. لە برسان خەوم لێ نەدەکەوت. ئێستێک لەمەوبەر هەستابووم دانیشتبووم و بیرم لە چارەڕەشی خۆم دەکردەوە و دەگریام کە ئەوەندەم زانی کەسێک لە پێشـم قوت بووەوە و گوتی: «دادە گیان ئەوە بۆ دەگری؟» گوتم: «مێردێکم بوو بژیو و پێداویستی منی دابین دەکرد، بەینێکە بێ سەروشوێن بووە و دیار نییە. نازانم ڕوو لە کوێ کەم.» ئەو کەسـە گوتی: «نێوی مێردەکەت چییە؟» گوتم: «نێوی مارفە.» گوتی: «ئەمن دەیناسم. ئەو ئێستا پادشای شاری «خوتانولخوتەن»ە. دەڵێی بتبەم بۆ لای؟» منیش گوتم: «جا ئەگەر تۆ گەورەیی ئـاوام لەگەڵ بکەی قەت لە بیرم نـاچێتەوە.» ئیدی لەڕێوە منی هەڵگرت و هێنامی بۆ ئەو کۆشـکە و پێی گوتم: «ئەوە دیوی مێردەکەتە و لەوێ خەوتووە بچووە بۆ لای.» منیش هاتمە ژووری و سەیرم کرد لێرە خەوتووی.

دوای ئەوە پادشـا بەسـەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە کە چۆناوچۆن هاتووەتە ئەو شـارە و کچی پادشـای هێناوە و بەو پلەوپایەیە گەیشـتووە. گوتی: «ئێسـتا شـازادە مردووە و کوڕێکی حەوت سـاڵانەی لە پاش بەجێ ماوە. ژنە گوتی: «پادشـا تکایە لێم بە دڵ مەگرە و

ڕابردوو لە بیر کە و لێم خۆش بە. بە خێری خۆت پاڕووە نانێکم دەیە و پەنام بدە. هێند پاڕاوە و لاڵاوە هەتا مارف بەزەیی پێیدا هات و گوتی: «دەست لەو ناجسنی و بەدفەڕیانە هەڵگرە، ئەو جارەش پەنات دەدەم. بەڵام ئەگەر بتهەوێ وەک جاران بکەی. تێ نافکرم دەتکوژم. تازە ترسم لە کەس نییە. ئیدی شتی وا بە زەینتدا نەیە، بلێی دەچم بۆ لای قازی و داروغە و شت. بۆخۆم پادشام و ئەوانە هەموویان لە ژێر دەسەڵاتی خۆم دان. لە خودا نەبێ لە کەس ناترسم. بێجگە لەوەش ئەنگوستیلەیەکم هەیە، کەسێکی لێ دێتە دەرێ نێوی ئەبوسەعاداتە هەر کارێکم بوێ، لەڕێوە بۆم جێبەجێ دەکا. جا ئەگەر پێت خۆشە بڕۆیەوە بۆ شار و وڵاتەکەی خۆت ئەوە ئەوەندەت ماڵ و سامان دەدەمێ بەشی هەتا هەتایەت بکا. خێراش دەتنێرمەوە. ئەگەریش پێت خۆشە لێرە لە لای من بمێنییەوە، ئەوە کۆشکێکی تایبەتت بۆ دروست دەکەم. پڕی دەکەم لە فەرشی حەریر و دیبا و بیست کەنیزیشت دەخەمە ئیختیارەوە لە خزمەتتدا بن. خوردوخۆراکی باش و جلوبەرگی شکۆداریشت دەبێ، هەتا یەکمان دەمرین. ژنە گوتی: «پێم خۆشە لە خزمەت تۆدا بمێنمەوە.»

دوای ئەوە دەستی مارفی ماچ کرد و تۆبەی کرد. مارفپادشا، فەرمانی دا کۆشکێکیان بۆ ساز کرد و پڕ فەرشیان کرد. کەنیز و پیاوی ماڵێی خستە بەر دەستی. لەوپەڕی شکۆ و گەورەییدا دەژیان. کوڕەکەی مارف بەینێک لە لای مارف و بەینێک لە لای ژنەکەی مارف دەبوو. مەمنا کوڕی خۆی نەبوو، ژنەکەی مارف ئەو کوڕەی خۆش نەدەویست. چی وا ئاوڕی لێ نەدەداوە و بە هێندی نەدەگرت. مارفیش ئۆگری کەنیزە جوانەکانی ببوو. خۆی لە فاتێ سازندەی ژنی نەدەدا و ئاوڕی لێ نەدەداوە. ئەخە فاتێ تازە پیرێژنێکی پەککەوتەی ناحەزی خوێنتاڵ بوو. مارفیش قەتی خۆشی لێ نەدیبوو هیچ، زۆریشی ئازار بە دەستەوە چێشتبوو. قەدیمیان گوتوویانە: «نە مار کلکی لە بیر دەچێ و نە باخەوان کوڕ.» شاعیریش لەو بارەوە دەڵێ:

متمانە نەکەی بە غەنیم باشە
تا تۆ گەنم بی ئەویش بەرداشە
ئەگەر جارێکی شکستت دابێ
لە بیری ناچێ هەتاکوو مابێ

مارف لەبەر ئاکار و خووخدەی باشی، ئەوی ڕانەگرتبوو، بەڵکوو بەزەیی پێیدا هات و هەر لە ڕێی خودا ئەو کارەی کردبوو.

کە چیرۆکەکە گەیشتە ئێرە. دنیازاد بە خوشکەکەی واتە شەهرزادی گوت: «ئەو

هەقایەتانە چەند خۆشــن. وەڵا لە ســیحری ڕوانینی چاومەســتان ســەرنجڕاکێشــترن.»
شـەهرزاد گوتی: «ئەگەر بمێنم و پادشـا نەمکوژێ، شـەوی داهاتوو لەوەش خۆشـترتان بۆ دەگێڕمەوە.»

کە ڕۆژ بووەوە پادشــا بە دڵێکی خۆشــەوە چاوەڕێی درێژەی چیرۆکەکە بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «تازە نایکوژم، هەتا حەکایەتکانی تەواو نەکا. دوای ئەوە چووە دیوان. وەزیر عادەتێکی بوو هەمیشــە کفنێکی لە بن پیلیدا بوو. پادشــا ئەوڕۆژەش هەتا ئێوارە لەگەڵ وەزیرەکـانی دیکەی کـاروبـاری وڵاتی بەڕێوە برد. دوای ئەوە بە پێی عـادەتی ڕۆژانی چووەوە بۆ حەرەمسەرا و لەگەڵ شەهرزاد دانیشت.

## که شەوی هەزار و یەکەم هاتەوە

دونیازاد خوشکه چکۆلەی شەهرزاد گوتی: «دادە چیرۆکەکەی مارفمان بۆ بگێڕەوە. شەهرزاد گوتی: «ئەگەر پادشا ڕێم بدا بۆتان دەگێڕمەوە. پادشا گوتی: «بیگێڕەوە زۆرم پێ خۆشە.» شەهرزاد گوتی: «خاوەنشکۆ، مارفشا خۆی لە خێزانی نەدەگەیاند و نەدەچووە لای. بەڵام لە ڕێی خودادا بەخێوی دەکرد. کاتێک ژنەکەی زانی مارفشا نایهەوێ سەرجێیی بکا و دڵی لە لای ئیدیکەیە. ڕقی لێ هەڵگرت. شەیتان چوو لە کلیشەیەوە. هانی دا بچێ ئەنگوستیلەکەی لێ بدزێ. بیکوژێ و بۆخۆی جێگای ئەو بگرێتەوە. هەر لەو بیر و خەیاڵانەدا بوو، وا بوو شەوێک هەستا بەرەو کۆشکەکەی مارف چوو. ڕێکەوت وا بوو ئەو شەوە مارفشا لەگەڵ یەکێک لە کەنیزە هەرە جوانەکانی کۆشکدا تێ خزابوو. پادشا بۆ ڕاگرتنی قەدر و ڕێزی گەورەیی ئەو ناوانە کە لە نەقیمی ئەنگوستیلەکەدا هاتبوون هەمیشە ئەنگوستیلەکەی لە قامکی دەردێنا. فاتمە سازندەش بەو عادەتەی ئەوی دەزانی. هەر بۆیە بەو نیوەشەوە چوو هەتا ئەنگوستیلەکەی لێ بدزێ. سەیر لەوەدا بوو، کوڕەکەی پادشاش کاری ئاودەستی دەبێ و لەو جەنگەیەدا دیتە دەرێ و چاوی بە پیرێژنە دەکەوێ کە بە پەڕتاو بەرە کۆشکەکەی باوکی دەچێ. لێی وە شک دەکەوێ و دەڵێ خۆزگە بزانم ئەو گڵاوە بەو نیوەشەوە بۆ هاتووەتە دەرێ و دەچێ بۆ لای باوکم. دەبێ شتێک بێ. ئیدی دڵی ناحەسێتەوە و دەکەوێتە شوێنی. ئەو کوڕە شیرێکی قوڵە و چکۆلەی هەبوو هەمیشە لە خۆی دەدا باوکی زۆر جار بە گاڵتە لێی دەپرسی: «کوڕم، شیرەکەت زۆر گەورەیە. ئەوە تا ئێستا بووە شەڕی پێ بکەی و ملی چەند کەسی پێ بپەڕێنی؟» ئەویش وەڵامی دەداوە و دەیگوت پێویست بێ پێشی دەپەڕێنم.» باوکیشی پێی پێدەکەنی.

کورتی کەینەوە شازادە شیری لە کالان دەرکێشا و کەوتە شوێن باوەژنی. هەتا چووە ژوورەکەی باوکی، لە پەنایەکدا خۆی مات دا بزانێ چی دەکا. سەیری کرد ئەوە هەر ئێرەوئەوێ دەگرێ و ملۆمۆیەتی و لە شتێک دەگەڕێ. لێی ورد بووەوە بزانێ لە چی دەگەڕێ کەچی تەماشای کرد، دەستی دا شتێک وەک گوڵەستێرە دەتروسکاوە. زانی ئەنگوستیلەکەی باوکییەتی، هێنای و هاتە دەرێ. لە بەر دەرگا گوتی بزانە چۆنت دەکوژم. ویستی دەست بە نەقیمەکەدا بێنێ. کوڕە گورج شیرێکی داهێنایە و ملی دابڕی. ژنە قیژاندی و بە لادا هات و گیانی دەرچوو. مارفپادشا لە خەو ڕاپەڕی و ڕایکردە دەرێ. تەماشای کرد، فاتمەی خێزانی لەوێ کەوتووە و خوێنی لە بەر دەڕوا. کوڕەکەشی بە شیرە قوڵەکەیەوە لەوێ ڕاوەستاوە. پرسی: «ئەوە چی بوو؟» کوڕە گوتی: «بابە هەر لێت دەپرسیم ئەرێ بەو شیرە سەری کەست نەپەڕاندووە؟ و منیش دەمگوت لە جێ خۆیدا پێی

دەپەڕێنم. ئەوە پەڕاندم.» ئیدی بۆ گێڕاوە کە شتەکە چۆناوچۆن بووە. ئەوجار بۆ ئەنگوستیلەکە گەڕان تەماشایان کرد ئەوە لە قولی ژنەکەی دایە. ئەنگوستیلەکەیان لە چنگی دەر هێنا. پادشا بە کوڕکەی گوت: «بە ڕاستی بە ڕاستی تۆ کوڕی منی.» حەساوەی ئەم دونیا و ئەو دنیا بی. پاشان مارف بانگی کۆیلە و خزمەتکارەکانی کرد بیبەن بی نێژن. ئەوە ئاو و گڵی ئێرەی بە قسمەت بووە بۆیە لە میسرەوە گەیشتووەتە ئێرە. شاعیر لەو بارەوە جوانی گوتووە:

ئەم دونیا سەیرە کێ لێی حاڵییە؟
لە کوێ دەژیت و دەمری دیار نییە
یەک تارانییە و لە بۆکان دەمرێ
یەک تکریتییە و لە سلێمانییە

دوای ئەوە پادشا ناردی لە دوای ئەو جووتیارەی میوانداری لێ کرد. هێنای کردی بە وەزیری خۆی. کچێکی زۆر جوانیشی بوو، لە خۆی مارەی کرد. ئیدی ژیانێکی پڕ لە خێر و خۆشیان پێکەوە ڕابوارد هەتا خودای تەعالا کۆتای بە ژیانیان هێنا و لێکی هەڵبڕین. ئەمری هەر بۆ خودایە.

لەو ماوەیەدا شەهرزاد سێ کوڕی لە پادشا بوو. کە ئەو چیرۆکەی تەواو کرد؟ کوڕنۆشی بۆ پادشا برد و گوتی: «پادشای جیهان، هەزار و یەک شەوە من هەموو شەوێ چیرۆکێکم لەو چیرۆک و هەقایەتانەی کە پێشینیان گێڕاویانەتەوە بۆ گێڕاوییەوە. ئەگەر ڕێم بدەی تکایەکم لێت هەیە.» پادشا گوتی: «هەرچیت دەوێ داوا بکە.» شەهرزاد بانگی دایەنەکانی کرد. منداڵەکانیان هێنا. یەکیان پێی هەڵگرتبوو. ئەوی دیکە دادەنیشت و چکۆلەکەشیان لە بەر مەمکان بوو. شەهرزاد کوڕنۆشی برد و گوتی: «پادشای جیهان ئەوانە منداڵەکانی تۆن. دەڵێم بەو منداڵانەم ببەخشە. مەمکوژە و لێم خۆش بە.» پادشا دانە دانە منداڵەکانی بە باوەشەوە گوشی و گوتی: «بە خودا پێش ئەوەی داوام لێ بکەی لێت خۆش ببووم. بەڵێنم دابوو ئازارم پێت نەگا و بتپارێزم.

بۆ بەیانییەکەی شەهریارپادشا فەرمانی دا، لەشکر کۆ بێتەوە. خەڵاتێکی بە شکۆ و گرانبایی دا بە وەزیر، باوکی شەهرزاد و پێی گوت: «ماڵت ئاوەدان بێ، ئەو کچە باشت لە من مارە کرد. وا بووە هۆی ئەوەی لەوە زیاتر دەستم بە خوێنی کچی خەڵک سوور نەبێ. ئەوەندی بڵێی کچێکی داوێنپاک و بێ فڕوفێڵە. خودای تەعالا بەسەری کردوومەوە و سێ منداڵی نێرینەشم لێی هەیە. شوکر و سپاس بۆ خودا کە ئەو نیعمەتانەی بە قسمەت کردم. دوای ئەوە پادشا دیاری و خەڵاتی دا بە میر و وەزیر و گەورەگەورەکانی دەوڵەت.

فەرمانی دا شـــار برازێتەوە و هەتا ســێ ڕۆژان لە خەزێنەی دەوڵەت تێچووی ئەو جێژنە دابین کرێ. ئیدی شاریان بە باشترین شێوە ڕازاندەوە و دیاری و خەڵات بە سەر فەقیر و هەژاراندا بڵاو کراوە و دەستیان گیرا. مسکێنان بەسەر کرانەوە. بەو شێوەیە خۆشی کەوتە وڵاتەوە هەتا تێکدەری خۆشی و شادێ لێکی بڵاو کردن. ئەمری هەر بۆ خودای دەهەندە و دلۆڤانە.